ناوی کتێب: مەوسوعەی جودی بۆ چەمک و زاراوەکانی سەردەم
نوسەر: مسعود عبدالخالق
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر
بەرگ: أمین مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٢٨ك - ٢٠٠٨ز
تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (٩٣) ی ساڵی ٢٠٠٩ دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر لوتێلی شیریں پالاس
ت: ٢٢٤١٦٩٥ - ٢٢٢٠٩٠٨ - ٢٥١٨١٢٨
مۆبایل: ٠٧٥٠٤٦٠٥١٣٢ - ٠٧٧٠١٢٨٧٢٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# پێشەکی بڵاوکار

ئێستاو پێشانیش، شیکردنەوەو دەرخستنی مانا ڕاستیەکانی هەر زاراوەو چەمکێك، زۆر پێویستە بۆ کاری هزریی.

چەمك و زاراوەکان، هیچ ساتێك وەك ئێستا بێ سەروبەری و لاڕێیی بەخۆوە نەبینیوە.

ئێمەش لە ڕۆژهەڵاتی دواکەوتودا، کە زێدی گشت پێغەمبەرەکان و ژیارە مەزنەکانی مرۆڤایەتیە، لە واقیعمان و ڕابردورمان، دابڕێنراوین و، هیچ پلانێکی بەرچاو ڕونمان نیە بۆ داهاتورومان.

نەیارەکانمان، هەرکات ویستبێتیان مانار مەبەستەکانی هەر چەمك و زاراوەیەك بسەپێنن، ئەوا بەپێی حەز و مەرامە ناحەزەکانیان، دایان ڕێژتووەو بەرِازاوەیی ساختە، بەسەر ئێمەیان داسەپاندوە.

دیارە زاراوەکان بەهێزترین و کاریگەرترین چەکی هزرییان بور، کە بەهۆیەوە ڕوبەڕومان بونەتەوەو لە هەمو بوارێکەوە داگیریان کردوین.

ڕوداوە گەورەو هەژێنەکانی دوایی ئەم سەردەمە، وەرچەرخانێکی زۆری بۆچون و ململانێی هزری و ژیاری توندوتیژی لێکەوتۆتەوە.

توندترین هێرش، کە بۆ سەر هەر گەل و میللەتێك بكرێ، هێرشی فکریە، کە لەرێی چەمك و زاراوەکان پیادە دەکرێت. بۆیە داگیرکەر بەر لە داگیرکردنی جێگەیەك، هەوڵ دەدات کەسایەتی میللەتەکە بێهێز بکات.

ئەم چەکەش بۆ تەزویرکردنی رۆشنبیری و فیکر و هزری کۆمەڵ بەکاردێنێت، بەمەبەستی زاڵ بوون و دەست بەسەرداگرتنی بە ئاسانی.

لەنیشانە هەرە زەق و دیارەکانی رابوون و بێداریی هەر میللەتێك، هەستی بەخۆکردن و ئاگا لەخۆبوونە بۆ پاراستنی هزرو مێژوو و داب و نەریتی جوانی تایبەت بەخۆی. جا گەورەترین هەنگاو لەم رێگایە، گەڕاندنەوەی چەمك و زاراوەکانە بۆ واتا راستەقینەکانیان و، هێنانەوەیان بۆ سەر راستەشەقامی خودی خۆیان.



# پێشەکی

ئەوە بەشی یەکەمی مەوسوعەی (جودی)یە، بەشەکانی داهاتووش بە دەوڵەمەندکردن و وەرگرتنی ئەزموونەوە دەردەچێت، تەقەلایەکی زۆرمان داوە ئەو فەرهەنگەیە بە تەنها کۆکردنەوەی زانیاری نەبێت، بەلکو دروستکردنی رێچکەی پەیداکردنی زانیاریش بێت، هەم یار مەتیدەر بێت بۆ هەریەکە لە:

١- توێژینەوەی زانستی لە ئاستەکانی سەرەتایی و ناوەندی و باڵا.

٢- بۆ راپۆرتی سیاسی لایەنە سیاسیەکان.

٣- وەك سەرچاوەو سودوەرگرتن بۆ وتاری رۆژنامە و تەلەفزیۆن، تا دەگاتە وتاری هەینی مامۆستایانیش.

رەچاوی هەموو ئەوانەمان کردووە بۆ هەموو لایەك بسازێ، لە خوێنەرێکی سەرەتایی تا رەوشەنبیرێکی باڵا.

ئەوەی حسابی بۆ نەکراوە لەو پرۆژەیە، لایەنی ماددی و قازانجەکەیەتی، هەم خۆم و هەم (نوسینگەی تەفسیر) لەدوای ماندوبونێکی چەند ساڵی، بەتەمای قازانج و دەستکەوتی ماددی نین، با خوێنەر لەجیاتی ئەوە، بۆمان بپارێتەوە بیبێتە سەدەقەی جاری.

ناوی (جودی)مان بۆ ئەو مەوسوعەیە هەڵبژارد، چونکە لە بنەچەدا زێدی باب‌و باپیرانی هەموو مرۆڤایەتی سەر ئەم زەوییەیەو، ناوێکی پیرۆزی قورئانییە، تاڕادەیەکی چاك لەگەڵ ڕەوتی ئەو فەرهەنگە دەگونجێ، کە لەسەر دوو ڕەهەندی دەڤەری‌و جیهانی دەڕوا، یەکەمیان: وەك فاکتەری وەختی‌و، دووەمیشیان: وەك فاکتەری مرۆڤایەتی هەمیشەیی.

**مەسعود عەبدولخالق**
**٢٠٠٧/٨/٩**

# سـەرەتـاو دەروازەکان

## چی هەڵبژێردراوە؛

لـەو سـەردەمەی عەولەمـەو تێکـچرژانی زانسـتو زانیاریـەکان دا زاراوەو چەمکێکی زۆر تێك دەپەڕێ، رۆژانە دووبارە دەبێتەوە، بەشـێکی زۆر لـە مانـاو ڕەچەڵەك و مەبەستەکانیان.. نادیارن (بەلایەنی کەمەوە بـۆ خـەڵکێکی سـادە)، زاراوە بەو مانایەی کە کۆمەڵە مانایەکی کـۆ کردۆتـەوە لـە هـەناوی خـۆی لـە وشـەیەکی سـادە یـان لێکـدراوگوزارش دەکـرێ، بـۆ نموونـە کـە وتـت رژێمـی "دیکتاتۆری" ئیتر پێویـسـت ناکـا بلـێ ی سـەرۆکی هەڵنەبـژێراوە و، میللـەت نایانەوێ، توند و تیژە، سـەربەسـتی تیـا نیـە، بـە ڕەخنـەو ئۆپۆزسـیۆن قایـل نیـە...هتد، تەنیا بەو زاراوە کۆتایی دێنێ، دەبێ خوێنـەرو بیـسـەر یەکـسـەر لـە تەواوی ماناکەی بگـات، ئـەگینا لـە زمـانی سـەردەم نەگەیـشتو بـەجێ مـا، ئەوداهێنانە لە بنەچەدا بۆ ئاین دەگەڕێتەوەو لەسەردەمی ئیسلاما ناوی (جوامـع الکلمە)بووە.

خۆ ئەگەر بە پێناس و ڕوانگەی خەڵکی تـریش لـەو زاراوانـەی ڕوانـی ئـەوا دیـسـان هەڵەتـە دەبـێ، بۆیـە زۆر پێویـسـتە ئـەو زاراوانـە ڕوون بکرێتـەوە بـە تەرازوویەکی وردو خۆماڵی، هەم مانا ڕەسەنەکەی بدا هەم مانـای گـۆڕاوی هـەم پێناس و هەڵوێستی تایبەتی خۆشمان، لە کۆتایشدا بە زمانێکی سـادەش بتـوانین دەری ببڕین، ئەوەش پێویـسـتە هـەم بـۆ ڕاگەیانـدن هـەم بـۆ وتاربێـژی هـەم بـۆ سیاسەتمەدار -زمانی سـەردەمە- کـە بتـوانێ بـە خێرایـی لـەو دونیـا خێرایـە مەبەستی خۆی دەربڕێ، هەڵبەتە ناکرێ ئەو هەمو زاراوانە (لە ملیۆنەهاش ڕەتی داوە) تۆمار بکەین، هەر تەنها ئەو کۆمەڵە زاراوە و چەمکە دەنووسینەوە کە لـە

جیهانی نوێ و کوردستان باوی هەیەو ڕۆژانە پێویستە، چونکە ئەوانی کۆن لەسەریان نووسراوە بە زمانی کوردی ئەگەر چی زۆربەشیان هەر وەرگێڕدراوە (تەرجەمە کراوە) یان بە ڕوانگەی مەدرەسەیەکی فەلسەفی و سیاسی وا نووسراوەتەوە گوزارش لە ڕاو بۆچوونی کێشە ڕەواکەمان و کەلتوورو شارستانی و ڕێبازو ئامانجە پیرۆزەکانمان نەکردووە، بۆیە ئەو تەقەلایەمان وەرگێڕان نیەو بەو ئاراستە کلاسیکیەش نیە، سەرەتایەکە بۆ دارشتنەوەی تێگەیشتنی تایبەتی خۆمان بۆ جیهان، جا با بزانین خۆمان کێین و ماناى چیە هەر بە چەند دێڕێك جارێ.

## ئێمە لە عەولەمەدا کێین ؟

لەو سەردەمە ئەو پرسیارە سادە و ساکارە بەڵام قورس و ئاڵۆزیشە، چونکە ئینتیمایە نوێیەکان (عابر القارات)ە، دەقەری نیە، ئێستا وەك جاران نیە هەر کەسێك بە ڕوانگە و بیر و بۆچوونی چەند دنیا دید و سەرکردە و زاناکانی خۆی بنوارێتە جیهان،بەلکو ئێستا ڕاستەوخۆ لەگەڵ جیهان کارلێك دەکەن، بۆیە ئینتیمایەکانی وەرگیراو (موکتەسەب) جووت ئابن لەگەڵ ئینتیماکانی میراتی، هەروەها ئایدیۆلۆژیا لەگەڵ بایۆلۆژیا، فسیۆلۆژیا لەگەڵ سوسیۆلۆژیا، .. تەنانەت زۆر جار تێکیش دەگیرێن، ئەو دۆخە تەنیا بۆ کورد یان ڕۆژ هەلات یان جیهانی ئیسلامی نیە، بەلکو بۆ هەموو جیهان بە ڕۆژئاواشەوەیە، ئینجا هەمان ئەو دۆخە هەر پەرژینەکانی نەتەوایەتی و کەلتووری و کۆمەلآیەتی و ئاینی کلاسیکو نەبڕیوە، بەلکو گەیشتۆتە ناو خێزانیش، بۆیە زۆر ئاسایە لەناو یەك خێزان یا لە ناو یەك دێی بچووك کۆمەلێك ئینتیمای نوێی جیاجیای جیهانی تیا بێت بە مەدرەسەی شوعیەت یان لیبڕالیەت، سۆشیالیستیەت، ئاینی، ... بە هەما شێوە سلوکەکان، ڕەوشتەکان، پەیوەندیەکان، نەریتە کەلتووری و فەرهەنگی کۆمەلآیەتیەکان، هەیە لەسەر شێوەی ڕۆژئاوایی یان ڕۆژهەلاتی پەیڕەو دەکا، ه بە نموونە ئاهەنگی سەری ساڵی (مەسیحی) چ پەیوەندیەکی بە کورد یان ب ئیسلام هەیە کەچی لە کوردستان گەورەترین ئاهەنگی بۆ دەکرێ، لەهەمان کا

خەلکێکیش هەیە لە ڕۆژئاوایە وەك ئێمە جەژنەکەی قوربان و ڕەمەزانە، بەو شێوەیە لە بار و دۆخ و کۆمەڵگەی وادا سنورکێشانی ئێمە و (ئێمە کێین؟) سانا نیە، ئەو کاتی سانا دەبێت کە میللەتەکەمان هەموو پێکەوە بکەونە سەر ڕاستە ڕێ، نازانین ئاخۆ بوونی فەرهەنگیمان ماوە یان نا؟ سەربەخۆین یان نا، شوێن کەوتە و چاولێکەرین یان پێشڕەوین؟ لقین یان نەسڵ؟ کام فاکتەرە لە (کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئایدۆلۆژی، ئاینی، ڕەچەڵەکی، جوگرافی، ...) سنووری ئێمەی پێ لەسەر دیاری دەکرێ؟ ئایا مەرجە بەیەك فاکتەر دیاری بکرێن؟ وەڵامی هەمو ئەوانە لەو جیهانەی ئینتیمای تێك چرژاوەکان و فرە ناسنامەی یەکتر بڕ و فرە فاکتەر بۆ ناسنامە ورد و بە ئەندازەی خۆی نابێت، چونکە ئینتیمای تاك بە سروشتی و بە گشتی وا گەشەی کردووە لە خانەوادەوە بۆ بنەماڵە بۆ خێڵ بۆ نەتەوەو ئێستاش بۆ شارستانیەکی جیهانی بەرێوەیە، ئەوە گەشەی ئینتیمای کۆمەڵایەتیەو تا ئێستاش بەهێزترین ئینتیمایە ئەگەر چی پێشی قایل نەبین، بۆیە دەبێ هاوسەنگیەکی ئەلەکترۆنی لە نێوان (واقیع) و (ویستراو) بکەین تا سنورێك بکێشین بۆ (ئێمە)، ئەگەر تووشی هیچ دەردێکی دەروونی سیاسی و فەرهەنگی نەبووبین ئەوا چەند سنورێکی دەماودەست (محدد) بۆ ئەو واقیعە دەماودەستە هەیە کە بتوانین فراوانترین ئینتیمای هاوبەش (ئێمەی) لێ بدۆزینەوە لە عەولەمەدا، ئەگینا لەچارەنووسدا بەشێکین لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دادگەری، ئەو سنورانەش:

١-ئێمە سەر بە فەرهەنگی ئیسلامین لە ڕووی ئاینیەوە.

٢-بەشێکین لە کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتی لە ڕووی جەمسەری جوگرافیەوە .

٣-ئینتیمای نەتەوەیشمان کوردە، لەڕووی ڕەچەڵەکیەوە.

٤-ئینتیماشمان کوردستانیە لەڕووی نیشتمانییەوە .

٥- سەر بە بەرەی ڕزگاری- نیشتمانین لە رووی ئایدیۆلۆژیەوە .

٦-سەر بە ولاتانی جیهانی سێیەمی تازە پێگەیشتوەکانین لە ڕووی شارستانیەوە.

هەڵبەتە کوردستان نیشتیمانێکی هاوبەشی چەندین نەتەوەی وەك کورد و عەرەب و تورکمان و کلدانی و.. ئەوانەش کۆمەڵێك بەها و نەریت و رەوشت و فەرهەنگی تایبەتی هەیە، کە سەرچاوەکەی ئاینی ئیسلامە، تێکەڵ بووە بە نیشتووی هەندێ نەریتی کۆمەلایەتی وئاینی کۆنی تر و عەلمانیەتی نوێ کە لەسەر سکەی خۆی تەواو خزاوە، بۆیە فاکتەرەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری و ئاینی و فەرهەنگی و دەروونی و رەوشتیمان.. جووت نابن تا ناسنامەیەکی روون و بەهێزی لێ پەیدا بێت و بەرروونی سنوری ئێمەش دیاربێت.. ئەوەیە قەیرانی ناسنامە لە عەولەمەدا، چونکە جاران ناسنامەی تاك (بەغیابی ئیسلام) لە تیرەکەی و هۆزەکەی دەدۆزرایەوە بۆ ناوچەیەك بەس بوو، بەلاّم ئێستا لەو دۆخە و بە تایبەتی ناسنامە بۆ میللەتێکی وەك کورد پێویستی بە کۆمەڵێك فاکتەری سەربار هەیە بۆ ناسینی وەك: جوگرافیا و نیشتیمان و نەتەوە و ئاین.. هەیە، کەواتە مەبەست لە ئێمە بریتیە لە: ئینتیمای بایۆلۆجی و میراتیمان کوردستانیە و ئینتیمای وەرگیراو و ئایدۆلۆژیان هەر ئەو بنەمایانەیە بیناو رزگارکەری کوردستانیشە، ئەوەش رێپیشاندەرە کە کوردستانیەکانیش لە چوار چێوەی کیانی سەربەخۆیان بتوانن خزمەت بە ئادەمیزادو دادگەری لە جیهان بکاو چاکترین تەعمیری زەوی بکەن، لە پاشکۆیەتیەوە بەرەو سەرمەشقی، لە دواکەوتەیی بۆ پێشکەوتن، لە نەفامیەوە بۆ رووناکی، لە لاسایی کردنەوە بۆ داهێنان، .. ئەوەش ناسنامەمانە لەو جیهانە نوێ یە و سنوری ئێمەیە کە لە گۆران دایە بە ئاسۆیی و شاقوڵی بەلاّم رووی گۆرانی راستەقینە لە شاقوڵیەوە بەرەو ئاسۆییە، واتە لە وەرچەرخاندابن، لەو (فترة إنتقالیة) تا دەگاتە جەوهەری ناسنامەی ئێمە کە یەکسان دەبێ بە هەموو بەشەریەت بەیەك ناسنامە، کە تەنهاناسنامەی بیروبڕوایە.

## گرنگیەکەی:

راستە ئێستا جیهان بووێتە دێیەکی بچووك، دووریەکان کورت بووینەوە، :.

بەلاّم دەبێ بزانین ئەو دێیە (چۆن یەك —متجانس) نیە، دابەش بووە بۆ سەروو و خواروو، ڕەش و سپی، تێرو برسی، بەهێزو بێهێز، داگیرکراو و داگیرکەر، زاناو ڕووناك بیرو نەزان و نەفام، .. نەتەوە و کەلتور و زمانی جیاجیا، شارستانیەتی جیاجیا، ئاین و ئایدۆلۆژیای جیاجیا.. ناسنامەی جیاجیا.. بۆیە هەر یاسا و بڕیار و هەنگاوێك دێت مەرج نیە لە بەرژەوەندی هەموو ئەو دێ بە بێت هەروەك لە مەبدەئی بنەڕەتی سەرمایەداری هاتووە: (پێك گەیشتنی دوو بەرژەوەندی دەبێ جیا بێت لەگەڵ سێیەم)، بە زۆریش لە بەرژەوەندی بالاّ دەستانە، ئینجا پلە بە پلە دادەبەزێ و گەورەترین زەرەرمەند میللەتانی ژێر دەستن، بە هەمان شێوەش لە بواری زاراوەکان ئەو مانایانەی دەدرێتە هەر زاراوەیەك یان چەمکێك لە لایەن هەر دەزگا و سەرچاوە و سیستەمێك بێت بەپێ ی بەرژەوەند و ڕوانگەی تایبەتی خۆیەوە دەیخاتە بەری لە هەموو بوارەکانی سیاسی، یاسایی، شارستانی، فەرهەنگی، کەلتووری، کۆمەلاّیەتی، ئابووری، .. هەتا زانستیش، بۆیە بنچینەی شکستمان، دەردی پاشکۆیی و چاولێکەریمان، .. لێرەوە سەرچاوە دەگرێ، کە ئێمە خۆمان داوەتە دەست پێناس و تێڕوانینی سیستەمێك کە ناسنامە و ئامانج و شێ و شایمان تێك ناکاتەوە، لە پێشەکی کتێبی (المعهد العالم الفکر الاسلامی) دەلێ: گەورەترین نەخۆشی لە چەمکەکانی دەست پێ دەکات کاتێ بە ڕوانگەی لایەکی تر پێناسەکان دابڕێژێت[1]، هەر بە نموونە ئەگەر بە ڕوانگەی جیهان خۆرەکان بڕوانیە چەمکێکی وەك (تیرۆر) دەبینین مەبەستیان (بزوتنەوەی ڕزگاری خوازیشە)، کەواتە مێژووی نوێمان هەمووی کەوتە خانەی تاوان و دادگای نێو دەوڵەتی، هەروەك ئێستا نیوەی کوردستانمان وەبەر ئەو حوکمە کەوتوون،لە تورکیا تەنها داوای خوێندنیان بە زمانی کوردی کرد لە وەلاّما وتیان ئەو داوایە تیرۆریە! دوور نیە لە ماوەیەکی کورتی تر هەمووومان بەرکەوین..، و ڕەنگە ئینتیمای شارستانیەکەشمان بگرێتەوە.. واتە بەکورتی ناسنامەی ئێمە بەدەر لەو

---

[1] الحضارة –الثقافة- المدنیة ل٨.

تەرازوانەی سەروور لەو جیهانە بێ (مـۆر)ی ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئـاوا نـەبخواردووە و نایخوا.. بۆیە نابێ بەو پێناسانە قایـل بـین، هـەر لێرەشـەوەیە بناغـەی ڕزگـاری هەمەلایـەنیمان (لـە بینـاکردنی کەسـێتی و سـەربەخۆیی و داهێنـان و بـەرەو پێشڕەوی چوونمان) لەوە دەست پێ دەکات کە ئێمـەش لێ تێگەیـشتن و پێناسـی تایبەتی خۆمان هەبێت بۆ ئەو چەمك و زاراوانە، ئەگینا بوونمان نیە و لە کەلتوور و فەرهەنگ و بوونێکی تر توابینەوە، واتە داڕشتنەوەیەکی تـری تێڕوانینمانـە لـە پاشکۆیەتیەوە بۆ سەربەخۆیی کە بەشێکی گرنگی ڕزگاری –ئیـشتمانیە، ئینجـا ڕزگاری کۆمەڵایەتیش، چونکە ئەو زاراوانە یەك مانای نەماوە، سەرنج بـدە هـەر تەنها (تیرۆر) تا ساڵی ١٩٨٣ز (١٠٩) پێناسی جیاجیای ڕەسمی سەرەکی هـەبوو کەلە دەسـتوور و یاسـاکان تۆمار کرابی[1]، پێناسـی (کەلتوور)یش تا سـاڵی ١٩٥٢ بەپێی (کۆپیر کلوکهۆن) دیسان بە ڕەسمیٚ گەیشتبووە (١٦٤) پێناسی جیاجیـا[2]، جگە لە نارەسمیەکانیش تا ئێستا ڕەنگە گەیشتبێتە هەزاران، کەواتـە ڕێکـەوتنی جیهانی نیە لەسەر چەمك و زاراوە و هەریەکە بە پێی بەرژەوەندی و لە خزمەتی کەلتوور و هەڵوێستی سـیاسی و ئابووری خۆی پێناسـی دەکـا، ئـیتر ئـەوەی بـە ڕوانگەی بەرژەوەندی تر پێناسـەکان دابڕێـژێ ئـەوا دۆڕانـدی، سـەرنج بـدە ئـەو شەپۆلەی کە ناوی نرا (غزو الفکـری) بەسـەر جیهـانی ئیـسلامیدا بـە تایبـەتی لەسەرەتای سەدەی بیستەم دەبینین هـەر لەسـەر دەسـتی عەلمانیـەکانی جیهـانی ئیسلامی بووە، دەقا و دەق لە وەرگـرتن و هێنـانی ئـەو چـەمکانە دەسـتی پـێ کردووە نمونەیەکی وەك فەرهەنگی (محیط المحیط)ی (بطرس بستانی) بڕوانە چـۆن و چی کردووە، مانـای وایـە زاراوە سیاسـی و مەنهەجیـەکان –چـەمك- کێـشەی خەستی لەسەر دروست بووە و دەبێ، بۆیە زۆر فەرهەنگ و ناوونیـشان هەیـە بـە ناوی (حرب المـصطلحات) یان (ڕاست کردنەوەی چەمك).. قورئانی پیرۆزیش لـە

---

[1] الموسوعة العربية – ( المادة ٪الارهاب الدولي).

[2] حضارة –ثقافة– مدنية.

بارەی ڕاست کردنەوەی (چەمك) زۆر تایبەتی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی تێدایە وەك: ﴿لاَ تَقُولُوا رَاعِنَا وَقُولُوا انظُرْنَا﴾ یان ﴿قُلْ لَمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِنْ قُولُوا أَسْلَمْنَا﴾، زۆربەی ئەرکی پێغەمبەرەکان ﷺ ڕاست کردنەوەی چەمك بووە، کە هەندێکی هەر بەیەکجاری کوژاندۆتەوە و هەندێکیشی ڕاست کردۆتەوە، هەندێکیش شێوەکەی هێشتۆتەوەو ناوەڕۆکی گۆڕیوە وەك (أنصر اخاك ظالما أو مظلوما)، نموونەیەکی تری زاراوەی گۆڕاو (دیمکراسیە) مانای ڕەسەنی (فەرمان ڕەوای گەل)ە، ئێستا ئەو مانایەی نەماوە لە هیچ شوێنێك وەك (ڕۆسۆ) گۆتەنی نەبووەو نەدەبێ[1]، (هەر چەندە لیبیا دەڵێ من ئەو جۆرە دیموکراسیەم!) بەڵکو هەر وڵاتە بە شێوەیەك ئەو دیموکراسیە پەیڕەو دەکا، بۆیە پێش ئەوەی ئێمە لێرە مانای هەر چەمکێك بگـزرین و تایبەتمەندی بدەینێ و بیکوردێنین خۆی گۆڕاوە و مانا ڕەسەنەکەی نەماوە، بەڵام زاراوە زانستیەکان کەمتر ئەو دەستکاریە و کێشەیەشی لەسەرە، ئەوەش ڕوونە چونکە ناسنامەی زانست گشتیەو مولکی هەموو کۆمەڵە، زیاتر ئەوانە دەستکاری کراون کە ناسنامەی تایبەتە نەك گشتی، بۆیە ئێمەش لەگەڵ ڕەچاوی مانا ڕەسەنەکەی دا مانایەکی کوردستانیانە و دادگەریانەی پێ دەدەین بە مەبەستی بناغە دارێژی (مەرجعیەت)ی فکری و شارستانیمان نەك تەنها وەرگێڕانێك و فۆتۆکۆپی فەرهەنگێك بکەین، تەقەلایەکە تا میللەتەکەمان لە کەوتنەوە بهێنە سەر قاچی خۆی بە پێی توانا، ﴿أَفَمَنْ يَمْشِي مُكِبًّا عَلَى وَجْهِهِ أَهْدَى أَمَّنْ يَمْشِي سَوِيًّا عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾.

پێش کەوتنی میللەتانی جیهانیش لە سەرەتادا لەفکریوە، ئەویش لە سەرەتادا لە فەرهەنگەکان دەستی پێ کردووە، جاحظ، بیرۆنی، إبن سینا، إبن ندیم، .. لەجیهانی ئیسلامی سەردەمی پێشکەوتووی، لە ئەوروپاش سەرنج بدە ئەو فەرهەنگانە چ دەورێکی بینیوە لە ڕابوونەکەیان... هەتا ئەگریك و دوای یونانیەکانیش (تأریخ الطبیعي- پلینی)، و (جوگرافیا- سترابۆ)، (گەردوونی -

[1] روسو- في عقد الاجتماعي.

پتلیموس و ئەرستۆ) (میژوو- هیرودوتسی).. ئینجا لەڕابوونی دووەمیشیان ئەوفەرهەنگانە پێشڕەو بووینە :(المرآة الکبری G.mirror)ی سەدەکانی ناوەڕاست، بەشێکی زۆریش پێیان وایە کاریگەری بنچینەیی لەسەر شۆڕشی فەرەنسی دەگەڕێتەوە بۆ فەرهەنگی (دیدرۆ) کە لە ۱۷۵۱ز بناغەرێژکراو دوای گەشەی پێدرا کە بە (ئەنسکلۆپیدیەی فرنسی) بەناوبانگە، فەرهەنگی (دالمبیر) و فەرهەنگی دنیس ویە بەرپرس دەزانن لەو پیش کەوتنەیان ... شارستانی تریش لەو فەرهەنگانە دەستی پیّ کردووە کە ژێر خانی وشیاری و زانیاریە.

## دەروازە و تێبینیە هەمە جۆرەکان؛

۱-زۆربەی ئەو زاراوە و چەمکە نوێیانە ڕەگ و ڕیشەکانی کۆنن دەگەڕێتەوە بۆ دەیان سەدە و بگرە بۆ قولایی شارستانیەکان، وەك ئامار و توێژینەوە دەرکەوتووە چەمگە ئیجابیەکانی ئەسڵیان پەیامە، سەلبیەکانیش زادەی هەڵس و کەوتی مرۆڤە، هەندێکیش تێکەڵێکە لە هەردوولا دروست بووە بۆیەش کەم چەمك هەیە لە ۱۰۰٪ چاك و لە ۱۰۰٪ خراپ.

۲-ڕۆژئاوا ئەو زاراوانە زەق دەکاتەوە کە ماناي سەلبی زیاتر دەداتە ڕۆژهەلاّت و جیهانی سێیەم و ئیسلامی.. لە بەرامبەریشدا بە هۆی دەسەلاّتدارانی جیهانی ئیسلامی (خانوو لە شوشە) نەیان توانیوە خۆیپارێزن یان زاراوە زۆر و زەبەنگە سەلبیەکانی ڕۆژئاوا زەق بکەنەوە، ئیتر لەو ململانێیە دیل کراون.

۳-زۆربەی ئەو زاراوە نوێیانە لە ڕۆژئاوا سەریان هەڵداوە لە بۆنە و زەمان و زەمینێك لە جەوهەردا لەگەڵ بارودۆخی ئێمەدا جیایە، ناشێت بۆ پەیڕەوکردنی، بۆ نموونە مەدەنیەت یان عەلمانیەت.. یان مافی ئافرەت.. لە ئەورووپا لە بۆشایی و سەلبیاتی ئاینەکەیان هاتووە، کاتێ هەندێك ڕەوشەنبیر و سیاسەتمەداری خۆمان ئەو زاراوانە لێرە دەڕوێنن نەك هەر بەری نابێ بەڵکو شێنیش نابێ، هەروەك بینران لە ئەزمونی چەپیەکان و ڕوو لە ڕۆژهەلاّتی وا ئێستاش دیسان عەلمانیەکان

روویان لە رۆژئاوا کردۆتەوە بەهەمان ئەوژم، جیاوازی جەوهەریەکەش لەوەیە ئاینی ئەوی وەك (سپینوزا – و گاردینی..) گۆتەنیان هەر رێنموونیە نەك شەریعەت و بەرنامەی ژیان، هەر مەسەلەیەکی شەخسیە بۆیە چەمکەکان زۆر جار دەوری ئاین دەبینن لەوانە: شارستانی، کەلتوور، فەرهەنگ ، لیبرال و دیموکراسی، دەولەت کەچی لێرە جیایە ئاینی ئیسلام بەرنامەیەکی ژیانی تەواو هەلگرتووە لە هەموو بوارەکان، مەودای هیچ زاراوە و چەمکێك ئادا هاوتای بێ یاخود بەدیلی، بۆیە عەلمانیەتی جیهانی ئیسلامی بە گشتی دەردی نە شارەزایی لەو بەراوردە هەیە. سەرچاوەی قەیرانەکانی و ساغ نەبوونەوەی فکری لەوەوە دێت.

٤-لە کۆنەوە رۆژئاوا دەردی خۆپەرستی هەبووە، جیهانی لە چاوی ئەورووپاوە دیوە، بەو شێوەیە زۆربەی تیۆر و توێژینەوەکانیان لە (تەعمیم) بە هەڵەدا چووە، دیاردەیەکی ئەورووپی بووە کردوویانە بە مولکی هەمو کۆمەڵ، هەروەك بە روونی لە تیۆرە سیاسی و فەلسەفی و کۆمەلایەتی و دەروونی یەکانی مارکس، فرۆید، دورکایم، مۆرگان، سپینۆزا، ... بە زەق تر لە هەموان دەردەکەوێ، بەداخەوە زۆربەی فەرهەنگەکانی جیهانیش بە عەرەبی و کوردیەکانیشەوە بە هەمان دەرد چووینە و ئەو هەلەیەی ئەوانیان نەپالاوتووە، هەتا زۆربەی ئەو فەرهەنگانەی ئێمەش لێرە پشتمان پێ بەستوون.

٥-ئەو دەردەی سەروو لە فەرهەنگ و زاراوە نوێیەکانیشیان بە روونی رەنگ دەداتەوە، بۆ نموونە پێناسی (حزب) تەنها بە کۆکردنەوە (دەنگ) دەناسێ [١]، ئەوەش زیاتر لە ولاتانی سەرمایەداری رۆژئاوایە نەك هەموو جیهان، هەروەها پێناسی (ریفۆرم-ئیسلاح- چاکسازی) یەکسەر بە بیروباوەرێکی ئاینی لە دوای(مارتن لۆتەر)ی داوەتە قەلەم [٢]، بۆیە زۆربەی فەرهەنگ و

---

[١] Oxford Advanced Learners Dictionary-٢٠٠٠.

[٢] Acritical Review of concept and Difinition- Krober And Kurekhim-

ئەنسکولوپیدیەکانی ڕۆژئاوا دەردی یەك لایەنی تێگەیشتن، نانیەت، گوێز لە هەمبانی خۆی ژماردن، سەرچیخی... پێوە دیارە، بۆیە نابی خۆ بدەینە دەست ئەو پێناس و مانایانەی ئەوان هەتا ئەگەر لیبرال پەروەریش بن. هەر بۆیەش ئێمە لەو فەرهەنگە پێناسی تایبەتی هیچ چەمك و زاراوەیەکمان نەکردووە، چونکە پێناسی زانستی نیە، پێناسی مەزهەبیە (چونکە چەمکەکان مەزهەبین نەك زانستی) بۆیە هەر پێناسێك گوزارش لە ڕاوبۆچونی مەدرسەیەك دەکا.

٦-لەبەر نەبوونی (مەرجەعیەتەکی فەرهەنگی کوردستانی) ئەوا بەرە بەرە زاراوەی مەدرسی سەری هەلداوە، زاراوەی وا کە مۆرکی مەدرسەیەکی پێوەیەو سەپێنراوە، لەوانە: زاراوەو چەمکی (هاوسەری، ڕامیاری، ..) ئەوانە زیاتر مانای عەلمانیەتیەکەی دەبەخشی نەك زانستی بێلایەن، تەنانەت هاوسەری دەقاودوق گوزارش لە مانای ژن ومێردایەتی لە سەربنچینەی تەفسیری فرویدی دەبەخشی، ئەوان شوکردن بەپروسەی یەکێتی جنسی پەتی لێك دەدەنەوە، بۆیە وشەو زاراوەی هاوسەري لەو سونگەیەوە دێت، کەچی پێناسی دروستی ژن ومێردایەتی ئەوەیە یەکێتیەکی کومەلایەتی وسیاسی وپاسایی وشەرعی وجنسیشە، جار وایە یەکیتیەکی فکری وئایدیلوژی وئاینیشە، کەواتە.زاراوەی "هاو+ سەری" تەواو گوزارش لەو پروسەیە ناکا و لە ڕووی زمانەوانیش ناتەواوە، بەهەمان شێوەش ڕامیاری لەدووشە (ڕامی-واتە فێلباز وە یار )[1]پێك هاتوە بەمانای سیاسەتێکە فێلاوی، ئەوەش گوزارش لە بۆچونی میکافیلی دەکا نەك هەموسیاسەت، هەندی زاراوەی تر هەیە دابەش بۆە بە نموونە ئادەمی زاد ومرۆڤ، هەلبەتە لەیەکەمدا مانای تەفسیری ئاینیە بو دروست بونی بەشەر لەمح ئادەم ولەدووەمیشاتەفسیری داروینیە بە (لا ادمیە)، کەواتە ئیشی فەرهەنگ زۆر ناسك وگرنگە بناغەکانی عەقلی سەردەمی لەسەر دروست دەبی

---

.١٩٥٢

[1] ئەفەرهەنگی کوردستانی گیوی موکریانیش ڕامیاری بەفێل باز لێك داوەتەوە .

٧-زۆربەی زاراوەکانی سەر بە عەلمانیەت دەگێڕنەوە بۆ مێژووی نوێی شارستانی و ڕابوون و زادەی گەشەی زانستی و عەقلانیەت، کەچی زۆربەیان ڕەگ و ریشەی کۆنی سەردەمی نەفامی و دڕندایەتی و لایەنی شەڕی سروشتی نادەمیزادە. ئێمە لێرەدا ناسنامە و تەمەنی ڕاستەقینەی خۆی پێدەدەینەوە.

٨-لە ڕۆژئاوا هەندێ زاراوە هەیە سەلبیە یان هەر خەیالیە بە حوکمی ئەو بارودۆخە مادیەی خۆیان؛ کەچی لای ئێمە هەمان زاراوە ئیجابیە و واقیعیشە، هەر بە نمونە (میسالی-ئایدیالی) لای ڕۆژئاوا بە مانای بیرێکی خەیاڵ پڵاو و ناواقیعی دێ، کەچی لای ئێمە مانای کارێکی نموونەیی و پێشەنگ دێ، هەروەها هەندێ زاراوەی تر لە بارودۆخ و بۆنەیەکی جیا لە ئێمە دروست بووە لە وەرگێڕانی دا ناوێکی پێ بەخشراوە جووت نابێ، لەوانە (ئوسوڵی) ئەوان بەو سەرەنجام و بەرەگریەی پرۆتستانیان وتووە (fendamentalism) ئوسوڵی، کەچی ئوسوڵی لای ئێمە مانای مەبدەئیانە و دانایی و دڵسۆزییە...، نمونەی تر لای ئێمە (شۆڕش بەرگری و کوردایەتی) و چالاکی پێشمەرگانە و بەرگری لە نیشتیمان شەرەفە، کەچی لای (ڕۆژئاوا و داگیرکەران و دیکتاتۆرەکان) ئەوە تیرۆر و توندوتیژی و دەرچوونە لە یاسا، ئەو لە بابەتی (تێکدەر، تیرۆر، دژی یاسا، دژی مەدەنیەت و شارستانیەت، ئەشقیا ،شێتی ، ڕێ گر..) ڕیزیان دەکا، لێرەدا زۆربەی ڕەوشەنبیر و نووسەر و سیاسەتمەدارانی عەلمانی لە دوولاوە بەهەڵەدا دەچن، یەکەم: کاتێ ئەو زاراوانە بەڕوانگەی ڕۆژئاوا و داگیرکەرانەوە لەناو ئێمەدا بڵاودەکەنەوە بێ لێك کردنەوەی ڕاستەقینە، کۆنیە تێکدەر و تیرۆریست و توندوتیژ ؟ دووەم: کاتێ ناتوانین بە ئاراستەی پێچەوانە و ڕاست کردنەوەی چەمك ئەو زاراوانە بۆناو کۆمەڵگەی ڕۆژئاوا بنێرینەوە، ئەگەر وا نەبین ئەوا تەنها فەرمانبەرێکی وەرگێڕ و پینەچی ئەو دیدانە دەبین و تەنها وەکیلێکی دڵسۆزی کۆمپانیای چەمکان دەبین بۆ ساغ کردنەوەی.

٩-ڕاست کردنەوەی چەمکەکان زۆر ڕێ ی دوور کورت دەکاتەوە بۆ تێك

گەیشتن، ئەوەی ئێستا عەلمانی و ئیسلامی و چەپیەکانی تەك و لۆ کردووە لە دیالۆگا تێك ناگەن، لە بنچینەدا لەو چەمکانە لێك جیان، بە تایبەتی عەلمانیەکان بە کوردیشەوە، هەم زانیاری لە بارەی ئەو ڕێبازە عەلمانیەی خۆی لێڵە هەم لە بارەی ئیسلامی ڕاستەقینەش.. بۆیە وەڵامەکانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئایدیۆلۆژی و ئینتیماکانی بە زمانێکی باڵا و ڕاشکاوانە نیە، ڕاوبۆچوونەکانی پڕە لە ناکۆکی لە نێوان (گۆتە و کردەی)، (ڕابووردوو و چارەنووسی) (ئینتیما و خزمەتی)..

جار وایە وەك چەند ڕوو ئەوەی دەیڵێ باوەڕی پێ نیە، ئەوەی شاردیتیەوەش شەرمی پێ یە بە ئاسایی لە ئاخافتنا ڕاستی ناڵێ، لە سپاردەیا دەرناچێ، لە بەڵێنا ناکۆك دەبێ.

١٠-زۆربەی زاراوەکانی نوێ بە تایبەتی سەلبیەکان لە تازی و فاشی و وجودی و دیکتاتۆری و شۆڤێنی و سادی و دوگمایی و.. لە مەدرەسە واقیعەکانی شیوعی و سوشیالیستی و سەرمایەداری ڕۆژئاوا هاتوون ئەك لە مێژووی ئیسلام.. بۆیە دەبێ هەڵوێستی ئیسلامیشی لەسەر ڕوون بکرێتەوە بێ ئەوەی بکرێتە مولکی ئیسلام یان هەمو کۆمەڵ.

١١-لەگەڵ گەشەی کۆمەڵ ئاوەڕۆکی زاراوەش دەگۆڕێ، ئەو زاراوانەی سەردەمی کشتوکاڵی و ئیمپراتۆری و خێڵەکی زۆر جیایە لەگەڵ سەردەمی پیشەسازی و وڵاتانی نەتەوەیی، ئێستاش لە سەردەمی عەولەمە دیسان جیایە لەگەڵ پێشوو، بۆیە ئێستا یەکێ لە قەیرانەکانی زاراوە ئەوەیە ماناکانی تەواو پێ هەڵناگیرێ هەتا لەڕووی یاساییشەوە، بۆیە پێویستی بە زاراوەی نوێ یان دەستکاریەکی بنەڕەتی هەیە، تا زانست و زانیاریش پێشکەوێ ئەوا زیاتر وشە سادەکان دەبنە زاراوەو چەمك، بەو شێوە سنوری فەرهەنگ فراوان دەبێ، مانار مەبەستەکان یەکتر دەبڕن لە وشەیەکی دیاری کراودا دەبنە زاراوە.

## تێبینیە هونەریەکان:

١-زۆر جار ئاینی ئیسلام لەبەر ساناییی ڕەوتی بابەتەکە وەك مەدرەسە ڕێز دەکەین.

٢-جاروایە هەندێ زاراوە و چەمك بەکاردەهێنین چەوتیشە، بەڵام لەبەر ئەوەی باوی وەرگرتووە ناچارین جارێ ئاوا پشتی پێ ببەستین لەوانە: شارستانی، کەلتوور، ڕێباز و زانستی، ...

٣- لەبەر ئەوەی زۆربەی سیستەمەکانی دەسەڵاتداری وڵاتانی ئیسلامی ئیسلامی تەواونیە، هەریەکە لە دەستور و سیستەمی سیاسیدا پەیرەوی سوشیالیستیە یان لیبرالیە یان دەستور و یاساکانی یۆنانی و ڕۆمانی کۆن و فەرەنسی ئێستایە، ئەوا بۆ ئەوەی لە هەندێ وڵاتانی پەیڕەو ئیسلامی وەك ئێران، سودان، چیچان و ئەفغانستانی پێشوو جیایان کەینەوە... بە وڵاتانی (موسڵمان نشین) تۆمار دەکەین، هەڵەیە بڵێین وڵاتانی ئیسلامی، چونکە ئیسلامی مانای پەیڕەوکردنی شەریعەتی ئیسلامی، واتە تاکە سەرچاوەی دەستورەکەی قورئان و سوننە بێت.

٤-زۆرجار باسی ڕۆژئاوا بە شێوازی جیاجیا دەکەین، لیبراڵ دیمکراسی، ئەورووپجیایەتی، سەرمایەداری...هەمووی هەر مەبەستمان لە شێوازی ژیانی ڕۆژئاوایە، ئەگەر وتراش چەپی، مارکسی، شیوعیەت، سوشیالیستی زانستی، .. هەر یەك مانایە تەقریبەن.

٥- باسی هەمو مەدرەسە سەرەکیەکان دەکەین بەبێ لایەنی، بەڵام کەمێك زیاتر باسی ئیسلام دەکەین چونکە بە زمانی کوردی کەمتر لەسەر چەمك و فکری ئیسلامی نووسراونەوە.

لێرەدا لە چەمك و زاراوە سیاسیەکان دەست پێ دەکەین ئینجا دەچینە ناو زاراوەکانی ئابووری و فەلسەفی و گەردوونی و سروشتی، چونکە ئێستا بەرنامەی سیاسی و ئایدۆلۆجیای تاکیش وەك جاران نیە سەرچیخی بێت، لە قوڵاییەوە بۆی

دەروانین، تێگەیشتن لە گەردوون لە فەلسەفە لە دەور و بەر، تێگەیشتنی تایبەتیشت لە سیاسەت و لە ئینتیمای حزبی بۆ دروست دەکات، هەروەك (جان کوریس) سەدەیەك لەوەو پێش گۆتبووی ناچمە ناو سیاسەت هەتا لە بناغەی گەردوون نەگەم، ئەوە زۆر ڕاست دەرچووە، هەر مەدرەسەیەك و سیستەمێکی سیاسی و لایەنێك ئەگەر بەرنامەکانی وا قووڵ نەبێتەوە ئەوا دەبێتە بەرنامە و لایەنێکی بەرژەوەندی و تەنها (پێ دان و وەرگرتن take and put) کە خراپترین پەیوەندی مرۆڤایەتیە.. جا لێرەدا ئەوە فەرهەنگی ڕاپێچی خەڵك نیە بۆ ناو بەرنامەیەك یان پێ دانی کلیلێك بێت بۆ تاکە هۆڵێك.. بەڵکو ڕەوشەن کردنەوەی دەرگاکانە، دڕدانی تاریکەکانە.. بۆ ئەوەی هەڵخەڵەتاوی نەمێنێ.

٦-لەبەر ئەوەی پانۆرامای مێژووی جیهان بە سەلبی و ئیجابی لە عەولەمەدا کۆ دەبێتەوە، ئەورووپاش پێشڕەو بووینە لە پێ خستنە ناو عەولەمە هەر لە سەدەی (١٦) بەدواوە، ئەوا ناو و سەربردەی زۆربەی زاراوە نوێیەکان لە ڕۆژئاوا هاتوون بە تایبەتی سەلبیەکانی وەك: فاشی، نازی، عەلمانی، بەرژەوەندی تایبەتی، سادی، ..هتد، لە لایەکی تر زاراوە چاکەکانیش وەك (مافی ئافرەت)، (مافی مرۆڤ)، (مافی چارەی خۆ نووسی)، (دیموکراسی)... چونکە لەوێ ئەو مافە نەبووە لە هەناوی سیستەمی ژیانیان دا نیە بە پێچەوانەی ئیسلام هەمو ئەو مافانە لە هەناوی شەریعەت دا هەیە بێ جوداکردنەوەی بەشێك و زاراوەیەك بۆی، جا کاتێ ئێمە بە شکستەوە لەسەر ڕێبازی ئەوان ڕۆیشتین یان خراپتریش وەك ئێستای دەسەڵاتە دیکتاتۆریەکان ئەوا زاراوەکانیشیان پڕ بە بەرمان دەبێت، هەر بۆیەش ناو و زاراوەکانی ئەوان زیاتر باوی وەرگرتووە، هەر بە نموونە (پەرلەمان) باوترە لە (شورا)، تیرۆر باوترە لە تۆقاندن..

بۆیە ئێمەش لێرەدا ناچار لەسەرەتادا هەر بەناوی باویەوە زاراوە و چەمکەکان دەنووسینەوە.

٨-ڕێسایەك هەبوو لەناو نووسەرانی عەرەب گرایە (لامشاحة في الاصطلاح)،

ئێستا وا ڕەتی دەکەنەوە لەوانە د.محمد عمارە لە کتێبی نوێی (معركة المصطلحات)، بەڵام هەندێکی تر پێ یان وایە (لامشاحة..)کە لە زاراوە ڕاستە بەڵام لە (چەمك) دەرناچی، چەمك و زاراوە لێرە لای ئێمەش لێك جیایە.

٩-هەوڵ دراوە زانیاری لە فەرهەنگە جۆربەجۆرەکان و باڵاکان و سەرچاوەی نەسلی وەرگیرێ لە ڕۆژهەلاتی و ڕۆژئاوایی و ئیسلامی و کوردی و فارسی و عەرەبی و ئینگلیزی و فەرەنسی.. بە تایبەتی لە بارەی نەسلی زاراوە و بۆنەی پەیدابوونی.

١٠- زۆر دەووتری فەرهەنگ دەبێ بێ لایەنانە و میان ڕەوانە بنوسرێتەوە، بەڵام ئەو بێ لایەنیە وانەکا سەودا لەسەر (ڕاستی) بکەین، یان میان ڕەوی وا هەڵبگێڕین کە هەر (ڕاستیەك) دابەش بووە بۆ لای مدرسەکان، مەرج نیە، ڕەنگە وابێ، ڕەنگە لای یەکێکیشیان بێ بەتەنها، هەر بۆ نمونە لە وەڵامی پرسیاری: ئاخۆ (٣×٤) چەندە؟ خۆ ئەگەر فکری ئیسلامی وتی دەکاتە (٢٠)، شیوعی وتی (١٢)، سۆشیالیستی وتی (١٧)، لیبرال دیموکراسی وتی (١٠)، ئەوە بێ لایەنی مانای وانیە بڵێین هەموتان ڕاست دەکەن یان نێوە ڕاستێکیان بۆ بدۆزینەوە، نەخێر ئێمە وەڵامەکان وەك خۆی تۆمار دەکەین! بەڵام لەکۆتاییدا دەڵێین وەڵامی شیوعی ڕاستە.

١١-ووردبوونەوەیەکی تر زۆر پێویستە، لەجیهانی ئیسلامیدا گەلێ زاراوەی سەلبی سەری هەڵداوە کە زادەی ڕەگەزپەرستی عروبی و تورکایەتی و.. پەڕیتە نێو فەرهەنگی ئیسلام، دەبێ بەووردی لێیان بژار بکەین یان مانای ڕاستەقینەو سەرچەلەی خۆی بۆ بدۆزینەوە.

١٢-لە پێش کۆتاییدا:

أ-هەندێ ناوی (موسوعة) هەیە زۆر لێك نزیکە وەك (الموسوعة العالمية العربية) و (الموسوعة العربية) بۆ لێك جیاکردنەوە یەکەمان کردۆتە (موسوعة العالمية) لە نووسیندا.

ب- ناوی دانەری كتێب و فەرهەنگەكان هەر جاری یەكەم دەنووسین.

لە كۆتاییدا ئەگەر دەڵێن (پێكدادانی شارستانی) هەیە، ڕەنگە وانەبێ بەڵام ئەوەی جێی گومان نیە (پێكدادانی زاراوە و چەمكەكان) هەیە.. جا هەندێكی لە پێك كەوتنیان زاراوەی نوێی هاوبەشی لێ دەرچووە لە دایك و باوكی جیاجیا.. هەشە ناشێت، بۆیە لێرەدا وەك مەسەلەی (فقه علی مذاهب الاربعة- یان خمسة)، ئێمەش لێرەدا (مفاهیم علی مدارس الاربعة) نیشان دەدەین بە كورتی هەنگاوەكان ئەوەیە:

یەكەم: پێ ناسێكی ئەسڵەكەی، دووەم: گەشە و لق و پۆ وەرگرتنی، سێ یەم: مانا و هەڵوێستی هەر مەدرەسەیەك لە بارەی ئەو زاراوە و چەمكانە ئنجا ڕوانگەی خۆشمانی دەخەینە سەر... بۆیە لە پێش هەموواندا با بزانین ئەو مەدرەسە سەرەكیانە كامەن؟

## مەدرەسەكانی سیاسی لە عەولەمەدا:

لەوسەردەمەدا نەك فەرهەنگەكان هەتا (نەتەوە یەكگرتووەكان) و دەزگا دەولی و مرۆڤایەتیەكانیش كۆك نین لەبارەیپێناسی زۆربەی زاراوە سیاسی و فیكریە نوێیەكان، وڵاتانی موسڵمانشینیش بە هەمان شێوە وەك دەركەوت لە كۆنگرەی (جاگارتا)ی ۲۰۰۲ز، ڕێك نەكەوتن لەبارەی پێناسی (تیرۆر)، هەروەك تا ئێستاش لە دەزگا ڕەسمیەكانی جیهانیش نەك هەر پێناسی فەلسەفی و كۆمەڵایەتی و سیاسی بۆ نەكراوە هەتا نیشانەكانی یاسایشی بۆ نەكراوە، ئەوەستێتە سەر بكەر یان كارەكە؟ كێیە تیرۆرست؟ ناسنامەی چیە؟..

بە هەمان شێوەش لە بوارەكانی تری سیاسی و فیكری و فەلسەفی و كۆمەڵایەتیش هەر بە نموونە چەمكی (دادگەری) یان (كێشەی نادەمی زاد).. لە هەموو مەدرەسە و شارستانی و بەرنامەكانی حزبە جیهانی و كوردستانیەكانش داواكراوە، بەڵام هەر مەدرەسەیەك بە جۆرێكی تایبەتی خۆی لێی تێدەگا و

پێناسی دەکا، جا ئەو مەدرەسانەی کە لە جیهانی نوێدا وەك هاوتا و (بەدیل) بە یەکتر بۆ زۆربەی چەمکەکان وا لێك جیان هەریەکە سیستەمێکی سیاسی و فیکری و کۆمەلایەتی و ئابووری تایبەتی هەیە تا دەگاتە پێك هێنانی باری دەروونی تاکیش، بریتیشن لە چوار مەدرەسەی سەرەکی کە هەر یەکەیان بە ڕوانگەی تایبەتی خۆی دەڕوانێتە ژیان و جیهان و ئەو چەمکانەش.

با لە پێشدا بزانین مەدرەسە چی یە؟ مەبەست لە مەدرەسە لەو سەردەمە: ئەو سیستەمە زیندوەیە کە پێك هاتووە لە کۆمەڵە تیۆرێکی سیاسی داڕشتراو لەسەر بناغەیەکی فیکری و فەلسەفی و عەقلی، خاوەنی ئەزموونی مێژوویی و واقیعیە، تیایدا چارەسەری لایەنێکی (یان هەموو لایەنەکانی) کێشەکانی شادەمیزاد و پەیوەندی و پێویستیەکانی لەگەڵ کۆمەڵ هەلگرتووە، کە لایەنەکانی سیاسەت و دەسەلا ت وبێ دەسەلات و هەڵس و کەوت و حەرام و حەلال.. دەگرێتەوە، بەو شێوەیە مەدرەسە (بەتایبەتی لە عەولەمەدا) ڕۆڵی ئاینیش دەبینێ، خاوەن بەرنامە و پابەندبوونە، خەلکی تایبەتی خۆی هەیە، بەشێوەیەك لەیەك کاتدا نێنتیما بۆ دوو مەدرەسە ناکرێت، قوتابیانی سەر بە هەر مەدرەسەیەك هەر لە بیری سیاسی تا دەگاتە هەڵس و کەوتی لێك جیایە لەگەڵ قوتابی مەدرەسەیەکی تر.. هەریەکە حەرام و حەلالی تایبەتی خۆی هەیە، هەر بۆیەش بە تاك تاك و بە کۆمەڵ و حزب و تاقمیش دەشێ سەر بەو مدرسانە بن، هەرچەندە هەندێ زانا و نووسەری بالاً وەك(المدارس الفكرية المعاصرة- ی محمد قطب) ناویان بە مەدرەسە نەبردووە، بەلکو بە (تیار-تەوژم)ناویان بردووە وەك کتێبی (تيارات الفكر العربي المعاصر، د.مصطفى عبدالغني)، بەو شێوەیەشی دابەش کردووە: ١-تيار الديني، ٢-تيار الليبرالي، ٣-التيار اليساري، ٤-تيار القومي...

ڕەنگە تەنها (تیار القومي) ڕاست بێت (تەیارە) نەك مەدرەسە، ئنجا هەمو جۆرە سۆشیالیستەکان ناکەونە خانەی (چەپ).

## ئایا ئیسلام مەدرەسەیە؟

ڕەنگە هەندێ نارەزایی دووسەرە هەبێ کە بۆچی ئیسلامیشمان ڕیزکردووە لەگەڵ مەدرەسە، هەروەك بە چاکی لە پێناسی مەدرەسەش دەردەکەوێ شمولی ئیسلام ناکا، جا نا ڕەزاییەکان بە دوو ئاراستەی پێچەوانەیە، بەشێك پێ یان وایە ئاین نابێ لە سیاسەت بگلێنرێ وئاین پەیوەستە بە تاك ئیتر ناگەنە ئاستی مدرسە، ئەوە عەلمانیەکانن، بەشەکەی تریش بە ئاراستەی پێچەوانە تەنها ئیسلام بە چارەسەر دەزانێ و زۆر لە سەروی مدرەسەیە، ئەوانەش ئیسلامیەکانن، بۆ هەردوولا، ئەوە هۆیەکانی ڕیزکردنی ئیسلامە لەگەڵ مەدرەسەکان:

١-تا خوێنەر واتێ نەگا ئەو مەدرەسە و سیستەمانە بۆ زەوین و ئاینیش بۆ ئاسمان هەروەك لە مەسیحی و چەند ئاینێکی تریش دا وایشان داوە، لە قورئاندا وا هاتوە: ﴿رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾.

٢-لە بارەی ئەوانەی دەڵێن ئەو ڕیزکردنە بچووك کردنەوەی ئیسلامە.. زۆر ڕاستە بەلام هەر خۆی گەلێ بچووك تر کراوەتەوە هەر خانەنشین کرابوو لە ژیان، جیاکراوەتەوە لە لایەن دەسەلاتداران، ئیتر لەو قۆناغە بەرز و گەورە کردنیەتی کە بتوانین بیگەینە ڕێز مەدرەسە.. ئەگینا خۆی مەزنە.

٣-خۆ ( ئیبراهیم) هەڵبەتە لەوپەڕی خواناسی بووە کەچی بۆ شکاندنی ئەو (جمود فکرية)یە (بۆ وەختیانە) عەقیدە و ئاینی زۆر بچووك کردەوە و بگرە چووە دەرەوەی جوغزی ئاینیش کاتێ وتی وەرن خەڵکینە با بزانین ئەو ئەستێرە ڕەنگە خوامان بێ و دوای مانگ و ڕۆژ ئنجا کۆمەڵەکەی گەیاندە قەناعەتێك کە دروستکەری مانگ و ئەستێرە.. خوایە، کەواتە ( ئیبراهیم) لە بچووکی دەستی پێ کرد بە مەزنی کۆتایی پێ هێنا، لە گومان دەستی پێکرد لە یەقین کۆتایی پێهێنا، لە فرە خوایی دەستی پێکرد بە یەکتاپەرستی کۆتایی پێهێنا.

بۆ ئەوەی ئەو (جمود)ە بشکێنێ و بیرە جام کردووەکان بکاتەوە و بیان جوڵێنێ..

بۆیە ئێستاش ئێمە لێرە بەو بچووکیە ئەگەر دەستیش پێ بکەین ئەوا بە مەزنی کۆتایی دێت.

٤-چەند ئەوەیەکە ئیسلام لەژیان دوور خراوەتەوە، وەك (ڕای باو) بە زەحمەت هەرس دەکرێ کە ئیسلام بەرنامەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و شارستانی بێت هەتا بۆ خودی بەشێکی زانای ئیسلامیش چ جای ڕەوشەنبیرێکی عەلمانی یان عەوامێك. بۆیە ویستومانە لە دوورەوە نزیکی بکەینەوە، لە دەرەوەی گۆڕەپان بیخەینە ناو گۆڕەپان، لە زیندانەوە بۆ دەرەوە، لە نەفی کراوی بۆ ناو ناوەدانی. .ئیتر ئەرکی دوای ئەو قوناغە بو سیاسیەکان دەگەڕێتەوە.

٥-ئینجا ئەو مەدرەسانەش خۆ هەر پلەی ئاینی هەیە مادام (حەرام و حەلال)، (شەریعەت) و (حوکم) و بەرنامەی ڕێگەی ژیان و ئینتیما و ئەرك و ڕێنمایی هەبێ، ئیتر ئەوە ئاینە.. (هەروەك لە گفت و گۆیەکەی عدی کوڕی حاتم ڕوون تر دەردەکەوێ)، جا بۆ ئەوەی هەم لە لایەك مەدرەسەکان بە ئامۆیی سەیری ئیسلام نەکەن لە لایەکی تریشەوە لەلایەن ئیسلام پەروەرانیشەوە ئەو مەدرەسانە بەبێ بڕوا لە قەڵەم نەدەن، تا کارلێك کردن و دیالۆك نەوەستێ...

بەو پێیە ئێستا دێینە سەر پێناسێکی سەرەتار خێرای مدرەسەکان (دوای بە درێژی باسیان دەکەین)، کە بریتین لە: (١-لیبراڵ دیموکراسی، ٢-سوشیال دیموکراسی، ٣-شیوعیەت، ٤-ئاینی ئیسلام).

١-لیبراڵ دیموکراسی: زیاتر سیستەمی ڕۆژئاوایە، ئەوە سیستەمە، ئایدیۆلۆژیایە، ڕێگەی ژیانە، .. بۆیە لیبراڵ دیموکراسی جیایە لەگەڵ دیموکراسی یان خودی سەرمایەداریش، کۆن ترین سیستەمیشە، ئێستا بە هەموو ئەو سیستەمە بێ بەرنامە و ڕەمەکیانەش هەر دەوترێ لیبراڵی، ئیمپراتۆریەکانیش بە جۆرێك ئەو سیستەمەیان پەیڕەو کردووە، ئێستاش لە جیهان دا زۆربەی وڵاتان و ئەو حیزبانەی بێ مەبادیئ و بناغەکانیان تەتهالەسەر بەرژەوەندی و (وەرگرە و بیکە take and put)یە سەر بەو مەدرەسەن، لە کوردستانیش چەند حیزبێك

هەن و بە گشتی حزبە عەلمانیەکان (جگە لە چەپەکان) بەرەو ئەو مەدرەسەن.

٢-سۆشیال دیموکراسی: زۆر جۆر سۆشیالیستی هەیە (وەك سۆشیالیستی زانستی، تۆباوی، فەوزەوی، مەسیحی، برجوازی، دیموکراسی، نەتەوەیی، نیشتیمانی، ..) ئەوەی ئێستا مەدرەسە دروست دەکا تەنها دوو جۆرە، یەکیان: سۆشیالیستی زانستیە کە هەمان ڕێبازی مارکسیە، بریتیە لە قۆناغی نێوان سەرمایەداری و شیوعیەت، بۆیە ئەوەیان هەر لە (شیوعیەتەوە دەخوێنینەوە)، کەواتە ئەوەی دەمێنێ (سوشیال-دیموکراسی)، زیاتر لە (٤) سەدەیە بیرۆکەکەی بە نموونەوە هاتووە، بەڵام ئەویش ڕەگ و ڕیشەی لەگەڵ لیبراڵیەت بە تەریبی بۆ قوڵایی مێژوو چەقیوە، ئێستاش لە وڵاتانی ئەسکەندینافیە و ئەوروپا و ئەفریقیا و ئاسیا ئەو ڕێبازە پەیدا بووە، بە تایبەتی لە دوای سەرنەکەوتنی ئەزموونی مارکسیەت، لە کوردستانیش چەند حیزبێك سەر بەو مەدرەسەن، ئێستا زیاتر بەرنامەکانیان لە ڕادیکالیەوە بەرەو پارێزگاری و شارستانی ڕۆژئاواییەن.

٣-شیوعیەت: ڕێبازێکی مارکسی لینینیە، بەپێی بۆچوونی خۆیان ئەوە دوا قۆناغی گەشەی کۆمەڵە و کۆتایی مێژووە وەك (حەتمی) کە تیایدا بە هەشتێك دەسازێ بە ڕزگاربوون لە دۆزەخی سەرمایەداری و لیبراڵی، بە یەکسانی بۆ هەمو ئادەمیزاد بێ دەوڵەت و یاسا و پۆلیس، هەروەك لەمانیفێستەکەی (مارکس، ئەنجلس) بلاوکرایەوە لە ساڵی ١٨٧٠، لینینیش یەکەم پەیڕەوکەری بووەلە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی (١٩١٧)ی ڕووسیا، دوای گەشە و هەڵلوشینی زیاتر لە نیوەی جیهان تا ساڵی ١٩٩١ و ڕۆژی ١٢/٣١ بە ڕۆژی هەڵوەشاندنەوەی ئەو مەدرەسە حیسابە، لە تەمەنی ٧٤ساڵی دا شکستی هێنا، بەڵام هێشتا چەندین وڵاتی وەکو چین، کۆریای سەروو، لاووس، ڤێتنام، کۆبا، و چەندین حزبی شیوعی تر و لە کوردستانیش بێجگە لە حزبە شیوعیەکان هەریەکە لە کۆمەڵەی کوردستانی ڕۆژهەڵات و (pkk) و چەند وردە حزبی تریش بە ڕارایی هێشتا سەر بەو مەدرەسەن.

٤-مەدرەسەی ئاینی (ئیسلامی): زیاتر لێرەدا مەبەست ئیسلامە، هەر چەندە هەندێ ڕێبازی سیاسی فیکری مەسیحی و یەهودی و بوزی و..هتد هەیە، دەزگـا و ئەنیـستۆی سیاسی لەسەر دروست کراوە، بەڵام ناوێتە کراوە لەگـەڵ یـەکێ لـەو مەدرەسـانەی سەروو لەبـەر بـێ ئینتـی، بۆیـە مەدرەسـەیەکی سـەربەخۆیان نیـە هەروەك زانا و پسپۆڕانی خۆشیان لەو بارەیە باس لە نوقستانی و ناشمولیەتی ئەو ئاینانە دەکەن کە تەنیا ڕێنمایی پیرۆزە و بەس، بێ شـەریعەتن، هـەروەك (علـی عزت بیگۆڤیچ) لە کتێبی (الاسلام بین الشرق و الغرب) دەڵێ: (الـسن بالـسن)ی یەهودی بەو نوقستانی و لارییەی دەروونێك سازدەدا کە سوشیالیستی توندی لێ بێتە بەرهەم بۆ پڕکردنەوەی ئەو نوقستانیە، هەروەها (السن بالعفو)ی مەسـیحی بە هەمان شێوە سیستەمێك بەرهەم دێنێت کە بریتیە لە (لیـبراڵ دیموکراسـی).. بەڵام (السن بالسن+العفو) ئیسلام لەبەر هەمەلایەنی پێویستی بە هیچ مەدرەسە و پینەیەك نیە و خۆی بەرنامەیەکی سـەربەخۆ و تـەواوە لـە هـەموو بوارەکـانی ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابووری و نیشتیمانی و شارسـتانی و کـەلتووری و..تا دەگاتە باری دەروونی و هەڵس و کەوتی تاکیش، ئەو مەدرەسەیە تاقانە لـە مێژوودا نمونە و ئەزموونی پیادەی دەوڵەمەندی هەیـە و بـۆ هـەموو سـەردەمێك دەشێ دووبارە بکرێتەوە، بۆیە لە دوای هەشتاکانی سەدەی (٢٠) دیسان رابوونی مدرسـەی ئیـسلامی زیـاتر هاتـەوە مەیـدان وەك گەلاڵەیـەکی سـەربەخۆی نـە ڕۆژهەلاتی و نە رۆژئاوایی، هەر چەندە پێشتر چەند جم و جۆڵێـك هـەبووە لـەناو خاوەن بیرەکان (نـەك جـەماوەر) لەوانـە (یـەکێتی محمـدی (نەورەسـی)، برایـان، دەعوە، حزب التحریر، جماعەی پاکستان، ...، بەڵام نەبووە خواستێکی جەماوەری تا شۆڕشی ئیسلامی ئێران ١٩٧٩ و لە دوایـش شۆڕشـی ئەفغانـستان تەقیـەوە، ئێستاش چەند نموونەیەکی سەرکەوتووی لە دروست کردنی دەوڵـەتی نوێنگـەری و بزوتنەوە و کۆمەڵی ئیسلامی لێ دروست بووە، جیهانی خستۆتە بەردەم گـۆڕانی مەزن، هەر چەندە زۆر بە دڕندانەش بەربەرەکانی دەکرێن، لەگەڵ کـەم و کـوڕی و

تیّ بینیش ڕوو لە زیادبووندان، وا ئیّستا پەرپووتەوە بەرەی ڕزگاری خوازیش تا ئەورادەیە تەنیا ئیسلامیەکانن دەتوانن بەرگری لە نیشتیمان بکەن لە ڕووی داگیرکەران وەك دەبینین لە (خوارووی لوبنان، فەلەستین، چیچان، کشمیر، سوّرۆ، ..) لە کوردستانیش چەند بالّیّك هەیە سەر بەو مەدرەسەیە.



هەندیّ وردە مەدرەسەی تر هەتە مەرجەکانی مەدرەسیاتی تیا نەسازاوە، لەوانەش مەدرەسەی بیری نەتەوایەتی، چونکە خۆی ئایدیۆلۆژیا و تەشریعاتی نیە، ئینتیمایەکی بایۆلۆجیە نەك ئایدۆلۆجی، میراتی یە نەك وەرگیراو، (لا إرادیة) نەك (إرادی)، جەوهەر و ناسنامەی ڕاستەقینەی مرۆڤیش ناکەویّتە سەر ڕەچەلّەك و نەتەوایەتی و هەریمایەتی و شویّنی جوگرافی و نیشتیمان، بەلّکو دەکەویّتە سەر جۆری پەروەردە، بیری نەتەوایەتی حزبی پیّ دروست نابیّت بۆیە دەبیتین هەردەم ئازناوی مەدرەسەیەکی ئاینی یان چەپی یان لیبرالّ دیوکراسی پیّوەنووساوە بۆ پڕکردنەوەی نوقستانیەکەی، هەندیّکیشیان بەیەك مەدرەسەش تەواو ناکریّن هەر بە نموونە (جمال عبدالناصر) زۆر بە ڕاشکاوی لە کتیّبی (فلسفة الثورة) دەلّیّ: نەتەوەییەکەمان بە دوو بالّ دەفڕیّ یەکیان سۆشیالیستە، ئەوی تر دیوکراسی، هەر بەپیّی ئاوەڕۆکی ئەو مەدرەسانەش ڕەفتار و هەلّس و کەوتی دیاری دەکریّت، هەروەك بینیمان هەندیّ حزبی نەتەوەیی ئیجابیە بەلاّم هەندیّکیش زۆر سەلبی و توند و تۆقیّنەر بوونە وەك: فاشیەکان، نازیەکان، بەعسیەکان.. هەموو ئەوانە جۆریّك لە سۆشیالیستیان خواستووە (واتە ئایدیۆلۆژیان پیّك هیّناوە لە ئاویّتەی نەتەوایەتی و سۆشیالیستی).

لەو سەردەمەی عەولەمە و دوای شکستی عەلمانیەت و شیوعیەت زۆربەی حزب و تەوژمە نەتەوەییەکان ئایدۆلۆژیەکانیان تەنیا بەیەك مەدرەسە پیّ تەواو

نابێت بۆیە پەنا دەبەنە بەر هەموو مەدرەسەکان[1].. لە کوردستانیش نەتەوەییەکان هەمان قەیرانیان هەیە، سەرەڕای قەیرانی ناسنامەیش، بە ڕوونی نازانرێ ئەوانە ئیسلامین یان عەلمانین؟ دیکتاتۆرین یان دیموکراسی؟ مارکسین یان لیبرالی؟.. بە کورتی هیچیان نیە (کەچی تا ساڵی دەشسوڕێتەوە هەمووی پەیڕەو دەکا لە ئاینی و عەلمانی و نەتەوەیی و ئومەمی و... ئیتر (شمولی) ڕاستەقینە ئەوەیە کە دەیەوێ هەمووی پاوان بکا و پێش ناکرێ و ماندوو و نەخوش دەبێ، بۆیە دەبێ دەسەڵاتدار بێت و ئیتر شەڕە دەسەڵات دەکا و دیکتاتۆری دەبێت و جارجاریش هەر بەیەکجاری جاری هەرەس هێنانی ئایدۆلۆژیاش دەدەن.

بەو شێوەیە و لە ڕاستیشدا نە (بیری نەتەوەیی) و نە (ئیسلام)یش مەدرەسەتین، یەکەمیان لێی بچووك ترە و دووەمیشیان لێی گەورەترە.



ئێستا ئەو مەدرەسانە لە هەموو جیهان وەك هاوتا و (بەدیل) لە گۆڕەپاتن، هەریەکە کۆمەڵێك چارەسەر و چەمکی جیای هەڵگرتووە، کۆمەڵە (حرام و حەلال)، ئامانجەکانی، بنچینەکانی، یاساکانی، دید و جیهانبینیەکانی، ئەرازووەکانی.. هەروەك چوار ئاینی سەرەکیە بە تایبەتی لە عەولەمەدا، جگە لە پەیڕەواتی بەرنامەی ئیسلام بە هەموو مەدرەسەکانی تر دەوترێ عەلمانی ئەگەر:

١-مەرجعیەتەکەی (قورئان و سوننە) نەبێت، ٢-یان هاوبەشێك بۆ ئەو مەرجەعیەتە پەیدا بکا، یان بە واتایەکی تر ئەگەر (دەستووری) وڵاتەکە یان (پەیڕەوی) حزبەکە سەرچاوەی دروست بوونەکەی بە تاقی تەنها ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە شەریعەت نەبێت ئەوا عەلمانی حیسابە، جیهانی ئێستا لەسەر ئەو بنچینە دابەش بووینە نەك لەسەر بنچینەی (شارستانی)، هەروەك (هەنتگتۆن) و دەزگا سیاسی و بڕیار بە دەستەکانی ڕۆژئاوا وای بۆ چووینە، جا هەر میللەتێك و

[1] هۆیەکی تریش هەیە لەو بارە چونکە مەدرەسەکانی عەولەمە لاواز بووینە بۆیە ئەو حزبە نەتەوەییانە پەنا بۆ زیاتر لە مدرەسەیەك دەبەن.

هەتا هەر تاکێکیش مادام مەدرەسەی خۆی نەدۆزیەوە بە پێی ئینتیمای (چینایەتیەکەی، شارستانیەکەی، نیشتیمانەکەی، ئاینەکەی، فەرهەنگی، کەلتووری)، ئەوا بزانێ یان نا خزمەتکارە بە خۆڕاییو بە خزمەتکاریش خانەنشین دەکرێ، بۆیە دەبێ ئێمە ئینتیمایەکانی خۆمان بدۆزینەوە لەیەکێ لەو مەدرەسانە ئیتر ناسنامەو ڕوانگەمان بێتو هەر بە پێی ئەویش لەو زاراوەو چەمکانە بگەین و دایڕێژینەوە (بڕوانە ئەو بەراووردە)*. لەسەر ئەو بنچینەیە لێرە بەولاوە هەڵدەستین بە هەڵبژاردنی کۆمەڵێك چەمك و زاراوە کە لەمو کوردستانە و جیهانیش زۆر بەکار و پێویست بێت، هەریەکەیان بە کورتی باسێکی ڕەچەڵەکی دەکەین لەگەڵ پێناسە جیاجیاکانی لە لایەن ئەو مەدرەسانە، ئینجا ئەو پێناسە هەڵدەبژێرین کە هەم ڕاستەقینەشە هەم ناسنامەی چەمکەکەیەو لەگەڵ ڕەوتی میللەتو ئینتیمای شارستانیشمان بگونجێ بە گشتیەکەی، ئینجا وەك هەموو میللەتان ئێمەش بەرگێکی کوردستانی تایبەتی لەبەر دەکەین جاری.. تا ڕادەی مومکین کە هاوسەنگیەکانی چەمکەکەش تێك ناچێ.

ئێستا بێجگە لە (زاراوەی زانستی) زۆربەی شێوازی چەمکی وەرگرتووە، بەڵام

---

* ئەوە خشتەکێکی بەراووردە کە چۆن لە هەمان زاراوەدا دوو واتای جیای هەیە لە نێوان داگیرکەر و زل هێزو دنیا خۆران لە لایەك و، لە لایەکی تر لە لایەن میللەتانی ژێر دەستە و ڕزگاری خوازانەوە:

| لە ڕوانگەی میللەتان | لە ڕوانگەی داگیرکەران |
| --- | --- |
| خەبات | تخریب |
| شۆڕش | عصیان |
| چالاکی | تیرۆر |
| وەلاء | خیانەت |
| حزبایەتی | عمالة |
| خیانەت و جاشایەتی | خدمة الوطن |
| نیشتیمانی | خارج القانون |
| پابەندی | تمرد |
| کوردستان | شمال العراق |
| کوسۆڤا | کوسوفو (سربی) |

بەهەمان شێوەش دەبێ بزانین ئێمە کامەی بەکار دەهێنین مرۆڤ یان ئادەمیزاد ...

ئێمە لێرەدا وەك (ڕێکەوتن) بەوانە دەڵێین (زاراوە) کە زۆر کاریگەری مەنهەجی نەبێت، هەڵبەتە زاراوە و چەمك بەوپێ یە زۆر لێك جیا دەبن، ئێمە لە هەموو بەشەکانی داهاتوو زاراوەکان بە کورتی دەنووسینەوە زیاتر بۆ زانیاری و لە خزمەت پرۆژەی چەمکەکانە، بەڵام چەمکەکان شتێك درێژتر و بە مشت و مڕەوە باس دەکەین.

بەو شێوەیە چەمکەکانیش دابەش دەکەین بەپێی پەیوەندیان بە سیاسەتەوە لە بیری سیاسی، فیکری، دەروون ناسی، فەلسەفی، ئابووری، ئاینی، .. هەر چەندە لە عەولەمەدا ئەو بەشانەش ئەو سەربەخۆییانەیان نامێنێ‌و تێك دەچرژێن، بۆیە هەرلایەو دەتوانێ لە قازانجی خۆی بەکاری بهێنێ یان خواری بکاتەوە.

تێبینی: لەوفەرهەنگەدا دەبێ زۆرترین مانا لە کەمترین ڕستەو وشەدا کۆبکرێتەوە،ئەوەش مانای زاراوە دەبەخشێ کە یەکەم جار لە فەرهەنگی ئاینی هاتووە دوایش لە فلسفە ،لە سەردەمی 'بانگی ئیسلام لەفەرموودەو ماناکانیش ناوی بە(جوامع الکلمە) هاتووە ،لە سەر ئەو بنچینەیە (مفردات القران) هاتووە لەلایەن ئەسفەهانی،هەلبەتە زمانی پێش کەوتوو ودەولەمەند ئەوەیە بتوانێ زاراوەو چەمك بەیەك ووشەیسادە دەر ببڕێ ،ئەگەر بووە ووشەی لێکدراو ئەوە پلەیەك لەپاشترە خۆ ئەگەر بووە ڕستەیەك ئەوەزمانێکی دەست کورتە یاخود پسپۆڕەکانی شارەزا نین ،لە هەموویدا مەبەست ئەوەیە بەکەم ترین ووشەو ڕستە زۆر ترین مانا ببەخشێ، ئێمەش زۆر کورت و خەستمان کردووەتەوە، تا قەبارەیەکی بچووك هەڵگرێ، بۆیە تکا وایە زۆر لەسەرخۆو بەسەرنجەوە بخوێنرێتەوە، ئەگینا وشك‌و ڕەکیك دێتە پێش چاوو مێشك.

# بەشی یەکەم

## چەمکەکانی بیری سیاسی

لەو بەشە زیاتر باسی چەمکەکانی سیاسی پەتی دەکەین بە تەدریسی (بیری سیاسی) لە بەشەکانی تر باسی چەمکەکانی ئایدیولۆژی سیاسی و فەلسەفەی سیاسی وزانستی سیاسی دەکەین

## (١)

# رامیـــاری سیاســـەت Policy

کۆن ترین زاراوەیە، بە جمکی لەگـەڵ ئـادەمیزاد هـاتووە ئەگـەر بـەو نـاوەش نەبووبێت، بۆیە پێناسەکەشی فرەجۆری وەرگرتـووە، بـەڵام هـەر هـەمووی کـۆك دەبنەوە لە مانای: (بەڕێوەبردنێکی دانایانـەی کاروبـاری تـاك و کۆمـەڵ)، هـەتا راپەڕاندنی ئیش و کاری خێزان و هـۆز و بـرا گەورایـەتیش هـەر بـە سیاسـەتیان ناوبردووە، هەڵبەتە هـەموو ئـەو زاراوە و چـەمکانە سـەرچـاوەکەی پەیامـە کـە کەوتۆتە ناو کۆمەڵ، ئینجا گۆڕان و خلْت و خاری بەشەری دەکەوێتە سەر، با وەرە بینەوە لە بنەچەی ئەو دوو سـەرچاوەیەی رۆژئاوایی (ئەغریقی-یۆنانی) و ئـاینیش (ئیـسلامی) بـزانین کامیـان ڕەسـەن تـرە، سیاسـەت لـە رۆژئـاوا گوایـە لـە (politique)ی فەرەنـسیەکەیە هـاتووە، ئـەویش لـە بنەچـەدا لـە ئـەغریقی و یۆنانیەکە هاتووەو ئەرستو بەکاری هێناوە، کە لە دوو وشەی لێکدراوی (polis- شار) و (tehem - بەڕێوەبەر)هاتووە ، واتە بەڕێوە بردنـی شـار، لـە سـەدەکانی دوای (١٣) فەرەنسا وای بەکارهێناوە[١]، ئەوەش لە پێناسەکەی سەرەوەی سیاسـەت ئەوەنـدە نزیـك نیـە[٥]، لەڕاسـتیدا کۆمـەڵێك وشـەی یۆنـانی کـۆن بـۆ چـاوگی (politque) دەنوسـرێتەوە، لەوانـە (polis، politeicl، teipolitica،

---

[١] بۆ زیاتر بڕوانە (علم السیاسة) د.حسن صعب، ل٢٠.

[٥] لە راستیدا هەڵەیەك زۆر باوو بووە لە ئەنجامی هەڵەی تەرجەمەی عەرەبی بۆ هەریەکە لە repoplic بۆ جمهوریە، politiic بۆ سیاسەت، ئێمەش لە سەر ئەو هەڵەیە ڕۆیشتووین، کەچی ریپۆبلیك مانای (أشیاء عامة) دێ نەك جمهوری، ئەوەش دەقاودەق ماناو پێناسی سیاسەتە کە بریتیە لە مەسایلە گشتیەکان، پۆلیتیکیش مانای مەدەنیەتە، بۆیە راستیەکەی ئەوەیە ئەفلاتوونە باسی سیاسەتی کردووە نەك ئەرستۆ، ئەوەی ئەرستۆ باسی مەدەنیەتە .

epolitike، ..) زۆربەیان بەمانای شار و گۆڕەپانی کۆبوونەوەی خەڵکی هاتووە، بۆیە زیاتر politque لە (مەدنیەت) نزیکترە نەك سیاسەت هەروەك لە مەبەستەکانی ئەرستوش لێی وادەردەکەوێ، بۆیە جاران تەرجەمەی (رسالة فی السیاسة)ی ئەرستۆ بە مەدەنیەت هاتووە نەك سیاسەت، چونکە لەو کتێبەش کە باس لە (خێزان- شار- دەوڵەت) دەکا زیاتر ئەو ڕەوتە وەردەگرێ ، ڕەنگە ( re -(poplice)ی ئەفلاتوون کەبە "جمهوري" وەرگێڕدراوەتە سەر عەرەبی )نزیك تر بێ لەسیاسەت ، ڕابێتیەکەی ئەوەیە (goverm) زیاتر مانای سیاسەتە، کە بە مانای (حکومەت)یش دێت و لێك نزیکن، ئەوەش زاراوەیەکی کۆن نیە .

پێناسی کۆنی ئیسلامی و ئاینی وا هاتووە: هەر دەقی وشەی سیاسەت لەو فەرموودە بەناوبانگە هەیە (کان بنو إسرائیل یسوسهم أنبیاءهم)، واتە ئیش و کاریان ڕادەپەڕاندن، هەر لەسەر وشەی (سیاسەت) (إبن یوسف عامری) دەڵێ: (والعرب تقول ساس فلان دابته إذا قام بصلاحها و راضها). لە (لسان العرب) سوس بەمانای سەرۆکایەتی یان (..والسیاسة هي قیام بالأمر بما یصلحه).

سیاسەت لە ئیسلامدا نزیکە لە مانای حوکم هەروەك (معجم الحدیث للتحلیل السیاسي)یش وای نەقل کردووە، زۆربەی فەرهەنگەکانی ئەورووپیش وەك (قاموس المحیط)ناسا بە (علم الدولة) تۆماریان کردووە، بۆیە ئیسوەی ئایەتەکانی قورئانی یش لەسەر حوکم و سیاسەتە، چ ڕاستەوخۆ چ لە (مقاصد الشریعة)دا، هەر پێناسی قورئان لە فەرموودەدا وا هاتووە: (أنباء عن قبلکم وأخبار من بعدکم و حکم فیما بینکم)، ئینجا بەشێکیشە لە ڕەوشت و ئیسلاح هەروەك لە کتێبەکانی (العین السیاسة)، (تعریفات جرجاني)، (إبن تیمیة-سیاسة الشرعیة)..هاتوون .

هەموو ئەو پێناسە کۆنانە (د.محمد عمارة) کورتی کردۆتەوە لە: (هەرچی کردارێك کە بێتە چاکسازی و دورخستنەوە لە فەساد-سیاسەتە)[1].. ئەوەش هەمان دارشتنەوەی (ابن عقیل)ە لە سیاسەت کە دەڵێ: (السیاسة ماکان فعلا

[1] د. محمد عمارە- المرکة المصطلحات ل١٧٨.

(١) رابەری سیاسەت Policy،

يكون مع الناس أقرب الى الصلاح وأبعد عن الفساد، وان لم يضعه الرسول ولا نزل به وحي..).[1]

بەو شێوەیە (سیاسەتی) ئیسلامی کەمانای چاکسازی گشتی وەردەگرێ و(Politice)ی ئەغریقی کە دەکاتە (بەڕێوەبەری شار) لە ڕێگەی ئەندەلوس لێك گیر بووینە و ئەو سیاسەتەی ئێستای لێ دەرچووە، زۆربەی فەرهەنگە جیهانیەکان مەبەست ومانا گشتیەکەیان وا نەقل کردووە :(تحقيق أكبر قدر من السعادة لأعظم عدد من الناس)، واتە: بەرژەوەندی گشتی، ئەوەش هەمان پێناسی ئیسلامیە (نەك پۆلیسی شار) کە ئەگەر بمانەوێ مانایەکی بۆ (بەڕێوەبردن) بتاشین بە مانای (ڕاپەڕاندن)ە[2]، بەو شێوەیە زۆربەی زاراوە و چەمکە پێویستەکان بنەچەکەی ئاینیە هەروەك (ئەلەکزەندەر گەریوفسکی)یش دەڵێ: (کۆنترین سەرچاوە کە لەسەر سیاسەتی نوسیبێتەوە ئاینە)[3]، ئیتر لە ئەوروپا تەقەلایان داوە ئەسڵێکی لە کەلتووری خۆیان بۆ بدۆزنەوە و کتێبەکەی (السياسة)ی ئەرستۆ بە دامەزرێنەری سیاسەت دەزانن، ئەگینا کەی (پۆلیس و شار) و سیاسەت دەگەڕێنەوە سەر یەك دایك و باوك.

ئەوە پێشەکیەك بوو بۆ سیاسەت کە زاراوەیەکە وا دەردەکەوێ دوورە لە ئاین و نزیکە لە عەلمانیەت و فکری بەشەری رووت کەچی ئەوە دۆخی ڕەچەڵەکی بوو، بۆ هەموو زاراوەیەك مەولەتی ئەو قوڵبونەوەیە نیە ٠

جا ئێستا دەگەڕێینەوە سەر ڕەوتی پێناسە جۆربەجۆرەکانی سیاسەت:

---

[1] الطرق الحكمية- ابن قيم الجوزية ص١٧

[2] أ-علم السياسه: صدرالدين قبانجي.

ب-النظم السياسية: د.مشهداني.

[3] کۆن ترین ڕووداوەکانی مێژوو.

## پێناسەکانی سیاسەت:

بە سەدان پێناس هەیە بەڵام هەندێکی هاوبەشی لێ هەڵدەبژێرین:

+ پێناسی کۆنی فەرەنسی کە لە کتێبی (leliver de toutes choses) لەلایەن (برونتۆی لاتینی) نووسراوە بریتیە لە (بەڕێوەبردنی شار) کە نزیکە لە مانا ڕاستەقینەکەی (politiqu)ی ئەرستۆ.

+ هونەر و زانستە.

+ هونەری مومکینە، یان وەك مۆسۆلینی پێناسی کردووە (هونەری وەرگرتنی دەسەڵاتە)[1].

+ (قاموس السیاسي): هونەری بەڕێوەبردنی دەسەڵاتە ،ئەوەش بە هەمان پێناسی ئەرهەنگی (La frand Encyclopedia).

+ زۆر پێناسی تری باو وەك سیاسەت مانای درۆیە، یان هەڵخەڵەتاندن، یان خۆویستی، ..

+ (بحث): هەڵخەڵەتاندنی خەڵك بە پیلان بۆ گەیشتن بە پایەك.

+ (فەرهەنگی لیتریە- فرنسی ١٨٨٠) : سیاسەت مانای زانستی دەسەڵاتە، پێشووتر لە (١٨٧٠) بە کەمێك جیاوازی تری پێناسی کردبوو بە (زانستی فەرمانڕەوای دەوڵەت)، هەر مانای (govern)یش بە سیاسەت هاتووە.

+ (فەرهەنگی ویبەر ١٩٦٢) : هونەری فەرمانڕەوای کۆمەڵگەی سرۆشتیە.

+(دوفرجیە- أحزاب السیاسی): زانستێکی دەسەڵاتی ڕێك و پێکە لەناو هەموو کۆمەڵەکان .

+ ئەنثرۆپۆلۆجیەکان: بە هەموو چالاکیەکی ناو سیستەمی کۆمەڵایەتی دەوترێ سیاسەت .

+ بەدی هێنانی زیاترین بەختەوەری بۆ زۆرترین کەس، پێناسی ڕەسمی

[1] الامیر: لە پێشەکیەکەی بە پێنوسی (مۆسۆلینی).

(١) رامیـــاری      سیاســـەت      Policy

مەنهەجی-هەتا لە (ئەمیر)یش دانی بەو پێناسە هێنراوە. (هەرچەندە ئەوە پێناس نیە ئەوە ئاماجی سیاسەتە- م.ع)

+ (مقدمة في انثرۆپۆلوجیا الاجتماعیة) : بەرنامەی دەسەڵاتە بۆ بەرگری کردن لە کۆمەڵگە .

## پێناسی ئیسلامیەکانی کۆن و نوێ:

+ سیاسەت ئەوەیە باری خەڵکی چاك و پتەو بکرێت (العین السیاسة).

+ پێناسێکی گشتی نوێ و کۆنی کە لە لایەن زانایانی نوێی وەك (د.محمد عمارە، د.ترابی[1]، د.قرزاوی..[2]) هاتووە، (هەرچی کردارێك کە خەڵکی پاڵبدا بەرەو چاکە لە دژی خراپە سیاسەتە).

+ لە (تعریفات-جرجانی) هاتووە کە (ئیمامەت) مانای دنیا و قیامەتە و دەڵێ (الامام: هو الذي لە الرئاسة في الدین و الدنیا جمیعاً). (ماوەردی)یش لەبارەی (عقد الامامە) هەمان ڕاستی دەڵێ (موضوع الخلافة النبوة في حراسة الدین وسیاسة الدنیا).[3]

+ پێناسی مارکسیەتیش: سیاسەت تەنها توخمێکی ئاساییە لەسەرخان و، کە ژێرخانە ئابووری یەکان هەڵی دەسوورێنن.

+ بەڵام ئێستا پێناسی باوی سیاسەت میکافیلیانەیە لە جەوهەردا و بریتیە لە (هونەری گەیشتن و مانەوە لە دەسەڵات).

بەو شێوەیە سیاسەت زۆر جۆرە پێناسی جیاجیا و ئیجابی و نیمچە سەلبی بۆ دارشتراوە، واتایەکی فراوانی هەیە، پەیوەندی بە زانستی کۆمەڵایەتی و ئابووری و نیشتیمانی و مێژوویی و دەروون ناسی و زانستی دیپلۆماسی و جیهانی..

---

[1] بۆ زیاتر سەرنج بدە المصطلحات السیاسیة- د.ترابي.

[2] السیاسة الشرعیة- د.قرزاوی.

[3] الأحکام السلطانیة والولایات الدینیة- ل٥

هەیە، هەتا پەیوەندی سیاسەت و ئابووریش نویّ نیە هەروەك زانایـانی ئـەورووپی بۆ (ئادم سمث، ۱۷۲۳-۱۷۹۰) دەگێڕنەوە، ئەخێر ئـەوە هـەر ئـەو دەردە بـاوەی ئەورووپچیایەتیە کە هەردەم ویستویانە یەکەم دۆزەرەوەژمارە پێرانەییەکان، یەکەم بەکارهێنان.. بۆ کەلتووری زانستی ئەورووپای بگێڕنەوە کە ئەوان خۆ بە سـوپەرمان دەزانن و خەلکی تریش (لۆیـەرمان)!، ئەگـەر تێبینـی بکرێـت لـە پێناسـەکانی سـەروو دەبینین پێناسـە کۆنەکانی ئیسلامی‌و نا ئیسلامیش بە ئیجابی سیاسەتیان نووسیتەوە، بەرەبەرە فکری بەشەری بە سەلبی روانیتیە سیاسـەت و ویستوریەتی لە رەوشت و ئاین جیای بکاتەوە، چونکە لە زۆربەی کتێبە کۆنەکان سیاسـەت لـە بەشی رەوشت دەنووسرایەوە نەك هەر پێناسـەکانی ئیـسلامی سـەروو، (محمد بـن عبداللە) هەم پێغەمبەر بوو و هەم سەرۆکی سیاسی دەولەتی ئیـسلامی بوو، دوای ئەویش خولەفای راشیدین، .. ئەو زانایانەش لە دوای ئـەوان کـە بـە خەسـت تـر لەسـەر سیاسەتیان نووسیە لەسەر هەمـان رەوتی رەوشت و مەبادیئو و بەهای بـالاّ وەك: (فارابی، ماوردی، إبن تیمیە، إبن قیم، غزالی، أبن خلدون، ..) تا دەگاتـە جمـال الـدین و حـسن بنـا و مـودودی و نـەدوی،خمینی، .. لـە کوردسـتانیش: بەدلیسی، سەعید نوورەسی، مەلا مستەفا، محمد شارەزووری، عثمـان عبدالعزیز، علی باپیر.

بە هەمان رەوتی تەریبیشەوە زانایانی جیهانی عەلمانی بـە سـەلبی و ئیجـابی لەسـەر سیاسـەتیان نووسـیوە: (ئـەفلاتوون، ئەرسـتۆ، کۆنفۆشـیوس، شیـشرۆن، ئەکوینی، ئوگستین، میکاڤیلی، هۆبز، رۆسۆ، لۆك، مونتسیکو، کانـت، هیجـل، مارکس، ئەنجلس، لینین، بنتام، سپسینۆزا، جمـال عبدالناصـر، شـبلی عیـسمی، مشیل عفلق، صدام حسین، ..)، لە کوردستانیش: د.عبـداللە جـودت، ئیـسحاق سکوتلی، رفیق حلمی، إبراهیم أحمد، جلال تالەبانی، مسعود بارزانی، ..

ئەو دوو بەرە مێژوویـیـە تـا دەگاتـە میکـاڤیلی (۱٤٦۹-۱٥۲۷) ئنجـا بـە راستەوخۆ ترو بێ پەردە دێتە سەر پێناسەکانی سەلبی سیاسەت و لـە رەوشـت و

(١) رەبــــاری ـــــ سیاســـەت ـــــ Policy

مەبادیئو بەهاو مرۆڤایەتی جیا دەکاتەوە و بەهەڵ قۆستنەوە و ڕفاندن و شەڕە دەسەڵات و بە هەرچی ئامرازێك بێت بگەیت بە مەبەست.. (الغاية تبرر الوسيلة) قاوغرێژی دەکا.

## ڕاڕەوی میکاڤیلی:

نیقۆلا میکاڤیلی لە ساڵی ١٤٦٩ لە ئیتاڵیا لە دایك بووە، لە ساڵی ١٥٢٧ مردووە، خاوەنی کتێبی بەناوبانگی (ئەمیر - the prince) و (طروحات) (فن الحروب)، ( تأريخ فلۆرنسا)یە ، ناوبانگێکی خراپی هەیە لە باردی ڕاڕەوەی سیاسەت، هەرچەندە بەشێکی تریش بەجۆرێکی جیاتر بۆی دەچن، هەر لەو کاتیش ئەو نووسینانەی لە خزمەت دەسەڵاتدارە دیکتاتۆرەکان نووسیوە کە چۆن پارێزگاری لە دەسەڵات بکەن و خەڵکی هەڵخەڵەتێنن، تا ئەو دواییەش نووسینەکانی لە گەلێ شوێن قەدەغە بوون، تیۆرە سیاسیەکانی خۆویستانە لە رەوشت و مەبادیئی جیاکردەوە، تا ئەو بەشە سیاسەتەیە خەڵکی ئاوی لێ ناوە (سیاسەت مانای درۆ و بادانەوە و هەڵخەڵەتاندن)، ئەوەش هەمان پێناس (سمت)ە بۆ سیاسەت کە ئێستا باوترین پێناسە، لە پرۆتۆکۆلی (١)ی حکماء صهیون هاتوو: (الحاكم المقيد بالاخلاق ليس بسياسي البارع) ئەوانە پێناس و بنەمای سیاسەتی ڕێبازی میکاڤیلیە کە ڕاڕەوی زۆربەی عەلمانیەکانە (نەك هەموو سیاسەت)، لە ڕاستیشدا زانایان و ئەنسرۆپۆلۆجیەکان بەچەوتی ڕاڕەوەی (میکاڤیلی) بە (مؤسس فكر السياسي الحديث) حیساب دەکەن، هەرچەندە هەندێ لایەنی زانستیش لە میکاڤیلی بەدی دەکرێ، بەڵام ئەو ڕاڕەوە تەنها مەرجعیەتی عەلمانیەتی نوێ ی ڕۆژئاوایە ، نەك هەموو سیاسەت وە نە هەموو عەلمانیەتیش، هەتا لە بوهاری شیوعیەتیش بەسەر ئەوانیدا پەیڕەو نەدەبوو، بزوتنەوەی شیوعیەتیش خاوەن مەبادیئو، ئەگۆر و ئامانجی سیاسی داهاتوو بوو، بەڵام هەر ئەسڵی پێناسی (مارکسی) بۆ سیاسەتمەدار کە بەستویەتەوە بە بازاڕ و

(١) ڕەمبـــاری سیاســـەت Policy

باری ئابووری وەك ئەنجلس دەڵێ تەماشای سەر و کەللە و ئینتیمای سیاسی تاك مەکەن، تەماشای بازاڕ و باری ئابوورییەکەی بکەن.. واتە بە کورتی لە مارکسیەت دا دان بەوە نانێ کە سیاسەت مەبادیئی سەربەخۆیە بەڵکو ئەویش دەداتە پاڵ مادە، ئەوەش لە کۆتاییدا سیاسەتمەدارێکی بەرژەوەند پەرست و هەلپەرست و بێ مەبادیئت بۆ دروست دەکا هەر وەك دەبینین لە دوای شکستی شیوعیەت، ئێستا بە خێراییەکی زۆر ئەوانیش بەرەو ئەو ڕاڕەوەن، دەتوانین بزوتنەوە خاوەن مەبادیئەکان جیابکەینەوە لە ڕاڕەوەی میکاڤیلی، باقیەکەی تر وەسفی (مؤسس الفكر السياسي الحديث) هەڵدەگرێ نەك هەموو لایەك، ئێستاش بزوتنەوە ئیسلامیەکانو دیموکراسیو دڵسۆزانی سیاسی تریش هەن کە لەسەر ڕاڕەوەی مکاڤیلی نین، دەتوانین لیستێکی بەراورد بکەین لە نێوان سیاسەتی ڕەواو سیاسەتی میکاڤیلی کە بە کورتیەکەی ئێستا دوو پێناسی دژ بەیەکی سەرەکی هەیە:

١-سیاسەتی ڕەوا: بریتیە لە (ئیسلاح+ بیناکردن+ مەبادیئی+ .. بۆ مەبەستی گشتی).

٢-سیاسەتی میکاڤیلی: بریتیە لە (درۆ و هەڵخەڵەتاندن و خۆ گۆڕین بۆ مەبەستی تایبەتی).

لە ڕاستیدا ڕاڕەوەی میکاڤیلی وەك ناو نوێیە بەڵام وەك ناوەڕۆك کۆنە، دەتوانین ڕەگ و ریشەی لە کتێبەکانی ئەرستۆوش بدۆزینەوە، هەموو ئەو فەیلەسوف و زاناو (وعاظ السلاطين)و کەلتووری ئەو سەردەمەی کە لە خزمەتی دەسەڵاتە ئیمپراتۆر و سیستەمە نەفامەکان بوونە میکاڤیلین، بەسەر دەسەڵاتیان دا هەڵگرتووە بەرامبەر برێك درهەم، لە دژی سیاسەت و دەسەڵاتێکی مەبادیئانەو ڕەوشتیانەی پێغەمبەرەکان و ڕاڕەوەکانیان، سەرنج بدە (ابن سيناء) لە (رسائل) وەسفی سیاسەتێکی بە ڕەوشتو خۆنەویست و خزمەتکار دەکا لە بەرامبەر سیاسەتێکی دووڕوویی کە وەسفەکانی دەقا و دەق جووت دەبێت لەگەڵ

(١) رامیــــاری ـــــــ سیاســـەت ـــــــ Policy

سیاسـەتی میکاڤیلیو سیاسـەتی شەرعی، ئیمام شـافیعیش دەڵـێ (لا سیاسـة الا ما وافق الشرع).[١] بە هەمان شێوە (إبـن خلـدون) لـە (مقدمـة) بـاس لـە (خلق السیاسة) دەکا کە بریتیە لە (بەڵێنو ڕاستگۆییو خۆنەویستی و بـەهاناو چـاکەو گۆتـەو کردەیـیو لایـەنگری هـەقو زەحمەتکێـشان،..) (سیاسـی نـەفامی)یـش پێچەوانەکانی ئەوانە، (فارابی)یش لە (کتاب الملة) باسی سیاسەتی نەفامی کردووە کە ئەو سیاسەتەیە بەرژەوەندی تایبەتی دەخاتە سەرووی بەرژەوەندی گشتی.[٢]

ابن القیم الجوزی باس لە (السیاسـة الظالمة) و (الـسیاسة العادلـة) کـردووە لـە (الطـرق الحکمیـة في الـسیاسة الـشرعیة) ل١٠، دەقەکـەی : (فـإن سیاسـة نوعـا: سیاسة ظالمة فالشریعة تحرمها وسیاسة عادلة فهي مـن الـشریعة). ابـن عقیلـیش دەڵێ: (الـسیاسة ماکـان فعـلا یکـون معـه النـاس اقـرب الي الـصلاح أبعـد عـن الفسـاد).. بەو شێوەیە زانایانی ئیسلامی باسی زانستی سیاسـەتیان کـردووە وەك (أشرف العلم)، بەپێی (قاموس الـسیاسة) (تهـذیب الـسیاسـة- أهـوازي) کـۆنترین کتێبێکی ئیسلامیە کە لەسەر سیاسـەتی نووسـیوە، واتـە ئـەو مـل ملانێیـەی میکاڤیلی سیاسـەتەدارانی ڤیلبازی ئیستا ململانێیەکی کۆنە .

[١] الطرق الحکمیة في السیاسة الشرعیة- ابن القیم الجوزیة- ل١٧.
[٢] بۆ زیاتر سەرنج بدە (الموسوعة المصطلحات العلم الاجتماع و السیاسة).

(۱) ڕامیـــاری سیاســـەت Policy

## لیستێکی جیاوازی نێوان سیاسەتی ڕەواو میکاڤیلی

| سیاسەتی میکاڤیلی- نەفامی | سیاسەتی ڕەوا - زانستی |
|---|---|
| ۱-بێ مەبدەئی و ڕەوشتیە | ۱-مەبادیئی و ڕەوشتیە |
| ۲-سیاسەت مەبەستە و خۆشی تیادایە | ۲-سیاسەت ئامرازە |
| ۳-بێبەڵێنی، درۆ، خیانەت، بێبەزەیی، خۆویستی، دڕندایەتی، خودپەرستی، گۆڕاوی. (الغاية تبرر وسيلة مطلقاً) | ۳-بەڵێن، ڕاستگۆیی، سپاردەیی، بەزەیی، گشت ویستی، خزمەت، مرۆڤایەتی، چەسپاوی. (الغاية لاتبرر الوسيلة في كل الأحوال) |
| ٤-ناکۆکی نێوان گۆتە و کردە | ٤-یەکێتی گۆتە و کردە |
| ٥-بەرژەوەندی تایبەتی | ٥-بەرژەوەندی گشتی |
| ٦-پارچە پارچەیی و بێ متمانەیی | ٦-یەکێتی و متمانە |
| ۷-تێکدان و گوێ پێنەدان و ئانیەت | ۷-پەروەردە و بیناکردن و دامەزراندنی چارەنوس |
| ۸-بەرژەوەندی شەخسی تەرازووە | ۸-ڕاستی تەرازووە |
| ۹-لایەنگیری چینی سەرو و چەوسێنەرانە لە دوای خۆی | ۹-لایەنگیری هەژار و چەوساوەیە |
| ۱۰-لەسەر مەبدەئەکە دەژی | ۱۰-بۆ مەبدەئەکە دەژی |
| ۱۱-هەردەم ئێستای لەگەڵ ڕابووردوو و داهاتووی ناکۆکە | ۱۱-لەگەڵ ڕابووردوو و ئێستا و داهاتوو کۆکە |

تێبینی: ئەوە بەراوردی ڕێبازەکانە، ڕەنگە ئیسلامیش یان خەلیفەش هەبووبێ بەشی دووەمی بەکارهێنابێ، ئەوە کردەوەی تاکە نەک ڕێباز.

(إبن تیمیە)ش لە تەفسیری (مائدە) سیاسەتی ڕاستەوخۆ بەندکردووە بە ئامەنەت و دادگەری، دەڵێ مانای (فهذان اجماع السیاسة العادلة و الولایة الصالحة)[1]. (أ.غزالی)یش لە بابەتی (عدل في السیاسة) دەڵێ: ئەو کاتی (دادگەری سیاسی) دێتە دی چ لە شارێك چ لە ولاتێك، وەك فەرمانەکانی ئەندامانی جەستەمان هەریەکەو بە پێی پسپۆری و تواناو شایستەی (کەفائەتی) بنکەو سەرکردە دروست بکرێت نەك لەسەر بنچینەی چین و ڕەچەڵەك و[2]..

هەتا لە وەسفی سیاسەتی مەدەنیشدا لە فەرهەنگەکانی کۆنی ئیسلامی بە پێکەوە ژیانی کۆمەڵێك خەلکی ڕەچەڵەك جیاجیا و مانای بوونی (هاولاتی-بێ بەستنەوە بە عەقیدە) لەسەر بنچینەی هاوکاری بەرژەوەندی گشتی ناوی هاتووە[3].

بەو شێوەیە سیاسەت لە فکری ئیسلام وەدەولەتی مەدینە پیادە کراوە، لە دوای ئەوانیش لە لایەن خەلیفەکان ولە ڕێگەی نامە و ڕێنماییەکانیان بۆ والیەکان و هەتا ئەو ساتەش هەر لەسەر ڕاڕەوەی سیاسەتی شەرعی دەڕۆن، واتە ئەو سیاسەتە چەوت و فێڵبازو خۆویستی یە هەموو سیاسەت نیەو ئەسڵی سیاسەتیش نیەو (میکافیلی)یش (مؤسس الفکر السیاسي الحدیث)نیە بە گشتی، هەروەك پێناسەکەی (مارکس) (الدین أفیون الشعوب) بۆ هەموو ئایین نیە هەڵەیە تەنها بۆ ئاینی (مەسیحی) نزیکە، بە هەمان شێوەش (میکافیلیەتیش) (مؤسس)ی هەموو سیاسەت نیە، تەنها سیاسەتی عەلمانی نوێیە بە کوردستانیشەوە ،چونکە عەلمانیەتی کوردستانیش بە چەپ و سۆشیالیستی و نەتەوەیی و لیبرالیشەوە وەك عەلمانیەتی عەرەب لە ژێر کاریگەری فیکری مارکس بوون، جا ئێستا (لە کوردستان)یش دوو تەوەری سەلبی پێك گەیشتن،

---

[1] السیاسة الشرعیة.

[2] میزان العمل.

[3] الموسوعة المصطلحات الجامع العلوم، الملقب بـ(دستور العلماء)، مادة -السیاسة المدنیة-.

یەکیان کۆتای خلت و خاری مارکسیەت لەلایەك، لـە لایـەکی ترلایـەنی سـەلبی سیاسەتی رۆژئاوایی کە بریتیە لە تێڕوانین بۆ سیاسەت لـە چوارچـێوەی تـەریتی سـەرمایەداریانە، بە پێی بنەمای (بیکە و وەرگرە take and put)، لە ئەنجامدا سیاسەت و حزبایەتیەکی بێ مەبدەئی و بێڕەوشتی سیاسی لێ دەردەچێ، لەسـەر ئەو بنچینەیەی (بەرژەوەندی تایبەتی) پەیوەندیو یاسـای نێـو دەولـەتی لەسـەر دروست بووە، کە لە کۆتاییدا یەکسـانە بە بەرژەوەندی شەخسـی وێـران کـەر یـان بەرژەوەندی تایبەتی ولآتێك، ئەوەش (سیاسەتی نەفامیە) جا یـا هـەر زانسـت و تەکنۆلۆجیاشـیان گەشەسـەندوو بێـت. بۆیـەش لـە رۆژئـاوا زۆر بـە ئاشـکرا و شەرعیەوە پەیوەندیەکانی سادەو ئالۆز، تاك و کۆ، ناوەکی و دەرەکی، دیپلۆماسی و دۆستایەتی، هەمووی لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی تایبەتە، هەر لـە کۆنـەوەش (ئادم سمث) وتوویـەتی: دادگـەری و بەختـەوەری بـەوە دێتـە دی کـە هەریەکـە بەرژەوەندی تایبەتی بۆ بێتە دی[١]، هەروەها (جۆرج بۆش-باوك) بە ئاشـکرا وتـی مەبادیئی میللەت نابێت ناکۆك بێـت لەگـەڵ بەرژەوەندیـەکانی، بۆیـەش ئێسـتا سەرانـەری عەلمانیەت بە سۆشیالیستی و چەپی و نەتەوەی و لیبڕالیەوە پـەیڕەوی رێبـازی میکـافیلی دەکـەن، هـەمووی بەڕاشـکاوانەتر دەڵـێن (خـۆ سیاسـەت دەزگایەکی خەیری نیـە! ئـەویش بـەدوای بەرژەوەندیـە، بۆیـە هـیچ مـەرجێکی مەبدەئی و رەوشتی سیاسی تیا نیە و باسیشی ناکرێ هەتا لـە راپـۆرتی سیاسـی کۆنگرەکان و راگەیاندن و هەڵس و کەوت و.. تـا لێـرەدا پێناسـی سیاسـەت لـە کوردسـتانیش وا بـاوی وەرگرتـووە بـە مانـای: (درۆ و پـێچ و پـەنا و هونـەری هەڵخەڵەتاندن و خۆ ویستی و کۆشك و تەلارو گـوێ نەدانـە سـەواییت و لێڵـی و ئەوبەر ئەوبەر کردن و بێ ئۆقرەیی و بێ ئەمەکی و هەڵپەرستی و.. لێرەوە (سـید القوم..) نەك (خادمهم) بەڵکو دەبێ (قوم) خـادمی سیاسـەتمەدار بێـت، ئـەوەش لە؟ دستان چاك پەیرەو کراوەبە پێی رارەوی میکافیلی کە لەسەر سیاسەت بژین

[١] ثروة الامم -(أدم سمث).

پێچەوانەی ڕێبازی شەرعی و مەبدەئی بۆی دەڕۆی .

تێبینی: رامیاری کوردیش مانای (مەکربازی)یە.[١] واتـە ئـەو زمـان زانـەی رامیاری بەرامبەر سیاسە داناوە بـە ڕوانگەیـەکی مکاڤیلیانـە هـەڵی بـژاردووە. (ڕامی + یار) (مەکریار).

## ئاین و سیاسەت:

زۆر ڕای چەوت باوی وەرگرتووە، ئێـستا خـەڵکی بەگـشتی و بەشـێکی زۆری ڕەوشەنبیریش لە ئەنجامی ئەو ڕەفتارە سیاسیە میکافیلیانە، یەکسەر ئەو پێناسە بۆ سیاسەت (تەعمیم) دەکەن و دەڵێن (سیاسەت مانـای درۆیـە)، بۆیـەش هـەر یەکێك بە فروفێڵ و نۆین باز بێت بۆ مەرامە تایبەتیەکانی خـۆی ج لـە دێیـەکی بچووك یان لە ولاتێك یان لە جهان ئەوا پێی دەڵێن چەندە سـیاسـیە بۆ خـۆی، لـە بیرەوەریەکانی شا جۆرجی بەریتانی هاتووە کاتێ بینی لەسەر گۆڕێك نووسـرا بوو: ئەوە گۆڕی سـیاسـەتمەداری ڕاستگۆ (فلانی کوڕی فلانە)، شـا جـۆرج وتـی: سـەرم سوڕ ماوە چۆن دوو کەس لەیەك گۆڕ شاردراونەوە؟ دەسـت و پێوەنـدەکانیش بـێ ئەوەی یەك لەسەر یەك بوەستن (وەك ئێستا ئاسا) پێ یان وت: قوربان یەك گۆڕەو یەك کەسە.. گوتی ئەخێر سیاسەتمەدارێکە و ڕاسـت گۆیەکیـشە (واتـە دوو)!، .. واتە سـیاسـەتمەدار و ڕاسـت گۆ یەك نین، ئـەوەیان مێـژووی سـیاسـی عەلمانیەتـە، ئێـستاش چاکترین پەیڕەوکـەری ئـەو بیرەوەریـەن، ئـیتر پێناسـەکانی عەلمانیـەت ومیکاڤیلی- دامەزرێنەری فیکری سیاسی هاوچەرخ- هـەمووی لەگـەڵ وتەکـەی (شا جۆرج) یەك ماناو ماهیەتە.. بەڵام ئینجا ئەخێر، هـەموو سیاسـەت وانیـە، دیارە سیاسەتیش وەك هـەموو بـەش و بەرهەمـەکانی مرۆڤ لایـەنی سـەلبی و ئیجابی هەیە، بۆیە سیاسـەتی میکـاڤیلی بەشـێکە لـە سیاسـەتی سـەلبی نـەك

---

[١] بڕوانە فەرهەنگی کوردستان- گیوی ل٤٨٠.

هەموو سیاسەت، بەڵام هەر کاتێ مدرسەکانی عەلمانیەت دەسەڵاتدار بێت ئەوا پێناس و هەڵسوکەوتی ڕێبازی میکاڤیلی و خۆویستی باو وەردەگرێ، هەر بۆیەش دەبینین لەو سەردەمە بە چاوێکی ڕێزەوە سەیری سیاسەت و سیاسەتمەدار ناکرێ، شەرمی پێ یە بڵێت من سیاسەتمەدارم، زۆر ئاسایە بڵێ من فەرمانبەرم یان کرێکارم.. بەڵام زۆر بە خێرایی دەڵێ من سیاسی نیم، یان لەسەر دوکان دەنوسرێ باسی (قەرز) و (سیاسەت) مەکە، هەتا بەڕای بەشێک لە لێکۆڵەرەوەکان ئەوەیلانە لەسەر سیاسەتیش، تەنانەت هەندێ حزب و لایەنی دەسەڵاتی سیاسی کار بۆ هەڵوەشاندنەوەی خودی (سیاسەت) دەکەن، جا ئەو دوخە وای لە خەڵکی عەوام و هەندێ نیمچە زانای ئیسلامی و (هەندێ زانایانی ئاینی تر کە شەریعەتیان نیە) ڕەوشەنبیرانی عەلمانیش کردووە کە هەموو پێکەوە بگەنە ئەنجامێکی هەنە و حوکم لەسەر سیاسەت بەگشتی بە سەلبی بدەن و لێی دوورکەونەوە، تەنانەت ڕارەوەی شیعەش هەتا پێش شۆڕشی ئیسلامی ئێرانیش لە ١٩٧٩ دوورکەوتبوونەوە لە سیاسەت، شۆڕش و دەوڵەتیان بۆ ئیمامی زەمان هەڵگرتبوو، هەندێکی تر زیاترلەوەش وتوویانە (أعوذ بالله من الشیطان و السیاسة)، ڕەنگە بێ ویستی خۆیان خزمەتێکی مۆڕاییان بە مەبەستی عەلمانیەت کردووە بۆ دوور خستنەوەی ئاین لە سیاسەت، هەروەك شوبلی عیسەمی دەڵێ: (زانا و پیاوانێکی ئاینی هەن کە زۆر لە ئیسلام قووڵ نابنەوە خزمەتی مەبەستەکانی عەلمانی دەکەن کە پێیان وایە ئاین تەنیا بۆ کاری شەخسی بێت و دوور لە سیاسەت)[1]، بەپێچەوانەی زانایانی کۆن کە سیاسەتیان بە (أشرف العلم) وەسف کردبوو، ئەو شەپۆلە زیاتر لە ئەورووپاوە لە دوای داڕمانی خەلافەت لە ساڵی ١٩٢٤ هات، بەکارهێنانی ئاین لەوێ بۆ سیاسەتێکی دڕندە کە تا ڕادەی (مافی شاهانە- Divine right at the king)[2] ناو دەبرا، لەوێ لەبەر

---

١ العلمانية و الدولة الدينية-شبلي عيسمى ص٧٧.

٢ موسوعة العلوم السياسية.

نوقستانی بەرنامەی سیاسی ئاینی مەسیحی (هەروەك سپنوزا، تالیدان، گاردینی دەڵێن: ئاینی مەسیحی بێ شەریعەتە)[1]، بووە هۆی وەستانی کۆمەڵگە لە پێش کەوتن و داهێنان و دادگەری و عەقڵانەتیش.. بەڵام بە سیاسی کردنی ئیسلام مانای ڕاست کردنەوەی ئیسلامی ڕاستەقینەیە، دەبێتە هۆی پێش کەوتن و دادگەری و بینای کۆمەڵایەتی و سەربەستی و.. ئەو دۆخە ئاسمان و ڕێسمانی فەرقە، کەچی ئەو شەپۆلە لە دوای دارمانی خەلافەت گەیشتە جیهانی ئیسلامی، هەڵس و کەوتی هەندێ خەلیفەو دام و دەزگاکانیان زەمینەیان زیاتر سازدا، هەندێ نیمچە زانای ئیسلامیشی هاتنە سەر هەمان ڕای (پاپا)یەکان و بەتایبەتی قەشە (ولیام ئامیل)ی ئینگلیزی کە وتەیەکی بەناوبانگی هەبوو وتبووی: (چەندە هەڵەیە ئەگەر واتێ بگەین خوا بە تەنها ئەو بوونەوەرە بەڕێوە دەبا)، لە وانە (شێخ علی عبدالرزاق) (قازی شەرعی)ی ئەزهەریش بوو، لە ساڵی ١٩٢٥ کتێبێکی نووسی بەناوی (الاسلام و أصول الحکم)، تیایدا هەندێ ڕاو بۆچونی دەگمەنی تیادا بوو، وەك ئەوەی (ئیسلام تەنها ئاینی گیانە نەك دەوڵەت، پەیامی محمد هەرگیز دەوڵەت و حکومەتی تیا نەبووە) ل٦٤-٦٥، هەندێ ڕای وا پەیدابوو، یەکێکی تریش بەناوی (خالد محمد خالد) هەر لە میسر کتێبێکی بە هەمان ناوەڕۆك نووسیەوە بە ناوی (من هنا نبدأ).. بەڵام کە چاکتر لە ئیسلام گەیشت هەر خۆی گەڕایەوە و کتێبێکی تری بەناوی (الدولة في الاسلام) دانا، ئەوانە هەر لە خزمەتی بیر و بۆچوونی عەلمانیەت نیە، بەڵکو ئیمپریالیزمی جیهانیش بە ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایەوە ئەوەیان مەبەستە بۆ دەرکێشانی گیانی بەرگری ئیشتیمانی، هەر بۆیەش لەگەل داگیرکردنی کوردستان ودروست بوونی مەینەتی کورد دروشمی جیا کردنەوەی ئاین لە سیاسەت هاتووە، یەکەم جار ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی)کەلەلایەن بریتانیاوەدەردەچوولەدوای ١٩١٨-

---

[1] هەرکەسێ ئینجیل بخوێنێتەوە ئەو ڕاستیەی بۆدەردەکەوێ، سەرەڕای ئەوەش لە (جدول و الشروح)ی ئینجیل پێناسی دەکا ئالی شریعەتی خوایە دەڵی سیرەی مسیحە.

بانگێشەی (ئـایین شـتێکەو سیاسـەتیش شـتێکی تـرە)ی بـلاو کـردەوە، ئینجـا داگیرکەرەکانی تریش لەهەموان سـەخت تـر دەسـەلاتی بـەعس بـوو سـزاکەی تـا ڕادەی سێدارە بوو، هەروەها هەر لە کاتی خۆشی (میکاڤیلی) و هـەمو ڕاڕەوەی ئێسـتاش زۆر داکۆکی لەسـەر ئەو لێك جیاکردنـەوەی ئـایین و سیاسـەت دەکـەن[١]، لەکۆنەوە دەزگا ماسۆنی و شێوە زایۆنیەکان و هەندێ ڕاڕەوی ئیسلامی نەفامیش یەکیان گرتۆتەوە لە دوورخستنەوەی سیاسەت لە ئایین، لە ئیسلامیەکانیش جـار وابووە لەبەر هۆی ناکۆکی ماندووبوون بێئومێـدی بـە ئـەنجامێك گەیشـتوون وەك (أعوذ بالله من الشيطان والسياسة) کە لەلایەن (شێخ سعید نورسـی) وتـراوە. بەڵام ئەوەی میکاڤیلی و هاوڕایانی مەبەستیانە جیایە، میکاڤیلی و ڕاڕەوەکـەی زیاتر داکۆکی لە دوورخستنەوەی ئـایین دەکـەن، لەبـەر هۆیـەکی سـادە، ئەگـەر سیاسـەت ڕەوشت و مەبادیئی بێـت ئـەوا عـەیب و عـار و نەتانیـەتی سیاسـەتە میکاڤیلیەکـە دەردەکـەوێ، بـەو شـێوەیە: ١-نـەزانی، ٢-تـەوژمی شکسـتی خەلافەت، ٣-هەڵمەتی عەلمانیەتی جیهان* لەسەدەی (٢٠)...، تا ڕادەیەکی چاك توانرا ئیسلام لە سیاسەت و ژیانیشدا جیا بکرێتەوە، تا ئەو ڕادە لـە دەسـتووری (حزبی بەعسی-١٩٤٧ ) مادەی (٣) تۆمار کرا: (تاکە پێك بەستنێك لـەناو دوو وڵاتی عەرەب دەبێت تەنیا نەتەوەیی بێت، هەموو بەستنەوەیەکی تـری ئـایینی و مەزهـەبی دەبـێ لـە ڕەگ و ڕیشـەوە دەرکێشـرێ)، زۆربـەی حزبـە عەلمانیـە نەتەوەییەکان بەو شێوەیە بوون، چەپیەکانیش زۆر خراتر، لە دوای هەموو ئەوانـە دەبینین کار و فرمانی ئـایین سیاسـیە بۆیـە ئـەو تەقەلایانـەی سـەرو هـەمووی شکسـتی هێنا و ئێستا ئایین و سیاسـەت سـەرتاپای جیهـانی گرتـەوە وەك یـەك شـت، هـەروەها سـەرتاپای بوارەکـانی ژیـانیش لـە کۆمەڵایـەتی، ئـابووری، نیشتیمانی، دپلۆماسـی، سـایکۆلۆجی.. هـەتا تەندروسـتی، نـەك تـەنها لـەناو

---

[١] طروحات، میکاڤیلی.

* ئەوەش لە ئەنجامی لاوازی مەسیحیەت بەرامبەر عەلمانیەت واسەری هەلدا لە ئەوروپا

ئیسلام، لە ناو مەسیحی و یەهودی و هندۆسی و.. بەدەیان حزبی مەسیحی و یەهودی و.. لە کوردستانیش (٣) حیزبی مەسیحی هەیە، هەر بۆیەش لە کۆنگرەی هەزارەیی کە لە هەفتەی کۆتایی مانگی ٢٠٠٢/٨ نیۆیۆرك کە بە هەزاران زانای جیهانی جۆربەجۆری ئەکادیمی و سیاسی و ئەنثرۆپۆلۆجی، .. بەشدار بوون بڕیاریان دا کە ئاین و سیاسەت و دەوڵەت لێك جیا ناکرێتەوە و سەدەی (٢١)یشیان بە سەدەی گەڕانەوەی ئاین پێش بینی کرد، ئێستا هەر سیستەمێك ئاینی بنچینە نەبێت دۆڕاوە، سەرنج بدە نێوان عەرب و ئیسرائیل، عەرەب ئاینی خۆیان بچووك کردۆتەوە و ئیسرائیلیش بە ئاینی خۆی ئیش دەکا، چۆن عەرەب ریسوا و شکست خواردوو و پەرتەوازەن، ئەگەر ئاینەکانی تریش بشێ باس لە جیاکردنەوەیان بکرێت لە سیاسەت و دەوڵەت و ژیان، ئەوا لە ئیسلام بە هیچ جۆرێك ناکرێت، بۆیەش دەبینین ئیسلامیەکان و زانایانی ئیسلامی (کە ئیجماعن) هەتا ئینسکلۆپیدیە گەورەکانیش پێناسی ئاین بە ژیانی سیاسی دەکەن بە نموونە فەرهەنگی (موسوعة العالمیة العربیة ج١٠ ص٥٨٤) کە لە هەناوی (Great Encyclobidia-British) هاتووە لە مانای ئاین دەڵێ: (الدین.. من دان دینا ملکه و حکمه و ساسه و دبره)، هەر لە (معجم الحدیث للتحلیل السیاسي)، دەڵێ: (باسی سیاسەت و حوکم یەکە، لە زانکۆکانی پێشو و ئێستاش بە زانستی سیاسەت دەوترێ (بەشەکانی حوکم)، بەهەمان شێوە فەرهەنگەکانی (لیتریە، دوفرجە -أحزاب السیاسة، معجم الحدیث، موسوع العالمیة، العین السیاسة، تعریفات جرجاني، ئەسڵە یۆنانی و ئەغریقیەکە..)، هەمووی سیاسەت و حوکمیان یەکسان کردووە، مانای حکومەت لە ئینگلیزی مانای سیاسەتە (govern)، بەو شێوەیە مانای وایە نیوەی قورئانی پیرۆز لەسەر سیاسەتە، هەروەها پێغەمبەرەکان سەرۆکی سیاسی میللەتەکەیان بوینە، هەر خودی سروشتی (تومەی ئیسلام) پەیوەندی و پێکهاتەیەکی سیاسیە، ئیتر سیاسەت و ئیسلام وەك سەر و لەشە ئەوەی بیەوێ

ئیسلام لە سیاسەت جیا بکاتەوە ئەوا دەیەوێ ئیسلام سەر بڕێ لە پشتەوە، هەموو زانایان لەسەر سیاسەتیان نووسیە، بەڵام ئەوانەی بە تایبەتی و ڕاستەوخۆ لەسەر ئیسلامیان نووسیە لە وانە (ئەهوازی، إبن تیمیة، أبن قیم، شافیعی، حنفی، أحمد، ئیمامەکانی ئەهل البیت، أبن عقیل، ماوردی، .. زۆری تر)، هەموو ئەوانە ئەو دابەشیەی (نەقل و عەقل)، (سیاسەت و شەریعەت)، (ئاین و دەوڵەت)، (قوانین الارض و قانون السماء)، (أدیان السماویة والارضیة)، (دنیا و قیامەت).. ڕەت کردۆتەوە، هەر بۆیەش هەر هەمووی لە پێناسی (ئیمامە) یان (الخلافة) وا هاتووە: (نیابة عن رسول الله ﷺ في حراسة الدین و سیاسة الدنیا به)[1]، یان وەك (تفتازانی) مەرجی یەکەمی (ئیمامەی) کۆکردۆتەوە لە کۆن و نوێ بە (ان یکون سائسا)[2] چارەسەرێك هەیە کە ڕەنگە بەشی هەموو لایەکی تیا بێت، بۆ چوونی عەلمانی و هەندێ لە عەوامی موسڵمان و ئیتریش کە دەڵێن نابێت ئیسلام تێکەڵی سیاسەت بکرێت، ڕاستە بۆ سیاسەتی میکافیلی، دەبێ ئیسلام لەو جۆرە سیاسەتە دوور بکەوێتەوە، بەڵام ئیسلام و سیاسەتی ئەخلاقی و شەرعی لێك جیا ناکرێتەوە وەك زانایانی ئاینی و ئیسلامیەکان بانگیشەی بۆدەکەن. ئەوەی زیاتر ئەو دەمەتەقێیەی درێژە پێدا هەڵس و کەوتی بەشێك لە ئەزموونی ئیسلامیە نوێیەکانە کە کێشە و ناکۆکی زۆری ناوەکی زیندوو کردەوە لەگەلیدا (أعوذ بالله من الشیطان والسیاسة)شی زیندووکردەوە .

ئەگینا لە ئەسڵدا مەسەلەیەکی عەقیدەیە ئەگەر باوەڕت وابێ قورئان هاتوو مرۆڤ (خلیفە) جێنشینی خوا بێت، ئەوا ئاینەکەشی بەرنامەی سیاسیە، خۆ گەر باوەڕیشت وابوو مرۆڤ بە ڕێکەوت پەڕیتە سەر ئەو زەمینە ئەوە تەواوە هەر مرۆڤ بۆ خۆی چاکتر دەزانی ئیش و کاری خۆی ڕاپەڕێنێ، بەڵام دەبینین عەلمانیەکانیش بە زمانێکی پاڵاو وەڵامی ئەو پرسیارانە نادەنەوە، بۆیە نایانەوێ ئاین تەواو لە سیاسەت جیا بکەنەوە بە تایبەتی لەو سەردەمە، دەیانەوێ لە خزمەتیان بێت،

[1] السیاسة الشرعیة. دقرزاوی ل٣٢. ٢- عقائد النسفي

دەوری سەرباز و خزمەتکاری و پینەچی و چەتر و تایبەتی ئەك سەرکردە و مەرجەعیەت و پێشڕەوی و ڕێ نیشاندەری بێ، بەتایبەتی لە کاتە تەنگانەکانیان ڕوو لە گوتاری ئایینی دەکەنەوە، حزبی بەعس ئەوەندە دژی ئیسلام بوو کەچی لە تەنگاییەکان و لەکاتی هێرشی ئەمریکا هەموو مەبدەئەکانی سۆشیالیستی و نەتەوەگەری لەبیر چوو،بۆوەو تەنها باسی ئیمانی دەکرد... وەك لە بەشی داهاتووە دێینە سەری بەتایبەتی لە (عەلمانیەت) و (ئیسلامی سیاسی).

## کێ ئایین بەکاردێنێ؟

دەنگۆیەکی زۆر دیسان تەقیوەتەوە بەڕووی ئیسلامیەکان لەلایەن عەلمانیەوەو دەڵێن ئێوە ئایین بەکاردەهێنن لەپێناو سیاسەت، هەر ئەو تۆمەتەش بوو لە دەزگای دادگاییەکانی کۆماری تورکی کەمالی لەدژی سەرکردەکانی شۆڕشی کورد (شێخ سەعیدی پیران، مەلا سەلیم، شێخ عبدالسلام بارزانی..) بەکارهاتووە، ئێستاش لەناوەخۆ و دەرەوە بەدەنگ هاتوون.

پرسیارێکی چەمکیە زۆر بەکار دێت بێ ئەوەی تەرازوویەکی دروست بێنن بۆ ساغ کردنەوەی، ئەوەش لە ئەنجامی ئەو لێك جیاکردنەوەیەی ئایین لە سیاسەتەوە دێت، ئەو کێشەیە کەمتر لە وڵاتانی ئاتیسلامی بەدی دەکرێ بەڵکو بەشی هەرە زۆریان لەدەستور دووبارە ڕێزی بۆ ئاینەکەیان داناوە هەروەك لە مادەکانی:١ و٤٧ لە دەستوری یۆنان، ١ و٢ لە دانیمارك، ١٢ لە نەرویج، ٤ لە سوید، ٥٤ لە کولۆمبیا، ٦٦ لە کورسیکا، ١٢ لە سلڤادۆر، ٦ لە ئیسپانیا، ٢٤ لە پورتوگالیا، ٣ لە پرگوای، ٢ لە ئەرجەنتین ...، هەندیکیشیان مەرجی ئینتمای ئاینی بۆ مەلیك وسەرۆك لە دەستور دیاری کراوە، لەوانە :مادەی ٤ لە سوید، مادەی ٩١ لە ئیسپانیا ..[1]، چونکە تێن و تەوژمی ئاینەکەیان لە سیاسەت بەهێزتر نیە تا ببێتە بەکارهێنەر بۆی، واتە لێرە (دان پیاهێنانە) کە ئیسلام

[1] بۆ زیاتر بڕوانە :الاسلام والعلمانية وأثرهما في نشأة الدولة العراقية الحديثة -نوسەر

بەهێزترە لە سیاسەتەکە، هەر بۆیەش دەبینین مەسیحیە عەرەبە نەتەوە گەریەکان ئیسلامیان لە پێناو مەبدەئی نەتەوەگەری بەکارهێناوە نەك مەسیحی[1]، هەر چەندە لە پێش تر و ئێستاش هەموو باڵەکانی عەلمانی لە جیهانی ئیسلامی و لە کوردستانیش ئاینیان لە پێناو سیاسەت (بەمزاراوە عەلمانی خۆی) بەکارهێناوە بۆ جوان کردنی ئەو بیر و ئایدیۆلۆجیانەی کە نامۆ بوونە وەك: مارکسیەت، سوشیالیستیەت، لیبرالیەت، .. جاران دەیان وت خۆ شیوعیەتیش هەر دادپەروەریەکی وەکو ئیسلامی دەوێ، یان سوشیالیستیش هەر ناوەڕۆکی ئیسلامە هەتا لەو دواییەش هەر بەردەوام بوو، (عبداللە ئۆجەلان) دەڵێ: (پێغەمبەرو ئیمام علی لە ئێمە سوشیالیستی تر بوونە)[2]، هەر لە بارەی دیموکراسیش دەیان وت هەروەك ئیسلام ئاوا سەربەستی تیایە، بەو شێوەیە (مەکسیم ڕۆدنسۆن) کە جیهان بینێکی مارکسی بەناوبانگە لە کتێبی (الاسلام و الماركسية)ی خۆی دەڵێ: (نەك لایەنە نەتەوەیی و عەلمانیەکان، بەڵکو شیوعیەکانی جیهانی ئیسلامیش سەروەریەکانی ئیسلامیان بەکارهێناوە لە پێناو بڵاوکردنەوەی شیوعیەت)، لەعیراقیش لەو نموونەیە گەلی زورە بەتایبەتی لەسەرەتاکان، لەلایەك دژی ئاین بوون وکتێبێ وەك (این اللە)یان بڵاو دەکردەوە لەلایەکی تر بانگەوازیان بە ناوی (صرخة الإلهية لأخ لينين)یان بڵاو دەکردەوە، معروف رصافی بە ئایەتی قورئان بانگەشەی بۆ شیوعیەت دەکرد ..، بەهەمان شێوە تەیاری نەتەوەیی لە عەرەب و کوردو تورك و عیبریش و.. کردوویانە، سەرنج بدە دوورترین کەس لە ئیسلام (میشێل عەفلەق) دامەزرێنەری حیزبی بەعس دەڵێ: (نابی عەرەب بێت و ئیسلام نەبێت، سەرم سوڕماوە ئیسلامێك عەرەبی خۆش نەوێ)[3]، کتابی (ذکری رسول اللە)شی هەیە.. سەرنج بدە چۆن

---

[1] بۆ زیاتر سەرنج بدە :(مشيل عفلق-كتابات كاملة)، شبلي عيسمي (العلمانية و الدولة الدينية)، نجيب عازوری (يقظة أمة العربية).

[2] هەڵبژاردە-عبداللە ئۆجەلان.

[3] الكتاب السياسية الكاملة- ميشيل عفلق.

ئیسلام بـەکاردەهێنێ بـۆ سیاسـەتی نەتـەوەیی، نەتـەوە گەریـەکانی عـەرەب و یەهودی دەڵێن: ئێمەین( شعب الله المختار)[*]، دەبـێ نەتـەوەی ئێمـە سـەرکردەی جیهان بێت!، بە هەمان شێوە دەبیـنین مێـژووی ئیمپریـالیزمی پـڕە لـە نموونـەی بەکارهێنانی ئـاین بـە هـەمو ئاراسـتەیەکی تـەریب و پێـچەوانە، تـا ئـەو ڕادە ئەنجومەنی ئیشتیمانی فەرەنسـی لـە گەرمـەی ئیمپریالیـەتی دا بـۆ داگـیر کـردن بڕیاری دا کە (چۆن دەرمان بۆ مێش کوژی پێویستە ئاواش مەسـیحی و ئینجیـل بۆ قەلاچۆی ئاینە ئەفسـانەیـەکانی تر پێویـستە)[1]، بە هەمان شێوە ئیسرائیل وەك دەوڵەتێکی نەتەوەیی لەسـەر بنچینەی دەقی ئاینی دروست کراوە[2]... کـۆن تـرین بەکارهێنانی ئاین لەپێناو سیاسەتی نـاڕەوا دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو شـایانەی کـە ڕەچەڵەکی خۆیـان بـە (معجـزە)یـەکی خـوایی دەبەسـتەوە[3]، لـە کوردسـتانیش بەکارهێنانی ئاین لەپێناو بنەمای عەلمانی لە چارەکی دوای سەدەی بیسـتەم زیاتر دەستی پێ کرد، بـەڵام لـە سـەرەتای سـەر هەڵـدانی عەلمانیـەت لـە کوردسـتان نـەیتوانیوە تەشـەنە بکـا یـان پـەنای بردۆتـە بـەر (١-کێشـەی نیشـتیمانی و کوردایەتی، ٢-یان ئاینی ئیسـلام)، زۆر ڕوونـە سـەرکەوتنی تـسبی (کۆمەڵـەی ڕەنجدەرانی کوردستانی عێراق) و (PKK) و سـەرنەکەوتنی حزبـە شـیوعیـەکانی هاوڕێیـان هۆیەکـەی بـۆ (فاکتـەری نیشـتیمانی دەگەڕێتـەوە نـەك عەقیـدەی مارکـسی)، هـەروەها بـوونی جەماوەریـەکی شـۆڕش و حزبـە کوردسـتانیەکانی پێشووش بۆ هەردوو فاکتەر دەگەڕێتەوە کـە هـەردەم زانایـەکی ئاینیـان کردۆتـە پێشەوا، ئـەگینا تـەفاعولیان نـەدەکرد لـەناو میللـەت هـەتا (پ.د.ك)یـش لـە سەرەتای شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١ بەشداریان نەبوو، هەر ئەو هۆیـە بـوو پـاڵی دان

---

[*] لە پرۆتۆکۆلی (٥)حکماء صهیون هاتووە : وقد منحنا الله العبقرية كي نكون قادرين على القيام بقيادة العالم

[1] معبنوا الارض ص١٩-فرانتس فانون.

[2] بۆ زیاتر سەرنج بدە (الاساطير المؤسسة..) - رۆجي غارودي.

[3] بۆ زیاتر بڕوانە د احمد سوسە –تاريخ حضارة وادي الرافدين ص ٢٠١

بێنە ژێر سەرکردایەتیەکی وەك (ملا مصطفی)، ئەگینا زۆربەی سەرکردایەتی بەو بەرە مارکسیەی خۆیان لابەلا وەسفی (بارزانیان) بە کۆنەپەرستو دەرەبەگخوازو مەلاو میسالی دەکرد، هەتا ئەزموونی کۆمەڵەی ئێرانیش هەر بۆ چەتر (م/شێخ عزالدین حسین)یان بەکارهێنا.. ئێستاش کە دەبینین حزبە عەلمانیەکانی کوردستان کەسیان دەنگی نەگەیشتە لە (٠٥٪)، ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هەرچەندە فاکتەری نیشتیمانی لە کوردستان زۆر بەهێزیشە کەچی توانای نیە ببێ بە جەماوەری بێ فاکتەری ئاینی.. هەر بۆیەش ئێستا هەمر هەموویان زاناییانی ئاینی کۆ دەکەنەوە لای خۆیان بە ناوی (یەکێتی زانایان)، ئەو شێوە بەکارهێنانە لەلایەن عەلمانیەتی سەرانسەری جیهانی ئیسلامی لە وردو درشتەوە بەدی دەکرێ بۆ پڕ پڕکردنەوەی نوقستانیەکانی خۆیان، ئەو تۆمەتەی بەکارهێنانی ئاین لە پێناو سیاسەت بەکاردێت لە لایەن عەلمانی لە دژی ئیسلامی ئەوانیش لە دژی عەلمانی، کەواتە باپزانین چۆن ئەو لێك گیربوونە بە تەرازوویەکی ورد لێك بکەینەوە:

١-جارێ لە پێشدا کە دەڵێن نابی ئاین تێکەڵی سیاسەت بکرێ، ئاین پاکە و لە پێناو سیاسەتدا نابێت بەکاربهێنرێ، مانای دان پیاهێنانێکی بێ ئەشکەنجەیە کە (سیاسەت خراپە)، جا کە خراپە بۆچی دەیکەن؟ ئەگەر باشیشە و پیرۆزە و مەبادینو راستیە ئەوا با ئاینیشی لە پێناو بەکاربهێنرێ. واتە بەکارهێنانی ئاین لەپێناوی سیاسەتی ناڕەوا دروست نیە.

٢-عەلمانی بە هەمو باڵەکانیەوە دەیەوێ تەنها ئەندازەیەك لە ئاین وەرگرێ وەك ئامراز بەکاری بهێنێ بۆ مەبادینەکانی خۆی کە جیایە لە ئاین، ئەوەیان بەکارهێنانی ئاینە لە پێناو سیاسەتێکی نا شەرعی، خودی ئیسلام ئەمك هەر (ئیسلامیەکان و بزرتنەوە ئیسلامیەکان) ئەوەی بە توندی ڕەت دەکاتەوە لە چەندین ئایەتی روون و ئاشکرا، ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِنَ الْكِتَابِ﴾، ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ الْكِتَابِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ﴾.

(١) رابەری  سیاسەت  Policy

٣-هەر کەمێك ورد بین (دزەکە) یان (فاوڵەکە) دەبینینەوە کە کێ بە نایین بەکاردێنێ بە ناشەرعی لە پێناو سیاسەت، هەر مەدرەسەیەك سەروەری مەدرەسەیەکی تر بەکاربهێنێ ئەوا فاوڵەکەیە، هەر بە نموونە شیوعیەکان ئامانجیان شیوعیەتە هەرکاتێ سەروەری کوردایەتی یان نەتەوەیی یان لیبرالیان بەکارهێنا ئەوا فاوڵەکەیە واتە بەکارهێنانی کوردایەتییە لە پێناو شیوعیەت، ئەگەر لایەنێکی ئیسلامیش هات سەروەری شیوعیەت یان عەلمانی بەکارهێنا لە پێناو ئامانجی ئیسلامی ئەوەش هەر فاوڵە، ڕاستی ئەوەیە (ئیسلامیەکان با ئیسلام بەکاربهێنن)، (لیبرالیەکان با لیبرالیەت بەکاربهێنن)، (شیوعیەکانیش با مەبادیئی مارکسی بەکاربهێنن)..هتد ئەوە هەمووە هەقی خۆیەتی با کەس دەست درێژ نەکا بۆ ئەوەی تەنیشتی، هەرچی سەروەری ئەوی تر بەکاربهێنێ ئەوە تەلۆشە و کۆتاییەتی تا لێرەدا بە وردی دەردەکەوێ تا ئێستا نموونەیەکمان نیە کە ئیسلامیەکان لە هیچ شوێنێك مەبادیئو سەروەری شیوعیەت یان لیبرالیەت یان سوشیالیستی و هەتا نەتەوەیش (نەك ئیشتیمانی)یان بەکارهێنابێ.. کەچی جگە لە چەند باڵێکی چەپی دابراو نەبێت هیچ بزوتنەوەیەکی عەلمانی نەبووە و نیە سەروەری ئیسلام بەکار نەهێنێ بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییە فیکری و مەنهەجی و ستراتیجی و شەرعیەتی جەماوەریەکەش.. ئەوەش دزەکەیە.

## زانستی سیاسی و ڕێبازی سیاسی:

ئەو دوو چەمکە زۆر لێك جیان، زۆر ترسناکە تێکەڵی یەك بکرێت، نەك هەر لە سیاسەت بەڵکو لە هەموو بەشەکانی زانیاری ئەو دوو لایەی هەیە وەك (زانستی ئابووری و ڕێبازی ئابووری، زانستی کۆمەڵایەتی و ڕێبازی کۆمەڵایەتی، زانستی ئاینی وڕیبازی ئاینی...هتد) هەمووی لێك جیان، کەچی نەك هەر عەوام بەڵکو لە ئاستی بەرزیش ئەو تێکەڵە هەیە، سەرنج بدە فەرهەنگێکی

(۱) رامیاری سیاسەت Policy

بالآی وەك (الموسوعة العالمیة) لە ب١٦، ج، ل٤١٤) دەڵێ: (زانستی سیاسی بریتیە لە توێژینەوە و پەیڕەوی ژیانی سیاسی، گرنگی بە بەهای سیاسی و یەکسانی و سەربەستی و دادگەری دەدا)، هەڵبەتە ئەوەش زانستی سیاسی نیە، تێکەڵە، (کلودبرنار ١٨١٣-١٨٧٨) یەکێ لەوانەیە کە (ڕێبازی سیاسی) لە بەشەکانی تری سیاسی جیاکردۆتەوەو ڕێبازی وا ناساندووە کە زیاتر ڕاستی و جێگیرترن لە تیۆری سیاسی، دیارە زانستی سیاسی پەیوەستە بە لێکۆڵینەوەیەکی واقیعی مێژووی سیاسی لەگەڵ ئیمکانیاتی ئەو واقیعە یان وەك لە (موسوعة علم الاجتماع-١٩٩٩) هاتووە دەڵێ: (لێکۆڵینەوەی ئەرکەکانی ئایدۆلۆجیا و هۆیەکانی دابەش و پەیوەندیەکانە..)، بەڵام کە هاتیە سەر چۆنیەتی بەڕێوەبردن و پەیڕەو کردن و دروست کردنی سیستەمی سیاسی و ئامانجەکان و.. ئەوە بەشی (ڕێبازە)، لە زانست هەموو مەدرەسە و تەوژمە جیاجیاکان کۆکن بەڵام لە ڕێبازا لێك جیادەبنەوە، دەبنە ڕێبازی جیاجیای وەك سیاسەتی( میکاڤیلی، مارکسی، لیبرالی، عەلمانی، ئیسلامی..)، بەکورتیەکەی ڕێبازی سیاسی لە چارەی واقیعی سیاسی دەکۆڵێتەوە، بەڵام زانستی سیاسی تەنیا لە واقیعەکە دەکۆڵێتەوە، یان بە واتایەکی تر زانستی سیاسی وێنەی گۆڕانی واقع دەکێشێ، بەڵام ڕێبازی سیاسی بەرنامەی گۆڕانی واقع دەکێشێ، هەر بۆیەش ڕێبازی سیاسی وسیاسەتەداری سەرکەوتووش پێویستیان بە زانستی سیاسی هەیە، چونکە بە هۆی زانستەکەش (تشخیص)ەکە چاکتر دەکرێت ئیتر چارەسەریەکان بە ساناتر دەداتە دەست (ڕێباز)، هەڵبەتە هەر جۆرە ڕێبازێك جۆرە دەرمانێکی هەیە، ئا لەو دەروازەیە پەیوەندی زانستی سیاسی بە دەقەکانی ئیسلام دەردەکەوێ کە بە پوختەی: زانستی سیاسی بۆ مرۆڤایەتیە، ڕێبازیش بۆ پەیام، بەهەمان شێوەش بۆ مدرسەکانی شیوعیەت و سوشیالیستیەت و لیبرالیەت. زانستی یەکە بۆ پەیڕەوکەرانی و ڕێبازەکەش بۆ خودی مدرسەکەیە.

(١) ڕێبـــازی            سیاســـەت            Policy

## سیاسەتی شـمولی:

ئەو تێکەڵیەی لە بەشـی ڕابـردوو بـاس کـرا، وا دیـارە زۆربـەی چـەمکەکان دەگرێتـەوە، ئەوەش قەیرانی ئەو مەدرەسـانەیە کە تەرازوو و پێوانەو سـنووردەکانی بە وردی پێ ناخوێندرێتەوە، بـاس لـە سیاسـەتی شـمولی دەکـرێ، ئایـدیۆلۆژیار مەدرەسەو سیستەمی تێدەگلێنێ، کە دەبینین ئەو وەسفە بـۆ ئـەوان ناشـێت، لـە کاتێکا سیاسەتی شمولی سەلبیە بەو واتایەی جم و جۆڵی سیاسی وا کە لایەنی تر نەخوێنێتەوە، پاوانی دەسەڵات بکەی، تەقەلای هەمور لایەنو ڕەنگو چینو توێـژ بدەی لە دەرەوەی توانـای سـنوری سیاسـەتەکە، ئـەوە سـەلبیە، دیکتاتۆریـە، چ دەسەڵاتدار بێت چ بێ دەسـەڵات.. بـەڵام ئایـدیۆلۆژیا و مەدرەسـەو سیسـتەم و بەرنامەکە با ئەو سـیفەتانەی هەبێت با شمولی بێت ئەوە سەلبی نیـە هەروەك زیاتر لە چەمکی شمولیەت زیاتری لێ باس دەکەین.

# (٢)

# عەلمانیەت لائیكیة Secularizm

عەلمانیەت لە (علم) نەهاتووە، هەروەك تا ئێستاش نەك عەوام بەڵكو هەندێ ناوەند و فەرهەنگیش وای تێگەیشتون، لە كتێبی (تیارات الفكر العربي المعاصر) لە ل٣٥ بە هەمان مانای (علم) هاتووە لە ژێر سەر دێڕی (تیار العلمي-الغربي)، هەروەها فەرهەنگی حزبی بەعس (تعریفات ببعض المصطلحات) لە ماددەی (عەلمانیەت) واهاتووە (كلمة مشتقة من العلم والعالم وهو بخلاف رجل الدین)، لە زۆر سەرچاوەی تریش وا بەچەوتی هاتووە، هەروەها مەبەستەكانی (مل ملانێ ی شارستانی-هندگتۆن) و تەقەلای رۆژئاواش دەیەوێ ماناكەی بە (علم) گوزارش بكا، وا خزمەتی ستراتیجیەتی پێ دەكرێ، بەڵام لە ئەسڵدا مانای (سیكولاریزم-دنیا ویستی) مانای زانستی (علم scince) ناگرێتەوە، بەڵكو لە (سایكولم) ئەگریكی هاتووە، فەرەنسیەكەش (لائیكی-Laigue) لە لایكسی یونانی هاتوە بەمانای رەمەكی (عامی )، لە بنەچەدا بەپێ ی هەندێ سەرچاوە (سیكولار) لەرۆمای كۆن و دواتر ئەو عەوام و كەسانە بووینە كە پایەی ئاینیان نەبووە لە كەنیسە[١]، بۆیە عەلمانیەتیش نوێ نیە وەك وا دەردەكەوێ كەلەگەڵ عەقلانی ومەدەنیەت ورینیسانس پەیدابووبێ، نەخێر، بەڵكو هەر شێوازێكی تری ململانێی ئاینی و نائاینیە، سەرەتاكەی دەگەرێتەوە بۆسەردەمی (ح هارون-براگەورەی

[١] بۆ زیاتر سەرنج بدە : أ-العلمانیة تحت المجهر ب-موسوعة السیاسة ب٤ ل١٧٩ ج- معجم الشامل للمصطلحات الفلسفیة.

مووسا)[1] که کۆمهڵه خهڵکێکی له لاویهکان لابوود، بهو شێوهیهی ح هاروون پابهند نهبوونه بهیاساکانی ئاینی، بهوانه وتراوه (لانیگ)، لهسهردهمی ناکوکی کنیسهو ئهورووپا داوا کرا ههرودك خهلکی ئاسایی با دهسهلاتی کنیسهو پیاوانی ئاینی لانیك بن [2]، ئیتر چهمکی لانیك به فهرهنسی و سیکولار به ئینگلیزی چهمسهری بهرامبهر ئاینی وهرگرت، لهنیو یههودیهکانیش ئهنجومهنێکیان به ناوی "عهلمانی" ههبود لهبهغداش، واته لهناوهرۆکدا کۆنهو ههمان مهل ملانێی ههق وناههق وئاینیه، یهکهم جار سیکولار بهردهمی له سالّی (١٦٤٨) له مۆرکردنی ئاشتی (وستڤالیا) بهکارهات که دهولهتی ئهتهوهیی پێ دروست بوو لهجیاتی سیوکراتی، یهکهم کۆمهری عهلمانیش لهدوای شۆرشی ١٧٨٩ له فهرهنسا دروست بوو، له دوای رابوونی ئهورووپیش باوی وهرگرت، ئیتر زۆربهی زانا و فهرههنگه کۆن و نوێکان ئهو مێژووه به سهرهتای سهرههلدانی عهلمانیهت دهژمێرن[3]، درای وا باو بوو به خۆمالّی کردنی دام و دهزگاکانی کنێسه بۆ دهولّهت یان مهدهنیهت دهگوترا سکولاکردن، کاتی که پیاوانی کنێسه ستهم و زۆرداریهکی بێ سنووریان له خهلّك دهکرد له باج وهرگرتن، سهرانه، فرۆشتنی پسولهی لێ بووردن، ئهشکهنجهی زانایانی وهك (کوپهرنیکوس، گالیلۆ، جوردانو، دیکارت، پیکۆن، چۆن لوك، سپینوزا، ..)، پاوان کردنی دهسهڵات بهناوی نوێنهرایهتی خواوهند و لاهوت یان وهك پێ یان دهووت (پادشاوهك خوای سهر زهوی- Diving right of the king)[4]، .. له کاردانهوهی ئهو بارودۆخه زیاتر پهرهی سهند، ههندێکی تریش لهوانه (الموسوعة العالمیة -ب١٦- ل٤١٥) له بنچینهدا دهیگێرێتهوه بۆ (میکافیلی) و ئهو کاریگهریانهی لهسهر (هۆبز)ی ههبوو له بارهی دهسهڵاتی سیاسی له دژی بههاا سیاسیهکانی مهسیحیهت، لێرهوه

[1] بروانه:جدول والشروح -انجیل
[2] بروانه :معجم الشامل للمصطلحات الفلسفیة -مادة:علمانیة .
[3] تیارات الفكر العربی المعاصر ل٢٠٤.
[4] الموسوعة السیاسة.

مانا فراوانەکەی (فصل المطلق بین السیاسة و الدین) بوود عەلمانیەت،، لە پێشەکی عەرەبیەکەی کتێبی (رسالة اللاهوت و السیاسة) سپنۆزای دانەر بە پێشەنگی عەلمانیەت دەژمێرێ کە ئاینی لە سیاسەت دوور خستەوە و نهێنیەکانی و دەستکاریەکانی ئینجیل و تەوراتی ئاشکرا کرد، هەروەها بەپێی زۆربەی (سەرچاوە زانستیەکانی) تریش هەریەکە لە (یاساناسی فەرەنسی ڤۆدین، سیاسەتمەداری ئەڵمانی-نەتسیوی، پاریزەری هۆڵەندی چۆرتیۆس) دەوری هەرە گرنگیان هەبووە لە بە دەولی کردن و دارشتنەوەی یاسای عەلمانیەت، هەموو ئەوانە و زەمینە فیکریەکەی ئەو سەردەم و شۆرشی فەرەنسی و وەچەرخانی ئیمپراتۆریەت بۆ دەوڵەتی نەتەوەیی و رابوونی زانستی ئەوروپیی و شکستی کنێسەو بەرنامەکانی تەبشیرو هەڵمەتەکانی ئیمپریالیزمی دوای سەرهەڵدانی شیوعیەتیش.. بناغەکانی بلاوبوونەوەو پەیدابوونی عەلمانیەتن، لە دوای تاوتوکردنێکی زۆری تر (جۆن هیلۆك-١٨١٧-١٩٠٦) وەك چەمکێکی سیاسی ماناکەی (گوایە بەبێ لایەنانە) دارشت کە تا لێستاش زیاتر بە گشتیەکەی ئەو مانایە دەبەخشێ: دەتوانرێ بە لەباری ئاین دوورخری لە چاکردنی کاروباری مادیانەی مرۆڤ، واتە جم و جۆڵی سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابووری و دروست کردنی دام و دەزگاو پارتی سیاسی بێ ئەوەی پەیوەندی بە ئاینەوە چ دوور چ نزیکەوە چ سەلبی چ ئیجابی نەبێ، ئاینیش لە گۆرەپان بکشێتەوە ناو کنێسە و دڵی ئادەمیزاد، یان وەك (د.کەیالی) دەڵێت: (مانای مرۆڤ بەخۆی ببێتە خاوەنی خۆی)[1]، ئەوەی بە خێرایی تێ بینی دەکرێت (هۆلیوك) لە پێناسەکەی (بێ لایەن) نیە بەلکو ئاینی بەخشکەی خانەنشین کردووە لە سیاسەت و دەوڵەت و زیاتر وەك (سەفەر حەوالی) دەڵێ لە ژیانیشیان جیاکردەوە[2]، ئەوەش نوێ نیە هەر هەمان تێروانینی کۆنە، هەر سەردەمێك ناوێکی جیای هەبووە، بەلام لە ناوەرۆك و

---

[1] الموسوعة السیاسة.

[2] العلمانیة.. سفرحوالي.

ماهیەت دا هەر یەكن، عەلمانیەكان خۆشیان دان بەوە دەنێن سەرنج بدە (د.محمد خلف الله) و (شبلی عیسمی) وەسفی كۆمەڵگەیەكی فرە ڕەگەزی مەدینە دەكەن بە سیستەمی عەلمانی[1]، یەهودیەكانیش لەناو خەلافەتی ئیسلامیش یەكێ لە ئەنجومەنەكانیان بەناوی ئەنجومەنی عەلمانی (جسمانی) بووە، بۆیە دیسان بە هەڵە دادەچین ئێمە ئەگەر سەرەتای ئەو چەمكە بۆ ئەو سەردەمەی بەرهەمی زانستی و عەقلانیەت بگێڕینەوە، بەڵكو بەتەریبی ئەو ڕێبازە شان بەشانی كۆمەڵگەی ئاینی پەیدا دەبن لە دوای پەیام ڕاستەوخۆ، لەناو مدرسە كۆنەكانیش ئەو دابەشیە هەبووە لە مدرسەی یۆنانیش، ئەگەر كەمێك بە سەرنجەوە بەراوردی پێناسەكانی عەلمانیەت بكەین دەبینین ئەوە هەمان تێ ڕوانینی (ئەرستۆ) وبەشێكی مدرسەی یۆنانیە بۆ گەردوون و كۆمەڵ، ئەرستۆ پێ ی وابوو ڕاستە خوا جیهان و مرۆڤی دروست كردووە بەڵام هەقی بەسەر هیچ دا نەماوە خۆیان بۆ خۆیان كاروباری خۆیان هەڵدەسوڕێنن، وەك (مەڵەكی دەستووری) چۆن خاوەنە تەك حاكم ئەویش هەر دروست كەرە نەك فەرماندەر، زۆربەی ئاینە دەستكردەكان ژیانی ڕۆژانەو خواپەرستەكەیان لێك جیاكردۆتەوە، بەهەمان شێوەش (بت و سەنەمەكانی) مەككەش هەروابوو، پەرستنیان (عیبادەتەكە) بوو كەچی شەریعەتیان نەریتی كۆمەڵایەتی و خێڵەكی بوو.. واتە ئاینیان جیاكردبۆوە لە ژیان كە ئیسلام شۆڕشی لەسەر كرد، .. ئەوە دەقا و دەق عەلمانیەتە، هەروەها (دەهریەكان —سروشت پەروەرەكان) كە لە قورئانیش ناویان هاتووە هەر هەمان تێڕوانینی ئەرستۆ و بەشی هەرە زۆری ئەغریقی و یۆنانی وایان دەڕوانی كە بوونەوەر هەر وا هاتووە و واش دەڕوا بێ كۆتایی.

لەو بارەیەوە (نیتچە) لەكتێبی ( هكذا تكلم زرادشت) دەڵێ: ((ئەو جیهانە كارلێك دەكار دەگۆڕێ، یەك دەگرێ و لێك جیادەبێتەوە، دەمرێ و دەژی.. بەڵام كاروانی (بوون) دەڕوا بێ كۆتایی))، ئەو بناغانە هەموی (بە دەهریەوەش) لە

[1] العلمانیه و الدوله الدینیه -شبلی عیسمی ل٨١.

کتێبی (مەجەستی- بتلیمۆس) هاتووە، ئایدیۆلۆجیەکانی بەبێ بڕوایی ئاوبراون لە ناو ڕیزی ئیسلامیش هەر هەبووینە[1]، خۆ زانایان (لوك، لیبنتز، رۆسۆ، لینج، ..) زۆری تر لە لایەك باوەڕیان بە خودا هەبووە، بە عەلمانیەتیش وەك پێناسەی (جۆن هلیۆکە)، هەمان ڕاڕەوەی (ڕبوبیەش-Deism) کە وشەیەکی لاتینیە بە مانای (خودا) دوای بووە ئایدیۆلۆژیەکی ئاینی فەلسەفی کە دان بەوە دەنێن خوا هەیە، بەڵام دەڵێن ئیش و کاری گەردوون و سروشت ناکا، هەقی لەو دونیایە نیە. زۆربەی زانایانی ئەوروپی و مێژووی زانیاری مەسیحی رایەکی وای هەبووە، سەرنج بدە، (ولیام ئامبل) قەشەی بریتانی دەڵێ: (خوا بەتەنها گەردوون بەڕێوە نابا)، بە پێی (مذاهب و مفاهیم في الفلسفة و الاجتماع)، هەریەکە لە (ابن رشد، أبن خلدون، گریبوفسکی، ڤۆلتێر، رۆسۆ، ..) لە وانەن[2]. بەلایەن کەمەوە مەرج نیە ابن روشد و ابن خلدون عەلمانی یان دەهری بن.

ئەو ڕوانگەیە لەوە دێت، ئەوانە وا تێگەیشتوون کە ئاین تەنها کارێکی تاکە لەنێوان خۆی و خودای، پەیوەندی بەژیانی سیاسی و ئابووری و یاسایی و کۆمەڵایەتی و شارستانی نیە، وەك ئاینی مەسیحی، کاتێ گوێبیستی هەندێ بنەمای ئاینی ئیسلام دەبن کە خاوەنی (تشریع) و چارەسەریەکانی ئەو فاکتەرانەی ژیانە و ئازادی و سەربەستی سیاسی و ئاینی و بڕوایی وعەقلانیەتی تیایە.. ئەوا یەکسەر دەڵێن ئەو ئاینە عەلمانیە!! هەر بۆیەش ناویان لە ابن الرشد وئەو زانایانە ناوە عەلمانی، لەلایەکی تریش لەسەر هەمان ڕوانگە عەلمانیەتی ئێستا ڕۆڵی ئاین دەبینێ، لەوەش زیاتر عەلمانیەتی جیهانی ئیسلامی دەیەوێ ئەو مافەی ئاینی بەخۆی بدا بە کردە بۆ ئەوەی دانیشی پیا بهێنێ، هەرچەندە فەرهەنگە ئاینیەکان عەلمانیەتیان لە زنجیرەی ئاین ڕیزکردووە، هەر بە نموونە (الموسوعة الميسرة للأديان والمذاهب) عەلمانیەتی لە (٣٧)ەمین ئاینی جیهانی

[1] بۆ زیاتر بڕوانە أ-الموسوعە الکشاف، ب-الموسوعە الجماعات و المذاهب..

[2] بۆ زیاتر بڕوانە (المذاهب و مفاهیم...) ل٦٢.

ڕێزکردووە، بەڵام بە زمانێکی پاڵاو و ڕاستەوخۆ دان بەو ڕاستیە ناهێنن. بۆیە ئەو مافە لە ئایینی ئیسلام دەسێنن، دەیەوێ زیندانی بکا، یان نەفی بکا و لەژیانی دووروبخاتەوە،هەرچی ئاینی ئیسلامە ئایکوژێتەوە بەلام لەخۆی جیا دەکاتەوە ، ئا لێرەوە ئەو ناکۆکیەی بەردەوامی ئیسلامی و عەلمانیەت دریژەی دەبێ لە جیهانی ئیسلامیدا و کەمتر لە جیهانەکانی تر ئەو ناکۆکیە هەیە.

## پێناسە جیاجیاکانی عەلمانی:

کۆمەڵێك مانای جیاجیای پێدراوە بەڵام ماهیەتی هەریەکە نەك لە لایەن ئاینیەکان بەڵکو لە لایەن فەرهەنگ و زانایانی عەلمانی خۆشیان، بە دنیایی، دنیا پەرستی، نا ئاینی، .. یان وەك لە هەموو فەرهەنگەکانی هاتووە جیاکردنەوەی: دەوڵەت لە ئاین، جم و جۆڵی سیاسی لە ئاین، گێرانەوەی کاروباری مرۆڤ لە خوایەوە بۆ بەشەری[1]، وا هەندێ لەو پێناسانە لە فەرهەنگە سەرەکیەکان وەك دەقی خۆی هەڵدەبژێرین:

+دانیرەی مەعاریفی بەریتانی، عەلمانیەت: بزوتنەوەیەکی کۆمەلایەتیە مەبەستی وەرگێرانی ڕووی خەلکی لەدوا ڕۆژ بەرەو واقیع و دنیا بە تەنها.

+فەرهەنگی (العالم الجدید-لابستر): سیستەمێکی دنیاییە تێکەڵی عیبادەت و بروای ئاینی نابێت.

+تۆکسفۆرد:.. مادیانە نەك روحی، دەسەلاتێکی دژ بە کنێسە.

+الموسوعة العالمیة: جیاکردنەوەیەکی ڕەهای نێوان سیاسەت و ئاین، ئەوە عەلمانیەتە.

+هەموو فەرهەنگەکان لەو سنوورە دەرناچن، هەتا لەوانەی کوردیش هەمووی هەروەك فەرهەنگی نوێ ی-برهان قانیع کە دەڵێ: عەلمانی بریتیە لە (دنیا پەرستی، باوەڕ بە کاروباری دنیایی و خۆشەویستی دنیا و باوەڕنەکردن بە

[1] کیالی- الموسوعة السیاسیة ج٤ مادە :عملانی.

دەردەوەی ئەمانە).

جیاوازی بنچینەیی لە نێوان ئەوانە و ئەکادیمیەتی ئیسلامی لە پێناسی دا ئەوەیە، ئەوانە مرۆڤ بە (سید الکون) دەزانن، کەچی ئیسلام بە (خلیفة الارض)ی دەزانێ.

## گەشەکردنی عەلمانیەت:

دەتوانین بە خێرایی خاڵەکانی هۆی گەشەکردنی عەلمانیەت لە ئەوروپا کۆ بکەینەوە لە:

١-بارودۆخی سەلبی ئاینی مەسیحی و نەبونی شەریعەت لەو ئاینە.

٢-گەشەی زانست و دۆزینەوە گەردوونیەکان و تیۆری پەرەسەندن.

٣-سەرهەڵدان و گەشەی فەلسەفەی مادی.

٤-گەشەی سەرمایەداری و کەرت و بەرژەوەندی تایبەت، لە بەرامبەر هەموو ئەوانەش ئاین لە کشانەوە بوو، بەشێوەیەك عەقڵ و ئاین کەوتبوونە دوو بەرەی دژ بەیەك.

٥-وەرچەرخانی ئیمپراتۆریەت بۆ دەوڵەتی نەتەوەیی و دروست بوونی یەکەم ئەزموونی عەلمانی لە فەرەنسا.

٦- دارمانی خەلافەتی عوسمانی و وەستانی بزوتنەوەی وشیاری لەجیهانی ئیسلامی.

بەو شێوەیە ئەو چەمکە لە ئەوروپا سەری هەڵدا (یان راستتر بڵێین زیندوو بۆوە بەو ناوە)، راستەوخۆتر لە زەمینەی واقیعی سەلبی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئاینی سەری هەڵدا، ئاینەکەیان -هەروەك سپینۆزا دەڵێت -بە خەستی دەستکاری کرابوو[1]، یان وەك (ڤۆلتیر) دەڵێ کتێبی پیرۆز هەمووی خرافیاتە شەریعەتی تیادا نەمابوو جگە لە هەندێ سپاردە، خۆی کارتی سووری بە خۆیدا بوو لە گۆڕەپان

[1] رسالة في اللاهوت و السياسة- سپنوزا.

دەربكرێ، سەرنج بدە (ما لقيصر للقيصر، وما لله لله) ئینجیل مەتی (٢٢) ١٤-٢٣. یان (محاکم التفتيش- Ingaision)، یان دروشمە باوەکانیان وەك (حوكمی ئاسمان بۆ خودا و حوكمی زەویش بۆ ئیمپراتۆریەت)، (ئاین بۆ ئاسمان و یاساش بۆ زەوی)، تارادەیەك باسی خوای زەوی و خوای ئاسمانیش دەکرا.. لەسەر بنچینەی عەلمانیەت لە فکردا لە باشترین دۆخی دان بەوە دەنێن کە (رب السماوات..)، کەچی لە قورئان (رب السماوات والأرض).. هەتا ئاسمانیش گەلێ جار تەنها بۆ خودا نەهێڵراوەتەوە. ئاینی مەسیحی دنیایی نیە گوایە قیامەتیە ((مملكتي ليست في هذه الدنيا))، دنیای بەجێ هێشتووە بۆ مرۆڤ، ، لە کەلتووری رۆما و یۆنانی و لە رۆژهەڵاتیش وەك ئاینی زەردەشتی خوای شەڕیش هەبووە، لەزۆر ی تریش خوا یارمەتیدەری بەشەری نەبووە ؛ بۆیە دەبوایە سیستەمێك ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە .

رای مەسیحیەت (وەك ئەرستۆ)[1] وابوو کە خوا بەتەنها گەردوون بەڕێوە نابا، هەروەك تەشە (ولیام ئاصبل) لە هەموان زەقتر بوێرانە تر جاری داوە، سەرنج بدە ئەو رایەی مەسیحی ئیستاشیانەوە ((ان الله في عمله ديمقراطي))، [2] کە واتە هاوکاری و شەریکی هەیە لە بەڕێوەبردن هەیە.

بەو شێوەیە لە ئەوروپا لەگەڵ ئەو فاکتەرانەی سەروو لەگەڵ رێککەوتنی ویستڤالیا لە ١٦٤٨ بە ئاسانی عەلمانیەت سەری گرت لە پاش شۆڕشی فەرەنسی یەکەم کۆماری عەلمانی لە ساڵی (١٧٨٩) دروست بوو، ئیتر تەقیەوە، لە سەدەی (١٩) بەدواوە سەرانسەری ئەوروپای گرتەوە، دوای سەدەی بیستەمیش جیهان بەگشتی، زەق ترین ریکەوتن کەتائیستاش زیاتر ولاتانی عەرەب وعەلمانیەتی توند رەو داوای دەکا ئەو میە کەلەنێوان موسولینی وپاپا کرا لە ١٩٢٩بەو شێوەیە : مرۆڤ لەبوونیەوە بۆ موسۆلینی بێت تا مردن لەوی بەدواوە هەتا

---

[1] لە بەچەدا ئەو رایەی (انکسامندرس) (موسوعە الفلسفیە ) سەیرکە.

[2] بەرنامەی (عطات رالعبر) (رادیۆی مۆنتیکارلۆ: بەیانی ١٩٩٨/٨/٢٧.

**قيامەت بيتە عايدى پاپا!!** ئەو دابەشيە وەك دووبرايەكە بوو ئەوەى گەورە وتى با ئەمن مەغدوور بم مالەكە وابەشكەين لێرەوە تا سەر بان بۆ من لەويش را هەتا ئاسمان بۆ تۆ!، ئيتر رۆلى ئاينى مەسيحى كەوتە دواى مردن، ئەوەى هەر جى ى مشت و مڕ بوو بە تايبەتى لە دواى ڕابوونى ئيسلامى لە پاش هەشتاكانى سەدەى ڕابردووەوە چەندە عەلمانيەت توانيويەتى و دەتوانى بێتە ناو كۆمەلگەيەكى ئيسلامى كە ئاينەكەى لە جەوهەردا لە مەسيحيەت جيايە، خاوەنى بەرنامە و شەريعەتى تێروتەسەلى سەرتاسەرى ژيانە، ديارە بەپێى بەشێكى گرينگى سەرچاوەكانى رۆژهەلاتى و ئيسلامى و هەندێكى رۆژئاواييش ئەوا (ماسۆنيەت و سەهيۆنيەت)ى جيهانى و رۆژهەلاتناس و فيكرى ئيمپرياليزمى و تەيارى (تەغريبى)و هەتا (مبشرين)[1]يش لە ڕێى دروست كردنى چەندين سەنتەرو ناوەندى رۆشەنبيرى و كەلتوورى و سياسى.. ئەو بيرەى هێنا جيهانى ئيسلامى، بە تايبەتى لە ڕێى بيرى نەتەوەيى.

بەلام ئەو زەمينەيە لەجيهانى ئيسلام نوێ نەبوو، لەپێش ئيسلاميش بزوتنەوەيەكى فەرهەنگى بەناوى (هێلنيستيە)* لەگەل داگيركردنى رۆژهەلات لەلايەن ئەسكەندەرى مەكدۆنى لە ٣٣٣پ.ز. دەست پێ دەكاو دروست بوو، ئەوكاتى (فيساگۆرس) چەند مدرسەيەكى دروست كرد لە هند و فارس بۆ ئەو مەبەستە، لەمێژووى ئيسلاميش (معاويە) يەكەم هەنگاوى جياكردنەوەى (قورئان)و (سولتان)ى دارشت، هەندى تێگەيشتنى تايبەتيش لەفەرموودەو قسەكانى ياوەران جۆرێك لە رجياوازى بەرجەستە دەكا، وەك:(سيفترق القرآن والسلطان..)، (اعمل لدنياك كأنه تعيش ابداً.. وللاخرة كأنه تموت غداً )، لەوانە دەتوانرى بەخواركردنەوە سودى لى وەرگيرى و واى پيشان بدەى كەئيسلاميش

---

[1] بۆ زياتر سەرنج بدە –مقالتان فى الحكومە -جۆن لوك .

* هيلنيستيە پێك هاتووە لەدوو وشە(هيل كە لەهيلاس هاتووە- جاران ئەگريكەكان بە يۆنانيان دەووت بلادهيلاس، دواى بە ماناى رەچەلەك-يان باپيرە - يۆنانى هات، وشەى دووەم ئيست واتە رۆژ هەلاتى، كەواتە هيلنيستيە بەو شارستانيە دەووترى كە لە رۆژهەلاتى ورۆژئاوايى پێك دێت

وەك ئاینەكانی تر قیامەتیە نەك دنیایی، یان بەلای كەمەوە كاری دنیایی وكـاری قیامەتی لێك جیایە، ئیتر مەسـەلەی تەسـەوف و تـەركی دنیـا..ئـەو ریـشانەی هەیە، لەگەل میژووی سیاسی موسولمانان بـوارێكی سـانا بـۆ بـوونی عـەلمانیـەت دەكاتەوە، یەكێ لەهەرە كارە ترسناكەكانی ئەو بەرجەستەیە رێكەوتنی (محمد بـن عبدالوهاب) و (محمد بن السعود) لە١٧٣٧ بەدەست خۆشی بریتانیا، تیایدا حوكم وئاینیـان لێك جیاكردەوە بەشیوەیەك حوكم بۆ ال سعود وفەتواش بۆ زاناكانیان [١]، ولاتی عەرەبی سعودی لەسەر ئەو بنچینەیە دروست بوو، بۆیە رەنگە هەلە نەبێ ئەگەر بلێین سعودیە كۆن ترین ولاتی عەلمانیە لە جیهانی ئیسلامی نەك توركیا .

لەدوای ئەو كارەی معاویە دواتر یەزیـد وای لـە زانایـان كـرد بـەرە بـەرە لـە دەسەلات و سیاسـەت دوور بكەونەوەو بەرەبەرەش كاریگەری فەلسەفەی یۆنانی لە سنوری خۆی زیاتر كاری لە هەندێ زانای ئیسلامی كرد، لەوانە دروشمی (إخـوان الصفاء-كە بریتی بو لە تەفلسەفەی یۆنان و شـەریعەتی ئیـسلامی یـەكتر تـەواو دەكـەن)، لـە سـەردەمی خەلافـەتی عوسمـانیش بەرەبـەرە ئەزموونـەكانی دوای (ویستفالیا-١٦٤٨) وشۆرشی فەرەنسـا١٧٨٩ هاتە ئێو خەلافەت لە رێكخـستنی سوپا و ئیدارە و دەستوور و.. ئـی دی ئـەو گۆتانـەی وەك (دەسـەلاتی ئاسمـان و دەسەلاتی زەوی، پیاوی ئایینی و پیاوی سـیاسی، نەقل و عەقل، پیاوی ئایینی بۆ مزگەوت و پیاوی سیاسیش بۆ دەولەت، زەوی بـۆ مـرۆڤ و ئاسمـانیش بـۆ خـودا، ئایینی ئاسمانی و یاسای زەوی، ..) لێـك جیاكرانـەوە، ئـەو لێـك جیاكردنەوانـە بنەمایەكی بەهێزی بۆ عـەلمانیەت سازدا، تا ئاین و دەولەت تەواو لێك بترازێ، لە سالی ١٨٢٦ز بـۆ یەكـەم جـار بـەرگی سـوپای خەلافـەت بـووە ئەوروپیانـە لـە سـەردەمی سـولتان محمـودی دووەم، لەسـالی ١٨٣٩ لـە سـەردەمی (سـولتان عەبدولمەجید) دەستورێكی تێكـەل بـەنیوە عـەلمانی(پیـك هـاتو لـە بنـەماكانی شورشی فرنسی) و نیوە ئیسلامی دارژرا، بۆ یەكـەم جـار دەسـتورێك دارژرا كـە

---

[١] الاسـلام والعلمانية واثرهما فى نشأة الدولة العراقية الحديثة

(سەرچاوەی بەتاقی تەنها شەریعەتی ئیسلام نەبێ) لە مێژووی خەلافەت[*]، .. تا پەیدابوونی ئەتاتورك، کەواتە ئەو بزوتنەوەیەی لە معاویە دەستی پێکرد لە ئەتاتورك کۆتایی هات، بە یەکەم کۆماری عەلمانی.

بە پێی هەریەکە لە (د.محمد عمارە، د.أحمد فرج..) یەکەم (فەرهەنگ) کە عەلمانیەتی لە جیاتی سیکولاریزمی ئینگلیزی و لائیکی فەرەنسی بەکارهێناوە فەرهەنگی (عەرەبی-فەرەنسی) لویس بەستەری میسری بوو لە ساڵی ١٨٢٨ کە لە ڕیزی سوپای فەرەنسی داگیرکەری میسر ئیشی دەکرد[1]، بۆیە (علمانی) داناوە تا بەرەی "علم"وەرگری، واتە ئەنقەستی تیابووە، سەرنج بدە لە کوردیش (رامیار) لەجیاتی سیاسەت هاتووە واتە (مکرباز) کە گوزارش لە رێبازی میکاڤیلی دەکا، نەك هەموو سیاسەت بەهەمان شێوەش هەڵبژاردنی عەلمانیەت وایە، لویس بەستەر Laigue فەرەنسیەکەی را تەرجەمە کردووە بە (علم)، چونکە لە Lagos ی فەرەنسی مانای (علمە)، جۆرە دزیەکە. وەك سەرقافلەی داگیرکەر هەردەم نووسەرو ڕەوشەنبیری وا هەبوونە و هەنە، بۆ جێ گیرکردنی چەمك و پێناس و پێوانەکانیان، عەلمانیەتو بەشێك لە عەلمانیەکان لە ئەسڵدا ئەو پێشەنگە بوونە، وەك لە لێدوانەکانی سیاسەتمەدارو سەرکردە سەربازیەکانی رۆژئاواش هەروا دەردەکەوێ کە کێشەی هەرە بنچینەیان بۆ ساتای داگیرکردنی وڵاتانی ئیسلام ئەو قورئان و شەریعەتە بووە، عەلمانیەتیش بەشێك بووە لەو ساتایە، بۆیە جار وایە ناوی (قۆڵی پێنجەم- الطابور الخامس)یشی لێ نراوە، ئیتر چەندین نووسەر و فەرهەنگ نووس و رێبازی عەلمانی لەگەڵ بزوتنەوەی مەشروتیەت (دەستوری) دروست بوو، لە سەرەتای سەدەی بیستەم بە زەق تر پەیدابوون هەتا لەناو جەرگەی خەلافەتی عوسمانیش، حیزبی ئیتحاد تەعالی و

---

[*] لەسەردەمی سەلیمی قانونی (گول خانە )دەرچو دوایش (خط همایونی ..) هەندێ فەرمانی تریش بەلام ئەو شێوازەی وەرنەگرت ببێتە شریك لەگەڵ شریعەت .

[1] أ-معركة المصطلحات- د.محمد عمارە ل٦٤. ب-علمانی و علمانیە- د.أحمد فرج.

تەرەقی تورکی لە ١٨٨٩لە یادی سەد ساڵەی شۆڕشی فرنسی دروست بوو، تیایدا بیری نەتەوەیی و لیبراڵی لە جیاتی بیری ئیسلامی داهێنا، نکین ئەلب (٥) بەرگی (توران)ی نووسی وەك تیۆری نەتەوەی تورك لە جیاتی شەریعەت، چەندین ناوەندو سەنتەرو حیزبی تری عەلمانی لە سەرانسەری سنووری خەلافەت دروست بوو، چەندین ڕەوشەنبیری عەلمانیش لە تورکەکان وەك:مدحت پاشا، نامق پاشا، تکیلن ئەلب، زیا ئەلب کۆك، أنور پاشا، مصطفی کمال..، ئینجا وەك (سەربەسەر) ڕۆژئاوا (٣) مەرجی بەسەر مصطفی کمال سەپاند کەلە کۆنگرەی لۆزانی١٩٢٣ بەو شێوەیە بەرجەستە بوو:

١-هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت و دامەزراندنەوەی دەوڵەتێکی نەتەوەیی.

٢-دەستورێکی عەلمانی مەدەنی لەجیاتی دەستووری ئیسلامی.

٣-سەرکوت کردنی هەر تەقەلایەك بۆ زیندوو کردنەوەی خەلافەت .

لە بەرامبەریدا ڕۆژئاواش سیڤەری گۆڕی بۆ لۆزان کە تیایدا کورد پشت شکێن کرا لەگەڵ خەلافەت، عەلمانیەکانی کوردیش پێی قایل بوون.

لە ناو عەرەبیش (نجیب عازوری، احمد لطفي سید، ساطع الحصري، اسماعیل مظهر، قاسم أمین، طه حسین، محمد عزه دروزه، سەلامە موسی، انطوان سعاده، علي عبدالرزاق، بطرس بستاني، شبلي شمیل، فرج أنطوان، میشیل عفلق، جمال عبدالناصر..) زۆر سەرکردە و سیاسەتمەداری جیهانی تر ڕۆڵیان بینی و کاریگەریان لەسەر جیهانی ئیسلامی و عەرەبی هەبوو، لەوانە: سوکارنۆ، نەهرۆ، سۆهارتۆ، غاندی، ... لە جیهانی ئیسلامیشدا ڕابوونێکی عەلمانی سەرتاسەری سەری هەڵدا و بەرەبەرە جێی خەلافەت و شەریعەتی ئیسلامی گرتەوە، لەناو کوردیش: (ئیسحاق سکوتلی، عبداللە جوودت، بەشێك لە بەدرخانیەکان، ڕەفیق حیلمی، شەریف پاشا، إبراهیم أحمد..) و چەندین نووسەر و ناوەندی کوردیش لەسەرەتا هاوکار لەگەڵ عەلمانیەتی تورکی دروست کردبوو، سەرنج بدە لە بڵاوکراوەی (مەشروتیەت) بە پێنووسی (شەریف پاشا)ی کورد لە

(ژ: ٤٠ی ساڵی ١٩٠٣) چۆن نووسیویەتی: (ئەوەی دەیسەلمێنێ کورد ئازاد بووینەو ئازادیخوازن ئەوەیە کە ئافرەتانیان هەرگیز پەچە ناپۆشن)[١]، گۆتەی (تا ئەوروپا لە کۆت و زنجیری ئایین ڕزگاری نەبوو پێش نەکەوت، ئاواش ئێمەی جیهانی ئیسلامی تا لە ئایینەکەمان ڕزگار نەبین پێش ناکەوین ) زۆر باوی هەبوو، بەو شێوە وڵات لەدوای وڵات پەیڕەوی عەلمانیەتیان دەکرد، خدێوی ئیسماعیل لە ١٨٨٣ یاسای فەرەنسی هێنا ناو میسر، هەندێ وڵاتیش لەگەڵ داگیرکردنی لەلایەن ڕۆژئاوا عەلمانیەتیان هێنا جێی شەریعەت، لەوانە جەزائیر ١٨٣٠، عێراق و وڵاتی شامیش لەگەڵ دروستکردن و داگیرکردنی، تونس یاسای فەرەنسی لە ١٩٠٦ پەیڕەوکرد. مەغریب لە ١٩١٣، زۆربەی ئەفریقیاو ئاسیاشی گرتەوە، هەمان بەڵێنی پێشکەوتنی تەکنۆلۆجی و سەربەخۆیی بە کورد درا لەلایەن عەلمانیەتی کوردیەوە. ئەوە مانای پێش کەوتنی وەرگرتبوو، بە هەمان ڕووکار هونەر و وێژە و کەلتووری کوردی بەرە بەرە ناوەڕۆکێکی عەلمانی وەرگرت هەتا ئێستاش لە (سروودی نیشتیمانی) کوردی وا هاتووە: ...دینمانە ئاینمان هەر نیشتیمان ! ئەوە لە کاتێکدایە دەبینین خەلکی تر گۆڕا بەرەو ئەنتی عەلمانی، سروودی نیشتیمانی چیچان (٧ جار –لاالە الاالله-)ی تێدایە، ئیتر کوردو جیهانی ئیسلامی لەگەڵ هاتنی عەلمانیەت مصیبەتیەکانیشی بۆ دروست بووە، کوردیش پێی دابەش و داگیرکراوو بووە.

## عەلمانیەتی ئێستا:

عەلمانیەتی ئێستا درێژکراوەی دەهریەکانە کە لەگەڵ زانایانی ئیسلامی ڕووبەڕوو بوونەوەو کتێبیان لەسەر نووسراوە تا سەدەی بیستەمیش، لەوانە (منقذ من الضلال) غزالي، (ضد الدهريين- افغاني)،زیاتر عەلمانیەتێکی ڕۆژئاواییە ،دوای ئەوەی عەلمانیەتی ڕۆژهەلاتی شکستی هێنا .

---

[١] ڕۆژنامەگەری کوردی بە زمانی فەرەنسی.

د.مراد وەهبە (١٠) خاڵی دەست نیشان کردووە کە نیشانەی بەرەو عەلمانیەتە، دەبینین هەمان توخمی بنچینەییەکانی دەهری و فەلسەفەی مادی و توخمەکانی (تەغریبی) ئائایینی تیایە:

١-مرۆڤ ئاژەڵێکی سروشتیە نەك جێنشینی (خلیفە)ی خوا لەسەر زەوی.

٢- مرۆڤ کوری ئەو دنیایە نەك دنیایەکی تر.

٣-ئاین دەرهاویشتەی پێویستی مرۆڤە نەك سەرووی مرۆڤ.

٤-رزگارکرنی مرۆڤ بە عەقلانیەت لە دژی ئاین .

٥-جێگرتنەوەی زانست لە جیاتی میتافیزیك و شتی نادیار.

٧- پەیوەندیە کۆمەلاّیەتیەکان جۆی پەیوەندیە ئاینیەکان بگرێتەوە.

٨-رەووشت بەند بێت بە تام و چێژێك هەر کەسە بۆ خۆی.

٩- مرۆڤ پێوانە و دوامەبەست دەبێ.

١٠- مێژوو رزگار بکرێت لە دەست خواوەند بدرێتە دەست سروشت[١].

هەرچەندە عەلمانیەتی ئێستا هەمووی یەك جۆر نیەو ئەو (١٠) خاڵەی لێ ناسازێ، هەیە توونـد وەك کۆنـە چـەپ و ڕادیکالیـە نەتـەوەیی و دیکتاتۆریـە عەلمانیەکان، میانڕەویش هەیـە وەك نیشتیمان پـەروەر ودیموکرات و ئاشـتی و خوازەکان، ئەوانە لێك جیان، هەشە هەر قایل نیە پـێی بلۆـێ عـەلمانی، بـەلاّم هەموویان بەرەو مەملەکەتێکن کـە پـێی دەلێن (بەرژەوەنـدی تایبـەت)، کـە بنەماکانی تیۆری سیاسی لێ تەرت و وێران دەبێ، ئەوانـە بـەو دۆخـەی پـێ ی گەیشتون کـە لایـان وایـە دنیـا هـەموو بوویتـە بەرژەوەنـدی و سیاسـەتی هەڵخەڵەتاندن و.. بەزەحمەت پێی هەرس دەکرێ ئاین و سیاسەت جیا نەبن، یان خەلکی تر هەیە سیاسەت دەکا بە مەبادیئو دوور لـە بەرژەوەنـدی تایبـەت، بـە تایبـەتی بەشـێکیان هەنـدێ تێروانینـی کلاسیکی هەلّـەی وەك گۆتـەکانی: (شەریعەتی ئاسمـان و یاسـای زەوی)، (ئاینـەکانی ئاسمـان)، (ئـاین بـۆ خـۆت و

---

[١] مدخل الى تنوير - د.مراد وهبة.

سیاسەتیش بۆ گشتی)، (زانایانی ئایینی لەسەروی سیاسەتن)، (دینداری خۆت بکە و هەقت لەکەس نەبێت)، (نوێژ و رۆژی ڕێ ی لە هیچ نەگرتووە)، (پیاوی ئاینی بۆ مزگەوت و سیاسیش بۆ دەوڵەت)، (زەوی بۆ مرۆڤ و ئاسمانیش بۆ خودا).. زۆری تریش، هەڵبەتە ئەوانە هەمووی هەمان زنجیرەی (اعطوا.. ما لقیصر لقیصر، وما لله لله)[1]، (واتە مافی قەیسەرە حوکمی زەوی بکا و خواش حوکمی ئاسمان)، بەو شێوەیە نەك عەلمانیەکان هەتا بەشێك لە زانایانی ئیسلامیش بە سانایی ناتوانی سیاسەتێکی ڕەسەنی مەبادیئی و شەرعی لەو سەردەمە ئاڵۆزە بدۆزێتەوە، ئەوە لە لایەك و لە لایەکی تریشەوە عەلمانیەکان هەمرودك لە هەشت و هەری ڕۆژانی (١،٢،٣)ی مانگی ئاداری ١٩٢٤ لە ئەنجومەنی نیشتیمانی تورکیا ڕوویدا لە بارەی هەڵوەشانەوەی خەلافەت و جێ نشین کردنی عەلمانیەت لە جێ ی ئەوا مصطفی ئەتاتورك بەو چەند پرسیارانە بەسەر نەیارەکانی دا سەرکەوت: چۆن شەریعەت (قورئان و سوننە)ی نەگۆڕ دەشێت بۆ کۆمەڵ و جیهانێکی گۆڕاو؟ ئەو قورئانە بۆ سەردەمێك هاتووە زۆر جیایە لەگەڵ کۆمەڵگەی خۆمان، بۆیە ئەو شەریعەتە چی تر ناشێت، دواێ خستووین، .. هەر ئەو جۆرە تێڕوانینە بنەمای تێگەیشتنی ڕەوشەنبیرانی عەلمانی دروست کردوو، بە کوردستانیەکانی ئێستاشەوە، بۆیە نەك خۆی بەنامۆ نازانی، لای وایە بزوتنەوەی ئیسلامی و بانگێشەی زانایانی ئاینی نامۆیە کە داوای پەیڕەوکردنی شەریعەت دەکەنەوە، لەگەڵ کەم زانیاریان لە بارەی ئیسلام یەکجاری لێیان ئاڵۆز بووە، بەو شێوەیە حزبە عەلمانیەکان، دەوڵەتانی عەلمانی، .. تاکی عەلمانی.. بەوە دەناسرێتەوە کە تێڕوانین و بیروباوەڕو یاساکانی دەستکردن و جیان لە تێڕوانین و بیروباوەڕ و شەریعەتی ئیسلام، هەروەك (نەوشیروان مصطفی) لەو بارەیەوە دەڵێ من و مامۆستای خاڵ لە بیروباوەڕیش (عەقیدە) جیابووین[2]، کۆمەڵە (حرام و حەلال)ی عەلمانی لەگەڵ کۆمەڵە (حرام و حەلال)ی ئیسلام لێك

[1] ئینجیل متی (٢٢)-١٤.
[2] پەنجەکان یەکتر دەشکێنن-ل٢٧٦.

جیایە، هەندێکیشیان هەر بە تەواوەتی دژیەتی وەك ئەو جۆرە عەلمانیەی کە لەو چوار خاڵەی کە وێنە کراوە لە لایەن (پرۆتۆکۆل حکماء صهیون) دەتوانرێ لەو چوار خالە کۆ بکرێتەوە : (١-ئابووریەکی پڕ سوو، ٢-یاسای دەستکرد جیا لە شەریعەت، ٣-فێرکردنێکی نا ئاینیانە، ٤-دیموکراسیەك کە جێگەی باوەڕ بگرێتەوە)[1]، ئەوەی هەرە نەرمەکە و تاکتیك زان و بە دیبلۆماسیەتە لەگەڵ ئیسلام بەو شێوە یاساییانەی خوارەوە لە دەستوری وڵاتەکەی -یان پەیڕەوی حیزبەکەی- دەنووسی:

- شەریعەتی ئیسلام سەرچاوەیەکی گرنگی یاسایە.
- شەریعەتی ئیسلام سەرچاوەیەکی سەرەکی یاسایە.
- شەریعەت سەرچاوەیەکە لە سەرچاوەکانی یاسا.

نموونەشیان زۆربەی وڵاتانی موسڵمان نشینن کە دەستوورەکەشیان لە ئەسڵی فەرەنسی و ماگناکارتی بریتانی نزیك ترە نەك لە ئیسلام، سەرنج بدە عەلمانیەتی دەستووری فەرەنسی، لە ٢٧/تشرینی یەکەمی ١٩٤٦ لە پەرلەمان هاتووە (نە دژی ئاین نە ئاینیش بێت)، ئەوانیش بە ڕەچەڵەك دەگەڕێتەوە سەر دەستووری ڕۆمانی، یەکەم جار لەجیهانی عەرەبی لە لایەن (فەقیهی یاسایی-د.أحمد سەنهوری میسری) بەشە مەدەنی دەستوورەکانی لەسەر دەستووری فەرەنسی نەقل کردوە، دوای هەموار کراوە بە مەبادیئی سۆشیالیستی یان شیوعی یان نەتەوایەتی لەگەڵ (باری کەسێتی) ئیسلامیش، بەشە سیاسیەکەشی زۆربەی لەلایەن داگیرکەر و بەپێی چەکی (ئینتداب) پڕکراوەتەوە، هەروەك دەستوری ١٩٢٥ی عێراق بریتیە لە خوردەی چەکی ئینتدابەکە. ئیتر بەوانە بوترێ دەوڵەتی ئیسلامی نەك هەر بوختانە بەڵکو هەڵەی زانستیشە وەك بڵێی ٣+٤=٩، بەهەمان شێوە حزبە عەلمانیەکانیش سەرچاوەی ئایدیۆلۆژیان بریتیە لە مەدرەسەکانی سۆشیالیستی یان لیبرالی یان شیوعی یان نەتەوەیی، یان تێکەڵێك

---

[1] بۆ زیاتر بڕوانە کتێبەکانی: انور جندي (سقوط العلمانية)، هەروەها العلمانية و الدولة الدينية- شبلي عيسمي ل٦٢،هەروەها ڕاستەوخۆ بڕوانە بروتوکولات حكماء صهيون .

لە وانە، بۆیە ئەندام بوون لە حیزبێکی عەلمانی عەرەبی یان کوردی یان ئەوروپی وەك یەکە، ئاینی جیا رێگر نابێت هەروەك شبلی عیسمی دەڵێ: (فالمؤمن و غیر المؤمن في مرتبة إعتبارية سوية)[1]، هەر بۆیەش ئێستا دەبینین ئەندامی عەرەبی لە کنیسەی ئیسرائیلی هەیە، یان لەناو حیزبێکی مەسیحی ئەوروپی، جیاوازیەکی وا نیە کوردێك چ لە حزبێکی سۆشیالیستی کوردی بێت یان لە ئەوروپی، هەر بۆیەش دەستووری عیراقی (سەردەمی رابووردوو)و تورکی و ئەڵمانی لێك نزیك ترە نەك عیراقی و تورکی و ئێرانی بە نموونە، یان پەیڕەوی (ی.ن.ك) و (پ.د.ك) لە ناوەڕۆکدا لە (حزبی سەوزی سویدی- کە ئەندامێکی سەرکردایەتی کوردیشە بەناوی جبار ئەمین) نزیك ترە نەك لە حزبێکی ئیسلامی کوردستان، بە هەمان شێوەش بۆ حزبە ئیسلامیەکان.

واتە جیهان دابەشی مەدرەسەیە نەك نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی و هەتا شارستانی وەك (هندگتن) بۆی چووە، دەوڵەت و بزوتنەوەو تاکی ئیسلامی لە جەوهەردا لە عەلمانیەت بەوە جیادەکرێنەوە کە (شەریعەتی ئیسلامی تاکە سەرچاوەی بەرنامەی ژیان)ی بێت ، بە هەمان شێوەش ئێستا تاکی عەلمانی و ئیسلامیش لەو دووریانە لێك جیا دەبنەوە، تاکی عەلمانی تێ دەکۆشێ بۆ هێنانەدی یەکێ لە مەدرسە عەلمانیەکانی سۆشیالیستی یان لیبراڵی یان شیوعی یان نەتەوەیی..هتد، ئیسلامیش بۆ دەوڵەتی ئیسلامی، ئەوەی بێلایەنە و بۆ هیچ تێ ناکۆشێ زۆربەی جار بە(عەوام) ناو دەبرێ یان لە باشترین دۆخیدا (سەربەخۆ)ی پێ دەوترێ .

لە دوای قەڵۆش بوونی عەلمانیەت بە تایبەتی لە کۆتایی سەدەی رابووردوو تا ئێستاش بە فراوانتر گەڕانەوە سەر بەکارهێنانی ئاین و شاردنەوەی عەلمانیەت، هەر لە سوێندی یاسایی و یادکردنەوەی بۆنە ئاینیەکان و قورئان خوێندن و وەزارەتی ئەوقاف و.. بەڵام لە کۆتاییدا هەر بەکارهێنانی ئاینە لە پێناو

---

[1] العلمانيه و الدوله الدينيه- ل٥٤.

عەلمانیەت، مادام دەستورەکەی عەلمانیە، شالێردا ئاسنەودی عەلمانیەت پێودرێکی وردتری دەوێ، ئەویش ئەودیە ئاخۆ لە نێوان دەستور (دستور السائد)و ئایین کامەیان (مرجع)ی کامەیە؟ ئەگەر دەستوور سەرجع بوو ئەوا عەلمانیە، پێچەوانەش بە پێچەوانەوە، واتە بەو پرسیارە حیزب و لایەن و دەوڵەتی عەلمانی و هەتا تاکی عەلمانیش لەڕووی پاسایەوە لێك دەکرێتەوە کامیان ڕابەری کامیانن؟ دەستوور یان ئایین؟ هەڵبەتە ئەو پرسیارە جیایە لەگەڵ پرسیارەکەی (گیزۆ*).

لە کۆتاییدا پێش ئەوەی هەمو بناغەکانی عەلمانیەت هەڵتەنگێنینەوە لە (مصطفى كمال) را.. دەبینین عەلمانیەکان لە دوای شکستی شیوعیەت بە پانتاییەکی فراوان گەڕانەوە لای ئایین بۆ هەموو بوارەکانی سیاسی، کۆمەڵایەتی، جەنگی، دیلۆماسی، دەستووری، فەرهەنگی، نیشتیمانی، .. نەك هەر ئیسلام بەڵکو مەسیحی و یەهودی و ئاینەکانی تریش بەو مەرجەی-لەنێو جیهانی ئیسلامیدا- ئیسلامی سیاسی نەبێت ، سەدەی (٢١) بە سەدەی ئاینی دەژمێرن، ناسنامەکان ئاینینە، ئوسولیەتی مەسیحی دەوری هەرە گرنگی جیهانی هەیە، (مل ملانێی شارستانیەکان-هندگتۆن) کە ئێستا ئەمەریکا و رۆژئاوا لەسەری دەڕۆن ناوەڕۆکی ئاینیە، هەر چەندە رۆژئاوا وازیان لە ئایین نەهێنا بوو، لە ڕاستیدا هەر خودی دەوڵەتی ئیسرائیلی لەسەر بنچینەی ئایین دروست بووە، هەتا لە لایەن (گوڵدمائیر-سەرۆك وەزیرانی ئەوسا) وەسفی سەرکەوتنەکانی (سوپای ئیسرائیل) بە چاکترین موفوسیری تەورات دەکرد، ئێستا وا تەیاری دڵسۆزانی نەتەوایەتی عەرەبیش لە دوای دژایەتی ئیسلام بۆی گەڕاونەتەوە .

هێشتا عەلمانیەتی کورد بە چاکی دەرکی بەو گرنگیەی ئایین نەکردووە لە قۆناغەکانی (١٩)ی ئەورووپاو سەدەی ڕابووردووی عەرەبە.

---

*( گیزۆ)ی فرنسی ئەو پرسیارەی هێنا ئاراوە ئاخۆ دابونەریتە سروشتی دەستور دیاری دەکا یان پێچەوانە؟

## پاساوە نوێیەکانی عەلمانیەت:

مەبەست زیاتر لێرە لە جیهانی ئیسلامیە ئەگینا لە جیهان زیاتر ئەو پاساوە هەیە مادام بەرنامەیەکی سیاسی تری ئامادە نەبێت، لە ناوەڕاستەکانی سەدەی ڕابردوو وەفدێکی زانایانی ئیسلامی لە ئەفریقا سەردانی (ماوتسی تۆنگ)یان کرد و باسی بەرنامەی ئیسلامیان بۆ کردبوو، لە وەڵامدا وتبووی: جا ئەگەر وڵاتی من خاوەن ئاینێکی وا بە بەرنامەی هەمەلایەن بوایە مـن هـیچ پێویستم بـە عەلمانیەت و شیوعیەت نەدەبوو، بەڵام لـە چین ئـاینی تـاوی و کۆنفۆشیۆسی زۆرایەتیەکەیە کە بۆ ئەو سەردەمە ناشێ و بنەمای گەشەی تیا نیە.. کەواتە لـە جیهانی ئیسلامی ئەو بەرنامە هەیە بۆیە ئێستاش لە دوای ئـەو هـەموو فـشارە هەمە لایەنە لە وڵاتێکی وەك تورکیا عەلمانیـەت شـێ نابێـت یـان وەك ئێـران (زەمانی شاه)، ئیتر پاساوەکانی عەلمانیەت گەرمترین جـەنگی فیکریـە کـە لـەو خاڵانە دەنوێنرێت:

(دیوکراسـی و کۆمـاری و مـافی مـرۆڤ و فـرە لایـەنی و دروسـت کردنـی کۆمەڵگەی مەدەنی و بازاڕی ئازاد، گەشەکردن، یەکێتی نیشتمانی .. تـەنیا بـە عەلمانیەت بەدی دێت)، ئەو خاڵەی دوای زۆر دەووروژێ و دەڵـێن هـەر وڵاتێکی ئیسلامی دەبینین وەك: هیند، لوبنان، یان عیراق، لە کۆمەڵێك ئاین پێك هـاتووە ئەگەر عەلمانی نەبێت پارچە پارچە دەبێت.

وەڵامی ئیسلامیەکانیش بەهێزترە بەتایبەتی لەو سەردەمە و بـە کورتیەکـەی ئەوەیە:

١-گەشەی زانست و تەکنەلۆجیا پەیوەندی بە جۆری حوکم و سیاسـەت نیـە، ئەگەر ڕاست بوایە دەبوایە ڤێتنـام و کـەمبۆدیا بـێ ئـاینی زۆر لـە پـێش یابـان بوونایە کە ئاینێکی دوا کەوتووی هەیە.

٢-دیوکراسی و کۆماری و مافی مرۆڤ.. پێکەوە نەبەستراون بە دەیـان نموونـە هەیە کۆماریە و نادیوکراسیە، زۆریـەی وڵاتـانی عـەرەبی عـەلمانی و کۆمـارین،

کەچی دیکتاتۆرین، لە ڕۆژئاواش: شیلی، ئیتالیا، پرتوغالو ئیسپانیا.. پێشوو، خاوەن بازاڕی ئازادو عەلمانی بوون، کەچی دیکتاتۆری بوون دیموکراسی نەبوون.. ئەوانە مەرج نین، تەنانەت بە پێچەوانەش هەندێ جار چ لەناو وڵاتانی عەرەب چ لە ڕۆژئاواش مەلەکیەکان دیموکراسی ترن لە کۆماریەکان. خۆ بزوتنەوەی شوڤینی فرنسیو فاشی ئیتالیو نازی ئەلمانیو ڤالانژیسی ئیسپانی.. لە هەناوی دیموکراسی بازاڕی ئازاد هاتەکایەوە، بەعسیەتیش لە عەلمانیەت و کۆماری هاتەدی ٠

٣-ئینجا بازاڕی ئازادو کۆماری ئەو پێوانەیە چاکە نین هەتا چاکەی تری پێ بپێوری، هەتا دیموکراسی خۆشی (بۆ زیاتر سەرنج بدە بابەتی دیموکراسی، بازاڕی ئازاد..).

٤-ئەو وڵاتانەی فرە ئاین و نەتەوەن نموونەی سەرکەوتوو نین لە ژێر سایەی عەلمانیەت: لوبنان هەموو توێژو چینەکان تێك بەربوون، یەکێتی سۆڤیەت، یوگسلافیا، چاد، سۆمال، ڕوانداو بۆرندیو عیراق و هیندو.. هەموو جەنگە ناوەکیەکان هەر لە ژێر سایەی عەلمانی بووە.. کەواتە عەلمانیش چارەسەر نیە هۆیەکەی قووڵ ترە، خەلەلی ڕۆژهەلاتی ناوەراست (بەنمونە) لە سنوورەکانە کە بە پێی (سایکس بیکۆ١٩١٦) کێشراوە، یان خەلەل لە نەبوونی (دادگەریە)، چونکە وڵاتێکی وەك سۆمال یەك زمان و یەك نەتەوەو یەك ئاین و هەتا یەك مەزهەبیشن، کەچی لە ژێر سایەی عەلمانیەت پارچە پارچە بوونە تا ئێستای ئەو نووسینە، ئینجا ئەوە بووە سەدەیەك عەلمانیەت نەیتوانیوە عەرەبی یەکبخا بەلکوفاکتەری پارچە پارچەییەکەیە، هەروەها کوردستانی مەزنیش لەژێر سایەی عەلمانیەت دابەش و پارچە پارچە کراوە، ئەوە سەدەیەکیشە بەرەو خراپتر پەرتەوازەیی تر دەچێت، تەنانەت کوردستانی خوارو لەژێر سایەی ئەزموونی عەلمانیەتی یەك نەتەوەو یەك مەزهەب و... کردبوویانە دووپارچەو دوو حکومەت دوو ...هتد .

کەچی دەبینین لە مێژووی ئیسلامی و نموونەی نوێی ئیسلامی تا ڕادەیەك

کەمێك ئازادی هەبووبێ و هەبێ عەلمانیەکان پاشە کشە دەکەن و ئیسلامیەکان گۆڕەپان داگیر دەکەن، هەروەك بینرا لە: جەزائیر، ئەردەن، تورکیا، یەمەن، لوبنان، فەلەستین، تاجیکستان، .. وا ئێستاش دەبینرێ لە مەغریب، تورکیا، پاکستان، بەحرەین، ئەندۆنیسیا و مالیزیاو هەتا لەو دۆخە ناسروشتیەی سۆمالیش، زۆری تریش بەڕێوەیە. هەڵبژاردنەکانی عێراقیش ٢٠٠٤ لەژێر سایەی داگیرکاریش بوو هەر ئیسلامیەکان زۆرینەی دەنگیان هێنا.

٣-قەیرانی ناسنامەی هەیە، بەزمانێکی پالاو نالێ من چیم، ئیسلامیە و عەلمانیشە، دیکتاتۆریە و دیموکراسیشە، نەتەوەیی و نومیشە، .. هەمووە و هیچیش بەتەواوی نیە، بۆیە دەبینین نەك جیهانی سێ یەم، حزبە کوردستانیەکانیش بە تایبەتی دەسەڵاتدار یادی جەژنی کرێکار، جەژنەکانی ئیسلام، جەژنی مەسیحی، جەژنی نەتەوەیی، .. هەمووی دەکەنەوە..، ساڵانەش لە پانۆرامای مێژووی کوردستان تەنیا دەنگ و باسی حزب و سەرکردەی خۆی تۆمار دەکا، واتە ئەوانی تر نین.

٤- عەلمانیەتی ئێستا لەسەر ڕێبازو بەرهەمی فکری خۆی ناڕوا، لە سەردەمی فکری شیوعی زۆربەی ناوەڕۆکێکی مارکسیان هەبوو، لەگەڵ سۆشیال دیموکراس و وجودی و فەلسەفەو ڕاڕەودکانی تر.. بەڵام لە هەموویدا تێبینی دەکرا لایەنە سەلبیەکانی ئەو ڕێبازانە پەیڕەو دەکرا نەك لایەنە ئیجابیەکانی.

٥- بەشی زۆری عەلمانیەتی ئێستا نە خزمەت دەکا و نە ئیشتمانی و دیموکراسیشە، گەڕاوەتەوە سەر پێناسەکانی بەشێك لە فەرهەنگە ڕۆژئاواییەکان کە عەلمانیەت (Secular) بە دنیوی و بێ مبالات و بێ بەرپرسیاری لێك دەداتەوە.

٦-لە کاتێکا لەو سەردەمەی عەولەمە هەر مەدرەسەو لایەنێکی سیاسی پێویستی بەوە هەیە لە هەوراز و نشێو، لە دەسەلات و معارەزە، لە بوونی و نەبوونیدا.. بەرنامە و پلانی ستراتیجی هەبێت بتوانێ جەماوەری بێت.. کەچی

پێکەوە ژیان ئاسایی بووە، پێکەوە ژیانی فرە نەتەوە و چین و توێژ و فرە ئاینیش، هەموو ئایەینەکانیش سەربەست بووینە، لە ئێرانی ئێستا، لە ئەفغانستانیش لە سەردەمی تالیبان چاکتر بوو هەتا لە سەردەمی شیوعیەتیش کە هەردوو بالی (پەرچەم)و (خەلق) لە دژی یەکو بەرەی جەنگی تر لە دژی نەتەوەو ئاینی تریش.. ئینجا دەبینین میللەتێکی پارچە پارچەی وەك یەهود ئاین کۆی کردوونەوە بەرامبەر (٢٢) وڵاتی عەرەبی عەلمانی پارچە پارچە.. ئینجا هەر ئاینیشە ئێستا بەرگری نیشتیمانی پێ دەکرێ.

## قەیرانەکانی عەلمانی (زیاتر مەبەست لە جیهانی ئیسلامیە):

لە سەرەتای سەدەی (٢٠) ڕەوشەنبیرانی عەلمانی جیهانی ئیسلامی بەڵێنیان دا بە نووسین و وتار کە هاتنی عەلمانیەت بەهەشت لەگەڵ خۆی دەهێنێ لە پێشکەوتن و ئازادی و شارستانی، کەچی وا دەبینین جگە لە دیکتاتۆری و پارچەپارچەیی و ناکۆکی و برسیەتی و گەندەڵیو خۆویستی ..خێری نەهێناوە، بەتایبەتی بۆ کورد بووە هۆی دابەشی و داگیرکردن و مەینەتی٠

زۆر بەکورتی قەیرانەکانی لەم خاڵانە دەگوشین:

١- دارمانی شیوعیەت بووە هۆی دارمانی بنەماکانی عەلمانیش، ئێستا حزبە عەلمانیو دەسەڵاتی عەلمانی هیچ مەبادیئو بەهایەکی نەماوە پەیوەستی ناسنامەو دیواری فیکری پێ دروست بکا، بۆیە تەنها دەترانی بە بەرژەوەندی مادی خەڵکی کۆ بکاتەوە کە ترسناك ترین هۆکارە بۆ کۆمەڵ و بۆ خۆشی، هەر ئەو فاکتەردشە سەرچاوەی دەسەڵات بازی و دیکتاتۆریەت و براکوژی و هەتا وڵات فرۆشیش.

٢-بۆیە عەلمانیەتی جیهانی سێ یەم (بەتایبەتی عەرەبی) هەردەبێ دژی پێشکەوتن و عەقلانیەت و دیموکراسی و ئازادی و وشیاری و مەدەنیەت و دادگەری بێت، ئەگینا گۆڕ بۆخۆی هەڵدەکەنێ، بۆیە دەبینین لە هەر شوێنێك

عەلمانیەتی ئێستا تەنیاو تاقە ڕێگەی دەسەڵاتە ئەگینا ڕێگەی تری مردنە.. بۆیەش ژیانی عەلمانی لە جیهانی سێ بەم شەرە دەسەڵات و دیکتاتۆری بە.

٧-تاك و سەرکردەکانی حزبە عەلمانیەکان بە بەرنامەکەشەوە ڕەوای دەدەنە بەرژەوەندی تایبەتی و کۆکردنەوەی زۆرترین خەڵك لەسەر بنچینەی (پێم بدە و پێت دەدەم= take and put).. ئیتر دیاردەی وەك: (بەرتیل، گەندەڵی بێ سنوور، بێ بەهەڵێنی، و بەدڕەوشتی و نیشتیمان فرۆشی و ماستاوچیایەتی و خۆویستی، ..) باو وەردەگرێ و بناغەکانی کۆمەڵیش تێك دەرووخێ.. و ترسناك ترین چارەنووسە.

٨-ئەگەر بەرژەوەندی میللەت یان نیشتیمان یان مەبادیئەکان لەگەڵ بەرژەوەندی حزبەکەیان و سەرکردە تێك گیرا ئەوا یەکسەر دووەمیان سەرکەوتە، ئەوەش سەرچاوەی گشت دیاردە دزێوەکانە و پێوانەکانیش وەردەگەڕێن (ئامراز بۆ ئامانج)، (وەختی بۆ دائیم)، (خائین بۆ جێی دلسۆزی)، (پێش کەوتن بۆ پاش کەوتن)، (نیشتمانی بۆ بەرژەوەندی)، (مەبادیئی بۆ گیرفان)..

٩-لە هەمووی ترسناك تر ئەو مەدرەسە و حزب و لایەنانە خودی خۆیان لەسەر بنچینەی گەشەی فاکتەرە کۆمەڵایەتیەکان بۆ فاکتەرە ئایدیۆلۆژیەکان دروست دەبن.. کەچی ئێستا ئەوان لەو فاکتەرە گەلێ لاوازن، بۆیە ناچار بگەڕێنەوە سەر فاکتەرە کلاسیکی و کۆمەڵایەتیەکان، ئەو کاتیش ناکۆك دەبن هەم لەگەڵ واقیعی کۆمەڵایەتی و سەردەم و هەم لەگەڵ دروشمەکانی خۆیان لە پێك هێنانی سیستەمی دیوکراسی و مەدەنیەت و... بۆیە لە کوردستانیش ڕاپەڕین لەسەر داگیرکەر کراو شۆڕش سەرکەوت، بەڵام ئەلقە لە گوێیانی داگیرکەریش ڕاپەڕین بەسەر بەهاکانی شۆڕش سەرکەوتن.

١٠- ئەو قەیرانانە ڕۆژ بە ڕۆژ لەگەڵ ڕەوتی مێژوو بە خێراتر زیاد دەکات، لە کاتێکا لە پێش هەموان دەسەلاتداری عەلمانی لە ڕابوونی ئیسلامی دا.. کەچی لە ناکاو دەبینی خانەی پۆلێن کردنی چ لە (مل ملانێی شارستانی) چ لە مل

ملانێی واقیعی دەولی لە تەنیشت بزوتنەوە ئیسلامیەکانە. بۆیە هێشتا خانەی راستەقینەی لەو دابەشیەی جیهانیش نەزانیە لە کوێیە (سەروو یان خواروو)، شارستانی ئیسلامیە یان شارستانیەکانی تر، تیرۆرستە یان لە بەرەی دژی تیرۆردا! چاك نازانی ئەوە لە جەوهەردا هەمان ململانێ ی تەوەری کۆنی ئیسلامی و تەوەری رۆمانی-یۆنانیە، سەرنج بدە ئێستا هەموو ولاتانی عەرەبی و موسڵمان نشین کە هاوکاری ئەمریکا بوون ئێستا لە ژێر هەرەشەی ئەون، ئینجا زانا و بیریارە عەلمانیەکانیش.. دەبینین نازانن ئینتیمای شارستانیان کامەیە هەر بە نموونە (طه حسين) دەڵێ: (شارستانی عەرەب و فەرەنسا یەکن لە کۆتاییدا سەر بە شارستانی یۆنانی لاتینین).

١١- بیروباوەرە گەردوونی و مرۆڤایەتی و ئاینیان تێك ئالاوە، بەتایبەتی لەدوای گەشەی زانستی سورانەوەی بەردو راستیەکانی قورئان ئەو بیروبۆچوونە عەلمانیانەی وەك :مادیەت لە فلسفە، گەردوونی بێ کۆتای، تیۆرەکانی پەرەسەندن و...هتد. لەباریەك هەڵوەشاندەوە، بۆیە ئێستا بەڵێنەکەی (جان کوریس) هاتەدی کە لە کتێبی (حقيقة العالم الملموس) باسی کردبوو وتبووی من تا لەقوراوی بنی گەردوون نەگەم ناچمە ناو سیاسەت. بەو پێیە ئێستا عەلمانیەت کە دەچێتە ناو زانستی نوێ لە جوغزی عەلمانی دەردەچێ و پاڵی دەدا بۆ لای ئیسلامی.. بۆیە بەشی زۆری بنەما فیکریەکانی عەلمانی لەگەڵ زانستی نوێ تێك دەگیرێ.

١٢- لەبەر ئەوەی عەلمانیەت ناسنامەو کەلتوری دەردکیە، بۆیە ناچار لەدژی رابردوو و کەلتوورو فەرهەنگی میللەتەکانیان بێ، عەلمانیەتی ئێستا شێوەیەکە لە جەوهەری هیلنسیتی کۆن.

١٣- لەجیهانی ئیسلامی عەلمانیەت قەیرانی زیاترە نەك لەجیهانی رۆژئاوا، چونکە لەوێ ئاینێکی بێ شەریعەت هەیە، نا لێرەدا عەلمانیەکان هەردەم لەگەڵ خودی ئیسلام وئیسلامیەکان لە روبەڕووبوونەوەدان، بۆیە هەرگیز ناتبنە

بزوتنەوەیەکی جەماوەری.. هەردەبێ (توقیە) بەکاربهێنن.

١٤-لەجیهانی ئیسلامیدا دەبێ عەلمانیەت هەموو ئەو داب و نەریت و کەلتوور و ئاین و مێژووی میللەتەکە هەڵتەکێنێ، ئنجا بنەماکانی عەلمانی لێ دابڕێژێتەوە.. عادەتەن ئەو هەنگاوانەش بە وێرانکردنی ژێرخانی کۆمەلگا لە ئەخلاق و بەها و ئاکارەکان دەست پێ دەکا، بێ ئەوەی بتوانێ دروستی بکاتەوە، بەو پێیە وای لێ دێت دەسەلاتی سیاسی و بیری گەندەڵی تەنها بتوانێ لە کۆمەلگەیەکی گەندەڵ بژی. وەك ئێستا لە زۆربەی ئەزموونەکانی عەلمانی جیهانی ئیسلام دەبینین بە کوردستانیشەوە.

١٤-خاڵێکی تایبەتیش تەرخان دەکەین بۆ زیانەکانی عەلمانی کە لە لایەن ئیسلامیەکان و چینە ئاینی و ئیشتیمان پەروەرە ڕەسەنەکان تۆمار کراوە لەسەریان، بە کورتی ئەوانەن:

أ-بزوتنەوەیەکی دژ بە ئاینی ئیسلامە.

ب-فاکتەرێکی هەڵتەکێنی بناغەکانی دامەزراندنی کۆمەڵ و تاکیشە.

ج-مایەی دوو بەرەکی و پەرتەوازەییە و داپچڕاندنە لە ڕابووردوو.

د-مەبەستەکانی بەخ کردنی میللەتانە بۆ ژێر چەپۆکی ئیمپریالیزمی و داگیرکاری.

ع-سەرچاوەیەکە بۆ دیکتاتۆری و تاك ڕەوی، چونکە بوون و مانی خۆی لە نەبوونی خەلکی تر دەدۆزێتەوە.

<u>لە کوردستانیش:</u> سەرە ڕای ئەو خاڵە گشتیانە ئەوا:

أ-لەگەڵ پەیدابوونی عەلمانیەت مەینەتی کوردیش بە هەموو ئاڕاستەیەك دروست بووە.

ب-عەلمانیەت هۆکارە بۆ تێك شێواندنی ڕەوشت و ناوبانگی پیاوەتی کورد.

ج-هەر ئەویشە بوویتە هۆی ئەو هەموو دووبەرەکی و شەڕی برا کوژی و تێکدانی ڕێزی کورد.

(٢) عەلمانیەت لائیکیة Secularizm

د-هەر ئەویشە بە ناڕاستەوخۆ بووە هۆی ئەو هەموو ئەلقە لە گوێیە دروست بێت.

ع-لە ژێر سایەی عەلمانیەت هەرگیز هەموو کوردستان نەیەك دەخرێت و نە حزبەکانیش یەك دەگرێت.

<u>سەرنج</u> : بۆ زیاتر لە بارەی عەلمانی بڕوانە ماستەرنامەی (الاسلام والعلمانية وأثرهما في نشأة الدولة العراقية الحديثة-نووسەر )

(٣)

# دەوڵەت الدولة State

وەك وشە بە پـێی سـەرجەم فەرهەنگـەكان لـە status هـاتوە، ئـەوەش لـە (ستان)ی ئاریەكان هاتوە وەرگەڕاوە بۆ سـتات بەمانای زێد (زێدی باب و بـاپیران = شوێنی باب و باپیران) هاتووە، وەك وشەش (سـتان) لە زمانی ئاری ڕۆژهـەڵات بەمانای وڵات و هەرێم هاتووە، دوای (state)مانای (پایە)ی وەرگـرت، لـە دوای سەدەی (١٢) بووە (پایەی دەسـەڵات)، لە دوای سەدەی (١٤) بە دەسـەڵاتی باڵای مەملەكەت دەوترا دەوڵەت، بە زمانی ئەڵمانی ئێستاش ئەو مانایەی ماوە، لـە فەڕەنسـیش بە (Etat) هاتووە، بەڵام دیـان ئـەو فەرهەنگانـەش بـەزۆری لـەژێر واقیعی جیهانی سەدەی ١٩-٢٠ كەوتنە ژێر كاریگەری ئـەوروپی، ئـەگینا پـێش ئەوانە دەوڵەت و حكومەت بەو مانایەی ئێستای زیـاتریش لـە قورئـان هـاتووە، وەك ڕێـبا ئەوەی ئیجابیە چ وەك ناو چ ناوەڕۆكی ڕەسەنی ئاینی هەیە.

دەوڵەت باڵاترین و گرنگترین دەزگای سیاسـیە بـۆ بـەڕێوەبردن و ڕێكخسـتنی كاروباری تاك و كۆمەڵ[1]، ئێستاش بە هەموو ئەو وڵاتـە سـەربەخۆیانە دەوترێ دەوڵەت، هەندێكیان بچووك وەك (دەوڵـەتی فاتیكـان) كـە ڕوویـەری ١/٢ كـم[2]، ڕووسیاش ١٨ملیۆن كم[2]، هەر مانای دەوڵەتە (هـەروەك د.ترابـی) دەڵێ مانـای ئیمپراتۆریەت و خەلافەت و شاهنشاهی و دار السـلام و دار العهـد.. دەگرێتـەوە[3]، لەدوای سـەدەی (١٩) و وەرچـەرخانی ئیمپراتۆریـەت بـۆ (دەوڵـەتی نەتـەوەیی

---

[1] ا-موسوعة علم الاجتماع ل٢٩٥. ب-موسوعة العالمية.

[2] المصطلحات السياسية في الاسلام ل٣٢.

(٣) دەولەت الدولـة State

هاوچەرخ) چەمکی (دەوڵەت) هاتە جیهانی ئیسلام ، بۆیە دەوڵەت تـەواو مانـای (state) نادا، لە (لسان العرب) و (قاموس المحیط) مانـای ئەوسـای بـە سـامان هاتووە، بە مانای (مداولة في الأمر)یش هاتووە، مانایەکی نزیك تریش (.. تداول نصر في الحروب.. یسمى الدولة).

هەموو شێوە ئیداری و هەرەمییەك دەگرێتـەوە لـە مێـژوو، پێناسـی گـشتی ئەوەیە هەر دەسەڵاتێك میللەتێك لەسەر تیلمە زەویەکی سـنووردار رێکیخـا لـە رووی ئیداری و سیاسـی و سـەربازی و بـەرگری.. دەوڵـەتی پـێ دەووتـرێ، واتـە دەوڵەت : ئومەت+ زەوی+ یاسا+ حکومەت..[1]، یان بەجۆرێکی تر: قەوارەیـەکی سیاسی و یاساییە بۆ خەلکێکی رێکخراو لە نیشتمانێك دا.

لە پێناسێکی تری گونجاوی (معجم مـصطلحات الفنیـة والعلمیـة) هـاتووە: (الدولة هـي جمـع مـن النـاس مـستقرون في أقلیم معـین الحـدود ویـستقلون بحکـم أنفسهم وفق نظام خاص). ئەوە پێناسـی باوە زیاتر گوزارش لە دیفاکتۆی دەوڵـەت دەکا نەك فەرمانی راسـتەقینەی، لەسـەر بنـچینەی سـەر هەلـدانی تونخـەکانی یاسایی دەولەت هاتووە کە پاش کەمێکی تر باسی دەکەین ٠

هەرچی هەندێ فەرهەنگی بالآشە لەوانە (موسوعة علم الاجتماع) ناسـنامەی دەوڵەت بـە یاسـاکانی دەناسـێ. (فالدولـة هـي القـانون والقـانون هـي الدولـة) و پەیوەندی دەوڵەت و میللەتیش بۆ بەرژەوەندی و هێز و یاسا دەگێڕنەوە، ئـەوەیان بۆ هەندێك کۆمەلگە راسـتە نەك بەگشتی، بەشێکی تر دەوڵەت تەنها بـە نەتـەوە دەبەستنەوە لەوانە (قاموس السیاسي) دەڵێ: ((إذا قامـت بـین أمـة سـلطة علیـا فهي دولة، أي الأمة رکن الأولى للدولة)) ٠

بوونی دەوڵەت بە چەکی لەگەڵ مێژووی مرۆڤ مـشت و مـڕی لەسـەر بـووە، بەڵام مـێژگەر شێوەی کۆتی دەسەلات و دەوڵەت وەك ئێستا نـەبووە، ئـەفلاتوون دەوڵەتی نمونەیی وەك بەشەکانی لەشی ئادەمیزاد وێنـە کـردووە (ئـەقڵ، ئیرادە،

[1] مقدمة في أنثروبولوجیا الاجتماعیة.

ئارەزوو) لە بەرامبەریش (دەوڵەت، شا، فەیلەسوفەکان، سەربازەکان، هاوولاتی)، لەلایەن ئەرستۆ و ئەفلاتونیش شار مانای دەوڵەتی داوە، ژمارەش بە (٤٠٥٠) خێزان وەك دەوڵەتی نمونەیی قەبڵێندراوە ، بەڵام ئێستا دەوڵەت ئەو پەیکەرەیە کە (حکومەت، دەستوور، هاوولاتی، پەرلەمان (شورا)، سەرۆك، دادگا، سوپا، سنورێکی جوگرافی..) لەخۆ دەگرێ لە ناوەوە، لە دەرەوەش پەیماننامە و بوون بە ئەندام لە (un) - هەرچەندە ئەوە مەرجێکی هەرە سەرەکی نیە چونکە دەوڵەتێکی رەسەنی وەك سویسرا تا ئەو ساتەش ئەندام نیە لە (un)، بەڵام دەبێ لە ئاستی (شخصیة القانونیة ) بێت .

مەبەستی بنچینەی دەوڵەتیش هەروەك سیاسەت هێنانەدی چاکترین بەختەوەری بۆ زۆرترین کەسە، ئەوەش ئامانجێکی پیرۆزە و لە بنەڕەتدا ئاینیە، واتە دەوڵەتیش ئەرکی بنچینەیی لەڕووی رەوتی مێژوویی وەرگێرانی فاکتەرە شاقولیەکانە بەرەو ئاسۆیی، واتە هەڵوەشاندنەوەی کاریگەرییە کۆمەڵایەتیەکان لەسەر تاك و وەرگێرانی بۆ کاریگەری یاسایی، واتە دەوڵەت سەرچاوەی سەرەکی مەدەنیەتە، بەتایبەتی لەو سەردەمە ئەو بەشە جێبەجێ دەکا، توانیویەتی زۆر کێشەش لەگەڵی چارەسەر بکا بەتایبەتی (مافی هاوولاتی- دەستوریانە)، بەڵام بۆشاییەکی مەزن بەجێ دەهێڵێ پێی پڕ نابێتەوە، ئەویش ئەوەیە چاوی یاسا هەردەم دیار نیە، چ فاکتەرێکی تر هەیە وا لە تاك بکا یاسا نەبەزێنێ، بەرژەوەندی گشتی بپارێزێ.. ئالێرەدا بیرۆکەی دەوڵەتی بێ عەقیدە شکست دەهێنێ، دەبێ دەوڵەتیش خاوەن ئایدیۆلۆژیا بێ بتوانێ پەروەردەی خەڵکی وابکا کە بەرپرسیاری لەسەر شانە ئەوەش بە دەوڵەتی عەلمانی ناکرێ، تەنها لەو سەردەمە بە دەوڵەتی ئیسلامی دەکرێ، بەڵام هەرچۆنێك بێت شێوەی دەوڵەتی ئێستای رۆژئاوا دەوڵەتانی جیهانی ئیسلامی ئێستا زۆر جیایە، شێوازی ئەوان سەرکەوتووترە بە هەموو پێوانەیەك، واتە ئەو شێوازە دەوڵەتەی ئێستا باوی هەیە پێشکەوتنە، بەشێکی گرنگی مەبەستەکانی دەوڵەتی هێناوەتەدی، لەپارێزگاری

(٣) دەولەت دولة State

بەرژەوەندی و بەشە گشتییەکان و هێنانەدی بەختەوەری بۆ زۆرترین خەڵك، ئەوەش ئامانجی ئایینە بۆیە دەوڵەت مەبەستێکی ئاینیە و پیرۆزە بە عەیاری خۆی، بەڵام کە هەڵس و کەوتی مرۆڤی بێ بەرنامەی تێ کەوت سەلبیاتیشی لەگەڵ دەکەوێ، دەبێتە هێزی ستەم و ڕاوەدوونان.. بەو شێوەیە خودی دەوڵەت لە پێویستیەکانە، سەلبی و ئیجابیەکەی ئەکەوێتە سەر (ڕێبازی سیاسیەکەی -کە لە دەستووڕەنگ دەداتەوە) وە(جۆری سەرکردایەتی) کە وڵاتی پێ بەڕێوە دەچێ، ئەگەر دیموکراسیش بێت ئەوا ئەکەوێتە سەر ئەو میللەتە ئاخۆ چ جۆرە دەستور و سەرۆکایەتیەك هەڵدەبژێرێ، ئەوەش دووبارە دەکەوێتەوە سەر مەدرەسەی فکری و سیاسی کە چ جۆرە میللەتێك دروست دەکەن، ئومەیە یان عەوام، وشیار و مەدەنی ڕەوشتدارن یان پێچەوانە، هەر لێرەش مەدرەسەکان لێك جیادەبنەوە بە پێ ی بەرنامەی سیاسیان و چۆنیەتی تێگەیشتنیان بۆ (دادگەری و نا دادگەری)، زۆر شێوەی دەسەڵاتی لێ دروست دەبێت (دیکتاتۆری، سەربازی، تاك ڕەوی، پیوکراتی، دیموکراسی، پادشایی، کۆماری، سۆشیالیستی، نەتەوەیی، شیوعی، ئیسلامی، ..).

## شێوەکانی دەوڵەت

بەسەرەکیش لە جیهان ئەو شێوە دەوڵەتانە هەیە:

١-لە ڕووی ئیداری (فیدرالیەکان، کۆنفیدراڵی، لا مەرکەزی، مەرکەزی، ..).

٢-لە ڕووی سیاسی، دوانەی هەیە وەك (دەوڵەتی ئاینی و دەوڵەتی عەلمانی)، (پادشایی و کۆماری)، (ڕادیکالی و پارێزەری)، (دیکتاتۆری و دیموکراسی)، (نەتەوەیی و ئومەمی)..

٣-لە نێوان هەر دوو خاڵ واتە ئیداری و سیاسی لە ئەنجامی پێویستیا هەندێ جۆر پەیدا دەبێت، وەك دەوڵەتی (سەرۆکایەتی، نیمچە سەرۆکایەتی، پادشایی دەستووری، پادشایی دەسەڵاتی..).

٤-دەولەتی نیشتمانی ونەتەویش لێك جیایە، راستە لە سەرەتادا دەولەتی هاوچەرخ لەسەر شێوەی نەتەوەیی دروست بوو، بەلام دوای کێشە دروست بوو لە نیوان پێك هاتە جیاکانی ئەو دەولەتە، بۆیە جۆری دەولەتی نیشتمانی باوی وەرگرت کە تیایدا لە جیاتی چەمکی دەستوری هاونەتەوەیی چەمکی هاو ولاتی پەیدا بوو، بەکەم سەرکەوتنی دەولەتی نیشتمانی بەسەر نەتەوەیی لە شۆرشی ئەمریکا ١٧٧٦ز بەرجەستە بوو، چونکەسوپای بریتانی و شورشگێرانی ئەمریکی هەریەك نەتەوە بوون بەلام نیشتمانیان جیا بوو ئیتر ئەزمونی دەولەتی نیشتمانی جێی نەتەوەیی گرتەوە، بەلام لە جیهانی عەرەبی لە دەستووریش وەك دەولەتی نیشتمانی پیشان دراوە کەچی پریان کردووە لە بنەمای نەتەوەیی وەك (..جزء من الامة العربية ) وبون بە ئەندام لە (جامعة العربية )و کۆمەلێك دروشم کە جێبە جێشی ناکەن .

٥- هەندی دەدولەتیش کە بەشێوەی نیشتمانیش پێك نەهاتون لەسەر شێوەی (تەوافوق )پێك هاتوون، لەوانە: چیکوسلوفاکیای پێشو، قوبرس، لبنان، ئیماراتی عەرەبی، تا رادەیەك عیراقی نوی ،عادەتەن ئەم جۆرە دەولەتانە لە پۆلی دەولەتی (مرکبة-etat-compos) دەژمێررێن، ئەو دەولەتانەی لە یەك رەگەزیو مەرکەزیانە پێك هاتوون پێیان دەلێن دەولەتی سادە : etat-simple .

دەولەت لە ئیسلامدا هاوتای پاسا و نەتەوە نیە، بێجگە لە بەرژەوەندی و هێزیش فاکتەری هەرە گرنگ رەوشت و ئایدیۆلۆجیاشە راگرو(مقەوەماتی) دەولەتە، رۆژئاوا دەولەتیان بەکارهێناوە بۆ داگیرکاری، بۆ دوو جەنگی جیهانی، جەنگی نوێ تریش، .. بەلام بۆ ناوەخۆش (لە چاو دەرەوە) هەندێ جار نیعمەت بووە لە : ئازادی و دیموکراسی و هەلبژاردن و گەشەکردن و خزمەتگوزاری و پێشخستنی زانست و تەکنەلۆژیا و بەختەوەری ..تا ئەو رادەیە لەگەلّ سیستەمی سەرمایەداری وبنەماکانی بەرژەوەندی برجوازی بگونجیّ، واتە بەختیاریەك بۆ کەمایەتی، بۆیە نەیتوانیوە کێشەکانی ئادەمیزادی چینایەتیو رەگەزیو نەژادیو

نەتەوایەتی.. چارەسەر بکا، هەربۆیەش ئەوان هەر وەك تیۆ ڕوانینی سیاسیان بە ئەرکێکی پیرۆزو ڕەوشتیەوە سەیری دەوڵەت ناکەن، پەیوەندی نێو دەوڵەتیشیان هەر وایە لەسەر بنچینەی (بەرژەوەندیە)، بۆیە بەها و یاساکانی دەولی و هەتا مافی مرۆڤیش لەگەڵ هەندێ ئیجابیاتیشی لە کۆتاییدا دەبنەوە یاسای دارستان، ئەوەش هەر دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی ئادەمیزاد، بە پێی هەریەکە لە میکافیلی، نیتچە، هۆبز، فرۆید، کانت، .. ئادەمیزاد گورگی ئادەمیزادە، جا ئەگەر دەسەلاتیشی هەبێت گورگایەتیەکەی بەشێوەی جیاجیاو لەبن پەردەی جوانی بەرجەستە دەکا، لەوبارەیەوە (کانت) دەڵێ (ئەزمونەکان دەیسەلمێنن کە هەرچی دەسەلاتی هەبووبێ خراپەی کردووە.. هەموو لەگەڵ هەموو..هەریەکەش لەگەڵ هەموو لە جەنگی بەردەوامدان)[1]..هەڵبەتە ئەو حوکمەی (کانت) و ئەوانی تریش لە مێژووی ئەوروپا زیاتر بەدی دەکرێ نەك بەگشتی.

ئەرستۆ (٣٨٤-٣٢٢ پ.ز) پێی وایە دەوڵەت لە فراوان و گەشەی خێزان دروست دەبێ، بۆیە سەرۆك لای پیرۆزە وەك باوك، هەریەکە لە (هۆبز، لیپتیز، رۆسۆ، ..) بە سەرەنجامی رێککەوتن و پەیمانی میللی هاتنەکایەی دەوڵەت دەدەنە قەڵەم، (دۆهرنگ)یش دەڵێ دەوڵەت لە ئەنجامی زاڵ بوونی بەهێز بەسەر بێهێز پەیدابووە، هەرچی مارکسیەتیشە بە سەلبی دەڕوانێتە دەوڵەت و پێی وایە:

١-دەوڵەت لە قۆناغێکی درەنگی مێژوویەوە پەیدابووە لە دوای پەیدابوونی چینایەتی، هەڵبەتە زۆربەی (تطوریەکان) پێیان وا بووە کە کۆمەڵگەی سەرەتایی دەوڵەت، یاسا، ئاین، خێزان، رەوشت، .. بەخۆوە نەبینیوە.

٢-ئامرازێکە بۆ سەرکوتکردنی چینەکانی ژێر دەست لە لایەن چینی دەسەلاتدار.

٣-مێژوو (٥) شێوەی سەرەکی لە دەوڵەتی بینیوە کە لەسەر بنچینەی

---

[1] فلسفه القانون والسیاسه-عمانوئیل کانت -(تا رادەیەك ئەو رایە لەگەڵ دەقی ئاینیش دێتەوە هەروەك لە قورئانیش دەڵێ (کلاأن الانسان لیطغی إن رآی إستغنی) .

(٢) دەوڵەت  الدولة  State

سیستەمی ئابووری دروست دەبی: (١- مەشاعی-بێ دەوڵەت، ٢- بەندایەتی، ٣-دەرەبەگایەتی، ٤- سەرمایەداری، ٥- سۆشیالیستی، شیوعیەت-بێ دەوڵەت دیسان).

٤-هەردەم دەوڵەت نوێنەرایەتی چینێك دەكا وەك دیكتاتۆر، بەپێی ئەو قۆناغانە، كە لە خاڵی (٣) دیاری كرا.

بۆیە دەوڵەت لە ڕوانگەی ماركسی هەردەبێ دیكتاتۆری بێت، لە قۆناغی سۆشیالیستیش كە گوازەرەوەی سەرمایەداریە بۆ شیوعیەت پێویستی بە دەسەڵاتێكی پۆڵاینی تاك حزبی پێشڕەو شمولی دەبێت[1]، تا لە كۆتاییدا (وەك ئەنجلس دەڵێت) دەوڵەت خۆشی دەخورێتەوە نەك بەبڕیارێكی سیاسی هەڵوەشێنرێتەوە، لینین بە وردتر باسی قۆناغی شیوعیەتی بێ دەوڵەت دەكا و دەڵێ: (بۆ هەر كێشەیەكیش كە پەیدا دەبێ لە جیاتی دەوڵەت و پۆلیس و دادگا یەكسەر خەڵكی خۆیان پێی هەڵدەستن بۆ چارەسەری هەروەك ئێستا چۆن دەبینین خەڵك دوو شەڕكەر لێك دەكاتەوە یان نایەڵن دەست درێژی بكرێتە سەر ئافرەت[2]، ئەو بۆچوونە تەنیا لە چوارچێوەی ماركسیەت نەمابوو زۆربەی عەلمانیەتی (ئالیبرالی) جیهانی گرتبۆوەبە، هەتا دەروون ناسەكانیش وەك (فرۆید)، (ماكس ستیرنەر) دەوڵەتیان بە ڕێگری گەشەی تاك و (مــن) زانیوە، هەندێ ڕێبازی ئاینیش لەوانە (تاویە-كە ئاینی بەشێكی زۆری سەرووی ڕۆژهەڵاتی ئاسیایە كە لە بنەچەدا لەسەر دەستی (لاوتزی-٦٠٤ پ.ز) بناغەڕێژ كراوە) ئەویش وەك عەقیدەیەكی ئاینی داوای كۆمەڵگەیەكی بێ دەوڵەت و دەسەڵات دەكا، هەروەها جیرالد و شاڤلی لە كتێبی (قانون جدید)، كرۆتین لە كتێبی (التعاون المتبادل) و (باكۆنین) لە كتێبی (مبادیء الشورة) وخاوەنی بنەمای(تحطیم كل ماهو الواقع

[1] بۆ زیاتر سەرنج بدە: ١-اصل العائلة والملكیة الخاصة و الدولة- أنجلس.
٢-الدولة و الثورة-لینین.
٣-أصول فلسفة الماركسیة. ج-پۆلیتزر.

[2] مختارات-لینین.

(٣) دەوڵەت	الدولة	State

خێر)و ولیام جودین لە کتێبی (عدالة السیاسة)، برۆدۆن و زۆری تر داوای نەمانی دەوڵەتیان کردووە.

هەر بۆیەش ئەو (٧٠) ساڵەی حوکمی سەربازگەی سۆشیالیستی بۆ ئەو ئامانجە نادیارەی نەمانی دەوڵەت بە توندترین شێوە حوکم لەسەر چینەکانی ڕەوشەنبیرو نووسەرو ماڵدارو زاناو نەزان و موعارەزەو لایەنگریش هەتا لەسەر چینی جووتیارو کرێکاریش کردووە.

هەر ئەوەندە بەس بوو بە (رەجعیەت) و لە خزمەت (برجوازیەت) یان (کەلتووری ئیمپریالیزمی)..هتد. لەقەڵەم بدرابوونایە.

**هەرچی فیکری ئیسلامیە** وا دەروانێتە دەوڵەت لە سنووری خۆی پێویستیەکی ژیانە و بە جەکی لەگەڵ مانای مرۆڤایەتی هاتووە بە پەیام، مادام لەکۆمەڵگەدا دوو بازنەی تایبەتی و گشتی هەیە بۆ جەم و جۆلی ژیان، هەڵبەتە بازنە تایبەتیەکان لەژێر خاوەنداری تایبەتیە، بەڵام بازنە گشتیەکان موڵکی گشتیە، بە واتایەکی تر هەردەم بەرژەوەندیە گشتیەکان کە موڵکی گشتین لە ژێر هەڕەشەی بەرژەوەندی تایبەتن، تالێرەدا ماناو پاساوی دەوڵەتیش پەیدا دەبێ بۆ ڕێکخستن و بەڕێوەبردنی ئەو بازنە گشتی و لایەنە گشتیەکانی مرۆڤ و ڕێکخستنەوەی لەگەڵ بازنە تایبەتیەکە؛ نەوەکی پارێزگاری موڵک وبەرژەوەندی گشتیە، بۆیە دەوڵەت لەناو هەموو کتێبە ئاسمانیەکانی هاتووە و پێغەمبەرەکانیش مەبەستیان دروست کردنی دەوڵەتی دادگەری بوود، ئەو شێوەیەی ئێستای دەوڵەت لە داڕشتنا سەرەتایەکە بەرەو ئەو مانایەی پەیامە بۆ دەوڵەت، ئیتر سەرەنجامی ئەو بۆچوونانەی مارکس و مۆرگان و باقی تطوریەکان بە هەڵە دەرچوو ، ئێستا لە لایەن ئەنسرۆپۆلۆجیەکانیش بە تەواوی ساغ بۆوە، کە دەوڵەت بە شێوەیەك هەر هەبووە لە هەموو سەردەمێك هەتا ئەو خێڵە جەرمانیانەی کە لە بنەچەدا لەوانەوە ناوی (بەربەر) هات و یاساو شارستانیان تێك دەڕووخاند لەناو ئەوانیش شێوەیەك لە ئیدارەو سوپاو هاوڵاتی و سەرکردەو قەدەغەو بکەو مەکە هەبوود،

ئەوەش مانای بوونی یاساو فەرمانڕەوا و فەرمان پێکراوو دەدات کەمانای دەوڵەتیشە، مادامیش مولکیەی گشتی‌و تایبەتی بێنین پێویستی دەوڵەتیش دەمێنێ، جاری دەوڵەتی یاسایی زیاتر لە ئەزموونی ڕۆژئاوا بەدی دەکری، بەلام هێشتا ئەرکی تەواوی دەوڵەت لە پارێزگاری مولکیەتی گشتی ناکرێ، تا ڕادەیەکی زۆر بەرژەوەندی تایبەت زاڵە بەسەر بەرژەوەندی گشتی.

دەوڵەت لە ئیسلام سپاردەو بەشێکە لە عیبادەت، پێویستە تیایدا دادگەری بچەسپێ‌و فەرمانکەرو فەرمان پێکراو جیاوازیان نەبێ، (سید القوم خادمهم) ئەوەش هۆزێنەو ئەفسانە نیە، چەندین جار لە دوای پێغەمبەر ﷺ و خولەفای ڕاشیدین دووبارە کرایتەوە، دەوڵەتی ئیسلامی نە دەوڵەتێکی سەربازیە نە دیکتاتۆری نە دەوڵەتی چینایەتی و سیوکراتی و..نە دیمۆکراسی‌و نە دیکتاتۆری.. نە پادشاییەو نە ئیمپراتۆریە.. بەڵکو دەوڵەتێکی مەدەنی گشت گری میللیە، دانەری یاساکانی هەمان ئەو دانەرەی یاساکانی سروشتە، کە تیایدا تاك (چ پیاو چ ژن) سەربەستی‌و سەربەخۆیی تا ڕادەی پێویست تیادایە، لە ئیسلام دا دەوڵەت بەرپرسیارە لە ڕێکخستن و چاودێری بوارەکانی کۆمەڵایەتی و ئابووری‌و مرۆڤایەتی‌و دادگەری‌و بەرژەوەندی‌و پابەندی‌و پابەندیە گشتیەکان، دەسەڵاتەکانیش هەر لە ئەسڵدا سەربەخۆیی خۆی هەیە چ (ڕاپەڕاندن) چ (دادگایی) چ شورایی و دەزگای تریش، لامرکزیشە، هەتا لە دوا قۆناغەکانی خەلافەتیش بەو شێوەیە بوە، لەڕوی جیای دەسەڵاتەکان: ١- تەنفیزی بریتی بو لە (ئەنجومەنی وەزیران-صدری ئەعزەم) ٢-دەسەڵاتی دادگا بریتی بو لە (شێخ الاسلام) دەسەڵاتی زۆر بوو جار وابووە لە سەرووی سوڵتانیش بووە، لە مێژوی دەسەڵاتی عوسمانی بە فەرمانی شیخ الاسلام دووجار سولتان گۆڕاوە سوڵتان مرادو سوڵتان عبدالحمید ٣-دەسەڵاتی یاسا دانان (شورا) کە پێی دەووترا (مەبعوسان)، هەریەکە بە جودا بوویە، بە هەڵە ئەوروپیەکان (لێك جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان) بۆ (مۆنتسیکۆ)و کتێبەکەی (روح القوانین) دەگێڕنەوە.

هەروەك لە ئیسلام دا دەستوری دەوڵەت لە چوارچێوەی پرۆژەیە بەرەو دەق، حزبە شیوعیەكانیش بە دەوڵەتیشەوە بەرەو دەریای شیوعیەتن، دەستوور و پەیڕەویان یەكسان نیە بە شیوعیەت، نابی لەو قۆناغەی گواستنەوەدا بە مەبادیئی شیوعیەت هەڵس و كەوتەكانیان هەڵسەنگێنێ، بە هەمان شێوەش پەیڕەوی بزوتنەوە ئیسلامیەكان و دەستووری دەوڵەتی ئیسلامیش یەكسان نیە بە ئیسلام (قورئان و سونە)، بەڵكو لێی هەڵدێنجێ، بۆیە ئەوەی یەكەم پرۆژەیە، گۆڕاوە، دەشێ هەڵە بێت.. (قۆناغی گواستنەوەیە)، بەڵام ئەوەی دووەم (واتە ئیسلام) چەسپاوە پرۆژە نیە، شایەنی هەڵە نیە، ئەو كاتیە تەواوی شەریعەت پەیڕەو دەكرێ نەك لە قۆناغی گواستنەوە، هەر بۆیەش بزوتنەوە ئیسلامیەكان و دەوڵەتی ئیسلامیش لە قۆناغی گواستنەوە مەرجعیەتی (قورئان و سونە) نیە ١٠٠٪، تا دەگاتە خەلافەت، ئینجا دەستوور نامێنێ ڕاستەوخۆ دەبێتە قورئان و سونە وەك ئەزمونی وەرچەرخانی( صحیفە) لەمەدینە بەرەو قورئان، جا وەك مەسەلەی شیوعیەكە ئەو ئیسلامیە یان هەر كەسێك بە هەڵەدا دەچێ ئەگەر بە ناوەڕۆكی قورئان و سونە هەڵس و كەوت و هەنگاوەكانی هەڵسەنگێنێ، بەڵكو بەو دەستوورە یان پەیڕەوە كە لەو قورئان و سونەیە هەڵێنجراوە، بە پاڵپشتی (السیاسة ما وافق الشرع ولا سیاسة ما نطق به الشرع).

## سەرهەڵدانی دەوڵەت لەوسەردەمەدا

جاران دەولەت بەچەند شیوەیەك دروست دەبوو، لەوانە بەشێوەی هێزو زاڵ بون، داگیركردن، گەشەی مێژویی، یان لە ڕێی ی ئاین وئایدیولوژیا، گەلێ جاریش وابووە لە ڕێی گەشەی دەسەڵاتی عەشایرێ دروست بوە یەكەم جار بۆ هۆزە (دیرە) دوای میرنشین و ئینجا دەولەت ..لەگەڵ زۆر ڕێی تر لەهەموان سەیر تر لە ڕێی وەسایەو ئینتداب وەك دروست بونی عیراق وئوردەن وسوریاو..

لەسیستەمی ئیمپراتۆریەتی كۆن سنور بریتی بور لەو خاكەی ژێر پێی دوا سەربازی شەركەر، بەڵام ئێستا بەڵە زەویەك نەماوە بێ سیادە ، سنوری دەولی

هەر دەولەتێك كۆتایی دێت بە سنوری دەولەتێكی تر، ئاواش لە (نەتەوە یەكگرتوەكان) تۆمار كراوە،، ئەوا دروست بوونی دەولەت گۆڕاوە، بەتایبەتی لەدەولەتی هاوچەرخ پەیوەندی دەسەلات وخاك ومیللەت بەندی سیاسی بوە ئینجا یاسایش، جاران زۆرناسایی بو كورد دەولەت لەنێو عەرەب دروست بكا وەك ئەیوبیەكان و گیان پۆلایەكان و...فارس لەناو كوردو عەرەب وەك سەفەویەكان یان دەولەتی رۆستەمی لە مغریبی عەرەبی، تورك لە ناو عەرەب و ئەوروپی ..بەلام لەسەردەمی رابونی نەتەوەیی لەدوای سەدەی ١٩ لە ئەوروپاو سەدەی ٢٠ لە رۆژهەلات ئەو نەریتە كۆتایی پێهات، ئیستا گەل وهەرێم دەسەلات لەپەیوەندیەكی سیاسی ویاسایی برواش دان، بەپێی یاسای دەولی سەردەمیش ٣ توخمی سەرەكی هەیە بۆ دروست كردنی دەولەت، ئەویش بریتیە لە ١-گەل ٢-هەرێم ٣- دەسەلاتی سیاسی، ئەوە بەپێی یاسای گوایە دەبێتە خاوەن دەولەت، هەڵبەتە یاسای دەولیش پڕە لە (متناقضات) لەلایەك ئەوەی بریارداوە لەلایەكی تریش بنەمای یاسایی (سیادە)و (عدم التدخل للشؤون الداخلیة) شی داوە، لەلایەك دەبینین كورد خاوەنی هەرسێكانەو نەبوێتە دەوڵەتو ئیسرائیلیش بیّ هیچ لەو مەرجە یاساییانە بویتە دەولەت ...، ئیتر كێشەی نەتەوەیی دروست بووە، بەڵام ئەوەی جێگیرە ئەوەیە كەنەوانەی خاوەن هەرێم بن كێشەكەیان لە ئاستی كەمایەتی دەردەچی بەرەو كێشەیەكی دەولی، عادەتەن بەشۆرش و ناخۆشی دەگوزەرێن، هەرچەندە بریاری مافی چارەی خۆنوسیش دراوە، ئیتر لە بەر تێكەڵ وپێكەلی یاسای نێو دەولەتی لەو بارەیەوە ئەوا رێگای جیاجیا پەیدا بوە بۆ دروست بونی دەوڵەتی نویّ لەوانە :

١- بەپێی یاسایی، ئەویش یان بەفەرمانی نەتەوەیەكگرتوەكان یان بەپێی رێكەوتنی دەولەتی داگیركەرواداگیركراو راپرسی دەكەن بۆ ئەو مافە، لەوانەی كرا ئەریتریا، تەیموری خۆرئاواو وا خواروی سودان و بیابانی رۆژئاواو كۆسۆڤاش لە رێیە، لەو نمونە دەگمەنانە كیبك كەوتە ئەو راپرسیە كەچی بە رێژەی ٥١٪دەنگی بۆ مانەوە دا لەگەل كەنەدا .

٢- هەڵوەشاندنەوەی دەولەتێكی گەورە وەك یەكێتی سۆڤیەتو یۆگۆسلافیا.

(٢) دەولەت    الدولـة    State

٣ – بە ڕێکەوتن دابەش دەبن وەك چیکۆسلۆڤاکیا.

٤ – بە شۆڕشی ڕزگاری ئەوەش ڕێگەی باوی وڵاتانی نادیموکراسیە ·
لەگەڵ هەندێ ڕێگەی تریش لەگەڵ گەشەی کۆمەڵگە پەیدا دەبێ ·

## (٤)

## میری (حکومەت) الحكومة Government

وەك وشە حكومەت لـە دەوڵـەت كـۆنترە و بناغەشـیـەتی، بـەپێی هـەموو (فەرهەنگەكان) كۆنترین دەزگـای سیـاسـیـشـە، بـەڵام مـانـای ئێـستـای حكومـەت بریتیە لـە پـەیرەوكردنی یاسـا ودەسـەڵات، هەرچـی ئەنپرۆپۆلۆژیەكانـە دەڵـێن حكومەت بریتیە لە كەسانێك كە لە دەسـەڵاتن تیایدا كۆمەڵـە یاسـای وا پـەیرەو دەكەن كە خەڵكی پێی قایلن.[١]

زۆر جار حكومەتو دەوڵەت تێكەڵ دەكرێ (هەروەك لێرەش هەندێ جار)، لـە ڕاستیدا حكومـەت یەكێكـە لـە پێكهێنـەرەكانی دەوڵـەت (گـەل، هـەرێم یـان نیشتمان، حكومەت) بەشێوە گشتیەكەی، باڵێكە لەناو دەوڵەت، باڵی ڕابەڕاندنو نەخشەكێشان و یاساو پلانەكانی دەوڵەتە، بۆیە ئەنجومەن بە سەرۆك وەزیرانیشەوە كابینەی حكومەتی پێ دەوترێ، لەكاتێكدا سـەرۆكی دەوڵـەت یـان پادشـایە یـان سەرەك كۆمار، هەندێ جار بە سەرەك وەزیرانیش دەووترێ (وەزیری یەكەم)، یـان وەزیری (اعظم)، لە خەلافەتی عوسمانلی (صـدر الأعظم)ی پـێ دەووتـرا، بـەپێی (موسوعة العربیة المیسرة) یەكەم ئەزموونی سەرۆك وەزیری لـە ئینگلتـەرا هاتـە دی ورۆبرت والپۆل ئەو سـەرۆكە بـووە لـەنێوان (١٧٢١-١٧٤٢ز)،، لەمێـژووی عوسمانیش لە سەردەمی (سـوڵتان ئۆرخـان ١٣٢٥-١٣٥٩) دروسـت بـوو كاتـێ (خلیل فیدرلی) لە وەزیرەوە بەرزكرایەوە بۆ (وزیر الأعظم) ٠

لەو سەردەمەدا سەرەك وەزیرو كابینەكەی پایەكی سیاسیە بە گـشتی مـەرج

[١] مقدمة في أنثروبولوجيا الاجتماعية.

نیە پسپۆر بێت لە بواری وەزارەتەکەی، ئاساییە دەوڵەت لە چەندین حکومەتی هەرێم پێك بێت لەگەڵ حکومەتێکی ناوەندیش کە لە پایتەختەکەدایە، نموونەشیان لە جیهاندا سەرکەوتووترین ڕێبازی سیاسییە، جا چ فیدراڵی، سۆڤییات، کۆمارییەکان، ئوستانەکان، ویلایەت، .. هەرچی بێت کە لە بنەچەدا بۆ نموونی حکومەتی ویلایاتی ئیسلامی دەگەڕێتەوە (کە چاکترین شێوەی نامەرکەزییە)، حکومەتی ئێستای کوردستانیش شێوەیەکە لەو تەرازە، مەرج نیە حکومەتی هەرێمەکان تەنها لە ئاست فیدراڵی و بەسەرروو بێت، تەنانەت لە ئۆتۆنۆمی (خود موختاریش) دەشێ لە ڕووی یاساییەوە حکومەت دروست بکەی وەك لە ئەڵمستین و ناخچەوان و زۆر شوێنی تر.. بۆیە گۆڕینی (ئەنجومەنی ڕاپەڕاندن)ی کوردستان بۆ حکومەت و (ئەنجومەنی یاسادانان)یش بۆ پەرلەمان هەم یاساییە، هەم دانایانەش بوو.

حکومەت و دەوڵەت لە خاڵێکی بنچینەیی تریش جیان، دەوڵەت پەیکەرێکی گشتی چەسپاوە (تسبیەن)، بەلام حکومەت دەگۆڕێت لەو کابینەوە بۆ کابینەیەکی تر لە چوار چێوەی یەك دەوڵەتدا، بۆیە بەشێك لە زانایان بەلای ئەوە دەچن کە دەوڵەت بکەوێتە خانەی زانستی سیاسی و بەلام حکومەت بۆ (ڕێبازی سیاسی)، چونکە بەزۆری حوکمەکەیە جەوهەری دەوڵەتەکەشی پێ دیاری دەکرێ، بە پێ ی (مۆنتیسکۆ) (٣) جۆر حوکم هەیە (کۆماری-پادشایی-دیکتاتۆری) گوایە هەتا ئێستاش ئەو پۆلێنە دروستە، بەلام دابەشی ڕاستەقینە وانیە، وەك لە خوارەوە:

- مەلەکی دەستووری وەك لە بەریتانیا (بەریتانیا مولکی ئەوە بەلام حوکمی ئەو نیە)، هەروەها هۆڵەندا، ئیسپانیا.. وا نموونەیەك لە وڵاتانی عەرەبیش سەرەتاییەتی لە بەحرەین.
- مەلەکی دەسەڵاتدار وەك مەلەکیە عەرەبەکان.
- سیستەمی سەرۆکایەتی وەك زۆربەی وڵاتە دیکتاتۆریەکان (جگە لە

ئەمریکاو رووسیای نوێ..). واتە هەم سەرۆك دەوڵەتە هەم سەرۆکی حکومەتیشە.

- سیستەمی تەوەری سەرۆکایەتی و سەرۆك وەزیران، کە بەشێك یان زیاتر لە دەسەڵاتی سەرۆك دەدرێتە سەرەك وەزیران وەك: فەرەنسا، تورکیا..
- سەرۆکایەتی دەستووری، کۆماریەو سەرۆکەکەی فەخریە دەسەڵات لە دەست سەرۆك‌و ئەنجومەنی وەزیرانە لەوانە: ئیسرائیل، ئەڵمانیا..عیراقی نوێ .
- جۆری تریش هەیە وەك (رئیس الظل) کە هەر ناوە، لە ژێرەوە سەرباز حوکم دەکا وەك: جەزائیر و تورکیا وپاکستان ..
- سیستەمی سیاسی ئێران سیستەمێکی تایبەت و نوێیە.

ئەوانە لەسەر بنچینەی دەستوور بوو، لەسەر بنچینەی مەدرەسەو رێبازی سیاسی ئاوا دابەش دەبن:

- حکومەتی ئیسلامی= سیستەمی ویلایات+ لامەرکەزی+ شورا+ فصل السلطات+ ولایە الامە.. نموونەش لەو سەردەمە ئێران، سودان و چیچانی پێشوو،..
- حکومەتی شیوعی: هەر حکومەت نامێنێ بەڵام قۆناغێ گواستنەومیە لەوانە (ڤێتنام، چین، کۆریای سەروو، کوبا .. ).
- حکومەتە لیبرالیەکان‌و حکومەتی سۆشیالیستیەکان لەمڕەوتی بابەتەکە باسیان دەکەین.
- هەندێك کۆماری‌و عەلمانیەت‌و دیموکراسی پێکەوە دەبەستنەوە، هەر بە نموونە فەرهەنگی (قاموس المصطلحات السیاسیة والدولیة-سوحی فوق العادة) دەڵێ لە سیستەمی کۆماری سەرەك هەڵدەبژێرێ راستەوخۆ لەلایەن میللەت یان لە لایەن پەرلەمان، هەروەك رایەکەی (مۆنتسیکۆ)ی پێشووە.. بەڵام ئەو پەیوەندیە مەرج نیە راست بێت، نموونە زۆرە کۆماریەو ناعەلمانیە وەك ئێران، سودان، ئینجا کۆماریەو دیکتاتۆریە (پڕە لە نموونە)، جار وایە هەر تەواو

پێچەوانەیە مەلەکیەکان لە کۆماریەکان دیموکراسی ترن، تەك مەلەکی ئەورووپی هەتا لەناو عەرەبیش، ئینجا کۆماریش هەیە وەك مەلەکیە هەتا لە میراتی دەسەڵاتیش، لەوانە: (کیم ئیل سۆنك) لە کۆریا، حافز ئەسەد لە سوریا، لۆران کابیلا لە کۆنگۆو.. زۆری تریش وا بەرێوەن کە کوڕیان بکەنە سەرۆك لەجێی خۆیان.

ئەو جۆرە سیستەمە هەرە دیکتاتۆریەکەیە، لەراستیدا لەو سیستەمە شتێك نامێنێ لەجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان، یاخود دەوڵەت و حکومەت، هەموو دەسەڵات دەدرێتە کەسی یەکەم، کەسی یەکەم یەکسانە بە دەوڵەت، ئەودیان دیکتاتۆری حزبی نیە وەك ئەزموونی حزبە شیوعیەکان، ئەزموونێکی تری نوێی دیکتاتۆری بووە، بە ئاشکراش خراوەتە دەستورە، سەرنج بدە لە (تعريفات بعض المصطلحات: مادة- الحكومة) کە بە فەرهەنگی (حزبی بەعس) حسابە دەڵێ: ((تتولى الحكومة ثلاثة هي: التشريعية ٢- التنفيذية ٣-القضائية)).. ئەوەش حکومەتی دیکتاتۆری و ئەولیەو دەستی بەسەر هەموو دەوڵەت داگرتووە ئیتر بواری میراتیش سانادەبێ.

زۆر شێوە و جۆری حکومەتی تریش هەیە (سەربازی، تاك حیزبی، ئوتوکراسی، پلوتوکراسی، زۆرایەتی، ئینتیلافی، ئینتیقالی، کەمایەتی، مەدەنی..)، بەڵام دابەشی بنچینەی حکومەت بریتییە لە دادگەری و نا دادگەری.

سیستەمی باوی ئێستای حکومەت ئەوەیە پێك بێت لە چەند حیزبێك یان یەك حیزب، بە پێ ی ئەو ڕێژە دەنگەی کە دەیهێنێ، ئەگەر لە (نیوە+١)[1] کەمتر بوو ناچار پەنا دەباتە بەر دانوستان لەگەڵ ژمارەیەك لە حزبی تر کە ئەو ڕێژەیە مسۆگەر بکەن تا لە پەرلەمانا دەنگی قایلی بهێنن، ئەو حکومەتە پێی دەوترێ ئینتیلافی وەك ئێستا زۆربەی حکومەتەکان لەو شێوەن، ئەوانەی بەشداری

[1] هەموو دەوڵەتێك وانیە، لە تورکیا دەبێ ٢\٣ی دەنگی پەرلەمان بهێنێ بۆ سەرۆکایەتی کۆمار.

حكومەتەكەش نین جا چ ئەندامیشیان لە پەرلەمان هەبێ یان نا پێیان دەڵێن (ئۆپۆزسیۆنی یاسایی)... هەردوولا بەشیان هەیە لە دەوڵەت تەنیا لە حكومەت نەبێت، ئەوەش لە بنەمایەكی دادگەریە (فەرمان ڕەوایی بۆ زۆرایەتی و مافیش بۆ كەمایەتی)، واتە لەو دۆخەدا حكومەتی خزمەت گوزارە نەك ئایدیۆلۆژیا، حكومەت ودەوڵەت خاوەن ئایدیۆلۆژی بێ گرفت نیە، گرفت ئەوەیە ئایدیۆژۆژی بەكار بهێنی قەڵۆشیش بی وەك ئەزموونی ئیستای عەلمانیەتی عەرەبی وكوردی، ئیتر لێرەدا ئۆپۆزیسۆن یەكسەر بی بەش دەكری لەهەموو مافیكی، لەكاردانەوەی ئەودش ئۆپۆزیسۆن دژ دەبی لە هەمووشتیكا با چاكیش بی، بەڵام ئۆپۆزسیۆنی لە ئیسلامدا دائیم نیە، لە سێرە(رصد) نیە دژ بە حكومەت وەك ئێستا باوە، بەڵكو پشتیرانیەتی لەسەر هەق بەڵام ناقایل ونەیارە بە هەنگاوە ناشەرعی و چەوتەكان.

لە بارەی بەشداربوون و (ئیئتیلافی) هەموو لایەك كۆك نین، هەڵوێستی شیوعیەت بەرامبەر بەشداری كردن لە حكومەتی برجوازی و حزبە برجوازیەكان بە خیانەت لە چینی كرێكار دەژمێررا بە پێی پەیامەكانی (ماركس-ئەنجلس) و جارنامەكەشیان، كەچی سوشیال- دیموكراس و ئوروۆ-شیوعیەكان بەشداریان كردووەو تاڕادەیەكیش واقیعیانە تر بووینە.

بە هەمان شێوە بەشێك لە مەدرەسەی ئیسلامی نوێش ئەو بەشداریە بە پلەی (كوفر) لە قەڵەم دەدەن، بەشێكیش بە پێچەوانەوە زیاد لە پێویست و بێ مەرج و پێشەكی بەشداری هەموو جۆرە حوكمێك دەكەن هەتابەشداری لە كنیسەی ئیسرائیلیلیش، وا دەركەوت لە ئەزموونی ٢٠ساڵی ڕابردوو ئەو دوو شێوە هەردووكیان بەو شێوە ئەو پەڕیە زۆر سەركەوتوو نەبووینە، تەیاری مام ناوەندیش كە لە حیسابا وردتربووە بەشداری كردووە ئەو جۆی بایەخ بووە.

هەرچی هەڵوێستی لیبراڵ-دیموكراسیشە بەپێی بنەمای (بەرژەوەندی تایبەتی) بەشداری دەكا، زیاتر خۆپەستانەیە، یان لە باشترین دۆخیان دا نوێنەرایەتی بەرژەوندی چینەكانی سەروو دەكەن، لە جیهانی ئیسلامیدا ئەوانە

به نووسەرو ڕەوشەنبیرو سیاسەتمەدارانیەوە بە هەموو شێوەیەك لە دەرەوەی دەسەڵاتو حکومەت ناژین، بۆیە سەوداو بەرتیل و گەندەلی ئیداریو.. ئاسایییە لەو مەدرسەیە .

## ئایا حکومەت جیهانی دەبێت ؟

لە بنەچەدا بانگیشەیەکی ئاینی یە، زیاتر پەیوەستە بە ئاینە کراوەکانی خاوەن دەعوە وەك مەسیحی وئیسلام، بەلام مەدرەسەی شیوعەتیش ئەو داوایەی بەرز کردەوە .

ئەو فکرەیە پێچەوانەی رای ئەرستۆ و ئەفلاتوونە کە پێیان وایە هەر شارێك حکومەتێکی پێویستە، ئەو فکرەیە (فکرەی برایەتی گشت جیهانە بۆناینەکان دەگەرێتەوە ،بۆ هەموو ئەو ئاینانەی خاوەنی بانگێشەو تەبشیرین لەپێش هەموویان مەسی وئیسلام) بەسەریش نەچووە، گەشەی کۆمەڵ و کێشەکان و پێویستیە نوێیەکانی مرۆڤ لە فیکریو دەروونیو کەلتووریو فەرهەنگی هەتا دەگاتە ئابووری و ڕەوشتی و دادگەری وبیاساکانی سروشتیش هەمووی پاڵپشتن بۆ داهێنانەوەی، بەتایبەتی لە (عەولەمە) بە هەموو ڕەهەندەکانیەوە، هەروەك حکومەتی جیهانی ئیسلامی بە جوان ترین شێوە هاتو گەشەی کرد، چونکە لەسەر فاکتەرێکی مرۆڤایەتی وا بنیات کرابوو هەموو کەسێك بواری بەشداری تیادا هەبوو بە یەکسانی، تەنها لەوێ یە ڕێسای (چاکترین بەختەوەری بۆ زۆرترین خەڵك)ی بە فراوان ترین دۆخی مومکین پێ دێتە دی، زۆر جیایە لەگەڵ حکومەتە ئیمپراتۆریەکان کە لەسەر فاکتەرێکی تاقانەی شازی سەربازی دروست بوو، بۆیە دەبینین زۆربەی ناوچەکانی جیهان بەرەو ئیسلام هاتن (نەك بە شیرو تیر) بەڵکو لە ڕێی هەڵس‌وکەوتی چاکی وەك: ڕەوشت، شەریعەت، ڕێکخستن، ناوەخۆ و.. بەیتا بەیتا گەلانی جیهان ڕوویان لێ‌کرد بە تایبەتی لە ئەفریقیاو خوارووی ئاسیا، ئێستاش زیاتر جیهان پێویستی بەو جۆرەحکومەتە هەیە، لە ڕاستیدا

(مل ملانێی شارستانی)، (کۆتایی مێژوو)، مەدرەسـەکان، عەولەمـە، نەتـەوە یـەکگرتووەکان، بڕیـار و دەزگـا جیهانیـەکان، یاسـاکانی نێـو دەوڵـەتی، .. جەنگەکان، ئەو جەنگەی ئێستای.. هەمووی گوزارش لە پێویستی ئەو حکومەتە جیهانیە دەکا ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، هەریەکە دەیەوێ ئەو پێشڕەو و خـاوەن ناسنامەی ئەو حکومەتە بێت، هەڵبەتە ئەو دوو فکرەیەی (دەوڵەتی‌نیـشتمانی – یان نەتەوەیی یان قوتری ..) و (دەوڵەتی جیهانی) تەواو مانـا و جیـاوازی نێـوان (نەتەوەیی) و (ئوممەتە)، واتە پرسـیارەکەش ئەوەیە ئایـا دەکـرێ جیهـان بکرێتـە یەك ئوممەت؟ بەدەر لە سنوری نەژادی و نەتەوەیی و ڕەنگ و نێر و مێ و...

یان لەسـەر چ بنـچینەیەك دەکرێتـێ، لەسـەر بنـچینەی ڕەچـەڵەکی و خـوێن نەتەوایەتی وەك مەدرەسەی نەتەوایەتی بۆی چووە؟

یـان لەسـەر بنـچینەی مادیانـە و برجوازیانـەی وەك مەدرەسـەی لیبراڵیـەتی ڕۆژئاوا؟ یان لەسەر بنچینەی چینایەتی شیوعیەت؟..

هەرگیز لەسـەر ئەو بنچینانە دروست ناکرێ، دەبێ لەسەر بنچینەیەك بێت کـە شـوڵی هـەموو کـەس بکـات ئـەویش تـەنها لەسـەر بنـچینەی مانیفیـستی عەقڵە،لەوێش بەتەنها بۆ ئاینە ، ووردتریش ئیـسلامە ئەو پەیامە عەقلیـەی لـە دروست کردنی ئوممەت هەڵگرتووە لەسەر بنچینەی بیروبـاوەڕ، بۆیـە لـە کۆتایـیا (چـاکترین بەختـەوەری بـۆ زۆرتـرین خـەڵك) دەبیـنین لـە شـیوعیەت و سـەرمایەداریدا.. تـەنها بـۆ چـینێکە نـەك هـەموو خـەڵك، لـە مەدرەسـەی نەتەوایەتیش چاك ترین بەختەوەری بۆ نەتەوەیەکە(ئەگـەر بـشبێ)، .. تـەنیا لـە ئیسلاما بوار هەیە بۆ هەموو خەڵك، ئەوەشی گەورەترین هێز و دینامیکیەتە کە بتوانی حکومەتی جیهانی لەسـەر دروست بێت بە تاقانە.

(٥)

# سەرۆك الرئيس President

زۆر مشتو مڕ لەسەر ئەو زاراوە كراوە لە لایەن زاناو فەیلەسوف و مەدرەسەكان..

لە بارەی: بنەچەو پەیدابوونی، مێژووەكەی، بزنەكەی، فەرمانی، پاساو و فاكتەرو هۆیەكانی پەیدا بوونی.. ئەركی مێژوویی و ئێستای، چارەنووسی، سەرۆكی سەركەوتوو كێیەو مانای چیە؟ پێوەری چیە؟.. هەر بەو پێیە پێناسیشی گەلێ زۆرە بەڵام نزیكترینیان كە مانای گشتی بدا لە (موسوع علم الاجتماع)مان هەڵبژاردووە كە دەڵێ (سەرۆك: ئەو كەسەیە كە كاری خەڵكی رادەپەڕێنێ یان وا دەكا خەڵكی تریش رایببەڕێنن)، كۆمەڵێك توانای هەیە جیا لە خەڵكی ئاسایی وەك توانای یەكلاكردنەوە، بڕیار، وروژاندن، گرنگی ئامانج، ستراتیجیەتو نەخشە، پێشبینی كردن، خێرا گەیشتنە ئامانج، سووربوون، دوورو قووڵ و هەمەلایەن بینی، باوەشی فراوانی لە بەرپرسیاریەتی، هێزی جێبەجێ كردن، ناسینی تواناكانی خەڵكی تر، داهێنان، متمانە، دادگەری و ڕاستی...

هەرچەندە بابەتەكەمان سەرۆكە بە گشتی بەڵام هەر بۆ زانین یەكەم سەرۆك كۆماری دەستووری لە ئەمریكا هاتووە، ئەویش(جۆرج واشنطن)بوو بە پێی دەستووری ١٧٨٧ز بووە یەكەم سەرۆك لە ساڵی١٧٨٩[1]، ئینجا ئەو ئەزموونە گواسترایەوە بۆ ئەمریكای لاتینی لە ساڵی ١٨١١ بۆ تشیلی، كولومبیا،

[1] النظم السیاسیة، وظیفة التشریعیة لرئیس الدولة.هەروەها بروانە: القانون الدولی والمشكلات الكبری

ڤەنزويلا[1]، ..

سەرۆك لە مەدرەسەی ليبرالی بەدريژی ميژوو بە دەسكەوت و هەلكەوت حيسابە، پيرۆزی نيە، ئيستاش هيچ لیّ پيچانەوەيەكی دوارۆژی لەگەلّ نيە، هەتا بەرای (سپنۆزا) لە ديوكراسيدا (سەرۆك) پابەند نيە بە هيچ ياسايەك تەنها بە بەلّينەكانی گەل[2]، لەو بنەمايەوە كەسانی وەك هيتلەرو موسولينیو زۆری تر پەيدا بوونە بە پرۆسەی ديوكراسيش، هەموو دەم ئەگەری دووبارەبوونەوەشی هەيە، هەر چەندە ئيستا دەبينين سەرۆكيش لەوانە سەرۆكەكانی ئەمريكا سزا و ليپيچانەوەی ياسايان لەسەرە، لەوانە نيكسۆن لە١٩٧٣-١٩٧٤لە سەرۆكی لادرا، كلينتۆن دادگايی كرا... .

هەرچی شيوعيەتە لەسەر ئەسلّی پەيدابوون و چارەنووسی زۆر بە ئيجابی و پيويستی سەيری سەرۆك ناكەن، پيّيان وايە لە قۆناغی كۆمەلگەی سەرەتای (سەرۆك) نەبووە، هەروەك لە كۆتاييش ناميّنیّ، پيّيان وايە سەرۆك زادەی مەل ملانيی چينايەتی و دابەشی كارە، هەلّبەتە ئەو بۆچوونە رەگ و ريشەی فراوانی هەيە لەناو زۆربەی (تطوريەكان) و بەشيكيش لە ئەنسرۆپۆلۆجيەكان بە تايبەتی (مۆرگان)، ئەوانە نموونەشيان هەندیّ هۆزی دواكەوتووە كە گوايە سەرۆكيان نەبووە، بە مەبەستيكی سركايەتيش وەسفی كۆمەلگەی رەسەنی ئەمريكا (هندية سوورەكان) و ئوستراليە-ئەبۆرجينيەكان دەكەن بەبیّ سەرۆك و ياسا و ريسا.. گوايە ئەوروپيەكان گەيشتنیّ و دريان بەتاريكی دا، زۆر تەقەلای تر لە لايەن ئەنسرۆپۆلۆجيەكان دراوە بە ئەدريسی (كۆمەلگەی بیّ سەرۆك Acephalas sociaty) گوايە تەنيا ئەنجومەنيكی پيرانيان هەبووە[3].. كەچی هەر لە وەسفەكانی خۆيان بۆ ئەو جۆرە كۆمەلگەيە دەردەكەویّ كە سەرۆكيان

---

[1] William.w-government of latin ammea. P١٦١

[2] رسالة في لاهوت و السياسة- سپنوزا ص٣٨٢

[3] بۆ زياتر بروانە: ا-مجتمع القديم- مورگان ب-مقدمە في أنثروپولوجيا.

(٥) سەرۆك الرئيس President

هەبووە، قەدەغەو ڕێساو ئایین هەبوود، هەر بەسروشتی خۆی هەر کۆمەڵێکی ڕەمەکی پێکەوە بن بۆ ماوەیەکی کەم سەرۆك و پسپۆڕی (تخصص)ی لێ پەیدا دەبێت، بۆیە لە فەرموودەدا: (إذا كنتم ثلاثة..) یاسایەکی گەردوونیە .

لە ئەزموونی نوێش بەکردە ویستراوە کۆمەڵگەیەکی وا تاقی بکەنەوە بێ سەرۆك سەرکەوتوو نەبووە، لە ئورگوای لە ساڵی ١٩١١-١٩١٥ (٩) کەس پێکەوە سەرۆك بوون، جارێکی تر لە ساڵی ١٩٤٦-١٩٦١ لە هەمان شوێن، گوایە لە ڕۆمای کۆنیش جۆرێك لە سیستەمی دوانەیی(دیارشی) سەرۆکایەتی هەبووە، لە ئەزمونی کوردستانیش سیستەمی نیوە بە نیوەی هەردووسەرکردەی (مام جلال وکاك مسعود) بە ناتەبایی هاتن تا یەکیان بۆ عیراق و ئەوی تریش لە کوردستان ماوە بە تەنها، هەریەکە ئەنجومەنی فیدراڵی و سۆڤیەتیش بەجۆرێك تاقیکراوە، لە (لیبیا)ی ئێستا گوایە سەرۆکی نیە و ئەنجومەنی گەل هەیە بەڵام (سەرکردەی شۆڕش-معمر قذافی) زیاتر لەو دەوردەش بە کردەیی دەبینێ، بۆیە ئەو بۆچونەی شیوعیەت لە بارەی (سەرۆك) بنچینەی زانستی نیە، ئینجا لە ڕووی واقیعیش پێچەوانەی ئەو بۆ چوونەی خۆیان بوون هەریەکەیان هەتا مردن سەرۆك بوو، هەتا لەیەکێ لە دەنگدانەکانی کۆنگرەیان (ستالین) لە (١٠١٪)ی دەنگی هێنا بوو!، لە دوایدا نموونەی سەیرتریشی لێ پەیدابوو (کیم ئیل سونگ) سەرۆکی کۆریای شیوعی مرد کوڕەکەی هێنا جێی خۆی، هەروەها (کابیلا)ش لە کۆنگۆ، لە نموونەی سۆشیالیستیش لە سوریا (حافظ الاسد) مرد کوڕی هاتە جێی ئێستا بوویتە دیاردەیەکی ئاسایی ناو عەلمانیەت بە کوردستانیشەوە، سەرۆکایەتی وەك (مولکیەتی) لێ هاتووە هەتا لە حزبی سیاسیش ئێستا ئەو سەرۆکانە لە جێی باوکیانن، ولید جنبلاط-لبنان، بنازیر بۆتۆ-پاکستان، سونیا غاندی-هیند.. زۆری تریش، لە کاتێکا دەبینین لەناو بزوتنەوە ئیسلامیەکان و دەوڵەتە ئیسلامیەکان واتیە، لە ئێران (آ.خمینی) مرد (علی خامنائی) هاتە جێی هەر لە نەتەوەی یەکیش نین، لە چیچان لە جێی جەوهەر دۆدایف سەلیم

خان یاندەربایف هات هیچی یەك تین، ئینجا لـەدوای ئـەویش لـە هەڵبـژاردنێکی ئازاد نەسلان مەسخادۆف دەرچوو بە هێمنی دەسەڵاتی دادەست، لـە ئێـران ئـەوا شەشەمین سەرۆك کۆمار دەگۆڕێ، هـەروەها دەسـتگۆڕی دەسـەڵات لـە بۆسـنیا لەلایەن (علی عزت بیگۆڤیچ) و تاڕادەیەك (عبدالرحمن وحیـد) لـە ئەندۆنیـسیا، نمونەی ئیـسلامی لەو سـەردەمە زیـاترە.. لـە کوردسـتانیش تـەنیا لـەناو حزبـە ئیـسلامیەکان دیاردەی ڕابەر گۆڕین هەیە ئەگەرچی هەندێ گیروگرفتیشی هەبوو، ئەگینـا حزبەکانی تر تا ئێـستا نەگۆڕاون و شمولی هەڵبژاردنی کۆنگرەش نـین، بـەو شێوەیە دەچینە ناو فیکری ئیـسلامی لـە بـارەی (سـەرۆك)و بـوون و پێویـستی: هەڵبەتە تێڕوانینـەکانی هـەروا سـادەو هـەڵقوڵاوی دەمـاو دەسـت نیـە، بـەڵکو ڕەگەکانی قووڵ دەبێتەوە بـۆ سروشـت و گـەردوون و یاسـاکانی بوونـەوەر، هـیچ سیـستەمێك نیە لە گەردوون سەرکردەو (مەرجع)ی نەبێت، هەر لە کەشکەشانەوە بۆ کۆمەڵـەی خـۆرو تـا دەگاتـە گـەردیلە، بـە هـەمان شـێوەش ژیانـدارانی بـە کۆمەڵیش، هەر لـەناو خانەیـەك هـەتا لەشـی ئـادەمیزادیش هـەمووی بـەپێی سیـستەمی ناوەندی و سەرۆکانە ئیش دەکا، بەو شێوەیە هـەر ڕەوایـەك لەلایـەن شەریعەتی ئیـسلامیەوە داڕێژراوە وەك واقیعیش پێویـستە، کـە پیرۆزیـش دەداتـە (سەرۆك) بە پیێ ی مەرجی خۆی، ئەوا سروشت و گـەردوون و یاسـای بنـچینەیی بوونەوەر کردوویە بـە (سـوننەیەکی بـوون)، بۆیـەش کۆمـەڵ و پارچـەکانی تـری کۆمەڵایەتیش هەریەکە پێویستی بـە سـەرۆك و (مەرجعیـەت) هەیـە وەك ئـاور هەوا، نەك تەنیا بۆ جەنگ هەروەك زۆرێك لە فەرهەنگ و لێکۆڵەرەوەکان وای بۆ چوون، سەرۆکیان لە بەشی (جەنگ) تۆمـار کـردووە لەوانـە (موسـوعة العالمیـة) بوونی سەرۆکی تەنیا لەکاتی مـل ملانـێ بـە پێویـستیەکی گـرنگ زانیـە[1]، لـە ئیسلامدا ئەرکی (سـەرۆك) سپاردەیە نەك ئیمتیاز، خزمەت کـارە نـەك خزمـەتی بکرێ، (سید القوم خادمهم)، عیـبادەتە پادشـایی نیـە، ئیش کەرە حسـایەوە نیـە،

[1] الموسوعة العالمية ج٢٦-ع-ص٣٥٠.

بۆیە کۆمەڵێك مەرجی توندو تۆڵ بۆ سەرۆك (ئجا ئیمامە یان خەلیفە یان سەرەك دەوڵەت) دانراوە لە زانیاری و دڵسۆزی و خۆنەویستی و مەبادیئی و...، هەر بۆیەش لە ئیسلامدا (بە پێچەوانەی سپینوزا - و عەلمانیەت) دوا مەرجەع نیە، چاودێری زۆر لەسەرە لە لایەن (ئومەت، شورا، دادگا، .. پەیام، لە هەمووی گرنگ تر ڕۆژی دوایی و لێپێچانەوە لەگەڵی)، ئیسلامی ڕاستەقینە بەوە دەناسرێتەوە کە والیەکانی، سەرۆکەکانی، وەزیرەکانی، .. بە تەکلیف و تکا بێنە سەرکار، لایان ناخۆش بێت بە پێچەوانەی ئەو پرۆسەیەی عەلمانیەت و ڕۆژئاواش کە دەبینین حزبێك یان سەرۆکێك دەردەچێ دەبێتە ئاهەنگ و خۆشی ئەوی دەریش نەچوو ماتەمینیە ئیتر جەنگ و وێرانکاری لە پێناو بکرێت، خۆ ئەگەر لەمێژووی خەلافەتی ئیسلامیش نمونەی زۆری ناشیرین هەیە ئەوە ئەزموونی موسوڵمانانە نەك ئەزموونی ئیسلام، لە کوردستانی خۆشمان بوونی بەرپرس یان سەرۆك واتە ئیمتیازو ژیانی خۆش، تا لێرەدایەو ڕاستە کە زانایانی دەروون ناسی دەڵێن (ئەسڵی سەرۆك) لەوە هاتووە ودێ کە هەندێ خەڵك غەریزەی زاڵ بوون و خۆ دیارخستنیان هەیە، خەڵکی‌تریش غەریزەی (هەست بە نوقستانی) خۆ بەدەستەوە دەدەن و دەبنە پاشکۆ و گوێڕایەڵ و سەرباز..

هەڵبەتە ئەو تێ ڕوانینە (گشتی) نیە، جارێ هەموو کەس غەریزەی خۆ دەرخستن و زاڵ بوونی هەیە، هەست بە نوقستانیش پاڵنەرە بۆ سەرۆکایەتی نەك سەربازی (لە دوای لە دەروون ناسی سیاسی زیاتر باسیان دەکەین)، سەرۆك لە ئیسلامدا دەروازە و زامنکەری دەستگۆڕی دەسەڵات و فرەیی و کار بە شوراو دەسەڵات بەجێ هێشتن بۆ هاوڵاتی و پایەی ئافرەت و هەژاران و پسپۆڕو...، بە پێچەوانەوە کە بنەماکان ئیسلام نەبێت ئەوا بازنە کلاسیکیە کۆمەڵایەتیەکان دێتەوە پێش کە تیایدا تواناکان، دڵسۆزیەکان، زاناکان، ئایدیۆلۆژیە مەبادئیەکان.. دەکەونە ژێر کلاسیکیەتی بازنە کۆمەڵایەتیەکان و تیایدا (نووسەر پاشکۆی سیاسەتمەدار دەبێ)، (زانا لەبەر دەرگای سەرۆك دەبێ)

(*) سەرۆك    الرئيس    President

(نیشتمان پەروەر چاو لەدەست نیشتما فرۆش دەبێ) (ژێر لەژێر دەستی نەفام دەبێ) (بەرژەوەندی گشتی لەژێر دەستی بەرژەوەندی تایبەتی دەبێ).. ئیتر لە دوایدا زۆر کەم دەبا، گەورە بچووك قوت دەدا، ئەگەر خاوەن هێز دووا بێ هێز بێ دەنگ دەبێ، هەمووی وەردەگەڕێ..

سەرۆك ئەو کاتی لەسەر بنچینەی هێزو ڕەچەڵەك و بنەماڵەو دەوڵەمەندی دەبێت کە سەرچاوەیەکی هەرە گرنگی ستەمی کۆمەڵایەتیە.

## سەرۆکی کاریزمی:

بە پێی زۆربەی فەرهەنگەکان یەکەم جار (ماکس ڤیبەر) کاریزمی بەکارهێنا، مەبەستی لەو جۆرە سەرکردانەیە کە بەهرەو توانایەکی زۆریان هەیە لە ڕاکێشان و کۆکردنەوەی خەڵك بێئەوەی ئامرازی دیسپلینی سەربازی یان پاڵنەری پایەو مادی بەکار بهێنێ، نموونەی زۆربەی فەرهەنگەکان بریتیە لە: غاندی، نەهرۆ، دلایلاما، أ.خمینی،... هەر چەندە ناوی هیچ سەرۆکێکی نوێی کوردی تیادا نیە بەڵام بەپێی ئەو مواسەفاتە (ملا مصطفى) لەو جۆرە سەرۆکە بووە.

هەموو سەرۆکێك ئەو بەهرەیەی نیە، بە پێی (ماکس ڤیبەر) ئەوانەی بەناوی خوا لە (مەسیحیەت و لە ئیسلام) یش توانیویانە ئەو پایە بەدەست بهێنن، لەڕاستیدا لە کۆمەڵگەی کۆن هیچ شارستانی و ڕابوونێك سەرنەدەکەوت ئەگەر پاڵپشتێکی پەیامی نەبوایە، چ بەڕاستەقینەکەی چ بە دۆخی لادان و خەڵەتاندنەکەی، بۆیە سەرۆکی کاریزمی پێویست بوو هەم بۆ ئەو ڕابوونە هەم بۆ پارێزگاری، بۆیە گەلێ جار ئەگەر ترخی (پەیام) ڕاستەوخۆ ئامادە نەبوایە یان ئەو سەرۆکە دژ بە پەیام بوایە ئەوە ناچار جۆرە سەربردیەکی تری لە (خارق) دەهۆنیەوە، بەشی زۆریان ڕەچەڵەکی خۆی دەدا ئاسمانی و هاتنەخوارەوەی پادشای گەورە لە ئاسمان بۆ ئەو میللەتە، یان ئەو مەملەکەت و شارەی بەدروستکراوی

ڕاستەوخۆی خودا وەسف دەکرد. یان بەشێکیان هەر ڕاستەوخۆ بانگێشەی خوایەتی دەکرد وەك (سەرجۆنی ئەکەدی)[1] یان بەشێك لە فیرعەونەکان و زۆری تر، بەشێکی تر لە (خارق) ئەوە بوو وەك باپیرە گەورەی پادشا ڕۆمیەکان گوایە گورگ بەخێوی کردوون لەسەر فەرمانی خواوەند، یان لە ئاسمان هاتونە خوار، بەو جۆرە (کاریزمیە) پێشیان لەخەلکی دەگرت تا:

١- هیچ کەس بیر لەو پایەو دەسەڵاتە نەکاتەوە بۆ خۆی.

٢- گوێڕایەڵ و پابەند بێت بە فرمانەکانی.

٣- بارێکی دەروونی گشتی بسازێ کە هەرگیز ئەوانە سەرکەوتوون.

٤- بۆ ئەوەی دەسەڵاتەکەشی بەمیراتی قەتیس بێنێ تەنها بۆ ئەو بنەماڵە.

٥- هەرچی دەیکەن و دەڵێن پیرۆزی تێدایە.

عادەتەن نازناو دەدرا سەرۆکی کاریزمی ، وەك: میللی چیف، ئەتاتۆرك، غازی درابووە مصطفی کمال، سەرۆکی فۆهر بۆ هتلەر، دوتشی - مۆسۆلینی، ڤلادیمیر ئیلتچ-لینین، شای ئێران-ئاریا مهر، صدام حسین-قائد الفذ.. ئەوە بەکاریزمی نوێیان لە قەڵەم داوە، هەرچەندە دەبوایە بە کاریزمی قۆپیەی لە قەڵەم بدابوایە..، چونکە ئەو ناز ناوانە لەلایەن خەلکانی (وعاظ السلاطين)ەوە بەو سەرۆکانە دراوە ٠

لە زاراوەی کوردی سەرۆکی کاریزمی زیاتر مانای (ڕابەر) دەگرێتەوە کە سەرۆکێکی ڕۆحی میللەتێك بێت، واتە هەم سەرۆکی یاسایی هەم میللی، هەڵبەتە ڕاستە هەموو کەس بە هیوای ئەو پایەیە بەڵام کۆمەڵێك سیفاتی سەرباری کاریزمیش هەیە، ئینجا مرۆڤە تایبەتیەکانن دەگەنە ئەو ئاستە بە گشتی هەروەك فەرهەنگەکان ئەوتایبەتمەندیانەیان وا تۆمار کردووە : (..خۆڕاگری، دڵسۆزی بۆ بەها بەرزەکان و بۆ حزب وبۆ هاوپەیمانانی، زۆر ناسین،

[1] بڕوانە : تأريخ حضارة وادي الرافدين.. - د.احمد سوسەص١٠٢

كەم پێكەنین، زۆر وزە، هێزی ڕاكێشان، بێ لایەنی لەناكۆكیە ناوەكیەكان[1]، .. لە هەمووی گرنگ تر بەلای (ماكس ڤیبر) (جاذبیة الشخصیة)یە، ئەوەیان سیفەتی سەرۆكی سەركەوتووە لە ڕووی زانستی نەك لە ڕووی (ڕێباز)، هەڵبەتە لە مەدرەسە مەبدەئیەكان بە تایبەتی لە ئیسلام سەرۆك وەك دەرفەت نیە هەر بێتو بیقۆزێتەوە بێ مەرج، یان وەك (سپنوزا) بڵێ سەرۆك لە دیموكراسیدا پابەند نابێت بە یاسا.. ئەخێر كۆمەڵێك مەرجی قورسی بۆ (سەرۆك، رابەر، والی) داناوە، ئینجا ناوی جیاجیا تری هەیە لە كەلتوری ئیسلام، خەلیفە، ئیمام، ڕەهبەر، سوڵتان، ئەمیر المؤمنین، .. بەكورتی و خێرایی هەندێك لەمەرجەكانی هەڵدەبژێرین:

١-مەرجە ئیسلامیە سەرەتاییەكانی لە دڵسۆزی و خۆ نەویستی و باڵایی و ڕەوشتی كەسێتی و سیاسیش.

٢-شارەزابێت بە واقیعی جیهانی و ناوەخۆی و ڕووكاری ڕووداوەكانیش.

٣-بەچاكی لە مەبەستی (مقاصد)ی ئیسلام و ئایەتەكانی قورئانی پیرۆز گەیشتبێ بە پەیڕەوكردنەوە.

٤-كەمتر نزیكی وردە ئیش و ڕاپەڕاندن بكەوێت، كەم تێكەڵ بێت زیاتر ڕێنمایی دەربێت بەتایبەتی لە قۆناغە سەخت و گواستنەوەییەكان.

٥-زۆر شورەوی بێت، دروست بوونی بریار (لا مەركەزی) بێت، (مەركەزیانە) جێبەجێ بكرێت، دەبێ بشزانێ ئەو بریارانەی دەشێ بۆ جێبەجێ كردن، سەركەوتووترین پەیوەندی سەرۆك بە شورا بەپێی ئەو ئایەتەیە ﴿الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ﴾، واتە شورا فرەگەلالە پێش كەشی ئەو سەرۆكە دەكاو ئەویش چاكترینیان لە چاك جیادەكاتەوە، گرنگ ترینیان لە گرنگ جیا دەكاتەوە، خراپ لە خراپترینیان جیا دەكاتەوە.. بۆ پەیڕەوكردن.

٦- بەپێی ئەو كۆمەڵە ئایەتەی لەنێوان ( .خضر) و ( .موسى) هاتووە

[1] بۆ زیاتر بڕوانە (قاموس التحلیل الاجتماعي) ل١٠٢.

(٥) سەرۆک    فرایس    President

دیمەنێکە لەنێوان دوو سەرکردایەتی دڵسۆز، بەڵام یەکەمیان دووربین و هەمەلایەن بینەو بە بابەتیانەو ئەنجام هەڵسەنگێنەر بۆ ڕووداوەکان دەچێت، کەچی لایەنی دووەم بە دڵسۆزی و هەنووکەییانەو یەك لایەنی و کورت بینانە بۆ ڕووداوەکان دەچێت و پێی وایە ئەوا (بێ هۆی مەعقول) کەشتیەکە دەشکێنێ! ئیتر بەرپرونی قورئانی پیرۆز ئەو جۆرە سەرکردەیەی جۆری یەکەم هەڵدەبژێرێ لەو بەسەرهاتە.

ئەرکی رابەر لە ساتە تەنگەکاندا ئەوەیە بتوانێ گیانی سەرکەوتویی لەپێشدا دروست بکا (کە پێی دەڵێن ورە)، بەپێچەوانەی گیانی شکست، کە زۆربەی جار خەڵکی سادە ئیرادەی بەهێز نیە لە ڕووبەڕووبوونەوەی کارەساتێك یان کێشەیەکی گەورە یان هێرشێکی بێگانە یان ئەرکێکی نیشتمانی و سیاسی قورس، بێ متمانەیە، خۆڕاگر نیە، داماوە، بە پڕوپاگندە زیاتر باوەڕدەکا، ئارامی نیە، ڕووخاوە، دەترسێ، وەسفی کێشەکە یان دوژمنەکە بەزیادەوە دەکا، ... ئەوا هەمووی دەردی کوشندەیە دەبێ ڕابەر ئەپێشیە بەسەر ئەو دەردانە زاڵ بووبێ، هەمو دەروازەکانی کۆنترۆڵ کردبێ، ئەگینا شکست دۆستی نزیکی دەبێ، لێرەوە دیان رۆڵی ئایین چەندە گرنگ دەبێ ئەگەر ئەو خەڵکە بە بیروباوەڕی ئاینی پەروەردە کرابێ، وەها دۆخێکی ڕوبەڕوو نابێتەوە پێویستیشی بە کاریزمی نابێ، بەڵکو دەزگاو یاسا ئەو رۆڵە دەبینن.

( ٦ )

# خەباتی رزگاریی نضال التحرري Liberation conflict

ئەو زاراوەیە لەکوردستاندا هاوتایە لەگەڵ (هێزە نیشتمانیەکان) یان (شۆڕشی کردنەوەی کوردایەتی) یان بەگشتی (پەیوەندیو جیاوازی رزگاری نیشتمانی بە رزگاری کۆمەلایەتی).

هەر کۆمەڵێك (یان تاکێکیش) باوەڕو کردەوەی وابێت کە نەتەوەی ئەو خاوەن بەهاو نەریت و مێژووو کەلتورو پێکهاتەی جەستەی و پاك ترە لە نەتەوەکانی تر، ئەو باوەڕو بۆچوونەش بکرێتە سەرمەشق بەرامبەر میللەتانی تر وەك بەرنامەی سیاسی و دەستووری.. ئەوە (رەگەزپەرستە)، بزوتنەوەی رزگاری لەو چەمکە نەهاتووە نە بۆ ئەو مەبەستەش، هەر چەندە لە هەندێ دۆخ لە کاردانەوەی رەگەزپەرستیو زیادەی ستەمی نەتەوەیی جۆرێك لە بیروباوەڕی رەگەز پەرستی بۆ نەتەوەی بن دەستیشی دروست دەبێتو بووە، .. بەلام هەر ناڕەوا دەردەچێ چونکە یاسای (کاروکاردانەوە) یاسایەکی میکانیکیە نەك کۆمەلایەتی، واتە ئەگەر داگیرکەرت رەگەز پەرست بوو نابتە بەلگە ویاساوی رەوایی پالپشتی رەگەز پەرستی تۆش.

دەبێ بەووریایی بڕوانینە زاراوەی وەك بیری نەتەوەیی، سەرکردەی نەتەوەیی، رزگاری نەتەوەیی، خەباتی نەتەوەیی، دەوڵەتی نەتەوەیی..،واچاکە لەجیاتی نەتەوەیی نیشتمانی بەکاربهێنرێت هەنگاوێك لە مرۆڤایەتی نزیك ترە، چونکە خەباتی رزگاری بە سروشتی خۆی ناوەڕۆکێکی مرۆڤانەی هەیە، بەپێی هەموو مەدرەسەکان و ئاینی راستەقینەو یاسای دەولیش، بە پێی ((پەرەگرافی ٣ی

مادەی ١ی-مقاصد امم المتحدە)) رەوای خەباتی رزگاری هەتا بەشێوەی شۆڕش‌و چەکداریش دەدابەپێی بڕیاری ٢٦٢٥ی ٢٤\ئۆکتۆبەر\١٩٧٠، سەبارەت بە هەڵوێستی فکری ئیسلامی بەرامبەر خەباتی رزگاری ئێستا ئەو کێشەیە کەمتر بووە ( بۆ زیاتر بڕوانە پڕۆژەی ئیسلامی بۆ رزگاری کوردستان لەو فەرهەنگە)، هەر بۆیەش حزبە کوردستانیەکان‌و شۆڕش‌و ڕاپەڕینەکانیان‌و بە واقعی ئێستاشیانەوە نوێنەرایەتی کێشەیەکی رەوا دەکەن ئەگەر خودی خۆشیان لە جۆرە تەرازوویەکی تریش بێت، رەگەزپەرستی نیە، انفصالی و (دعوة الی عصبیة) نیە، داگیرکردنی خاکی خەڵکی.تر نیە، مادام سنور و ئامانجیان کوردستانیە نەك کورد، کە یەکەمیان مانای نیشتمانی بەهەموو سەرخانیەکانەوە دەگەیەنی و دووەمیشیان نەتەوایەتی، بێجگە لە چەند نموونەیەکی دەگمەن وەك (کاژیك) و (پاسۆك).. پێچەوانەی ئەو رێسایە بووینە، بۆیەش بەرنامەو خەباتی هەموو حزبە کوردستانی و شۆڕشەکانیش لەسەر دوو تەوەر خەباتی کردووە:

**تەوەرەی یەکەم:** رزگاری-نیشتمانی.. کە لە کۆتاییدا خۆی لە رزگاری کوردستان دەنوێنێت، لە ئامانجی کاتی جیاجیای وەك لا مەرکەزی، ئۆتۆنۆمی، فیدراڵی، ولایات، .. تا سەربەخۆیی و دەوڵەتی کوردستان، جا چ جۆرە دەوڵەتێك (ئیسلامی، سۆشیالیستی، ..هتد) ئەوەیان بەندە بە تەوەرەی دووەم، لە تەوەرەی یەکەم هەمووی هاوبەشن لەو ئامانجە، بەو جۆرە حزب و هێزانەش دەووترێ هێزە نیشتمانیەکان (قوة وطنیة) یان (أحزاب الوطنیة)، هێزە نیشتمانیەکانی کوردستان وەك چەمکی یاسایی هاوولاتی دەبێ هێزێك بێ لە رووی یاسایی یان شەرعیەتی شۆڕشگێڕی و جەماوەری کوردستانی بێ نەك کوردی.

لە کوردستان چەند حزبێك هەبوونەو هەنە کە (نیشتمانی) نین بەو پێناسە، هەر چەندە زۆرترین قەبارەو چالاکیشی لە کوردستان بووبێت، لەوانە (مەدرەسەی شیوعیەت کە حزبی شیوعی عێراق، مەدرەسەی ئیسلامی کە بزوتنەوەی ئیخوان المسلمین، بەرەی تورکمانی ئێستا).

بە دروست بوونی (کۆمەڵەی رەنجـدەرانی کوردسـتان) و هاتنـە نـاو خـەباتی کوردستانی لە دوای سالانی ١٩٧٦ ئەو تەوقەی مەدرەسەی شیرعیەتی شـکاند و دوایش لە کۆنگرەی شەقلاوەی ١٩٩٣ حزبی شیوعی خۆشـی ئـەو دۆخـە شـازەی کۆتایی پێ هێناو بووە هێزێکی نیشـتمانی بەدروسـت بـوون و گـۆڕینی بەشـێك لەحزبی شـیوعی عێراقـی بـۆ حزبـی شـیوعی کوردسـتانی، بەهـەمان شـێوەش (رابیتەی ئیـسلامی لە کوردستان بە سەرۆکایەتی شێخ محمد بەرزنجی لە ١٩٨٢)و دوایش (بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردسـتان) خەباتی پێش مەرگایـەتیان لـە دوای سـاڵی ١٩٨٧ز، ئەو تەوقەی مەدرەسەی ئیـسلامیش شکاو دوای لە سـاڵی ١٩٩٤ بە دروست بوونی (یەکگرتووی ئیـسلامی لە کوردستان) هەموویان بوونە هێزێکـی نیشتمانی، بەرەی تورکمانیش ئێـستا لـەو دۆخـە شـازەدایە زیـاتر لـەوانیش لـە بەرنامەی خۆی رزگاری ئەو نیـشتمانەی تیا نیە.

**تەوەرەی دووەم:** رزگاری کۆمەڵایەتی، ئەو تەوەرەش زیاتر کێشەکانی مرۆڤـی وەك: دادگەری، ئیسلاح، هەژارایەتی، چینایەتی، فکـر، فەلـسەفە، ئایـدیۆلۆژیا، ئایین، .. دەگرێتەوە، ئەگەر تەوەرەی یەکەم رزگاری خاك بێت ئەوا تەوەرەی دووەم رزگاری تاکە، یەکەم شاقولیە دووەم ئاسۆیی، یەکەم پەیوەندی ئەتەوە بە ئەتەوەیە لە دووەم دا پەیوەندی مرۆڤ بە مرۆڤە، یەکەم دەڤەری و تایبەتە دووەم جیهـانی و گشتیە، یەکەم بیرو ئەندێشەو ئایدیۆلۆژیا نیە تەنیا هەستو ئەستو پابەنـدی یـە لە دووەم دا بەرنامـەی سیاسی و عەقاندی و مەدرەسەیە، یەکەمیان نزیك تـرە لـە زانستی سیاسـەت کەچی دووەم لە رێبازی سیاسی، کەواتە هەمو حزبە جیاجیاکان لەسەر بنچینەی تەوەری یەکەم یەکدەگرنەوە، بەڵام لەسەر بنچینەی تەوەری دووەم لێك جیا دەبنەوە، ئەوەش بریتیە لە پەیوەندی نێوان هەردوو تەوەر بـەو شـێوەیە: ئەوەی دەڵێ کێشەی مرۆڤی کوردستانیش هـەر بـە قورئان و سـوننە چارەسـەر دەبێت، ئەوانە ئیسلامیەکانن، بەشێکی تریش دەڵـێن: نـەخێر ئـەو کێـشەیە بـە (مارکس-لینین) چارەسـەر دەبێ، ئەوانە چەپیەکانی کوردستانن، هەشە پێی وایە

بە سۆشیال-دیمکراسیانە چارەسەر دەبیٚ ئەوانەش چەند حزبێکن لە کوردستان، هەشە پیٚ ی وایە بە لیبرالٚ دیمکراسی ئەوەش حزبە دیمکراسیەکانی کوردستانن، بەشێکیش هەموو کێشەکانی مرۆڤی کوردستان هەر لە کێشە نەتەوەییەکەی دەبینن (واتە جووت کردنی هەردوو تەوەری رزگاری-نیشتمانی و رزگاری کۆمەلاٚیەتی)، ئەواتەش نەتەوەگەری و تەیاری بیری نەتەوەیی سەرەتای رەگەزپەرستیەکەیان لەو جووت کردنە دیٚت.

ئەو بەشانەی دوای (شیوعی ولیبرالی و.. )پهێیان دەووتریٚ (عەلمانیەت)، ئەوانە لەدوای شکستی مەدرەسەی شیوعیەت لە ١٩٩١بە دواوە جۆرێك لە بۆشایی ئایدیۆلۆجی و مەبادیئی لە ریزەکانی پەیدابووە، بۆ پرکردنەوەی ئەو بۆشاییە (کە لە تەوەری دووەم دروست بووە) بەتەوەری یەکەم پری دەکەنەوە.. بۆیە عەلمانیەتی کوردستان بەگشتی جۆرێك لە گەرانەوەو وەچەرخانی لە بنەما ئاسۆییەکانی بەرەو شاقولیەکان، واتە لە فاکتەرە ئایدیۆلۆژی مرۆڤایەتیەکەی بەرەو فاکتەرە کۆمەلاٚیەتی و کلاسیکیەکان چووە، بەلاٚم لەهەر دۆخێك بن لەو قۆناغەی رزگاریدا نەك عەلمانیەتی میان رەو ونەتەوەگەری هەرەتوندەکەش لەگەلٚ ئیسلامیەکان یەك دەگرنەوە، چونکە بەپیٚی هەموو مەدرەسەیەك رەوایی بەو خەباتەی رزگاری دراوە ،لە فکری ئیسلامیش لە هەموان روونتر (کە لە بابەتی پرۆژەکانی رزگاری کوردستان زیاتر باس دەکریٚت)، هەروەهاش لە مەدرەسەی شیوعیەت و.. هەتا لە یاسای نیٚودەولەٚتیش کە زیاتر دروست کەرانی سەرانی ئیمپریالیزمیش بووینە کەچی لە (مقاصد امم المتحدة) لە مادە (١) پەرەگرافی (٣) رەوایی بەو جۆرە خەباتە و بەرگری چەکداریش داوە، تا دەگاتە مافی چارەی خۆنوسی، ...

خەباتی رزگاری لە هەر ولاٚتێك ناوێکی هەبووە، لە ئیسپانیا لەدژی ناپلیۆن دەوترا (الحرب الشعبية-گەریلا)، لەجەنگی جیهانی لەدژی ئەلمانیا دەوترا (حرب الأنصار) لە هەمان جەنگ لە یۆگسلافیا (حرب دفاع الشعبي) وفەرەنسیەکان

(حرب العصابات) یان (المقاومة) له جەزائیر (الحرب الثوریة).. ئێستا زیاتر ئەو جۆرە بەرگریە پیرۆزیەتی ئاینی پێ دەدرێ وەك جیهاد المقدس.

خەباتی رزگاری قۆناغ و گۆڕەپانێکە کام مەدرەسە و کام لایەنی سیاسی خێراترو راست تر خزمەتی بکاو بە ئەستۆی خۆی بگرێت ئەوە خاوەنیەتی.. بەلام مدرسەکانی عەلمانی لەو سەردەمە بەهۆی ئەو بنەما لاوازانەی کە زیاترینیان پەرەی گرتووە لە (بەرژەوەندی تایبەتی) ئەوا کۆمەلگایەکی گەندەلت بۆ دروست دەکا کە توانای بەرگری داگیرکەری نابێ، لەلایەکی تریشەوە مدرسەکانی عەلمانی لە جیهانی ئیسلامی کۆمەلگای دوچاری جەنەی (تقزم) دەکا، دیسان کاریگەری تێکەتیڤی ترسناکی دەبێتەوە، بەتایبەتی لەم سەردەمەی دروشمی (ململانێی شارستانی)کە ئەدرێسی عەولەمەی ئێستایە، لەو گۆرەپان و ململانێیەدا پال بدەیە لای هەر مدرسەیەکی عەلمانی ئەوا بە سروشتی خۆی دەکەویە قۆلی پێنجەم لەدژی رابووردووی میللەتەکەت لە قازانجی فەرهەنگی بیانی و لەدژی بەهاو نەریت و خواستە راستەقینەکانی میللەتەکەت دەبیت، لەگەل زۆر سەرەنجامی نێگەتیڤی تر.

## ( ٧ )

## براكوژى إقتتال الاخوة Fraternicide

تايبەتە بـە كـورد وەك وشـە، وەك زاراوەش مەبەسـت لـێی (مـل ملانێـی خوێناويە لە چوارچێوەی باڵـەكانی بزوتنـەوەی رزگـاری نيـشتمانی كوردسـتان)، ئەگينا ماهيەتەكەی دووبارە بووبێـتـەوە لـەناو زۆربـەی ميللـەتان بـەناوی (حـرب الاهلية)، يان (حروب داخليـة)، زۆربەی ميژووی جيهانيش پێك دەهێنـێ، شـەڕی نێوان قابيل وهابيليش بە يەكەم براكوژی حيسابە.

لە ميژووی نوێی كورد ئەو زاراوە لە سـاڵەكانی ١٩٦٦ بەزەقی سـەری هەڵداوە كـاتێ بـاڵی حزبـی (م.س-پ.د.ك) بـە رێبـازێكی عـەلمانی جيابوونـەوە لـە سـەركردايەتی ئاينی مەلا مـصطفی بارزانی، بـەڵام چـونكە لايـەنی يەكـەم لـە كۆتاييدا كەوتە بەرەی داگيركەر ئەوا بەخێرايی ئەو زاراوەيـە كوژايـەوە، لەسـاڵی ١٩٧٢-١٩٧٥ جارێكی تر خەريك بوو سەر هەڵبداتەوە لەگەڵ (ح.ش.ع) ديـسان (حزبی شيوعی) كەوتەوە بەرەی داگير كەرو ئەو زاراوە باوی وەرنەگرت.

لە دوای سەهەڵدانەوەی شـۆڕشی نـوێی سـاڵی ١٩٧٦ بەرابەرايـەتی (ی.ن.ك) ئەو زاراوەيە بەراستەقينەتر باوی وەرگـرت بەتايبـەتی لـە كارەسـاتی هـەكاری و ڕووداوەكانی دوای ئەو لە ساڵانی ١٩٧٧-١٩٧٨ كە زيـاتر لـە (٨٠٠ پ.م) لـە نێوان (پ.د.ك) و (ی.ن.ك) تياچوو و كە زياترينيان لايەنی (ی.ن.ك) بـوو، ئـيتر لەو سەردەمی زياتر ئەو زاراوەيە ميللی بوو و كەوتە نـاو خـەڵكی، هـەر چـەندە هەندێك لە شارەزايان دەڵێن زاراوەيەكی كۆنە لەبارەی ڕووداوەكـانی بـەتليس كـە هەندێ عەلمانی و شێخەكانی تەريقەت لەدژی شێخ شەهاب چوونە پـاڵ لەشـكری

تورك، شێخ شەهاب کشایەوە وتی با شەڕی براکوژی نەبێ[1]، گوایە ئەوە سەرەتای بەکارهێنانی سیاسیانەی زاراوەی براکوژی بووە.

جاران بەشەڕی نێوان دوو بەرەبابی یەك هۆز وتراوە برا کـوژی، بەشـێکی تـر دەڵێن دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەست و ئەست و ئەدەبیاتـەی کـە وەسـفی بـرا کـوژی نێوان ئیمامی عەلی و معاویە کراوە، .. کەچی بەشێکی تر دەڵێن ئـەو زاراوەیـە چەکە لەگەڵ سەربردەی مرۆڤ و لە براکوژی نێوان قابیل و هابیل هاتووە..

بەهەر حاڵ جارجار رەنگە لە مێژووی سیاسی نەتەوەیی کورد لەدوای سـەدەی بیست هاتبێت، بەڵام پێش ئەو سەدەیە بەو ماناو پێناسەی سەروو لـە کوردسـتان نەبووە، ئەو برا کوژیە (یان خۆ کوژیشی پێ دەووترێ) زۆربـەی مێـژووی سیاسـی نوێی کوردستان پێك دێنێ لە هەموو پارچەکان، لە کوردسـتانی خـواروو شـەڕی نێوان (ی.ن.ك) لە لایەك و (پ.د.ك) و (حسك) و (حشع) و (پاسۆك)، (لەشکری ئیـسلامی ١٩٨٢)، دوای راپـەڕینیش دیـسان لەگـەڵ (پ.د.ك)، بزوتـەوەی ئیسلامی، pkk، هەروەها (پ.د.ك)یش لەگـەڵ (حـدکا)و (کۆمەڵـە) لـە دیـوی ئێران و pkk و پارتی گەلی دیوکراسی کوردستانیش، ..

لە کوردستانی ئێرانیش (حدکا) لەگەڵ (کۆمەڵـە)، لـە کوردسـتانی تورکیـا (pkk)ەش لەگـەڵ زۆربـەی حزبـە کوردسـتانیەکانی سـەرووی کـردووە، .. وەك تێبینی دەکرێ ئەو دۆخە لەگـەڵ بـەرەو عەلمانیـەت چـوون زۆر زیـادی کـردووە، هۆیەکانیش زۆرە دوانی (لەو رەوتە باسە) سەرەکین:

١-عەلمانیەت: زیاتر بەرژەوەندیـە نـەك مـەبادیئی بزیـە دەسـەڵات وەرگـرتن جۆرێك لە راشکاوی و رەوایی وەرگرتووە، بەتایبـەتی ئەگـەر ئـەو حزبـە لـەرووی ئایدیۆلۆژیەوە نوقستان بێت و داینـەمۆی فکری لاوازبووبێ ناچـار بـرا کـوژی بـە کارهێناوە وەك ئامرازێکی پارێزگاری لـە مـانی خـۆی، بـۆ ئـەوەش ئەنـدامان و لایەنگرانی بە حوکمی پایەو ئیمتیازو بەرژەوەندی راگرێت ئەوا زۆر پێویـستی بـە

[1] بۆ زیاتر بڕوانە ئیسماعیل حەقی- ناودارانی کورد.

دەسەڵات دەبێت و شەڕیشی لەسەر دەكا.

٢- لەبەر ئەوەی حزبە كوردستانیەكان بەرنامەیان ماركسی بووە ئەوا بەپێی یاسای سێیەمی دیالكتیك (قانون وحدة وصراع الاضداد)[1] نەك براكوژی هەر دەشێ و ناشێ، بەڵكو یاسایە و هەر دەبێ ببێ، بە ئامرازی پێش كەوتن دەزانرا، تا ئەو دواییەش لە مێزگردەكان باس لە ئیجابیاتی براكوژی دەكرا و گوایە ئەو میللەتانەی شەڕی برا كوژی تیابووە پێ ی پێش كەوتوون، پرسیاری واش كراوە: ئاخۆ ئەو شەڕە ناوخۆییە براكوژیە یان نا؟ چونكە بە پێی ماركسیەت هەر حزبەو تەمسیلی چینێك دەكا، چینەكانیش لەمل ملانێیەكی خوێناوی بێ دانوستان دان تا نەمانی چینایەتی، ئیتر هەر یەكە ناوی چینی پرۆلیتاریای لەخۆ بار دەكرد و لای بەرامبەریش بە برجوازی و لە خزمەت ئیمپریالیزمی ئەمریكی ئیتر دەبووە گەرمەی شەڕی براكوژی، تا ئەو رادەیە جارجار هەندێ حزبی كوردستانی دەگەیشتنە ئەنجامێكی پێچەوانە، گوایە حزبی بەعس <u>سۆشیالیستیەو</u> نزیك ترە لە ماركسیەت هەتا حزبێكی نەتەوایەتی، بۆیە بەپێی یاسای ڕێزكردنی (اولویات-مراتب التناقض) ئەوا ئەوەی ناوی نراوە براكوژی لە پلەی یەك بووەو رەوا بووە.. ئیتر هەموو كورد لەسەر ئەو بنچینە بێ بنچینەیە بەناویەك كەوتبوون، هەڵبەتە راستە ئەو زاراوەیە زیاتر بەرپرانگەی نەتەوەگەریەكان (براكوژی) نەگینا بەپێی ماركسیەت (براكوژی) ئەوەیە نوێنەرانی چینی زەحمەتكێش لە حزبە شیوعیەكان بكەونە مل ملانێ وەك سەرەتای مل ملانێی نێوان باڵەكانی سەر بە چین و سۆڤیەت، ترۆتسكی و ستالینی، چەپی نوێ و كۆن، ماركسی شۆڕشگێڕو ماركسیە هێمنەكان..، بەرپوانگەی فەلسەفەی چینایەتی زاراوەی برا كوژی رەوایە، لە ١٩٧٦ بەدواوەش هەموو باڵەكانی كوردایەتی شاخ بەرەو ماركسیەت بازیان دا، بۆیەش مێژووی نوێ زۆربەی شەڕی براكوژی بووە، تا ئەو دواییەش لە سیمینارەكانی دا بە ئاشكرا باس لەوە دەكرا كە ئەوە شەڕی

---

[1] البیان الأول للاتحاد الوطني الكوردستاني.

برا کوژی نیه، ئنجا باس له سودو ڕەوایی ئەو شەڕە دەکراو تەنزیر دەکرا (بە تایبەت لە لایەن ی.ن.ك) کە میللەتانی جیهان بەو جۆرە شەڕانە پێش کەوتوون[١]، لەو نمونانەی باس دەکرا جەنگەکانی نێو خۆیی ئیسپانیا وئەمریکا..

هەڵوێستی فیکری ئیسلامی براکوژی ئەوەیە لە نێوان نوێنەرایەتی یەك (ئومەتن) ﴿وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا﴾.. بەڵام بەگشتی ئەو جۆرە شەڕانە ئەگەر ناویشی (براکوژی) پێش نەبێت (حەرام) بووە، (بۆ زیاتر سەرنج بدە جەنگی ڕەوا— لەو فەرهەنگە).

[١] بۆ تەسڵی ئەو بیرە سەرنج بدە: ١- مادية الديالكتيكية، ٢- في التناقض (ماوتسي تونك)، ٣-أصول فلسفة الماركسية (جورج پوليتزر)..

# ( ٨ )

## دادگەری العدالة justice

بە مانا فراوانەکەی مەبەست لـێی ڕێکخستنی ژیانی خەلکیە لـە پەیوەنـدی نێوان خەلك و دەسەلات و ئەرك و فرماندا.. کە هەمو بوارەکانی فکری و سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابووری و نیشتمانی و دەروونی و.. هەتا جەستەییش دەگرێتەوە، هەریەکە بەسنوری خۆی و سنوری تر نەبەزێنێ، هەندێ مەدرەسەی تر کـە (داوای دادگەری) دەکـەن پێیـان وایـە دادگـەری تـەنها لایـەنی ئـابووری و مولکیـەت دەگرێتەوە (لەوانە مەدرەسەی مارکسیزم، مەدرەسەی مادی و سۆشیالیستەکان) تا رادەیەکیش مەدرەسەی لیبرالی سەرمایەداریش، بەتایبەتی رووکاری نوێیان.. ئنجا دادگەری لەگەل یەکسانی جیایە، جیار وایـە بـۆ لێـك جیاکردنـەوە لەگـەل باساکانی تری سورشتی و ژیاری و بـایۆلۆجی بـە (دادگـەری کۆمەلایـەتی) نـاو دەبرێ، لە بنەچەشدا هەر زاراوەیەکی ئاینی بووە هەر لەوێش پێناسی بـەکورتی و پوختەیی دراوەتێ و ئینجا لەسەر ئەو بنـچینەیە پێناسـی جیاجیـای وەرگرتـووە، هەندێکی لێ هەلدەبژێرین:

- موسوعة الكشاف..: پەیرەوکردنی قورئان و سوننە مانای دادگەریە.
- معجم مصطلحات اصول الفقه..- العدالة:الاستقامة، ..هي ترك الكبائر و عدم الاصرار على الصغائر.
- رسائل (ابن سيناء): العدالة وسط بين الظلم و الظلام، هـەروەها دەلـێ دادگەری بریتیە لە زالّ بوونی ئەخلاق بەسەر دەروون دا.
- مەبەستی بنچینەی هـاتنی پێغەمبـەرەکان و ئیسـلام بـۆ پـەیرەوکردنی دادگەریە، بۆیە لە قورئان زۆر باسی (عدل) کراوە، هـەتا باسـی (خـوای گـەورە)

خۆی بە لـێبوەشانەوە لەگەڵ خۆی لەگەڵ بەنـدەکانی، ئینجـا بـۆ دەسـەڵاتداران و خەڵکی بەگشتی.. بە (عادل) کردووە .

دادگەری راستترین هێڵە کە دنیاو قیامەتو سروشتو ژیـان، مـرۆڤ و واقیـع، گەورەو بچووك، حاکم و مەحکوم، .. لەسەر یەك رێکـی کـۆ بکاتـەوە، تـا ئـەو رادەیە دادگەری لەگەڵ دوژمنیش ﴿لاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُوا﴾.

- لە زۆربەی فەرهەنگە کۆنەکانی ئیسلامی دادگەری بەندکراوە بە رەووشتیشو لە نێوان (افراط وتفریط) لەوانە (موسوعة مصطلحات جامع العلوم) کە بـە (دستور العلماء) بەناوبانگە دانەرەکەی (قازی نەگیری). مادە: عدالە.
- في اللغة الاستواء، ضد الجور، استقامة علـى طريـق الحق..واتـە بەنـدە بـە فەلسـەفەی هەق و رەوشت.
- ابن تيمية: لە تەفسیری (سورەتی مائـدە)دا دادگـەری بـە (ولايـە صـالحة)و سیاسـەت پێك دەبەستێ. (فهذان جماع السياسة العادلة والولاية الصالحة).
- هەریەکە لە (لسان العرب) و (قاموس المحيط) لە مـاددەی (عـدل) هـاتووە: العدل ضد الجور، الميزان، المستقيم.
- لە (معجم المصطلحات العلمية والفنية) لە (مادە: عدل) هـاتووە: الإعتـدال والإستقامه والميل الى الحق.
- ابوحامد الغزالـي (کتێب: میزان العمـل): لـە بابـەتی" عـدل في السياسة" دەڵێ: ئەو کاتی (عدل في السياسة) دێتە دی کە لە شارێك یان وڵاتێـك ئـەو خەڵکە وەك جەستەی مرۆڤ هەر ئەندامەو بەکاری خـۆی هەڵـسێ. .. واتـە دەیەوێ بڵێ دادگەری ئەوەیە کەسی شایستە لە شوێنی شایستە.
- ئیمام غەزالی: الإعتدال هو الميزان الصحيح لجميع انواع السلوك والخروج هـو مصدر كل الامراض.
- مەدرەسەی شیوعیەت پێی وایە بە هەڵوەشاندنەوەی مولکیەت و کردنی بـە مولکیەتی گشتی دادگەری دێتـە دی (مبـاديء شـيوعية-انجلس، رأسمال-ماركس).

+ مەدرەسەی لیبراڵ دیمکراسی پێی وایە دەرفەت بەخشین بەسەربەستی بۆ هەرتاکێك لە بازاڕی ئازاد دا دادگەرییە (بۆ زیاتر سەرنج بدە: ئادەم سمس، رۆسۆ، فۆکۆیاما، فەیلەسوفە تەنویریەکانی تر..).

+ مەدرەسەی سۆشیالیستەکان، چارەسەرێکی مام ناوەندی نێوان شیوعیەت و لیبراڵ دیمکراسیە تا رادەیەك لە ئیسلام نزیکە (بڕوانە: برنشتاین، فۆریێ، کۆڵ، سان سیمون..)، بەڵام هەر لە چوارچێوەی ئەو چەمکەی کە دادگەری قەتیس بێت لە ئابووری، ئیتر پێیان وایە مولکیەت بەپێی کار دروست بێ ئەوە دادگەرییە.

+ بەڕای (سپینوزا) لە(رسالة في اللاهوت و السیاسة) دادگەری ئەو کاتە دێتە دی کە هەر کەسێك ئامادە بێت ماف بداتەوە خاوەنی بەپێی (یاساکانی مەدەنی) و سەربەستی تاك.

+ غاندی: دادگەری ئینجا نەمانی (توندوتیژی).

هەڵبەتە بەسەدان پێناس و تێڕوانینی جیاجیای تری لەسەرە، بگرە کۆنترین مادەی ئێکۆڵینەوە بووە، بەپێی هەموو فەرهەنگەکان چەمکێکی ئاینیە لەگەڵ هاتنی پەیام و بەشەریەت هاتووە، بۆیە فکری ئادەمی زادیشی ورووژاندووە، هەر لە (مەدرەسەی یۆنانەوە تا ئەوساتە)، کۆن نابێت لەگەڵ بوونی مرۆڤ وەك ئاو و هەوا پێویستە، ئێستاش لە دیباجەی زۆربەی دەستوور و پرۆگرامی دەوڵەت و لایەنە سیاسیەکان هاتووە، لە دیباجەی رێکخراوەجیهانیەکان و (عصبة الامم) و (نەتەوە یەکگرتووەکان)یش هاتووە.. هەر چەندە مێژوو زیاتر بە رووداوی نادادگەری پڕبوویتەوە بەتایبەتی ئەورووپاو ئەمریکا بۆیە (زۆربەی زاناو فەیلەسوفانی مادی) دەڵێن (مێژوو بریتیە لە تۆمارگای تاوانەکان)، بەو شێوەیەش نیە، هەردەم بەری (خێر، هەق، ئاشتی، ئارامی، یەکێتی، جەنگی رەوا، بەختیاری، بەزەیی، خۆنەویستی، بەرژەوەندی گشتی، راستگۆیی، بەڵێن، بەهانا هاتن، مەبادیئی عەقیدی،..) بەسەرۆکایەتی دادگەری لە مل ملانێیەکی بێ وچان بووە لەگەڵ بەرەی (شەڕ، چەوسانەوە، دوویەردکی، داگیرکاری، خۆویستی، بێ بەزەیی، جەنگە ناڕەواکان، تۆقاندن، بەرژەوەندی تایبەتی،

مالپەرستی، ئارەزووبـازی، بەدڕەوشـتی، میکـاڤیلی، ..) ئـەزەلی و ئەبەدیـشە مادام رەگ و ڕیشەی هـەردوو بـەرە لـەناو خـودی سروشـتی مـرۆڤ شـین کـراوە، بەجووتە (زوج -دیاد).

توخمی ئادەمیزاد سەربەستیەکی پێدراوە لەو گەردوونە، ئنجا توانای بـەهرەی هەر تاکێکیش جیایە، ئارەزوو و پاڵنەرو خواستیشیان جیایە، تەبیعەتەکانیشیان جیایە، بۆیە بەبێ ڕژێم و تەرازوو بە ماوەیەکی کەم کۆمەڵگە تێك و پێك دەچێ، هەربۆیەش پێویستی بە یاساو ڕێکخستن و پێوەرو تـەرازوو هەیـە، جا هەریەکـە جۆرە یاساو تەرازوویەکی لادادگەریە، بەشێك پێی وایـە دادگـەریش وەك تیـۆری نیسبی ئاینشتاین وایەو نسبیە، واتە هەربەشێکی لای یەکێکیانـە، تـەخێر، ئـەو سیستەمە دادگەریە کە بتوانـێ هـەموو لایەنـەکانی کۆمەڵگـەو مـرۆڤ لـەژیانی ماددی و گیانی بە هاوسـەنگی دابڕێـژێ، واتـە لایەنـەکانی پێویـستی مـرۆڤ لـە سەربەستی و دەسـەلات، لە ئابووری و سیاسی، ئەخلاقی و جەستەیی، دەروونـی و دەرەکی، شاقوولی و ئاسۆیی.. بە تەرازوو ڕێك بخا.

## دادگەری و سەردەم

دادگەری کۆمەڵە بنەماو پەیڕەو و بڕوای نەگۆڕە بەند نیە بە سەردەمو زەمان و زەمین، بۆیە بەشێکە لە توێژینـەوەی ڕێبازەکـانی فکـری و سیاسـی، فەلـسەفی، کۆمەلایەتی، ئابووری، نەك زانستەکان، هـەر بۆیـەش دادگـەری لـە کۆمەڵگـەی سەرەتایی و سـەردەمی ناوڕاستو ئێـستاو داهـاتووش هەریەکـە، زۆربـەی زانـاو فەیلەسوفەکان بەسیاسـەتمەدارانیشەوە کەمتر توانیویانەو دەتوانن (ئـەو سـیفەتەی چەسـپاوی دادگـەری) هـەرس بکـەن، جگـە لـە کەمایەتیـەك، هـەر بـە نموونـە (سوقرات) لەو پرسیارەی دا کە دەڵێ (ئاخۆ سـەردەمەك دێـت درۆ چاك بێـت و ڕاستیش خراپ) بۆی وابووە ئەو سنورانە نیسبی و گۆڕاو نین، بـەلکو چەسـپاون تێکەڵ ناکرێن، خۆ ئەگەر ئـەو سـەردەمەش هـات هـەروەك لـە فـەرموودەش وا هاتووە (سەردەمێك دێت ڕاستگۆ بـە درۆزن لـە قەڵـەم دەدرێ و درۆزنـیش بـە

راستگۆ)، بەڵام ئەوە دۆخی تایبەتیە و لادانی کۆمەڵە (ئینحرافە).

هەڵبەتە مەدرەسەی شیوعیەت و (خەتی تمتەوری بەگشتی) و زۆربەی ئەیلەسوفەکانی سەدەی (١٨-١٩) بێ دوو دڵی وەڵامی ئەو پرسیارەی (سوقرات)یان بە (بەڵێ) داوەتەوە و کۆك بوونە لەسەر گۆڕانی مەبادیئو و ئەخلاق و راستی و دادگەری..پۆیان وابووە ئەواتە چەمکی نسبین، بەندن بە بارودۆخ و پێوانەکانی سەردەمی خۆی، لەو بارەیەوە (ئەنجلس) بەزەقتر دەڵێ: (لا هنالك مبادیء والاخلاق و عدالة ابدیة و ثابتة..) هەڵبەتە بە کۆمەڵێك بەڵگە و نمونەشەوە.

ئەو تێڕوانینە زۆربەی حزب و فەرهەنگەکانی جیهانی سێیەم و کوردستانیشی گرتیۆوە، سەرنج بدە دەستوری حزبی بەعس وەسفی (عدالة الاجتماعیة) دەکا: ماکان یعتبر عاجلا في ظرف اجتماعي ما قد لا یعتبر في ظرف آخر[1]، بەو شێوەیە دەگاتە سەرەنجامێك کە (کۆیلایەتی، دەرەبەگی، سەرمایەداری) لە قۆناغی خۆی بە (دادگەری) قەبڵاندووە.

بۆ روون کردنەوەو لێك کردنەوەی ئەو تێك گیرانە بەشێکی بۆ (فلسفەی راستی) بەجێ دێڵین لەزنجیرەی داهاتووی ئەو فەرهەنگە، بەشێکیش بە نموونەیەکی ئابووری دەست پێ دەکەین کە نموونەی باوی (مارکس و تەتەوریەکان) بووە لە دژی چەسپاوی دادگەری، دەڵێن: باری ئابووری و بازاڕ و تەکنەلۆجیا هەردەم لە گۆڕانە ئەوا کێشەی نوێ و چینی نوێ و چارەسەری نوێشی پێویستە، .. کەواتە دادگەریەکی نوێشی پێویستە.[2]

بەڵام بەکەمێك وردتر دەردەکەوێ کە ئەو گۆڕانکاریانە سنووری دادگەری نابەزێنێ و هەر بە چەسپاوی دەمێنێتەوە، راستە بەشەکانی ئابووری: ئامرازەکان، بەرهەم، پەیوەندی بەرهەم هێنان، هێزەکانی بەرهەم هێنان، بازرگانی، .. گەشەی

[1] تعریفات ببعض المصطلحات- المادة:عدالة الإجتماعیة.
[2] بۆ زیاتر سەرنج بدە ١-مجلد کامل (مارکس-انجلس)، ٢-راس مال-مارکس، ٣-اعمال کاملـــە (لینین).

کردووەو گۆڕاوە، مرۆڤیش خۆیەخۆ و پەیوەندیشی بەسروشت گۆڕاوە، بەڵام با بزانین کام لایەنی گۆڕاوە؟ هەموو لایەکی گرتۆتەوە یان لایەنی نەگۆڕیشی هەیە؟ دیارە ئەگەر بەووردی سەرنج بدەینە پرۆسەی (دروست بوونی مولکیەت) لەدوو پرۆسەی بچووك تر پێك دێت، بەزەحمەت لێك جیا دەکرێتەوە، یەکەم: پرۆسەی بەرهەم، دووەم: پرۆسەی دابەش، ئەو گۆڕانکاریانەی لەسەروو باس کرا هەمووی لەبەشی یەکەمە (لەپرۆسەی بەرهەمە)، کە هەموو مەدرەسە و کۆمەڵیش کۆکن لەسەری، بەڵام کە دێت ئەو بەرهەمە دابەش دەکرێت، ئا لێرەدا مەدرەسەکان جیادەبنەوە هەریەکە لەسەر بنچینەو بەپێوانەیەك دابەشی دەکاو لێرەوەیە هەژارو دەوڵەمەند، چینایەتی، چەوساندنەوە، .. پەیدا دەبێت نەك لە پرۆسەی (بەرهەم)، بۆیە بەشێکی زۆر لە ئابوری ناسان پرۆسەی بەرهەم بەند دەکەن بە زانستی ئابووری و پرۆسەی دابەشیش بە (ڕێبازی ئابووری)- (هەر چەندە ئابووری ناسی ئیسلامی مەزن (محمد باقر صدر) بەو پۆلینە رازی نیە)[1]؛ هەڵبەتە وەك لە بابەتەکانی پێشووش باس کرا زانستی ئابووری گشتیە، گەشە دەکا، بە ئامراز دەگۆڕێ، .. بەڵام ڕێبازی ئابووری نەگۆڕە، مەبادیئە، تایبەتە بە مەدرەسەکان و تیۆری سیاسی و فکری و فەلسەفی و سیستەمی ژیان و دادگەری، .. هەر بە نموونە لە ڕێبازی ئابووریە مەدرەسەکان لێك جیادەبنەوە، مەدرەسەی لیبراڵی (سەرمایەداری) لەسەر بنچینەی قەبارەی ئامراز بەرهەمەکەدابەش دەکا، سوشیالیستی و ئیسلام زیاتر لەسەر بنچینەی کار، شیوعیەت لەسەر بنچینەی پێویستی، .. واتە ئەو جیاوازیانەی (دابەش)بەو ڕاددەیە ناکەوێتە سەر سەردەم و پلەی ئامراز چ (داس) بێت یان (دەراسە)، ئەوەیان بەرهەمەکە زیاد دەکاو بەرژەوەندی گشتیە، بەڵام کاتێ دێیە سەر دابەش (چ لە داس بێت یان دەراسە) ئینجا دەبینی لە نێوان کرێکارو خاوەن مولك و هەقی (دەراسە یان داس) ئا دادگەری تێ دەکەوێ، بناغەی چینایەتیو چەوساندنەوەی وردو درشت لێرەوەیە، .. واتە عەیب لە سیستەمی ئابووریە، لە ڕێبازەکەیە پەیوەندی بە

[1] بڕوانە: (اقتصادنا).

ئامرازی بەرهەم هێنان و گەشەی تەکنەلۆجیاو زەمان و زەمین نیە، بەو شێوەیە دەبینین مەبادینەکانی دادگەری چەسپاو، لە هەموو لایەك، هەق هەر هەقە، ٢+٣=٥، درۆ هەر سەلبیە، چاکە و رەوشت بەرزی هەر ئیجابیە، .. ناگۆڕێت، گەورەترین تاکتیکی فکری و فەلسەفی کە لە خەڵك دەکرێ تێك شێواندنی ئەو (چەمکە)یە بەناوی گۆڕان و سەردەم و.. تا خەڵکی ئەو مافە گەردوونی و ئەزەلیەی خۆی لەمیاد کاتو عەیب و عاری دەسەڵاتدارو زۆردارو دەست و پێوەندەکانیشیان بە نووسەران وحزب و مەدرەسەکەشەوە، .. دابپۆشێ.

## مەدرەسەکان و دادگەری:

هەر لەسەر ئەو بنچینەش لە کۆنەوە تا ئێستا هەر مەدرەسەیەك بەجۆرێ سەیری (دادگەری) کردووە، لە کاتێکدا لیبراڵ دیکراسەکان پێیان وایە - واشیان پەیڕەو کردووە- کە سەربەستی تەواو بدرێتە تاك لە ماڵداری و پەیوەندی بەرهەم هێنان و بازاری ئازاد و سەربەستی بیروبڕواو سەربەستی جنسی، .. ئەوا لە ئەنجامدا جۆرێك لە هاوسەنگی ئارام دەگرێت بەشێوەی (هەرەمی)، سەروو و خواروو، زۆرو کەم، کاری ماسولکەیی و عەقلی، خاوەنداری و بێخاوەن، هەبوون و نەبوون، هەریەکە بە بەختی خۆی لەسەر بنچینەی (البقاء للأصلح..) ئارام دەگرێ- (جۆرێکە لە داروینیەتی کۆمەڵایەتی).. ئیتر ئەوەیان پێ چاکترین دادگەریە.. شان بەشانی یەکسانی لە یاساو مافە مرۆییەکانی تر.

ئەو جۆرە سیستەم و ژیانەی لیبراڵی لە لایەن تیکرای مەدرەسەکان و زاناو فەیلەسوفانی ئالیبراڵی بە دەردی کوشندە لەقەڵەم دراوە، بە ئەزمونگای چەوساندنەوە وەسف کراوە، سەربەستی بیروڕا جیایە لەگەڵ سەربەستیەکانی تری کردە، لە یەکەمیان بەستوری خۆی ئیجابیە بەڵام لە دووەمیان هەر ئەسڵی دەوڵەت و یاساو پابەندیە رەوشتیەکان و ئاینیش بۆ رێکخستنی هاتوون نەك سەربەستی تەواو پێ دانی، چونکە کۆمەڵ بەگشتی بریتین لە تواناى جیاجیا، هێزی کۆمەڵایەتی و ئینتمای جیاجیا، پسپۆرو لێ زانینی جیاجیا، ناوچە و

داهاتی جیاجیا، .. ئەگەر ڕێک نەخرێ و سەربەستی تەواوی پێ بدرێ ئەوا بەماوەیەکی کەم کەمایەتیەک زاڵ دەبێت بەسەر زۆربەی سەرچاوەکانی ژیان و زۆرایەتیەکەش چاو لە دەست دەمێنێتەوە وەک ئێستا، لە کۆنگرەکانی جیهانی و لە کۆنگرەی زەوی (جوهانسبیرک ٢٠٠٢ز)، لە ڕاپۆرتەکانی (UN).. بەکورتی هاتووە: خەڵکی سەروو کە لە ٢٠٪ دانیشتوانی سەر زەوی پێک دێنن، کەچی لە (٨٠٪) دەخۆن، خەڵکی خوارووش کە لە ٨٠٪ی دانیشتوانی سەر زەوی پێک دێنن تەنیا لە ١٦٪ی داهاتیان بەردەکەوێ، ئاماری سەرسوڕهێنەری تر هەیە (١٧٣) کەس و کۆمپانیا لە (٨٠٪)ی داهاتی جیهانیان بەدەستەو (٦) ملیاریش تەنها لە ٢٥٪.

هەتا لە ناوەخۆشدا هەریەک دەوڵەمەندی ئەمریکی هەیە بە ئەندازەی (٢٠٠) خێزانی ئەمریکی بەردەکەوێ[1]، هەر لە کوردستانیش کە سەرەتایەکی سیستەمی لیبڕالیە –لە ساتی نووسینی ئەو فەرهەنگەدا- لە ئامارەکان دەرکەوتووە (یەک موچە خۆری تایبەت مانگانەکەی ٤٥٠ جار بە ئەندازەی موچەخۆرێکی سادەیە).

بەکورتی وەک (ڕۆجیە غارودی) گۆتەنی سەربەستی بازاڕ مانای سەربەستی هەڵلوشینی بێ هێزەکان لە لایەن بەهێز، ئینجا ئەو سەربەستیە هەزاران سەلبیاتی کۆمەڵایەتیو ئابووریو ئەخلاقیو مرۆڤایەتی و جنسی و تەندروستیو دەروونی.. لێ پەیدا دەبێت.. بۆیە مارکسیەکان لە کاردانەوەی ئەوانە تیۆری سیاسی و فەلسەفەی مادی و مەدرەسەی شیوعیەتیان لێ هێنا دی، کە بریتیە لەو دادگەریەی شیوعیەت کە مولکیەت بەیەکجاری لەناو کۆمەڵ هەڵوەشێتەوە، سەربەستی قەڵاچۆ بکرێ تا یەکسانی بێتەدی، چونکە بە بۆچوونی شیوعیەت مولکیەتە سەرچاوەی نادادگەری لە هەموو بوارەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فکری و دەروونی و چینایەتی و ئابووری.. بەڵام ئەوانیش (دەردی تاک

---

[1] بۆ زیاتر سەرنج بدە: ١-امریکا طلیعة الانهیار- روجیە غارودی، ٢-تقریر امم المتحدة لسنة ١٩٩٩، ٣-قمة الارض-جوهانسبرك، جنوب افریقا.

ئاکتەری)یان هەیەو پێیان وایە سەرچاوەی دادگەری تەنها ئابوورییە، ئابوورییەکی ناسەرمایەداری، .. هەرچی فکری ئیسلامیە سەربەخۆیە و وا ناڕوانێتە دادگەری، ئەوەی ئیستاش دەبینرێ لە باری جیهانی و پەیوەندی نێودەوڵەتی و دەڤەریش دادگەری نیە، لە فکری ئیسلام دا وای بۆ ناچێ کە کێشەکانی کۆمەڵ بەگشتی تەنها ئابووری بێت، خۆ ئەگەر لە بارودۆخ و ناوچە و (پەڵەیەکیش) وابوو ئەوە دیسان دەردە نەك ناسایی، ئینجا هەڵوەشاندنەوەی مولکیەت بە گشتی وەك دەستکاری بەندێکی گەردوونیە، زۆر وردەکاری تریش هەیە.. بەو شێوەیە هێنانەدی دادگەری لە فکری ئیسلامیدا ئامانجێکی بنچینەییە بۆ دروست کردنی کۆمەڵگەیەکی بەستاندەر تیایدا جیاوازیەکانی کۆمەڵایەتی‌و نەژادی‌و مێژوویی‌و زمان و ناوچەو وزەی ماسولکەو وزەی زیهنی.. نەبێتە بنچینەی جیاوازی چینایەتی‌و فکری‌و سیاسی‌و مرۆڤایەتی، تیایدا جیهانێکی بێ چەوسانەوە بێت‌و هەموو تاکێکیش بەشدار بێت لە ئاوەدانی ﴿هُوَ أَنشَأَكُمْ مِنَ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا﴾، هەم لە مەودای بەشداری و دروست کردنی بڕیار و چارەنووس، .. بەو شێوەیە ئەو دادگەریە بووە داینەمۆی بنچینەی بڵاوبوونەوە و مانەوەی ئیسلام کەتا ئێستاش پێشبڕکێ لەگەڵ هەموو مەدرەسەکان بکاو ناوی پێغەمبەر لە کتێبە نا ئیسلامیەکانیش بەیەکەم کاریگەر لەسەر ئەو زەویە تۆمار بکرێت[1]، چونکە دادگەری ئەو ئیسلامە بووە سەرزکەکەی لەگەڵ هاوولاتیەك (کە ئاینیشی جیابووە) وەستاندووە لەیەك دادگا بۆ هەق سەندن، ئیتر ئەوە دینامیکی ئەو ئارامی و پێشکەوتن و بڵاوبوونەوەیەی ئیسلام بووە، مەدەنیەت و بەختیاری و دادگەری و خۆش گوزەرانی بەوە دێتە دی و هاتبوە دی، لە کاتێکا لە هەمان سەردەم لە ئەوروپا بۆ هەق سەندن و دادگای کردن لە نێوان دوو لای کێشە- لە باشترین دۆخیاندا - (مربارەز-زۆرانبازی) دەکرا کام لا بیبردبایەوە لە هەقەکەش دەیبردەوە، هەر ئەوکاتی بەندە و رەش پێستەکان کە لەئیسلامدا سەرکردە بوون لە ئەوروپا و جیهانی تر لەگەڵ ورچ زۆرانبازیان پێ دەکردن بە رووتی،

---

[1] بروانە ئە مایل هارد-مئە ١٠٠، یەکەم ناوی کاریگەر لەو جیهانە ئائیستاش محمد ە .

بەرپرسانیش لەسەر تەختە پێیان رادەبواردن‌و یەکتریان دەعوەت دەکرد بۆ بینینی زۆرانبازی وا، رۆژی سێ جاریان لێدەدان بۆ بەرخستنەوەیان کە ئەوانە بەندەن[1]، ئەوەیان هەر لە ئەستۆی ئیمپراتۆرەکان نەبووە.. هەرنایێن بەرووتی بێشەریعەت نە سیستەمی عەلمانی دادگەری پێ نایەتەدی نە بەو جۆرە یاساو ئەریتانە نە بە پەروەردەکەشیان، هەتا ئێستاش لەگەڵدا بێت، چونکە چۆنیەتی هاتنەدی لە ڕێی دوو تەوەرد:

١- یاساو دەستووری ستاندەر (بەعەیار) لەگەڵ هەموو جم و جۆڵەکانی مرۆڤ بە تاك‌و کۆوە، بە ناوەکی و دەرەکی، .. بتوانی تاك راستەرێ بکا چ بەسزا چ بە ماف لە خودی یاساکە.. بێ پێویست بوون بە دەزگای تری وەك: مافی مرۆڤ، پارێزەرایەتی، مافی ئافرەت، مافی منداڵ، .. هەژار.. ئەوەش تەنها بە ئاینێکی ئاسمانی رەسەن دەکری نەك بە ئارەزوی مرۆڤی شەرانگێز.

٢- لەبەر ئەوەی ئەو یاسایانە ناتوانن روو بچنە ناخەکانی هەموو مرۆڤێك، ئەوە کێشەیەکە (نهێنیەکانە- اسرار الشخص)، جا چۆن (چاودێرێکی یاسایی) لە ناخی‌مرۆڤەکە دروست بکەی بۆ ئەوەی ئەگەر چاوی یاساش دیار نەبوو ئەو چاودێرە بەدیل بێت، ئەوەش بە پەروەردەیەکی عەقیدەیی پتەو دەکرێت تا پلەی (ئیحسان) دەتوانی مرۆڤ وا پەروەردە بکا کە لە دادگەریش رەت بدا و بەشێك لە هەقی خۆشی بەجێ دێڵێ بۆ مرۆڤی تر لە (ڕاهی خودا)..

بەو شێوەی دەبینین مەحاڵە هیچ جۆرە دادگەری یان یەکسانی یان ئەو یۆتۆپیانەی کە وێنەکراوە..بێتەدی بێ ئەو دوو تەوەرەی سەروو کە لە هیچ مەدرەسەیەکی تر دەست ناکەوێ جگە لە ئیسلام ٠

نیشانەو دەروازەی بنچینەی دادگەری لەوە دەردەکەوێ بە سادەییەکەی ئاخۆ سەرۆك و والیەکان، بەرپرسەکان ژیانی مادیان چۆنە؟ هەڵبەتە نمونەی کۆن و نوێی ئیسلامی راستەقینە بەناوبانگە لە نوێش لەکاتێکدا سەرۆکی وا هەیە هەتا ٥٠ تەن زێڕی هەیە (مارکۆس سەرۆکی پێشوی فیلیپین بە نموونە)، بە دەیان

---

[1] بروانە : سێنزەهە دکتۆری فیرعەون

قەسر، .. کەچی خمینی، دۆدایڤ، مەلا مستەفا .. کە مردوون بێ سامان و میرات ڕۆیشتوون.

## یەکسانی و دادگەری:

زۆر جار ئەو دوو چەمکە تێکەڵ دەکرێ یەکسانی جیاوازە لەگەڵ دادگەری، هەروەك لە مارکسیەت و زۆر فەرهەنگی تر تێکەڵ کراوە، لەوانە: فەرهەنگی هوبهۆش، موسوعه العلم الاجتماع.. دادگەریان بەجۆرێك لە یەکسانی لێك دایتەوە، هەر چەندە داوای یەکسانی لە لایەن هەر یەکە لە فەیلەسوفە کلاسیکیەکانی وەك (تۆماس مور، سان سیمون، فوریە، ئوین، مارکس، ئەنجلس، ماو، ..) بە مەبەستی دادگەری بووە، هەروەها ئەمو داوایەی (سۆشیالیستی تۆباوی- یەکسانی رەها) هەمان مەبەستە، ئەوانە لە کاردانەوەی ئەو بیرەی کە لەگەڵ عەلمانیەت هاتووە لەسەردەمی یۆنانی و رۆم و بەتایبەتی لەسەر زاری (ئەرستۆ) کە دەڵێ (هەموو مرۆڤ یەکسان نین وەك شانە)، ئەوان بەپێو و یاسایان جیا بووە لە دوو ئەرازووی دوو جۆر یاسا، بائێك و دوو هەوا..بۆ (بەهێز و بێ هێز)، (غەریبە و هاوولاتی)، (رەش و سپی)، (بەندە و خاوەن)، (دەوڵەمەند و هەژار)، (دەسەڵاتدارو بێدەسەڵات)، (رۆمی و نا رۆمی- بەربەر)، (رەمەن و نیشتی)، (پیاوانی ئاینی و ئاسایی) ...

ئێستاش هەر بەو ماهیەت و جەوهەرەیە تەنها شێوازەکانی گۆڕاوە.

لە راستیدا لە فەرموودەش هاتوود: (الناس سواسیة کأسنان المشط..).

بەڵام ئەو یەکسانیە لە ئاست یاساو ئەرك و مافە گشتیەکانە.. ئەگینا یەکسانی دادگەری ناهێنێتە دی، چونکە مرۆڤەکان لە رووی توانا و جەستەو چەندایەتی و چۆنایەتی و لە رووی پێویستی ئارەزوو و سروشت لێك جیان.. بۆیە هەتا ئەگەر زۆر وردیش بووین لەو یەکسانیە، سەرنج بدە: هەر مرۆڤە و یەك هەنارمان بەسەر دابەش کردن بەیەکسانی دەبینین بەشێك لە مرۆڤەکان بەختیار بووینەو ئارەزووی هەناریان زۆرەو بەشەکەی تر نیگەرانن چونکە ئارەزووی

هەناریان نیەو ئاردزووی سێویانە.. بەو شێوەیە دادگەری مانای دابەش کردنی بڕی یەکسان نیە بە چەندایەتی بەڵکو چۆنایەتیش دەگرێتەوە، چونکە مرۆڤەکان هەر لە چەندایەتی لێك جیانین لە چۆنایەتیشە، لە دادگەری دا هەر لایەنی ئابووری و مادی ناگرێتەوە لایەنی رەوشتی و گیانیش دەگرێتەوە کۆتایی بەو جیاوازیە زگماکی و رەچەڵەکی و کۆمەڵایەتی و جوگرافی و نەژادی و ئابووری و چینایەتی و کەلتووری و شارستانی دەهێنێ وەك چین و توێژ و نەتەوە و تائیفە.. بەڵکو تەنها وەك مرۆڤی جیاجیا.. وەك تاکی جیا نەك کۆمەڵەی جیاجیا، ئەوەیان زۆر گرنگە، (لە بابەتی کۆمەڵگەی مەدەنیش) ئیتر ئەو نادادگەریەی کە زۆربەی مێژووی پێك هێناوە، مەبادینەکانیشی بریتی بووە لە: ئەگەر بەهێز ئاخافت بێهێز بێدەنگ دەبێ، ئەگەر سامان هات عەقڵ بوەستێ، گەورە هەڵسا بچووك نەجوڵێ، دەسەڵاتدار قامچی بڵند کرد هەق و ماف بێ دەنگ بێ،...

ئینجا یەکسانی رەها لە گەردوون و سروشت و ژیانیشدا نیە، جگە لە بیرکاری رووت نەبێت و (بۆ زیاتر بڕوانە تیۆرەکانی نسبی ئاینشتاین). بۆیە (یەکسانی) نە هاتۆتەدی نە دێتەدی، دادگەریە هاتۆتە دی و دێتەوە دیش.

( ٩ )

## ڕای گشتی   الرأي العام   Public opinion

گوایە ئەو چەمکە یەکەم جار لەسەر زاری وەزیرێکی لویسی شەشەمی فەرەنسی بەکارهاتووە ، دوایی لە شۆڕشی فەرەنسی ١٧٨٩باوی وەرگرت، بەلاّم دەبێ ئاگادار بین ڕای گشتی مێژووی زۆر کۆنە بە ناوی تر .

سەردەمی ئێستا زیاتر بەو ڕاو بۆچوون و دەنگ و باسە دەووترێ کە باوی دەبێت لەناو زۆرینەی خەلکی وەك ڕاستیەك، بەشێکی تر بە جۆرێکی تری پاسایی پێناس دەکەن وەك (قاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدولية) کردوویەتی دەڵێ: ((طريقة تفكر غالبية أعضاء الجسم الإجتماعي))، بەشێکی تر پێیان وایە: ئەو کۆمەڵە تێڕوانین و باسانەیە کە لەناو خەڵك بڵاوەو ڕاستیشی نەسەلمێنراوە[١].

مەرج نیە ئەو ڕاو سەرنجو هەڵوێستانە گوزارش بکرێ یان خەلکی دەری ببڕن هەروەك بەشێك کردوویانە مەرج[٢].

بەلاّم پەیوەستە بەو خەلکە، واتە زیاتر مەسەلەکان سیاسیو کۆمەلاّیەتیو عەقیدەییە، نەك زانستیو فەلسەفیو پسپۆڕی.

لەو سەردەمەی (عەولەمەدا) ڕای گشتی بەڕای ولاّتانی جیهانیش دەوترێ لە بارەی کێشەیەك، ئیتر ئەو ڕایە گشتیە لەسەر هەردوو ئاستی جیهانیو ناوەخۆیی ڕۆڵێکی گرنگ دەبینی بەتایبەتی لە ولاّتانی تەواو دیکراسی، بوویتە هۆی گۆڕانی گرنگ تا ڕادەی شۆڕشیش وەك شۆڕشی ئیسلامی ١٩٧٩ز لە ئێران، هەندێ جاریش لە سنووری ڕەسمیش دەپەڕێتەوە وەك ئەو ڕاپەڕینە گشتیانەی لە

---

١ موسوعة علم الاجتماع ل٣٠٦.

٢ سياسة الحكم- نوسێن نی.

دژی شیوعیەتی جیهانی کرا لە نەوەدەکانی سەدەی (٢٠) داینەمۆکانیان لە رای گشتی دەستی پێ دەکرد، هەڵبەتە هەتا جیهان بچووك تر بێتەوە ئەوا ئەو جۆرە رای گشتیە زیاتر کارلێك دەکا و جیهانگیری وەردەگرێ و لەژێر کاریگەری دەڤەری کەمتر دەمێنێتەوە، رۆڵی سانسۆرە ناوەکیەکانی ئەو دیکتاتۆریانەش کز دەبێت کە لە بنچینەدابۆ دروست کردنی رایەکی گشتی هەڵخەڵەتاوی بەئارەزووی دەسەڵاتداران ...

هەڵبەتە رای گشتی مانای یەکسان بوونی رای هەموو تاکەکان نیە، چونکە بەشێك پێیان وایە هەر تاکێك خاوەن رایەکە هەروەك (تیریس) دەڵێ ژمارەی مرۆڤ چەندە ئەوەندە رایەش هەیە.. نەخێر مەبەست لە رای گشتی بەو رایە باوانە دەووترێ کە لە دۆخێکی تایبەتی تێروانینەکانی خەڵکی تیادا کۆ دەبێتەوە و رایەکی باو وەردەگرێ وەك شەپۆل.

ئەو دەروازانەی رای گشتی پێ دروست دەبێ دەکەوێتە سەر مێژی بەرنامەو رێبازو ئەو مدرسەیەی رابەرە، هەم دەکەوێتە سەر جۆری میللەتەکەش، ئەگەر ئەو رایە لەسەر بنچینەی دۆزو کێشەیەکی زەق بێت ساناتر ئەو رایە دروست دەبێت، لەراستیدا ساناتر رای گشتی بۆ فاکتەرە شاقولیەکان دروست دەبێ، هەرچی فاکتەرە ئاسۆییەکانو هەق و دادگەریەکانە بە زەحمەت تر دروست دەبێ، بەتایبەتی لەنێو میللەتێکی عەوام، کۆشش‌و ئەرکی زۆری پێویستە، بەڵام شاقولیەکان بەسانایی دەوروژێ، سەرنج بدە، (شڤان پەروەر) لەدوای شکستی شۆرشی ئەیلول ١٩٧٥ بە سرودو گۆرانی توانی رای گشتی لەبارەی کوردایەتی بوروژێنێتەوە.

لەبارەی دروست بوونی رای گشتیش کۆك نین، لە کاتێکا مارکسیەکان پێیان وایە ئەو جۆرە رایە هەردەم رای چینی دەسەڵاتدارە[1]، واتە لە هەر وڵاتێك لەهەر مەملەکەتو هەتا لە لادێیەکیش رای خەڵکەکەیو تەبیعاتو هەڵس‌و کەوتیان رەنگ دانەوەی شێوازی گەورکانیانە، ئەوەش لە بارودۆخی خۆیدا تا رادەیەك

[1] بۆ زیاتر بروانە: ١-مارکس-اعمال کاملە٢-بیان الشیوعی-مارکس-انجلس.

ڕاستە هەروەك لە فەرموودەش هاتووە (الناس على دين ملـوكهم)، بـەڵام دەبـێ تێبینی بکرێت دەڵێ (الناس) واتە عـەوام نەك (ئومە)٠

هەرچی ڕۆژئاواشە* پێیـان وایـە ڕای خـەڵکی لـە هەڵخەڵـەتاوی دایـە، بـە دووبارەکردنەوەو برەودان لە ئامرازەکانی ڕاگەیاندنو وروژانـدنی هەسـتو ئەسـت ئەو ڕا گشتو ویستراوە دروست دەبێت کە لە کۆتاییدا لـە خزمـەتی بەرژەوەنـدی مادی بورجوازیەتە، هـەردوو بۆچـوونی سـەروو (مارکـسی و سـەرمایەداری) تـا ڕادەیـەك ڕاسـتی تیایـە، بۆیـە هەریەکـە لـە (ڕارەوەی میکـاڤیلی، تیۆرەکـانی دورکایم، نازیەت، .. تا دەگاتە ڕایەکانی ئێستا) و زۆری تـر باسـی ڕای گـشتیان بە هەڵخەڵەتاوی کردووە، میکاڤیلی پێی وایە خەڵکی عەوام عەقڵێکی ئەرشیڤی نیە، تەنیا دوا کاغەز دەخوێنێتەوە و پێی کاریگـەر دەبـێ، نـاتوانی ئێـستا بـە ڕابردوو ببەسـتێو ڕاسـتیەکان بدۆزێتـەوە، بۆیـە هـەردەم بـە ئاسـانی دەتـوانرێ هەڵخەڵەتەنرێ، هەر هەڵخەڵەتاویشە[1].

(دورکایم)یش لەو بارەیەوە پێی وایە خەڵکی مەیلی ژیـانی مێگـەلیان هەیـە (نزعـة القطيـع)، مەبەسـتی لەوەیـە ئەگـەر هەنـدێکیان (بەتایبـەتی خەڵکـە کاریگەریەکان) شتێك بکەن هەمووی بەدوایدا لاسایی دەکەنەوە، ئەو لە شۆڕشـی فەرەنسی تێبینی کردبوو کـە بـەڕەوە دەچـوون پردێکیـان دەشـکاند کـە خۆیـان زەرەرمەند دەبوون، یان بەڕەوە بینایان تاڵان و وێران دەکرد[2]..

هتلەریش لە کتێبی (کفاحی) دەڵێت جەماوەر توانای وەرگرتنـی کەمـەو لـە بیرچوونەوەی زۆرە بۆیە بەشێکی بۆ هەڵبژێرەو هەر بۆی دووبارە بکـەوە تـا بـاوەڕ دەکاو ڕای گشتی لەسـەر دروست دەبێت ئەگەر ڕاستیش نەبێت.

ئامارەکانی ئێـستا ئـەو ڕاسـتیانە زیـاتر دەردەخـا لـەبارەی میللـەت، ئـەو تێڕوانینـەی سـەرووی میکـاڤیلی و دورکـایم و هتلـەر.. وەك ئامۆژگـاری

---

* هەردەم کە دەڵێین ڕۆژئاوا مەبەست لە سیستەمی سیاسی و ئابووریەکەیتی نەك خەڵکی ڕۆژئاوا

[1] (امیر، طروحات)- میکاڤیلی.

[2] (مقدمە علم الاجتماع)، إيك دورکاریم.

دەسەڵاتداران بەرامبەر هاووڵاتیان بێت ئەوا نووسینە نوێیەکانیان بەتایبەتی کتێبەکانی (کیسنجر) لەوانەش (دبلوماسیە..)، هەمان دانان بۆ ئەمریکا دەکا وەك دەسەڵاتدارێکی جیهانی و هاووڵاتیانیش دەوڵەتە بچووکەکان بێت.

بەو شێوە رای گشتی رایەکی پیرۆز و پێوانەیی نیە، تا بینای لەسەر بکرێت، هەر بۆیەش زۆرایەتی و دەنگ دان و کۆی دەنگی عەوام مەرج نیە چاکترین تەرازوو بێت، ئەوەش یەکێکە لە سەلبیاتە هەرە بنچینەییەکانی دیکراسی و هەڵبژاردنیش، بەڵام لە هەمان کاتیشدا مانای وانیە- بەو وەسفەی سەروو - هەموو میللەت هەردەم هەڵخەڵەتاوو بێت، لەبەرامبەر ئەوانە زانایەکی تر دەڵێت: (دەشێ بەشێکی خەڵکی هەردەم هەڵخەڵەتابن، دەشێش هەموو خەڵك بۆ ماوەیەك هەڵخەڵەتێ، بەڵام هەرگیز ناشێ هەموو خەڵکی هەردەم هەڵخەڵەتێ..)، ئەوەیان راستە ئەوەی هەڵدەخەڵەتێ و لاسایی گەورەکانیان دەکەنەوە خەڵکی عەوامە، ئەگینا خەڵکی خاوەن مەبادئەو تێگەیشتوو و بڕوادار هەڵناخەڵەتێ،و رای گشتی ئەویش جیایە، بەو دەروازەش دەچینە ناو فکری ئیسلامی لەو بارەیەوە، قورئانی پیرۆز و فەرموودە و فیقهیش باسیان لە عەوام کردووە کە زۆربەیان دژی راستین ﴿وَأَكْثَرُهُمْ لِلْحَقِّ كَارِهُونَ﴾.

وشەی (اعرابی) هەر بەو مانایەی عەوام وگێل هاتووە هەروەك لە :موسوعة المصطلحات علم الاجتماع و سياسة في الفكرالعربي و الاسلامي، الاموال- ابوعبيدالله بن قاسم، احكام سلطانية-ماوردي، صحاح— رازی..هتد وەسف کراوە، لەسەردەمی عوسمانیش وشەی "تورك"یش ئەومانایەی داوە[1].

رای گشتی عەوام سەلبیە، ئیمام عەلی راستەوخۆتر باسی کردووە (العوام.. ينحنون بكل رياح، اذا تجمعوا ذروا و اذا انتشروا نفعوا..)، بەو شێوەیە رای گشتی عەوامی نەفام راستە هەڵخەتاویە، ئیتر ناشێت ئەو جۆرە رایە بکرێتە دەروازەیەك بەرەو دادگەری، هەروەك لە هەندێ تەقەلای بەشێك لە ئیسلامیەکان

---

[1] بروانە:أ- محاضرات فى النشوء القومية -ساطع الحصري ب-دراسات فى الحركة الكردية المعاصرة -د عثمان علي

بەدی دەكری، لە راستیدا ئەو پۆلە بەشەریە لەسەر ئاین و رەوشتی شـایەكانیانن، رەوە و مێگەلن، بەلاَم كۆمەلگەیەكی رەوشەنبیرو بـاوەڕدارو خـاوەن مـەبادیئو و (سـەوابت) خاوەن رایەكی پتەو و كاریگەرو پـیرۆزن، بەداخـەوە زۆربـەی پـسپۆر و فەرهەنگـە بالاَكـانیش لێكیـان جیـا نەكردۆتـەوە، ئـەو دوو جـۆرە رای گـشتیە لەجەوهەردا دوو دنیای زۆر لێك جیان:

<u>یەكـــەمیان</u> (واتـــە رای گـــشتی عـــەوام) بـــەخێرایی دەگـــۆڕێ، پتـــەو نیـــە، هەلَخەلَەتاویە، نا مەدەنیە، مەعقول نیە، هێزخواری كردوونەوە، بۆ بەرژەوەندیەو لە بەرژەوەندی خۆشیان نیە، لای بەسەركەوتوانن (الناس اتباع من غلب)[1]ن، ئـا لەو كاتەیە ئەو (نەستەقیە) راستە لە عەرەبی كە وتراوە (الناس بخير ما تباينو، فاذا تساوو هلكوا)[2].. ئەوەش هەر هەمان پێناسـی ئیمـامی عـەلی یـە بـۆ رای گشتی عەوام، لەو پۆلە ئەگەر راستیش بپێكن وەختیە، رایەكانیان پڕ لـە خلـت و خارو ناكۆكیە، عەبەسیە، هەستیە، ئەوەستێتە سەر دەسـەلاَتداران، مـەیەرە، پڕە لە دەردی: دەروونـی، گومـان، درو ڕوویـی، تەقـەزرمی.. ﴿وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ اجْتُثَّتْ مِنْ فَوْقِ الأَرْضِ مَا لَهَا مِنْ قَرَارٍ﴾.

<u>دووەمیـــان</u>: رای ئومـەت، بـە بنـچینە و ســەوابت و راسـتگۆییە، دروستی، بژاردەیی، مەبەستی، عەقلی، رێكخراو، راستی ئەرازووە ئەك هێز و بەرژەوەندی، لەمیەرە، بەرهەمداریشە، .. ﴿.. كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي السَّمَاءِ، تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ..﴾، لـە فكـری ئیـسلامیـشدا هـەموو كـەس شایستەی ڕاوێژ نیە، پێویـستە بەلایـەن كەمـەوە خـاوەنی: هەلوێـست، زانیـاری، دلـسۆزی، پـسپۆڕ، پێگەیشتن، ئامادەیی، شارەزایی.. بێ.

ئەو دوو رایە دوو فەرهەنگ و دوو دنیاو دوو كەلتوورو دوو ئاین و مـەدرەسـەو مەبادیئی فەلسەفە و تێگەیشتنی لێك جیان، ئەنجامەكانیشیان لێـك جیادەبێـت، بۆیە جۆری یەكەم (واتـە رای گـشتی عـەوام) بەهـەزاران نموونـەی كـۆن و نـوێ و

[1] معجم الكنوز و الامثال و الحكم.
[2] معجم الكنوز و الامثال و الحكم.

زیندوومان لەبەرچاوە کە چەندە هەڵخەڵەتاویەو بێ ئاگایە، بەشێکی ئەو دەردەش بەشێك لە ڕەوشەنبیران دەگرێتەوە، جار وایە هەموو کۆمەڵگەی جیهانیش دەگرێتەوە بەتایبەتی لەسەردەمی کۆن زەق ترین نموونە هەموو خەڵکی سەر زەوی پێیان وابوو کە زەوی چەقی گەردوونە کەچی کۆپەرنیکۆس بەتەنها گوتی نەخێر ،لە وسەردەمەش ئەو ڕاستیە لە ئامارەکان دەردەکەوێت لە ساڵی ١٩٩٤ لە ٦٥٪ی قوتابیانی ئامادەیی بەریتانیا تەیان زانی کێ سەرەك وەزیرانیانە، لە ٨٠٪ی ئەمریکیەکان نەیان دەزانی ئەو یاسایانەی ئەمریکی لە بارەی (ئیجراائاتەکانی دژی تیرۆر) چەندە دەستووریە، لە (٩٠٪)ی خەڵکی ئەورووپا نازانن ڕاگەیاندنەکانیان هەموو شتیان بە سەلامەتی بۆ ناگوازنەوە[1]، لە (٩٥٪)ی خەڵکی عێراق نازانن لە چاپ دانی ئەو دراوە (فۆتۆکۆپیە) مانای باج وەرگرتنە لەدوای ١٩٩٠، بێجگە لە کێشە سیاسی و فکری و فەلسەفیەکان و زانستیەکانیش، ڕای گشتی بەو قەبارە یەکلاکەرەوەیە ناکەوێتە سەر ئامرازەکانی ڕاگەیاندن، کێشەی کورد لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلول وتاشۆڕشی شاخیش ڕای گشتی پتەوتر بوو نەك لەدوایی ڕاپەرینو ١٩٩١بەولاوە کە ئامرازی ئاسمانیشی هاتە پاڵ.. بە هەمان شێوەش ڕای گشتی سەردەمی بێ تەکنەلۆجیا و بێ هەواڵی ئوممەتی ئیسلامی مانار هاوسەنگی خۆی هەبووە. هەر هەڵەیەك لە (ئەمیر یان خەلیفە) بینرابایە چەپڵەی بۆ لێنەدەدرا وەك (عزت ابراهیم) جێگری سەرۆکی عێراق ئەی دەووت گەورەم (ڕوو لە صدام حسین)حاشا تۆ هەڵە ناکەی، هەڵەی تۆ لە ڕاستی ئێمە چاکترە[2]، بەڵکو پێچەوانەی دەووت ڕاستت دەکەینەوە، ئیتر جار وابووە ڕای ئافرەت ڕاستتر بووە لە ڕای خەلیفە و یەکسەریش دانی پیا دەهێنا، ئەو جۆرە ڕای گشتیە سێیەم سەرچاوەی (شەریعەتە) کە بە (ئیجماع) ناوبراوە، تا ئێستاش ئەو (ئەحکامانەی- ڕای گشتی)یش دروست بووە گەورەترین پاڵپشتن بۆ مانەوەی شەریعەت، بەشێکیش لەو شریعەتە(بەهەر هۆیەك) بێت بە قراوانی

---

[1] ئەو ئامارانە بەفراوانی بڵاوکرانەوە.

[2] بەبۆنەی لە دایك بوونی سەرۆکی عێراقی لە ٢٠٠٦/٤/٢٨.

ئەو رایەی لەگەڵ دروست ئەکراوە بە خێرایی دەتوانرێ دەستکاری بکرێ، نموونەی هەردوو جۆرهەیە، یەکەمیان کە رای گشتی لەگەڵ دروست کراوە وەك: نوێژ کردن، مارەکردن، جەژنەکان، گۆشتی بەراز نەخواردن، ریشە نەکردن، .. ئەو بەشە شەریعەتەی رای بۆ دروست کرابێ ئەوا بەبێ بوونی دەوڵـەتی ئیسلامیش و لە سەردەمی دەوڵەتی عەلمانی ئەو (حرام و حلال)یـەی خـۆی پاراستووە، کەچی دەبینین مانا و ناوەرۆکی جیهاد، سیاسەتی شەرعی، حوکمی ئیسلامی، بیت المال..، بەو جۆرە رای گشتی بۆ دروست نەکراوە بە خێرایی لەناو ریزی موسڵمانانیان دەرکێشاوە • بـۆ نـوێ کردنەوە و زیندووکردنەوەی شەریعەت و خەلافەت بەتەواوی، ئەوا پێش ئەوەی بزوتنەوەی ئیسلامی بۆ دروست بکەی پێویستە (رای گشتی) بۆ دروست بکرێ ئەگینا بەنامۆیی بانگـە(دەعـوە)کەت تەفاعول دەکا لەگەڵ خەلکی، رای گشتیەك بە بناغە و توند و تۆڵ بێ بۆ ئومەتێك بە خێرایی سەرکەوتوو دەبێ، بۆیە دەبینین لەو سەردەمەش رای گشتی ئومەتێکی وەك ئێران ١٩٧٩، .. چەندە جیاوازن لەگەڵ رای گشتی وەك شۆڕشی فەرەنسا ١٧٨٩ یان هەتا راپەڕینی کوردستان ١٩٩١، لە ئێران ١٨ مانگ شۆڕش میللی بوو کەچی دام و دەزگا پردیان تێك نەدا تەلی کارەبایان نەبری، هۆیەکەش ئەوەیە ئەو دوو دینامیکیەی رای گشتی شۆڕشی پێ دروست بوو جیایە، یەکەمیان لیبرالیەو دووەمیان عەقیدەی ئیسلامیە، واتە یەکەمیان باشترین دۆخی عەوام و دووەمیان ئومەت، هەر بۆیەش هەرچی تەقەلایەك لەلایەن هەر مەدرەسەو سیستەمێك لە مەبادئیو ئومەتەوە بەرەو عەوامیان ببات وبیتە هۆی دارمانی بینای مرۆڤ وکۆمەل گەورەترین دوژمنی مرۆڤایەتیە، مەبەستی زاڵ بوونە بەسەر خەلك و لەرێی نەفام کردنیان ﴿فَاسْتَخَفَّ قَوْمَهُ فَأَطَاعُوهُ﴾، ئەوە بەنج کردنی راستەقینەیە، بێ دەنگ کردنیەتی، ئالیرەدایە وەك ئەنسرۆپۆلۆجی و ئەبلەسوفو فەرهەنگەکانی عەلمانی لە وانە (world book enceclopidia)و (الموسوع العالمیة) باسیان لە (زۆرایەتی بێ دەنگ- صامت) کردووە کە هەردەم گوایە زۆرایەتی میللەت پێك دەهێنن.. نەخێر لە هەموو سیستەمێك وا نیە،

ئوممەتی ئیسلام کۆنابنەوە لەسەر ریسوایی و مل کەچی هەروەك لە فەرموودە هاتووە (لا يجتمع أمتي على الضلالة)، ئینجا (امر بالمعروف و نهي عن المنكر) هەیە هەمو بێ دەنگێك بە وەلام دەهێنێ وەك ئەرکی ئاینی، (هلك قوم مالم يقل للمسيء اسأت و للمحسن احسنت)، ئەوانە دینامیکیەتی رای گشتیە لە ئیسلام.. کە هەموو جیهان بەرەو دادگەری بەرێ، بۆ رزگاری خەلکی کوردستان لەو کاروانە ئاویتەو سەختیەی پێویستی بەو جۆرە بینایەی رای گشتیە.

بۆ دروستکردنی ڕای گشتی جیاوازییەکی بنچینەیی هەیە لەنێوان ڕای گشتی کۆمەلگەیەکی دروست و ڕەوا(ئوممەت) وە کۆمەلگەیەکی نەفام، لە یەکەما پێویستی بە گوتارێك هەیە ڕوو لە عەقل، کەچی بۆ دووەم گوتارێك ڕوو لە عاتیفەو هەست و نەست، لە یەکەما بیناکردنی لەگەل پێویستە لە ئی دووەما سەرەڕۆییە، بەردەوامی ویتەوی لە یەکەما لە سەر بنچینەی بیرو بڕواو ڕاستی دەبێ لە ئی دووەما وەختی و هەلچوون و لەگەل شەپۆلێك ڕای گشتیەکە تێك و پێك دەچێ یان هەر کاریگەری و بەرهەمی نابێ، ئەگەر بووشی مەرج نیە بە ئیجابی بێت، لە یەکەما بەهۆی بەرنامەیەکی ڕاست و دروست قوول دەبێ لە ئی دووەما بەهەر وروژێنەرێکی هەست و نەست بێت جار وایە بە شیعرو گۆرانی و سرودی ئیشتمانی دروست دەبێ.

( ١٠ )

# گۆڕان ‌ التغير ‌ Change

مەبەست لێی کۆتایی هێنانی وەستانە، گۆڕینی واقعێکی کلاسیکی بۆ واقعێکی تازە، هەڵبەتە گۆڕان سوننەتێکی گەردوونی خواییە ئەوەی نەگۆڕە لەو گەردوونە گۆڕان‌و جولان خۆیتی، تێڕوانین‌و بۆچوونی جیاجیا گەلێ زۆرە لە بارەی ئامرازی گۆڕین، نەك لە نێوان تەیارو مەدرەسەکان هەتا لە نێوان یەك مەدرەسەو تەیار و لایەنیش، کێشەکان دەکرێنە دوو بەشی سەرەکی: فاکتەرەکانی گۆڕان و شێوەی گۆڕان، یەکەمیان هەڵدەگرین لەبەشی (بیری-فلسفی) لەبەشەکانی داهاتووی ئەو فەرهەنگە باسی دەکەین، ئێستا تەنها ئاماژەیەك بە بۆچوونە سەرەکیەکان دەکەین لەبارەی چۆنیەتی گۆڕان بەوشێوەیەی خوارەوە:

- مارکسیەکان: پێیان وایە گۆڕان بەگشتی لە سروشت‌و ژیان بە هۆی ناکۆکی ناوەکی دێت، لە نێو کۆمەڵگەش ئەو گۆڕانە گوزارش دەبێ بەهۆی فاکتەری ئابووری کۆمەڵ لە ڕێی ناکۆکی چینایەتی.
- مادیەکانی فەرەنسی‌و بەشێك لە نەتەوەگەریش، پێیان وایە ژینگە (بیئة) سەرچاوەی گۆڕانە.
- هیگل: سەلبیات سەرچاوەی گۆڕانە.
- بەشێك لە دەروون ناسان: هەست بە نوقستان کردن.
- مەدرەسەی فرۆید: جنس.
- نەتەوەگەریەکان: مل ملانێی نەتەوایەتی..
- توینبی: التحدي والاستجابة..

- زۆر ڕای تری جیاجیا..
- فکری ئیسلام: پێی وایە لە کۆتاییی مرۆڤ خۆی لەو گۆڕانە بەرپرسیارە چ بەرەو سەلبی یان بەرەو ئیجابی نەك فاکتەری دەرەکیو ئابووریو جنسو.. ﴿إِنَّ اللَّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ﴾.

زۆر ڕاوبۆچونی تریش هەیە، ..

دووەمیش: لە بارەی وەڵامی ئەو پرسیارە ئاخۆ دەبێ گۆڕان لەسەرخۆ بێت و پلە بە پلە یان بە توند و تیژی و ئاکاو بازدان، .. دابەشبوونێکی سەرانسەری هەیە.. هەر لە مارکسیەکانەوە خۆیەخۆ و مدرسەکانی تر تا دەگاتە ئیسلامیەکانیش خۆیەخۆ، مارکسیەکان لە فەلسەفەو سروشتدا کێشەیان کەمترە بەڵام لە بارەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی لێك جیابوونەوە بۆ سێ بەشی سەرەکی:

أ–ئەوانەی پێیان وابوو سەرمایەداری (کە وێستگەی ئێستای کۆمەڵگەیە) بەهێواشیو لەرێی هەڵبژاردنو دیمکراسیو ئازادی راوبۆچوون دەگۆڕێ پێیان دەووتن (ئیسلاحیەکان کە بریتی بوون لە سوشیال دیمکراسەکان لە دوایدا لە مارکسیەت بەتەواوی جیابوونەوە وەك مەدرەسەیەك، هەروەها زۆرێ شیوعیەکانیش)، بۆیە ئیسلاحی لە مارکسیەت تۆمەت بووە، ب- ئەو بەشەی پێشیان وابووە سەرمایەداری تەنیا بەتووند و تیژی و شۆڕش دەگۆڕێ ئەوا چەپە نوێیەکان بووینە، بە رێکخراوە توندەکانی وەك (ألوية الحمراء، بادر ماينهۆف، عمل الالماني، جيش الثوري الياباني، باکۆنیییەکان..- هەروەها لە وڵاتی خۆشمان هەریەکە لە (کۆمەڵەی دیوی کوردستانی ئێرەو ئەو دیوو، pkk..) تا رادەیەك تەیاری ماوی لە دەولەتی چین وئەلبانیاش هەمان رایان هەبوو ج- بەشی سێیەم حزبی شیوعی و وڵاتانی سوشیالیستی بووینە هەردوو ڕێگایان پەیڕەو دەکرد، ئیتر ئەو کێشەیە تەواو بەدەقەکانی مارکس چارەسەر نەدەبوو بە هۆیەوە هەر ژمارەو تەیار زیادێ دەکرد، بەپێ ی دوا فەرهەنگی سۆڤیەتی زیاتر لە ٢٠٠ زاراوەی تۆمەت تۆمارکرابوو بۆ ناوەخۆ..

لەتێو ڕابوونی ئیسلامیش ئەو کێشە هەیە: ئاخۆ گۆڕان و گێڕانەوەو پیادەکردنی شەریعەت بەکام شێوە دەبێت؟ بە نەرمیو هێواشی و پلە بە پلەیی یان بە شۆڕش؟ یان بە هەردوکیان؟ واتە کۆمەڵگە بە چ ئامرازێك دەگۆڕێت؟ سێ وەلامیان هەیەو سێ بەشیش لێ دروست بووە، بەو شێوەیە:

أ- تەیاری (برایان) پێیان وایە ئەو گۆڕانە تەنیا بە ئاشتیو گوتاری سیاسیو بەرنامەی ڕاستە ڕێ کردنی چاکسازی و لە کۆتاییدا چاکردنی کۆمەڵ لە ڕێی تاك وەك هاوکێشە ئیصلاحیەکەی ئەدەوی (تغیر و اصلاح: من فرد ← مجتمع) کە لە سەرەتای سەدەی بیستەم ئەو گەشتەیان بەڕێوەیە تا ئێستا نمونەیەکی بە مورتاحی نیە ب-بەشی دووەم پێی وایە ئەو گۆڕان و ئامانجە ئایەتەدی تەنیا بە جیهادو توندو تیژیو شۆڕش نەبێ، لە کۆتاییدا لە چاکردنی کۆمەڵگەو دەسەلات دەست پێ دەکا، واتە یەکەم جار دەسەلآت ئینجا چاکردن، وەك هاوکێشەکەی (مەودودی) گۆڕان: (من مجتمع ← فرد)، پێچەوانەی هاوکێشەکەی (ئەدەوی)یە.

هاوکێشەکەی (مەودودی) ئێستە زیاتر لە تەیاری (ئەلقاعیدە) خۆی دەنوێنێت و باڵە ئیسلامیە توندەکانی تری وەك (جەماعەی) جەزائر، میسر، کۆمەڵەی (هجرەو تەکفیر)و.. دەگرێتەوە، هەریەکە بەلگەی عەقلی و نەقلی خۆی هەیەو هەبووە، ئەو دۆخە تا سالآنی (٨٠)ی سەدەی (٢٠) دوای تەقینەوەی شۆڕشی ئیسلامی ١٩٧٩لە ئێران و ئەفغانستان ١٩٨٠بەشی سێیەمیش سەری هەڵدا، (ڕاستتر بڵێین لەسەر دەستی بەشی سێیەم ڕابوونی ئیسلامی تەقیتەوە)، ئەویش کۆی هەردوو ئەزموونی پێشووە، هەردوو هاوکێشەیە (گۆڕین: فرد ⇆ مجتمع)، واتە بەهەردوو ڕێگە گۆڕان دەبێت، هەم بەرێگەی شۆڕشو جیهادو ڕاپەڕین، هەم لە ڕێگەی ئاشتیو ژیانی سیاسیو دیموکراسی.. بەپێی بارودۆخو زەمانو زەمینو مەرجەکانی خوودیو بابەتی.. تا ئێستاش ئەو سێ بەشە لەناو ڕابوونی ئیسلامی واقعی بزوتنەوە ئیسلامیەکان پێك دەهێنن، ئەو بەشەی دوای

زیاتر حسابی بۆ دەکرێو بەخێرایی نموونەی پێ دروســت بــووەو لەگەشــەکردنە، پاساوەکانیان ڕەگ و ڕیشـەیەکی عەقڵی و نەقلیو مێژوویی‌و فەلسـەفی‌و واقعــی‌و هەتا (فطری)و سـروشتیشـی بەهێزترە، هەر لە گەردوونیش دەبینین گۆڕانەکان یەك لایەنی نیە تەنیا هێواش و پلە بە پلە هەم هەمووش توونددوتیژ نیە، شان بە شانی یەك هەن، هەروەك گۆڕانە هێواشـەکان، دانیمـەکان باوەکـانن لـە هـەمان کاتـدا (شۆڕشی سروشتی، سۆپرنوڤا، گەردەلول، لافاو، برکـان، تاڤگـەکان، ..) گۆڕانــە توندەکان پێك دێـن، ڕەنگە ڕەوتــی ڕووبارێـك زۆر وێــچووی مێــژووی کۆمــەڵ و میللەتان پیشان بدا، چۆن لەسەرخۆ دێت و دەڕوا لەناکاو وەردەچــەرخێ و دەبێتــە تاڤگە، ئاواش مێژووی کۆمەڵ پڕیەتی لە وەچەرخان و وەرگــەڕان و شــۆڕش شــان بەشانی گۆڕانی هێواش، بۆیە هەردوو سەرچاوە بەجیاجیا و پێکەوەش سەرچــاوەی ڕەســەنی گۆڕانن هەم لە سروشتو هەم لە کۆمەڵیش و لە پۆلەکانی تری ژیانیش .

هەروەك لە ئەزموونی شیوعیەت و لە ئەزموونی ،ڕایان نموونەیەك نەبینرا بــە خۆشی‌و هەق‌و دادگەری گۆڕانی بنەڕەتی لە دەســەڵات بکرێت ئاواش هەم مێژوو و هەم واقیعیش زۆر بە دەگمەن نموونەی دەست ناکەوێ کە ناهەق ملی کەچ کردبــێ بۆ حــەق و گۆڕابێــت، زۆردارو نادادگــەری گۆڕابێــت بــۆ دادگــەری.. بەخۆشــی و ئاشتیانە، لــە کۆنــەوەش (ئەرستۆ) تێبینیــەکی وردی بــەجێ هێشــتووە، دەڵــێ (تەشریع) سەرچاوەیەکی گرنگی گۆڕانە، هەڵبەتــە تەشـریعیش واتــە حکومــەت، حکومەت نەبێ نـاتوانێ ئــەو (شــەریعەتە) پیــادە بکــاو کۆمــەڵ بگــۆڕێ، بۆیــە هاوکێشەکەی (ئەدەوی) بەنوقستانی دەمێنێتەوە لە کۆمەڵگەیەکی دابەش بــووی نادادگەری، هەرودکو (ابن طق طقی)یش لــە (الفخری في اداب الـسلطانية) وت و وێژی لەسەر گەلاڵەیەك کردووە کتو مت ئەو گەلاڵــەی (برایــان)و هاوکێــشەکەی (ئەدەویە)، گەلاڵەکەش ئەوەیە: وا باوو بوو گوایە(ئەگەر سیاسەتی دەروونی تــاك چاك بوو خێزانەکەش چا دەبێ، ئەگەر خێزانیش چا بوو دنیەکەش چــا دەبــی، تــا شارو وڵاتەکەش بەو زنجیرەیە چا دەبێت)، ئەو دەڵێ نەخێر، مادام دەزگــای حــوکم

چا نەکرێت نموونەی بەو هەموو دەروون پاکانە هێناوەتەوە کە لە ژێر حوکمێکی خراپ بووینە.. واتە (گۆڕان: لە بنکە بۆ ← سەروو) بە تەنها ئامانجەکە ناهێنێتە دی.. هەر چەندە گۆڕانی پلە بە پلەو هێواشی ئەسڵەنەك گۆڕانی توند هەرچەندە یاسائە بەڵام ناچاریشە، تا یەکەم مەودای تیا مابێت‌نابێت پەنا ببرێتە بەر دووەم.

ئەو ماددەیەش زیاتر بەندە بەدوو چەمکی تر (شۆڕش)و (ئیصلاح) لەهەر یەکەیان بە جیاجیا وەك چەمك باس دەکەین.

(١١)

## شۆڕش الثورة revolution

شۆڕشیش هـەر بەشـێکەلە گـۆڕان، بـەو گۆڕانکاریـە ڕیـشەیی‌و چـۆنایەتیە دەووترێ کە لە بوارەکانی ژیان یان لە یەکێ لە بوارە گرنگـەکان دەکـرێ، مانـای گۆڕینی واقیعێکە بە واقیعێکی تـەواو جیـا، یـان وەك (دائـرة المعـارف العالمیـة) پێناسی کردووە بریتیە لە: گۆڕینی ڕیشەیی لە بناغەکانی کۆمەڵ، هەندێ جار بە (مانایی) باسی شۆڕشی ڕەوشەنبیری یان شۆڕشی تەکنەلۆجی یان کشتوکاڵی‌و یان ئاسمانی دەکرێ، مەبەستی بازدان و وەرچەرخان و پانتایەکی فراوانـە لـەگۆڕین، هەروەهاش جار وایە واقعێك (جا کۆمەڵایەتی‌و سیاسی بێت ج ئیداری‌و دەزگایی بێت یان زانستی و چاکـسازی بێـت) گۆڕانکاریـەکی زۆری پێویستـەو کەلەکـەی کردووە، دەڵێن ئەوە ناگۆڕێـت شۆڕشـێکی دەوێ.. واتـە شـۆڕش گـۆڕانێکی بـە ئەوژمی زیاترە، بریتی دەبێ لە: تەقاندنەوەی ئەو گۆڕانە چـەندایەتیانەی کەلەکـە بووە بۆ چۆنایەتی، لە پلەپلەیی بۆ بازدان، لە سنورێکی دیاری کراو و یەك لایەنی بۆ فراوانی هەمە لایەنی، لە ئاساییـەوە بۆ ناکاو.

لەڕووی ئاسایییەوە شۆڕش مانایەکی نێوانی ئینقلاب و یاخی بوون وەردەگـرێ، ئەگەر مەرجەکانی تەواو بسازێ.

ئەو ناوانەی سەرووش هەمووی لە شۆڕشی سیاسـی وەرگـیراوە کـە میللـەتان بەرپای دەکەن لە دژی دەسەڵاتدارانی ستەمکار، بۆیە لە پێناسی شۆڕشی سیاسی زیادەیەکی دەوێ بۆ پێناسەکەی سەروو ئەویش (ئایدیۆلۆژیایە) بۆ گیان پێ دانـی شۆڕش ئەگینا تەنها دەبێتە ڕاپەڕینێك یان هەڵچونێکی جەماوەری نـەك شـۆڕش،

دیارە هەریەکە لە: ماناو پێناسی، فاکتەری هەڵگیرسانی، ئاماجەکانی شۆڕش..، مــــشتومڕی زۆر هـــەڵگرتووەو هەڵـــدەگرێ، وەك لـــە پێناســـە جیاجیاکـــانی دەردەکەوێ، وا گرنگترینیان لــێ هەڵدەبژێرین:

## پـێناســـەکان:

- **لە فەرهەنگی حزبی بـەعس** (ئیـنقلاب) رۆڵـی شۆڕشـی دەبینـیو (حزبـی ئینقلاب)ی بە پێویستیەکی مانو نەمان دەزانی.[١]
- **قاموس مصطلحات السياسية الدولية (ممدوح فوق العادة):** پێناسی یاسایی کردووەو دەڵێ: (شۆڕش ئەوەیە کە گۆڕینێکی ڕیشەییە بە ئامرازێـك بـەدەر لە دەســەڵاتی دەستوری لائەنجام دەدرێ). ئەو پێناسە بۆ زۆربـەی فەرهەنگـە رەسمیەکان دەگەڕێتەوە.
- **مارکس:** شۆڕش بریتیە لە گۆڕینی پەیوەندیەکانی بەرهەم هێنان*.
- بەشێکیش پێیان وایە هەردەم شۆڕش دادگەریە لـە دژی چەوسـانەوە، دوای ئەویش دەبتە چەوسێنەر بەڵام پرۆسەکە لە کۆتاییدا جیهان بـەرەو دادگـەری رادەکێشێت (لەوانە: برۆدۆن، کرۆبونکین، ..).
- **باکۆنین:** بەهەمو تەقەلایەکی توندانەی گـۆڕینی دەســەڵاتی وتـووە شـۆڕش، هەروەها هەر لە کتێبی (مبادىء الثورة) هەموو گـۆڕینێکی واقـعو یـاخی بوون بەچاکە زانیوەو مەبدەئێکی بەناوبانگی هەیە کە دەڵێت: (تحطيم كل ماهو قائم خير).
- **موسوعة السياسة-ب١ ل٨٧٠:** پێی وایە ناسینەوەی شۆڕشی کۆمەڵایەتیو جیاوازیەکانی لەگەڵ شۆڕش زانستیو کەلتووریو ئابووری ئەوەیە یەکەمیان توندوتیژو ناکاویە، هەرچی دووەمە هێمنو لەسەرخۆیە.

---

١ بڕوانە: -١- تعريفات ببعض مصطلحات- مادة: انقلاب، ٢- اقوال ميشيل عفلق.

* پاش کەمێکی تریاسی ئەو گۆڕانەی پەیوەندی بەرهەم هێنان دەکەین چۆن شۆڕشیش دەخولقێنی.

- بەشی هەرە زۆری زاناو فەیلەسوفەکانی رۆژئاواو ئەو رۆژهەلاتیانــەی لــەژێر کاریگەری ئەوانن شۆڕش تەنها بە مانــای پێویستیەکانی ئــابووری پێنــاس دەکەن‌و مانای دەدەنێ ئەگینا بە شۆڕش بێعەقڵی دەزانن.
- **سۆرکین (١٩٤٧)**: شۆڕش هەرگیز پاڵنەرەکــەی ئابووریــە بــەڵام جاروایــە بەرگی ئاینی یان نەتەوەیی یان ئەزادی لەبەر دەکا.
- **لیبراڵ دیکراسەکان**: لــەباش ترین دۆخــی هەڵوێستیان پێیــان وایــە ئــەو گۆڕانکاریانە تــەنها لــەو دۆخانــە مانــای شــۆڕش وەردەگــرێ کــە گــۆڕینی دیکتاتۆری و تاك ڕەوبە بۆ دەسەلاتێکی دیمکراسی.
- **فەرهــەنگی ئۆکــسفۆرد (oxford a.l p٢٠٠٠)**: بەشــە ئینگلیزیەکــەی، تەنها مەرجی توندوتیژی دژی دەســــەڵات داوەتە گۆڕانێك تا ناوی شۆڕشی لــێ بنرێ.
- **دائرة المعارف العالمیة**: شۆڕش گۆڕانێکی ڕیشەییە لە بناغەکانی کۆمەڵ.
- بەشێکی تر شۆڕش بەگشتی بــەجم و جــۆڵێکی شــێتانە و (نامــەنتیقی ونــا معقول) لەقەلەم دەدەن (لەوانە: **نیتچە، گۆستان لوبون**، ..)، ئەوانە زیاتر لە ســۆنگەی کۆمەڵگەیەکی مەدەنی دیموکراسی یەوە ئەو ڕایــە موتلەقــەیان بــۆ دروست بووە.
- بەشێکی تر بەدۆخی (لا شعوری-بێ هۆشمەندی)و هەتا بە (بەربەر)یــش لــە قەڵەم دەدەن.
- پرۆتوکولات حکماء صهیون: الثورة لیست اکثر من نباح کلب علی فیل [1].
- **مالرۆ**: هــەر شۆڕشــێك ئــابووری نــەبێت (ثــورة بــلا ســبب)ە یــان (ثــورة لا عقلانیــة)یە، شۆڕش نەخلاقی‌و ئاییــنی‌و مــەبادیئی‌و عەقیــدەیی‌و مانایــەك نابەخشێ.- لەڕاستیدا زۆربەی ئەو زاراوە کوردیانەی لە بەرامبەر ئەو زاراوە نوێیانە هەڵبژێردراوە لەڕوانگەیەکی ناوا هاتووە، سەرنج بــدە بــۆ سیاســەت

---

١ بڕوانە: پرۆتۆکۆلی (١٩)

(رامیاری) یان بەرامبەر داناوە مانای (فێڵباز)، ئەوەش زیاتر ماناسیاسەکەی میکاڤیلی دەگرێتەوە نەك هەموو سیاسەت، هەروەها (شۆرش)یش وەك لە (فەرهەنگی کوردستان) هاتووە لە بنەچەدا بەمانای پشێوی و یاخی بوون هاتووە وەك فارسیەکە، واتە زاراوەو چەمکی شۆرش لە زمانەوانی کوردی بە روانگەیەکی لیبرالی هاتووە کە لە خزمەت ڤۆناغی رزگاری کورد نیە. هەر بۆیەش لە فارسی (ئینقلاب) بە مانای شۆرش هاتووە، بۆیە لەو تەقەلایەماندا پێویستی بە دەستکاری کردنەوەیەکی فراوان تر دەکا لە بەشەکانی داهاتوو .

## لە روانگەی مەدرەسەکان:

لە روانگەی مارکسیەوە شۆرش زادەی سەردەمێکی دیاری کراوی گەشەی کۆمەلگەیە، لەگەڵ هاتنی مرۆڤەوە نەبووە و لە سەردەمێکی تریش نامێنێ، بەلکو بەندە بە ڤۆناغێکی مێژوویی کە چینایەتی لێ پەیدا بووە، لەگەڵ ئەوەشدا مەدرەسەی مارکسی گرنگیەکی یەکجار زۆری پێداوە، لە ئامۆژگاریەکی بەناوبانگی (مارکس) بۆ شیوعیەکان دەڵێ: ئێوە شۆرشگێر بن چاکساز مەبن[1]، ئەوان هەموو گۆرانکاریەکی بە ئیجابی دەزانن تا ئەو رادەیە وەك (باکۆنین) لە بنەما بەناوبانگەی وتوویەتی: ( هەموو گۆران و وێرانکردنێك پێشکەوتنە)[2]، بۆیە شۆرش یەکێکە لە کۆڵەکەکانی فەلسەفەی مارکسیەت، زۆر بە توندیش بەندی کردووە بە (مل ملانێ ی چینایەتی)، واتە تەنیا شۆرشی چینایەتی بە شۆرش دەزانی، شۆرشەکانی نەتەوایەتی و نەژادی و ئاینی و ئایدیۆلۆژی.. یان بە شۆرش نازانی یان بەسەرخان و دیویکی تری هۆیەکی شاردراوەی مل ملانێی چینایەتی دەزانێ، هەر بۆیەش راپەرین و ئینقلاب و بزوتنەوە میللیەکانی بەووردی لە شۆرش جیاکردۆتەوەو مەرجی تۆکمەی بۆ سەرکەوتنی شۆرش داناوە

---

[1] مارکس- اعمال کاملە.
[2] مبادیء الثورة.

که بریتیه له:

١- حزبی پێشڕەو.

٢- بەرمیەك.

٣- هێزی چەکدار.[1]

هەر بەڕای مارکس هەڵگیرسان و داینەمۆکەشی بەو وێستگانە دەڕوات: هێزەکانی بەرهەم هێنان (ئامراز+مرۆڤ) لەگەڵ پەیوەندیەکانی بەرهەم هێنان (کە بریتیە لەو پەیوەندیە جیاجیانەی نێوان کۆمەڵ لە ئەنجامی پێویستی بەرهەم هێنان پەیدا دەبێ)، لە ناکۆکی دان، لە کاتێکا وەك یاسا هێزی بەرهەم هێنان گەشە دەکا، پەیوەندیەکانیشی ڕێگریەتی، تا دەگاتە رادمیەك ( ئەو خالە پێی دەووترێ critied) گەشەکە دەوەستێنێ، بەو شێوەیە ئەو پەیوەندیەی بەرهەم هێنانی کلاسیکی بەناچاری دەتەقێ و بەتوندی ژێرخانەکەی دەگۆڕێ و دەبێتە شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی سەرتاسەری تیایدا پەیوەندیەکانی سەرخانیش بەدوا دەگۆڕێ لە زانست و سیاسەت و ئایدیۆلۆژیاو فەلسەفەو سیستەمی کۆمەڵایەتی و.. هەرە دوایەکەی ئاینیشە دەگۆڕێ[2]، بەهەمان شێوە جارێکی تر دۆخەکە دووبارە دەبێتەوە و قۆناغێکی نوێی کۆمەڵایەتی دێتە پێش، لەسەر ئەو بنچینە.. بە بۆچونی مارکسیەت مێژوو هەم (٥) جۆرە شۆڕش سەرتاسەری و هەم پێنج قۆناغیش بەخۆوە بینیوە: (مەشاعی، بەندایەتی، دەرەبەگایەتی، سەرمایەداری، سۆشیالیستی، ..) واتە پێنج جۆرە ئاینیشی بە خۆیەوە بینیوە ٠

زۆر زانای تریش ڕایان وایە هەر قۆناغێك بەندە بە شۆڕش وەك (گوردن چایلد) دەڵێ: گۆڕان لە دڕندایەتی بۆ بەربەری شۆڕش بووە، لەبەربەریەوە بۆ مەدەنی دیسان شۆڕشێکی تر بووە، پێی وابوو ئەو شۆڕشەش (دۆزینەوەی نووسین) بووە،

---

[1] بۆ زیاتر سەرنج بدە (مؤلفات-ماوتسی تونگ). - یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە ساڵی ١٩٧٥ لەسەر ئەو بنچینەیە دروست بووە

[2] ئەو نمونە زۆربەی سەرانی شیرعیەت (مارکس، ئەنگلس، لینین، تروتسکی، بلیخانۆف، ستالین، ماو، کیم ئیل سونگ، جۆرج پۆلیتزر،.. نەقلیان کردووە).

بەشێکی تر دۆزینەوەی ئاگر بە شۆڕشی شارستانی لە قەڵەم دەدەن..هتد.

بەڕوانگەیەکی مارکسی گوایە ئێستاش کە قۆناغی سەرمایەداریە ئەوا شۆڕشێکی پرۆلیتاریا سەرتاسەری بەڕێوەیە بۆ گواستنەوەی بەرەو سوشیالیزمی و شیوعیەت، ئەو پرۆسەیە (حتمیة التأریخیة)ی پێ دەووترێ، دروشمی (ئەی کرێکارانی جیهان یەکگرن)یش لەو شۆڕشە سەرتاسەریە هاتووە، بۆیە نابێت هەم شۆڕش لەیەك وڵات بکرێت هەم لە وڵاتانی دواکەوتووش دەست پێ بکا، (کەچی ئەوەیان سەرەتای قەیرانی مارکس بوو دەرنەچوو)، شۆڕشی مارکسی لەیەك وڵاتیش دەستی پێ کردو (ترۆتسکی) زۆر بە توندی دژی ئەو دیاردەیە وەستاو لەگەڵ (ستالین) کەوتنە کێشەو تیۆری شۆڕش بەردەوامی[1] دارشت و دوای تیرۆر کرا لە لایەن لایەنگرانی ستالین.

کەواتە بەڕوانگەی مارکس شۆڕش ناکەوێتە سەر قەبارەی جەماوەر و هۆیەکانیو گۆڕانی واقعو بنکەو لوتکە.. بەڵکو دەکەوێتە سەر ئەنجام: ئاخۆ پەیوەندی بەرهەم گۆڕاوە یان نا.. بۆیە ناچار ناوی شۆڕشی فەرەنسی ١٧٨٩ز بە شۆڕشی بورجوازی لە دژی دەرەبەگو ناوی شۆڕشی ئیسلامی ئێران ١٩٧٩ بە هەڵچوونێکی کۆمەڵایەتی، شۆڕشی ئیسلامی (محمد د.خ) بەگۆڕینی کۆیلایەتی بۆ دەرەبەگایەتی.. ئیتر لەسەر ئەو بنچینە (واتایە) دەگەنە زۆر ئەنجامی شازی تر.

هەرچی مەدرەسەی لیبرالیزمە هەم لە بنەچەو هەم لە باری ئێستای رۆژئاواش کەمتر مانای شۆڕش دەچێتە ناو فەرهەنگیان، هەر مانای لیبراڵی ئێستا بە پێچەوانەی کۆن زیاتر نزیك ترە لە (محافظ) نەك لە (رادیکاڵ)، بۆیە فەلسەفەی لیبراڵ لەسەر ئەنتی شۆڕش بینا کراوە، هەر بۆیەش ئێستا وا زیاتر ئامادەکاری یاسایی و فکری و شارستانی بۆ چەمکی شۆڕش دەکرێ وەك تاوان و تیرۆر، زۆربەشیان شۆڕش بە تێکدانو گۆڕانکاری سەلبی لە قەڵەم دەدەن، (بیرك) وەختی خۆی گوتویەتی: گۆڕانەکان لە رێی پێویستی کۆمەڵ بێت نەك شۆڕش، هەتا

[1] بۆ زیاتر بڕوانە (الثورة الدائمة- ترۆتسکی).

شۆڕشی بۆ گۆڕینی دەسەڵاتیش بێت پێی وایە (گەشەکردنێکی ناسروشتیە).

ئەو راو بۆ چوونە لەو سەردەمەی تاك جەمسەری (ئەمریکی) زۆر باوی وەرگرتووە گەیشتۆتە پێناسی دەستووریش، توانیویانە بیکەنە گوتاری سیاسی زۆربەی دەسەڵاتدارانی دیکتاتۆری و هەموو ئەوانەی لە گۆڕانکاریو پێشکەوتن و شۆڕش و راستی دەترسن، ئەوانەی دەیانەوێ بێ دەنگیو مەین و ڕەوەیی و مەبدەئی (بخۆ و بژی، بیکەو بیرمەکەوە) پەیڕەو بکرێ، ئەو پێناسانەی ئێستا تاوتۆ دەکرێ لەبارەی یاسای تیرۆر زۆربەی بەلای ئەوە دەچێ کە شۆڕش تاوان بار بکات بە گشتی .

هەموو ئەوانە وبە پڕۆتزکۆلەکانی زایۆنی و تیۆرە نوێیەکانی (مەل ملانێی شارستانی-هندگتۆن)، (کۆتای مێژوو-فۆکویاما) (سەرکەوتنی بێ جەنگ-نیکسۆن) (دبلوماسیە-کیسنجر).. مەبادیئی لیبڕالیەتن لە ژێر ڕۆشنایی ئەوەدا نووسەران و سیاسەتمەدارانی جیهانی سێیەمی شکست خواردوو گۆتەی وەك : سەردەمی ئایدیۆلۆجیا جەنگ و شۆڕش نەماوە، یان بە (فتنە)* ناوی دەبەن، دەڵێن (سەردەمی دیالۆگە) (کەچی لە هەموو کات زیاتر وا سەردەمی جەنگ و سەردەمی یاسای جەنگەڵستانە).. هەموو ئەوانە زادەی فەلسەفەی لیبڕاڵ دیمکراسی رۆژئاوایە.

لە راستیدا ئەو دوو بۆچوونە ئیمجە پێچەوانەیەی لیبڕاڵی و شیوعی بۆ شۆڕش ڕووبەڕووی زۆر پرسیاری بێ وەڵام دەبێتەوە، یەکەم لە بارەی شیوعیەت: ئایا ئێستاو لە قووڵایی مێژووش یەك نموونە هەیە لە شۆڕش بە پێی ئەو وەسفانەی مارکسیەت ڕوویدا بێ؟ کوا تەنیا (٥) شۆڕش سەرتاسەریەکە؟ ئەی شۆڕشەکانی شوعیەتیش کە دەسەڵاتیان پێ وەرگرتووە پێشی ڕووخان زۆربەی لە ڕێی رزگاری

---

* هەندێ زانای ئیسلامیش بەشدارە لەو هەڵەتە لەوانە زانایانی سەر بەدەسەڵاتدارەکان (کە بە وعاظ السلاطین ناو دەبرێن) وەك ئەزهەر هەندی بەشی وەزارەتە ئەوقافەکان و هەندێ زانای سەلەفی کەئناویش ،کەدرێژکراوەی ڕێککەوتنی کۆنی نێوان محمد کوری عبدالوهاب و حمد کوری ئال سعود .

نیشتمانی‌و چەکداری‌و یاخی بوونەوە نەبووە؟ کامیان لەناو کارگە دەستی پێکردووە؟

خۆ ئەگەر ئەو یاسایەی مارکس ڕاست بوایە دەبوایە شۆڕشی یەکەم جار لە وڵاتە پیشەسازیەکانی ئەمریکاو بەریتانیاو فەرەنساو یابان.. بکرابایە.. کە شۆڕشیش گڵپەی گرت نابوایە بوەستایە سەرانسەری جیهانی بگرتایە وەك (ترۆتسکی- لە- ثورة الدائمة) بانگێشەی بۆ کردبوو.. لە ڕاستیدا ئەوەی ترۆتسکی مارکسیانەی ڕەسەن بوو.

زۆر پرسیاری تری فەلسەفی‌و کۆمەڵایەتی و سیاسی و واقعی تریش هەیە..

لە بارەی بۆچوونەکانی لیبرالیەتیشەوە، ئاخۆ چۆن بەخۆشی هەق وەرگیراوە؟ کەی دیالۆگو پاڕانەوە لەگەڵ ئاگرو ئاسن‌و کیمیاوی کراوە؟ کەی ئیمپریالیزم و داگیرکەران و ماف خۆران خاکیان بەخۆشی‌و ڕەوشتیانە بەجێ هێشتووە؟ کەی لایەنی شەڕی ئادەمیزادێکی سەلبی بە خۆشی کپ کرایتەوە؟ کەی میللەتێك بەدیاری سەربەخۆیی بۆ هاتووە؟ کەی دیالۆگ لە نێوان دڕەندەو نێچیر بووبێتە ڕزگار بوون؟.. مەگەر تەنیا بەو شێرەی کە دڕندەکە دیاری دەکاو دیالۆك لەسەر ئەوە بکەن کە ئاخۆ چۆنی بخوا، بەبرژاوی یان بەکوڵاوی، بەڕاوەڕاو یان بەخۆشی، بە خنکاوی یان بەکوژراوی، بە هێمنی یان بە توند و تیژ، بە دیمکراسیانە یان بەدیکتاتۆریانە..، جا ئەو بنەمایەی ئاشتی مەسیحی (ئەگەر شەقێکیان لەولا ڕوومەتەدا لا ڕوومەتەکەی ترت بۆ وەرگێڕە) ئەوە خەیاڵیە، نەك ڕۆژهەڵاتی هەر ڕۆژئاوایە ئەوەوی‌و کیمیاوی‌و نوێترین چەك لە جیهان بەکارهێناوەو پێشڕەوی جەنگ بووینەو خەڵکیان چەوساندۆتەوە.

جا ئەوبنەمایەش ئەگەر دایڕنی لە واقعی ئێستا یان بەپیرۆزیەوە سەیریبکەی لە ڕووی ئەنسرۆپۆلۆجی‌و دەروون ناسیشەوە دەبینی لە هەرە چاکیدا تەنها بۆ بەشێکی کەم ڕاستە، ئەوانەی کە ڕەوشتیان بەرزە، ئەگینا ئەگەر بەدڕەوشت شەقێکی لێدای بێ بەرگری ئەوجارە بەقامچی لێت دەدا، وەك وادەبینین ئێستا

لەهەمو كات زیاتر سەردەمی شەڕو شۆڕو هێزو چەوساندنەوەو چەند تـەرازوویی‌و ڕەگەزپەرستی و.. لە ڕاستیدا ئەو ولاتانەی هێزدارن هەرەشەیان لەسەر كەم تـرە، لە وەزیری بەرگری ژاپۆنیان پرسی ئەگەر بۆمبی ناووكیتان هەبوایە لەكاتی بۆمبـا باران كردنی هیرۆشیما ئاخۆ ئیوەش پێی لە ئەمەریكاتـــان دەداوە؟ لـە وەلاّمـدا وتی ئەگەر ئەوجۆرە بۆمـبایەمان هەبوایە هـەر لـە ئـەوەڵیڕا ئـەمریكا ئەیـدەوێرا لێمان بدا!!

لە ڕوانگەی ئیسلامیش دابەشیەك هەیە لە واقعی ئێستای ڕابـوون، بەشـێكی گرنگ لە (تەیاری برایان) پێیان وایە گۆڕان لە مرۆڤ و كۆمەڵ، لە واقعە خراپ و ستەمكاردكان، گەڕانەوەی ماف.. بە چاكسازی‌و پەروەردەیی‌و دیالۆك‌و پاڕانـەوە دەكرێ بێ شۆڕش‌و توندو تیژی.

لەو بارەیەوە (قاموس مصطلحات الدولیـة)ش پـێ ناسـێكی هاوشـێوەی ئـەو بیرەی كردووەو دەڵێ: هەڵبژاردن و پەرلەمان‌و ژیانی سیاسـی‌و دەسـتووری دەبێتـە شۆڕش‌و گواستنەوەی سـەرمایەداری بۆ سۆشیالیستی (هەڵبەتە ئـەوە پێناسـێكی سۆشیال دیمكراسیە) گەلێ جار ئەگەر گۆڕانێكی فـراوانتر بـەو ماهیەتـە ڕوو بـدا پێی دەڵێن (شۆڕشی سپی).واتە شۆڕشێكی بێ خوێن.

هەرچی بەشی دووەمە پێی وایە (بێ شۆڕش‌و جیهاد)[1] تـەنها لـە دۆخـەكانی دادگەری ڕاستە، ئەگینا لەو جیهانەی ئێـستا مانـای خـۆ بەدەسـتەوەدان‌و سـەر شۆڕی‌و ئەوێری یە، زیاتر دەڵێن ئـەوە گوتـاری سیاسـی دەسـەلاّتدارانی زۆردارە، ئەزموونە نوێیەكانیش سەلماندوویانە كە دیالۆك و چاكسازی ناتوانێ جێی شۆڕش بگرێتەوە نەك لەبەر بێ زانیاری و بێ دانایی چاكسـازان، بـەڵكو بـەهۆی لایـەنی بەرامبەرو دەسەلاّتدارەكانە، كە بەو چاكسازیە قایل نین بابەتە جەوهـەری یـەكان بگرێتـەوە لەوانـە : دەســەلاّت‌و دەســتوورو كۆمەڵگـەو سیـستەمی سیاسـی‌و

[1] جیهاد بەو مانایە باوەی ئێستای كە زیاتر مانای جەنگ دەگرێتەوە، ئەگینا هەروەك لە فكری ئیـسلامی باسی دەكەین جیهاد بەمانای ڕەهای جەنگ نیە.

دادگەری، .. بۆیە بەکارهێنانی توندوتیژی و داپڵۆسین و زەبرو زەنگ لەلایەن دەسەڵاتداران و بێ دەنگی و بەناو چاکسازی لەلایەن (معارەزە) یان میللەتەوە.. لە کۆتاییدا بەزیانی میللەت و هەزاران و نیشتمان تەواو دەبێت، ئەگینا مەبدەئی (ئاشتی-لا عنف) مەبدەئی هەموو پەیامەکانی ئاسمانی یە، بەتایبەتی ئیسلام، بەداخەوە زۆربەی فەرهەنگەکانی جیهانی سێ یەمیش هەروەك رۆژئاواییەکان نموونەی کۆن بە (بوزا)و (مونسو)و (مەسیح)و (زینۆن).. دەهێننەوەو نوێش بە (غاندی)و (جۆن ریسکارت)و (تۆلستۆی)و (هنری دائێد)و (مارتن لۆتەرکنك)، [1].. کەچی ناوی (اخوان المسلمین) نایەت خۆ ئەوان لە هەموان ئاشتیخوازتر بووینە، خۆ (مارتن لۆتەر) و (غاندی)یش رێبەرایەتی نارەزایی مەدەنیان کردووە هەروەك (أ.خمینی) و شۆڕشی ئێران کەچی ناوی تۆمار ناکەن، ئەوەش ئەنقەستێکە کە چ بەیاسایی یان بێ یاسایی، چ خۆت بگونجێنی یان نا.. ئەوان ئەو تۆمەتانەی (نایاسایی، یاخی، تێکدەر، تیرۆر، نا مەدەنی، دژە دیمکراسی، دژە نوێگەرایی، چەتە، رێگر، ..) دەدەنە پاڵ ئیسلامی و ئازادیخوازە دڵسۆزەکانیش، بۆیە بەشی دووەم لە تەیاری ئیسلامی پێی وایە شۆڕش سوننەتێکی گەردوونیە، هەروەك چۆن گۆڕانی لەسەرخۆ و بەرەبەرەیی لەو گەردوون و سروشتە هەیە ئاواش گۆڕانی توند و تیژی وەك: تەقینەوەکان، سوپەر نوفا، برکان، تاڤگەکان، بروسك، گەردەلول، .. ئەوە هەمووی شۆڕشی سروشتین، ئیتر مێژووی کۆمەڵیش هەروا هاتووە، بۆیە شۆڕشیش یاسایەکە لە یاساکانی گەشەکردنی کۆمەڵ، ئامرازێکیشە لە دەست میللەتان و ژێر دەستان، لە دەست کردنەوەی ئەو ئامرازەش ماناي بەتێ کردنی راستەقینەی میللەتانە، بۆیە شۆڕش ئەسڵێکی بنچینەی ئیسلامە لە بارودۆخی خۆی، وەك سەرچاوەیەکی سەرەکی گۆڕان، هەڵبەتە گۆڕان لە دژی (وەستاو) بەشێکە لە (مقاصد الانسانیه) و (تەعمیر)، ﴿هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا﴾، بۆیە گۆڕان و چاکسازی

[1] هەر بۆ سەرنج بڕوانە (الموسوعة السياسية (ك-ل-م) ب٥ ل٣٨٥).

هێمن چارەسەری دانیمە، رەسەن ترە، چاك تر ئامانج دەپێکێ.. بەڵام تا رادەی خۆی ئینجا دەپەڕێتەوە بۆ شۆڕش، واتە تا پلەیەکی زۆر جۆری گۆڕان (واتە شۆڕشە یان چاکسازی) ئەکەوێتە سەر سروشتی لایەنی بەرامبەر، بەشێکی کەمیش ئەوەستێتە سەر هەلو مەرجی (لایەنی یەکەم واتە چەوساوەو ماف خوراوەکان)، ئاخۆ چیان پێ دەکرێ؟ لە توانایان دا هەیە.. ئەگەر شۆڕشیان پێ نەکرێ ئەرك نیە، هەر فەرموودەی (من رأی منکم منکرا...هتد) ئەوە سنورەکانی چاکسازی و شۆڕشە.

لەراستیدا ئەو باسە وەڵامیشە بۆ مەسەلەیەکی گرنگ ئاخۆ چارەنوسی شۆڕش لە کۆمەڵگەیەکی مەدەنی یاخود ئیسلامی تەواو چی دەبێ؟ ئایا لەکۆمەڵگەی مەدەنی شۆڕش پێویستەو دەکرێ؟هەڵبەتە شۆڕش بە هەمو رەهەندەکانیەوە لەکۆمەڵگەیەکی مەدەنی زۆرجیایە لەگەل کۆمەڵگەیەکی خێلەکی، رۆلی ئامرازی شۆڕش لە کۆمەڵگەی مەدەنی زۆر کەم دەبێتەوە، وەبگرە پێویست نامێنێ مەگەر بۆ گۆڕینی سیستەم نەك بۆ گۆڕینی دەسەلات، بەلام لەکۆمەڵگەیەکی دادگەر بەیەکجاری کاری شۆڕش دەوەستێ وئامرازی رەخنەی بیناکەرو ئۆپۆزیسۆنی ئامۆژگاری کەرو...جێی دەگرێتەوە .

## جـۆرەکانی شـۆڕش :

لە پێشدا دەبێ بزانین کە شۆڕش لەگەڵ (ئینقلاب)* جیاوازە لە پێناسیشدا ئینقلاب (کۆدیتا: فەرەنسیە بەمانای ئینقلاب) گۆڕینە لە لوتکە، زیاتر هێزی سەربازی لێ بەکاردێت بێ ئەوەی بنکە و خواروو بەشداری هەبێت، کەچی شۆڕش لە بنکە دەست پێ دەکات ئامانجی فراوان تری هەیە، جاریش وایە ئینقلاب ئەنجامێکی شۆڕش دەدا، ئینقلاب هەر زادەی ولاتانی دیکتاتۆری نیە، لە ئەمریکای لاتینی مەڵبەندی ئینقلابات بووە، پۆلیڤیا لە هەرە پێشەوە بووە، لە

*

جیهانی سێیەمیش لە وڵاتە دیمکراسیەکانی وەك تورکیا و پاکستان مێژوویەکی هاوتەریبی ئینقلابی لەگەڵ خۆی هێناوە ، زۆربەی چاودێران پێیان وایە سۆڤیەتی جاران و ئەمریکاش دۆستی یەکەمی ئینقلابچیانن، هەروەك زۆربەی دیکتاتۆریە ئینقلابیەکانی جیهانی سێیەمی، ئێستا هاوپەیمانی ئەمریکا و بریتانیا و فەرەنسان، بۆیە لە پێناسەکانی بەشێك لە فەرهەنگەکان ئەو جیاوازیە نیە، بەپێی فەرهەنگی (قاموس مصطلحات الدولية) پێناسێکی باسایانەی شۆڕش دەکاو هیچ جیاوازی ناکا لەگەڵ ئینقلاب مادام هەر گۆڕینێکی لە دەرەوەی دەستوور بە شۆڕشی لە قەڵەم داوە، هەروەها (موسوعة العلم الاجتماع)یش لە نموونەی شۆڕشەکان (شۆڕشی فەرەنسی ١٧٨٩ و شۆڕشی روسی ١٩١٧ و ئینقلابی ١٩٥٨ و ١٩٦٨ عێراقی )پێکەوە ریز کردووە بەناوی شۆڕش.

بەپێی دابەشی کۆمەڵ لەسەر بنچینەی فاکتەرە کاریگەریەکان لە (ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و نەتەوەیی و نەژادی و سیاسی و عەقیدەیی...)، جا کام فاکتەر زیاتر لە فەترەیەکی مێژوویی کاریگەرتر بووە شۆڕشی لەسەر دروست بووە ئەوا شۆڕشەکەش هەمان ناوی هەڵگرتووە، وەك شۆڕشی رزگاری کە بریتیە لەو هەمو شۆڕشانەی کە خاکی پێ رزگار دەکرێت (لەوانە کوردستانیش) کە پێیان دەڵێن شۆڕشی رزگاری خوازی نیشتمانی، شۆڕشی نەژادیش ئەوانەی لە ئەفریقیا کرا بەتایبەتی خوارووی ئەفریقیاو زامبیا.. لە دژی ئەپارتاید، وە ئەوانەی ئێستاش لە هەردوو ئەمریکاو ئوستراليا دەکرێ، شۆڕشی ئەورووپای کۆنیش دەگرێتەوە، لەو سەردەمەش بەهەندێ خۆپیشاندان و جم و جۆڵی میللی تریش دەنوێنرێت، ئیتر ئەو پێشبینیەی مارکس لە (تیۆری بەرەو هەژاری- بۆس المتزايد) دەرنەچوو چونکە زۆر میللەتی برسی کران و شۆڕشیان نەکرد لەوانە برسیەتیە بەناوبانگەکەی سۆمالی ئەو دواییە.

شۆڕشی عەقیدەش (یان بەوانە دەووترێ شۆڕشی ئایدیۆلۆجی وەك حزبە شیوعیەکان پێی هەڵسان)، شۆڕشی عەقیدەیی لەو سەردەمە زیاتر بە

**(١١) شۆڕش الثورة revolution**

ئیسلامیەکان دەوڵەتێ وەك لە ئێران و ئەفغانستان و چیچان و زۆربەی شوێنی تر، هەر چەندە شۆڕشەکانی ئەفغانستان و چیچان و کشمیر ئیشتمانی ئیسلامیە بەڵام عەقیدەکە داینەمۆیەو.

هەڵبەتە هەر مەدرەسەیەك پێوەرێکی هەیە بۆ مەزنترین شۆڕش، لە ئیسلامدا ڕەوای دەداتە هەموو شۆڕشێك لە دژی چەوسێنەر ﴿وَمَا لَكُمْ لاَ تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ﴾، تێبینی دەکرێ کە (في سَبِيلِ اللّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ) مەرجی عەقیدەیی پێ نەداوە، بەڵام مەزنترین شۆڕش ئەو شۆڕشە عەقیدەییە یە کە لە: نەفامییەوە بۆ دادگەری، لە تاریکی بەرەو ڕووناکی، لە دڕندەیی بەرەو مرۆڤایەتی، لە فەرمانڕەوای و یاسای دەستکردی مرۆڤەوە بۆ فەرمان ڕەوای دروستکەری مرۆڤ، لە شاقولیەوە بەرەو ئاسۆیی، .. یان هەرچیەکی بەو ئاراستەیە بێت، بۆیە شۆڕشەکانی ڕزگاریش پلەیەکە لە شۆڕش، بەڵام باڵاترین پلەی شۆڕش نین (بۆ زیاتر سەرنج بدە جەنگی ڕەوا لەو فەرهەنگە)، دیسان زۆربەی فەرهەنگەکانی جیهانی سێیەمیش هەروەك ڕۆژئاوایی چەند نموونەیەکی بە شۆڕشی سەرەکی نووسیە، بۆ نموونە (الموسوعة السياسة- مادة: الثورة) پێنج شۆڕشی نموونەی تۆمار کردووە:

١- شۆڕشی بریتانی ١٦٨٨ز.

٢- شۆڕشی ئەمریکای ١٧٧٦ز.

٣- فەرەنسی ١٧٨٩.

٤- ڕوسی ١٩١٧.

٥- چینی ١٩٤٩...

ئیتر شۆڕشی پێغەمبەرەکان و ڕزگاری خوازانی تیا نیە کە گەورەترین تەوژمی گۆڕانیان لەو جیهانە دروست کردووەو دەکەن، هەتا شۆڕشی ئیسلامی ئێرانیش ١٩٧٩ لەسەر ئەو ئەزمانەیە کەچی تۆماری نەکردووە.

### (١١) شــۆرش (الثورة) revolution

١- شۆڕشی بەریتانی ١٦٨٨ز.

٢- شۆڕشی ئەمریکای ١٧٧٦ز.

٣- فەڕەنسی ١٧٨٩.

٤-ڕوسی ١٩١٧.

٥- چینی ١٩٤٩...

ئیتر شۆڕشێ پێغەمبەرەکان و رزگاری خوازانی تیا نیە کە گەورەترین تەوژمی گۆڕانیان لەو جیهانە دروست کردووەو دەکەن، هەتا شۆڕشـی ئیسـلامی ئێـرانیش ١٩٧٩ لەسەر ئەو ئەزمانەیە کەچی تۆماری نەکردووە.

( ١٢ )

## چاكسازی إصلاح reform

بە مانا سادەیەكەی گۆڕینی دۆخە سەلبیەكانە بەرەو ئیجابی بەشێوازی هێمن و لەسەرخۆی بێتوندوتیژی و شۆڕش، جا ئەو چاكسازیە روو لە تاك بێت یان كۆمەڵ یان دەزگا، بۆیە چاكسازی و سیاسەت نزیك ترینێكن لێك ئەگەر یەكیش نەبن، وەك لەدوای زیاتر دەردەكەوێ، جاریش وایە ئەگەر چاكسازیەكی زۆر و خەستی پێ بوێ ئەوا ناوەڵناوی شۆڕشی پێوە دەنووسێن وەك شۆڕشی ئیسلاحی بەو مانایەی لە دژی گەندەڵی (فسادی)[1] یان ئەگەر ئەو چاكسازیە ئەنجامێكی خێرا و بەرچاویش بدا بە (شۆڕشی سپی) ناودەبرێ، لە راستیدا پەیوەندی چاكسازی و شۆڕش و نوێكردنەوە (تجديد) بەو شێوەیە نیە كە زۆربەی فەرهەنگە لیبراڵی و ماركسیەكان هەتا نەتەوەگەریەكانیش بۆی چوونە وگوایە چاكسازی تەنها گۆڕانێكی سادەیە نەك قووڵ و ریشەیی، كەئەوەی دوای تەنها لە توانای شۆڕشە.. نەخێر ئەوەیان راستە بۆ ئەو بەرنامە بێ هێز و تواناییانەی كە خۆیان قووڵ نین ناتوانن روو بچنە ناو ناخی مرۆڤ و كۆمەڵیش، ئەگینا بەرنامەی ئاینی راستەقینە لە كۆن و نوێ چاكسازیەكەی لە كۆتاییدا دەگاتە قوڵایی و ریشەیش، واتە لێرەدا چاكسازی شۆڕشێكی هێواشە و شۆڕشیش چاكسازیەكی خێرایە، بەڵام جیاوازیەكی تر هەیە جار وایە ئەو گۆڕانكاریەی شۆڕش (یان بە زاراوەی ئاینی جیهاد) بەرهەمی دەهێنێت بە ٥٠ ساڵی چاكسازی نایەتەدی، هەر بۆیەش نوێكردنەوەی راستەقینە (تجديد) بابەتایەكی فراوانی نەكەوێتە مەملەكەتی

[1] بۆ زیاتر بڕوانە أ-مصطلحات سياسية- د.ترابي. ب-معركة المصطلحات- د.محمد عمارة.

چاكسازی، چاكسازیەكی بە بەرنامەو مەبەست، (تجدید) گۆڕانو چاكسازیەكە لە چوارچێوەی ڕەسەنایەتی خۆی، ئەو بەرنامەیە زۆر وردو بەنەخشە نەبێت جار وایە لەسەر هێڵی ڕەسەنی خۆی لادەدا، بەتایبەتی ئەو بەرنامە سیاسی و كۆمەڵایەتیانەی بیناكردنی مرۆڤ و كۆمەڵی تیادایە، واتە بەرنامە ئاسۆییەكان، هەروەك چاكسازیەكەی (گۆرباتچۆڤ- گلاسنۆست وبیرۆسترۆیكا ) كۆتای بەوە هات زۆربەی وڵاتانی سۆشیالیستیو نیمچە شیوعی هەڵگەڕێتەوە لە بەرنامە ئاسۆییەكان بۆ شاقوڵیەكانو گەڕانەوە سەر لیبراڵی و نەتەوایەتی و دەڤەری، بەو شێوەیە چاكسازی دەبێ مدرسەیەكی بەهێزی لە پشت بێت بێت نەگینا هەڵی دەوەشێنێتەوە پێی چاك ناكرێ، هەر بەو شێوەش چاكسازیەكانی (مارتن لۆتەر) بەرامبەر (كاتۆلیك) بووە هۆی پەیدابوونی مەزهەبێكی نوێ بەناوی (پرۆتستان)ی لە سەدەی شانزەم.

مانای ئێستای چاكسازی هەر كۆمەڵایەتی نیە، بەڵكو دەزگا ئابووری و سیاسی و زانیاریش دەگرێتەوە، هەر چەندە زۆربەی فەرهەنگە كۆن و (تارادەیەك نوێیەكان)ی ڕۆژئاوا و زۆربەی عەلمانیەتی ڕۆژهەڵاتیش كە ناوی چاكسازی دێت یەكسەر بەمانای بەو چاكسازیەی (مارتن لوثر ١٤٨٣-١٥٤٦) دەبەستنەوە كە لە دژی (كاتۆلیك، دادگاكانیان، كلیل و چەكی بەهەشت، پشكنین، دەربەگایەتی، گەندەڵی، كێشە بەگشتی..)، وەك فەرهەنگی بەناوبانگی (oxford) پێناسی كردووەو دەڵێ: (چاكسازی بریتیە لەو پرۆسە یەی دژی كەنیسەی كاثۆلیكی رۆمی كراو كەنیسەكانی پرۆتستانی پێ دروست بوو لە سەدەی شانزدەهەم)[1]، لە ڕاستیدا چاكسازی جگە لەگەڵ مێژوو، زانایانی ئاینی و نا ئاینی باسیان لە چاكسازی كردووە، بەشێك بە هێمنیو بەشێكیش بە توندیو بەشی تریش بەهەردوو شێوە لەوانە: (ئەوین، مورسی، ئەرك، ئەدون، پوپ، رۆسۆ، روتری، سندی، وێب، لوپر، ئەنجلس، برنشتاین، كونت، ورد، سپنسر،

---

[1] Oxford. Advanced learnens dictionary.٢٠٠٠

غاندی، .. سەرەڕای پەیامەكانی ئاسمانی مەدرەسەكانی یۆنانی و چینی و هندی..)، تەنانەت مەبەستی بنچینەی ئاینی ئیسلام چاكسازیە، هەر پێناسی سیاسەتیش لە ئیسلامو لە بنەچەی خۆشیدا هەر مانای چاكسازی گشتیە، واتە چاكسازی ئەسڵە، شۆڕشو جیهاد ئامرازن بۆ مەبەستی چاكسازی لەوساتانەی كەهیچ ڕێگەیەك لەبەردەم نامێنێ، چونكە بەرهەمی چاكسازی لەڕووی چۆنایەتی چاكترە لە بەرهەمی شۆڕش كە چەندایەتیەكەی زیاترە.

جار وایە ئەوانەی ئەو بڕوایەی هەیە كە هەمرو شت دەكرێو دەشێ بە هێمنی چابكرێو بگۆڕدرێ پێیان وتراوە (چاكسازیەكان-إصلاحیون) یان (تەقلیدیەكان، كلاسیكیەكان، پارێزگاران).. ئەوانە لەیەك بەرەو تراز ڕیز كراون لە بەرامبەر (أصولیون، شۆڕشگێڕەكان، مۆدێرنەكان، ڕادیكالیەكان، ..)، ئەو دوو بەرەیە هەم پێچەوانەن و هەم هاوتای یەكیشن وەك دوو چەمكی: لیبڕاڵ دیكراسەكان و سۆشیال دیكراسەكان، شۆڕش و چاكسازی..، لێرەوە یەك دەگرنەوە لەو بارەیەوە، هەردوو لا لە بنەچەدا بۆ چاكردنی لایەنە سەلبیەكانی كۆمەلگەی سەرمایەداری ڕۆژئاوا هاتینەكایەوە، بەشێوەی هێمنانەو سەردەمانە، لەو خاڵە جەوهەریەدا لەگەڵ ماركسیەكان تێك دەگیرێن كاتێ ئەوانە (لیبرالیەكان و سۆشیال و دیكراسەكان) پێیان وایە پرۆسەی چاكسازی (پەیوەندی بەرهەم هێنانیش) دەگرێتەوە كە لە فكری ماركسی بە مەحاڵو كوفر حسابە، بۆیە زۆربەی جار لە فەرهەنگی شیوعیەكان دا سۆشیال دیكراسی بە: خائین و دووڕوو، هەڵگەڕاوە، كرێ گرتە، ڕوویەكی تری برجوازی، ..پۆلین كراون.

بەكردە باری كرێكارانیشیان تارادەیەك چاكساز كردووەو پێشبینیەكەی ماركس لە كتێبی (تیۆری-بۆس المتزاید) دەرنەچووكە تیایدا هاتبوو (لەبەر ئەوەی پەیوەندی بەرهەم هێنان چاكساز ناكرێتو ناگۆڕێت تەنها بە شۆڕشێكی توندو تیژی نەبێت)، داینەمۆی شۆڕشگێڕیەتی ماركسیش لێردوە سەرچاوە دەگرێ.

بەپێی هەمان تیۆر وا پێشبینی كرابوو كە چینەكانی ناوەندیش بكەونە پاڵ چینی پرۆلیتاریاو بگەنە ئاستێكی نەداریو بتەقێتەوە بە شۆڕشێكی كۆمەلایەتی، كەچی وا دەرنەچوو..

بۆیە لە كۆتاییدا (چاكسازی) بە گەورەترین دوژمنی ماركسیزم حسابە، هەروەك لە ئامۆژگاریە بەناوبانگەكەی (ماركس) بۆ شیوعیەكان هاتووە (ئێوە شۆڕشگێڕ بن نەك چاكساز)، چونكە پێیان وایە چاكسازی (حتمیة التأریخیة) دوا دەخا، ئارادەیەك هەقی ماركسیەتە لەو بۆچوونە چونكە سیستەمی رۆژئاوا چاكسازیەكانیان رەختیانەو لاوەكیەكان بووە، تەنها دەبێتە كپ كردنی و بەنج كردنی خەلكی، هەروەك ئێستاش وا دەبینین لە هەموو بوارەكان، هەتا رەنگی داوەتەوە سەر (un)یش كە زۆربەی بڕیارو چارەسەریەكۆنیان كورت خایەن و لاوەكیو سەرچیخیە، نموونەشمان كێشەكانی صۆماڵ، لبنان، فەلەستین، بەلكان، ئەفغانستان، كوردستان، .. هەر بەهەمان شێوەش چاكسازیەكانیان لە پەیمان نامەكانی: (سایكس-پیكۆ-١٩١٦) و (بەلفۆر-١٩١٧) و( لۆزان-١٩٢٣ )..كە لەلایەك ولاتێك پێش كەش یەكێكی تر دەكا (وەك كوردستان و فەلەستین) لە هەمان نووسراودا داوا دەكا مافی هاوولاتیانی ئەو ولاتە بپارێزێ (بۆ روون تر سەرنج بدە دەقی نامەكەی بەلفۆر[1] _ یان ئاوەڕۆكەكانی پەیمان نامەی سایكس بیكۆ- لوزان، ..)، ئەو جۆرە چاكسازیانەیە سەرچاوەی پشێوی و جەنگ، بەلام ئەوە مانای ئەوە نیە سەرتاپای چاكسازی سەلبی بێت وەك بۆچونەكەی ماركسیزمو

---

[1] دەقی تەرجەمەی نامەكە: برام لۆرد رۆتشیلد، خۆم بەبەختەوەر دەزانم لەجیاتی حكومەتی خاوەن شكۆو بەرەزامەندی ئەنجومەنی وەزیرانیش ئەو لێدوانەتان بۆ بنێرم وەك هاوسۆزی بۆ ئەواوی زایۆنیە یەهودیەكان: (حكومەتی خاوەن شكۆ بەسۆزەوە دەروانێتە گەلی یەهودی بۆ دروست كردنی نیشتمانێكی نەتەوەیی لە فەلەستین، هەموو ئەركێكی مومكینیان بۆ دەرەخسێنێ، پێویستە بزانرێ مافی مەدەنی (نایەهودیەكان)ی دانیشتوانی فەلەستین نابێ پێشێل بكرێت و جیابكرێنەوە لە مافە یاساییەكانی یەهود.

برای دلسۆزتان.

ئەرسەر بەلفۆر ١٩١٧

هەندێ زاناو فەیلەسوفو دیدگای مادی ترو لەو سەردەمەش هەندێ لەتەیاری جهادی ئیسلامیشی هاتۆتە سەر، بەڵکو ڕێگەیەکی ڕەسەنی گۆڕانو گەشەکردنو بەئیجابی کردنە.

چاکسازی لە فکری ئیسلامی دا وەك چارەی هەمیشەیە بۆ کێشەکانی مرۆڤایەتی، بۆ هەردوو تەوەرەی گیانیو مادیەکەی، پێی وایە ئەوانەی وا دژی چاکسازین تەواو لە مرۆڤ نە گەیشتوونو نە کەرەستەی تەواوی چاکسازیشیان لایە، بەڵام چاکسازیش سنوورو مەرج و بارودۆخی خۆی هەیە، بەشێکە لە یاساکانی ئاسایی سروشتو سونەتێکی گەردوونیشە، پلە بە پلە کە لە چاکسازی دوور دەکەوێتە بەرەو جەمسەری شۆڕش مانای تر وەردەگرێ وەك : سەرنج، ڕەخنە، سەرزەنشت، گەشەپێدان، نیمچە گۆڕین، سزاکانی ئابووریو کۆمەڵایەتیو دەروونی و.. هەتا دەگاتە زیندانیش، .. شان بەشانی یەکتر بەکاردەهێنرێت بۆ چاکردنی بارێکی سەلبی بەرەو ئیجابی، بەڵام دیسان ئەگەر بەرنامە و ئامانجێکی مەزن و پیرۆز لەپشت ئەو گۆڕینە نەبێت نە سەلبی و ئیجابی مانای خۆی وەردەگرێ نە ئەو کۆمەڵە گۆڕینانەش دێتە دی، بۆیە دەبێ ئەو ئمرازووە بەکاربێت بۆ هەڵسەنگاندنی گۆڕان و هەر هەنگاوێك کە لەو ئامانجە نزیکت دەکاتەوە، هەر بۆیەش چۆنایەتی هەنگاوی گۆڕین ئەکەوێتە سەر واقع و دەوروبەرو کارتێکەرەکانی، لە کاتێکا (تجدید) چاکسازیە لەچوار چێوەی خەلافەتی ئیسلام (یان دەوڵەتی ئیسلامی)، بەڵام شۆڕش و ڕاپەڕینە لەچوارچێوەی داگیرکراوی چەوساندنەوە یان هاوشێوەکانی، بەهەمان شێوەش مارکسیزم جەختی لەسەر ئەو سنوورو لێك جیاکردنەوە کردووە، دەبینین گۆڕان لەچوار چێوەی یەك چین یان حزبە چەپیەکاندا بەچاکسازی و ڕاستەڕێ کردن وەك ئامرازێکی سەرەکیە کەچی لەگەڵ برجوازی شۆڕشو تەرتو وێران کردنە.. بەڵام لە مەدرەسەی لیبرالیەت دا هیچ سنورێكو یاسایەك نیە چاکسازی و شۆڕش لێك جیابکاتەوە، زیاتر ئەکەوێتە سەر بەرژەوەندی بارودۆخی ئەو ساتیو کاتی، ئەو بیروبۆچوونانەی لە ئەوروپا ناوی

لێ نراوه (ئیسلاحی-چاكسازی) هەر له مارتن لۆتەر، رۆسۆ، رۆبەرت ئەوین، مۆرس، ... هەتا غاندیش.. ئەوا لەسەر هەمان فكرەیان راپەڕین و شۆڕش كراو جیهانی پێ گۆڕدرا، كەچی ئێستا كەمتر پێویستیان بەو راپەڕین و شۆڕشە هەیە ئەوا ناو ناتۆرەی یاسایی و كۆمەلآیەتی و دەروون ناسی جیاجیایان بۆ داتاشیوه بۆ یەك خستنی، هەر چەندە لەبەر گرنگیشی وەختی خۆی (un)یش دانی بەوه هێناوه كه میللەتان زیاتر له چاكسازیان پێویستە تا دەگاتە رادەی بەرگری و شۆڕشی چەكداری .. هەروەك له ماددەی (١) فەقەرە (٢، ٣)ی بابەتی (مقاصد الامم المتحدة) هاتووه.

## هێزی چاكسازی:

مەبەست لێی توانا و كاریگەری ئەو مەدرەسە یە(یان دەزگایه بەگشتی یان ئەو كەسە) بۆ گۆڕینی واقعێك، ئەوەش دوای خوورد كردنەوەی بەسادەتر دەبینین ئەو توانایه دەپیورێ بەڕووبەری ئەو توانایەی چاكردنی مرۆڤێكی سەلبی بەرەو ئیجابی، كەواته بازنەی باسەكەمان لێرەدا لە دەوری چاكردنی مرۆڤە، ئاخۆ چەندە دەكرێ مرۆڤێكی خراپ چا بكرێت؟ ئایا خراپە میرات و زگماكیه یان وەرگیراو فێربوونه؟ ئایا راستە هەموو مرۆڤێك هەر سروشت و ڕەگانی شەڕانیە؟ وەك زۆربەی زانایان وای بۆچوونە، كەواته كێشەی بنچینەی مرۆڤ چیه؟ كام مەدرەسەو عەقیدەو سزا دەتوانێ ئەو جۆرە مرۆڤانە چا بكا؟..

لەسەر وەلآمی ئەو پرسیارانە دابەش بوونێكی هەمە لایەن هەیە.. بەشێكی زۆر له زانایانی رۆژئاوایی پێیان وایە هەر لە بنەچەدا مرۆڤ شەڕانگێز و گورگانیە[1] لەوانە: (میكافیلی، نتچه، هۆبز، فرۆید، دوركایم، ماركس، وجودیەكان، مادیەكان، ..)، بە كورتی زۆربەی عەلمانیەتی جیهانی و دەفەری ئەو بۆچوونەیان هەیە، ئیتر ڕەش بینن بەرامبەر مرۆڤ، بۆیە رۆژئاوا كەمتر گرنگی بەو

[1] بۆ زیاتر بڕوانه ئەو كتێبانه: (أمیر، طبیعة الانسانیة، نظریة الجنسیة..).

لایەنە دارە، جگە لەوەی سزای زیندانی و چارچاریش (سێدارە) وەك دوا چارەی تەلاچۆی تاوان، هەر بەهەمان شێوەش زاناو فەیلەسوفانی شیوعیەت و سۆشیالیستیش هەر بەجۆرێك لە جۆرەكان بێ ئومێد بووینە، چونكە بەپێ ی ئەو زانایانەی هاوبەشن لە دەروون ناسی، ئەنسڕۆپۆلۆجی، كۆمەڵناسی، فەلسەفی، سیاسی.. لەدوای لێ كۆڵینەوەو ئەركێكی یەكجار زۆر گەیشتنە ئەو راستیە ئەمرە گوایە: هیچ دەزگایەك نیە چاودێری نیاز و مەبەستە شاردراوەكانی مرۆڤ بكا، چونكە یاسا لەباشترین دۆخیدا تەنها دەتوانی چاودێری لایەنە دیارەكانی مرۆڤ بكا، بەوەش نیوەی كێشەی كۆمەڵیش بنبڕ ناكرێت، باقیەكەی تر (واتە لایەنی شاردراوەكەی كە-أسرار الشخص-ی پێ دەوترێ)، سەرچاوەی سەلبیاتی كۆمەڵ و تاكە، هەر لە پەیوەندیەكانی جیهانی تا دەگاتە یەكەی خێزان، كەواتە ئەو –اسرار-گرنگترین بەش و دوا ڕیان و قووڵ ترین كێشەكەیە، ئالێرەدا توانای بزوتنەوە كۆمەلایەتی و سیاسی و حزب و دەوڵەت و مەدرەسەكان دەردەكەوێ كە كامیانە دەتوانی ڕوو بچێتە ناو قوولایی ناخی مرۆڤ و چاكسازی تیا بكا، راستە ئەوانەش هەمووی لە بنەچەدا بەناوی چاكسازی دێنە مەیدان كەچی گەر بەو تەرازووە قووڵە هەڵیانسەنگێنی تێكدانی زیاتر دەبێ لە بیناكردن، مادام بەرنامەو عەقیدەكەی نەتوانی وا ڕوو بچێتە ناخی مرۆڤ، مادام نەتوانی ئەو دوو ئەركە چاكسازیە گرنگە گەردوونی و چارەنوس سازانەی خوارەوە بۆ مرۆڤ دانەڕێژێ:

١- بتوانێ مرۆڤێكی دەروون نەخۆش و سەلبی و شەڕانی و گورگانە وەرگێڕێ بۆ مرۆڤێكی ساغی ئیجابی خێرمەندی هاوكار.

٢- بتوانێ چاودێرێكی هەمیشەیی (روحی) لەناخی مرۆڤ دروست بكا بۆ گێڕانەوەی لەهەر نیاز و كارێكی سەلبی بێ ئەوەی چاوی یاسا و خەلكیشی لێ دیاربێت، ئالێرەدا پێویستە بڵێین كێشەی مرۆڤ لەدوا لێكدانەوەدا هەر كێشەی ئەخلاقیە، بە چارەسەریەكانیشەوە، راستە دوو هۆكاری سەرەكی هەیە بۆ چاكردن و راستە ڕێ كردنی مرۆڤ و كۆمەڵ:

| | | |
|---|---|---|
| (١٢) چاکسازی | إصلاح | reform |

١- یاسای توندو تۆڵ و دادگەر.

٢- چاودێری گیانی لەناخی مرۆڤەوە.

جا وا دەردەکەوێ کە یەکەمیان مادی و دەرەکی و دووەمیشیان روحی و ئەخلاقیە.. بەڵام مادام دادگەرو تەرازووی تیادایە ئەوا یەکەمیشیان هەر ئەخلاقیە.. واتە راستە لە کۆتاییدا کێشەکە ئەخلاقیەو چارەسەریەکەش ئەخلاقیە، ئیتر لێرەدا پەیامی عەلمانیەت و ئاین لێك جیادەبنەوە کاتی پەیرەوی عەلمانی تەنها جەخت لەسەر مادیانەی مرۆڤ دەکا، ئاینیش زیاتر ئەخلاقیانە، ئەگەر مەدرەسەکانی عەلمانی (چەپی و سۆشیالیستی و لیبراڵی و ئەتەوەیی..) بتوانن جارجار خاڵی یەکەم (واتە یاسایەکی بەدادگەر) بهێننە دی ئەوا هەرگیز نەیانتوانیوە و ناتوانن خاڵی دووەم (چاودێرەکە) دروست بکەن، بەو شێوەیەو لێرەدا مەدرەسەکانی عەلمانیەت تواناو وزەی دەوەستێ و بەرەبەرە لەگەڵ گەشەسەندنی کۆمەڵ و زیاتر بەرەو عەولەمە چوون جێگە و پێگەی خۆی لەدەست دەدا بۆ پەیامی ئاینی کە لە توانای هەبووەو هەیەتی ئەو ئەرکە ببینێ، هەر بۆیەش بەزەقی دەبینین مەدرەسەکانی عەولەمە لە چاکسازی تاك و کۆمەڵ تەواو پەکی کەوتووەو بەرەو قەلۆشیە لە هەموو بوارەکانی: سیاسی، فکری، فەلسەفیو لایەنی پەیڕەویش لە یاساو دادگەری و هێزی جەماوەرو..، هەر بۆیەش دەبینین لە هەر شوێنێکی جیهانی ئیسلامی بەئازادی عەلمانیەت و ئیسلامی وەك بەدیل لە مەیدان بن ئەوا عەلمانیەت قەتیس ماوە لە دەسەڵاتخوازی و کلاسیکیەت و فریودانو دیکتاتۆریو پشت بەستن بە سوپاوزینداني ..، لەسەر ئەو بنچینە قوولە بووە ئەو سەدەیەی نوێ ناونراوە سەدەی ئاینەکان[1]، هەتا تیۆرە کۆمەڵایەتیە سەرەکیەکانی هەرە دوور لە ئاینیش ناوەرۆك و مەبەستەکەی پڕە لە ئاین وەك (تیۆری مل ملانێ ی شارستانی)، (سیستەمی نوێ ی جیهانی)، (عەولەمە و عالەمی)، (جەنگی نوێکانی جیهانی)، (ئیمپریالیزمی نوێ)، (پرۆژە نوێکانی تر..)، هەتا مەدرەسەکانی تریش ئێستا داینەموٚیەکی ئاینی بۆ تەرهیم کراوە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ (هەروەك لە بەشی مەدرەسەکانی عەولەمە لەو

[1] بۆ زیاتر سەرنج بدە ڕاپۆرتی کۆنگرەی هەزارەی نیویۆرك-هەفتەی کۆتای ٨/٢٠٠٠.

فەرهەنگەدا زیاتر باسی ئەو بابەتە دەکەین)، وەرچەرخانێکی گرنگترو هاوتای تریش ئەوەیە زانستی نوێو ئایدیۆلۆژیاش بەرەو ئایینە بەتایبەتی ئیسلام.

کەواتە بابزانین ئەگەر مەدرەسەکانی عەلمانی لەو چارەسەریەی ناخی مرۆڤ بە مەحاڵ گەڕانەوە ناخۆ بەرنامەی ئیسلام چی پێیە؟ ئایا دەتوانین لە بەرنامە چاکسازیەکانیدا مرۆڤی شەڕانی بۆ مرۆڤێکی خێرخواز بگۆڕێ؟ هێزی پەروەردەی چەندە؟ چەندە دەتوانێ مرۆڤێکی خۆنەویست دروست بکا چ سادە بێ یان بەدەسەڵات، دنیا نەویست بێ، بەرژەوەندی تایبەتی بخاتە خزمەت بەرژەوەندی گشتی.. دەکرێ نموونەك لە کۆمەڵگەی نوێ دروست بکا کە تاکەکانی پەیڕەوی مەبادیتەکانی عەقیدەیەك بکا چی بۆخۆی ویست ئاواش بۆ خەڵکی تر، دوایی چی بۆ وڵاتەکەی ویست ئاواش بۆ جیهان.. بەو شێوە بێت دادگەری جیهانی پێ بێتە دی.. کەواتە چۆن‌و لە کێ ڕا ئەو چاکسازیە دەکا؟ ئەگەر جاران توانیویەتی ئایا لە ئەزموونی نوێ نموونەی هەیە؟ هەروەك تۆلستۆی، برناردشۆ، .. بە ڕاشکاوانەتر بۆی چووەو دەڵێ: دادگەری بەو بنەمایە دێتەوەدی ئەگەر هەریەکێك چی بۆ خۆی ویست ئاواش بۆ خەڵکی تر، کە ئەوەش بناغەی ئیسلامە لە هەر سەردەمێك پەیڕەو بکرێ، هەڵبەتە بەپێی ڕووکاری مادی ئەو سەردەمە ئەو پرۆسەیە بە مەحاڵ پۆلێن دەکەن، بەڵام مەحاڵ نیە، لەو بەشەی داهاتوو وەڵامەکەیتی بەروانگەی فکری ئیسلامی.

( ١٣ )

# ناخى مرۆڤ نفس الانساني Human's psyche

له كۆنەوە ئەو بابەتە زۆربەى مەدرەسەو زانايانى سەرقاڵ كردووە، لەبارەى پێكهاتەى دەروونى مرۆڤ، چەندين پرسيارى بێ وەڵامى وەك: ئاخۆ تەبيعات و سروشتى مرۆڤ لە كوێيە؟ چارەى هەيە يان نا؟ سەرچاوەكانى دروست بوونى (تەبيعاتى) سروشتى بەشەرى چيە؟ خۆرسكەو زگماكى و ميراتە ياخود بەرەبەرە مرۆڤ وەرى دەگرێ لەدەوروبەر؟ ئايا تەبيعات چەسپاو و نەگۆڕە ياخود ئەويش چا دەكرێ و خراپتر دەكرێ؟

كەواتە هۆى بنچينەى (إنحراف اجتماعى) لە كوێى ئەو دەروونانە دروست دەبێت؟.. زۆر پرسيارى تريش.

هەڵبەتە كێشە لەسەر پانتايى‌و شوێنى مادى (تەبيعات)يش هەيە، بەپێى (تعريفات جرجانى) ئەوا: (الطبع: ما يقع على الناس بغير إرادة)، واتە بەدەرە لە ويست‌و خواستى ئەو كەسە خۆى و ئيتر بەو مانايە بێت تەبيعات دەرمانى نيە هەر وەكو كورديش وتويانە، بەڵام رەنگە (جرجانى) لەگەڵ ئەو بەشەى (طبع)ى بێت لەلايەنى حەزو ئارەززى خواردن و نووستن و تواناى لەش كە (غەريزە)ى پێ دەوترێ، نەك ئەو بەشەى كە پەيوەستە بە "ئەخلاق"ى كە بەشەكانى (توورە يى، هەڵچوون، بێ ئۆقرە، خۆ ويستى، خۆبەزل زانى، بێ بەزەيى، هەڵپەرست، ترسنۆك،...) لەگەڵ پێچەوانەكانى (دەرنگ توورەبوون، بە ئۆقرە، گشت ويستى، سادەيى، بەبەزەيى، راستى، دادگەرى، بەهەڵوێستت، بەهێزو ئازا، هاوكارى، برايەتى، بەهانا هاتن..) دەگرێتەوە، بۆيە كەمتر ئەو رايە هەيە كە (تەبيعات)

بەدەربێت لە ئیرادەی تاك خۆی، هەر چەندە بەناڕاستەوخۆ ڕایەکانی مارکس، ئەنجلس، دورکایم، فرۆید، هۆبز، نیتچە، شوبنهاور، وجودیەکان، مادیەکان، بەشێکی زۆریش لە دەروون ناسان، جەبریەکانیش، .. هەر هەمان مانا وەردەگرێ، چونکە ئەوانە پێیان وایە تەبیعاتی بەشەری بەندە بە بازاڕەکەی وەك مارکس دەڵێت، کە نزیکە لە ڕایەکەی ئیمام غەزالی، کە هەڵس وکەوتی بەشەری دەگێڕێتەوە بە سەرەکی بۆ غەریزەی زگ تێرکردن، فرۆیدیش بەندی کردووە بەبارودۆخی جنسی، دورکایم دەیگێڕێتەوە بۆ تەبیعاتی دەستە جەمعی و مێگەلی، .. ئەوانەی پێشیان وایە (تەبیعاتی بەشەری) زگماکی و خۆڕسکو میراتی نیەو بەرە بەرە دروست دەبێتو شایەنی گۆڕانیشە لەوانە (مۆنتسیکۆ، ڕۆسۆ، جۆن لۆك، بەڵام بۆ سەرچاوەی دروست بوونەکەی د ــ ان بەهەڵە دەیدەنە پاڵ فاکتەری جیاجیای وەك: ئابووری، نەژادی، نەتەوایەتی، چینایەتی، ژینگە، بەشێکی تر بۆ پێکهاتەی فسیۆلۆجی و ئەو لێنجانە کاریگەرن، وا بەشێکیان لێ تۆمار دەکەین: -

- ئەنجلس: بۆ گەڕان بەدوای تەبیعاتی بەشەری سەیری سەرو کەللەی مەکەن، سەیری بازاڕو دۆخی مولکیەتی بکەن.
- ستالین: تەبیعاتی هەر کەسێك بەندە بە ئینتمای چینایەتیەکەی، واتە تەبیعات و سروشتی ئاغایەك جیایە لەگەڵ جوتیارێك، دەوڵەمەندێك لەگەڵ هەژارێك.
- شیوعیەت بەگشتی: پێی وایە مرۆڤ وەك تاك تاك چانابێت بەڵکو بەچینەوە دەبێ بگۆڕێ.
- مۆنتسیکۆ: لە کتێبی (روح القوانین) ژینگەیە تەبیعاتی بەشەری دیاری دەکات، هەریەکە لە دورکایم، لامارك، داروینیەکان، مادیەی فەڕەنسی کلاسیکی، .. هەتا بەشێك لە مارکسیەکانیش لەوانە (بلیخانوف) هاوبەشی

ئەوانەو (مۆنتسیکۆ) دەکەن لەو رایە*.

- دەروون ناسەکان: بەشێکی زۆر لەوانــە ئــەو جــۆرە تەبیعاتــە بــۆ (غــەریزە) دەگێڕنەوە.
- جەبریەکان لە فکری ئیسلامیشدا: هەریەکە تەبیعاتی لە ئەزەلەوە بۆ دیــاری کراوەو هیچی لەدەست نیەو مسەیەرە.
- بەشێك لەگەردووناسی (منجمین): پێیان وایە رۆژی لەدایك بوونو جوولــەی ئەستێرەکان کاریگەریەکی زۆری هەیە لەسەر تەبیعات.
- لەکۆنەوەش (هـرقلیط ٤٦٠-٣٧٧پ.ز) رای وابوو ئەو لینجیەی لە مێشك و دڵو پەنکریاس دەردەچێت تەبیعاتی بەشەری پێ دیاری دەبێت، مەدرەســەی فەسلجی نوێش هــەمان رای پەرەپێــداوە، لەوانــە هــەردوو زانــای ئــەڵمانی (کریشمر)و (ڤۆند)، هەروەها (باڤلۆڤ)و (یۆنگ)، چەندین مەدرەسەی لەسەر دروست بووە وەك مەدرەسەی فرنس سکون، ماك ئولین، مەدرەسەی ئیتــاڵی (ڤیولا) مەدرەسەی کریشمر، مەدرەســەی یــۆنگ، مەدرەســەی شــلیدۆن..، لەناو کوردیش وا باوبوو پیاوی چڵمن پەسندە.
- هەروەها بەشێك لە فەیلەسوفانی ئیسلامیش ئاڕادەیەك ئەو رایەیان هــەبووە (جــلال الــدین سـیوطی) لــە کتێبــی (الرحمــة في طــب والحکمــة) هــەروەها (سمرقندی) لە کتێبی (تنبیه الغافلین -ص٧٥) دەڵێــت: ان دخـول نـسب بـین الیبوسة والرطوبة والحرارة والبرودة یمرر اخلاقیة الانسـان بحیـث یقـول (..فمـن یبوسه العزم ومن الرطوبة اللین ومن الحرارة الحدة ومن البرودة الاناه فـإن زاد واحد منها او قل دخل الفساد).

---

* بنەچەی ئەو رایە لە سەردەمی ئەرستۆ وە دێت، ئەسکەندەری مەکدۆنی پرسیارێکی ئاراستەی مامۆستای خۆی ئەرستۆ کردو تیایدا هاتبوو: من چی بکەم لەگەڵ خەڵکی ناوچەی بابل (عێراقی ئێستا) کە هەردەم لە گۆڕانو بێ بەڵێنین؟ لە وەڵامدا ئەرستۆ وتی: لێیان گەڕێ ئەوانە چاك نابن چونکە سروشتو تەبیعاتیان وەك ئاوو هەواکەیانە (واتە ژینگەکەیان)کە خێرا دەگۆڕێت لەوپەڕی سارد بۆ ئەوپەڕی گەرمو پێچەوانەش .

- داڤید هیۆم: له (مقالة عن طبیعة البشریة) نزیك دەبێتەوە له راستی تەبیعەت به نزیك خستنەوەی له دەروونو ئەو گۆرانكاریانەی بەسەری دێت.
- ئوگست كۆنت: تەبیعاتی بەشەریش هەروەك قۆناغەكانی كۆمەڵایەتی هەر تاكێك بەسێ قۆناغ دەروا: ئاینی، فەلسەفی، علمی واقعی.
- ئەرنست باركر لە كتێبی (اخلاق القومیة) و زۆربەی نەتەوەگەریەكانی جیهانی تەبیعات دەدەنە ئینتمای نەتەوایەتی.

**فكری ئیسلامی** زۆر رون دەروانێتە تەبیعات و ناخی مرۆڤ لەژێر ئیرادەی خۆی، پێی وایە نەگۆرو زگماكیش نیە، بەرەبەرە لە ژینگەو خێزانیو كۆمەڵو جیهان وەری دەگرێ، واته شایەنی چاكردنو خراكردنی هەیە. ـ

ناخی مرۆڤ وەك هەموو بەشەكانی بوونەوەر لەدوو دژ ( دیاد -جووتە -زوجی) ﴿سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنْبِتُ الأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لاَ يَعْلَمُونَ﴾ پێك هاتووە:

**لایەنی یەكەم:** لایەنی دەروونیە (نفس) هەردەم ئارەزووی زاڵ بوونو دەست بەسەراگرتنو تێر نەبوونو سنور بەزانـدنو خوازیاری زۆرو تەمەڵوكو جنسو دەسەڵاتو خۆ دیارخستن.. بەكورتی لایەنی سەلبی مرۆڤە (النفس الأمّارة بالسوء) لایەنی مادیو شەهوانیەكەیە كه زیاتر بەلای دڕندایەتی مەیل دەكا.

**لایەنی دووەم:** عەقیدەیە، یان هەندێ جار به (ئەخلاق) تۆماری دەكەن یان بەگشتی به (عەقل)ی دروست دەری دەبرن، گرنگ ئەوەیە لەدژی بەرەی یەكەمە، عەقڵە (یان عەقیدە) دەبێتە هێزی رێ گرتن لەو داخوازیە بێ سنورانەی (دەروون)، ئەو دوو لایە نە، ئەو دوو دەزگا دژ بەیەكە لەناخی هەرتاكێك هەردەم له جەنگێكی بێ دانوستانن بەشێوەیەك ئەگەر عەقڵی دروست بەتەواوی سەركەوت ئەوا مرۆڤێكی میان رەوو رەووشتداری ئیجابی لێ دەردەچێ، ئەگەر دەروونیش سەركەوت ئەوا مرۆڤێكی دڕندەی بەدرەوشتی سەلبی لێ دەردەچێ بۆیە (ابوبكر) دەڵێت: (طوبى لمن كان عقله امیرا، وهواه اسیرا.. ویل لمن كان هواه امیرا

وعقله اسيرا).

بەکورتی هەموو مرۆڤێك لەو جیهانە لە نێوان ئەو دوو ئەنجامە دایە، واتە سروشتو ئەبیعاتەکانیشی ئەوەستێتە سەر ئەنجامی ئەو جەنگە یان هاوسەنگیەکانی.

رای جیاجیا لەو بابەتە:

- ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا، فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا، قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا، وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا﴾، واتە: هەردوو لایەنی دژبەیەکی لەناخی مرۆڤ شین کردوە.
- {ان الله خلق الانسان وركب فيه العقل و الشهوة، وخلق الملائكة وركب فيها العقل، وخلق البهائم وركب فيها الشهوة، فمن غلب عقله على الشهوة فهو أعلى من الملائكة، ومن غلبت شهوته على عقله فهو أدنى من البهائم*} (فەرموودە).
- ابن عباس: ان في ابن آدم نفساً وروحاً بينهما مثل شعاع الشمس، والنفس هي التي بها العقل والتميز، والروح هي التي بها النفس والتحرك، الا ان النفس والروح يتوفيان عند الموت في حين ان النفس وحدها هي التي تتوفى عند النوم.

هەڵبەتە مرۆڤە شەهوانیەکان (کە دەکا دەروونی زاڵ ترە بەسەر عەقلی) ئەوا بێ سوودتریش دەبێت لەگیان لەبەر، چونکە ئەو سودێکی هەر هەیە، کەچی ئەو مرۆڤە تەنها دەبتە بارستاییەك لە سەلبیات بۆیە لە قورئانی پیرۆز لە دۆخی وادا وەسفی مرۆڤ بە (...كالانعام بل أضل) دەکا.

- سـەعید نورسی: لە کتێبی (الایمان وتكامل الانسان) دەڵێ: (لایەنی جەستەیی و دەروونی بە ١٠٠ پلە لە خوار ئاژەڵە، بەڵام لایەنی مرۆڤایەتیەکەت ئەگەر بە پەروەردەی ئیسلامی تەواو کرا ئەوا جیهانێکی بالایە.

* بۆیە لە قورئان کاتی مرۆڤی بەد بە ئاژەل دەشوبهێنێ بەوە ناوەستێ و دەڵێ: (..كالأنعام بل اضل..)

- ابن عدی لە (تهذیب الاخلاق) دەڵێ مرۆڤایەتی بەندە بە هێـز و دەسـەڵاتی لایەنی دەروونی.
- فارابی لە (کتاب الملة) دەڵێ: لەکاتی دەروون زاڵ بوون بەسـەر عـەقڵا ئـەوا هەم کۆمەڵگایەکی نەفام وهەم سـەرۆکەکەش نەفام دەبێت.
- لە مانای بیـنای کۆمەڵایـەتی هەریەکـە لـە (میرث) لـە کتێبـی (عناصـر التنظیم الاجتماعی)و (براون) لە (العلم الطبیعی للمجتمـع)، (میرۆخ) لـە (علـم انثـروپولـوجی بریطـانی) بەشـی هـەرە زۆری.. وانـابینن کـە بینـای کۆمەڵایەتی بیـنایەکی ژێرخانی ئەخلاقیە.. دووری دەخەنەوە لەناخی مرۆڤ و هەریەکە پێناسی سەیر سەیریان هێناوەتەوە بۆ ئەو بینایە کە لێرە مەودانیە هەمووی تۆمار بکەین.
- بەهـەمان شـێوە (موسـوعة العلـم الاجتمـاع) هـەروەك زۆربـەی زانایـان‌و فەرهەنگە عەلمانیەکان چاکردنی تەبیعاتی داوەتە کێشەی کارو کاسبی.
- ئـەفلاتون: جیـاوازی نێـوان شـار و هـاووڵاتی گوایـە لـەو (متراجحة= in equility) هاتووە، شـاکان عـەقڵیان زاڵە بەسـەر دەروون بەڵام هاووڵاتی بـە پێچەوانەوە..
- (معجم الکنوز..) العقل عقال النفس.
- رسائل (ابن سینا): دادگەری بەندە بەزاڵ بوون بەسەر دەرووندا.
- لە ئەفسانەی یۆنانی کۆن (دەروون، نفس- psych-سایك) کـچێکی خـوای جوانیە (ئیرۆس) عاشقی بووە.. دوای شاردرایـەوە و هـەمرو خـەڵك حـەزی لێ کردووە.. (معجم دیانات و اساطیر العالم- ل۱٥۱).
- هەریەکە لە (لـسان العـرب-ابـن منظـور)و (موسـوعة الادیـان..)و چـەند فەرهەنگ‌و زانای تریش لەگەڵ زۆربەی موفەسیرەکانی قورئانی پیرۆز مەیلی ئەوەیان کردووە کە بەرەی دەروون هەردەم مرۆڤ پاڵدەدا بـەرەو جەمـسـەرێك ناوی (أنعام)یان لێ ناوە، بەرەی عەقیـدەش هـەردەم مـرۆڤ پاڵـدەدا بـەرەو

جەمسەرێك ناوی (أحسان) یان لێ ناوە کە نزیکە لە پلەی فریشتەیە.

- کەمتر زاناو فەیلەسوفانی ڕۆژئاوا هەستیان بەو بابەتە گرنگەو سەرچاوەکانی کردووە، بەڵام بەشێکیان هەیە لەو بارەیەوە دواون کە چۆن دادگەریو چاکسازیو مەدەنیەتو ئارامی بێتە دی.. لەو بارەیەوە (سپنۆزا) لە (رسالة في لاهوت والسیاسة) دەڵێت: (بۆ ئەو مەبەستە دەبێ هەموو ڕێنماییەك بکەوێتە ژێر کاریگەری عەقڵ بەتەنها، بەر لە دەروونیش بگرین کە دەبێتە زیان بۆ خەڵکی تر).
- هەڵبەتە مارکسیەکان ئەو جەنگە لەوێ نابینن بەڵکو بۆ (مولکیەت) و فاکتەری ئابوری دەیگێڕنەوە.
- لیبرالیەکان: تەواو ڕێشمەی لەسەر دەروون کردۆتەوە، لە وەڵامی پرسیاری (اتتخذ الحکم هواکم..) دەڵێن: بەڵێ!
- هەڵبەتە ڕای جیاجیاش هەیە لەبارەی ئەو شوێنەی کە لە لەشی مرۆڤەو بووەتە سەرچاوەی تەبیعاتو چاکردنەکەشی، وەڵامەکانی هەمان هاوشێوەی وەڵامی سەرچاوەکانی بارو تەبیعاتی کۆمەڵە بەگشتی، مارکسیەکان کە پێیان وایە ئابووریە پێشیان وایە ئەو سەرچاوەیە لە لەشی مرۆڤ گەدەیە، بۆیە ئەگەر باری (گەدە) چا بکرێت ئەو مرۆڤەش چا دەکرێ، بەهەمان شێوە مەدرەسەی جنسی دیارە ڕایەکەیان چاکردنی مرۆڤ لە چاکردنی ئامرازی جینسی دەبینن، مەدرەسەی نەتەوایەتیش پێیان وایە خوێنی پیس نەبێت و تێکەڵی ڕەگەزی تر نەکرێت هەروەك ڕای بزوتنەوەی شۆڤێنیو تۆرانی و نازی و فاشی و بەعسی وزایۆنی.. زۆری تر.

لە فکری ئیسلامیشدا.. ئیازو جەو جۆڵە عەقلیەکانە واتە ئەگەر عەقل بەدروستی ڕێکخرا ئەو سەرچاوەیتی ئەگینا هەریەکە لە گەدەو جنسو خوێنو پێستو زمان.. تەنها شێوەن نەك جەوهەرو ناسنامە، ئەوەی سەرکردایەتی دەکا عەقڵە.. ئەگەر عەقلیش سەرکردە نەبێ ئینجا ڕاستە بۆ هەر مرۆڤێك ئەندامێك

دەبێتە بنچینە لەوانە و زیاتریش.. لێرەش دەبێ جۆرە دادگەرییەک هەبێ تابێ عەقڵ دەروون زیندانی بکا، پێویستە مافی خۆی بداتێ، بەڵام دەسەڵاتی نەداتێ، وەک ئیمام غەزالی دەڵێ: (ان الأعتدال هو الميزان لجميع السلوك، والخروج عن حد الإعتدال الى الإفراط والتفريط هو مصدر الأمراض النفسية..)

## جەنگی نێوان دەروون و عەقڵ:

جەنگی نێوانیان تەن بەتەن نیە، کارتێ کەرەکانی دەرەکی لە باری کۆمەلایەتی‌و ئاستی زانیاری‌و نەریت‌و دەوروبەرو هێزی پەروەردەو جۆری حوکم و باری سیاسی و هەڵس‌وکەوت و سلوکی زاناو بەرپرسان و رای گشتی‌و راگەیاندن‌و ئاین .. بە ئیجابی‌و سەلبی بەشدارن لەو جەنگە، ئیتر بە گشتی لە کۆتاییدا هەندێ فشار لەرێی رای گشتی بە ئیجابی‌و سەلبی دروست دەکا لەسەر تاک کە رێ لە (دەروون) بگرێ هەموو شت نەکا کە بە شێوەی: عەیبە، مرۆڤایەتی، لومە لائم، نەریت، بەزەیی، :.گوزارش دەبێت، هەر چەندە بەشێك پێیان وایە ئەو نشارانەش ئەڵقەیەك لە کۆت و زنجیر زیاد دەکا لەسەر مرۆڤ لەوانە مدرسەی لیبرالیزم، وجودیەکان، (فرۆید) لە هەندێ ئەدەبیاتی کوردیش ئەو رایە هەیە (بروانە شیعرەکانی بێکەس لەبارەی عەیبە)، هەروەها پێچەوانەکانیشی هاندەری دەروونە لەوانە (گوێ مەدێ، عەیبە نەماوە، هەموو خەڵك وا دەکا، مەبدەئیات‌و دادگەری و هەق نەماوە، هەرکەسە بۆ خۆیەتی، ..) بۆیەش لە فکری ئیسلامیدا کە تاوانێك دەکرێ بە تەنها لە ئەستۆی بکەرەکە نیە ئەگەر بارودۆخی دەوروبەرەکەی بەستاندەر نەبێت، ئەو کەسە دەستی نابڕێ لەسەر دزی کاتێ لە وڵاتەکەی نادادگەری و باری ئابووری پەروەردەیی خراپ بێت.

بەڵام بۆ رێگرتنی یەکجاری لە خراپەو کپ کردنەوەی تەوژمی دەروون و هەڵمەتەکانی ئەوا تەنیا بە ئایینی ئیسلام ئەو جەنگە یەکلا دەکاتەوە لە قازانجی عەقڵ، بەهۆی لێپرسینەوەی دوا رۆژ، هەر بۆیەش (بووینە کۆلەگەیەك لە ئیسان)،

ئەو بڕوایە وا دەکا هەم عەقیدە زاڵ بێت بەسەر دەروون و هەم چاودێرێکیش دروست بکا، ئیتر بینای کۆمەڵایەتی راستەقینە لێرەوە دروست دەبێت، مانای وایە "ئیمان" هەر مەسەلەیەکی شەخسی نیە لە نێوان خۆت و خودا نیە وەك ئاینەکانی تر، بەڵکو فاکتەرێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری ..تەواوی ژیانە، نموونەی کۆن و نوێ و واقیعیشمان لەبەر چاوە کە چۆن مرۆڤێکی سەلبی بەهۆی ئەو ئاینە بووە بە ئەستێرەیەکی پرشنگداری کۆمەڵ و خۆنەویست لە پێناوی ژیانی خەڵکی ترو مرۆڤایەتی و دوا رۆژ گیانی خۆی کردۆتە بەراگێڕ، لەو سەردەمە تاکە رێبازێکە پێچەوانەی رێبازەکانی تر سەرو ماڵی لە پێناو بیرو بڕواکەی دادەنێ، کەواتە مانای راستەقینەی (بینای کۆمەڵایەتی، مەدەنیەت، شارستانی، دروست کردنی مرۆڤ، پێش کەوتن، مافی مرۆڤ، مافی ئافرەت، ..) لەوە دێت کە ئەو کۆمەڵە یان ئەو تاکە یان ئەو لایەن و سیستەمە چەندە عەقڵی زاڵ ترە بەسەر دەروونی، یان چەندە دەتوانی و توانیویەتی یارمەتی بەرەی عەقڵ بدا دژی بەرەی دەروون، شانۆی راستەقینە ئەوێیە، ئەو بەرنامانەی تا ئەو رادەیە روو نەچوویتە ناو سیاسەتو فکرو ئینتمای سیاسیو مەدرەسیشی هەبوو بێت ئەوا یان نەفامەو چاولێکەریو عەوامیەتە یان بۆ بەرژەوەندیو مەبەستی شەخسی یە، با هەر ناویشی رەوشەنبیرو سیاسەتمەدارو نووسەریشی هەڵگرتبێ، لێرەدا ئەو رایەی (جان کوریس) دەبێ بەهەند هەڵگرین کە پێش سەدەیەك لەکتێبی (حقیقة عالم الملموس) وتبووی ناچمە ناو سیاسەت هەتا لە نهێنی گەردوون چاك نەگەم.

سەرکەوتنی عەقڵ مانای وایە ئەو مرۆڤە پێش کەوتووخوازە، مرۆڤ پەروەرە، بەهاناو دادپەروەرەو بە ئەمەك و بەڵێن و خۆنەویست و بەرژەوەندی گشت ویستو وڵات پارێزە...

خۆ ئەگەر دەروونیش زاڵ بوو بەسەر عەقڵ ئەوا دەروون ناوەستێ بەپێی تواناو سنوری دەسەڵاتی تا پلەی (فیرعەون) ئارەزوو بازی و زۆرداری دەکاو تێریش

نابێت وەك سیفەتەكەی (دۆزەخ) هەر دەڵێ (هل من مزید)، (ئیتر ئـەو مرۆڤـە تەنها بۆدیەكە و ئەو دەروونە بەدوای خۆی رای دەكێشێ بەپێی یاسـاكانی خـۆی نەك یاسـای عـەقڵی و مرۆڤایەتی)، گوێڕایەڵیش دەبێت دیـسان بەپێی دەسـەڵات و توانای، ئەگەر دەسـەڵاتدار بێت ئەوا سـتەمكارە، داگیركەرە، ماف خـۆرە، تازیـە، فاشیە، دڕندەیە، .. ئەگەر دەسەڵاتیش نـەبێت ئـەوا خـۆفرۆش دەكـا، خیانـەت، ئەڵقە لەگوێی، دووڕوویی، دوو زمانی، بێ سەوابتی، بێ متمانەیی، بێ بـەڵێنی، شایەدی بەناحەق دان، دڵی نەخۆشـە، عەوامـە، بـەپێی ئـەو كـەم دەسـەڵاتیەی زۆرداره بەكەم ترین شەپۆڵ لار دەبێتەوە، .. بەد رەوشتە.. تاد..

واتە جۆری شـەخسـیەت، جۆری تەبیعات، رەوشتی، پلەی مرۆڤایەتی..

دەكەوێتە سەر چارەنووسی ئەو هاوكێشەوجەنگە، نەك رەچەڵەك و چینایەتی و نەژادی وەك تێڕوانینەكانی فاشی و نازی و تـۆرانی و بەعـسیزم..هتـد. هەڵبەتـە هەریەكە لە دەوروبەرو ژینگەو رەچەڵەك و ئاستی زانیاری و باری كۆمەڵایـەتی و چینایەتی، باری ئابووری، هۆكارەكانی تری سیاسـی و..هـەمووی كاریگەریـەكی هەیە.. بەڵام لە كۆتاییدا (سەرەنجامی ئەو جەنگـە)یـە رەفتـاری تاكەكـە دیـاری دەكات، هەڵبەتە ئەو بۆچوونە بەرفراوانەی (رۆژئـاوا) گوایـە (ژینگـە و وەرەسـە بەرپرسن لە تەبیعات و شـەخسـیەتی.. هەڵەیە)، ئەوەی ناوی لێ نراوە (طبع) یـان (غەریزە) یان تـەبیعات دەرمـانی نیـە..ئەوانـە لـە فەرهـەنگی ئیـسلام راسـت نین..تەبیعاتیش وەك (ئیمان) لە جووڵەدایـە لـە زیادوكـەمی دایـە، بۆیـەش لـە قورئان باسی سێ جۆر (نفس)ی كردووە، (الامـارة)، (اللوامـة) ( المطمئنـة) هـەتا هەندێ لە موفەسیرەكان مـەیلی ئـەوە دەكـەن كـە دەڵـێن ( عومـەر) توندو ( ابوبكر) نەرمە.. گوایە(طبـع)یـان وایـە.. تـەخێر، ئەوانـە لەسـەر ئـەخلاقی پێغەمبەرن د خ، بۆیە دەبینین ( ابوبكر) لـەكاتی پێویـست چـەندە توند بـووە جەنگی كردووە.. هـەتا ئـەو كەمـە جیاوازیـەی نێـوان ئەوانـەش لـە تـەبیعات دەگەڕێتەوە بۆ ئەو فاكتەرەی سـەروو.

ئــیتر هــەموو مرۆڤێــك لــەو جیهانــە لــەنێوان دوو جەمــسەردایە، (مقاصـد الشریعة)ش ئەوەیە سنوری نێوان عەقڵ و دەروون بەستاندەری رێك خا كە (جهـاد الاكبر)ی پێ وتراوە، نەك تەرت و وێرانكردنی دەروون، هەروەك رێبـازی هەنـدێ ئاینی غەیرە ئیسلامی لە سۆفیایەتیش، سەرنج بدە (ابو حفـص) لـە جیـاتی رای سۆفیەكان بەكورت كراوەیـی ئەوەیـە :(مـن لم یـتهم نفسه علـی دوام الاوقـات ولم یخالفها في جمیع الاحوال ولم یجرها الی مكروهها في سائر أیامه كان مغـرورا، ومـن نظر الیها باستحسـان شيء منها فقد اهلكهـا)[1]، ئەوەیان رەت بوونـە (انفـراط)ە، هەروەك جەنگەكەی ئەفلاتون لەگەڵ (نفس)؛ ئــەخێر رەهبانیــەت و خــۆ ئەزیــەت دانی رەمەكی لە ئیـسلام دا نیە، جەنگی ئیـسلامی لەگـەڵ (دەروون) ئەوەیـە كـە دەروون بگێڕێتەوە سنوری خۆی، ئەو سنورەی كە كۆتایی دێت لە سـنوری تاكێكی تر ،واتە كاری شریعەت ئەوەیە سنوری یەكتر نەبەزێنن،ئەوەش لە لایـەن (دستور العلمـاء) پەیوەند بە ئەخلاق و حیكمەتەوە گوزارش كراوە، ستاندەرەكە ئەوپـەڕی حیكمەتەكەیە[2]، واتە جەنگێكی دائیم نیە مەبەستی چاكسازی ودروست كردنـی (نفس المطمئنـة)یـە، جەنگەكـە لـە قۆنـاغی (أمـارة بالـسوء)ە، ئەوكاتـەش نـە (نفس)ەكە خۆی نە خەڵكی تریش لە ئاسودەیی دانین.

## تەقەلای مەدرەسـەكان:

لەبەر گرنگـو چارەنووس سازی ئەو بابەتە زاناو مەدرەسەو پارتە سیاسـیەكانو هەتا دەزگای حكـومیش لـە تەقەلایـەكی بـەردەوامن بـۆ دۆزینـەوەی چارەســەر بەزەحمەتیش دەست دەكەوێ، چونكە لە قوڵاییەكە تیایـدا بابەتـەكانی فەلـسەفەو زانستو سیاسەتو دەروون ناسیو كۆمەڵناسیو ئاینو مەنهەجیـشی لێ بەیـەك

---

[1] ابو القاسم القشیري- (الرسالة القشیریة في علم التصوف)، هەروەها بۆ زیاتر سەرنج بدە (موسوعة مصطلحات التصوف الاسلامي)-مادة-نفس، نفس الامارة،..

[2] موسوعة المصطلحات جامع العلوم- قاض الاحمد نكري-مادة-أخلاق.

دەگەنو تۆرێکی ئاڵۆزی تێنك چرژاوی لێ دروست دەبێت، هەر بۆیەش هەر تەقەلایەك بەدوای ئەو چارەسەریە بێت بە هاوتاو بەدیلی ئاین دەژمێردرێت، جا چی لە توانادایە یان نا، ئەو بابەتە بەرەبەرە لەو سەردەمە گرنگی وەردەگرێ لە هەموو بوارەکان لەگەڵ بەرەو عمولەمە چوونمان زیاتر، بۆیە زۆر جۆرە رێگە و ئامراز بەکاردێ بۆی، ئیتر ئەو توێژینەوانەی کۆمەڵگەی مەدەنی، کۆمەڵگەی لیبڕاڵی، کۆمەڵگەی شیوعی، کۆمەڵگەی یۆتۆپیەکانی کۆن و نوێ.. هەمووی بەشێکە لەو تەقەلایانە، زۆربەی ئەوانە (بە مارکسیەکانیشەوە) لێرەوە بە پێی دووریان و نەگەیشتنیان بەو ناخەی مرۆڤ رایەکی هاوبەشیان بۆ دروست بووەو گوایە مرۆڤ بە پێی باری مادی تەبیعاتو کەسێتی و ڕەووشت و چاکەو خراپەی دیاری دەکرێ، بەڵام هەر مەدرەسەیەك بەرێگە چارەی تایبەتی خۆی، رۆژئاوا پێی وایە سەربەستی دان بە مرۆڤ و راهێنانی لە پابەندی بە یاساو تێرکردنی و بەرەڵایی جنسی (راسلیانە) ئەوا کێشەکانی کەم دەبێتەوە..، هەر چەندە ئامارەکانیش بەردەوام پێچەوانەی ئەو ئەنجامەن، هەر لە نموونەیەکی سادە لە کاتی (کوژاندنەوەی کارەبای کالیفۆرنیا لە ماوەی سەعاتێکدا نزیکەی ٧٠٠ تاوان کرا).. هەروەها لە رووداوەکەی کاترینای ٢٠٠٥!.

هەرچی مارکسیەکانیشە.. پێیان وایە هەر مولکیەت سەرچاوەی هەموو سەلبیاتەکانە، جا بەپێی قەبارەی ئەو مولکیە مرۆڤەکە سەلبی و ئیجابی دەبێ، هەر لەوێش چاك دەبێ بەهۆی بن بڕکردنیو نەهێشتنی یەکجاری مولکیەت کە لە شیوعیەت دێتە دی، .. ئەوەش مێژوو و رەوتی کۆمەڵگە تەزکیەی نەکردو شکستی هێنا.

هەرچی تەقەلای حزبە سیاسیەکانو دەزگای ئیداریو سیاسیو زانستیو مەدەنیەکانیشە، هەر بەردەوامن بەپێی پێناسی سیاسەتو دەوڵەتیش لەو تەقەلایە، جم و جۆڵی سیاسی هەر حزبێك وەك (ئیدعا چاکسازیە) هەریەکەش پشت بە مەدرەسەکەی دەبەستێت لەباشترین دۆخیدا، ئالێرەدا مل ملانێیەکی

شەریفانەو زانستیانە دەکەوێتە مەیدانی سیاسی ئەگەر هەموو لایەك بە ڕاستگۆیانە پابەند بن پێی ، ئاخۆ کام لا دەتوانێ بە هۆی بەرنامەسیاسیەکانی زیاترین خەڵك پەروەردە بکاو ڕێگی بخا لە سەلبیەوە بەرەو ئیجابی، ئەوە ئەك هەر ئەرکێکی ئاینی و سیاسی و حزبیە بۆ کوردستانی خۆمانیش یەکجار گرنگە لەو قۆناغەی ڕزگاریدا کە پێویستت بە دروستکردن و بیناکردنی مرۆڤی خۆنەویست و نەدۆڕاو هەیە، بەڵام زۆر بەڕوونی دەبینین ئەو جۆرە ئێستا حزبی و سیاسیانە ئەنجامەکانیان بەچی دەگا، لەو بەرنامەیەی گۆڕانکاری و چاکسازی، بە تایبەتی ئەو حزبانەی خاوەن ئایدیۆلۆژیاو مەبادیئێك نین، ئەوا زیاتر دەیڕوخێنن نەك بینا، کەواتە ئێستا دەبێ ئەو (نهێنیە گرنگە) شی بکەینەوە (کە پەیوەستە بەو بابەتە) بۆچی لە هەڵبژاردنێکی سەربەست لە نێوان کۆمەڵێك حزبی دەسەڵاتدارو بێ دەسەڵات، دیموکراسی‌و سوشیالیستی، شیوعی‌و ئیسلامی‌و نەتەوەیی و لیبڕالی... لەجیهانی ئیسلامیدا زۆربەی حزبە ئیسلامیەکان دەنگ دەهێنن، لە شوێنێکی وەك جەزائیر لە ۲٦\دیسمبر\۱۹۹۱ لە (۸٦٪)ی دەنگ بۆ بەرەی ئینقازی ئیسلامی هات، نهێنیەکە ئەوەنیە کە لە توێژینەوەکانی زۆربەی سەنتەرە ڕۆژئاوایی‌و نووسەرە عەلمانیەکانی ناوچەکەو کوردستانیش هاتووە (گوایە) دەگەڕێتەوە بۆ خراپی باری ئابووری و فێرکردن و خزمەتگوزاری.. یان داپلۆسین، جا ئەگەر ڕاستە پرسیارە گرنگەکە ئەوەیە بۆچی ئەو هۆیە نەبووە دەنگ هێنانی (جبهة القوة الاشتراكية-حسين ايات احمد) یان (منظمة الشيوعية العمالية- لويزه حنون) یان حزبە لیبڕالیەکان و سوشیالیستەکان و نەتەوەگەریەکان یان حزبی دەسەڵاتدارلە جزائر...

وەك توێژینەوەیەکی زانستی بەو شێوەیەی خوارەوەیە نەك باری مادی:

لەسەروو کەمێك باسی ئێستای سیاسی نوێ کرا کە وەك جاران ڕەمەکی و فریودانی نیە.. خەڵکی لە ڕوانگەو چاویلکەی چەند مونەزیرو سەرکردەی حزبەکەی جیهانو ناوچەکە ببینی، .. نەخێر، ئێستا لە عەولەمەدا هەر کەسەو

راستەوخۆ تێکەڵی جیهان بووەو هیچ نهێنیەکی وای لەبەردەم نامێنێ، ئیتر پەردەی هەڵخەڵەتاندن دادەماڵێت، ئەگەر ئەو حزب و لایەنانە لەسەر مەبادیئێکی راستەقینە نەرواو گۆتەو کردەی یەك نەبێت دەماو دەست ئاشکرا دەبێت و نیازو مەبەستەکانی سەرکردەو بەرپرسەکان سەر ئاو دەکەون، .. ئەوە لە لایەك، لە لایەکی تر سەرچاوەی سەلبیاتی مرۆڤ و کۆمەڵیش (وەك لەناخی مرۆڤ بۆمان دەرکەوت) پێگەو شوێنێکی مادی نیە لەناو لەشی مرۆڤ تا بە (نەشتەرگەریەکی پزیشکی) دەری کێشێ، بەڵکو لایەنێکی رووحیەو تەنها بە پرۆسەی روحی چارەسەر دەبێ، ئالێرەدا توانای دەزگاو حزبە عەلمانیەکان بۆ چاکسازی پەکی دەکەوێ و کەمەری دەشکێ، ئیتر هیچ دەورێکی سیاسی و چاکسازیو کۆمەڵایەتی راستەقینەی بیناکەری نامێنێ، هەتا لە پێناسی مانای سیاسەتو حکومەت و دەسەڵاتی مەدەنی و دیمکراسی بێ کار دەمێنێتەوە مەگەر تێکەڵدان، ئەوەی دەوری دەمێنێ دەزگاو زانایانی ئاینی و لایەنە ئیسلامیەکانە دەتوانن لە رەهەندی رووحیش کاری سیاسی و چاکسازی بکەن، ئیتر مرۆڤی نوێ چارەنووسی خۆی لەو مدرسەیە دەدۆزێتەوەو دەنگی دەخاتە پاڵ دەنگی ئەگەر ئازادی هەبێ، ئەوەش تەواو لەگەڵ توێژینەوە و رێساکانی سەردەم یەك دەگرێتەوە کە زۆربەی زانایان هەتا (فرۆید و بافلوڤ) ئەو قەناعەتەیان هەیە کە پەیوەندی مرۆڤایەتی لاواز دەبێت لەگەڵ زیادبوونی پەیوەندی مادی، هەروەها چەند یاسایەك هەیە زۆربەی فەرهەنگەکانی جیهانی دەست بە دەست تۆماریان کردووە بەناوی (القوانین الاجتماعیة الکونیة unvarsal social law) کە دەڵێت: (تزداد نسب الجرائم في المجتمعات التي تلعب فیها الدین دورا هامشیا و ثانویا)[1].

بەو شێوەیە زانایانی جیهان مەیل دەکەن ناو لە سەدەی (٢١) بنێن سەدەی ئاینیو کشانەوەی عەلمانیەت، نەك هەر لە جیهانی ئیسلامی ئەو دۆخە بەرەبەرە

[1] بۆ زیاتر سەرنج بدە (موسوعة العلم الاجتماع) ل٥٠٦.

لە ڕۆژئاواو جیهانیش وا تێبینی دەکرێ، هەر ئەو ڕەهەندو هۆیەشە کەوا لە لایەنە عەلمانیەکان بکا شەڕە دەسەلاَت بکا بەدەربڕینی جیاجیا.. وەك بەناوی تیرۆر، مل ملانێی شارستانی، پاراستنی ئاسایش‌و دژی دیکراسی‌و ئازادی‌و نامەدەنی.. ئەوەش هەر بەشێکە لە مل ملانێی مێژوویی نێوان خێرو شەڕە..

# ( ١٤ )

## چاكسازی كۆمەڵ إصلاح الاجتماعي Society reform

بابەتی هەرە ناوەندی ئایین و فەلسەفەی كۆمەڵایەتی و تیۆری سیاسی و سیستەمی ژیان و شارستانیەتە، مەبەست لێی چاكردنی پەیوەندیەكانی كۆمەڵە لە پەیوەندیەكی ستەمكاری بەرەو دادگەری، .. ئیتر زۆربەی بابەتەكانی وەك بنیای كۆمەڵایەتی، گۆڕانی كۆمەڵایەتی، گەشەی كۆمەڵایەتی، .. دەگرێتەوە، زۆربەشیان راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ لە بەشەكانی رابووردوو باس كران، ماوە هەندێ پرسیاری بنچینەیی لێرە بووروژێ بۆ دۆزینەوەی وەڵامی پێویست و هەم پەیوەندی چاكسازی تاك بە كۆمەڵیشەوە، پرسیارە بنچینەییەكە لێرە ئەوە: ئاخۆ ئەگەر تاكەكانی كۆمەڵگەیەك چاك بوون مەرجە كۆمەڵگەكەش چاك بێت؟ وەڵامی جیاجیات.. دەست دەكەوێ، بەشێك پشت بە نمونەیەك دەبەستن كە لە كۆنەوە دروشمێكی شارەوانی مۆسكۆ هەبووە، تیایدا هاتووە.. ئەگەر هەر ماڵەو پێش دەرگای خۆی خاوێن كردەوە ئەوا شارێكی خاوێنمان دەست دەكەوێ.. ئەوەیان راستە چونكە زەویەكی رووتەختەو یەك رەهەندە، بەڵام لە (تەعمیما) هەڵە دەردەچێ نەك بۆ كۆمەڵ هەتا بۆ بینایەك راست دەرناچێ، واتە تەنها مەرجی بینای راست و دروست ئەوە نیە خشتەكانی راست و دروست و بە ئەندازە بێت.. نەخێر چونكە ئەو جارە دەبێتە دوو رەهەند:

١ - رەهەندی (پانی و درێژی).

٢ - رەهەندی بەرزی.

هەرجی كۆمەڵگەیە پێك هاتووە لە كۆمەڵێك رەهەندی مادی و رووحی.. واتە

نموونەیەکی یەك ڕەھەندی میکانیکی نابێتە بەڵگە بۆ واقعێکی ئاڵۆزی فرە ڕەھەند، ھەروەھا لە کۆنەوەش (ابن طق طقي) لە کتێبی (الفخر في اداب السلطانية) تێبینی کردبوو کە پاك بوونی دەروونی تاکەکان بەس نیە بۆ پێکھاتنی کۆمەڵگەیەکی پاك، چونکە ڕەھەندی نوێی تێ دەکەوێ لە پەیوەندی و حوکم و بەرژەوەندی گشتی و ڕای گشتی و..ھتد، لە کۆلتووری کۆنی فکری بەشەریش (ئەرستۆ) ئەو تێبینیەی کردبوو وەك (ابن طق طقي) کە چاکردنی کۆمەڵ زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ جۆری حوکم، بۆیە ئێستاش بەشێك زیاتر داکۆکی دەکەن بەھاوشێوەی (فەرمووەدەکە) [1] و دەڵێین: (الا ان في المجتمع مضغة اذا فسد فسد سائر أجزائه وإذا صلح صلح الكل ألا وهي الحكم).

کەواتە چاکردنی کۆمەڵ بە کۆمەڵێك رووکار دەکرێ، نەك یەك، لە تاك و لە کۆمەڵ، لە بنکەو لە سەروو، لە کردەو گۆتە، ..

ئەوەش پرسیاری نوێ‌دروست دەکا ئاخۆ ئەو فاکتەرانەی کۆمەڵ دەگۆڕێ چیە ھەر لە فاکتەری ئابووری و دەروونی و ئەزادی و خوێن و ھێزو ژینگەو عەقڵی و مادی..ھتد

ئەزموونەکانی کۆن و نوێ بەتایبەتی لەو سەردەمەدا تەواو ساغ بۆوە کە کۆمەڵگەی چەق بەستوو و بەنج کراوەکان بەباری مادی بەھیچ فاکتەرێك ناجوڵێ تەنھا بە ئاین نەبێت کە دەتوانێ رووبچێتە ھەمو ئاخەکان و ھەمو ئەو بۆندە یەکبەستیەی کە کۆمەڵگەی پێك وە بەستیوە، تەواو بە پێچەوانەی ڕایە کلاسیکیەکان دەربارەی ئاین کە زۆربەی بەڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ مانایەکی لە جۆری مانا مارکسیەکەی (الدین افیون الشعوب) پێدابوو.. یان وەك فاکتەرێکی بەجێمار لەناو تەپوتۆزی مێژوو..

[1] ئەوە لەو فەرموودە وەرگیراوە : (الا ان في الجسد مضغة اذا فسد فسد سائر الاجزاء واذا صلح صلح سائر الاجزاء الا وهي القلب)

(١٥)

## دیالـۆگ حـوار diaiogue

بەپێی چەندین سەرچاوە لەوانە (موسوعة العربیة المیسرة- مادە: دیالوك) دیالۆگ وشەیەکی عەجەمیە بە بەستەی دوورقژلی وتراوە، لەناو کوردیش هەبووە، چەمکێکی کۆنی ئاینیە لەزۆر شوێنی قورئانی پیرۆز هاتووە[1]، مێژووی یەکەم دیالۆك بۆ پێش گەردوون دەگەڕێتەوە، کاتێ خوای گەورە دیالۆگی لەگەڵ فریشتەکان کرد لەبارەی دروست کردنی گەردوون و ژیان و مرۆڤایەتی، دیالۆگ چاکترین ئامرازی تێگەیشتنە، ماناکەشی بەگشتی (گفتوگۆ و وەڵام)[2]، یان لە هەندێ فەرهەنگ و سەرچاوەی تر بە "هونەری گەیشتن بەڕاستی"پێناس کراوە، ئەوەیان زیاتر لە (مقاصد الشرع)یشدا نزیك دەبێتەوە، دیاردەیەکی مرۆڤانەیە بە پێچەوانەی یاساکانی دارستان کەلەوێ دیالۆك تەنها مانای پەلاماری لێك مراندنە، بۆیە هەمو ئامرازەکانی کۆن و نوێی مرۆڤ بێ دیالۆگی مرۆڤایەتی هەروەك یاسای دارستان توندو تیژیو هەڕەشەو پەلامار بووە، زۆربەی نووسینەوەی کتێبە کۆنەکان لەسەر شێوەی دیالۆك (محاورە) بووە، یەکێ لەو سەرچاوە کۆنانە دیالۆگەکەی (کۆماری ئەفلاتون)[3] بوو لەسەدەی (٤-پ.ز)، لەناو کەلتوری ئیسلامیش ئەو جۆرە نووسینە باوی هەبووە، بە هەمان شێوە نێردراوەکانی ( · عیسی) بۆناو خەلکی ناویان (حواریون) بووە، واتە دیالۆك

---

[1] بۆ زیاتر سەرنج بدە (الحوار فی القران-محمد حسین فضل الله).

[2] بۆ زیاتر سەرنج بدە هەریەکە لە (موسوعە الادیان.ل٢٤٤، موسوعە العالمیە- مادە:حوار).

[3] بڕوانە: جمهوریة أفلاطون.

ئەسڵێکی گرنگی ئاینیە، لە فکری ئیسلامیشدا پانتایی دیالۆك گەلێ فراوانە هەتا جار وایە لەسەر (محال) دیالۆك کراوە لەگەڵ لایەنی بەرامبەر هەر چەندە لە قورئان وەسفی بە (شدید المحال) کردووە لەباری ئاسایی خۆی، ئیتر ئیسلام تەنها (تەبلیغ) نیە وەك بەشێك لە ئیسلامیەکانیش وای تێگەیشتوون زیاتر دیالۆگ و تێ گەیاندنی دانایانەیە، هەتا لەدەقیشدا دەبینین پێغەمبەر ﷺ چەندە دیالۆگی لەسەر موتلەقەکانیش کردووە نەك هەر لەگەڵ بێ بڕواکان لەگەڵ هاوەڵەکانیشی، لەگەڵ ئەو گەنجەی کە وتی زینا دەکەم تەنها پێ ی نەفەرموو ئەوە دەقی لەسەرە و ئەوا (تەبلیغم) کردی حەرامە.. نەخێر، کەوتە گفت و گۆ و وەڵام لە زەرەرو زیانەکانی کۆمەڵایەتی‌و کەسێتی خۆی هۆیە خراپەکانی بۆ ڕوون کردەوەو گەیشتە ئەنجام.

دیالۆگی زانستی ئەوە نیە وەك دەمارگیرەکان خۆی پێ ڕاست بێت و لاکەی تریش تەنها هەڵە، لەو بارەیەوە ئیمامی شافیعی بنەمایەکی لۆژیکی تۆکمەی داڕشتوە ودەلێ: (ڕای ڕاستم دەشێ هەڵە بێت و ڕای بەرامبەریشم -کە پێم هەڵەیە- دەشێ ڕاست دەرچێت)، وارێك دەکەون کە جارێ هیچ لایەك لەسەر هەق نین و بەهەردوو لا بەهۆی ئەو دیالۆگە دەیدۆزنەوە، (إبراهیم)یش لە دیالۆگەکانی لەگەڵ خەڵکیدا (کە بەدانایانەترین شێوەی کردووە) نەهاتووە یەکسەر بڵێ (خوای) من ڕاستەقینەیە و ئەوانەی ئێوەش پووچە، وترویەتی وەرن بەدوا بگەڕێین ڕەنگە ئەو ئەستێرە گەشە خوا بێت، دوای مانگ ئینجا ڕۆژ.. لە ئەنجامی دیالۆگەکە گەیشتنە ئەو ڕاستیەی کە خوای ڕاستەقینە دروستکەری هەموو ئەو شتانەیە.. واتە هەنگاوەکان بەو شێوە بووە:

یەکەم: هەردوولا ڕێکەوتوون جارێ ڕاستی بزرە.

دووەم: ئامانج لەو دیالۆگە هەبێت و دیواری (جمود عەقلیەکان) بشکێت.

سێیەم: لە واقعی چەوتی‌و نەفامی‌و بێ بڕوایی دەستیان بەدیالۆگ کرد لە ڕاستی‌و ڕووناکی‌و بڕواداری کۆتایی هات.

هەتا لە قورئانی پیرۆزیش هاتووە: ﴿وَإِنَّا أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَى هُدًى أَوْ فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾.

فیکری ئیسلامیو ڕێبازی خوایی لە کۆنو نوێشەوە بەدیالۆگ گەشەی کردوەو دەکا، لەبەر هۆیەکی سادە هەرچی ڕاستیەك -کە (قیمة المعرفة)ی پێ دەووترێ لە (فەلسەفەی زانیاری)دا- بدۆزرێتەوە ئەوا فکری ئیسلامی پێ پتەو دەبێت، بۆیە هەر دەروازەو فەزایەك کە ئازادی دیالۆگی لێ بڕەخسێ لە قازانجیەتی، تەنها ئەو ڕێبازو مەدرەسانە دژی ئازادی دیالۆگن کە لە فکردا دەست کورتو نەدارن، بۆیە ڕێکەوتنەکی گشتی هەیە کە مەمبەستی دیالۆگ لە نێوان دوو لایەن، دوو خەت، دوو شارستانی ..هەتا دوو کەسیش بێت ئامانجەکەی دۆزینەوەی ڕاستی نوێیە، بابەتەکە واگەشە بکا کە پاشایەکی لە زانیاری نوێ وەردەگرێ، بە پێچەوانەی (جدل-دەمەقاڵێ) کە ئامانج دیار نیەو هیچ لایەك بە تەرازووی (ڕاستیو ئەخلاقی) بۆ یەك ناسەلمێنن، هەروەك لە قورئانی پیرۆز دیسان باسی لە (جدل) دەکا لە سوورەتی (مجادلة)و جیاوازی لەگەڵ (دیالۆگ-حوار) دەکا ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا﴾، لە سەرەتادا (جدل) بووە لە نێوان پیاو و ژنەکەی بۆیە پێغەمبەر ﷺ بەشداری نەکردووە، تا هاتوونە سەر دیالۆگ (حوار) و وازیان لە دەمارگیری بەڕایەکانی خۆیان هێناوە ئینجا بەشداری کردوون ﴿وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا﴾، بەشێکی تر (جدل) یان (حوار الحاد) بەجۆرێك لە (لغو) دەژمێرن، پێیان وایە ئابتە ئامرازی ئیقناع بۆیە ئامۆژگاری مامۆستاو (داعیەکانیان) دەکەن خۆ لەو شێوازە بپارێزن، لە ڕۆژئاواو سیستەمی عەلمانیەتدا ئەو جیاوازیەی نێوان (جدل) و (حوار) نیەو تێکەڵی هەیەو هەبووە.. هەروەك زاراوەش یەك بنەچەی هەیە (دیالۆگە) یان (دیالکتیك)و (مادیة الدیالیکتیکیة).. هەر لەوە هاتووە، پێناسی گشتی دیالۆك لای ئەوانیش بە (هونەری گەیشتن بە ڕاستی) هاتووە بەڵام دیسان کێشە لەسەر (پەیوەندی دیالۆگ بە فەلسەفەی ڕاستی) دروست دەبێت، ئەوان (ڕاستی) بە

چەسپاوی و بەدەر لە جـم و جـۆڵی عـەقڵی حـساب ناکـەن، لەگـەڵ جـم وجـۆڵی زانیاری(حرکە المعرفە) تێکەڵی دەکەن (بۆ زیـاتر بڕوانـە فەلـسەفەی راسـتی لـەو فەرهەنگەدا)، بۆیە جگە لە (مەدرەسەی مارکس) ئەوانی تر هەریەکە بەشێوەیەك بە دیالۆگ قایلن ئەگەر بەکردەش جۆرێکی تر بێت، لە ئیسلام دا( لەبارى ئاسایی خۆی) دیالۆك چاکترین ئامرازی تێگەیشتنە، واشی پەیڕەو کـردووە، هـەر چـەندە لایەنی بەرامبەر لە کۆن و ئێـستاوە هەموو هێڵێکی سووری بەزاندووە کەچی ئـەو دیالۆگە وەرنەگەڕاود بۆ ناکۆکی بالآترو زیندانی و.. وەك ئێستا لە هەندێ شـوێن یاسای تایبەتیشی بۆ دەرچووە بەناوی جیاجیا، بەلاّم ئەوە مانای ئەوە نیە هەموو دیالۆگێك سـەرکەوتوو بێـت، بۆیـە لـە ئیـسلام دا مـەرجی تایبـەتی هەیـە بـۆ لایەنـەکانی دیـالۆگو گەیـشتن بەڕاسـتەقینە، مەرجـەکانیش پەیوەنـدی بـە کەسایەتی‌و ڕەچەڵەکی نەتەوایەتی‌و باری چینایەتی‌و ئینتماو بڕوا و بالآ دەستی.. نیە، بۆ هەموو کەس بوار هەیە بەو مەرجەی:

١-خاوەن بەرنامـە و زانیاریـەك بێـت ئـەگینا بـەخێرایی ڕێـساکانی دیـالۆك وەردەگەڕێ بۆ (جدل) وبێ ڕێزی.. ئالێرەدا (ئیمامی عەلی) وتوویـەتی: (دیـالۆگم لەگەڵ هەر زانایەك کردبێت سەرکەوتووینە، لەگەڵ نەزانیش هەر تـێ کەوتینـە). سەرکەوتن مانای دۆزینەوەی ڕاستی بۆ هەردوولا.

٢-خاوەنی ڕێبازێکی فکری‌و عـەقیدەیی‌و سـیاسی وابێت بەرژەوەندی گـشتی‌و مەبادیـەکانی لە سەرووی بەرژەوەندی تایبەتی بێت، بەدوای ڕاستی بگەرێت لـەو گەردوونە.

٣-مەرجەعیەت و تەرازووەکانی کتابێکی ڕاستەقینەی خوایی بێت.

ئەگەر ئەم سێ مەرجەی لێ نەسازێ دەبێتە (جدل)، هەروەك لە قورئانی پیرۆز باسی هەر سێ مەرج لەو ئایەتە هاتووە ((ومن الناس من يجادل في الله بغير علم ولا هدي ولا كتاب منير..))

مەرج نیە هەر سێ خاڵی سەرووی لێ بسازێ ئینجا دیالۆگ بکرێـت، ئـەخێر،

مەبەست لەوەیە ئەو شێوە دیالۆگەیە ئەمزۆك نابێت، نابتە (جدل)، لە راستیدا (جدل) بەمانا کردەو گۆتەییەکەی شێوازی عەلمانییە بۆ ئیقناع و (حوار)یش شێوازی ئاینییە بۆ تێبك گەیشتن، هەرچی مەدرەسەی شیوعیەتە- لەناو عەلمانیەتدا- دیسان تایبەتمەندی خۆی هەیە، کۆلەگە بنچینەییەکەی (دیالکتیکە-واتە-جدلی) وە بنەمای ناکۆکی (التناقض) بە (لب الدیالکتیك) وصف کراوە لەلایەن (لینین)[1].

بەراشکاوی پێیان وایە (جدل)ە هێزی دینامیکی زانست و زانیاری و هەتا سروشت و ژیانیش، ئیتر (جدل-دیالکتیك) لە روانگەی شیوعیەت مانای گەیشتن بەراستی ئیمو کۆتایی بێت، بەلکو (راستی)یش چەسپاو و پیرۆز نیە لەبەردەم دیالکتیك، هەموو شتێك دەگرێتەوە تەنیا خۆی (واتە دیالکتیك-جدل) رەهایە[2]، هەر ئەویشە تاکە سەرچاوەی گۆڕان و گەشەکردنی هەموو بونەوەر بە پۆلەکانی ژیانیشەوە تادەگاتە دروست وگەشەی زانیاری، بەهۆی (جدل) لەپێناو (جدل).. واتە ئەو زانیاریە نوێیەی لێرەوە بەرهەم هات دیسان دەکەوێتەوە ژێر لایەنی تری جدلی، .. بەو شێوەیە وەك (هیگل) ئەو بنچینەی ناونا (سێ کوچکە: یان بەسێ کوچکەی هیگلی ناوبانگی دەرکرد[3].

مارکسیەکانیش بەهەمان شێوە پەیڕەویان کردووە، ئیتر ئەو جۆرە (جدل)ە ناگاتە هیچ راستیەك، تەرازوو و پێوانەیەك نامێنێ بۆ ناوبژی نێوان دوو لایەن یان دوو کەس، ئەگەر کێشەیەکی فکری هەبێت چارەسەر نابێت، بۆیەش لە مارکسیەتدا بۆچوونی جیا سەری لەبالی جیا دەوەستا ودوایش بەرەو ناکۆکی، هەر بۆیەش ئەو هەمو تەوژمو باڵ و لایەنانەی لێ پەیدابوو لەو تەمەنە کورتەیدا وەك :ماوی، ترۆتسکی، لادەر، چەپی ساویلکەیی، پاشکۆیی،

---

[1] دفاتر فلسفیه-لینین.

[2] مادیة الدیالکتیکیة.

[3] بڕوانە: مدخل في فلسفه هیگل (سێکوچکەکە بریتیە لە: بابەت -دژەکەی -سەرەنجامی دروست بونی "بابەت"ێکی نوێ ..بەو شێوەیە دووبارە دەبێتەوە تاهەتایە .

ئۆرۆشیوعی، جەنەی ستالینی، چەپی نوێ، شیوعی کلاسیکی، مارکسی بێ لینینی، مارکسی نەتەوەیی، مارکسی دیموکراسی، .. هەتا لەدوا (فەرهەنگی سۆڤیەتی) پێشوو زیاتر لە (٢٠٠) زاراوەی تۆمەتی تیا بوو تەنها بۆ جۆرەکانی شیوعیەت خۆ بەخۆ، جیای لەگەڵ خەڵکی تر، رەخنە و معارەزەی یاسایی و نایاسایی جێی نەدەبۆوە، هەر دان بە معارەزە و بوونی بەرامبەر نەدەهێنرا جا (دیالۆگی) چی بکەیت، لە راستیدا ئەو (جدله) کە لە فکر دەهێنرا ناو کۆمەڵ ئەوا یەکسەر ماناى (مل ملانێی چینایەتی) وەردەگرت، ئەوەش هەردەم پلەی توندو تیژی درابوێ، ئەو دۆخ و تێڕوانینە بارێکی ناوەکی دیکتاتۆری و تۆقاندنی وەرگرتبوو، باری جیهانیشی والێ کردبوو نا ئارامی و جەنگی ساردو گەرمی لێرەو لەوێ پەیدا کردبوو، تیرۆر و قەلاچۆی رای جیا نەك لە ریزی دوژمنانی هەتا لە ریزی شیوعیەکانیش ئەنجام دەدرا لە هەموان زەق تر تیرۆر کردنی ترۆتسکی، چەندین زانای گەورە لە ئاوەدانی دوور خرابۆوە (لەوانەزانای فیزیایی ئەندری سەخاروف)، ئینجا جەنگ و تێك گیرانی ناوەخۆو هەرێمایەتیەکی بەردەوام هەبووە، لە نێوان باڵەکانی شیوعیەت خۆبەخۆشی لەوانە: سۆڤیەت و چین، ڤێتنام و کەمبۆدیا، باڵی پەرچەم و خەلق لە حزبی شیوعی ئەفغانستان، نۆنیتاو بەرەی میللی لە ئەنگۆلا، .. لە کوردستانیش (ی.ن.ك) و حزبی شیوعی، حزبی شیوعی (قیادەی مەرکەزی) و (لجنەی مەرکەزی)، لەناو کۆمەڵەش (عێراقچی و کوردستانچی)..تەنانەت ئەو هەموو ناکۆکیانەی نێو حزبە عەلمانیە کوردستانیەکان (چ خۆبەخۆ چ لەگەل لایەنی تر) بەشی هەرە زۆری بۆ ئەو بیرە دەگەڕاوە..

لەبەر هەمان هۆ لە پێش دارمانی شیوعیەت زیاتر لە (١١) جۆر بزوتنەوەی مارکسی تەنیا لە کوردستانی سەروو سەری هەڵدا، هەڵبەتە لە هەموو جیهان مادام دوو باڵی جیای مارکسی لێ هەبوبێ هەرگیز لە ناکۆکی توند دابووینە.

هەرچی مەدرەسەی سۆشیال دیمکراسیشە ئەو رایە توندەی نەبوو، باوەڕی بە (دیالۆك) هەبووە هەتا لەگەڵ (چینی برجوازی و سیستەمی سەرمایەداری)و

(فەلسەفەی میسالیش) بە پێچەوانەی مارکسیزم، پێی وابووە کە دەشێ بە هێمنی لە ڕێی دیالۆك ئاشتی جیهانی و ناوەکی بێتە دی و بپارێزرێت، دەشێت سەرمایەداریش بەو شێوازە هێمنیە بگوازێتەوە بۆ سۆشیالیستی، بەلام هەردەم جێگەی ڕەخنەی توندو سەرزەنشتی شیوعیەکان بوون.

هەرچی ڕۆژئاواشە تا سنورێکی چاك باوەڕی بە (دیالۆك) هەیە، گوێ دەگرێ بەلام پەیڕەو ناکا، مێژووەکی بانێك و دوو هەوا و چەند هەوای هەبووە، لە نێوان ناوەکی و جیهانی، سەروو و خواروو، ڕۆژئاوای و ڕۆژهەلاتی، بەهێزو بێ هێز، چینی سەروو چینی خواروو، .. ئەگەر بزانێ ئەو دیالۆگە بەزیانی ئەو تەواو دەبێت نایکات، هەتا لە ئاستە فکریە بالاکانیش ئەو شێوە دیالۆگە دەکا کە لەگەڵ کەلتوور و بەرژەوەندیە بالاکانی شارستانی ڕۆژئاوا بگونجێ، ئەگینا بەدروشم دیالۆگیە بەلام هەردەم دیالۆگی بەهێزو بێ هێز، چەوسێنەر و چەوساوە، داگیرکەرو داگیرکراو، دیالۆگێکە لەو شێوەیە، لایەنی هێزدار دەڵێ: وەرە با دیالۆگ و دانوستان بکەین ئاخۆ چۆنت بخۆم بە خۆشی یان بەڕاوەڕاو؟ بە برژاوی یان کولاوی؟ ئازادی و دیمکراسیت پێ دەدەم خۆت هەڵبژێرە بە چ جۆرە چەقۆیەك سەرت ببڕم، لە پێشڕا یان لە پشت سەرت، .. بەو جۆرە دیالۆگە وتراوە (دیالۆگی ناهاوتا) یان (دیالۆگی خۆبەدەستەوەدان). یان دیالۆگی دۆزینەوەی (هەنجەت)، (بیانگە) بۆ هەڵلوشینی وەك ئەو چەند دێرە شیعرە:

ئەگێڕنەوە ئەڵێن سەردەمێ
بەرخێ تینووی بوو چووە سەرچەمێ
لەوێوە گورگێ بە فێڵ و درۆ
لەگەڵ بەرخەکە کەوتە گفتوگۆ
ووتی تۆ کاری چەوت و چیلە ئەکەی
بەرخەکە ئاوم لەسەر لێل ئەکەی
بەرخەکە وتی گەورەم کەی وایە

ئەوەی تۆ ئەیڵێ ی زۆر ناڕەوایە
ئاوێ لای تۆوە بەرەو لای من بێ
دەبێ چۆن چۆتی و بۆچی لێخن بێ
ووتی ئەی باشە جنێوەکانی پار
دێتە یادت بەرخی ناڵەبار
بەرخەکە وتی گەورەی سەردار
کۆرپەی ئەمساڵم ئەك هێنی پار
تۆ ئەفەرمووی پار، پارم نەدیوە
تەنها شەش مانگم تەمەن بڕیوە
ووتی وەهاش بێ دیسان تەواوە
باوك و براکەت جنێویان داوە
ئەبێ ئەو داخەت هەر پێ بڕێژم
کەلبەم لە دووگی ئەرما بنێژم
هەر کە ئەوەی وت بەچەپۆك و دان
بەربووە لاشەی بەرخی بەستەزمان
ئاوا لە سایەی جەوری ستەمکار
دەتلێتەوە بێ دەستی هەژار

هەندێ لە ڕەوشەنبیرو نووسەرو سیاسەتمەدارانی جیهانی سێیەمو موسڵمانانو وڵاتە داگیرکراوەکانیش جار وایە بە شانازیەوە بەدوای ئەو جۆرە دیالۆگانە کەوتوون، بەرەی دووەم لە (بێهێز، چەوساوە، داگیرکراو، زینداتی کراو، ..) بە دژ بە دیالۆك لە قەڵەم دەدەن، کەی ئەو جۆرە دیالۆگە ئەنجامێکی هەبووە، لە دوای یەك سەدە تەقەلا تەنانەت داوای دیالۆك کردن لە بارەی سەربەستی دان بە کورد بە زمانی خۆی بدوێ و بنووسی لە تورکیا بە تیرۆر لەقەڵەم دراو وا ساڵی (٢٠٠١)ە؛ نیو سەدەشە دیالۆکی نێوان ئیسرائیل و عەرەب.. هەمووی هەروەك

سەرەنجامی دیالۆکەکانی جارانی ئیمپریالیزم و داگیرکەران لەگەڵ داگیرکراو و چەوساودکانە، یەك نموونە نیە لە مێژوودا زۆردارێك مافی لە ڕێی دیالۆك گێڕابێتەوە بۆ خاوەنی، تەنانەت بەشی هەرە زۆری ئەو دیالۆگانە پیلان بوود یان بۆ ڕاگرتنی بەرگری و خۆ ئامادەکردنی یان هەر بۆ تیرۆرکردنی ڕاستەوخۆی سەرکردەکانیان، داگیرکەری ئیسپان داوای گفتوگۆ و دیالۆگی لەگەڵ (لامپیرا)ی سەرۆکی هندیە سوورەکانکرد - کە تایفەی (مایا) لەوێ دانیشتوانی ڕەسەنەکەن لە هندۆراس (هندۆراس بەزمانی لاتینی مانای: قووڵایی)[1] – لامپیرا ٣٠٠٠٠ چەکداری هەبوو و ئامادەو قایل بوو بەرەمی کەوتنە دیالۆگ و دانوستان کەچی لەو دیالۆگە تیرۆریان کرد و خاکیشیان داگیر کرد، دەیان نموونەی وا هەبووەو هەیە، لە قۆناغی نوێش ئەوەی بەو شێوەی لامپیرای بووە، پیلان و دیالۆگەکەی حکومەتی عێراق و مەلا مصطفی بارزانی بوو لە پایزی ١٩٧١ ویستیان تیرۆری بکەن سەرکەوتوو نەبوو، هەروەها ئەو دیالۆگە تەلەفۆنیەی نێوان رووسیاو جەوهەر دودایف - لە شۆرشەکەیان بۆ سەربەخۆی چیچان لە دوای ئەوەتەکانی سەدەی ڕابووردوو- کە بووە هۆی تیرۆرکردنی، هەروەها د. عبد الرحمن قاسملۆش، .. سەدان نموونەی تر.

دیالۆگ زیاتر ئەنجامی دەبێ کە لایەنی دادگەر باڵا دەست تر بێت وبنەمای (ح.ابوبکر) هاتبێتە دی (بەهێزتان لام بچووکە تامافی لێ دەستێنمەوە، بێهێزیشتان لام بەهێزد تا مافی بۆ وەردەگرمەوە)، دیالۆگی نێوان (ح.عمر) و ئافرەتێك- کەلەو سەردەمی بە مرۆڤ حساب نەکراوە- کەچی لە کۆتایی شای سەر ئەو زەویە و دەڵی ئافرەتەکە ڕاست دەکاو عمر هەڵەیە..

کەچی لەو سەردەمەی عەولەمەش هەر بێهێزەکانن، چەوساوەکانن، داگیرکراوەکانن، میللەتان و ڕەوشەنبیرانی بێ دەسەڵاتن.. داوا لە دەسەڵاتدارو بەهێزو داگیرکەر دەکا بۆ دیالۆگ و ئایکا، حسنی مبارك لە ساڵی (١٩٩٨) بە

[1] ئەو ناوە لەوە هات کە کۆلۆمبس لە دەریاچە قووڵەکەی ڕزگاری بوو، ناونرا قووڵ (هیندۆراس).

ئاشکراترین جار گوتی ئێمە دیالۆگ لەگەڵ ئیسلامیەکان ناکەین زەرەرمانە، لە کاتێکا ئەویش و دەسەڵاتدارانی عەرەب بە رێکخراوی (فتح )یشەوە بەردەوام تکایان لە ئیسرائیلە کە دیالۆگیان لەگەڵ بکەن، ئەو زنجیرەیەی بێ هێز لەگەڵ بێ هێزترو بەهێز لەگەڵ بەهێزتر لە جیهانێکی نادادگەری بەو شێوەیەی سەرەوە هەر لەتاکە کەسێکەوە تا دەگاتە ئەمریکاو (un)..لە ناوەڕۆکدا پەیڕەو دەکرێ .

بەهەمان شێوە دەبینین رۆژئاوا گەلاڵەی مل ملانێی شارستانی پیادە دەکا کەچی بێ هێزەکانی بەرامبەری داوای دیالۆگی شارستانیەکان دەکەن، لەوانە تیۆرەکەی (د.خاتمی)، هەروەها گەلاڵەکەی (سەرانی عەرەب لە مانگی ٢٠٠١/١١) بەناوی (حوار الحضارات: تواصل أم الصراع)، هەروەهاش تیۆرەکەی رۆجیە غارودی بەناوی (تێك گەیشتنی شارستانیەکان).. کەچی وەڵام نیە، سەرنج بدە ئەو زنجیرە لە کوردستان هێزە دەسەڵاتدارەکان ئامادەنین تەواو دیالۆگ لەگەڵ هێزە ئیسلامی و هەندێ ئیشتمان پەروەری دڵسۆز بکەن یان جار وایە لەگەڵ یەکتر، بەلام هەردەم ئامادەن لەگەل داگیر کەر بکەن، بەهەمان شێوەش سەرانی عەرەب (کە داگیر کەرانی کوردستانیشی تیایە )ئامادەنین دیالۆگ لەگەڵ کورد بکەن، بەو تەکانە پێچەوانەییەش سەرانی عەرەب دەست بۆ ئیسرائیل و ئەمریکا درێژ دەکەن و بەدروشمی (خیار السلام و الحوار خیار استراتیجی وحید) کەچی لەگەڵیانە نایکەن، جا ئەلێرەدایە مامۆستایانی بەناوبانگی مەدرەسەی دیالۆگ لەئیسلامیەکان (بەتایبەتی خەتی ئیخوان) دەگەڕێنەوە سەر ئەو ڕاستیە وەك د.قەرزاوی لەنوێ ترین کتێبی دا دەلێ ئەگەر لایەنی یەکەم هەر دان بەبوونت نەهێنێ چۆن و لەگەڵ کێ دیالۆك بکەیت[1]، بۆیە هێرشێکی توندی کردۆتە سەرهەڵگرانی دروشمی ئەو جۆرە دیالۆگەو بە (سباق یعدد حصان واحد)ی شوبهاندووە، واتە دیالۆگیش لە جیهانی نادادگەری وەك مەسەلەی ئاشتیە چۆن لە مەیدەنی (دیگۆل) هاتووە (کلیلی هێزە دەرگای ئاشتی دەکاتەوە) لێرەشدا

[1] الاسلام و العلمانیة-وجها لوجه-مقدمة.

ئەگەر هێزت نەبێ دیالۆگت لەگەڵ ناکەن و ناخوێننەوەو سەرەنجامیشی نابێ، ئیتر (سیرنۆ سیکۆفیج) لە سالی ١٨٦٨ەو راستی ووتوە کەدەڵێ:هێـز تـەنها بـە هێـز دەوەستێنرێ .

## گرفتەکانی دیالۆگی ئیسلامی و عەلمانی:

لە ناوەڕۆکی بابەتی سەروو بەڕوونی باس لە رووکار و بوارەکانی دیـالۆگ کـرا لە نێـوان مەدرەسـە و ئاینـەکان تـا دەگاتـە شارسـتانیەکانیش.. لـەو بەشـەش مەبەسـتمان ئەو تەوەرە دیالۆگەیە کـە لـە نێـوان ئیـسلامیەکان و عەلمانیـەکانی جیهانی ئیـسلامی (عەرەبی بەتایبەتی)، ئەوەش دوو بەشی سەرەکیە:

١-عەلمانیـە دەسـەلاتدارەکان کـە زۆربـەیان دیکتاتۆریـەکانن، بۆیـە کـەمتر ئامادەی دیالۆگن هـەروەك (حـسنی مبـارك) گۆتـەنی دەڵـێن زەرەرمانـە، ئـەو دیکاتۆریانە نەك لەگەڵ ئیسلامیەکان لەگەڵ هیچ هێزێکی کاریگەر نایکەن.

٢-ئەو بەشە عەلمانیەی کە دەسەلاتدار نین و معـارەزەی ئیـشتمان پـەروەر و نەتەوەگەریە دڵـسۆز و چەپیە پاکەکانن..

لە هیچیان دیالۆگ ناڕەوا نیە بـەلام ئـەوەی بەرهـەمی راسـتەقینەی هـەبێت بەشەکەی دواییە..

گرفتی لای ئیسلامیەکان: هەر زۆر بەکورتی و خێرایی ئەمانەیە:

١-گەلێ جار بەشێك لە ئیسلامیەکان بەپێی تێگەیشتنی تەسکی خۆیان لـە فقهی سیاسی ئیـسلامیدا رێگرن لە دیالۆگ و بێ ویـستی خۆیان خزمەتی گوتـاری ناحەزانی خۆیان کردووە.

٢-لە فقهەکانی تری وەك (أولویات، واقع، موازنە، تغیر، ممکـن..)، دەسـت کورت بووینە بویتە هۆی لێ تێکەڵ بـوونی کۆمـەڵێك چـەمك لەوانـە: (تبلیـغ و حـوار)، (واقـع و دەق)، (بەرنامـەی سیاسـی وفکـری سیاسـی)...نـەیتوانیوە بەدروستی وستاندەری دیالۆك بکا .

٣-بەو شێوە چاکەش لەناوەڕۆك و پۆلێن کردن و لە مەبەست و خاڵە لاوازەکانی و، هۆی پەیدابوونی، (عەلمانیەت) نەگەیشتووە.

## گرفت لای عەلمانیەکان:

١-بەگشتی ئاستی تێگەیشتنیان لە ئیسلام لاوازە.

٢-بەروانگەی (ڕۆژهەڵاتناسەکان) دەڕواننە ئیسلام، لە کاتێکا (ڕۆژهەڵاتناسەکانیش) بەهەڵەی لێ تێگەیشتوون چونکە ئەوانیش بەپێی واقعی مەسیحی و ئاینەکانی تر ئیسلام هەڵدەسەنگێنن.*

٣-بەزۆری ئامرازو ئامانجیان تێکەڵ کردووە، ئەو دیالۆگە بەو ئامانجە ناکەن کە مادام لە خزمەت ئامانجەکانیانەو ئیتر عەلمانیەت و ڕێبازەکەی ئامرازە نەك ئامانج.

٤-کەمتر (سەوابت) و مەبادیئی لەناو عەلمانیەت ماوە، بۆیە گەلێ جار هەتا ئەگەر دیالۆگیش بکرێت بە عەبەسی کۆتایی دێت.

٥-ئەوەی هەرە گرفتە باڵەکانی عەلمانیەت بەخێرایی شێوەو ناوەڕۆکی دەگۆڕێ، لە چەپیەوە بۆ ڕاستڕەوی، لە سۆشیالیستی بۆ لیبراڵی.. یان بە پێچەوانەوە، بەگشتی قەیرانی ناسنامەی فکریان هەیە.. جا دیالۆکی فکری لەسەر چ بکرێ تەنانەت بەشێکیان گەیشتنە ئەو ڕادە دەڵێن فکر و ئایدیۆلۆژیاش نەماوە.

٦-زۆر بەخێرایی لە مەبادیئە ئاسمانییەکان گەڕاونەتەوە سەر مەبادیئە شاقوولیەکان.

٧-ئارادەیەکی زۆر کۆمەڵێك دەردی دەروونی سیاسی وەك (لاسایی کردنەوە، تەقەزوم، گومان، بانێك و چەند هەوا، خێرا لاربوونەوە، خێرا وەرگەڕان)ی پێوە نوساوە.

٨-خەریکە ببێتە ڕەها کە عەلمانیەت پەیڕەوی مەبدەئی (بەرژەوەندی) بکا..

واتە هەردەم بەرژەوەندی تایبەتی‌و خودی خۆی بەسەر گشتی دەسەپێنێ.. وە ئیتر بە سانایی دەتوانرێ بگۆڕێ رارەوی سیاسی میکاڤیلی یە رێنیشاندەری عەلمانیەت، ئەوەش گەورەترین‌و کوشندەترین گرفتی گفتوگۆیە کەئەیە، کە نرخی زانستی نامێنێ لەبەردەم (هەرچیەك بیت لە پیناو بەرژەوەندی تایبەت).

## (١٦)

## دیکتاتۆری    استبدادیة    dictator

بەو جۆرە دەسەڵاتانە دەوترێ کە بڕیارەکان و جێبەجێ کردنیشی لای تاکە کەسێك چڕ بێتەوە، عادەتەن دەسەڵاتی ناوەستێ لە چ سنوورو یاساو دەستوورو نەریت و ئاینیش، تەنیا لای بنەماڵەکەی یان چەند نزیکێکی خۆی، ئەو راوێژانەش وەردەگرێ کە لە خزمەتی دیکتاتۆریانەی بێت.

### بنەچەکەی:

لەوەو پێش باس کرا کە زۆربەی چەمکە سەلبیەکان بنەچەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەزموونی بەشەریەت و هیچ بناغەیەکی ئاینی نیە، بەپێی هەندێ سەرچاوەو فەرهەنگ لەبنەچەدا دیکتاتۆری دەگەڕێتەوە بۆئەزموونی رۆمای کۆن، بۆ ئەو دۆخە تەنگانەی کە وڵاتەکەیانی تێ دەکەوت ئەوا (ئەنجوومەنی پیرانی رۆما) بێ رای میللەت بەپێی (نیمچە دەستووری) هەندێ سەرۆکی وەختیان هەڵدەبژارد بۆ ماوەی (٦) مانگ بۆ بەڕێوەبردن و پەراندنەوەی وڵات لەو دۆخە ناسکانەدا..
هەندێ سەرچاوە ناوو نمونەی وەك (سۆلا، یۆلیۆس قەیسەر، ئۆگۆستۆس، ...)یان تۆمار کردووە لەو بابەتانەدا، بەگشتی بەو پرۆسەیە دەوترا (دیکتاتور) کە وشەیەکی لاتینیە لە (Dictare هاتووە مانای سەپاندن)، ئەو زاراوە سەلبی نەبوو بەڵام لەدوای ئەوەی سەرۆکی وا هەبووە کە (٦) مانگەکە تەواو دەبوو لەسەر تەخت دانەدەبەزی و ئیتر ناوی دیکتاتۆری بووە ئەو جۆرە دەسەڵاتەی کە شەرعیەتی جەماوەری یان دەستووری یان شۆڕشگێڕی یان دۆخی دژواریشی نیە..

دیسان بەپێی بەشێك لە فەرهەنگ و سەرچاوە مێژووەکان یەکەم جار لە (سقیلە)ی سەر بە یۆنان ئەو دۆخەی سەروو رووی‌دا لە پێش زایندا، ئەو کاتی بە (tyrans)[١] ناوزەد کراوون، بەپێی هەمان ئەو سەرچاوانە نموونەی نوێی دیکتاتۆری یەکەم جار لەسەدەی (١٦) لە بریتانیا لە (ئۆلیڤەر کرۆمویل) سازاوە، هەرچەندە ئەو مەبەستی لە ئەزموونی دەولەتی هاوچەرخە،بەلام گومان لەو راستیە نەبە ،چونکە رۆژئاوا وبەتایبەتی زۆربەی چالاکی پێشڕەوایەتی مێژوو بۆ خۆی پاوان بکا چ بە چاکە چ بە خراپە، بۆیە رەنگە لە وولاتی تریش بووبی بەلام ئەوەی راستی بێ یەکەم دیکتاتۆری لە دەسەلاتی ئیسلامی لەسەردەمی معاویە دەستی پێ کرد .

لەبەر ئەوەی دیکتاتۆری سیفەتێکی دانەبڕاوی بەشەریە بۆیەش بەپێی زەمان‌و زەمین و نیشانەو ناوەڕۆکی گۆڕاوە، سەردەم و وەخت هەبووە دیکتاتۆری بوویتە مەدح و زاناو نووسەرو شاعیر بەسەریان دا هەلگوتووەو وتویانە دیکتاتۆریانە توانیویەتی ئیشی میللەت راپەڕێنێ، بە دەسەلاتە بێ هێزەکانیشیان وتوە دیمکراسی، لە مەدرەسەی مارکسیەتیش دیکتاتۆری هەر مەدح بووەو دیمکراسیەتیش سەلبی بووە.

## رایە جیاجیاکان:

دیکتاتۆری زیاتر لە زاراوە نزیك ترە نەك لە چەمك بۆیە کەمتر مشت و مڕی لەسەر بووە، زۆربەی فەرهەنگ و سەرچاوەکانی یاسایی و سیاسی و فەلسەفی و کۆمەلایەتی.. بەگوزارشی جیاجیایان نوسیە بەلام لە کۆتاییدا هەر ماناو ناوەڕۆکەکەی لێك نزیکە هەروەك هەندێکیان والێ هەلدەبژێرین:

---

[١] بۆ زیاتر بڕوانە: أ-موسوعة العالمية ل٣٤٠ ب-النظم السياسية.. ج-الوسیط القانوني الدستوري، د.أدموند .

(١٦) دیکتاتۆری استبدادیة dictator

- ئەرهەنگی ئۆکسفۆرد[1]: *دیکتاتۆری واتە دەسەڵاتداری رەها.*
- لە (المورد) و (الموسوعة العالمية)ش هەمان مانای داینێ.
- (رۆسۆ) لە کتێبی (في العقد الاجتماعي) بەجۆرێکی تری گوزارش کردووە کە کورتی دەکەینەوە لە شێوەکانی دەسەڵاتدا:

١- دیمکراسی ← دەسەڵاتداران >* لە (گەل).

٢- ئورستقراطي ← دەسەڵاتداران < ** گەل.

٣- دیکتاتۆری ← دەسەڵاتدار = گەل.

٤- پادشایی هەرسێ جۆری سەرووە.

- لە سەرچاوە کۆنەکانیش کە باسی (استبداد)یان کردووە، (ماوردی) لە کتێبی (تسهيل النظر) ئامۆژگاریەکەی (ئەسکەندەری مەکدۆنی) نەقل کردووە بە لێدوانەوە کە دەڵێت لەو خۆشیە دوورکەوە کە هاورێکانت پی ی ناگەن، .. دیکتاتۆری و (استبداد)ی خۆشەویستی تیانامێنێ.
- عبدالرحمن کواکبی دەڵێ (مستبد) ئەوەیە حوکم لەسەر خەڵکی دەکا بە ئارەزووی خۆی نەك بە ئارەزوی خەڵکی، یان بە یاسا، پێی لەسەر دەمی خەڵکیە تا هەق نەڵێن[2].
- موسوعة علم الاجتماع: چەند نیشانەیەکی داناوە بۆ ناسینەوەی دیکتاتۆریەت:

١- دەست بەسەراگرتن.

٢- متمانە نەبوون بە میللەت.

٣- خۆ بەچاکترین پارێزەر زانی.

---

١ فەرهەنگی ئۆکسفۆرد ٢٠٠٢ وەرگێرانی سەلام ناوخۆش.

* ئەو هێمایە مانای زۆرترو گەورەترە .

** مانای بچووك ترە .

٢ بروانە : الاعمال الكاملة –القاهرة ١٩٧٠

٤-سزا و پاداشی نامەعقول.

٥-زۆر مەرکەزیەت.

٦-کەم راوێژی.

٧-گوێ نەدانە رای گشتی میللەت.

٨-بڕیاری حەدی..

زۆربەی نیشانەکانی پێچەوانەی دیکراسی هێناوە.. هەرچەندە بەشێکی وانیەو هەندێ نیشانەی تری نوقستانە، ئینجا بڕیارە حەدیەکان عادەتەن ڕوو لە بنێ هێزەکانە نەك بۆهەموو لایەك.

+فەرهەنگی ئۆکسفۆردی ئینگلیزیەکەی نیشانەیەکی سەرەکی دانــاوە هـەر بەدەقی ئینگلیزی هاتووە: especialy one who has gained it using ...millitary force[1]

+ئەنسرۆپۆلۆجیەکان[2]: ئۆتۆکراسی و ئیستبدادی لەخانەی دیکتاتۆریەتیان ریزکردووە.

+زۆر جۆرە رای تریش هەیە، لە کوردستانیش وەك لە (راپۆرتی سیاسی ی.ن.ك) هاتووە دیکتاتۆری و سەرمایەداری بەپێچەوانەی یەك ناسیوە، سۆشیالیزمی نزیك کردۆتەوە لە تۆتالیزمی و دیکتاتۆری.. هەروەك (مارتین دودج)یش لە نیشانەکانی دا تۆتالیزم و دیکتاتۆری پێکەوە ریزکردووە و چەند نیشانەیەکی هاوبەشی پێ داوون:

١-دەسەڵاتەکە بۆ یەك تاکە کەسە لە کۆتاییدا.

٢-زۆر گوێ نادات گفت وگۆ و راوێژ.

٣-حزبی سیاسی و بوونی خەلکی تری پێ هەرس ناکرێ جگە لە حزبەکەی خۆی یان تاقمە بچووکەکەی.

---

[1] Oxford-d pr٤٧.

[2] بروانه: مقدمة في انثروبولوجيا الاجتماعية .

٤-رەخنە قەبول نیە (بەتایبەتی لەکەسی یەکەم –جودی–).

٥-معارەزەی یاسایی نیە..

ئیتر مل پێ کەچ کردنی خەڵکی و زیندانی و تەزکیەو (تەرغیب و تەرهیب) کۆکردنەوەی خەڵکی لە حزب و تاقمەکەی بەزەبری دەسەڵات دیاردەی هەرە زەقی ئەو سیستەمەن[1].

ئەوانە بە پوختی رایە جیاجیاکان بووە، لەڕەوتی بابەتەکە هەڵسانگاندنیانیشی تیادایە، دیکتاتۆری هەر لە سیستەمی سیاسی پەیدا نابێت، چونکە سروشتی پۆلێکی فراوانی بەشەریە بۆیە لەناو دەزگا کۆمەڵایەتی و خێڵەکی و هەتا دەزگا زانستی و مەدەنیەکانیش هەیە.

عادەتەن ئەو جۆرە دیکتاتۆرانە بیانگە یەکی پیلانی دەرەوە و گەشاندنەوەی سەروەریەکی هاوبەش هەڵخەڵەتێنەری وا کەخۆی تیایدا ناوەند بێت و ئامرازێکی ساناش دەبێ بەهۆیەوە ڕاڕەوەی نارازیەکانی بەتوندترین شێوە سەرکوت بکات.

زۆربەی فەرهەنگەکان ئەو چەمك و زاراوانەی وەك ئۆتۆکراسی، تاك ڕەوی، مونوکراسی، دەسەڵاتی رەها، شمولی، حزبی سەرکردە، حزبی پێشڕەو، شاهنشاهی (نەك مەلەکی دەستووری)، دەسەڵاتی تۆتالیرزمی (وەك ئەوەی مۆسۆلینی).. لە بۆلی دیکاتۆری ریزکردووە، نمونەکانیشیان لە دیکتاتۆری هەریەکە لە (ستالین، هتلر، دڤالیە، عیدی أمین، موسولینی، ساموزا، مارکۆس، شای ئێران).. تۆمار کردووە.

کەمتر نووسەرو توێژەرەوەکان ئەو سەرۆکانەیان لە خانەی دیکتاتۆری تۆمار کردووە کە ئاسەوارو دەسەڵاتیان ماوە، ئەمەش سەلبیاتێکە لەبارەی دادگەری نووسینەوەی مێژوو، هەر بەپێی نیشانەکانی بەشێکی زۆری وڵاتانی عەرەبی و جیهانی هێشتا دیکاتۆرن، کەمتر حزبە عەلمانیەکانی عەرەبی بە کوردستانیشەوە دەست گۆڕی دەسەڵاتو سەرۆکایەتی دەکەن، لە هەموو سەردەمێك ئەو

[1] إعرف منهبك.

دیكتاتۆرانە بەشێك لە عەوام و رەوشەنبیرو نووسەرو هونەرمەندو سیاسەتمەداری وایان هەیەو هەبووە نەك هەر بۆیان داپۆشـن بـەڵكو رەسـتای بیانگـە دۆزینـەوە بووینە، گۆرانیو شیعریان بەسەردا هەڵگووتوە، نازناوی باڵایـان پـێ داوە لەوانـە (خواوەند، مەزن، خـاوەن شـكۆ، قائـد الفـذ، سەرۆكی هێـژا، ڤۆهـەر، دوتـش، سەرۆكی سەرۆكان، سەرۆكی بێ هاوتا، فخامة، سیادة، یان وەك (مصطفی كمال) سـێ نازنـاوی دراوەتـێ یـەكیان (عـصمت ئینـنو) نـاوی (میللـی چـیف- واتـە سەركردەی هەمیشەیی) دووەم نازناوی غازی، لەدوایدا پەرلەمان سێیەم نازنـاوی (ئەتاتۆركی) پێ دا واتە باوكی تورك، .. ئێستاهەیە بەدەیان نازناوی دراوەتێ .

زۆربەی ئەوانە كێشەیەك یان فاكتەرێكی هاوبەشی مێـژوویی و ئایـدیۆلۆژی و نیشتمانی كردۆتە دروشمو هاندەر بۆ جۆشو خرۆشكردنی هەستو نەستی خەڵكی عـەوام بەپێی تیۆری (تحدی و الاسـتجابة-تـوینبی) تـا شـەرعیـەتی جـەماوەری و مێژوویی و یاسایـشی پـێ وەرگـرێ، هـەروەها هەڵدەسـتێ بـە دروسـت كردنـی ئەنجومەنی كارتۆنی بەناوی پەرلەمان و گەل و جارجار هەڵبژاردنێك سازدەدەن یان بۆ سـەرۆكایەتی هەتا هەتایە یـان بـۆ ماوەیـەكی درێـژ و لـە ٩٩، ٩٩٪ دەنـگ دەهێنێ، تەنانەت سەرۆكی عێراقی لە ساڵی (٢٠٠٢) لە ١٠٠٪ دەنگـی هێنـا! ئەو سنوورەشی شكاند، خەریكن نزیك بنەوە لـەو دەنـگ هێنانـەی (سـتالین) كـە جارێكیـان لـە (١٠١٪)ی هێنابوولـە كۆنگرەیـەكی حزبـی شـیوعی، هـەرگیز پێغەمبەرەكانیش ئەو جۆرە دەنگەیان نەهێناوە .

دیكتاتۆریەت ناسنامەی نیە لە هەموو مەدرەسەكان پەیـدا دەبێـت هـەتا لـە دیكراسیش، هێتلەر بە دەنـگ دان و لـە رێی دیكراسـی لەسـاڵی ١٩٣٢ بـووە راوێژكاری ئەڵمانیا، بۆیە بەشێكی زۆری پانتایی مێژووی عەلمانیەت و رۆژئـاوا و لیـبراڵ دیكراسـی و سـەرمایەداری جـەنگ و پـەلامارو شـەرە دەسـەڵات و دیكتاتۆریەت بـووە، نموونـە نزیكـەكانی : هتلـەر لـە ئـەڵمانیا، مۆسـۆلینی لـە ئیتاڵیا، دۆڤالی لە هایتی، فرانكۆ لە ئیسپانیا، صدام لە ئـیراق.. ئـیتر دەروازەی

دیکتاتۆری بەراستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لەو سیستەمە لـە هـەموان نزیـك تـرە مادام مەبدەئی بەرژەوەندی تایبەتی و شەخسی لە سەرووی گشتیە، مێژوی سیاسی خەلافەتی ئیسلامیش پاکانەی بۆ ناکری لـەو ڕووەوە بـەلاّم بـە پێچەوانەی ئـەو رایەی (کۆتایی مێژوو)و (مل ملانێی شارستانیەکان) کە جگە لـە سـەرمایەداری ڕێبازەکانی تر بەدەروازەی دیکتاتۆری لەقەڵـەم داوە، هـەر بـەخێرایی ئـەو رایـە گەیشتۆتە جیهانی سێیەم و کوردستانیش، سەرنج بدە ڕاپۆرتی سیاسـی (ی.ن.ك) کۆنگرەی (٢) هاتووە: (پەرەسەندنی بیرو داخوازی مافی مـرۆڤ و دیکراسـی کـە هەردووکیان هەم بۆ گەشەکردنی سەرمایەداری و بازاڕی ئازاد پێویست بـوون، بـۆ ڕیسواکردنی ڕژێمە دیکتاتۆریەکان..)[١]، هەر با بە (معجم الحديث..) وەڵامی ئەو هەڵە تێگەیشتنە بدەینەوە کە تیایدا هـاتووە (لەسـاڵانی (٧٠-٨٠) سـەردەمی بینوشێ چالاکیە ئابووریەکانی سەرمایەداری و بازاڕی ئـازاد بـوو کەچـی ئـەرپێزی مافی مرۆڤی دەگرت و ئەدیکراسیش)، زۆربەی دیکتاتۆریەکان لەو تـرازەن و خۆ نمونەی (ئەنجومەنی ئاسایشیش) کە چۆن (٥) ئەندامی هەمیشەیی بێ هەڵبژاردن هەردەم ئەندامن و ڤیتۆشیان هەیە ئەوەش هەر دیکتاتۆریەتە.

هەرچی مەدرەسـەی شیوعیەتیشە هـەر خـودی (دیکتـاتۆری پرۆلیتـاری) کۆڵەگەیـەکی بنـچینەیی یـە، یەکـەم جـار (بـابۆف)ی فرنسـی لـە ١٧٨٩داوای شێوەیەك لە دەسـەلاتی پرۆلیتاریـای کـرد ئینجـا مارکسـیەتیش داوایـان کـرد، معارەزەو لایەنی سیاسی و رەخنەی تر بە دوژمنی لەقەڵـەم درا، تـەنها حزبەکـەو تاکە شەخسەکە لە کۆتاییدا دەسەڵاتدار دەبوون چونکە (چـینی پرۆلیتاریـا) نـە دروست بوو نە دروستیش دەبێ، ئیتر کەسانی دیکتاتۆری وەك ستالین لە رووسیا، ماو لە چین، هۆنیکەر لە ئەڵمانیا، چاوشیـسکۆ لە رۆمانیا، کیم ئیـل سـونگ لـە کۆریـا، پـۆل پـۆت لـە کـەمبۆدیا، کاسـترۆ لـە کۆبـا، .. زۆری تـر.. تەنانـەت

١ ڕاپۆرتی گشتی (ی.ن.ك) کۆنگرەی (٢) ل٢.

دیکتاتۆری گەیشتە ئەو رادەیە کە (کیم ئیل سۆنك) مرد وەسیەتی کرد کوڕەکەی هاتە جێی (بووە شیوعیة الملکیة)، بەو شـیوەیە دیکتـاتوری لەگـەل دەسـەلات هاوریێ بوینە(کلا أن الانسان لیطغی إن رأی إستغنی)، جا ئەو دەسەلاتە جار وایە ناوی (دیموکراسی) هەلگرتووە وەك ئەلمانیای دیموکراسی، بەمـەنی دیموکراسـی .. سەرنج بدە احمد سیکۆتۆری سـەرۆکی پـارتی دیموکراسـی غانـا بـە دەلی (ئیمـە سیستەمیکی دیکتاتۆریان لـە نیـو دیکتاتۆرییـەکان هەلبـژاردو کـە دیکتـاتوری گەلە، چاکترە لە دیکتاتۆری تاکـە کەسـەکان یـان دیکتـاتوری پەرلـەمانی، یـان دیکتاتوری چینی برجوازی ..)[1] .

لەپاش هەموو ئەوانەش دیکتاتۆریـەت زیـاتر زادەی جۆرێـك لـە سیستەم و عەقیدەیە، لەدوای پشکنین و وردبوونەوە وا دەردەکەوێ زۆربەی دیکتاتۆریـەکانی سەدەی رابوورددوو و ئێستاش بەرهەمی جۆرە عەقیدەیەکی سیاسـی ناوێتـەن لـە رەگەزیو جۆرێك لە سـوشیالیستی، واتە فەلسـەفەی نەتەوەگەریو سوشیالیستیو نیشتمانی پێ گوتراوە، بەکورتی لەنێرنەو جۆرە خەلکە سـەرهەلدەدا کـە لایـەنی ئارەزووی زالە بەسەر عـەقل ونەخلاقیەکەی، بۆیە هەرگیز ناسنامەکەی بەشـەریو عەلمانی دەبیت نەك ئاینی راستەقینە، ئەوەش بە روونی لەمیـژوو بـەدی دەکـرێ هـەر لـە ئەرسـتۆ (٣٨٤-٣٢٢پ ز) وە تـا میکـافیلی (١٤٦٩-١٥٢٧) وبـە دواوەش زاناو فەیلەسوفی عەلمانی راویژکەرو رێنیشـاندەری دیکتاتۆر بوونە .

هەروەك دۆخی ئێستای جیهانی دەسەلاتداری عەرەب نموونەی دیکتاتۆرین لەو جیهانە بە نیشانەکانیەوە، تا ئەو رادەیە (کیسنجەر) لـە وەلامـی ئـەو پرسـیارەی ئاخۆ ژمارەی دانیشتوانی عەرەب چەندن؟ وتـی تـەنیا (٢٢) کەسـن، واتـە هـەر سەرۆکەی یەکسانە بە میللەتەکەی هەروەك پێناسـەکەی (رۆسۆ) بـۆ دیکتـاتۆری، لە راستیشدا هەر خۆشیان شەرم لەو باروودۆخـە ناکـەن هـەم لـە دەنـگ هێنـانی بەساختەی ٩٩، ٩٩٪ هەم لـە گۆتـەش، لـە عێـراق وەك دروشـم لەسـەر دیـوار

[1] بروانە : علم السیاسة -د حسن الصعب ص٤٣٥

دەنووسرا (اذا قال صدام قال العراق).. ئیتر شەڕو جەنگو ئاشتیو ماڵ وێرانیو بەفیڕۆدانی داهاتی عێراق بێ سانسۆرو ڕای میللەت.. تا گەیشتە ئەو ڕادەیە سەرۆك یەکسان بێت بە دەوڵەت، ئەوەش هەمان گۆتەی (لویسی چواردەمی فەرەنسی) بوو کە دەیووت (من دەوڵەتمو دەوڵەتیش منم)، ئەوە جۆرێکی زۆر تایبەتە لە دیکتاتۆری، چونکە دیکتاتۆریەکانی سەروو کە ناویان لە فەرهەنگەکان تۆمارکراوە لەگەڵ دیکتاتۆریەکەشیان نیشتمان پەروەر بوینە، کەچی دیکتاتۆری ئێستای عەرەبی تەنها بۆ مانەوەی دەسەڵاتی دیکتاتۆری سەودای هەرزان لەسەر وڵاتو نیشتمان دەکا، بووە میراتگری ئەو جۆرە نەریتەی نیشتمان فرۆشی، هەروەك فرۆشتنی لیبیا بە ئیتالیا، دجلە بە بەریتانیا، فەلەستین بە یەهوود..هتد لە سەرەتای سەدەی بیستەم، ئێستاش بەجۆرێکی تر بەردەوامە.

سیستەمە سیاسیەکەی دەسەڵات لە کوردستانیش زۆر کاریگەرە بە ئەزموونی سیستەمی سیاسی عەرەبی بۆیە (عبداللە پەشێو) لە شیعرێکی دا ڕوو لە سەرکردەکانی کورد دەڵێ:

ئاگرداێکتان کرد بە دوو
خەڵك مێژوویەکی هەیە
ئێمە دوو مێژوومان هەیە
هەموو دنیا یەك سەرکردەی لێ بەڵایە
ئێمە لەویش دوومان هەیە

نەریتی سیاسی لەناو جیهانی موسڵمانشینیش زیاتر بەلایەنی دیکتاتۆریەتە، جۆری حوکمو دەستوورو بەرنامەی سیاسیو ئایدیۆلۆژیاو عەقیدەیان عەلمانیە، لە سۆشیالیستو فەلسەفەی نەتەوەگەریو لیبرالی یان ئاوێتەیەکە لەوانە، حوکمی ئیسلامی ڕاستەقینە وەك ئیسلامیەکانو زاناکانیان دەڵێن (قورئانو سوننە) بێت وانین، بۆیە ئەگەر دیکتاتۆری ڕەگی لە دەروونی ئەو دەسەڵاتدارانە هەبێت کە لایەنی عەقلی ملکەچی دەروونیە ئەوا لەو مەدرەسانەش ڕەگی هەیە

که مەدرەسەی روحی نین، بۆیە دیکتاتۆریەت لە فکری ئیسلامی هیچ پێگە و جێگەیەکی نیە، هەر چەندە زۆربەی پانتای مێژووی ئیسلام بەجۆرێك لە دیکتاتۆری حساب بووە ئەوەیان مێژووی موسڵمانانە نەك ئیسلام، چونکە شورا ئەسڵێکی بنچینەی حوکمە، ئینجا (ویلایەت) لە ئیسلامدا بۆ ئوممەتە هەروەك قورئان زیاتر رووی لە (ئوممەت) کردووە بە پلەیەك ئینجا بۆ (شورا) و لەوێش بۆ (فقیە-یان ئەمیر)..، مانای (ولایەتی ئومة) ئەوەیە هیچ دەزگایەك لەسەرووی ئوممەت نیە، لەدوای دەستوور کە حوکمی خوایە، ئیتر (وەلی ئەمر)و (ئیمام) و (سەرۆك کۆمار)و (ئەنجومەنی شورا-پەرلەمان).. هیچی راستەوخۆ بەند نیە بە پەیامی خوایی، بەڵکو هەمووی بەند دەبێت بە پەیاننامەی کۆمەڵایەتی لەگەڵ (ئوممە)، دەبێ هەڵبژێردرێن نەك دیاری بکرێن یان بەمیرات و خۆسەپاندن، تا رادەیەك ئەو کێشە لەناو (فقهی سیاسی) ئیسلامی هەیە بەشێك لە (شیعە و سوننە) یەك دەگرنەوە دەڵێن (ولایة) بۆ (فقیە-یان ئەمیر).. ئیتر ئەو رایە سەر دەکێشێ بۆ دیکتاتۆریەت هەروەك سەری کێشاوە، هەر چەندە ئەزموونی ئێرانی لە (ولایە فقیە) وەك (چارەسەرێکی مام ناوەندی) دەسەڵاتی زۆر دارایتیێ بەڵام هەڵێش بژراوە لە (مجلس خبرگان)، بۆیە ئێستا لە ئێران هیچ دەزگایەکی سیاسی نیە (ئوممەت) هەڵی نەبژاردبێت بە پێچەوانەی وڵاتێکی دیکراسی زادەی وەك بریتانیا دەبینین بنەماڵەو خانەوادەی شازادەکان بێ هەڵبژاردن و بەمیرات خاوەنی ئەو میرنشینەی بەریتانیان، یان جار وایەئەنجوومەنی لۆرد (یان ئەعیان) بەمیراتە بێ هەڵبژاردن، ئینجا ئەزموونی ئیسلامیەکان درەوشاوە تر بووە، هەتا لە ئەفغانستانیش(کەنموونەیەکی ناشرینی هارچەرخی ئیسلامیە) سەرۆکایەتی بە نۆرە بوودو (٣) سەرۆك گۆڕا، کە گەیشتە (برهان الدین ربانی) گیر بوو، لە چیچانو سودانو ئێران نموونەی تەواو ئەنتی دیکتاتۆریان پەیڕەو کرد بەڵام لە ئاستی پێویستیش نەبووە، لە ئێران سەرەك کۆمار تەنها دەتوانێ لەدوو دەورە خۆی هەڵبژێرێ تا ئێستا (٦) سەرۆك کۆمار گۆڕاوە (١-ابو الحسن بنی صدر٢-

محمد علی رجائی٣-علی خامنـائی ٤-هـاشمی رەفسـنجانی ٥-محمـد خـاتمی ٦-عمودی نەژاد)..، لە چیچان لە دوای (جوهر دودایـف) (سـلیم خـان یانـدربایف) بووە سەرەك كۆمار، دوای لە هەڵبژاردن (ئەسـلان مەسـخادۆف) دەرچـوو (سـلیم خان) قایل بـوو تـەنها ببتـە سـەفیرێكی گەڕیـدە لـەپێناو ئـەو گەلـەو كۆمـەك پەیداكردن، هەتا لە كوردسـتانیش دەست گۆڕی دەسـەڵاتو گـۆڕینی رابـەر لـەناو ئیسـلامیەكان زۆر ئاسـایی بووە (٤) ڕابەریان گۆڕیوە تا ئێستا (هەر چەندە لـەوەی دوای گێروگرفت هەبووە)، بەڵام لەناو حزبە عەلمانیە دەسەلات دارەكان ئەوە زیـاتر لە نێو سـەدەیە هیچ گۆڕیـنێكی سـەرەك حزب نەبینراوە، مەگەر مردن یـان بـەلێك ترازانو ژمارەی سەركردە زیادكردن، هۆیەكەش دەگەڕێتەوە بۆ چـەند فاكتـەرێكی مێژوویی لەوانەئەزموونی سـەقەتی خەلیفـەكان لەوبارەیـەوە، مـیر نـشینـەكانی كـورد..، ئینجـا لـەو سـەردەمەش دوو كاریگـەری نـوێی تـر یـەكیان ئەوەیـە دەسەلاتی سیاسی كوردی لەژێر كاریگەری ئـەزموونی عەرەبیـە كـە دیكتـاتۆری پەتین، هەروەها كاریگەریش بووینە بە ئەزموونی ماركسی كە بناغەكەی لەسـەر دیكتاتۆری هاتووە، ..جگە لەوەش دەسەلاتی عیراقی زیاتر دیكتاتۆری بووە

(١٧)

# فيدرالى الولايات Federation

له دواى گەشەى كۆمەڵو پەيدابوونى دەوڵەت، زياتر تێكەڵى و پێويست بە يەكتر بوون بەو شێوە فراوانەى، ئەو زاراوانەش لەگەڵى پەيدا بووە لە ئەنجامى ئەزمونى مێژووى شارەزايى مرۆڤايەتى، ئەگينا لەبنەمادا هەموو ئەو زاراوانەى وەك : فيدرالى، پەرلەمان، سياسەت، مرۆڤايەتى.. هەبووە بەهەمان ناوەرۆك، مەگەر ناو و شوێنى جيا بووبێت، هەڵبەتە پەيام بە دەيان سەدە لە پێش عەقلى بەشەريە، جا وەك پەيام بنەچەى ئەو چەمكانە رۆژ هەڵاتيە، وەك زادەى بەشەريش رۆژئاوايين، چونكە كام شارستانى زاڵ بێت ئەو چەمكانە بە ناو و وشەى ئەوان زاڵ دەبێتەوە، لەسەر ئەو بنچينەيە (واتە لە رووى بەشەريەوە) فيدراڵى لە سەرەتادا لەسەر شێوەى پێويستى ئيدارى و سياسيانەش دروست بوون، بە هەردوو جۆرى سەلبى و ئيجابى، لە لايەك دەبينين ئيمپراتۆرەكان بە مەبەستى سياسى و زاڵ بوون فيدراڵيان پيادە كردووە هەر بە نموونە فيرعەونەكانى ميسر وڵاتيان كردبووە (٤٢) ناوچە[١]، هەريەكە دڵسۆزێكى فيرعەونى لێ دەسەڵات دار بووە بە مەبەستى كۆنترۆڵ كردنى، يان وەك كۆمارەكانى سۆڤيەتى پێشوش، كەچى لە خەلافەتى ئيسلامى راستەقينەدا بە مەبەستى بەشدارى سياسى گشتى و رێكخستن و لامەركەزيانەى دەسەڵاتو مەدەنيەت و ئازادى تاكو پێكەوە ژيانى رەنگە جوداكان بووە، بەو شێوەيە ئەسڵى فيدراڵى سيستەمى ويلايەتەكانە لە ئيسلامدا، هەروەك لە فەرهەنگى بەناوبانگى (ئۆكسفۆرد)يش

[١] الموسوعة السياسة ل٤٤٥.

(١٧) فیدراڵی       فیدراڵیەت       Federation

هەر بە مانای (ویلایات)ی هێناوە[١]، لەگەڵ ئەو گۆڕان و کاریگەرییە کەلتووری و ئابووری و ئەخشەی کۆمەڵایەتی و سیاسی نوێیانەی بەسەریدا هاتوون، بۆیە هەق وابوو بە (ویلایەت) سەردێڕی ئەو چەمکە بنووسین، بەڵام چونکە ئێستا فیدراڵی باوترە لە ویلایەت، لە لایەکی تریشەوە پەرلەمانی کوردستانیش بە وشەی (فیدراڵی) سەردێری کردووە، بۆیە ئێمەش لەگەڵ ڕای باو دەڕۆین جارێ ئەگەر تەرازووش نەبێت.

فیدراڵی وەك وشە لاتینییەبە مانای (یەك گرتن) یان (هاوپەیمانی) دێت، بۆ ئێستا بە مانای قەوارەیەکی نیسبی دێت و هاوتایی لەگەڵ (هەرێم-ئیقلیم) ناویان دێت، (ئیقلیم)یش جاران مانایەکی تری هەبووە، بەهەر لاکێشەیەك لەو (٧) لاکێشە تەرییەی کە ئەو هێڵانەی زەوی بە ئاسۆیی دابەش دەکرد دەووترا (ئیقلیم)[٢]، دوای لە وڵاتیش بچووکتر بۆوە، ئیتر هەر وڵاتێك چەند ئیقلیمێکە، مەبەستی ئێستا لە (ئیقلیم-هەرێم) نەك هەر سنوورێکی جوگرافی تایبەت، بەڵکو دانیشتوانی ڕەچەلەك و کەلتوور و فاکتەری تریش تایبەت بێت، ئینجا پێی دەوترێ هەرێم (ئیقلیم)، تەنانەت (کیبك) لە کەنەدا تەنها تایبەتیەکەیان فەرەنسی زمانن هەرێمیان پێك هێناوە، بۆیە ئێستا فیدراڵیەت و هەرێمایەتی و دابەشی دەسەڵات جۆرێکە لە چارەسەری سەرەتای کێشەی فرە نەتەوەیش لە سنووری یەك وڵاتدا، لێرەدا پێویستە بەلای ئەو باسەدا بچین کە بەشێك لە نووسەران و فەرهەنگیش نموونەی ویلایەتی سیستەمی ئیسلامی بۆ چارەی (کێشەی نەتەوەیی) دەگێڕنەوە، نەخێر، ئەو کاتی کێشەو بیری نەتەوەیی هەر نەبووە[٣]، هەرێمو نەتەوەو دەسەڵاتی سیاسیش لەو پەیوەندییەیاسایی وسیاسییەی وەك ئێستا نەبووە ،دابەش بوونی ولایەتەکان لەسەر بنچینەی نەتەوەیی نەبووە،

---

[١] قاموس أكسفورد ل٢٢٢.

[٢] موسوعة الكشاف إصطلاحات الفنون و العلم ل٢٤٧،ومعجم البلدان -ياقوت الحموي، إبن الخلدون-المقدمة ...

[٣] بۆ زیاتر بڕوانە: نەتەوایەتی.

لەسەر بنچینەی ئیداری بووە، هەتا لە سەردەمی عوسمانیش ئەگەر تەماشای هەر ٣٢ ویلایەت بکەین هیچی جووت نییە لەگەل ئیستمانێك، دوای مەشروتیەتی ١٨٧٦ز یش هەروابوو، لە مادەی ٧١ی دەستووری (مەشرووتیەی یەکەم) عوسمانی هاتبوو کە ئەندامی مەبعوسان (پەرلەمان) نوێنەری بەتەنهای ویلایەتەکەی ناکا بەلکو نوێنەرایەتی هەموومیللەتی عوسمانی دەکا ، بۆیە هەرێمی ئیستاو ویلایەتی ئیسلامی لێك جیانە، هەتا خودی ئیقلیم (هەرێم) عەرەبی نیە، لە ئیخلیمی لاتینی هاتوە، بەلام هەردوولا هاوبەشن لە (لا مەرکەزیەت)، کەواتە فیدرالی (یان ویلایەتەکان یان هەرێمەکان) شەخسیەتی سەربەخۆیی (نیو دەولەتی) لە دەست دەدەن بۆ یەك شەخسیەتی ناوەندی، لە بەرامبەریشدا (ناوەند) کۆمەلێك دەسەلاتی بۆ ئەوان بەجێ دێلێ، لە کۆنفدرالی وانیە، هەر یەکە شەخسیەتی مەعنەوی دەمێنێ، ئیستا کەمتر ئەزموونی کۆنفدرالی تەمەنی درێژ بووە هەتا لە نێوان یەك ئەتەوەش هەروەك کۆنفدرالی (عەرەبی یەکگرتوو) کە لە ٨/مارس/١٩٥٨ لە دیمەشق لە نێوان یەمەن ومیسر، دوای عێراق و سوریا، دوای میسر لەگەل چەند ولاتێکی تر ی عەرەبی، جاران نمونەی سویسرا یەکیتی سوڤیەت کۆنفدرالی بوون، بەلام ئانیستا کۆنفدرالی (امارات العربية المتحدة) ماو، دیارە فیدرالی بەردەوام ترە ۰

بە زۆری دەسەلاتی ناوەندی چ وەزیرەکانی (تنفیذی) چ (پەرلەمان) لە ئەندامانی هەرێمەکانی فیدرالی و ناوەند پێك دێت (هەڵبەتە ناوەندیش هەرێمێکە لە فیدرالیەت، خۆ ئەگەر سنووری جوگرافی و ولاتی جیاجیا بن وەك ئەو شێوەیەی بریتانیا ئەوا پەرلەمانیان کە ژمارە (٦٣٥) ئەندامن بەو شێوەیە پێك هاتووە:

(٧١) ئەندام سکوتلەندا، (٣٥) وێلز، (١٢) ئیرلەندای سەروو، ئەوی تر ئینگلتەرا*، هیە، لە قوبرس لە کوی ٥٠ ئەندام (١٥)ی تورکە، (٣٥)ی

* جاران بەبەشی خوارووی بەریتانیا (جگە لە وێلز) دەوترا ئینگلترا

یونانییه، دیاره چری دانیشتوانی هەرێمەکان ئەو کاریگەرییەیان هەیە، لە ویلایەتەکانی ئەمریکا دەبینین هەردوو ویلایەتی میرمۆنت و ئەلاسکا نزیکەی ٣\١١ی ئەندامانی کۆنگرێس پێك دەهێنن، هەرچی ویلایەتی تیتر بورگە ٤١ ئەندامی هەیە لەکۆی(٤٣٥ نوێنەران +١٠٠پیران)، ئەنجومەنی هەرێمەکانی سویسرەش ٤٤ئەندامن، بۆ هەر کانتۆنێك ٢ ئەندام ٠

هەریەکە لە هەرێمەکانیش پەرلەمانی سەربەخۆیان هەیە، واتە فیدرالی حکومەت و پەرلەمانیشە، زۆربەی ولاّتانی جیهانیش ئێستا بە جۆرێك سیستەمی دەسەلاّتیان فیدرالّیە، جا ناوی جیاجیای وەرگرتووە، لەوانە: ولایات وەك جارانی خەلافەت و ئێستای ئەمریکا، ئیمارات وەك ئیماراتی عەرەبی یەکگرتوو، کۆماری وەك یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو، ئوستانەکان وەك ئێران، هەرێم وەك کوردستان، و کانتۆنات[1] وەك لە سویسرەو فرەنساش..، ئیتر رەنگە نموونەی نەبوونی ئەو سیستەمە دەگمەن بێتو تەنها لەوولاتە دیکتاتوردکان نەبی (کە زۆربەی ولاّتانی عەرەبی و سوشیالیستەکان و هەندێکی ئەفریقی دەگریتەوە)، ئەزموونێکی زۆر سەرکەوتووە هەم بۆ ئیداری و هەم سیاسی و هەم نەتەوەییش، ئەو ولاّتانەی خاوەنی ئەو سیستەمەن زیاتر ئارام و ئاسایش و گەشە و تەبایی و بە یاسایی بەرێوە دەچێ .

لە ئەزموونی نوێ دا سویسرە کۆن ترین سیستەمی فیدرالّی یە، بەلاّم ئەگەر ناوەکەشی نوێ بێت، ئەوا ناوەرۆکی نوێ نیە، بە هیچ جۆرێك لە داهێنانی ئەورووپی نیە هەروەك دەیانەوێ هەموو مۆدێرنیەکی ئیجابی بکەنە موڵکی خۆیان، هەموو ئەوانە بناغەی پەیامی هەیە، ئەگینا با سەرنج بدەینە شارستانی (ئەزدیل ١٣٢٥-١٥٢٠ پ.ز) چەند کۆنیشە و وەسفی لە لایەن زۆربەی فەرهەنگەکان بە کۆنفدرالّی کراوە[2]، لەو سەردەمەدا: لە دوای دابەش کردنی و

---

[1] کانتۆن فەرەنسیە واتە (قضاء، سویسرەش مانای محافظة) - قاموس جیب- ل٤٤ فرنسي-عربي.
[2] الموسوعة السياسة -کيالي- م-ن -ب[1] ل٢٩٤.

وەچەرخانی جیهان لە چاخی ئیمپڕاتۆریەتەوە بۆ وڵاتە نەتەوەییەکان کە بناغەکەی بۆ جیهانی ئیسلامی و سێیەمی لە ڕێکەوتنی (١٩١٦)ی سایکس بیکۆ-سازانۆف) بەدواوە دروست بوو، ئیتر کێشەی نەتەوەییش بووە سەرباری پێویستیەکانی سیستەمی فیدراڵی.

لە ئەزموونی نوێدا هەرێمەکانی فیدراڵی بە پێی سەروەری دەنگ دان و دیموکراسیانە توانیویانە جۆری حوکم و مەزهەبی سیاسی و دەستووری هەرێمیش بگۆڕن وەك لە هەرێمەکانی سەرووی نایجیریا تا ئێستا (١٠) ولایەتیان جاڕی پەیڕەوکردنی شەریعەتی ئیسلامی داوە وەك مۆدێرنترین چارەسەری کێشەی کۆمەڵ و تاك بۆ ئەو شوێنە، هەروەهاش لە مالیزیا و پاکستانیش هاوتای ئەو شێوەیە هەیە.. هەر چەندە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات و عەلمانیەتی جیهانیش ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە دژی پێش هاتی وان، لەو چوارچێوەدا پەرلەمانی کوردستانیش بۆ پەیوەندی هەرێم بە ناوەند فیدراڵی لە نێو زنجیرەی لا مەرکەزی و خود موختاری و کۆنفدراڵی.. هەڵبژاردووە، کە لە لایەن شۆڤینیستە عەرەبەکان پەسند نەکراوە، هەرچەندە بەشێکیش(بەتایبەتی ڕەگەز پەرستەکانی عەلمانی عروبی) پێیان وایە ئەوە سەرەتای جیابوونەوەیە، دەڵێن دەبێت ئەو هەنگاوە بیگێڕدرێتەوە بۆ ڕاپرسیەکی گشتی دیموکراسیانەی، سەرانسەری عێراق نەك تەنیا لە کوردستان، بەو بۆنەشەوە بۆ وەڵامیش هەڵوەستەیەك دەکەین:

١-فیدراڵی و دیموکراسی لەو پەیوەندیە ئۆرگانیکیە نیتە، زۆر وڵات هەیە و هەبووە فیدراڵی بووە و دیموکراسی نەبووە وەك لە فیرعەونەکان کە باسمان کردو یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو وەك دیکتاتۆری، سیستەمی ویلایاتی ئیسلامی پێشوو ئێرانی ئێستاو سودانیش وەك نموونەی تر.

ئینجا ئەوەش عەیبێکی دیموکراسیە کە مافی دەخورێت هەر وەختێك ڕاپرسی سەرانسەری بکرێت زۆرایەتی عەرەب لە عێراق دەنگ نادەنە فیدراڵی یان هەر

مافێکی تری سروشتی خەلکی کوردستان، (بۆ زیاتر بڕوانە بابەتی دیموکراسی لەو فەرهەنگە).

٢-وولاتـە فیدراڵیـەکان هێـزی یـەکگرتوویان گـورج و گـۆڵ تـرە لـە ولاتـە نافیدراڵیەکان، بۆیە هەموو زانا و فەرهەنگەکان فیدراڵیان بـە مانـای (یـەکێتی سیاسی) وەرگێڕاوە[1]، بە پێچەوانەوە زۆربەی ئەو وڵاتانـەی شـۆڕش و کێشـەکانی نەتەوەیی تیایە تا فیدراڵی و دەسـەلاتی ناوەنـدی تـاك ڕەو دیکتـاتۆر و تـاتیفی بـووە، ئـەگینا وڵات هەیـە چـوار سـەدەیە فیدراڵیـە و زۆریـش ئـارام و گەشـە سەندووشە.

٣-بۆ دیاری کردنی شێوەی پەیوەندی راپرسی بە سەرانسەری وڵاتەکـە ئـاکرێ بە تایبەتی ئەزموونە نوێیەکان، لە دوای ١٩٩٠ تا ئێستا ئـەو پرۆسـانە ئـەنجام دراون لـە ژێـر چـاودێری (نەتـەوە یـەکگرتوەکان): ئـەریتریا، چـەند کۆمـارێکی سـۆڤیەتی پێشـوو، بیابـانی ڕوژئـاوا، تـەیوری ڕۆژهـەلات، هـەردوو بەشـی چیکۆسلۆڤاکیا، چەند پارچەیەکی یۆگسلافیا، کیبك لە کەنەدا، .. هیچی لە وانە راپرسیەکان لە سەرانسەری وڵاتەکە نەکراوە تەنها لـە هەرێمەکـە کـراوە، چـونکە دوو ئیرادەی لێك جیان هـەروەك ئێسـتا وا دەبیـنین پەرلـەمانی کۆسـۆڤا بـەکۆی دەنگ داوای سەربەخۆیی دەکاو پەرلـەمانی سـربیاش بـەکۆی دەنـگ دژیـەتی ، ئینجا مەرج نیە لەو هەرێمەش هـەر راپرسـی کـرا هـەمووی هـەر سـەربەخۆیی هەڵبژێرێت، هەر چەندە ئەگەر هەڵیش بژێرن هەم لە ڕووی یاسایی و هەم لە ڕووی شەریعەتەوە ڕەوایی پێدراوە، لەوانـە کیبـك لـە سـاڵی ١٩٩٨ راپرسـی کـرا لـە هەرێمەکە لە (٥١٠٠٪) دەنگی مانەوەیان دا لە کەنەدا نـەك سـەربەخۆیی، بۆیـە زیاتر ئەوەستێتە سەر جۆری دەسەلات و دەسـتورو دادگەری ئەو وڵاتە.

٤-هەرچەندە مافی جیابوونەوە، رەواشـەو یاساییـشە، چـەندین بڕیـاری نێـو دەوڵەتی بو دەرچووە، هەڵبەتە بە پێی یاسـای نێو دەوڵەتی گشـتی هەرمیللـەتێك

[1] بۆ زیاتر بڕوانە: أ-الكشاف ب٣٠ (ش-ى) ل٢٨٥. ب-موسوع العالمية.

خاوەنی هەریم وگەل ودەسەلاتی سیاسی بوون مافی بوون بە دەولەتیان هەیە، بویە لە راستیدا فیدرالی هەریمیکی نەتەوەیەك بریتیە لە دەسەلاتی سیاسیەکەی و واتە زیاتر نزیك بوونەوە لە مافی چارەی خونووسی لە دەولەتە .

٤-فیدرالی فاکتەریکی گرنگی یەك پارچەیی و کۆکردنەوە و پیکەوە ژیانە، با نموونەی سەربردەی دروست بوونی فیدرالی لە ئوستralیا باس بکەین، (بێجگە لە دانیشتوانی رەسەنی ئوستralیا کە (ئەبۆرجینیەکان)ی پێ دەووترێ، چەندین دەستەو تاقمی جیاجیای لێك پێچراوی لە بەندی و مەنفی و بەدڕەوشتانی تێ هەلدراوی بریتانی لە چوار قوژبنی جیاجیای ئوستralیا دەژیان، کەچی لە دوای سالی ۱۹۰۰ز سیستەمی فیدرالی دروست بووە یەکسەر گەشەی دەست پێ کرد، پەرلەمانیشی لێ دروست بوو و یاسایان دارشت و کۆمەلگەیەکی پارچە پارچەی یەکخستەوە و ئەو ئوستralیە پێش کەوتووەی ئیستای لێ دەرچووە، هەر چەندە ستەمیشیان لە دانیشتوانی رەسەنەکە کردووە کە زیاتر لە ۵۰۰۰۰ سالە لە ئوستralیا دەژیان، لە هندیش هەمان دۆخ روویدا لە دوای جیابوونەوەی پاکستان لەرێی باری ناوەخۆی هەلوەشایەوەو هەر نەتەوەو تایفەیەو ئاینێك بەرەو ئاژستەیەك بوون، ئیتر لە دوای ۱۹۵۰ سیستەمی ویلایاتی پەیرەو کردو هندیان کردە (۲۱) ویلایەت، لە هەر هەرێمێك پەرلەمان و حکومەت و سەرۆکی هەرێمیش خۆی بۆ دروست بوو ئیتر تا رادەیەکی چاك ئارام بۆوە و لە پارچە پارچەیی رزگاری بوو.

لە کۆتاییدا ماوە بلێین کۆنفیدرالی و فیدرالی جیاوازیەکەیان لەوەیە یەکەمیان: چەند دەولەتێك لەسەر بنچینەی سەربەخۆیی هاوبەش لە چەند روویەك لە دەرەوە دا یەك دەگرن، هەرچی فیدرالیە ئەوا یەکگرتنی چەند حکومەتێکە لەناو یەك دەولەت یەك دەگرن،ئەوکاتی دەولەتەکە دەبێتە دەولەتێکی فیدرالی، بۆیە ناتوانرێت بەعیراق بووترێت عیراقی فیدرالی تا بەلایەن کەمەوە هەرێمێکی تری فیدرالی بۆ دروست نەبێ وەك ئەوەی خواروو داوای دەکەن .

لە کۆنفیدرالی دا بۆ هەر هەنگاوێك یان بڕیارێك کە هاوبەشە پێویستی بە کۆی دەنگی دەوڵەتە بەشداربووەکانە، کەچی لە فیدرالی دا بەپێی زۆرایەتی دەنگی هەرێمەکان دێتە دی و گەلێ مەسەلەی تر (بۆ زیاتر سەرنج بدە: (کۆفر، ئەدوارد - Amodern dictionary).

(١٨)

## شـورا (پەرلەمان) Parliamen- National Assembly

ئـەو زاراوەیـە لـە ناوەڕۆکـدا کۆنـە، زۆر بـە راشـکاوی لـە قورئـانی پـیرۆزو فەرموودەو وتە بە نرخەکان هاتووە بە پەیڕەویشەوە (ما رأيت أحد أكثر مشورة لأصحابه من رسول الله ﷺ) رواه الترمذي.

بە پێی فەرهەنگەکانیش دەوڵـەتی ئیـسلام یەکـەم سیـستەم بـوو کـە شـورا بەکاربهێنێ[1]، بە پێی هەندێ سەرچاوەی تری شارەزا لە مێژووی سیاسی دەوڵەتی ئیسلامی لە مەدینە ئەوا (عشرة المبشرة) زیاتر شورای دەوڵەت بووینە بـە پـێی نوێنەرایەتی نەخشـەی سیاسی و کۆمەڵایەتی یەکەی:

١-أبـوبكر و طلحـة- لـە تـیم، ٢-عمـر و سـعید بـن زیـد- لـە عـدی، ٣-عبدالرحمن بن عوف-سعید بن أبی وقاص-لـە زەهـرە، ٤-علـی لـە هاشـم، ٥-عثمـان-بنی ئومەیە، ٦-زبێر بن عەوام- لە ئەسـەد، ٧- ابـو عبیـدالله- لـە فهر،[2] بەڵام رۆژئاواییەکان ئەوەش وەك هەموو بەشەکانی تری زانـست و فیکـر و فەلسەفەو دۆزینەوەکان خۆمـاڵی دەکـەن، بـە پـێی بـۆ چـوونیان کـە زۆربـەی فەرهەنگو ئەنسکلۆپیدیەکانی جیهانی ئیسلام و سێ یەمیش بە لاسایی کردنەوە تۆماریان کردۆتەوەو دەیگێڕنەوە بۆ ئـەو سـەرەتاییەی سـەدەکانی ناوەڕاسـت کـە ئەنجومەنێك دروست بووە بۆ بەرگری لە بەرژەوەندی دەرەبەگـەکان، دوای گەشـەی

---

[1] موسوعة أديان- ص٣٢٢.

[2] الموسوعة السياسة -ب٣ ل٥٠.

کردو بووە ئەنجومەنی شایەکان و جێی ڕاوێژو نوێنەرایەتی.. تا بووە پەرلـەمان[1]، لە هەندێ سەرچاوەی ورد تر دەیگێڕنەوە بۆ پێش سـەدەی (١١)ش بـە تایبـەتی کاتی هێرشی نۆرمەندیەکان بۆ سەر بەریتانیا، ئەوە بوو شای بـەریتانیاش بـانگی پیاو ماقول و ئاینی شارەکانی کرد بـۆ چارەسـەری، ئـیتر ئـەوە بـووە نـەریتێکی سالآنە (٣) جار دادەنیشتن، لـە دوایـدا لـە ژێـر فـشاری مـاقولآن جـۆن سـانتیر (بەڵگەنامەی ماگناکارتا)ی دەرکرد لـە ١٢١٥/٦/١٥ز کـە لـە ٦٣ مـادە پێـك هاتبوو، هەقی چینەکانی سەروو لـە (مـاقوولان، پیـاوانی ئـاینی، بازرگانـەکان، بیانیـەکان..) دیاری کرا، ئەنجومەنی بۆ دروسـت کـردن، بەردبـەرە لـە سـەردەمی (هنری سێیەم لە سالّی ١٢٥٤ز بوو بە پەرلەمان، دوایی لە سالّی ١٢٦١ز بـووە دوو ئەنجومەن، (ئەنجومەنی لۆردەکان-پیـاو مـاقولّ و ئاینیـەکان)- (ئەنجومـەنی گشتی-نوێنەری شارەکان)، تا ئێستاش هـەر بەردەوامـە[2]، بـە هـەمان شێوەش مێژووی پەرلەمانی نمونەیی کە بە (شای پەرلەمانان)یش ناو دەبەن بـۆ بـەریتانیا دەگێڕنەوە لە سەردەمی (شا ئەدوارد)، لە سالّی ١٢٩٥ز کە بۆ یەکەم جـار پیـاو ماقولآنی دەرەوەی کنێسەشی بانگ کرد لە کۆبونەوەیەك، ئیتر لە ئـەوروپا ئـەوە بە پەرلەمانی نمونەیی نـاو دەبـرێ[3]، پەرلـەمانی بریتـانی ئێـستاش بـە کـۆنترین پەرلەمان دەژمێردرێت، هەرچی (موسوعة البلدان) ئـەوا پەرلـەمانی(ئالیـسینك) ئایسلەندا بەکۆن ترین لەقەلەم داوە، هەڵبەتە ئەو تێ ڕوانینـە لـە چـوار چێوەی یەکسان کردنی مێژووی جیهان بە مێژووی ئەورروپاوەیە، ئەگینا لە پـێش (ماگنـا کارتا)و پەرلەمانی نموونەیی (ئەك لە دەوڵـەتی ئیـسلامی) مەدینـەو دواتـریش، یەکەم ڕاوێژیش پەروەردگار بە فریشتەکانی کرد لەبارەی دروست کردنـی ئـادەمی زاد، بۆیە مێژوەکی پەیامیو گـەردونی هەیـە، هـەتا لـەناو زۆربـەی خێڵـەکانی

---

[1] الموسوعة العالمية ب١٠ ل٥٧٩.

[2] بۆ زیاتر ا-نظم السياسة، ب-الوسيط في قانون الدستوري د.أدموند. ج-موسـوع العالميـة ب١٠ ل٥٧٩.

[3] الموسوعة العالمية ب٢ ل٣٥٦، هەروەها (احزاب السياسية-دوبرجيه).

جیهانیش شێوەیەك لەو ئەنجومەنە هەبووە کە پێك دەهات لە سەرەك تیرەکان بۆ تونژینەوەو بڕیار دروست کردن لەبارەی هەر کێشەیەکی نوێ، بۆیە زۆر فەرهەنگی تر ولاتی تر بە خاوەن یەکەم پەرلەمان دەزانی، لەوانە (موسوعة البلدان )پەرلەمانی ئایسلەندا بە کۆن ترین پەرلەمانی جیهان دەزانی، لە کەلتووری ئەلمانیا ئەونەریتە بۆ (رایشتاخی) ئەلمانیا دەگێرنەوە، لەوێشەوە بۆ (ئەنجومەنی پیرۆزی رۆمانی کۆن )، هەرچی ی (قاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدولية ) پەرلەمانی پاریس بە کۆن ترین ناسیە ·

ئەو زەمینە سازیەی ئەورووپی بە گشتی و لەگەڵ گەیشتنی شارستانیەتی ئیسلامیش پێیان لە رێی ئەندەلوس ودوایش لە رێی عوسمانیەکان زیاتر فێرە سیستەمی شورا بوون هەروەك لە نووسینەکانی (قصة الحضارة-ویل دوارنت)، (بناء الانسانية-بریفولت)، هەروەها ریتشار کۆل، دوزی، سارتۆن، شارلز سنجر، .. باس کراوە، رون تر لە هەموان لە نامەکەی (جۆرج)ی بەریتانی بۆ خەلیفەی ئەندەلوس (هشامی سێیەم) دەردەکەوێ (دەقی نامەکە لە کۆتایی ئەو بابەتەیە)، ئیتر بەرە بەرە سیستەمی شورای لێ پەرەسەند لەگەڵ گەشەی ئەورووپا، ناوی جیاجیاشی وەرگرتووە لەو سەردەمە، وەك :(پەرلەمان بەگشتیەکەی ، رایخشتاخ و دییت و پەندەستۆك لە ئەڵمانیا، کۆنگرێس (نوێنەران+پیران) لە ئەمریکا، سانکوائجوان لە کەنەدا، دوما لە رووسیا، لوکسابا لە هند، تریبون فرنسی، دیل ئیرلەندی، ریکسداغ سویدی، ڤولکتنگ دانی مارکی، لاندرات سویسرە، کنیسە لە ئیسرائیل، کورتیز لە ئیسپانیا، ئەنجومەنی گەل لە هەندێ ولاتانی عەرەب، ئەمانەتی میللی (لیبیا)، .. ناوی تریش هەیە ئێستا: ئەنجومەنی پاسادانان، شورا، سوڤیتیات، ..)، ئەوەش نیشانەیەکی ترە کە لە بنەچەدا ئەو ناوو ئەزموونە ئەورووپی ولاتینی رەسەن نیە بۆیە ئەوەندە ناوە جیاجیایەی هەیە .

لە دوای سست بوونی جیهانی ئیسلامی کارنەکردن بە شـوورا لـە دوای ئـەو ئینقلابەی معاویە کردی جـاریکی تـر بـەوناوە نوێیانـەوە هاتـەوە نـاو جیهـانی ئیسلامی، یەکەم جار لەسـەردەمی مەشـرووتیەتی یەکـەم لەسـالی ١٨٧٦ز لـە دەولەتی عوسمـانلی ئیـشی پـێ کراوە، دوای وەسـتا وجـاریکی تـر لـە ئینقلابـی ئتحادیەکان لە ١٩٠٨ ئیـشی پێکراوەبـە نـاوی (مەبعووسـان ) ئنجـا پەریـەوە جهانی ئیـسلامیش لەگەل دروست بوونی دەولەتی هاوچەرخ بوێیان .

هەموو ئەو زاراوانەش لە ناوەرۆکدا هەرمانای شورا دەگرێتەوە، بەلام رەنگـە لە هەندێکیان مەرجە ئیسلامیەکانی لێ نەیەتەدی ئەگینالـە پێناسـی پەرلـەمان وەك لە فەرهەنگی بەناوبانگی (ئۆکسفۆرد) هاتووە:

The group of people who are elected to make and ) change the lows of acountny( [1]، ئـەوەش دەقـا و دەق نـاوەرۆك (مقاصد)ی مانای شورایە، هەروەك لە فەرهەنگە نوێیەکانیش فەرمانی شـورایان بەو دەقە هێناوە (كانت سبيلا لتعديل الرأي أو الموقف) [2].

لە جیهانی سێیەم هەتا کۆتـایی جـەنگی سـاردیش شـان بـە شـانی ولاتـانی سوشیالیستی (بێجگە لە چەند ولاتێك نـەبێت) سیـستەمی پەرلـەمانیان جـێگیر نەبوو، هەروەهاش لە جیهانی موسولمان نشینیش کار بە شورا نەدەکرا مادام کار بە شەریعەتی ئیـسلامی نەکرێت، بۆیە دەسەلات هەمووی کۆبۆوە لە سەرۆك، لـە هەندێ شوێنیش پەرلەمان هەبوو بەلام تا ئێـستاش هێمایـە و بـەس، دەسـەلاتی راستەقینەی نیە بە تایبەتی لە ژێر سـایەی ولاتە دیکتاتۆرو تاك لایەنو بنەمالـەو سەرۆك و حزبی سەرکردەدا، گرنگترین نیشانەکانی بێ دەسەلاتی پەرلەمان ئەوانەن:

١- مـــەیمرن.

٢- زۆربەی جار قایل و ناقایلیان لە ١٠٠٪)ە.

---

[1] Oxford –D- p٩٢١.

[2] الموسوعه السياسه ب١ ل٩١٩.

٣- کەمتر گفت و گۆ لەسەر بابەتەکانی پشت هێڵی سوور دەکرێ.
٤- ملکیین أکثر من ملك.
٥- ئەندامانی پەرلەمان بێ ئاگان لە باری خەڵك.
٦- پسپۆڕ نین لەو کارەیان.

جاران بە هەردوو شێوە پەرلەمان هەڵدەبژێردرا چ ڕاستەوخۆ لە لایەن میللەت چ بە میراتیشەوە، لە سیستەمی دیموکراسی ئێستادا پەرلەمان هەڵدەبژێریت ڕاستەوخۆو دەسەڵاتی یاساداناتی هەیە، حکومەتیش دەسەڵاتی جێبەجێ کردن، لەژێر سایەی دەستور، لە هەندێ شوێنیش هەر پەرلەمانە حکومەت و سەرۆك هەڵدەبژێرێت یان لێی هەڵدەبژێردرێت، سزاو چاودێری دەکا تا ئەو رادەیە متمانەی لە حکومەت دەسێنێتەوە، ئەو پرۆسەیە پێی دەڵێن (حجب الثقة)، عادەتەن کورسیەکانی پەرلەمان پڕ دەکرێتەوە لەسەر بنچینەی ڕێژەی بەشداری و دەنگی ئەو حزبە، بۆیە چەند فراکسیۆنێك (کوتلەیەکی) لەناو یەك پەرلەمان دروست دەبێت، ئەو کۆمەڵە فراکسیۆنەی دەکەونە هاوپەیمانیەتی و زۆرایەتی دەنگ مسۆگەر دەکەن بۆ دروست کردنی حکومەتێکی ئینتلافی، ئەو فراکسیۆنانەی بەشداریش نین لە حکومەت پێیان دەوترێ (معارەزەی یاسایی) ئەو ناوە بۆ جیاکردنەوەیەتی لە معارەزەی چەکداری و دەرەوەی پەرلەمانە.

بە پێی (دۆڤرجیە) لەسەر هەمان بنچینەی هاوپەیمانیەتی ئەو فراکسیۆنانە لە دەرەوەی پەرلەمانیش فیکرەی (حزب)ی لێ دروست بووە لە ناوەڕاستەکانی سەدەی (١٨)[١].

لەو لایەشەوە مەرج نیە پەرلەمان و حکومەت تەواو لێك جیاببنەوە لە هەندێ شوێن هەر ئەندامی پەرلەمانن دەبنەوە سەرەك وەزیرانیش وەك تورکیا، لەڕاستیدا لە دوای پێك هاتنی (ئەنجومەنی مەزنی تورکیا )لە ١٩٢١لەلایەن ئەتاتورکەوە بەپێی مادەی ٢، ٣ دەستوورەکەی، ئەوا دەسەڵاتی پەرلەمانی

[١] الاحزاب السياسية -دوفرجيه.

حکومی نزیك کرانەوەو تا ئیستاش سیستەمی دیموکراسی بە هۆیەوە لەنگە، بۆیەش ئەسڵی لێك جیاکردنەوەی (نسبی) هەر سێ دەسەڵاتەکانو دەسەڵاتی ئومەتیش (کلکم راع و کلکم مسؤول عن رعیته..) لە ئیسلام هاتووەلەسەردەمی (راشدین ) کاری پێکراوە، نەك وەك ئەوروپیەکان بۆ (مۆنتسیکۆ)ی دەگێڕنەوە[1].

خودی پەرلەمان وەك هەموو دەزگاکانی تر تاسنامەی (عەقائدی) نیە، ئەکەوێتە سەر بەکارهێنەرەکانی، واتە ئەگەر گریان کورسیەکان هەمووی بە شیوعیەکان پڕ کرایەوە ئەوا پەرلەمان دەبێتە دەزگایەکی دیکتاتۆری پرۆلیتاریا و گواستنەوە بەرەو شیوعیەت، ئەگەر ئیسلامیش دەرچوو دەبێتە شورا، هەر چەندە لەناو بەرەی چەپیشدا مشتومڕ هەیە لەسەر خودی پەرلەمانیش، شیوعیە رەسەنەکان پەرلەمان بە دەزگایەکی برجوازی تایبەت بە سیستەمی سەرمایەداریو لیبراڵ دیموکراسی لە قەڵەم دەدەن، بەڵام سوشیال دیموکراسیەکانو (ئۆرۆ شیوعیەکانیش) چوونە ناو پەرلەمان و لە شوێنانی وەك فەرەنسار ئیتالیاو یۆنان و پرتغال سوودیان لێ بینی، پێش بینیەکەیان تا رادەیەك هاتە دی کە دەکرێ لە رێی بەشداری پەرلەمان دەروازەی گۆڕانکاریو چاکسازی بکەیتەوە بە هێمنانەوە دوور لە دیکتاتۆریانە.

بە هەمان شێوەش لە فکری ئیسلامی هاوچەرخیش کێشە هەیە لەسەر بەشداری پەرلەمانو دەسەڵاتەکانی و هەم لە خودی شوراش بە تایبەتی لەو پرسیارە ئاخۆ ویلایەت بۆ کام لەم سێ دەزگایە بۆ (فقیه-یان ئەمیر) یان بۆ (شورا) یان بۆ (ئومەتە)؟ (زیاتر ئەو وەڵامانە لە بەشی فکری ئیسلامی باس دەکەین)، بەڵام بۆ بەشداری ئیسلامیەکان لە پەرلەمانێکی فرە لایەنی عەلمانی و چەپی ئەتەوەیی دیسان کێشە هەیە، بە شێك لە ئیسلامیان پێیان وایە پەرلەمان جێگەی یاسادانانەو ئەوەش تەنها مافی خوایە دابڕێنی بۆیە (کفرە)، هەندی فەیلەسوفی ئەوروپیش ئەو رایەیان هەیە لەوانە (ئەمانویل کانت) دەڵی مرۆڤ

[1] بۆ زیاتر سەرنج بدە (روح القوانين)- مونتسکیۆ.

ناتوانی یاسا بۆخۆی دابڕێژێ چۆن بۆ کۆمەل دەتوانی، بەلام بەشێکی تریش زیاد لە پێویست بێ سێ‌ دوو بەشداری دەکەن هەتا لە کنێسەی ئیسرائیلیش ئەندامی ئیسلامی هەیە، بەشی سێیەمیش بەمیان ڕەوانەتر وا دەڕوانتە پەرلەمان کە دەزگایەکی بێ ناسنامەیە، ناسنامە عەقائیدیەکەی ئەکەوێتە سەر ئەو ئەنداماناەی کورسیەکان پڕ دەکەنەوە لە لایەك، لە لایەکی تریش ئەو دەستوورەی ولات، هەردووکیشیان بە دەوری خۆیان دەکەوێتە سەر جۆری میللەت و ڕاستی و دروستی هەلبژاردنەکە، ئەگەر بەو شێوە دروستیە بوو و ئیسلامیەکان دەنگ بهێنن ئەوا هەمان پەرلەمان دەبێتە شورایەکی ئیسلامی بە هۆی دیموکراسیانە دەتوانن دەستووریش وەرگێڕن، کێشەی ئەو بەشە ئیسلامیەی کە دژی ئەزمونی بەشداری پەرلەمانین بە هەموو بارێك کێشەی زانیاریە، لە ڕاستیدا پەرلەمان یاسا دانان نیە بەلکو دەرهێنجرانی یاسایە لە دەستوور، بۆیە ئەو کێشەیە لەگەل دەستوورەنەك لەگەل پەرلەمان، دەستووریش لەلایەن پەرلەمان دانارێژرێ ئەوەیان لە سەرووی دەسەلاتی پەرلەمانە، لە دەسەلاتی میللەتە، کەواتە هاتینەوە سەر ئەو پرسیارە ئاخۆ ئەو میللەتە ئیسلامیە، عەلمانیە، مەسیحیە، .. واتە لێرەوەیە کێشەکە. بۆیە ئەو کاتی دەنگ دەدرێتە دەستورێکی ئیسلامی کە دەنگ دەران سیفاتی (ئومە)یان هەبێت نەك عەوام.. تا لەو کاتەیە عەلمانیەت سوودمەند دەبێت لە نەزانی خەلك و جێگەی خۆی دەکاتەوە، لەو دۆخە هەلبژاردنانەدا پەرلەمانیکی پسپۆر دروست نابێت لە یاسا دەرهێنان و داڕشتن بەپێی ڕای (ستیورات مل)، خەلەل لە بنەچەدا لەوە دێ لە دەنگ دانی میللەتێکی عەوام ئەوا دەنگی زانا و نەزانێك وەك یەکە، ئەو میللەتە هەلخەلەتاو و ڕەمەکی دەبێت ناتوانێ ببێتە چاودێرێك لەسەر ئەو پەرلەمانەی کە خۆی هەلی بژاردووە، بۆیە ئەو جۆرە پەرلەمانەش دەبێتە شێوە دیکتاتۆریەك لە میللەت دەپچڕێ هەتا لە باشترین دۆخی دیموکراسیشدا وەك کەمایەتیەك جار وایە بڕیاری پێچەوانەی خواستی میللەتەکەش دەدا، ئەوەیان سەلبیاتەکانی گشتی پەرلەمانە.

بۆ هەموو ئەو چارەسەریە دیسان دەبێ بگەڕێینەوە سەر چاوگی کێشەکان کە دەستوورە، ئەگەر دەستوور بە عەیار دارێژرابوو ئەو کاتی ئەك عـەمەلی دەتـوانرێ لەگەڵ ئیسلامیەکان نوێنەری ئاینی تریش ئەنـدام بـن لـە پەرلـەمان یان شـورا هەروەك لە ئێران چەندین ئەندامی شورای مەسیحی و یەهودی و بەهائی تیادایە، لە شورای سودانی سەردەمی (نیتقاز)دا دەبینین چـەندین ئەنـدامی شـوراو هـەتا سەرۆکی ویلایەتیش نافرەت و مەسیحیشە، هەروەك لە قوبرسیش لـە سـەردەمی سوڵتانی عوسمانیەکان قەشەی مەسیحیەکانی ئەندام بـووە لـە دەسـتەی بـالاّ بـە فەرمانی سوڵتانو شێخ الاسلام.

## مەبەســـتەکانی شـورا ( پەرلەمان ):

لە راستیدا ئەو شێوازەی لیبراڵ دیموکراسی و پەرلەمان و فرە لایەنی و دەست گۆڕی ... بەرهەمی ئەزمونێکی دوور و درێـژە.. لـە کاتێکـا ئـاینی راسـتەقینە نەبێت زۆرێك لەو ئەزموونانە باشـترین داهێنـانی بەشـەرین، (سـتیورات میـل) لـەبارەی سـنورەکانی پەرلـەمانو دەسـەلاّتی حکومـەتو سـەربەسـتی تـاك نووسیویەتی: ئەوانـە چـاکترین مەبادیئـەکانی لیـبراڵ دیموکراسـین، پێـشی وایـە حکومـەت نوێنەرایـەتی هـەموو لایـەك ناکـا، بـۆ ئـەوەی ئـەو حکومەتـە ستەمکارنەبێ و (لا مرکزی) بێت وبـۆ ئەوانـەی لـە حکوومـەت نـین ئـەوا ئـەو دەزگایانە بۆ پڕکردنەوە و بەشداری لە حکومەت شێوازێکی هـەرە گونجـاوە، بـەو شێوەیە ئەویش پەرلەمان بە هەڵە دەزانێ، بەلاّم هیچ بەدیلێکی تـری نەدۆزیـتـەوە ئەگینا زۆر گومانی لە پسپۆڕی ئەندامانی پەرلەمان هەیە، هەڵبەتـە (سـتیورات میـل) ناهـەقی نـەبووە لـەو تێبینیانـە، هـەر ئەوەشـە لـە بنەڕەتـدا جیـاوازی پەرلەمانێکی ئاسایی و شورا، شـورا دەبـێ هەڵبـژێرابێ لـە لایـەن ئومـەت کـە هەموویان دەزانن (کەسی شایستە بۆ ئەو شوێنە شایستە) هەڵبژێرن کە پـسپۆڕن، چەند مەرجێك هەیە لە ئیسلام بۆئەو کەسانەی شایستەی شوراو مشاوەرەن، یـان

شورا هەڵدەبژێرن نابێ نەفامو دزو حەسودو دوورو ترسنوك و نارەزووباز خۆویـست بێ، واتە نابێ عـەوام و رەمـەكی بـن، ئـەوەیان جیـاوازی بنـچینەییە لـە رووی هونەری كار، جگە لە جیاوازیەكانی تری فكـری، دڵـسۆزی، چـینایەتی، .. بۆیـە دەبـینین بـەماكانی شورا ستاندەرترە لە مەبەستەكانی پەرلەمان كـە هەریەكـەیان لە فەرهەنگە جیاجیاكانی ئیسلامی و عەلمانی هاتووە.

## بنەماكانی شـورا:

۱-دوور خستنەوە لە جەبریەت (دیكتاتۆریەت).

۲-وادەكا دەسـەڵات لا مەركەزی بێت.

۳-خەلیفە بە هەڵبژاردن و (بەیعە) بێت[1].

٤-ویلایەتیش لە كۆتاییدا دەبێتە مولكی نوممەت.

٥-دەست گۆڕی دەسەڵات دەبێت نەك میراتی و خۆ سەپاندن.

٦-خەڵكی شایستە لە شوێنی شایستە.

۷-چارەسـەری بە ستاندەر بۆ كێشەكان.

مەبەستەكانی پەرلەمانیش كە لە فەرهەنگەكانی سـەردەم هاتوون هەمان شتە:

۱-چەق نەكردنی دەسەڵات و بڵاوكردنی دەسەڵات (دژە دیكتاتۆری).

۲-بەشداری زۆربەی خەڵك.

۳-بڕیار و هەڵوێستی دروست.

٤-بە هونەرمەساتی كردن نەك نارەزوویی.

٥-پسپۆریەتی.

٦-بوونی یاسـا لە سـەرووی هەموان.

۷-بە یاسایی كردنی معارەزە.

[1] (من بايع أمير من غير مشورة المسلمين فلا بيعة له، ولا بيعة للذي بايعه، فالخلافة شورى) (عمر بن الخطاب).

٨-ئارامی و تەقاندنەوەی تراناکان.

٩-راوێژ لە بڕیارە گرنگەکان و جێبەجێ کردنیش.

## پەرلەمانی کوردستان:

لە دوای راپەرینی ساڵی ١٩٩١ و کشانەوەی ئیـدارەی حکومـەتی ناوەنـدی و گەشەی رێکخستنی کۆمـەڵی کوردسـتان و بێسـەروبەری بـەڕەی کوردسـتانی و ململانێی دوو هێزە سەرەکیەکە.. هەموو ئەوانـە بـیری هەڵبـژاردنی پەرلـەمانی هێنایەکایەوە و لە ١٩٩٢ پەرلەمان هەڵبـژێردرا بـە پێـشبڕکێ و بەشـداری ئـەو حزب و لایەنانە بە ئەنجامەکانیشیەوە:

١-( لیستی زەرد) پ.د.ك: ٣٣٧٨٧٩ کە دەکاتە ٤٥,٢٪.

سەرۆك: ٤٦٦٨١٩ کە دەکاتە ٤٨,٣٪.

٢-( لیستی سەوز) ی.ن.ك +(زەحمەتکێشان): ٤٢٣٩٣٣ کە دەکاتە ٤٣,٨٪.

سەرۆك: ٤٤١٠٥٧ کە دەکاتە ٤٥,٦٪.

٣-لیستی (سەوزو سپی) ئیسلامی، (یەکگرتوو[1]+بزوتنەوە): ٤٩١٠٨ کە دەکاتە ٥,٠٨٪.

سەرۆك: ٣٨٨١٥ کە دەکا ٤٠٪.

٤-حسك (شین): ٢٤٨٨٢ کە دەکا ٢,٥٪.

سەرۆك: ٢٣٣٤٢ کە دەکا ٢,٤٪.

٥-ح.شیوعی عێراقی: لیست:٢١١٢٣ کە دەکا ٢,١٪.

٦-پارتی گەل: ٩٩٠٣.

٧-بێ لایەن: ٥٠١ دەنگ.

لیستی زەرد یەکەم دەنگی هێنا بە زیادی (١٤٠٤٢) دەنگ کە دەکاتە رێژەی ١,٤٪ لە سەرۆکایەتیش (٢٥٦٧٢) دەنگی زیادی هێنا، ئەو رێژەیەی کـە هاتـە

[1] یەکگرتوو جاڕ نەدرابوو، بەڵام کاری رێکخراوەی دەستی پێ کردبوو.

سەر دەزگاو پـەخشو کـار پـێکردن (٤٩٪)ی یـەکێتیو لـە ٥١٪ی (پ.د.ك)، ڕێژەی ڕاستەقینە نیە، بەڵکو ئەوە زیادەی دەنگی ئەو حزبانـەن کـە دەنگـەکانیان نەگەیشتە (ڕێژەی یاسایی لە ٧٠٪.کەوا ڕێکەوتبوون.

هەرچەندە ئەزموونێکی نوێو دەگمەن بوو، تا رادەیەك سەرکەوتوو بوو، بـەڵام دوایی (ی.ن.ك) بە ئەنجامەکەی قایل نەبوو، لەو کـاتی (پ.د.ك) تـەنازولی لـەو برە زیادە دەنگەی کرد، ڕێکەوتن کە ئەنجامەکـەی جـار نـەدرێت، دەسـەلات بـۆ هەریەکەیان (٥٠به٥٠) بێ، یەکەم کۆبونـەوەیان گرێـدا، لەسـەر ئـەو بنـچینەیە حکومەتیان دروست کرد کە سەرۆکی پەرلـەمان لـە (پ.د.ك) بێـت و سـەرۆکی حکومـەت لـە (ی.ن.ك)، بـاڵا دەسـتی هەمـە لایەنـەی (ی.ن.ك) لـە هـەموو بوارەکانی پێوە دیار بوو، دوای ماوەیەکی کورت سـەرۆکی حکومـەت و وەزیـری پێشمەرگە لە لایەن (ی.ن.ك) گۆڕدرا و لە مەدەنیانە زیاتر بـەرەو عەسـکەریانە، ئیتر ئەوەندەی نەبرد سـەرەتای شەڕی برا کوژی دەسـتی پێکرد لە لایەن (ی.ن.ك)و (بزوتنەوەی ئیـسـلامی)، دوایـیش لەگـەڵ (پ.د.ك)، یەکـەم جەنگیـشی لەگـەڵ هێزەکانی (پ.ك.ك) بوو.

لە دوا شەڕی برا کوژیو گرتنی بینای پەرلەمان لە لایەن (ی.ن.ك) بووە هـۆی ئەوەی (پ.د.ك) شەرعیەت لە پەرلەمان بسێنێتەوەو بە ناشەرعی لـە قەڵـەم دا، بەهانەی (ی.ن.ك) ئەوەبوو گوایە (سەرۆکی پەرلەمان-جەوهـەر نـامیق) بوویتـە ڕەسەدی تۆبچیەکان، بەخێرایی هێزەکانی ئیـسلامی گەیشتنە بینـای پەرلـەمان و بۆ پارێزگاریو دەرکەوت تەنها مشتو مڕێکی سـادەیە نـەك داگیرکـردن، بـەلام دیاردەیەکی زیدە ناشرین وبێ مەسـئوولیەتانە بـوو، لـە مێـژوودا چـەند جارێـك بەدەگمەن کاری وا ڕووی داوە، لەوانە : (کرۆمیـل ) پەرلـەمانی بـەریتانیا داگـیر کردو لەسەر دەرگاشی نووسی ئەو خـانووە بۆکرێیـە هەرچـی دەیـەوێ، یـان وەك (یالتسین) و هێرشەکە بە تۆپ و تانك کە لە (دۆما)ی رووسیای دا لەو سەردەمی (رۆسـلان حـسب الله ترف) سەرۆکی پەرلەمان بوو..

لە میانەی شەڕی برا کوژی چەند جارێك تەمەنی پەرلەمانیان درێژ کردەوە کە لــە ئەســلدا بــەڵێن وابــوو تــەنها لــە دوای ســاڵێك هەڵبــژاردن بکرێتــەوە، دوای ١٩٩٧/٨/١ هێزەکانی (پ.د.ك) بە هاوکاری هێزەکانی عێراق بە ناوی (توکلت علی الله) هەولێریان گرتەوە و لەو کاتیەوە (پ.د.ك) پەرلەمانی دروست کردەوە، زیاتر لە (٦٠) ئەندام دەوامیان دەکرد لە کۆی (١٠٥) ئەندام، بە پێی بۆچوونی (پ.د.ك) ئەوە ڕادەی یاسایــە، بۆیە وەك پەرلەمانێکی شەرعی لــەو ماوەیــە تــا ساڵی (٢٠٠٢) چەندین یاساو بڕیاری دەرکرد تا گەیــشتە هــەمواركردنی یاسـای حزبایەتیش، هەرچی نەیارو بەشدارنەبووەکانی پەرلەمانیشە دەڵێن ئەو پەرلەمانــە هێزی یاسایی لە دەست داوە، چونکە:

١-ماوەی درێژکردنەوەی لە هەموو پێوانەیەکی تاسایی و نائاسـایی دەرچـووە (وەختی ماناى دانیم نیە).

٢-ڕادەی یاسایی ناکەوێتە سەر ژمارەی ئەندام، بەڵکو دەکەوێتە سـەر ڕێـژەی لیستی بەشدار کە دەبێ بکاتە لە (٥٠٪+١)، لە کاتێکدا بـە حیـسابێکی سـادە دەبینین ئەو ڕێژەیە دەرناچی چونکە بەشداربوان (لیـستی مۆر) و (لیـستی زەرد)ن، کە دەکاتە:

٤٥,٢٪+(٥٠٠).٪= ٤٥,٧٪ نووقستانە.

٣-کۆمەڵێك خەڵك مردوون لە دەنگ دەران و نەوەیەکی نـوێش پێگەیـشتوون کە شایستەی دەنگن.

٤-ئەو پەرلەمانانەی کە درێژ دەکرانەوە وەك ئەوەی لبنــان تــەنیا لــە کـات و ساتە جەنگیەکان بوو هەر جەنگ تەواو بوو هەڵبژاردن کرا، ئینجا هیچ چالاکی و یاسایەکی دەرنەکرد. لەگـەڵ چـەندین خـاڵی تـر لـەو شـێوەیە، بـەڵام یاسـاوی بنـچینەی بـۆ مانـەوەی پەرلـەمان هـەروەك سـەرۆکی (پ.د.ك) لـە دانیـشتنی پەرلەمانی ساڵی (٢٠٠٢) ئاماژەی بەو قەیرانــە کـرد و وتـی: دەزگایــەکی تـری شەرعی شك نابینین لە کوردستان جگە لە پەرلەمان، کە تا ڕادەیەك ڕاستە، ئـەو

قەیرانە بە هەڵپەسێردراوی ماوە تا لە ٢٠٠٢/١٠/٤ جارێکی تر پەرلەمان بە هەموو لیستی بەشدار کۆبوونەوە و (ی.ن.ك) بە ئەنجامەکەی ساڵی ١٩٩٢ قایل بوو کە (٤٩٪) کورسی هەبێت و (٥١٪)یش بۆ (پ.د.ك)، تا هەڵبژاردنی نوێ و ناوی لێ نرا پەرلەمانی ئینتقالی.

لە راستیدا دامەزراندنی پەرلەمان و حکومەت لە کوردستان هەنگاوێکی بڕبڕ و گرنگ بوو، هەر هەمان دوو دەزگای یاسادانان و جێبەجێ کردن بوو ئەو زاراوە نوێیانەی پێ درا کە تەواویش لەگەڵ دەستوور و یاسای نێو دەوڵەتیش گونجاو بوو، چونکە هەم لە (خود موختاری-حکم الذاتي) و هەم لە فیدراڵیش و بەسەروو تر دەتوانرێ حکومەت و پەرلەمانی هەبێت، هەروەك لە هند، رووسیا.. نموونەی پێش چاوتر حکومەتی و پەرلەمانی فەلەستین لە چوارچێوەی (حکم الذاتي)یشە، بووە مایەی شادمانی خەڵکی کوردستان، ئیتر هیوایان وا بوو کە ئەزموونی کورد وەك وڵاتانی عەرەب نەبێتە دیکتاتۆری و دەنگ هێنانی ٩٩،٩٩٪ و پاوان و شەڕە دەسەڵات، کە لەزۆر لادا دەسەڵاتی حزبە کوردیەکان بەدەسەڵاتی عەرەبی چووە.. بە داخەوە لە کۆتاییدا وا دەرچوو.. هێشتا ئەو پەرلەمانەش دەسەڵاتی راستەقینەی خۆی لە ژێر رێنمایی حزبایەتیدایە، زۆربەی بڕیارەکان لە پێشدا بە ئامادەکراوی لە (م.س)ەوە دێت،لەڕاستیدا دەسەلاتی پەرلەمان لاواز دەبێ لەژێر سایەی (بنەمای تەوافوق)، چونکە لە کوردستانیش لە نێوان ئەو دووحزبە دەسەلاتەکان بەپێی تەوافوق دابەش کراوە ،ئەم تەوافوقودەش لە جهان دا تەنها لەو وولاتانە پەیڕەو کراوە کە دووپێکهاتەی لێك جیان لەوانە: چیکۆسلۆڤاکیای پێشوو قوبرس و لبنان و عیراقی ئێستا .. کەواتە ئەو دوو حزبە لەبەر دەسەلات بازی ئامادە بوون میلەتێکی یەك مێژوو و زمان و مەزەب و ..بکەنە دووبەشی وا کە خەریك بوو لەسایەیدا فیدرالی ئوستانی (محافظات)بەرجەستە ببێت، بەلام بۆ داهاتوو کە رەنگە فرەلایەنی بکەوێتە ناوی و بەرەو پێش تر بچێت.

**دەقی نامەکـەی شـا جۆرج:**

لە شای ئینگلتراوە (جۆرج) بۆ خەلیفەی موسڵمانان لە شانشینی ئەنـدەلوس، خاوەن شکۆ (هشـامی سێ یەم)ی پایە بەرز.. دوای سڵاو و رێز:

گوێبیستی بـاڵای پلـەی خوێنـدن و زانـست و پیـشەسازی بـووین لای ئێـوە، ویـستمان بەشێك لەو رووناکیە بەر نەوەکانی ئێمەش بکەوێ کە تەواو بـێ بەشـین لە زانـست و زانیاری، ئەوا خوشکە زایەکم شازادە خانم (دوبانت)م نارد بـە خـۆ و بە دەستەیەك لە کچە ماقوڵانی ئینگلترا بە دیاریـەکی سـادەش بـۆ جـەنابتان[1]، داوامانە کە بە زانست و زانیاریەوە بگەرێنەوە لامان تـا نـەوەکان فێـرە زانـست بکەن.

خزمەتکارتان

جۆرج

خەلیفەش وەڵامی داوەو قایل بوو و فێرە زانست بکرێن لەسەر بودجەی (بیـت المال)[2].



بەو شێوەیە دەردەکەوێ ئەگەر هەموو مێژوو بە مێژووی ئەوروپاشـەوە دارنـین لە کاریگەری ئاین و هەتا ئەو نامـەیەی سـەرووش چاوپۆشـی لێ بکـەین، دەبیـنین ئەزموونی بەشەری تەنها لـە دوای سـەدەی (١٢) دەسـتی پـێ کـردووە، کەچـی شورای ئیسلامی بە لایەن کەمەوە (٦) سەدە پێش ئەو مێژووە بـە نـاوەرۆکێکی کردەیی دامەزراوە، ئینجا شورا پڕ بەناوی راوێژو تەگبیرو دارشـتنی هەڵوێـست و یاسای نوێیە، کەچی پەرلەمان وەك لـە زمـانی فەرەنـسی بـە مانـای (قـسەکەر

---

[1] دوایی لە کتێبی تر دەرکەوت دیاریەکان زێر بووینە.
[2] بۆ زیاتر سەرنج بدە ا-التمكين للأمة الاسلامية ل٦٩. ب-نحو أسلوب أمثل للدعوة الاسلامية ل١٧٧. ج-الغرب نحو الدرب.

parler ) ئەوەندە لەو ناوەرۆکەی ئەرك و فەرمانی ئێستای پەرلەمان نزیك نیـە، کەواتە هەردەم لە گەشەی زاراوەکان سەربردەی لای رۆژئـاوا زیـاتر زەق دەبێتـەوە چونکە لەوێ بە ناتەواوی رێ دەگری بەرەو تەواویەك کـە لـە ئیـسلامدا هـەبووە، هەر بە سەرنجێکی سادە دەبینین هەر لێرەش لـەوانی پێـشوو داهـاتووش دەبیـنین چۆن پەرلەمان لە سەدەی (١٢)وە بەرێ کەوتووە بەرەو ناوەرۆکێك گەشە دەکا کە شورایە.

(١٩)

## دەســـتوور القانون الاساسي Constitution

لە سەردەمی دەوڵەتی مەدینە دەستوور هەبووە ناوی (الصحیفة) بووە، مادە بە مادە لە قورئان وەرگیراوە[1]، بەڵام وەك ( وشەكە) وابێ دەچی لە بنەچەدا كوردی یان فارسی بیت ، لەسەدەی ١٩پەڕیوە نێو فەرهەنگی عوسمانی دوایش عەرەبی بۆیە لە(لسان العرب) ئەو زاراوە نیە كەچی لە (قاموس المحیط) هەیەو دەڵی (الدستور: النسخة المعمولة للجماعات التی منها تحریرها) لە (فەرهەنگی (كوردستان)یش هاتوە دەستور مانای بنەگە، ڕێ پیشان دان ...كە دەڵێ دەستوری كوردەواری بەمانای دابو نەریتە رەسەنەكان دێت.

جاران بە وەزیری دەستە راست یان وەزیری گەورە یان ئەو وەزیرەی زیاتر لە ئیش‌وكاری خەڵكی پێنچاوەتەوە وتراوە (دەستوور)[2]، لە ئێرانیش بەو دەفتەرە وتراوە دەستوور كە مانگانەی سەربازەكانی لێ تۆماركراوە .

بەڵام بەو مانایەی ئێستا كە یاسای بنەرەتی بە یەكەم جار (وەك فكری بەشەری) لە بەریتانیا پیادە كرا، ئەویش وەك فكرە لە رێنی ئەندەلوسەوە پێی گەیشت، بە پێی سیستەمو نەریتو بەرژەوەندی شایانەی خۆیان و هەندێ نەریتی سیاسی رۆمانو یۆنانی كۆن دەستوورێكی وایان دارشت وەك رێكەوتن نەك نووسینەوەی مادە بە مادە، كە هەمان سەرچاوەی بەڵگەنامە بالاكەی (ماگناكارتایە) ی ساڵی (١٢١٥)ز لە لایەن شا جۆن سانتیر دەرچووە، ئیتر بەرە

[1] معركة المصطلحات -د.محمد عمارە، ل٣٧.

[2] تعریفات جرجانی -مادە دستور- ل٦١.

بەرە ولاتانی تریشی گرتەوە، دەستوری ئەمریکی لە ١٧٨٧و دوایش دەستوری فرنسی لە ١٧٩١وەك دەستوری نوسراو سەری هەلداو تەنیەوە بۆ وولاتانی هاوچەرخ، تا جاریکی تریش لە ١٨٧٥ز هاتەوە ناو دەوڵەتی عوسمانیش بە تایبەتی لە ڕێی مدحت پاشاو بزوتنەوەی (عوسمانی لاو) بەناوی مەشروتیە، لەناو ولاتانی عەرەبیش یەکەم دەستوور (بە مانای ڕەچەلەکی دەستوری لە سالی (١٨٥٧)ز لە لای (محمد بای دووەم) لە تونس دەرچووە، دوایی لە میسر ١٨٨٢ز، لە سعودیەو لبنانیش ١٩٢٦ز، ئوردەن ١٩٢٨، لە سوریا ١٩٣٠، لیبیا ١٩٥٠، عیراقیش ٢١ \٣\ ١٩٢٥ ..ئەوەی لەسەر ئەو دەستورانەی ولاتانی عەرەبی دەگوترێ تا ئیستاش ئەوەیە هەموو ئەو دەستوورانە لە لایەن (د.أحمد عبدالرزاق سنهوری ١٨٩٥-١٩٧١) نووسراوەتەوە کە فەقیهەکی پاسانانی میسریە، دکتۆرای لە فەرەنسە تەواو کردبوو، زۆر لە ژێر کاریگەری یاسا و دەستووری فەرەنسی نووسیویەتەوە تا رادەی وەرگێرانی کت و مت، هەرچی لایە سیاسیەکەشیتی زۆربەی خورد کردنەوەی ئینتداب و وەسیەکانی ئیمپریالیزمی بووە، لەو دوایە هەندێ بەندی بەلای سۆشیالیستی ئەتەوەیی و لە هەندێ شوێن بەلای شیوعیەت و (باری کەسیش)ی بەلای شەریعەتی..چووە، بۆیە ئەو دەستورانەی ئیستای ولاتانی عەرەبی زۆربەی بە ڕەچەلەك فەرەنسی و ئەویش بۆ نەریتی رۆمانی کۆن و ماگناکارتاو نەریتی بیانی دەگەڕێتەوە، کە زیاتر گوزارش لە نەریتو فەرهەنگو کەلتووڕو ئاینی خۆیتیان، بۆیە ئەو دەستوورانە نە لە نزیك نە لە دوور لەسەر ئیسلام حساب ئین، چاکترین پێناس دەتوانرێ بلێی دەستووری عەلمانین، دەستووری ئیسلامی و عەلمانیش بەوە لێك جیا دەکرێتەوە لە ولاتانی موسوڵمانئشین دا، دەستووری ئیسلامی سەرچاوەی وەرگرتنی بە تاقی تەنها شەریعەتە، ئەوەش گەورەترین شۆرش‌و ئامانجی پێغەمبەرەکان بوودو ئامانجی بزوتنەوە ئیسلامیەکانی ئیستاشە.

دەستووری عەلمانی لە جیهانی ئیسلامیدا لە باشترین دۆخیدا پەیوەندی بە شەریعەتی ئەو بەندە لاوازەیە کە لە بنە چەدا لە (کۆنگرەی یاسایی لاهای ١٩٣٧ )[1] لە لایەن یاسا ناسانی ئەوروپی ئەو بەندە تۆمار کرا وەك هەنگاوێکی ئیجابی بۆ هەموو جیهان، بەو شێوەیە: (الشریعة الاسلامیة مصدر هام التشریع) یان (مصدر رئیسی من مصادر التشریع)، واتە شان بە شانی (شەریعەت) هاوبەشێك لە دەستوور و شەریعەتی غەیرە ئیسلامی بۆ دادەرژن کە ئەوەش لە لایەن زانایانی ئیسلامی و بزوتنەوە ئیسلامیەکان رەت دەکرێتەوە بە پێی ئایەتی ﴿وَلاَ يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا﴾، ﴿وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ﴾. بەشێکی تری ئیسلامی پێی وایە ئەو بەندانەی سەرووەدروستە بۆقۆناخی گواستنەوە نەك هەتا هەتا یە .

بەو شێوەیە زۆربەی وڵاتانی موسوڵمانانشین بریتین لە کۆمارێکی سۆشیالیست یان نەتەوەیی یان شاهنشین و لیبراڵی، یان کۆمارێکی تێکەڵ لەوانە.. یەکەم دەستووری ئیسلامی لە قۆناغی نوێدا لە (ئێران) لە دوای شۆرشی ١٩٧٩ دارێژرا کە شەریعەت تاکە سەرچاوەی دەستوورەکە بێت، ئینجا ئەفغانستان و سودان و چیچانیش وەك دەوڵەت بەدوایدا هات، لە زۆر ویلایەتی تری وەك پاکستان، مالیزیا، نایجیریاش ئەو پەیرەوکردنە هەیە.. هەرچی وڵاتی عەرەبی سعودیە ئەوەیان سیستەمێکی شاهنشاهیە تەنها (باری کەسێتی) تەواوەن شەریعەتە،ئەگینا بناغەی دروست بوونی ئەو دەوڵەتە لەسەر بنچینەی رێکەوتنە بە ناوبانگەکەی محمد بن عبدالوهاب وحمدبن سعود لە ١٧٣٨ز کەتیایدا وا رێکەوتن دەسەڵات بۆ بنەماڵەی ئال سعود وفتواش بۆ بنەماڵەی عبدالوهاب ئەوەش بەرجەستە کردنێکی ترسناکی جیاکردنەوەی ئاینە لە دەسەڵات و سیاسەت بۆ یەکەم جار لەجهانی ئیسلامی بەو راشکاویە ، هەرچەندەماڵی ئال

[1] معلمه الإسلام انور جندی م ٢ ص ٣٣٤

سعود لە ساڵی ١٩٢٩ز ئەو ڕێکەوتنەیان هەڵوەشاندۆتەوە بەلام زانایانی ئاینی سەر بەدەسەڵات تا ئیستاش لەلای خۆیان یەك لایەنانە پا بەندن پێی .

دەستوور کۆمەڵگەی پێ ڕێك دەخرێ و لە سەروو ڕا تا خواروو، لە هەموو بارێکدا پەیمان (مەرجعیەت) و پەیوەندی نێوان دەسەڵاتدار و هاوڵاتیە لە لایەك و لە لایەکی تریش هاوڵاتی خۆبەخۆ، بۆیە (بەڕای زانایانی ئیسلام) ئەگەر دەستوور ئیسلامی نەبێت لە حوکمدا حەقەن ستەمی تیا دەبێ ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾.

بۆیە دەبێت دەستوور لەسەرووی پەرلەمان بێت، نابێ پەرلەمان دەستوور دارێژێ بەلکو ڕاستەوخۆ لە لایەن میللەت (یان ئومەت لە ئیسلامدا) دیاری دەکرێ، ئینجا پەرلەمان لە ژێر ڕۆشنایی دەستوور مەودای دەسەڵاتی تەشریعی دەبێت، ئەو دەستوورەش چەسپاو نیە لە بنچینەدا بۆ گۆڕین و گەشەکردنی کۆمەڵ هاتووە، بۆیە هەردەم بە پرۆژە حسابە هەر چەندە یاسای بنەڕەتیشی پێ دەووترێ بەو مانایەی یاسای نا بنەڕەتی لێ هەڵدەهێنجرێ نەك بنەڕەتی بەمانای چەسپاو، بەلام لە زۆربەی سیستەمی دەستووری عەلمانیدا جۆرێك لە چەسپاویە و بەپێی نەریت و کەلتووری میللەتەکان و بنەماڵەی دەسەڵاتدار دروست دەبێت (هەروەك لە بەریتانیا باسمان کرد)، بۆیە (گیزۆ)ی فەرەنسی ئەو مەتەڵەی لادروست بوو بلاوی کردەوە بە پرسیارێك: ئاخۆ دەستوور سلوك و نەریتی خەڵکی دیاری دەکا یان پێچەوانە، یان بەشێوەیەکی تر جوڵان و گەشەی کۆمەڵ دەستوور نوێ دەکاتەوە یان پێچەوانە ؟

ئەو مەتەڵە لە دەستوری عەلمانی بێ وەلام بووە هەروەك (هێلکە لە مریشك یان پێچەوانە)، لە مارکسیەتیش خێرا وەلامەکەی ئەوەیە سیستەمی کۆمەلایەتیە دەستوور دیاری دەکا[1]، بەلام لە ئیسلامدا زۆر روونە مادام دەستور پرۆژەیە، مانای دەستووری ئیسلامی تەواو جووت بوون نیە لەگەڵ (پەیام)،

---

[1] القانون و الاشتراكية - ل٦١.

چونکه خودی دەوڵەتی ئیسلامیش لە قۆناغی پرۆژە دایە لەو (فترة انتقالیة).. میللەت گەشە پێ دەدا لە هەموو رووییەکانی کۆمەلآیەتیو ئابووریو شارستانیو تەکنەلۆجی و سیاسی و عەقیدەیی بەرەو خەلافەتی راستەقینە و ئوممەی ئیسلامی و دادگەری.. وەلامی پرسیارەکەی (گیزۆ) زۆر روونە لەلای زانایانی ئیسلامیو ئەوەیە دەستوورە سلوکی خەلکی دیاری دەکا، ئەگەر چی دەستووریش رەنگ دانەوەی واقیعە بەومەرجەی دەستور پێشرەو بێت، واتە مانای بێ دەوری خەلکیش نیە، هەر خەلکە ئەو دەستوورە هەلدەبژێرێ تا لەو پرۆژە دەردەچێت دەگاتە قورئان و سوننە، تا ئەو کاتی دەستووری ئیسلامیش دەشێت هەڵە بێت، گفت گۆی لەسەر بکرێت، گەشەی پێ بدرێت، هەروەك لە سەردەمی دەولەتی مەدینە کە پێغەمبەر (د خ) خۆی بەپێی پەیام دایمەزراند یەکسەر قورئانی پیادە نەکردووە، بەلکو دەستورێکیان دارشت قۆناغ بە قۆناغ کە هەر لە قورئانی پێرۆز وەردەگیرا بەناوی (صحیفة)، ئایەتەکانی قورئان زیاتر خورد دەکرایەوە بۆ ئەو (فترة انتقالیة)ی لە کۆمەلگەیەکی ئەفامی بەرەو کۆمەلگەیەکی دادگەری شەریعەتی، هەروەك لەو مادەیەی (صەحیفە) بە نموونە (..ماكان بين اهل هذه الصحيفة من أشتجار يخشى فساده فمرده الى الله و الى محمد)[1]، بەلام دوایی کە کۆمەلگەیەك رەنگ و ئینتمای راستەقینە عەقیدە بوو، (ئوممەت) دروست بوو (پەیام) راستەوخۆ بووە ئەو دەستوورە شایەنی دەستکاری گەشەپێدان و گفت و گۆ ئامێنێ، بەلام ئەو یاسایانەی کە شورا (یان پەرلەمان) لەژێر رۆشنایی ئەو دەستورە هەلی دەهێنجێ چ لە (فەترەی ئنتقالی) ئیسلامی ج لە سیستەمە دیموکراسیەکاندا دەشێ هەلسەنگێنرێ، ئەوجۆرە دەستورانەی بواری گۆران و دەستکاری زۆری هەبێ پێی دەوترێ "دەستووری نەرم" ، بە پێچەوانە پێی دەوترێ "دەستووری پتەو" ،ئەوجۆرە دەستوورە پتەوە یان زۆر بەدانایانەو لە سەر بنچینەی ئاینی وردەقی نەگۆر دروست بووە یان لە ئەنجامی رێکەوتنی کۆمەلێك

[1] مجموع الوثائق السياسيه للعهد النبوي و الخلافه الراشده، ل٢٠، د.محمد حيدالله الحيدر ئابادي.

پێکهاتەی نێو یەك دەوڵەت لەسەری رێك کەوتوون وەك تەوافوق،عیراقی توێ یەکێکە لەو جۆرە دەستورانە، واتە یتەو، بۆیە دەستکاری هەر مادەیەك مەرجی فۆرسی بۆ دانراوە .

یتەوی ئەو دەستوورە رێ لە دەسەڵاتی سەرۆك، ئەمیر، خەلیفە، رەهبەر، .. دەگرێ کە بەهەڵە یاساو فەرمان دەربکا.. وئەوەش مانای سەروەری یاسایە، لە سیستەمی دیموکراتیشدا ئەگەر فەرمانێکی میری دەرچوو دەستووری نەبێت ئەوا دەزگای تایبەتی هەیە بەزۆری ناوی (پارێزەرانی دەستوورە) یان (چاودێرانی دەستور)، ئەو فەرمانە هەڵدەوەشێنێتەوە، دەگوترێ دەستووری نیە، هەرچی دیکتاتۆریەکانە ئەوا هەر خۆیان هەم پەرلەمانو دەستورو نومەتیشن، لە یەکەم دەستور لە سەروی سەرۆکە لە دووەم دا دیکتاتۆر لەسەرووی دەستوورە .

## (٢٠)

# یـاسـا قانون (تشریعات) Law

له ئەسڵدا وەك وشە (قانون) عەرەبی نیە، لە یۆنانی بە ڕاستەدار وتراوە (کانون)[١]، لە کوردیش وشەی "یاسا" لە (یاسق)[*]ی جەنگیز خان هاتووە، لە ڕۆمیشدا (نوما) مانای یاسایە بەو تێگەیشتنەی هێزو یاسا لە پاڵ یەك بن بۆیە (ڕۆما)ش هەر ئەسڵ لە (ڕۆمۆلوس واتە هێز) هاتووە[٢]، هەربۆیەش یاسا نزیکە لە .(دیفاکتۆ)ی لاتینی کە دەکاتە (هێزی ئەمری واقیع) ئیستاش دەبینین سەرچاوەی زۆربەی یاسا تایبەتیو گشتیەکان بە یاسای دەولیشەوە لە (دیفاکتۆ) ئەمری واقیعەوە هاتوەو دێت هەروەك هۆبز بە ڕاشکاوانە تر دەڵێت یاسا بریتیە لە فەرمانی دەسەڵاتدار[٣]، (سەفسەتیەکان-سۆفیەکان) هاوشێوەی ئەو ڕایەیان هەبووە سەبارەت بە یاسا هەر وتویانە (هێزە یاسا دروست دەکا)، لە (پروتوکولات ..) ورای (هوبز ) هێزو یاسایان پێك وەبەستوەو .

بەگشتی بە مانای جێ بەجێ بوون و پەیڕەوکردنی لە هەموو بەشەکانی[٤]، ئەوەش مانای جەرهەریەکەی پەیام و شەریعەتە، قورئان خۆی پێکهاتووە لە (عەقیدەو شەریعە واتە بیرو بڕواو یاسا)، ئەگەر ئینجیل مانای (مژدە)یە بەڵام

---

[١] موسوعة المصطلحات العلوم عند العرب -مادە- قوانین.

[*] جەنگیز خان کۆمەڵێك بڕیاری دەرکرد لەشێوەی شەریعەتێکی تێکەڵ وتەرهیم لە ئەدیت وئاینی جیاجیا .

[٢] ق عقد الاجتماعی-روسو-

[٣] بروانە :موسوعە الفلسفیە المختصرە -المادە تعریز

[٤] موسوعة المصطلحات جامع العلوم-مادە-قانون-

تەورات و ئاڤيستاماناى (شەريعەتە)، كە راستەوخۆ بەو مانايە هاتوون نەك وەك (قانون) بەماناى راستەدار گەشەى كردبێت، هەموو ئەو زاراوە ئيجابيانەى رۆژئاوا كە لە ناوەڕۆكدا لە ئاين وەرگيراوە دواى دەستكارى و وشەيەكى خۆمالى نزيكيان پێ داوە..هەر كتێبە ئاسمانيەكان دادگەرى و ياسايى راست و دروست بە (طريق المستقيم)، (صراط المستقيم)، (الاستقامة) بەستوە كە لە قورئانيش پێكيان بەستووە بۆيە فيكرەى (قانون-كانون) ناوەڕۆكەكەى ئاينيە، بە ئينگليزيش بە ماناى (الاستقامة) يان (معيار) يان (قاعدة)، (مبدأ)..، هاتووە (بۆ زياتر سەرنج بدە قاموس التربية وشەى-CANON) ل٤٥.

زۆر جۆرە پێناسى لێك نزيك تريش هەيە هەندێكى لێ هەڵدەبژێرين:

ياسا بريتيە لە:

*بەر زەفت كردنى كۆمەڵ بەهۆى دەسەڵاتێكى رێكخراوەوە (رۆسكۆپۆند)[1].

*كۆمەڵە رێسايەكى يەكسان و هاوبەشە بۆ رێكخستنى پەيوەندى نێوانيان كە لە لايەن هەموو لايەكيشەوە قەبوڵ بێت. (ماكس كلاكمان)[2].

*بە پێى ئەنترۆپۆلۆجيەكان هەمو رێكموتنێكى گشتى ياسايە (مقدمة في أنثروبولوجيا الاجتماعية).

لە فەرهەنگە كۆنەكانيش وا هاتوە:

*ياسا لە فيقهدا زياتر بۆ گەڕانەوەى ئەحكامى فيقهى يە، بەڵام بە ماناى رێكخستنى پەيوەندى تاكەكان لەهەموو بوارەكان هاتووە. (زياتر سەرنج بدە: معجم مصطلحات أصول الفقه).

*جرجانيش لەسەدەى (١٤) لە (١٣٤٠-١٤١٣)ز ژياوە.. بە بۆنەى ياساى زمان پێناسێكى گشتى كردووە لە (تعريفات) دەڵێ :(أمر كلي منطبق على جميع جزئياته التي تتعرف احكامها منه).

[1] مدخل الى علم الانسان.
[2] مدخل الى علم الانسان.

+قاموس المحيط: قانون هو مقياس كل شيء

+زۆر جۆرە پێناسی نوێ تر هەیە، بەشێك پێیان وایە یاسا ئەوەیە كە دەوڵەت دروستی دەكا لەوانـە ( هـۆبز، هیگـل، دۆهـرنگ،..) وەك ئێـستاشی وابـاوە، بەشێكی تر دەڵێن ئەخێر لە سروشت و بنچینەدا یاساكان خوایین (خوا ڕسكن نەك خۆرسك) لەوانە (شیشرۆن، قدیس ئۆگستین، توما آكوینی، ..)، هەندێكی تـریش دەڵێن لەناو دەروونی ئادەمیزاد رەگی هەیە (رای یۆنانی كۆنیشە).

+ رای تریش هەیە دەڵی یاسا ئەوەیە كە لەلایەن بە هێزەكانـەوە دەردەچـێت، ئەوانـە: هـۆبز، نیتـچە، میكـاڤیلی ... یاسـای دادگـەری (یـان شـەریعەت) پێویـستـەكی تاك و كۆمەڵایەتیە، بۆ بەردەوامی ژیان، مادام دەروونی ئادەمیزاد پڕە لە حەزو ئارەزووی تێر نەبوو لە ڕووی: خۆ دەرخستن و تەمـەلوك و جـنس و حەز بە زاڵیەتی و.. ئەوەش لەگەڵ بوونی دەسەڵات و بوار دەبتە هۆی هەڵلوشینی حەزو ئارەزووی خەڵكی تر.. ئیتر ئەوە بناغەی جیـایی بەرژەوەندیەكانـە،جا ئـەو یاسایە لە ئەسڵدا بۆ ئەوە هاتووە ڕێ لەو حەز و ئارەزووەزیـادە ڕەویـە بگرێـت و بیگێڕێتەوە سنووری خۆی، سنوری ئازادی وئارەزووی هەر یەكێك كۆتایی دێت لە سنوری یەكێكی تر، ئـەركی یاسا ڕاگرتنی ئـەو سـنورەیە، ئـەوەش مەبەسـتی پەیامەكانی ئاسمانی بووە بەگشتی، دادگەریترین یاسا ئەوانەن كە بەستاندەری ئەو سـنورانە دادەڕێـژێت لـە نێـوان مرۆڤـەكان، پەیوەندیـەكانیان ڕێـك دەخـا، بـە پێچەوانەش یاسـای بەدیل جۆرە یاسـایەكی ستەمكار دەبێت نەك لەگەڵ زۆرایـەتی خـەڵك هـەتا لەگـەڵ یاسـاكانی سروشـت و كۆمـەڵ و گـەردوون میكـانیكی و كیمیایی.. هتد ڕێك نابێ، بۆیە وەك لـە پێناسـەكان هـاتوون هـەمووی پێناسـی ڕاست و دروستی یاسا نیە، یان بەلای كەمـەوە پێناسـی یاسـای دادگـەری نیـە، مەرج نیە هەر ڕێكەوتنێك یان دەوڵەت و دەسەڵاتدارێك یـان پەرلـەمانێك بڕیـار دەركا یاسا بێت، هەتا نەریتیش لەگەڵ یاسا جودایە ئەنـرۆپۆلۆجیەكان نـەریت و یاسـا تـەنها بـەوە لێـك جیادەكەنـەوە كـە (یاسـا) هێزێكـی جێبـەجێ كردنـی

(متفرغ)ی له پشته، .. نەخێر ئەوە زۆربەی نەریتە (نەك یاسا) كە بەهێز دروست دەبێت[1]، كۆمەڵگەیەكی دەرەبەگی یان خێڵەكی یان برجوازی لێ دروست دەبێت هەروەك دەبینین زۆربەی یاساكانی رۆژئاوا بە تایبەتی بریتانیا زیاتر گوزارشی نەریتە ئابوری و ئاینی وكۆمەلایەتیەكانە تەنانەت كۆمەلە بەلگەنامەی ماگناكارتاش بەو شیوەیە دەرچوو، بە تایبەتی نەریتی چینی برجوازی، یاسای راست و دروست ناكەوێتە سەر هێزو زۆرایەتی و زەمان و زەمین و ماقولایەتی و رەچەلەك و..

یاسا بە گشتی چ كۆمەلایەتی چ سروشتی چ زانستی..كۆمەڵێك سیفاتی نەگۆڕي هەیە بەوەش جیا دەكرێتەوە لە رێساو تیۆرو بەلگەنەویست و فەرەزیە.. یاسا راستی موتلەقە، لە دووبارە بوونەوەی هەمان راستی دروست بوە.. واتە رۆژهەلاتن و ئاوابوون یاساییە.. چونكە هەروەك خۆی (لە جەوهەردا) دووبارە دەبێتەوە. تاقی كراوەتەوە، ئەوەی تاقی نەكراوەتەوە پێی ناوترێ یاسا ئەگەر ئەو ناوەشی بۆ داتراشێت، مەگەر دووبارەی گۆڕاوی بێت وەك یاسای (یەك لە دوای یەكی ئەندازەیی)، بۆیە بەهەڵە لە لایەن عەلمانیەكانەوە دەگوترێت پیادەی شەریعەت گەڕانەوەیە بۆ دواوە.. نەخێر مادام یاسا كۆن نابێت، گەڕانەوە و چوونە پێشی نیە، پەیوەندیەكی جێگیرە نەك هەر حوكم لەسەر نەگۆڕەكان بكا بەلكو حوكم لەسەر جولان و گەشەو گۆڕانەكانیش دەكا، یاسا ئەو پەیوەندیە نەگۆڕیە لەنێو كۆمەڵێك دیاردەو شتەومەكی گۆڕاو كە گوزارش لە لایەنە گشتی و وێلك چووەكانی دەكا، هەموو دیاردەو شتێك هەندێ لایەنی تایبەتی خۆی هەیە كەباری ئاوەكی خۆی پێ رێك دەخاو ناسنامەی پێ گوزارش دەبێ، چەند لایەنێكی گشتیش هەیە كە هاوبەشە لەگەڵ ئەوانی تر..

---

[1] ح ئابوبكر دەڵێ: (بەهێزتان لام بێ هێزە تاحەقی لێ وەردەگرمەوە، بێ هێزیشتان بەهێزە تا مافی بۆ وەردەگرم).

بۆ نموونە هەموو تەنێك وێك چووە لە راكێشان، ئیتر یاسایەك نوێنەری ئەو پەیوەندیەی نێوان هەموو تەنێك دەكا لەو جیهانە بە (كێش=ك (ب١×ب٢)\(دووری)[٢]).

هەر چەندە ئەوەی سەروو نموونەی یاسای سروشتی بوو، بەلاّم یاسا بەگشتی ئەو نیشانانەی هەیە:

١-دووبارەبوونەوەی بەردەوام.

٢-بەند نەبوونی بە زەمان و زەمین.

٣-دەدۆزێتەوە دروست ناكرێت.

٤-پەیوەندیەكی چەسپاوە.

٥-لە چوارچێوەی یاسادا (ناویر) نیە، (شاز) نیە، شمولیە..

بۆیە (لكل قاعدة شاذ) نەك (لكل قانون شاذ)، مادام یاسا شیازی تیابوو لە پایەی یاسا دادەبەزێ بۆ (رێسا-قاعدة)، چونكە هەندێ جار لە كتێبە كۆن و نوێیەكانیش یاساو رێسا بەیەك چەمك لێكدراونەتەوە[١]، بەو شێوەیە یاسای تەواو وەك یاساكانی سروشت ئەو سنورە رادەگرێ كە بە ئەندازەیەكی ستاندەر -عەیار- بەرێوە دەچی، كەمترین ترازان جۆرە سەرەنجامێكی وای دەبێ هەموو سروشت تێك دەچێ، ترازان لە یاسای كۆمەلاّیەتیش كارەساتی ستەم و كێشەكانی تری لێ سەرهەلّدەدا، كەواتە یاسا ستوورە، رادەیە، عەیارە، ئەندازەیە.. رێكخستنە، لە نێوان ئەویەرو ئەم پەڕ، هەردەم یاسا نە زۆر توند نە زۆر نەرم، نەبزێو نە وەستاو، نە ئاژەلّی نە فریشتەش، نە مەسەیری و نە مخەیەری، نە سەربەستی موتلەق و نە بەستانەوەی موتلەقیش.. لە نێوان هەموو ئەوانە ستورێكی ناسك هەیە پێی دەلێن (عەیار)،هەر ئەوەشە پێی دەلّێن یاسای دادگەری (شەریعەت)، كەمتر بە نادەمیزاد دەدۆزرێتەوە با دادگەریشی بوێ، هەروەك (ئەمانویل كانت ١٧٢٤-١٨٠٤) لە پیش هەموان دانی پیا هێناوە، جا لە تەقەلاّی دۆزینەوەی ئەو عەیارە

[١] بۆ زیاتر سەرنج بدە (موسوعة الاصطلاحات الفنية و العلمية)، ئەوەش بە روونی تێكەلّی كردوە.

(كە ناتواترێ) زۆر جۆرە ياساى لێ پەيدا دەبێو هەمووش ناوى ياساى لێ دەنرێ، جگە لە وانەش بەشى تريش كە هەر لە ئەسڵدا بەدواى ستەم و چەوساندنەوەن و دەيكەنە ياساش، هەروەك مەسەلەى سياسەتى ميكاڤيلى و سياسەتى رەوشتى، لێرەش ياساى راست و دروست رەوشتيە، بەشێكە لە رەوشت هەروەك لە كۆنەوە (سقرات، ئەفلاتون، ياسايان بە بەشێك لە رەوشت زانيوە، زۆر راستە ياساى بێ رەوشت كوێرە هەق و ناهەق تێكەڵ دەكا، دەبێتە دارستان تا ئەوكاتى (محامات- پارێزەر)، مافى مرۆڤ، مافى زيندانى، ..هتد پێويستە، دادگەرى بەوە دەچەسپێ كاتێ ياسايەكە بەشێك بێت لە رەوشت، عەقيدە، .. هەم مرۆڤەكانى چوار چێوەى ئەو ياسايەش رەوشتداربن.. ئەو كاتى ئە (پارێزەر)ى پێويستە بۆ دادگا ئە دەزگاى (مافى مرۆڤ)، ئيتر ياساى رەوشتى (سيفاتى راستى) هەيە، بەند نابێت بە بارودۆخو زەمەنو قۆناغى مێژووى شايەنى دەستكارى نيە، نەگۆڕن، .. هەر بۆيەش ئەو ياسايانەى پێش (١٤) سەدە دادگەرى بووينە ئێستاش هەر دادگەرى دەبێت، بۆ هەموو سەردەمێكى تريش، هەروەك (مۆنتسكيۆ)ش دانى پيادا هێناوەو دەڵێ، لە پێش پەيدابوونى (ياساى دەستكرد)يش ياساى دادگەرى هەبووە[١]، هەر چەندە لەو بۆچوونەيدا لە دوو شوێن تەواوى نەپێكاوە چونكە (ياساى دەستكرد) هەرگيز دادگەرى نابێت، ئنجا ئەو پێى وايە لە پێش ياساى دەستكرد بە ياساى سروشت كاركراوە.. نەخێر ئەوەى ياساى سروشتى داناوە هەر ئەويش ياساى كۆمەڵى داناوە لە ڕێى پەيام وهەر ئەويشە دادگەرى - كە هەماهەنگە لەگەڵ ياساى سروشت نەك هەر عەينى ياساى سروشتى خۆى بێت، هەر بەو بۆنەيەوە دێينە ناو ئەسڵى ياساى دەستكرد و هەموو ئەو بەرهەمانەى عەقلى بەشەرى لە (ياسا، دەستور، رێكخستن، دەوڵەت، ماف، رەوشت، مرۆڤايەتى، ..) هەر هەمووى يان ئەسڵى ئاينى هەيەو گۆڕانيان بەسەر هێناوە، يان لە ياساكانى سروشت سود وەرگيراوە چ بەسەلبى چ بە ئيجابى هەڵبەتە بە

[١] روح القوانين- مونتسكيو.

یاساکانی حمورابیشەوە کە دەڵێن یەکەم سیستەمی یاسا ئەو دایڕشتوە! لە یاسای خێڵەکی هاتووە: خوا بەردی گەورەو بچووکی داناوە..ئەوە یاسایەکی سروشتیە، دادگەریە بۆ سروشت .. کە دەبێتە یاسای کۆمەڵایەتی و چینایەتی لەسەر بنچینەی غەیری بنچینەی (ان اکرمکم عند الله اتقاکم) لێ دەردەچێ و ستەمە، واتە یاسای سروشتی مەرج نیە دادگەری بێت بۆ کۆمەڵ، لەسەر ئەو بنچینە دوو جۆرە یاسا (بەسەرەکیانە) لەناو کۆمەڵ و دەسەلاتدا هەیە، یەکەمیان:(یاسای دانراوی ئادەمیزاد)، دووەمین: یاساکانی خوایین کە بریتیە لە بەرنامەی رەسەنی ژیان، چونکە ئاینی ئیسلام (طقوس)ی نیە بەو مانایەی کە ئەنسرۆپۆلۆجیەکان بە (ئاینی جادووی یان کۆمەڵە سەما و هەڵپەرکێیەك) وەسفی دەکەن.. ئیسلام بەرنامەی چۆنیەتی ژیانی بەستاندەرە.. بەدیلی بەرنامەی سوشیالیستی و شیوعی و سەرمایەداریە.

وەك ئێستا ئێران، سودان، چیچان و ئەفغانستانی جارانیش، بەشێکی عەرەبی سعودی و پاکستانیش نەگینا ولاتانی موسڵماننشین، یاساکانیان لە فەرەنسی و بەریتانی وەرگیراوە، ئەوانیش بەرچەڵەك و نەریت دەگەرێتەوە سەر رۆمانی کە لەسەردەمی ئیمپراتۆر (جەستیان) بەدەی شەشی زاینی بەناوی (کۆمەڵە یاسای مەدەنی)[1] دارێژراوە.

ئەو دوو جۆرە یاسایە بەهەڵە جارجار بە دەستکردەکە دەوترێ یاسای زەمین و بە ئاینیش دەوترێ یاسای ئاسمان یان (شرائع الارض و شرائع السماء).. ئەوە هەڵەیە، یاسای زەمین و ئاسمان هەر یەکە، هەروەك دیاردەی عەلمانی شان بەشانی یەك هاتوون، ئەوەی لە لایەن (تطوریەکان) بەناوی گەشەکردنی یاسا و ئەبوونی یاسا لەسەردەمێك.. هەمووی هەڵەیە، ئەسڵی هەمو یاساش ناگەرێتەوە بۆ (حمورابی) یان رۆمانی، هەتا لێك جیاکردنەوەی دەسەلاتەکانیش کە بۆ (مۆنتسیکۆ) دەگێرنەوە راست نیە، چاکتر وابوو بنووسن مێژووی یاسای

[1] الموسوعة العالمية -ق- ل٤١.

دەستکرد بۆ ئەو مێژوو و سەرچاوانە دەگەڕێتەوە نەك هەموو یاسا، یاسای دەستکردو یاسای دادگەری (شەریعەت) ئەو جیاوازیانەی هەیە:-

هەڵبەتە لە پێش هەموو شتێك دەبێ تێبینی بکرێت هەندێ زاراوەو وشە هەیە لە جێی خۆی نیە، دەبینین وەك ئەسڵ (ئیقلیم-هەرێم) گەورەتر بووە (نەك لە دەوڵەتی ئێستا) لەسنوری ئیمپراتۆریەتیەکانیش بە نێوان دوو هێڵی ئاسۆیی دابەشیەکانی زەوی وتراوە، سەردەمێك هەموو جیهان چوار ئیقلیم یان حەفت بووە، کەچی ئێستا بە چەندین (ئیقلیم) ئینجا وڵاتەك پێك دێنن، هەروەهاش لەبارەی دەوڵەت و حکومەتیش چەمکی حکومەت فراوانتر بووە لە دەوڵەت، زیاتر بە زەنگینەکان وتراوە (دەوڵەتدار) واتە سامان دار، هەتا لەناو کوردیش (دەوڵەمەند) لە بنەچەدا (دەوڵەت مەندە) واتە خاوەن سامان.. کەچی ئێستا دەبینین چەمکی دەوڵەت لە حکومەت فراوانتر بووە، بەهەمان شێوەش جاران یاسا فراوانتر بووە لە دەستوور، کەچی ئێستا پێچەوانەیە، بۆیە لەو بەراوردەش رێك دەرناچێ لەبەر هەمان هۆ، یاسای دادگەری (شەریعەت) هاوتای دەستوورە زیاتر نەك یاسا، (فقهی یاسایی) هاوتای یاسایە بەڵام بەهەر حاڵ جاری لێرەشدا وەك زۆربەی چەوتیەکانی تری باو (العادة محکمة) دەڕۆین.

بە کورتی چەند بەراوردێکیان لە نێوان تۆمار دەکەین بەو شێوەیە :

١-یاسای دەستکرد دەگۆڕێت و هەموار دەکرێت (تعدیل)، بەندە بە بارودۆخ و زەمان و زەمین و ویست و ئارەزووی دەسەڵاتدار، ئیتر نیشانەی هەرە گەورەی یاسای دەستکرد ئەوەیە فرە ڕوو و فرە وەڵام و فرە تەرازوی بۆیەك کێشە هەیە، یاسای دادگەریش (خوایی) تاقانەیە، یەك وەڵامە.. هەروەك پێغەمبەر چەندین هێڵی خوارو خێچی کێشاو یەك هێڵی راستیشی بەنێوانیان دا هێنا، وەسفی هێڵە خوارو خێچەکانی بە بەرنامەو تەرازوو و یاسای دەستکردو نا دادگەری برد، تاکە هێڵە راستەکەش بە یاسای خوایی ﴿وَأَنَّ هَـٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ﴾.

٢-یاسای دەستکرد لە باشترین دۆخیدا وەڵامی بارودۆخی ئەو ساتەی کۆمەڵ و عەقڵی بەشەریەتن بە پێچەوانەی یاسای دادگەری کە سەرتاسەری و نەگۆڕ و جووتە لەگەڵ جەوهەری مرۆڤ.

٣-یاسای دەستکرد وەك (مەتاتی) ئەوسەرو ئەم سەری پێ دەکرێ، بە هەمان یاسار دەستور ڕەش سپی دەکرێ، نیشتیمان پەروەر خائین دەکرێ، بەرگری نیشتیمانی بە تێکدەر بە یاسایی دەکرێ، تێکدەرانی خۆی بە (دفاع عن الوطن) بە یاسا دەکاو.. هەموو ئەو تاوانانەی مێژوو پشت بە یاسا کراون بۆیە ناهەقی (ڤۆلتێر) نەبووە ئەگەر ڕەتیشی دابێ کە وتوویەتی: (مێژوو بریتییە لە تۆمارگای تاوانەکانی بەشەریەتن) کەچی یاسای خوایی ڕوونو ئاشکراو ڕەونەقدارە.

٤-یاساکانی دەستکرد کە جووت نابێت لەگەڵ ستاندەر، هەم ئاکۆکە خۆبەخۆ هەم لەگەڵ واقع و هەق هەم لەگەڵ یاساکانی سروشت، هەم لەگەڵ ڕسکانو (فیترە)ی بەشەری، بە پێچەوانەی یاسای دادگەری لەگەڵ هەرسێ ئەوەر کۆك دەبن.

٥-کێشەی بنچینەیی یاسای دەستکرد ئەوەیە (عەقیدەی) لەگەڵ نیە، بۆیە لە هەر شوێنێك چاوی دیار نەبێت، یان بێهێز، بێ پۆلیس.. ئەو یاسایە جێ بەجێ ناکرێو دەبێتە هۆی بەردەوامی تاوان، هەروەك لەو سەعاتەی کوژانەوە بەناوبانگەکەی کارەبای کالیفۆرنیا زیاتر لە (٧٠٠) تاوانی لێ ئەنجام درا، بەڵام لە ئیسلامدا کە شەریعەو عەقیدە لێك جیانیە بۆیە (بڕوادار)ی ڕاستەقینە چۆن یاساکە لە پێش چاوی دەوڵەتو پۆلیسو چاودێر جێبەجێ دەکا، ئاواش لە غیابی ئەوان، ئەوە جیاوازیەکی بنچینەییە، لە هێزی یاسای (شەریعەت)و خاڵی هەرد لاوازی یاسای دەستکردیشە، واتە یاسای دەستکرد هێزی جێ بەجێ کردنەگەی خودی نیە، بەندە بەهێز هەروەك ئەرێتی ڕەسەنی خۆی لە پێناسی ڕۆمانیو سەفستیەکان هاتووە، تا ئێستاش هەر تەواوە.

٦-کۆمەڵە یاسایەك هەیە لە فەرهەنگ و ئەنسکلۆپیدیەکان بەناوی (قوانین اجتماعیة الکونیة- Univarsal social law)[1] هاتووە وەك دەقی خۆی (ژمارەی تاوان لە کۆمەڵگەیەك زیاد دەکات ئەگەر ئاین رۆڵێکی پەراوێزی هەبێت).. هەڵبەتە یاسای دەستکردو عەلمانیەت بەگشتی دەکەوتە بەر چوارچێوەی ئەو یاسایەو کۆمەڵگەیەکی پڕ تاوان و نادادگەری دروست دەکا.

٧-هەردەم یاسا لایەنی گشتی تاك دەگرێتەوە ئەوەش نیوەی کێشەکانە، بەڵام ئەوەی سەرچاوەی تاوان و گێروگرفتی کۆمەڵایەتیە لایەنی تایبەتی مرۆڤە کە (نهێنی تاك یان أسرار الشخص)یە، یاسای دەستکرد ناتوانێ روو بچێتە ناخی مرۆڤ و تایبەتمەندی و نهێنیەکانی ستاندەر بکا، هەرگیز تایبەتیش ناچوێنرێتە ناو چوارچێوەی یاسا، بۆیە لە باشترین دۆخی یاسای دەستکرد تەنها نیوە بەختیاری و دادگەریەك دەهێنێتە دی، تەنها یاسای خوایی دەتوانێ بە یاسای ستاندەری و چاندنی (رەوشت) لە ناخی تاکەکان زاڵ بێت بەسەر پاڵنەری تایبەت و نهێنیەکانی، دەتوانێ رێگرێك وچاودێرێکی زاتی لە دەروونی دروست بکا بە ئەندازەی زیاتر لە هێزی یاسا رێگر بێت لە خراپەو هاندەری چاکە.. بەوەش دادگەری ئیسلامیو پرۆژەی شارستانیو مرۆڤایەتی پێ دێتە دی بۆ سەرجەم کۆمەڵ.. هەر ئەوەش توخمی هەرە بنچینەی (تمکین الاسلامي) و دادگەری کۆمەڵایەتی یە.

٨-لە یاسای دەستکرد، هەر بۆشاییەکی یاسایی هەبێت یەکسەر مەبدەئی ویرانی (بەرژەوەندی تایبەتی) دێتە جێ، کەچی لە شەریعەتدا هەر بۆشایی لەیاسا نیە، ئەگەر ئەشنۆزرایەوە وەك بۆشایی دەرکەوت ئەوا عەقیدەو رەوشتی دێتە جێی و بەرژەوەندی گشتی بۆی ئامادەیە.

٩-یاسای دەستکرد کاتێ دادەرێژرێ کە پێویستە، واتە رووداو یاسا دروست دەکا، کەچی یاسای خوایی لە پێش روودانی ئامادەیە .

[1] موسوعة العلم الاجتماع ل٥٠٦.

٩-چارەنووسی یاسای دەستکرد بەرەو یاسا کۆمەڵایەتیەکان (شەریعەت)، هەتا زانست و زانیاری و گەشەی کۆمەڵایەتی زیاد بکات یاسا دەستکردەکان بەرەبەرە لە ئەنجامی گۆڕانیان بەرەو ناڕاستەیەك وەردەگرێ، ڕوو لە (شەریعەت)ە، هۆیە بنچینەییەکەشی ئەوەیە چونکە ئەویاسایانەی کۆمەڵایەتی ڕاستەقینە (دادگەرن و بە عەیارو ستاندەرن..)، بۆیە لە هەناوی کۆمەڵ و تاکەکان ئەو یاسایانە هەن و بەدەرن لەویستی مرۆڤ، نەك دروست بکرێ یان دابتاشرێ یان پەرلەمان بۆیان دابڕێژێ.. بەڵکو دەدۆزرێتەوە وەك زانست، ئیتر لەگەڵ گەشەی زانست و کۆمەڵ بەرەبەرە ئەو یاسایانە لە هەناوی کۆمەڵ دەدۆزرێتەوە و جێی یاسای دەستکرد دەگرێتەوە.. بەو شێوەیە ئەگەر پەیامی ئیسلامیش نەهاتبایە (بەگریمانە)، ئەوا پەیامی عەقڵی (کە هەمان پەیامی خواییە) ئەو شەریعەتەی دەدۆزیەوە بەرەبەرە، سەرنج بدە (برناردشۆ، تۆلستۆی، شکسپیر،ڕۆسۆ ،سپینۆزا..) لەدوای نزیکەی (١٣) سەدە بەختیاری دەدۆزێتەوە و دەڵێن (بەختیاری بەوە دێتە دی کە هەر کەس چی بۆ خۆی ویست ئاواش بۆ خەڵکی)*.

بەو شێوەیە عەقڵی پێش کەوتوو و یاساکانی کۆمەڵایەتی ڕاستەقینە پەکتر یاسادان دەکەن و دەبنە پاڵپشتی یەك، بە پێچەوانەش بۆ یاسا دەستکردەکان.

سەرەنجام تا ڕادەیەکی زۆر وەك (زۆربەی زانایان) گۆتەنی یاسای دەستکرد لە لایەن بەهێزانەوە و ڕاپێچ دەدرێ، هەردەم بانێك دوو هەوایە (الکیل بالمکیالین- dauble stander)، لە دەست ویست و ئارەزووی دەسەڵاتدار، یان نەریت و ڕای باوی عەوام و ئەویش بۆ چینی سەروو، .. ئیتر ستەمە، ماف خورانە ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ.. ئەوەش بەپێی ئەرازووی ئیسلام هەموو نیشانەکانی سەردەی (یاسای ئەفامیە) با لەسەردەمی تەکنەلۆجیاو ئینتەرنێت و مافی مرۆڤ و دەزگای (un)یش بێت، هەر پێناسە کۆنەکەی ڕۆمە بۆ یاسا

---

* ئەوەش هەمان فەرموودەیە: (لا یؤمن أحدکم حتی یحب لأخیه ما یحب لنفسه)، واتە کۆمەڵگەی سەردەمی مەدینە لەسەدەی (٧) جیهانی هاوچەرخیش بەهەمان یاسا بەختەوەری بۆ دێتە دی.

هەروەك سپینوزا بەجۆرێکی تری گوزارش کردووە و دەڵێ: هەتا لە سیستەمی دیموکراسیش سەرۆك لە سەرووی یاسایە[1]؛ هەر چەندە (رۆسۆ) وەسفی کۆماری بەوە دەکا کە (هەمو دەزگا و پایەکان لە ژێر رکێفی یاسا دەبن، صاحب السیادة، نامیتنی)[2]، بەلاّم زۆر روونە (صاحب السیادة، میللی چیف، فۆهر، فخامة الرئیس، ..) بە زیادەوە هەرماوە لە سەرووی یاساشن بە تایبەتی لە ولاتانی دیکتاتۆری.

خۆ بەشێکی تریش لە کاردانەوەی ئەوە هەر خودی یاساش بە دادگەریەکەشەوە بەسەلبی دەزانن، لەوانە تەتەوریەکان بەگشتی و ئایتی تاریە (کە لە یابان و دەوروبەری) هەیە، باکۆنین، جیرالد، ستانلی، جۆدین، برۆدون، .. زۆری تر.. بەرای (باکۆنین) ئازادی لەبێ یاسایی دەست پێدەکا، .. لەو کوتیلەوە هەلوێستی مارکسیەتیش لە بارەی (یاسا)بناغە رێژ کراوە بەسەلبی، پێی وایە: یاسا لە خزمەت چینی دەسەلاّتدار بووە بەپێی قۆناغی مێژوو هەردەم بەندیش بوود بە دەوڵەت و سیستەمی کۆمەلاّیەتی، ئەریت و یاساو ئاین و کەلتوری سەردەمی دەرەبەگایەتی لە خزمەت ئاغە بووە، دوای لە خزمەت برجوازی.. لەدوا قۆناغ لە خزمەت کرێکارە کە یاسا خۆشی نەماوە چونکە چینایەتی و دەوڵەتیش نەماوە، بۆیە لینین دەڵێ: (پرۆلیتاریا بەهیچ یاسایەك پابەند نابێت)، ئیتر کە لە شیوعیەت یاسا نیە بەهەمان شێوەش پێیان وایە کۆمەلگەی سەرەتاییش یاسای نەبووە، هەندێك لە جیهان بینیە سۆشیالیستیە (مارکسیەکان) رەتی دەدەن و دەڵێن مادام (پرۆلیتاریا بەند نەبێت بەیاسا ئەوا لە سۆشیالیستیش یاسا نیە)[3]..هەر چەندە لە شوێنی تری تویێ مارکسیەکان لەو بۆچوونە پەشیمان دەبنەوەو (سۆشیالیستی لێ دەبوێرن) لە کتێبی (القانون و

[1] رسالە في اللاهوت و السياسة -سپینوزا- ل٣٨٢.
[2] في عقد الاجتماعي -رۆسۆ- ل٨٠.
[3] منظري قانون سۆفیاتی.

الاشتراکیه-ل۳۰) هاتووە: (بۆ بیناکردنی سۆشیالیستی یان گۆڕینی بەرەو شیوعیەت مەحاڵە بکرێت دەوڵەت یاسا بەکار نەهێنێ...).

ئەو رایەی مارکسی و تەتەوریەکانیش دەگەڕێتەوە بۆ هەمان سەرچاوەی (بەسروشتی کردنی یاساکانی کۆمەڵ)، بەرای مارکسیەکان لە شیوعیەتدا (بەدیلی یاسا) بەرپرسیاریەتی گشتیەو خەڵکی گوایە دەگەنە ئاستێکی وا کە خۆیان دەوری هەم پۆلیسی و هەم یاساو دادگا دەبینن لەسەر شەقام، چۆن ئێستاش دەبینین نەریت و ویژدانی خەڵکە نایەڵێ دەست درێژی بکرێتە سەر ئافرەتێك یان دوو شەرکەر لێك دەکەنەوە[1]، ..تا ئێرە بۆچوونی مارکس بوو..

بەڵام بەسەرنجێکی سەرەتایی دەردەکەوێ کە ئەو بەدیلە (نەریتە) ئەوەش بە خێرایی دەگەڕێتەوە بۆ هێزو بێهێز و شیرازەشی تێكو پێك دەچێ لەگەڵ قەیرانێکی ئابووری یان کۆمەڵایەتی یان یاسایی..هتد، ئەومیان ئەوکاتی کەمێك راست دەبێت کە بتوانی ئەو لایەنە شەڕە سروشتیە دەرکێشی کەخۆی لە ناخی هەموو مرۆڤێك مەلاس داوە، هەڵبەتە ناشکرێ[2]، هەموو ئەو بۆچوونانە هەڵە دەرچووە ئێستا، رای ئەنسرۆپۆلۆجیەکان و(ئێستا مادیە تەتەوریەکانیش گەڕانەوە) سەر ئەوەی کە یاسا بەجۆرێك لە جۆرەکان هەر هەبووە لە هەموو زەمان و زەمینێك.. هەر بەلای کەمەوە مادام ئایین هەبووبێ یاسای لەگەڵ هەبووە، قەدەغەو (بکەو مەکەی-حلال وحرام) لەگەڵ بووە، رەوشتی لەگەڵ بووە، هەر لە توێژینەوەی رەوشتی هندۆکی و بوزی و کۆنفۆشی و زەردەشتیەکان، ئنجا سەرنج بدە ئەو بروایانەی لە (مانۆ) ی هندی ۲۰۰۰ پ.ز و (ڤیدای) ئاری ۱۸۰۰ پ.ز، کتێبە پیرۆزە کۆنەکانی تری چاپۆکی مەکسیکی، پۆپۆل ڤونی هندیە سورەکان[3]،...، هەروەها ئەو دابەشیە چینایەتیەی هندی کۆن -براهمار

[1] بۆ زیاتر سەرنج بدە (القانون و الاشتراکیه) -ترجمه هنری ریاج- ل۲۰.
[2] بۆ زیاتر بروانە بابەتی ناخی مرۆڤ (هەر لەو فەرهەنگەدا).
[3] کۆنترین رووداوەکانی مێژوو -گربۆشکی.

شادراو مەنبووز[١]، ئەوە بەدی دەکرێ چ جای ئاینی سەرەکی و نەسلیەکان.. هەتا تەتەوریەکانیش دان بەوە دەنێن کە (نەریت) هەبووە[٢]، ئەگەر بە وردی سەرنج بدەینە نمونەکانی خۆشیان دەڵێن خێلە بەربەرەجەرمانیە کۆ نەکان (کە شارستانی رۆمانیان رووخاند )گوایە ئاین ویاساوچینایەتی ...نەبوو لەنێویان دا، کەچی وەسفیان دەکەن دەڵێن لەنەریتی ئەوان گەرانەوە لەجەنگ ئەوەندە ئابڕوو چوون بوو خۆی دەکوشت ...ئایا عەیبەو شەرم کردنو ئابڕوو چوون ..هەموو مانای بوونی یاسا(بکەو مەکە)ی سەردەمی خۆیان نیە ؟، هەندێکیشیان وەك (راد کلف، براون، مالینۆفسکی) وتویانە یاسا هەبوو.. نەریتیش هەر یاسایە مەرج نیە بەنووسینەوە بێت هەروەك ئێستاش دەستووری بەریتانیاو یان ئەو شیوعیەتەی کە دەڵێن لە جیاتی یاسا نەریتی خەلکی دەبتە بەدیل بەنووسین تۆمار نەکراوە .

نەبوونی یاسا بەشی هەرە گرنگی (سیستەم و بەرنامەی ژیانی لیبراڵ دیموکراسی) دەگرێتەوە، هەر خودی لیبراڵی لەهەمو فەرهەنگەکان بەمانای سەربەستیو پابەند نەبوونی (بەتایبەتی تاك) بەیاسایە، بۆیە ئەگەر لەدوای ئەزمونێکی زۆر ئنجا هاتنە سەر دارشتنی یاسا بۆ باری کۆمەلایەتی، بەلام تا ئێستاش لەبواری ئابووری و بازارو بەرژەوەندیو باری کەسێتی –بێ یاسان.. کە سەرچاوەی ستەمی چینایەتیو بوونی هەژاریو کارەساتی زۆرە لە داگیرکاری و چەوساندنەوە.

---

[١] المتد القديمه، د.محمد إسماعيل.

[٢] بۆ زیاتر سەرنج بدە (مقدمة في أنثروبولوجيا الاجتماعية).

## یاساکانی کۆمەڵایەتی (دادگەری):

مەبەست لێی لایەنە چەسپاوەکانی (ثوابت)کۆمەڵ و کۆمەڵایەتی یە ، بریتین لەو یاسا (نەگۆڕانەی) کە حوکم لەسەر گۆڕان و پەیوەندییەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسیو کاریگەریەکانی دەکا، هەمان نیشانەی یاسای سروشتی هەیە، بە تەرازووەکانی (یاسای سروشتی) و (فەلسەفەی راستی)دا دەیان ناسینەوە، ئەوەش ئەرکی فەلسەفەی یاسایە، ئەو یاسایانەش ئەگەر بە دروستی دۆزرابنەوە ئەوا نەگۆڕە هەر لەسەرەتای بەشەریەوە تا کۆتایی، ئەو حاڵەتە بەند نیە بە (قۆناغ و گەشەی کۆمەڵ، بە زەمان و زەمین، بەباری تەکنەلۆجیا).. ئەو یاسایەی لە ( داسو ئاشی با) ڕاست ودروست بووە لە دەراسەو ئاشی هەڵمیو لە ئینتەرنێتیش یاسای دروستن، هەر هەمانیشن کە دادگەری لە هەمو سەردەمێك دروست دەکەن کە لە ئاینی ئیسلام پێ ی دەووترێ (شەریعەت)، ئێستا زۆربەی فەیلەسوف و زاناو سیاسەتمەدارانیش بەحوکمی سەرچاوە جیاجیاکانی مێژوو دان بەوە دەنێن کۆمەڵگەیەکی نموونەیی بەهۆی ئەو یاسایانە (ئەو شەریعەتە) دروست بووە، ئەوەی لایان گرفتە ئاخۆ لەو سەردەمەی جیایی باری کۆمەڵایەتی و چینایەتی و زانستی و ئابووری و شارستانی لەگەڵ ئێستادا چۆن بە هەمان ئەو یاسایانە ئەو کۆمەڵگەیان پێ دروست دەبێتەوە، هەڵبەتە بەو ڕوانگە (تەتەوری)و (مارکسی)و تاڕادەیەك (ئەنثرۆپۆلۆجیانەش) کە گوایە یاسای کۆمەڵایەتیش بەرهەم وەڵامی پێویستیەکانی باری کۆمەڵایەتی و چینایەتی و شارستانی سەردەمی خۆی بێت، واتە مرۆڤ دروستی دەکا، نەك خوا ڕسکی، واتە هۆکارەکە (علە)کەی لە واقعی کۆمەڵ دا نیە.. تا یاساشی بۆ هاتبێت، یان وەك یاسا بدۆزێتەوە بەڵکو وەك (برگسۆن) گۆتەنی یاسار (راستیش) وەك دارتاشی دەتاشرێ! واتە لەو حاڵەتەدا بەردەوام یاسا دەگۆڕێ مادام ئەو بارە بەردەوام بگۆڕێ (..ماطا من قرار)، بۆیە هەندێك لە ڕەوشەنبیرانی جیهانی موسوڵمانشینیش لەسەر ئەو بنچینە داوای

دەستکاری (شەریعەتیان) کردووە تا بگونجێ لەگەڵ پێشهاتەکانی سەردەم یان هەر بەیەکجاری ئیلغا بکرێتەوە لەنەوەی یەکەمی عەلمانیەتەوە لەسەردەمی (مصطفی کمال ئەتاتورك) و (ئەلب کۆك)و هەتا طە حسین، حبیب بورقیبە، تەسلیمە نەسرین، ..با بزانین ئەو خەلەلە لە کوێ یە؟ عەلمانیەکان وا راهاتوون لە هەمو ولاتە خاوەن دەستورەکان هەر لەماوەیەکی کەم چەند جار دەستکاری یەك یاسا و بگرە دەستوریش بکرێ، بۆیە بەزەحمەت دەچێتە عەقڵی یاسایەك هەبێ بۆ هەتا هەتایە هەر راست بێت و پێویستی بەدەستکاری نەبێت بێ زیاد و کەمی لە ژیانێکی گۆڕاودا؟ بۆ یەك لاکردنەوە پێویستە بگەڕێینەوە سەر چاووگە بنچینەییەکان کە "فەلسەفەی راستیە"، دەبێ بزانین ئاخۆ (راستی) چەسپاوەو ناگۆڕێ یاخود ئەویش دەگۆڕێ؟، واتەگۆڕان سەرتاپای ژیان دەگرێتەوە، لە هەمو زەمانو زەمینێك ٣+٦=٩، هەروەها رەوشتو بەهاو تەرازو و پێوەرە راستەقینەکان ناگۆڕێن، .. واتە رەوشتی درۆو خراپە لە هەمو زەمان و زەمینێك چەسپاوە، ئەمەك هەر چاکەو درۆش هەر خراپە..یان هەر لە نمونەکەی (تۆلستۆی) بێ ئەوەی ئاگای لێ بێت کە پێش (١٣-١٤) سەدە لەپێش ئەو یاسایەك هەبووە بەناوی (یاسای ئیحسان) کە فەرموودەیە و دەڵێ: (لا یؤمن أحدکم حتی یحب لأخیه ما یحب لنفسه) کە کۆمەڵگەیەکی پێ دروست کرا دادگەر و بەختەوەر و پێش کەوتووی هەمەلایەنی لێ هاتەدی لە بیابانیکی هەرە دواکەوتە، بەهەمان یاسا کە (تۆلستۆی) بە عەقڵ دۆزیەوە وتی بەختەوەری بۆ کۆمەڵ نایەتەدی هەتا یاسای (هەرکەس چی بۆ خۆی دەوێ ناواش بۆ خەڵکی تری نەوێ) نەیەتەدی.. هتد .

کەواتە چۆن یاساکانی سروشت نەگۆڕن ئاواش یاسای کۆمەڵایەتی هەیەو نەگۆڕە، ئەوەی دەگۆڕێ و دەستکاری دەکرێ و زیادو کەمی لێ دەکرێ هەر ناوی (یاسا)ی لێ نراوە، ئەگینا سیفاتی یاسایی نەبووە، لێرەدا واراهاتووین کە هەرچی بە دەوڵەت و دەستورێکەوە دەربچێ ناوی (یاسای) لێ دەنرێ.. ئەوەیان هەر ناو

لێنانە، دوورە لەو یاسایەی ئێمە لێرە باسی دەکەین، کە هەمان حوکمی چەسپاو و شمولیەتی یاسای سروشتی هەیە، بەڵام درێژکراوەی ئەو نیە، یاساکانی سروشت و یاساکانی میکانیکی و فیزیایی و کۆمەڵایەتی و فکری، هەر یەکە بەجۆری خۆی یاسان، هەر بە نموونە: یاسای (کارو کاردانەوە) لە میکانیکی یاسایەکی ڕاستە (دادگەریە بۆ میکانیك)، مەرج نیە لە هەموو سروشت وا ڕاست بێت یان لە کۆمەڵدا.. گەلێ جار دەبینین کاردانەوەیەکی کۆمەڵایەتی بۆ کارێکی کۆمەڵایەتی هەیە، بەڵام یەکسان نیە بەهەمان بڕی کارەکە، کە ئەوەش سیفەتی بنچینەیی یاسا میکانیکیەکەیتی.. کە لەیاسای کۆمەڵایەتی و دادگەری وا هاتووە (السن بالسن..)، بەڵام بۆ هەموو کارێك بەهەمان بڕ نیە، بەبڕی جیاجیایە، کوشتنی بەناهەق کوشتنە، بەڵام زینا کاردانەوەکەی (سزایەکەی) زینا نیە (جەلدەیە).. بەو شێوەیە.

ئەوەی مەبەستمانە چۆنیەتی حوکمیان وشمولیەتیەکەیان لە هەموو بەشەکان هاوبەشە، جا ئێستا با بزانین ئەو دۆخە تایبەتیەی کە ئادەمیزاد تیایدایە چۆنە؟.. هەڵبەتە یاساکانی سروشت هەمو لایەنەکانی شت و مەکەکان دەگرێتەوە، هیچ بوارێکی سەربەستی بۆ سروشت و پارچەکانی نەهێڵراوەتەوە، بۆیە ئەو دارو بەردو ئاسن و ئاو و هەوا و ئەلەکترۆن و مانگ و ڕۆژە هەموو مسەیرن، مخەیەر نین.. هەروەك لە پرسیارەکەی قورئانی پیرۆزیش وا دێت وەڵامەکەی: ﴿فَقَالَ لَهَا وَلِلأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ﴾، .. بەڵام مرۆڤ و کۆمەڵ لا ئاسۆیەکی لە پێش کراوەتەوە و سەربەستی تیادراوە کە ئەسڵی تاقی کردنەوە خوایەکەش ئا لەو ئاسۆیە..کە قورئانی وەسفی دەکا: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الإِنْسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولاً﴾.

بۆیە مرۆڤ تا ڕادەیەك مخەیەرە، دەتوانێ یاخی بێت، چاك بێت، خراپ بێت، دەتوانێ بەستاندەریش بژی (کە ئەوەیان یاساکەیە)، یاخی بوونەکەی لەو

سـتاندەرەیەو ئنجـا یاخیـشە لـە یاسـای سروشـتیو یاسـاکانی فـیترەو لـە (شەریعەتیش)، کە یەکەم سـەرەنجامی ئـەو یاخیـە کێـشەکانی کۆمەڵایەتیـە لـە دابەشی چینایەتیو ستەم و ئاژاوەو چەوساندنەوە و..بۆیـە سـتەم وچەوسـاندنەوەو یاخی بوونو پێش ئەوەی لە شەریعەت سەرپێچی بـێ لـە یاسـاکانی سروشـتی و مرۆڤایەتیش سـەرپێچیە، بەهەمان شێوە یاسای دەستکردو سیستەمی عـەلمانیش بە پێناسی ستانداری یاخیی بوونێکە لەو پلە .

یاساکانی کۆمەڵایەتی هەروەك یاسـاکانی سروشـتە لـە سـیفات و نیـشانە و حوکم و هاوکێشەو هاوسەنگی دا، ئەو یاسایانەش سـیفاتی (تـاقی تـەنیای- Al one)ی هەیە بەدیلەکەی فرەیـە، یاخیـە، سـتەمە، رێبـازی جیاجیایـە، ئەگـەر ناویش لەو بەدیلە یاساییانە نرا -یاسا-، لـە راسـتیدا یاسـا نـین، فەرمانێکـە و بەس، .. بۆ لێـك جیاکردنـەوە نـاوی لێ دەنـێین (یاسـای دەسـتکرد)، کـەمترین جیاوازی ئەوەیە کە یاسای دەستکرد[1] هەردەم ناکۆکـە لەگـەڵ دادگـەری، لەگـەڵ یاساکانی سروشت، بە پێچەوانەی یاسای کۆمەڵایەتی (راستەقینە) کە چەسپاوە و هەماهەنگە لەگەڵ سروشت و ناخی مرۆڤ و.. چـونکە یـەك دانـەر و بەرێوەبـەری هەیە: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي السَّمَاءِ، تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ بِإِذْنِ رَبِّهَا وَيَضْرِبُ اللَّهُ الأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ، وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ اجْتُثَّتْ مِنْ فَوْقِ الأَرْضِ مَا لَهَا مِنْ قَرَارٍ﴾.

ئـیتر وەڵامـی ئەوپرسـیارانەی پێـشوو سـانا تـر دەبێـتو دەتـوانین لێڵـی و تێکەڵیەکە راستەوخۆ تر لێك بکەینەوە، لە مادەی (سیاسەت) باسـمان کـرد، کـە بەشەکانی کۆمەڵ زۆربەی دوو لای هەیە لـە شـێوەی: زانـستی و کۆمەڵایـەتی و رێبازی کۆمەڵایەتی، زانستی ئـابووری و رێبـازی ئـابووری، زانـستی سیاسـی و رێبازی سیاسی، زانـستی فکرو رێبازی فکر..هتد.

[1] بۆ زیاتر سەرنج بدە جیاوازیەکانی یاسای دەستکرد و یاسای (شەریعەتی) لەمادەی-یاسا-.

ئەوەی لەو بەشانە دەگۆڕێن زانستەکانی کۆمەڵ و ئابووریو سیاسەت و فکرە.. کە سەرچاوەی بەرهەم و تەکنەلۆجیا و شارستانی و..هتد.

ئەوەی چەسپاوە ڕێبازەکانە.. کە سەرچاوەی ناسنامە ومەدرەسە ونماین و ئایدیۆلۆژیەکانە، ..ئەوانەش (پەیڕەو-منهج)ی کۆمەڵن، ئەو یاسایانەش لایەنی زانستی هەیە کە پێی دەڵێن (زانستی یاسا) کە فەرمانی لێ کۆڵینەوەی مێژوو و واقعی یاساو چۆنیەتی پەیڕەوکردنی و بەراوردەکانیەتی، ئەوانەش دەگۆڕێن و ناسنامە نین، هەرچی (ڕێبازی یاسایە) ئەوەش چەسپاوە و ناگۆڕێت، بەند نیە بە زەمان و زەمین، چۆن ٣+٦=٩، مانگ لە دەوری زەوی دەسوڕێ، یاسان، چەسپاون، ئاواش یاساکانی کۆمەڵایەتی لە ڕێبازی یاساییدا چەسپاوە، بۆیە ئەو یاسایانەی (١٤) سەدە لەوەو پێش دادگەری داوە ئێستا و ١٤ سەدەی تریش هەمان یاساو دادگەری دەداتەوە، هەر دەستکاریەك یان هارتایەك یان هاوبەشیەکی بۆ پەیداکەی پێش ئەوەی دژی شەریعەت بێت، دژی یاساکانی کۆمەڵیشە.. هەر بۆیەش کێشەکانی کۆمەڵ و دۆزینەوە زانستیەکان و فشاری گەشەی کۆمەڵ.. هەمووی بەتێکڕایی هێزەکی کێش کردن (جاذبیة) دروست دەکەن، تیایدا یاسای دەستکرد بەرەو شەریعەت پاڵ دەدات، هەروەك ئێستاش زۆرێك لە بەندەکانی یاسای دەستکرد لەو ئەنجامەو لە ئەنجامی پێویستی واقعیو ژیانو تەندروستی وا بەرەو ئامێزی شەریعەت دەچن، بۆیە زۆربەی دەستورەکانی عەلمانی ئێستا پڕیەتی لەبەندی شەریعەت، لە کۆتاییدا هەمو بەشەریەت بە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواوە پێویستی پێ دەبێت.

## (٢١)

## سەرتاپای شمولی all-inclusive

ئەو زاراوەیە تەنها وەرگێردراوی وشەیەکی ڕۆژئاوایی نیە، بەڵکو وەرگێراوی چەمکێکی تایبەتە بە خۆیان، مەبەستی ئێستا زیاتر ئەو ئایدولۆژیاو ئایینو تیۆرە سیاسیانەیە کە لە زۆربەی لایەنەکانی مرۆڤ دەدوێ، وەك زاراوەیەکی سلبی سەیر دەکرێ لەلایەن عەلمانیەتی نوێ وە (واتە عەلمانیەتی دوای شکستی عەلمانیەتی چەپ-سیکۆلاریزمی ڕۆژئاوایی)، لە لایەن ئیسلامیەکانو مەدرەسە فکریەکانی تر بە ئیجابی سەیر دەکرێ لە سنوری خۆی، واتە کاتێ مانای دەست بەسەراگرتنی هەموو لایەنەکانی ژیانی تاكو کۆمەڵ بێ لەلایەن دەسەڵاتی سیاسیەوە ئەوا سلبی دەبێ، لە جیهانی ئیسلامی زەمینەی مێژوویی و فکری ڕاستەقینەی نیە، زۆر زاراوەی ڕۆژئاوایی هەیە زادەی بارودۆخێکی ئەلبی یە (تەعمیم) کراوە، زاراوەو لایەنی تریشی گرتوتەوە، کەچی مەرج نیە لە هەموو دۆخێکدا سەلبی بێت، پێچەوانەی واشی هەیە، هەموو ئەو دۆخانە لەوە دێ کە ڕۆژئاوا هەرگیز نەبوویتە خاوەنی ئاینێکی تێرو تەسەلو هەمەلایەن، بەڵکو هەر کێشەشیان بووە لەگەڵی ئەوەش ڕەنگی داوەتە سەر بارودۆخی ئایدولۆژی و مدرسەی سیاسی وفکری لە ئەنجامدا بۆشاییەك لە ژێرخانی مەنهەجی زانیاری و فەرهەنگی و شارستانی و یاساییان هەر هەبووە، ئیتر وەك کەلتوورێکی دێرینیان فرە ئایدۆلۆژیاو مدرسە بۆچوونی لێ پەیدا بووە، بێ ئەوەی (مەرجەعیەتێکی) یەکگرتووی هەبووبێ، هەریەکەشی وەڵامێکی جیای بۆ کێشەیەك هەیە، واتە هەر پرسیارێك فرە وەڵامی لێ قووت دەبێتەوە مەرجیش نیە هەموو ئەو وەڵامانە

ڕاست بن، هەر تەنها یەکیان ڕاستە یان دەشێت ئەویش ڕاست نەبێ، خۆ ٣+٤=٧ یەك وەلام هەڵدەگرێ ئەوانی تر زیادە یە هیچ سودێکی زانستی نیە فرە وەلامی پێشکەشی بکەیت، بۆ مەسەلەی ئالۆزو فراوانەکانیش هەتا چارەسەرو وەڵامی هەمە لایەن (نەك فرەلایەن) تەواو پێشکەشی بکرێ ئەوا لە نوقستانی و دەست کورتی ڕزگاری دەبێ، سەرنج بدە کاتێ (ئانیشتاین) ویستی تیۆرو هاوکێشەیەکی شمولی وا بدوزێتەوە واتای بونەوەر بدا، بەناوی "تیۆری هەمرو شتێك "پێی نەگەیشت بەلاّم بە زەبەلاح ترین زانا تومار کرا بەهوی ئەو تەقەلایانەی، واتە هەتا چارەسەر و وەلامەکان شامیزی فراوان قوول و هەمەلایەن(شمولي) تربێت ئەوا زانستی ترو ڕاست ودروست تر دەبێت، بەهەمان شێوە مدرەسەو فکرو ئایدولۆژیای هەمەلایەن (شمولي) هەلگری چارەسەریەکانی هەمە لایەنی ژیان بێت ئەوا پیروز ترە، وەڵامی پرسیارە ئەمرەکانی مرۆڤی بەستاندەری پێ بێت، ئەوا سیفەتێکی (شمولي) وەردەگرێ و زۆر نایابە و بەلگەی بەهێزی وراستی و دروستی وقوولّی و هەمەلایەنی ئەو مدرسەیە یان ئاینەکە دەردەخا، بۆیە لە ڕۆژئاواش جاروایە وەسفی شارستانی پێش کوتوو و بەهێز لە لایەن زانایانیان بە شارستانیەکی شمولي وەسفی کراوە[1]، کەواتە هۆی چیە زاراوەی (شمولي) بە ڕەهای بە توومەت و سەلبی بژمێردرێ؟ .. لە ڕۆژئاوا دا ئاین، ئایدۆلۆژیا، زانستو تیۆری سیاسی، سیستەمی ئابوری ئەخلاقیو شارستانی ... هەمووی لێك جیایە، هەر پارچەیەك لە لایەك هاتووە، هیچ (مەرجعێك)ی نیە لایەنەکانی ئەو سیستەمانە بەیەك ببەستێ وسیستەمێکی ژیانی تەواو وەك بەرنامە بداتە مرۆڤ وپەیوەندیەکان ڕێك بخا بە دادگەری، بۆیە لای ئەوان نەشیاوە مدرەسەیك یان ئاینێك هەر بەرنامەیەکی ژیان شمولي بێت، هەر بۆیەش شمولي تارادەیك بە مەحال و بەدەر لە توانای بەشەری پیشان دراوە ....تا ئەو رادەیەی بە دکتاتوری و زۆرداری تێکەل کراوە، لێرەدا دیسان خەلەل لە (تەعمیم)ە ئەمرو

[1] بروانە (المدخل علم الانسانی )

وشکی سوتاندوە، ستور بەزاندن و تێکەل کردنێکە لە بەشێکی دا ئیجابیەو لە بەشی تر سەلبی یە، لە کاتێکا شمولیەت بۆ زانست و ئایدولۆژیاو مدرسەو ئاین نیشانەی راستی و دروستی یەتی، کەچی هەمان شمولیەت لە پەیڕەوکردنی سیاسی و دەسەلاتا سەلبی و تومەتە، کاتێ بەوری بەحزیەوە گروپانی سیاسی پاوان بکەی و هەموو لایەنەکانی چالاکی سیاسی کۆمەڵ و تاك دەست بەسەرا بگرێ، وەك ئێستا دبینین زۆربەی دەسەڵات دارانی سیاسی عەرەب و ئەو ئەزموونەی کوردستانیش تا رادەیەك وێچوی ئەوانە کە هەموو بونەو یادو چالاکیە میللی سەندیکاکان دەبێ مولکی ئەوان بێت، هەر لە جەژنەکانی ئیسلام، جەژنی کرێکاران، جەژنی مەسیحی، جەژنی نەتەوایەتی، جەژنەکانی منداڵ، ئافرەت، نوسەران، ...هتد هەمووی هەر دەسەلاتی سیاسی بە مولکی خوی دادەنێ، دەست دەخاتە هەموو ڕوویەکی ژیانی گشتی مرۆڤ، بەشێکی زوری تایبەت بە تاکیش جگە لە جموجولی نزیك سیاسەتیش هەتا ئابوری و ماڵداری ..بە (تەزکیەی حزبی) نەبێ ڕێت پێنادەن مافی هاوولاتی خۆت لە یاسایی و سیاسی و کومەلایەتی وبژیوی و ئابووری و... بەکاربهێنێ، ئەوە سیاسەتی شمولیەو زۆر سلبیەو دەروازەی دکتاتوریەتە، ئیتر ئەو حزبە دەسەلاتدارە هیچ چالاکیەکی مەدەنی بو لایەن و حزبەکانی تر نایەڵێتەوەو جورێك لە ئابلوقەی یاسایی و ئابووری و سیاسی و کومەلایەتی دەخاتە سەریان ئەگەر بەناو فەزایەکی دیموکراسیش بێت، لەلایەکی ترەوە هەر یەکە لە حزبە چەپی و ئیسلامیەکان کە پالپشت دەکەنە سەر ئایدولوژیایەکی شمولی ئەوەیان پەسەندە، بەلام هەرکاتی ئەو ئایدولۆژیا شمولیە دەسەلاتی شمولی بۆ دروست کرد و گۆڕەپانی سیاسی داگیر بکەن ڕێگە بە هیچ حزبێکی سیاسی تر نەدەن بە ناوی ئەوەی گوایە ئایدولۆژیاکەیان شمولیەو پێویست بە ئایدولوژیاو تیۆری سیاسی تر ناکا! ... ئەوەش سەلبی یە، وەك بینرا لە ئەزموونەکانی شوعیەت و فاشی و نازی تورانی و بەعسیاتی رویاندا، هەروەها لەئەزموونی تالیبانیش ڕوویدا، ڕێیان بە هیچ

(٢١) سەرلەبەرانی    شمولي    all-inclusive

چالاکیەکی سیاسی تر نەدەدا شان بە شانی ئەوان ئایدولۆژیاو تیۆری سیاسی گەڵاڵە بکەن، زۆربەی پاساوی تیۆری حزب‌و سەرکردە دکتاتۆرو شمولیەکانیش ئەوە بووە گوایە ئەوان پەیامێکیان پێیە بە هۆیەوە کۆمەڵگە دەپەڕێننەوە لە قۆناغێکی سەختی مێژوویی، هەروەك پەیامی شیوعیەت بەناوی ڕزگاری پرۆلیتاری، پەیامی نەتەوە گەورەکان بە ناوی بەك خستن‌و ڕزگاری، .. یان زاڵیەتی، یان پاساوی تری وەك باری نائاسکی میللەت، پلانی دوژمن‌و ئیمپریالیزم، .. حزبی بەعس (٦) پاساوی بۆ ئەو مەبەستەو (حزب القائد) هێناوەتەوە:

١- خۆی شۆڕشی کردووەو سەرکردایەتی ئەو پەیڕەوی دەکا .
٢- ئامانجەکانی ئامانجی میللەتیشن .
٣- توانایی گەیشتن بەو ئامانجانە تەنها بەو حزب‌و سەرکردایەتی‌یە دەکرێ.
٤- زۆرایەتی خەڵکیش لە دەوری ئەو ڕێبازو سەرکردەو حزبەیە .
٥- سەرکردەکەی هەم سەرەك حزبەو هەم سەرۆکی میللەتیشە .
٦- بە تەنها ئەوان ئەو بەرپرسیاریەتەیان پێ هەڵدەگیرێ بە خەڵکی تر ناکرێ [١].

بە سەرنجێکی سەرەتایی دەردەکەوێ کە : خاڵی (٣) پاساوی دیکتاتۆریەتی شیوعیەکانە، لە خاڵی (٥) دیکتاتۆریەتی فاشی‌و نازیەکانە، لە خاڵی (٦) نمونەی وەك (بەعسی) کە هەموو جۆرە دیکتاتۆری‌و تۆتالیزم‌و ئۆتۆکراسی کۆدەبنەوە، بەڵام ئەگەر وەك خاڵی (٢) بێتەدی، واتە (ناوەندی -مەرجەع) بیروباوەرو پەیامێك بێ نەك (دەسەڵاتی سیاسی)، بەڵکو دەسەڵاتی سیاسی‌و سەرەك‌و... ئامراز بن، ئەوەیان تەواو جیایە، لەو ڕووەوە لایەنە ئیسلامیەکان تا ئێستا لە سیاسەتدا شمولی نەبوونە، هەرچەندە پاڵپشت دەکەنە سەر ئاینێکی

---

١ بڕوانە: تعريفات ببعض المصطلحات ـ مادة: حزب القائد .

شمولی، ئەزموونەکانی تورکیا، جزائر، ئێران، سودان، .. لەزۆربەی بزووتنەوەکانی ئیسلامی جیهان دەبینین دەست گۆڕی دەسەڵاتیشتان لەگەڵ دەکرێ، ئەگەر چی لەو ڕووەوە لەئەفغانستان نمونەیەکی ئیجابی پێشکەشی نەکرا، هەروەها لەدوای خولەفای راشدینیش نمونەی سلبی زیاتر بووە، تێکەڵ کراو، شمولیەتی ئاینی لە پێناو شمولیەتی دەسەڵاتی سیاسی بەکار هاتووە، بەڵام ئیستا زیاتر لایەنە ئیسلامیەکانن کە لە هەڵبژاردن دەردەچن ئازادیەك بو عەلمانیە معارەزەکانیش فەراهەم دەکەن، هەر بە نموونە هەتا حماس لە فلستین دەرنەچرو لە ٢٠٠٦ز هەرگیز فتح هەموو دەسەلاتی بو خۆی قۆرخ کردبوو، لەسایەی دەرچوونی ئەوانە ثەقافیەت وئازادی بیرورا مافی یاسایی معارەزەو سەروەری یاساو دژە گەندەلی سەری هەڵدا، . سەرەنجام شمولیەت بە تێکرای سەلبی نیە، تەنها لە رەفتاری سیاسی دا سەلبیە، ئەو تێکەڵیەشی مەبەستێکی سیاسی و مەرامی زالیەتی شارستانیانەی لەپشتە، لە چوار چێوەی مل ملانێ ی شارستانی و مەدرەسەیی، لە کاتێکدا مدرەسەی لیبرالیەت زۆر هەژارە لە فکرو ئایدولۆژیا بۆیە حزبێکی سیاسی لاوازی بێ تیۆرو ئەخشەو ستراتیژیەت لێ گەلالە دەبێ، دەبێتە مەیدانێك بۆ سەودای (پێم بدە تا بۆت بکەم) کە ناشرین ترین دیمەنی سیاسی میکافیلیە، تەنها خەلکێکی بە بەرژەوەندو نانی پێ کۆ دەبێتەوە .. لە کاتێکدا مدرەسەی ئیسلام (یان چەپیەکانی پێشوو) لە فکرا دەوڵەمەند بوون بە خێرای لەناو جەماوەرا حزبە لیبرالیەکان هەڵدەلوشێ، بۆیە ئەو زاراوەیەی (شمولیەت) یان وا فراوان کرد کە بتوانن لە ژێرخانی (منافسەکان) ی خۆیان بدەن لە چوارچێوەی ئەو مل ملانێ یە، ئەگینا لە بنەچەدا چالاکی سیاسیش (عقدی فکریە —نەك عەقدی ئابووری ) بۆیە بەشێکە لە عەقیدە نەك بەرژەوەندی، خەلکێکی ساغ مەیلیان بەلای ئەو حزبانە زیاتر کە تیۆری سیاسی ئاوسی هەلگرتووە، پالپشت دەکەنە سەر ئایدولۆژیاو فەلسەفەیەکی شمولی فراوانی گەردوونی و سروشتی و کومەلایەتی، بۆیە دەبینین (جان کوریس) لە کتێبی (حقیقة العالم الملموس) دەڵێ

تا لە دوا نهێنی گەردوون نەگەم ناچمە ناو سیاسەت، واتە سیاسەتی نوێ دەبێ پالپشت بکاتە سەر بنچینەیەکی قوڵی فەلسەفەی و زانستی وعەقلی ئەگینا یەکسەر حزبە ئاینیەکان ئامادەن جیهان هەللوشن بە دیموکراسیانە، تا ئەوە نهێنیەکەی زاراوەی (شمولیەت) کەوا تێکەڵ کراوە، ئەگینا ئایدۆلۆژیاو فکرو ئاینی شۆلی جیایە لەگەڵ دەسەلاتی شمولی .

## رەچەلەك و گەشەی

زاراوەی شمولیەت بەو سنورەی خۆی نەك هەر سەلبیە یان تومەت، بەلکو وەسفێکی نایابەو بە دەگمەن دەست ناکەوێ، ئەوا لەگەل زاراوەیەکی تر تێکەل کراوە هەم لە ناوەروك و هەم لە وشەو زاراوەشی لە (تۆتالیتاریزم totalitarize) هاتووە، هەروەك مەسەلەی عەلمانیەت چۆن وشەیەکی نزیك (علم)ی هەلبژێردراوە بە مەبەست، ئاواش لە وەرگێرانی زمانیشدا فێل لەبابەتەکە کراوە، تێکەلی تۆتالیتاریزم کراوە بە مانای (کلیانی) نەك (شمولی)، شمولی وەسفێکی گرنگی بەرنامەی ئاینیە، کەچی کلیانی- totalitarizeme سەرتاپای دیاردەیەکی سیاسیە و ئەو سیستەمە سیاسیەیە کەدەست بە سەر چالاکی و هەموو جولەیەکی میللی -مەدەنی دادەگرێ، لە کونەوە پێی ی وتراوە (تۆتالیتاریزم) لە (موسوعة العربیة) تۆتالیتاریزم (کلیانی) بەو (٦) خالە دەناسێنەوە.

١- زال بوونی دەسەلات ٢- بێ دەنگ کردنی معارەزە ٣- چاودێریەکی زیاد لە پێویست ٤- پیروز کردنی سەروك ٥- بەکارهێنانی ئامرازی ترقاندن ٦- زال بون بەسەر تیش وکاری خەلك..[1] ئەوانەش بەشێکە لە نیشانەکانی دکتاتوری تاك رەوی و هەتا نازی و فاشیش کە لەلایەن دەسەلاتەوە دەست بەسەر هەموو دەزگا مەدەنی و سیاسی و حقوقیەکان دا دەگیرێ، تادەگاتە پێویستیەکانی ژیانی

---

[1] بۆ زیاتر بڕوانە: موسوعة عربیة ج٢ ل ٧٣ وە (موسوعة السیاسیة) ج٥ ل١٣٦

رۆژانەی تاك .. هەمووی دەخەنە ژێر ركێفی راستەوخۆی دەسەلات، تا نەتوانێ لە ژیانی ئاسایدا لەو دەسەلاتە جیا ببێتەوە هەتا لەناو مالیشیدا.

ئەوەی زیاتر یارمەتی ئەو وەرگێرانەی داو تا وا بەهەلەدا بچن لە تێكەل كردنی (شمولیەت) و (كلیانی) ئەوەیە لەسەرچاوەكانی بیانیش ئەو دوخە هەبووە، سەرچاوەی دكتاتوری لە لایەن (نویمان) لە كتێبی (الثورة الدائمة ١٩٤٠) دەداتە پاڵ شۆرش و سەروەریەكانی، كەچی (كارل فریدریك) دەی داتە پاڵ ئایدولوژیای شمولی[1]، لەلایەكی ترەوە لە پێش ئەوانە(هیگل )ی ئەلمانی بەرنامەیەكی توێژینەوەی هەبوو بە هەمە لایەنی و قوولی ناوی نابوو (شمولی )، هەردەم باسی لە شمولیەتی تێگەیشتن دەكرد لە بابەتەكان تاسەر چیغ نەچن، دوای (براتراند راسل)ی بریتانی رەخنەی لە شمولیەتی هیگل گرت لە كتێبێكی بە ناوی (تأريخ فلسفة الغربية ١٩٤٦) ... لەو هەنگاو هەنگاوە پێچەوانانە شمولیەت هەم پەریەوە ناو سیاسەت و فكرو فەلسەفەو ئایدولوژیاو.. هەم لە تێكەڵیەكەشی بە درێژایی خۆی مانای تۆمەتی وەرگرت لە رۆژئاوا ... هەڵبەتە پەرەسەندنێ فكری شمولی ئەزمونی شیوعیەت و تەیاری نەتەوە گەری لەلایەك، لەلایەكی تریش زاوزێ ی نێوان هەردوو لا وپەیدابوونی دیاردەی نازی و فاشی ... دوایش شكست هێنانی گشت ئەو ئەزمونانە .... یارمەتی یەكی زوری پەرەسەندنی ئەو تێروانینە سەلبیە دا بەرامبەر شمولیەتو تەعمیم كردنەكەی، لەبنەچەدا لە پێ ئاسە فەلسەفیەكەی را بە چە وتی دادەرێژێ بۆیە شكستی دەبێتە شكستی شمولی بەتەواوی، لە تێروانینی فلسفی شمولی بە مانای تێ روانینی ژیان و سروشت و گەردوون لەچوارچێوەی یەك یاسا، راتە دۆزینەوەی فەلسەفەیەك لەلایەن مرۆڤەوە كە بتوانێ فەرمان لەسەر گەردوون وسروشت وژیان بكا، لەسەر مادی و گیانی بكا... هەڵبەتە ئەمەش رەنگە مەحال بێت، شكست دەهێنی وەك لە ماركسیەت

---

[1] بروانە هەمان سەرچاوەی پێشوو.

شکستی هێنا، ئیتر رۆژئاوا دەیکاتە شکستی (شمولیەت) وبەتێکەڵیەوە بێ ئەوەی سنورەکان لێك جیا کاتەوە .

لە کاتێکدا دەبینین ئایدۆلۆژیای شمولی یان ئاینی شمولی بووە لە تاریکاییەکانی مێژوو بەرەنگاری جورەکانی دیکتاتۆری وتاك رەوی زۆرداری بوویتەوە، ئەو تەعمیمە بەو رەهاییە چەوتە، هەڵبەتە ئایدۆلۆژیای شمولی، ئاینی شمولی، تیروانینی شمولی .. هەریەکە پلەو جیاوازی هەیە لەگەل یەکتر، هەموو ئەوانەش جیان لەگەل دەسەڵاتی شمولی، ئەوەی دواییە سەلبییەکەیە، لەپێش تریش رون کرایەوە مەرج نیە دەسەلاتی شمولی سەربە ئایدولوژیاو ئاین و بەرنامەیەکی شمولی بێت، پێچەوانەشی بەپێچەوانەوە، وەك دەبینین زۆربەی دەسەلاتدارە شمولیەکانی ئێستا لە جیهانی عەرەب سەربە مەدرەسەی لیبرال دیموکراسیە وهیچ ئایدیولوژیەکی شمولی لەپشت نیە، بە دەگمەن مدرەسەی تریش هەیە لەوانە هەردوو حزبی بەعس لە عێراق و سوریا کەسەر بە مدرەسەی سۆشیالستیکی ئەتەوەگەریە، نمونەی ولاتانی سۆشیالستی و پێشوش هەبوو کە ئایدۆلۆژیایەکی شمولی و دەسەڵاتی شمولی لەسەر دروست کرابوو، بەلام دەبی بووتری هەر خویان ناویان بە بە ئایدیۆلۆژیای شمولی بردووە بو مەزن کردنی ئەگینا شمولی نەبووەو زور مەودا کورت بووە .

لە چوارچێوەی ئەزموونی رابوونی ئیسلامی نوێش لە ئەفغانستانی سەردەمی بزوتنەوەی تالیبان تا رادەیەك دەسەلاتی شمولی دروست کرابوو، ئەوەی ولاتانی سوشیالستی پەیرەو کردنی راستەقینەی (شوعیەت وبەندەکەی دکاتاتوری پرۆلیتاریا) بوو، بەلام لە فکری ئیسلامیدا هەتا چالاکی ئاینی تر قەدەغەیە نیە چجای چالاکی سیاسی، (لا اکراه فی الدین)، (لکم دینکم ولی الدین)، (من یشاء فلیؤمن ومن یشاء فلیکفر....) ئینجا دەسەڵاتی سیاسی ئیسلامی راستەقینە هەرگیز شمولی نیە، ئەگەر فرە لایەنی سیاسیش سەردەمی نەمێنێ وەك لە ئێران چیچان و بۆسنە کە خۆی لە خۆیدا بونی ئەو زەمینە نیە، واتە هەر

لە خودی کۆمەڵگەکە لایەنی سیاسی تری غەیرە ئیسلامی لێ شین نابێ، لەو دوخانەش هەر شمولی نیە مادام بەرنامەکانی بریتی بێت لە دەست گوری دەسەڵاتو ئازادی بەرامبەر، مافی معارزە وهاوڵاتییەتی، بوونی دەزگای مەدەنی، ... لە هەموان گرنگتر بەجێ هێشتنی زۆربەی دەسەڵات بۆ (ئومەت)و پانتایەکی زوریش بۆ تاك .. واتە هەرگیزاو هەرگیز دەسەلاتێکی شمولی نیە، بەکار هێنانی ئەو زاراوەیەو زۆربەی زاراوەکانی تر بە وردی نامافی خۆی ناپێکی لەلایەن رەوشەنبیر و سیاسەتمەدارانەوە، هەتا ئەوانەی لە بەرامبەری دەسەڵاتی شمولیش وەستاون، لەلایەك لەبەر سەرچیخی تێگەیشتن لەلایەکی تریشەوە چونکە شمولی زاراوەیەکی سوکترە لە دکتاتۆریەت بۆیە زیاتر ئەو زاراوە بەکار دەهێنن، بۆ تووردنەبوونی دەسەڵات دارە دکتاتۆرەکان، ئەگینا ناوەروك و نیشانەکانیان هەر یەکە. یەکێ لە نیشانە گشتیەکانی ئەو جورە دەسەڵاتانە لەگەڵ داروخانی دا هەموو دام و دەزگاکانی دەوڵەتی و بەڕێوەبەرایەتی یە گشتی یەکانیش بە بەرپرس بە بەرێوەبەر... و تەواوی قاوغی ئەو دەسەڵاتە تێك دەروخێ... ئەو دیاردەیە لە کوردستانی خوارووش بەدی دەکرا، هەر جارەك لایەنێکی شەرکەرە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان لەشارێك یا لە ناوچەیەك دەسەڵاتەکەیان دووچاری شکست دەهات بەرامبەر یەکتر ئەوا لە رەگو ڕیشەوە تێك دەرووخا هەتا کورسی و مێزەکانیش بەدیل دەکران ...! ئەوەش مانای وایە ئەو دەسەلاتانەی کوردی لە چوارچێوەی شمولیەت بوون لەو نێوانەی ١٩٩١ هەتا نوسینی ئەو بابەتە.

# (٢٢)

## رەگەزپەرستی العنصرية racism

هەرچی سەروەری دانێك بە یەكێ لە نیشتما میراتیەكان یان فاكتەرێكی شاقولی ئەوا دەروازەكەی دەچێتە سەر رەگەزپەرستی، شانازی كردن بە رەچەلەك، بە بار باپیران، بە نەژاد، بە نەتەوە، بە هۆزو تیرە، بە خاك.. و سووككردنی خەلكی تر لە بەرامبەر، .. هەموو ئەوانە جۆرێكن لە دەمارگیری تاكو عەوام، بە سیاسی كردنی ئەو تێروانینانە دەبێتە رەگەزپەرستی .

**بنەچەكەی :**

ئەو زاراوەیە دەگێرنەوە بۆ ئەو شانازیو یاخی بوونەی شەیتان ئەنجامی داو رەچەلەكی خۆی لە رەچەلەكی (ئادەم) بالاتر داناو وتی من لە ئاگرمو تۆ لە قوڕ.. سەرەنجامەكەشی چارەنوسێكی شومی بۆ خۆی هەلبژارد، نیتر مێژوو پڕیەتی لە كارەساتی رەگەزپەرستی، بۆیە هەندێ زانا بە رەش بینیەوە وەسفی مێژوو بە تۆمارگای تاوانەكان دەكەن، لە مەدرەسە هەرە روناكەكانی بەشەری كۆنو نوێ، رەگەزپەرستی لێ دەرەوشاوەتەوە، (ئەرستۆ)و (گروتیوس) مرۆڤەكانی پێ وەك (أسنان المشط) نەبووە، بەلكو بچوكو مەزن بەندەو ئازاد پلەی لێك جیای كۆمەلایەتی بووینە، هەتا هاوەلاتی سەردەمی كۆمەلگای رۆمانی هەرگیز هەژارو غەوارەو بەندەو ئافرەتی نەگرتوتەوە، لە كۆمەلگە دیوكراسیەكەی ئەسینیش هەروا بووە، مەدرەسەی یۆنانی تا رادەیەك دوو راو بۆچونی جیای هەبوو، بالی لاهوتیەكان لەژێر كاریگەری كەلتوری ئاینی وا بۆ مرۆڤەكان دەچوون

کە هەمووی لە قوڕن‌و کەس لە کەس گەورەتر نیە، هەرچی لاپالّی عەلمانی بوو پێیان وابو کە ڕاستە هەموو لە قوڕن بەلاّم (بەندەکان) لە قوڕێکی خراپن، دەرەبەگ‌و مەزنەکانیش لە قوڕێکی تێکەڵ بەزێڕ دروست کراون، ڕۆمانیەکان کۆمەلگەکەیان دابەشی چینایەتی نەژادی‌و ڕەگەزی دەکرد، هاو وڵاتی پلە یەک‌و دوو و سێ هەبوو، ئەوەی لەوانیش نەبوایە یان دژیان بوایە بە (بەربەر) دەخوێندرایەوە، ئەوەی ئاینی ئەوانیش نەبوایە بە (ئیشنی) دەخوێندرایەوە، تەنانەت هیرودتس—کە بە باوکی مێژوو ناوزەد دەکرێ ئەویش شەڕی نێوان ئاسیا ئەوروپی بە شەری بەربەرو مەدەنی لە قەڵەم داوە، بەو شێوەیە سیستەمیکی خنکاوو لە ڕەگەزپەرستی کۆمەلایەتی‌و ئاینی‌و فکری،.. یان پەیرەو دەکرد، (چینی)ەکانیش ئەورووپیان بە (قژ سپی) ڕەزاگران وەسف دەکرد،.. لەناو یەهودیش ئەوەی لەوان نەبوایە بە (جویم) دەخوێنرایەوەو بە چاوێکی نزمتر سەیر دەکران‌و بنەچەی (شعب الله المختار) لەوە دێ، و زۆربەی ئایدۆلۆجیای زایۆنی لێرەوە سەرچاوەی دەگرێ، هەروەها لەنێو شارستانی هیندۆسەکانیش نەو دابەشیە هەبووە، براهماو شودرا چینێکی بالاّ‌و مەنبووزەکانیش چینی خواروون، لە نێوان زۆر شارستانی تریش ... جگە لە سیستەمی ئاینە ئاسمانیەکان ئەگینا مێژووی مرۆڤ بریتی بووە لە ڕەگەزپەرستی، لەدوای لادان لە ئیسلامی ڕاستەقینە ئەوەی لە ئەمەویەکان نەبوایە بە موالی ناو دەبرا، لە سەردەمی عەباسیش بە شعوبی، ئیتر هەر کۆمەلگەیەکی نەفامی بەجۆرێك یان سەرتاپای ڕەگەزپەرستی بووە، لەنێو بەهای خێلایەتی کوردیش ئەوەی لە خێلەکەیان نەبوایە بە بێگانە دەخوێنرایەوە بە هەموو ماناکانی یەوە، هەرچی ڕەگەزپەرستی نەتەوایەتی نەژادی‌و شارستانیە... ئەوانە لەدوای ڕابونی نەتەوایەتی سەری هەلّدا لە سەدەکانی (١٨-١٩) لە ئەوروپا، لە سەدەی (٢٠)یش لە جیهانی سێیەم، سەرەتا لە ئاستی فکریەوە کۆمەلێك زاناو فەیلەسوف تەنزیریان بۆ ڕەگەزپەرستی کردووە، لە هەموان زەقتر: گوبینوی

فەرەنسی، شامپرلینی ئینگلیزی، (بەواس)، (فیشەر)... زۆرێکی تر وای بۆچوونە کە نەك خوێنو پێستو زمان هەتا توانای ئەقلی نەتەوەیەك لەگەڵ نەتەوەیەکی تر لێك جیایە، هەریەکە توانای ئەقلی نەتەوەکەی خۆی بەسەر مەشق زانیوە، جۆرە تەنزیرێکی ڕەگەزپەرستی وای کردووە هانی هێرشی سەربازی بۆ سەر یەکتر بدەن، ئاپارتایدو فاشیو نازی لێ پەیدا بوو .. سەرلەنوێ هەریەکە لە (هۆبز)و (نیتچە) زۆرێکی تر لە زانایان ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ هاتونەتەوە سەر بۆچونەکەی یۆنانی کۆنی (ئەرستۆ ) (گرۆتیوس) کە مرۆڤەکانی وەك (دەمی شانە)نین و یەکسان نین، هەیە بۆ بەندە باشەو هەشە بۆ ئاغەو .... بەتایبەتی تەنزیراتە ڕەگەزپەرستیەکانی (هیگل) لەبارەی کۆتایی مێژووی کۆمەڵ لەسەر دەستی نەتەوەی ئەڵمان، ئەو هەموو جەنگەو پاکتاوی ڕەگەزی و قەڵاچۆی ڕەگەزی لێ پەیدا بوو، .. ئێستاش بە دەمامکێکی تر ڕەگەزپەرستی بەناوی (سەر شارستانی- ڕۆژئاوا سالاری) سەری هەڵداوە ... هەمووی یەك ماهیەتی ڕەگەزپەرستیە ئەگەر چی ئەدریس زەمانو زەمینو شێوەی گەشە دەکات، بەو شێوە ئەو ڕەگەزپەرستیە نەتەوە گەری نەژادیە پەریوەوە ئاسیاو ئەفریقاش، لە جیهانی ئیسلامیش زیاتر نەتەوەی تورکو عەرەبی گرتەوە، عەرەبەکان شانازیان بە خاکەکەی دەکردو بە (ارض الرسالات)یان ناو دەبرد، میللەتەکەشی بەسەر مەشقی میللەتانو بە (أمة العربية وأمة الرسالات، خالدة،..) یەهودیش بە شعب الله المختار، تورکیش خۆیان بە (نجیب زادە)و تورانی حساب دەکرد .

## لە بەرامبەردا :

لە بەرامبەری ئەو چالاکیە مێژوییەی ڕەگەزپەرستی بەردەوام ئایینی ڕاستەقینە لە دژیدا لە سەنگەر بووە، خاوەنانی ئەقلی ڕاست دروستیش دژی ئەو ڕەوتە بوینە، لە بەرامبەر مەدرەسەی عەلمانی یۆنانی کۆن ( فیساگۆرس ئەنتلامیدسو ئەفلاتونو سوقرات...)، و زۆرتر ڕەخنەگر بووینە لە کۆمەڵگای

بێت، تاکە شارستانیەکە کەرەشەکانی جیهان ئێستاش شانازی پێوە دەکەن هەروەك لە داستانی (الجنور) بەرووني هاتووە[1]، کە لەو کاتی دا گەورە پاشاکان یەکتریان بەزۆرە ملەی (بەندە)و (ئاژەڵێکی) درندە داوەت دەکرد، ئەو واقیعە ئەوەندە رەسەن بیوو لەنێو دنیای ئائیسلامی گەیشتبووە پلەیەك نەك عەوام هەتا لەچاخی رابونیش دەبینین (مونتسیکۆ) لە کتێبی (روح القوانین) بەتوندی دەکەوتە نارەزای لە دژی دروست کردنی ئادەمیزادیکی قولەرەش، دەڵێ ئەوە سوودی چیە؟ یان لە شوێنی تر پرسیار لەسەر مرۆڤایەتی ئافرەت کراوە ... لەزۆر شوێن رۆژانە (٣) جار لە (بەندە) دەدرا تا بەبیری بێتەوە ئەوە بەندەیە[2]، زۆربەی یاساکانی کۆنی حورابی، رومانەکان لە یارەی مافی (خاوەن) لەسەر (بەندە)بووە ...، لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا هەمور چین و توێژو نەژادو نەتەوەو رۆل و کەسایەتی خۆی هەبەو هەبووە ،کەس ناوی (کەمایەتی) و (زۆرایەتی)و سەید وبەندە نەبووەو بەچەوتیش دروست نەکراون!، بەدرێژای خەلافەت (سەرەرای گەلێ سەلبیات) لە دەزگای رەگەز نامەدا ناسنامە لەسەر بنچینەی رەگەزی تۆمار نەکراوە، رەگەزپەرستی هاتە جیهانی موسلمانشین لە دوای :

١ـ هاتنی عەلمانیەت

٢ـ پەیدابوونی بیری نەتەوایەتی

٣ـ دارمانی خەلافەت

سەرچاوەکەشی لەرۆژئاوا لەسەر دەستی مدرەسەی لیبرالیزم سەری هەڵدا، ئەگەر چی ئێستا چاکسازی زۆریش لەو مەدرەسەیە تیاکراوە، تا رادەیەك جیاوازیەکانی نەژادی ورەگەزی و نەتەوەگەریان سریتەوە بەهۆی مافی یاسای هاوڵاتی (حق المواطنة)، بەڵام بەجۆرێکی ترو لەبەرەیەکی تر ئەو رەگەز پەرستیە بەکار دەهێننەوە، لە دەزگاکانیان، لە راگەیاندن، لەرەفتار، لە تیۆرە

[1] بروانە : الجنور- ئەلیکس هایلی
[2] بروانە سیترەه دکتۆری فیرعەون

بەناوبانگەکەی (مل ملانێی شارستانی)، لە دیمکراسی و ماف و بڕیارە جهانیەکانو لە نەتەوەیەکگرتووەکان... هەتا لە دەستکەوتە زانستیەکانیش، زۆربەی دوزینەوەکانی فلسفی وزانستی وتەکنیکی دەگێڕنەوە بۆیەکەم کەسی رۆژئاوای ئەگەر خەلکێکی تریش دۆزیبێتیەوە، بەو شێوەیە مێژووی جیهان لە مێژووی ڕۆژئاوا دەبینن، خەلکی ترو کیشوەرەکانی تر ناخوێننەوە هەروەك (براترند راسل)ی بریتانی زۆر بە ئاشکرا لەدوای سەردانە جهانیەکەی داتی پیاهێناو وتی: (جاران وا تێ گەیشتم هەر ئەوروپا هەیە ئێستا دەبینم جهانی تریش هەیە) .تاکۆتای سەدەی بیستەمیش ئەو دۆخە ڕەگەز پەرستیە بەیاسایش کرابوو، یان لە دەستوور تۆمار دەکراو و حزب و دەولەتی لەسەر دروست دەبوو، وەك لە دەسەلاتی ڕەگەز پەرستی (ئاپارتاید)* ی خوارووی ئەفریقا ، لە ١٩٤٨ هەتا ڕزگاری ڕەشەکان لە بەرامبەر سپیەکان لە مولکداری وفەرمانبەری خوێندن هەتا لە پارك و چێشتخانەکان قەدەغە کرابوون، یەك دەنگی سپی بەرامبەر (٣) دەنگی ڕەش بوو لە هەلبژاردن، ئەو دۆخە لەسەر دەستی زۆربەی ولاتە داگیرکەرەکان بەرامبەر نەتەوەی ژێر دەست ئەنجام دراوە، لەوانەش نەتەوەی کورد، ئەوانەو سەرەرای ڕەگەز پەرستی تری یاساکانی نەفامی و بانێك دوو هەوای (الکیل بالمکیالین) ... ئینجا ڕەگەز پەرستی شارستانیەك لەگەل شارستانی و کەلتوور فەرهەنگێکی تر، هەتا دەگاتە ڕەگەز پەرستی هونەر وزانستی و سینەمایی و هەریم چیایەتی و ...، لەیادی ٢سالەی جەنگی کەنداوی دووەم (١٩٩١) لە کەنەدا ڕێپێوانێك کرا تەنهاسەدو قوور خاچیان بەرزکردبووە کە یەکسان بوو تەنها بە ژمارەی کوژراوەکانی هێزەکانی ڕۆژئاوا، لە کاتێکدا کوژراو لە ڕێزەکانی سعودیە وکوێت ولاتانی کەنداو و عەربی هەبوو ئەوانەیان بەمرۆڤی تەواو حساب نەکردبوو،ئەوەش تووکی ڕەگەزپەرستیە، بەو دواییە زەق تر ئەو

* ئاپارتایدا وشەیەکی ئەفریقیە، ماناى (جیاوازی) دێت، بەمانای جیاوازی نەژادی سپی و نەژادی ڕەنگەکانی تر.

دیاردە دەردەکەوت ئەگەر ئادەمیزادیکی ئەمریکی بکوژرا بە ئەوا قەرەبوی چوار قاتی یەکێکی ئەفغانی وپاکستانی وئیراقی بوو ٠

هەرچی مدرەسەی شیوعیەتیشە وەك تیۆرو پەیرەویش تا رادەیەکی چاك ئەو شێوازە ڕەگەز پەرستیە شاقولیانەی قەلاچۆ کردبوو، بەلام کێشە وڕەگەزپەرستی گەلێ جار لەگەل نەتەوە بچووكو کەمایەتیە ئاینیەکان دەکرا، بەتایبەتی لەگەل ئیسلام، لە یەکێتی سۆڤیەتی پێشووش زۆر بەدل ڕەقانە ڕەگەز پەرستی کراوە لەگەل کەمایەتی کورد زیاتریش لەسەردەمی ستالین، لەلایەکی تر جۆرێك لە ڕەگەزپەرستی چینایەتی لەمدرەسەی شیوعیەت کراوە بەهۆی تێوری (ناکۆکی چینایەتی)٠٠٠٠ ئەوەش شێوەیەکی تری ڕەگەزپەرستی دەگمەنە (ڕەگەز پەرستی ئاسۆی) .

لە جیهانی ئێستا ولە عەولەمەدا هێشتا بەگشتی ڕاپۆرتەکانی ڕێکخراوە مرۆییەکان بەردەوام ڕاپۆرت دەربارەی ڕەگەزپەرستی دەدا، زۆربەی ولاتانی جهانی بە ڕەفتاری ڕەگەز پەرستی لەقەلەم داوە لەوانەش : هەردوو ئەمریکا لەگەل دانیشتوانی ڕەسەنی ئەمریکی.

دەزگاکانی وەك زانکۆی عربی، فرانکۆ فۆنیە، ئەنگلو سکونیە، زایونی ٠٠٠ ڕەگەز پەرستین هەروەها شارستانی لەگەل (شارستانی تر) ٠٠٠ هێشتا جیهان مەودایەکی زۆری لەپێشە تا لە ڕەگەز پەرستی رزگاری دەبێت

(٢٣)

## کەمایەتی أقليـــة minority

زۆر کێشە نیە لەسەر پێناسی ئێستای، بۆیە هەرکەمێك لەسەری هەڵوەستە دەکەین و پێناسـی (موسوعة الدولیة للعلوم الاجتماعیة) هەڵدەبـژێرین کـەتا رادەیەك هەمەلایەنەو دەڵێ : ئەو کۆمەڵە خەلکەن جیاوازیەکیان لەگەڵ زۆرایەتی هەیە لە یەکێ لە فاکتەراکانی (رەچەلەکی، نەتەوایەتی، ئاینی، زمـان،...) یـان زیاتر، بەهۆیـەوە وەك نوقـستانیەك دێتـە بەرچاوی گـشتی، فەرهـەنگی بـالای (british Enseclobidi..) هەمان پێناسی هەیـە، بـەڵام (موسـوعە لاروس) دەڵێ کەمایەتی ئەوانەن کە دەسەلاتیان کەمە، ئەو پـێ ناسـەی دوای لـە رەوتـی باسـە کە دەردەکەوێ زۆر ورد نیە، کەمایەتی مانای واتیـە لـە هـەموو بوارەکـان لەگەل زۆرایەتی لێك جیا بن، سەرباری ئەو فاکتەرانەی لە (موسوعة الدولیـه...) هاتووە هەریەکە لـە جیاوازیـەکانی فەرهـەنگی، تـایفی، کـەلتووری، .. دەبێتـە دابەش بوون بۆ زۆرایەتی وکەمایەتی ئەگەر ئەو فاکتەرانە لە یەکی لەلایەنـەکانی کەمایەتی یان زۆرایەتی بنچینەیی بوو، بۆیە گەلێ جـار ئەخـشەیەکی نـسبی لـە کەمایەتی و زۆرایەتی دروست دەبێ بەپێ ی بنچینە بوونی ئەو فاکتەرە، هەر بـە نمونە لەگەل دروست بوونی عێراق لە ١٩٢١ کە فاکتـەرو جیـاوازی نەتـەوەیی لێ بنچینە بوو ئەوا یەکـەر کورد لە چاو زۆرایەتی عەرەب بوونە کەمایەتیـەکی لـە ٢٢٪، بـەلام دوای بـەرپابوونی شۆڕ شـی ئیـسلامی ئێـران ١٩٧٩ فاکتـەری ئیسلامی (سـواق دراو بـە تـائیفی) گەشـەی کرد ئـەو ئەخـشە گۆڕا سـوننەی ناوەراسـتی عـەرەب بوونـە کەمایـەتی٢٠٪، ... ئێـستا جـۆرە ئەخـشەو

سەرئەنجامێکی تر پەیدا بوو، بۆیە کەمایەتی و زۆرایەتی بەرز ونزمی وگۆرانی تیایە بە پێ ی فاکتەرە کۆمەلایەتیەکان لەلایەك ، لەلایەکی تریشەوە بەهۆی فاکتەری سیاسیش، وەك ئەو واقعەی ئێستای کێشەی کەمایەتی لە جیهان کەزۆربەی لە ئەنجامی ئەو سنورە دەستکردە دروست بووینە، بەپێی ئاماری رەسمی[١] ٢٢٣-٢٣٠ کۆمەلە کەمایەتی سەرەکی لەو جیهانەی ئێستا هەیە کە خاوەن کێشە بن، ژمارەیان بە پێ ی ئاماری ١٩٩٠ز (٩١٥) ملیۆنە، سەرجەم ژمارەی نەتەوەو گەلانیش بەپێ ی (برنارد نیتچمان) لە نێوان(٣٠٠٠-٥٠٠٠)ە[١]، بە پێی (القاموس السیاسی ) ژمارەی زمانی ئەو گەلانەی لە ملیۆنێك زیاترن و لە هەریەی خۆیان دەژین ١٥٦ زمانە، رەنگە لە توێژینەوەی نوێ زیاتر بن، بۆیە رەنگە ژمارەی کەمایەتی وکێشەکانیان زیاتر بێ.

## بنەچەو گەشەی ئیثنی :

لەبنچەدا ئەو زاراوەیە لە کەمایەتی ئایینی و نەژادی هاتووە، کۆن ترین مانا کە تۆمار کرابێ ئەوەیە جاران لە کۆمەلگای رۆمان هەر یەکێك مەسیحی یان یەهودی نەبوایە پێ ی دەووترا (ئیثنی)، یان جویم، بە پێی هەندێ سەرچاوە (ئیثنی) وشەیەکی یۆنانیە زیاتر مانای (گەل، نەژاد) دەگرێتەوە[٢]، رەنگە (نەژاد)ەکە نزیك تر بێت، لە ئاینە راستەقینەو دەستکاری نەکراوەکان ئەو زاراوەیە نەباوی هەبووە، نە تۆماریش کراوە، چونکەهاوولاتی (کە موسولمان واهل الذمە ی) گرتۆتەوە لە دە وڵەتی ئیسلامی بەند نەبوود بە ئنتمای ئاینی و کۆمەڵایەتی و رەچەلەکیەکانی تر، وەك لە کۆمەڵگەی رۆمان (ئیثنی) یەکێك بووە لەو کەمایەتیانەی کە لەماف دا بێ بەش بووینە لە ئەرکدا زیادیان خراوەتە

---

[١] بروانە: موسوعة العربية، هەروەها کتێبی (أقليات في خطر ــ تيد روبرت جار – ترجمة د. رفعت سيد احمد)

[٢] الملل والنحل والاعراق- ل ٢١

ئەستۆ لەناو زۆرايەتی مەسيحی، ئەوە لە رووی ئاينی لەرووی شارستانی و نەژادیش ئەوەی لەرۆمان نەبوايە عادەتەن ناوی (بەربەر)يان لیّ دەنا، لەسەردەمی عەباسی وئەمەويش رەگەزپەرستی سەری هەلّداوەو زاراوەکانی وەك: مەوالی و شعوبی پەيدا بوو، لە هندو چينو هەتا لەنێو عەشيرەتو هۆبەو دێيەكيش ئەوەی لەخۆيان نەبوايە دەيانووت بێگانەيە، لەدوای خەملّينی سياسی رەگەزیو دروست بوونی دەوڵەتو سنور لەسەر ئەو بنچينەيە، كەمايەتیو زۆرايەتی بە جۆرێكی تر سەری هەلّدا لەسەر ئەو بنچينەيەش لە دوای سەدەی (١٨)بەولاوە بانگێشەی مافی كەمايەتی كرا، هەرچەندە بەشێك بۆ دەقی رێكەوتنامەی ڤيەننای (١٨١٤-١٨١٥)ی دەگێرنەوە كە داوای مافی ئازادی ئاينیو سياسی كرا[١]، گەلیّ جار ئەوانە كەمايەتی نەبوونە، بەلاّم دروستبوونی ئەو سنورە دەستكردانە كە لەدوای وەرچەرخانی سيستەمی ئيمپراتۆری بۆ سيستەمی (دەوڵەتی نەتەوەی) هاوچەرخ بە ئارێكی لە چوارچێوەی نەخشەكانی ئيمپريالیزمی جيهانی، كەمايەتی زۆرايەتی لیّ دروست بووە، بە دووكەرتو چەند كەرت كردنيان، هەندیّ ئونە لە هەردوو دۆخی كەمايەتی رەگەزی و ئيسنی تۆمار دەكەين :

ئەمريكا: پێك هاتووی ٢٥٠ جۆر ئاينیيە، سەرەرای زۆرايەتی مەسيحی، لە هەموو ئاينیو نەتەوەيەكی جيهانی لیّيە، وەك ئەژاديش لە ٧٤٪ سپی، ١٠٪ رەش، ٩٪ هنديە سوورو ئيسپانیو لاتينين .

بەريتانيای مەزن: لە ٨٠٪ ئينگليز، ١٠٪ ئيرلند، ٤٪ وێلز، ٢٪ هندی.

چين: ٩١٪ هان چينی، ٤٪ نەتەوەی جوانگ، ٨٪ هاو، تيبتيەكانيش كەمايەتيكی كێشەداريان لەگەلّ چين هەيە، سەرجەم ٥٥٠ جۆر كەمايەتی لیّيە.

رووسيا : ١٢٨ جۆری لیّيە، بەو شێوەيەش هندو ماليزياو ولاّتانی جيهان......

---

١ هەمان سەرچاوە.

ئەوانەی خوارەوەش سنوری دەستکرد کردوویانن بە کەمایەتی وکێشەیان هەیە، بریتین لە:

نیرلەندا : سەرنج بدە هەنگاوەکانی دروست بوونیان بە کەمایەتی کە خۆیان لە بنەچەدا زۆرایەتین وەك نمونەیەك بۆ گشتی:

زۆربەیان غیلی زمانو مەزهەب کاسۆلیکن لە سەدەی پێنجەوە ئایینی مەسیحیان وەرگرتووە، پایتەختیان دبلنە، لە ساڵانی ١٩٢٠-١٩٢١ تا ١٩٤٩ قۆناغەکانی سەربەخۆی ئیرلەندا تەواو بوو لە دەست بەریتانیا، لە هەمان کات بەریتانیا هەڵسا (٦) هەرێمی لە بەشی سەرووی ئیرلەندا (الیستر) وا جیاکردەوە کە ئینگلیزە مەزهەب کاتۆلیکیەکان زۆرایەتی پێك بهێنن لێی و (بلفاست)ی کردە پایتەخت، .. ئیتر لەوکاتەدا ئەوانە لەسەر خاکی باب‌و باپیرانیان بوونە کەمایەتی‌و کێشەیان هەیە.

کوردستان: هەمان دەردی هەیەو خۆی زیاتر لە ٤٠ ملیۆنە کەچی لەبەر ئەو دابەشبوونەی لەسەرەتای سەدەی بیست بوویتە کەمایەتی لەسەر چوار پارچە.

بەربەر: بە سەرەکی لە نێوان جەزائیرو مەغریب دابەش کراون، لە جەزائیر لە ٢٢٪ ی دانیشتوان پێك دەهێنن .

تامیللیەکان : لە٢٠٪ ی سریلانکا پێك دەهێنن، زۆرایەتیەکەش سەنهالین.

باسك: دابەش کراون سێ هەرێمی بەلای فەرەنساو چار هەرێمیش ئیسپانیا، تەنها ٢ ملیۆنی کەوتۆتە دیوی ئیسپانیاو بوینە کەمایەتی .

قوبرسی: لە ٢٠٪ تورك‌و زۆرایەتیەکە یۆنانیە: ﴿لە کۆتاییدا کۆمەڵێك زانیاری تر لەبارەی کەمایەتی تۆمار دەکەین﴾ .

زۆربەی ئەوانەی بە کەمایەتی ناودەبرێن نەتەوەی رەسەن‌و کۆنترن لە زۆرایەتییەکە، بەو دۆخەی ئێستایان کێشەی کەمایەتی یەکێکە لە گرفتەکانی دیموکراسیش، زۆربەی ئەو وڵاتانەی کێشەی کەمایەتی هەیە دیموکراسیشن کەچی بەو دیموکراسیە ئەو کێشە چارەسەر نابێ، لەبەرهۆیەکی سادە، ئەویش ئەوەیە

بنەمای یەکەمی دیموکراسی ئەوەیە ئەنجامی ڕاستیو دروستی دەوەستێتە سەر زۆرایەتی، بۆیە کەمایەتی تێدەشکێ ئەگەر لەسەر ڕاستیش بن، بۆیەش دیموکراسی لە کۆتای شیکردنەوەیدا بە ڕەگەزپەرستی کۆتایی دێت یا هەرچەندە چاکترین داهێنانی بەشەریش بێ.

## ڕای مەدرەسەکان :

ئەو زاراوەیە وەك لە سەرووش ڕا دەرکەوت لە هەناوی عەلمانیەتو مەدرەسەی لیبرال دیموکراسی چەکەرەو گەشەی کردوە، هەرچەندە ئێستا تا ڕادەیەکی چاك بەهۆی دیموکراسیو دروستکردنی کۆمەڵگەی مەدەنیو فراوانکردنی چەمکی هاوولاتی لە جیاتی هاوئەندەمیی ئەو کێشە کزبووە، بەڵام عەلمانیەتو تەیاری نەتەوەگەری جیهانی سێیەم کە زیاتر زادەی مەدرەسەی ڕۆژئاواین، ئەوانە زۆرداریەکی بێ وێنە لە کەمایەتی دەکەن، ئەگەر کەمێك بەرگری لەو چەوسانەوەش بکەن ئەوا یەکسەر ناوی (انفصالی، عملاء، ارهابیە، خارج قانون، ضد الحریة والدمقراطیة،...)ی لێ دەنێن. هەتا لە فەرهەنگەکانیش وەسفی کەمایەتی لە کۆتایدا بە (قۆڵی پێنجەم- طابور الخامس) ناو دەبرێ، سەرنج بدە (موسوعة السیاسیة)ی د.کیالی کە فەڵەستینیەو خۆشی داگیر کراوە کەچی دەڵێ: ئیمپریالیزم هەردەم کەمایەتی بەکاردەهێنێ لە دژی زۆرایەتی بۆ پشێوی!! دەقەکەی: (في مجتمعات متخلفة والتابعة فأن امبریالیة حاولت بأستمرار تطبیق مبدأ فرق تسد وذلك من خلال تحریض الاقلیات ضد الاکثریة)[1]، ئەمەوەی جێی سەرنجە (د رفعت سید احمد )ی وەرگێڕی کتێبی بەناوبانگی (اقلیات فی خطر) هەمان ئەو گوتەیەی کەیالی دووبارە دەکاتەوە ئینجا دەڵێ: کەمایەتی لەنێو عەرەب لە مەترسیدا نیە[2]!!.

---

١ موسوعة السیاسیة - .د.کیالی ج١ ل٣٤٠

٢ بڕوانە پێشەکی ئەو کتێبە .

لە مەدرەسەی مارکسیەت چونکە فلسفەو فاکتەری (یەکلاکەرەوە) لەسەر بنچینەی رەچەلەك و نەژادو زمان نەبووە، بۆیە کەمایەتی مانایەکی وای نەبەخشیوە، تارادەیەك جۆرە چارەسەریەکی ئەو کێشەی کردووە، تەنیا لەسەر بنچینەی جیاوازی چینایەتی دەروانێتە زۆرایەتی و کەمایەتی، ئەو باسەی کەمایەتی زۆر دەگمەن بووە مەگەر جار بە جار لە ئەدەبیاتی مارکسی باسی لە زۆرایەتی پرۆلیتاریاو کەمایەتی برجوازی کردبێ.

لە فیکری ئیسلامیدا هیچ جۆرە جیاوازیەك نەبووە، نە لەسەر بنچینەی چینایەتی نە نەژادی، تەنیا بنچینەیەك دارێژراوە کە لەتواناى هەموو کەسە بێ ئەوەی نەژادو چینایەتی و نێرو مێیاتی و..... هیچ فاکتەرێکی میراتی رێگر بێت، ئەویش فاکتەری (تەقوایە)، واتە جیاوازی پایەو پۆلێن لەوەیە کامیان دادگەرو دڵسۆز بەخزمەت و پەیرەوکەرتری یاساو شەریعەکەیە، لەوبارەیەوە زانایەکی ئەمریکی گوتەیەکی زێرینی هەیەو دەڵێ (لەو جیهانە تەنها یەك خواپەرست هەبێت بە زۆرایەتی حسابە)، واتە لە ئیسلامدا زۆرایەتی و کەمایەتی لەسەر بنچینەی ژمارەو چەندایەتی نیە، بەلکو لەسەر بنچینەی راستی یە، بۆیە لە کۆمەڵگەی ئیسلامی کەمایەتی ماناو شوێنی فەرهەنگیش نیە، تەنها بۆ جیاکردنەوەی زاراوەی وەك ملل، نحل، اهل الكتاب، اهل الذمة، دار الحرب، دار العهد... ئەگینا هیچ سیستەمێك وەك ئیسلام نەیتوانیوە، ناتوانێ چارەی (کەمایەتی) بکا، ئوممەت لە ئیسلامدا مانای نەتەوە رەچەلەك و نەژاد ناوچەو سنورێك ناگرێتەوە ... بەلکو هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە بە پیر بانگی ئیسلام دێن، بۆیە سەرکردەو مونەزیرو دەزگاکانی ئیسلامی بەتایبەتی لە سەردەمی خەلیفەکانی (راشدین)پێك هاتبوو لە کەمایەتی چینی هەژارو نرقستانان و ئافرەتانیش ئەوەتا بلال حبشی، سەیادی رۆمی، سەلمانی فارسی، .. سەرکردە بووینە، هەربۆیەش پیاو ماقوڵانی قورەیش بەپێی سیستەمی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمی (بگرە ئەو سەردەمەش) ئەو جۆرە پێکهات و کۆمەڵگەیان پێ قبوڵ

نەدەكرا كە ڕەشێك یان غەریبەیەك یان كەمایەتیەك یان هــەژارو نوقــــستانێك لــە سەرووی ئەوان بێت.

كاتێ وەڵامی پرســیارەكەی (عمری كوری بن مەكتوم)ی كەمێك پشت گوێخرا لە لایەن پەروەردگارەوە گەورەترین وشیاری بە پێغەمبەر ﷺ دراو سورەتێك بـەو بۆنەوە هاتە خواری بەناوی (عبس وتولی)، لەبەرئەوەی پێغەمبــەر ﷺ كــەمێك زیاتر ویستی وەڵامی پرسیاری زۆرایەتیەكی مجلسو پیــاو مــاقوڵانو شــێخەكانی قورەیش بداتــەوەو پــشت لــە كەمایەتیــەكی هــەژارو نوقــستان بكـا. هــەتا لــە سەردەمی دوای راشدین (هەرچەندە لادانێكی ترسـناكیش هەبووە) ئــەو دیاردەیــە باوی نەبووە زیاتر لەناو جیهانی مسوڵمانشین لە دوای هەڵوەشــانەوەی خەلافــەت و هاتنی عەلمانیەت و سەرهەڵدانی تەیاری نەتەوایەتی پەیدابووە تا بــە میللــەتێكی ڕەمەنی ٤٠ ملیۆنی وەك كورد بگوترێ كەمایەتی كە هەر بۆ مــاوەی ســەدەیەك لە مێژووی خەلافەت سەركردایەتی جیهانی كردووە.

## بە یاســـایی بوونی كێشـــەی كەمــایەتی :

هەڵبەتە لە دوای دروستبوونی پەیوەندی لە نێوان خاكو تاكو دەســەڵات كــە سەردەمی ڕابوونی نەتەوەگەری پێ دەڵێن، ئەوا بە پێی یاسای نێو دەوڵــەتی ســێ توخمی یاسایی دیاری كرا بو بوون بە دەوڵەت: ١- هەرێم (نیشتمان)، ٢- گــەل (نەتەوە) ٣- دەسەڵاتی سیاسی .

هەڵبەتە لە سەردەمی ئیمپراتۆرەكان ئەو پەیوەندیە نەبووە، چونكە (ســیادە) باڵی بەسەر زەمیندا نەكێشا بوو، ئێستا یەك بست خاك لەسەر ئەو زەویە نەماوە سیادەی وڵاتێك نەبێ، بەجۆرێك سنوری نێو دەوڵەتی هەر وڵاتێك كۆتایی دێت بە سنوری وڵاتێكی تر، بۆیە جاران ئاسایی بــوو دەســەڵاتو ئیمپــراتۆریەت لەســەر خاكی خەڵكی تر دروست بكەیت، زۆر سروشتی بوو ڕۆم لە شام بــن، ئەمــــكەندەر مەقدۆنی لە بابل بێت، صلاح الدین لە میــسر بێــت، عوســــمانلی لــە ڕۆمانیــا

بیت، ...بەلام ئێستا ئەوە نابێت، وەك یاسای دەولیش چەسپاندوویەتی، هەرگەلیك لەسەر خاكی خۆی بەرپرسە لە خۆی نەك لە خەلكی تر، جا ئەو كێشانەی لەو ئاستەن ئەوا كێشەی نەتەوەییە نەك كەمایەتی، یاخود بە روونتر: كێشەی ئەو میللەتانەی كە خاوەنی هەرێمو گەلن ئەوا كێشەكەیان لە ئاست یاسای نێو دەولەتیە بنەمای مافی چارەی خۆنوسی دەیانگرێتەوە تا رادەی بون بە دەولەتو وەرگێران لە نەتەوەیەكگرتووەكان، لەوانە: كوردو فەلەستینیو چیچانیو كشمیرو باسك و....، ئەوانەی هەرییان نیە لە ئاست كەمایەتی دەژمێردرێنو پرسەكەیان بە كێشەیەكی ناوەكی لە قەلەم دەدرێت، چەندین بریار بۆ نەتەوەكان هەیە لە هەموان روون تر مادەی (١) كەچی مادەی(٢٧) بۆ كەمایەتی هاتووە كە مافی فەرهەنگی پێ بدرێ، نەگینا بە هۆی مافی هاولاتی بون لە دەستوری ولات چارەسەر دەكرێو یاسای نێودەولەتی كەمتر رێگەیان پێ دەدا دەولەت دروست بكەن، بۆیە بەشێكی زۆر لێیان وا دەتوێنەوە .

## پێناسی لارۆس :

ئەو پێناسەی لارۆس كە لە سەرەتادا تۆمارمان كرد مانایەكی زۆر دەبەخشێ ئەگەر جوان تر ستوركێش بكردبایە، بەلام بۆ ئەو واقیعەی ئێستا زۆر تەواوەو، زۆرایەتیو كەمایەتی ناكەوێتە سەر ژمارەو چەندایەتیو رووبەری جوگرافی ... بەلكو زیاتر دەكەوێتە سەر دەسەلات، هەردەم دەسەلاتداران دەبنە چینێكی كەمو دژی زۆرایەتی میللەت، ئەوەیان لە ولاتە دیكتاتۆریو شمولیو تاك رەویەكان زۆر روونە، بەلام لە ولاتە دیموكراسیەكانیش لە جەوهەردا هەروایە، هەتا دەست گۆری دەسەلاتو هەلبژاردنیش بكەن، چونكە لە كۆتاییدا كەمایەتیەك دەگەنە دەسەلات بەناوی نوێنەرانی میللەتو نوێنەرییش نین، .. بۆیە بەردەوام ئاماری رێكو پێك دەردەچێ لەبارەی خۆشگوزەرانی چینی دەسەلات، بەراستی دەركەوتووە ئەوانە كەمایەتیەكی دەسەلاتدارنو پێناسەكەی (لارۆس) راستو

دروستە بەو پێیەو چینی دەسەڵاتدار ڕەگەزپەرستی‌و جیاوازیش دەکەن‌و هەردەم بە چاوی سووك دەڕواننە چینی بێدەسەڵات، ئەوەش تەواو لەگەڵ پێناسەی مارکسیزم‌و ئەو زانایانەی کە لە ناوەڕۆکی دەسەڵاتیان کۆڵیوەتەوە تێك دەکاتەوە کە پێیان وایە دەسەڵات ئامرازێکە بۆ ملکەچ پێکردنی چینە بێدەسەڵاتەکان، لە ڕاستیدا ئەو نمونە پێچەوانانەی کە لە هەندێ شوێن کەمایەتی دەسەڵاتدارن پاساوی ئەو جۆرە پێناسە دەکا، لەوانە ئەو کەمایەتیەی (ئەلبوێر) کە لە بنەچە سپی هۆڵەندین دەسەڵاتی لە خواروی ئەفریقا بەدەستەوە بوو حوکمی زۆرایەتی ڕەهای ڕەش پێستەکانی دەکرد، هەروەها لە مۆزەمبیقیش، هەمان ئەزموون ئێستا وا لە بۆرندی‌و ڕواندا کە دەبینێ توتسیەکان تەنها ١٤٪ن‌و هۆتۆش لە ٨٥٪ ن کەچی بەهۆی ئەو دەسەڵاتە کەمایەتیەکە دەسەڵاتدارن زۆرایەتیەکەش بێ دەسەڵات، لە عێراقیش بەهۆی ئەو دەسەڵاتە لە ٢٠٪ ی سوننەی عەرەب (سوننە بەمانا کۆمەڵایەتیەکەی) زاڵ ببوو بەسەر هەردوو زۆرایەتی کورد لە ٢٢٪ و شیعە ٥٥٪، بەڵام بە دەمامکێکی ئاڵۆز کەمایەتیەکی خۆی داپۆشیوە. ئەو جۆرە دابەشیە پێی دەوترێ (عرقية السياسية) Ethno political .

## هەندێ زانیاری تایبەتی تر:

لە ڕاستیدا کەمایەتی‌و زۆرایەتی نەخشەیەکی چەسپاوی نیە، دەکەوێتە سەر ئەو فاکتەرەی کە دەکرێتە تەرازوو، ئەگەر بە تەرازووی نەتەوەگەری نەخشەی کۆمەڵایەتیت دارشت، ئەوا ڕوونە ئەوانەی لەو نەتەوە نەبن‌و کەمتربن دەبنە کەمایەتی، بەڵام لە هەمان کۆمەڵدا ئەو جارە تەرازووو فاکتەری ئایینیت کردە بنچینە ئەو جارە نەخشەکە دەگۆڕێ‌و بە جۆرێکی تر کەمایەتی دروست دەبێ... بەو شێوەیە ئەگەر دیسان فاکتەرت گۆڕی بۆ مەزهەبی یان فەرهەنگی یان ئابووری یان ... ئەوا هەر جارەی جۆرە نەخشەیەکت دەداتێ‌و هەر یەکە

کەمایەتی زۆرایەتیەکەی جیایە لەگەڵ ئەوانی تر، هەرلە یەك کەسدا ڕەنگە لە نەتەوەیی زۆرایەتی بێ، بەڵام کە هاتە سەر ئایینی هەمان کەس ببێتە کەمایەتی، بۆ نمونە لە عێراق مسیحیەکی عەرەب زۆرایەتیە لە چاو تورکمان، کەچی هەمان کەسی دەبێتەوە کەمایەتی لە چاو ئایینی بەرامبەر هەمان کەمایەتی، کەواتە نەخشەی کەمایەتی دەگۆڕێ بە پێی گۆڕانی فاکتەری کاریگەر لەسەر کۆمەلگەکەو سەردەمەکەی.

بەو ڕووکارە ئەو نووسراوو لێکۆڵینەوانە هەریەکە بە جۆرێك لەو کەمایەتیەی پێچاپەتەوە، لە پێش سەدەی بیستەم توێژینەوەکان هەر لەسەر کەمایەتی ئایینی بووە، بەلای ڕەچەڵەکیو نەژادی نەچوونە، ئێستا نووسینەکان هەمەلایەنی وەرگرتووە بەڵام هەریەکە بەپێی ئینتمای فیکری خۆی، واتە هەیە تەنها مسوڵمانانی جیهانی تۆمار کردووە، لەوانە مێژووناس (محمود شاکر)، هەشە کەمێك فراوان تر وەك (تید روبرت جار) لە کتێبی (أقليات في خطر) یان فەرهەنگی بالاو ئنسکلوپیدیای ولاتان ڕێژەی ئافرەتو پیاو، هەژارو دەولەمەند ...... بەو شێوەیە ... لە کۆی هەموان وا هەندێ زانیاری لەبارەی کەمایەتیان لێ هەلدەبژێرین:

*بە پێی کتێبی (أقليات في خطر)٢٣٣ کەمایەتی چالاك لە ٩٣ ولات هەیە، واتە ئەوە کۆی گشتی نیە بەلکو ئەوانەی کێشەیان هەیە لە ولاتانی نا دیموکراسی بەتایبەتی، ئەگینا بە دەگمەن ولات هەیە کەمایەتی تیانەبێ، بەڵام یاسای هاوولاتی لە زۆربەی ولاتان کۆمەلگەیەکی مەدەنی وای دروست کردووە کەمتر ئەو کەمایەتیە زەق بێتەوە بەڵام لەگەڵ کەمترین ورووژان ئامادەیە سەرهەلدا.

* لە دوای ویستفالیا ١٦٤٨ز و سەردەمی خەملینی ولاتان لەسەر بنچینەی نەتەوایەتی کەمایەتی زۆر دروست بوو، بەشێکیان بە خێرایی لەو ولاتە نوێیانە پەڕینەوە بۆلای زۆرایەتی ولاتی خۆیان وەك لە نێوان پاکستانو هند، ئەلمانیا بۆ لزانۆ لە سەرووی ئیتالیا لە١٩٣٠و١٩٤٥، و لە نێوان تورکیاو یۆنان سەرەتاکانی

١٩٢٠ بەدواوە ... لە زۆر شوێنی تریش، وا ئێستا لە ئێران شیعەو سوننەی عێراقیش ڕوودەدا .

## هەندێ ئاماری ساڵی ١٩٩٠ لەبارەی کەمایەتی:

* کیبك ٦,٨ ملیۆنن فەرەنسی زمانن لە ٢٧٪ ی دانیشتوانی کەنەدای ئینگلیزی زمانن، بە هەردوو باری خۆشیو ناخۆشی تێکۆشاون بۆ سەربەخۆیی، بەڵام ئێستا دەنگی یەکگرتووی زیاترە، ئەو ناوچەیە سەرەتا کە فەرەنسا دۆزیەوە ناوی نا (فەرەنسای نوێ) لەنێو هەرێمی کیبیك ٧١٠٠٠ ئینگلیز زمانی لێ دەژی، وەك کەنەدا کیبیکیەکان کەمایەتین، وەك کیبیك ئەو ٧١٠٠٠ دەبوونە کەمایەتی.

* پێکهاتەکانی سۆڤیەتی پێشوو کۆمارەکانی ئێستا: ڕووسیا ٣٦ کەمایەتی، ئوکرانیاش =٧،

* یۆگوسلاڤیا: شەڕ لەنێوان پێکهاتەکان ڕوویدا لە کۆتایی سەدەی ڕابووردوو، نەخشەی کۆمەڵایەتیشیان بەو شێوەیە بوو: ٦٦٪ صربیا، ١,٣٪ ئەلبان، ٣٩٠,٠٠٠ مەجەری، ٢,١٦٠٠٠ ئیسلامی بۆسنە، ١٥٠٠٠ کروات، ١٤٨مۆنتی نیگرو ١١١٠٠٠غەجەری (ڕۆمی)، لە کرواتیاش نەتەوەی ڕەسەن ئەستوتیەکانن لە ٧١٪، ئەوانی تر سرب ٦٣٢٠٠٠، لە بۆسنەوهرسك ٤٠٪ بۆسنە مسولمانەکانن ئەوانی تر ١,٣٢١٠٠٠ سرب، ٧٥٨٠٠٠ کروات، لە مەکدونیا ٧٦٪ مەکلۆنی ڕەسەنن، ئەوانی تر ٣٤٨٠٠٠ ئەلبان ٤٧٠٠٠ تورك، ٤٥٠٠٠ سرب، ٤٣٠٠٠ ڕۆم، ٤٠٠٠٠ بۆسینە ئیسلامەکان، لە سلۆڤینیا ٩٠٪ سۆڤیەتن ئەوانی تر ٦٥٠٠٠ کروات، ٤٢٠٠٠ سرب، لە مۆنتی نگرۆ ٦٨٪ ڕەسەنەکان، بۆسینە ئیسلامەکان ٧٨٠٠٠، ٣٠٠ ئەلبان ١٩٠٠٠سرب، ٧٠٠٠ کروات.

(٢٣) کەمایەتی　　　الأقلية　　　minority

---

* لە سەرجەم جیهانیش ڕێژەی ئافرەت زیاترە لە پیاو، بۆیە ئافرەت زۆرایەتیە و پیاویش کەمایەتی .

## (٢٤)

## جـــاش مرتزقة Mercenry

زاراوەیەکی تایبەتە بە کورد، هەرچەندە لە هەموو جیهان هاوشێوەی هەبووە کە دۆخەکەی لە جەوهەردا بەجاشی کوردستانی بچێت بەڵام وەك یەکیش نین، لە کوردستان بەو خەلکانە وتراوە (جاش) کەچەکی دوژمنی داگیرکەری هەلگرتووە دژی شۆرش بەرامبەر هەندێ پارە، لەناو کوردا نامۆرناشرین ترین پیشەیە، بارێکی هەرە تایبەتە لەبە یەك گەیشتنی سێ تەوەری سەلبی لە ئابووری و سایکولوجی و سیاسی دێت ،کە لە زاڵ بوونی: ١ــ بەرژەوەندی تایبەت بە سەر بەرژەوەندی گشتی ٢ــ دەروونێکی نەخۆشی بەسەر رەوشتی باڵای خۆی ٣ــ میکاڤلیەتی سیاسی بەسەر مەبادینیەکان . بۆیە ئەو ناوە دەگمەنە لەدوخێکی دەگمەنی کەسێتیەکە بۆ دۆزرایتەوە لە نێوان کۆمەلە ناوێکی تر وەك خیانەت، خۆ فروش، گەل فرۆش، بێگانە پەرست، کە لە ناو هەموو میللەتان هەبووە بەلام ئەو زاراوەیە شایەنی بە جیهانی کردنە لەسەر زاری کورد ناو لە هەموو خانینێك (بەپێی ئەو پێناسە) بنرێ (جاش ــjash)، پرۆسەی جاشایەتی مانای داڕنینی ئەو کەسە لە هەموو خوو و ڕەوشت و (سەوابت)ە وە دابەزینە بۆ ئاژەلێکی دڕندەو هەردەم بێ بەلێن دەست پیس، تالانچی، بێسپاردەی، دروزن، دەروون شکاو، ترسنوك، مادی، بێ نوقرە، بێ متمانە، گومانداو، دەروون نزم، بێ شەرم، بێ پەروەردە، .. ئەو سیفەتانە یە —کە بریتین لە بەهای جاش- ئێستا لەناو کۆمەلگای کوردستان تەنیتەوەو، هەرەشە لە بنەماکانی کۆمەلگەکە دەکا کە وێنەی وای لە مێژوو بەخۆ نەبینیوە، بۆیە لەگەل سازبوونی زەمینە دیسان ئەو

دیاردەیە لە گینە بە ترسناك تر سەرهەڵداتەوە هەروەك لە بەڵگەنامەو دۆسیەكانی بەعس بە روونی دەسەلمێنێ، زۆریش لێی بەخەم نینە.

مێژووناسان دیاردەی (مرتزقە) بۆ سەردەمی (رۆم) دەگێڕنەوە، گوایە لە كێشە ناوخۆیەكانیاندا بەشێك لە رۆمەكان هەندێ لە جەرمانو سولافیەكانیان بەكرێ دەگرت وەك پیشەی جەنگاوەری لە دژی رۆمەكانی تر، لە سەدەكانی ناوەڕاستیش لە كاتی جەنگە ئاینیەكاندا فەرەنسیە پرۆستانتەكان، ئەڵمانو ئینگلیزەكانیان بەكرێ دەگرت لە دژی فەرەنسیە كاتولیكەكان، لە هەڵمەتە ئیمپرالیزمەكانی فەرەنساش بۆ جیهان تیپێكی جاشی بیانیان هەبوو ژمارەیان (٢٢٠٠٠) بوو زۆربەیان ئەڵمانی بوون، دوای بوونە كرێگرتەی جیهانی هەرچی ئیشی جەنگی پێ بووبایە بۆیان دەكرد بەو كرێیەی لەسەری رێك دەكەوتن، لە جەنگەكانی جیهانی یەكەم بە فراوانتر بەكار هات، ئێستاش ئەو جۆرە (مرتزقەیە) زیاتر نزیكە لە دیاردەی جاش، چونكە تەكنۆلۆجیای نوێ زۆر پێویستی بە ئەفسەر نەماوە بۆ یەكلاكردنەوەی جەنگ بەڵام، هەردەم سوپای داگیركەر پێویستی بە چاوساغی نێو میللەتی داگیركراوەكە هەیە، ئەو جاشانەش كاریگەرو شارەزاترن، بۆیە سیستەمی (مرتزقە) بەرەو گۆڕانی تەواوە بۆ سیستەمی (جاش) بە تایبەتی لەو نیشتیمانانەی داگیركراون.

ناوی جاش لە شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١ زیاتر پەرەی سەند هەرچەندە لە بنەچەدا هەر لە لایەن سەرەك هۆزە خۆفرۆشەكان سەری هەڵداوە، بەڵام دوو هەنگاو كاریگەریەكی قووڵیان كردە سەر فراوانبوونی ئەو دیاردەیە، یەكەم ناكۆكی باڵی (م.س) پ ـ د ـ ك لەگەڵ (مەلا مصطفی) لە ئەنجاما وەرچەرخانی باڵی (م ـ س) بەلای داگیركەری حكومەتی عێراقو چەك هەڵگرتنیان لە دژی شۆڕشی كوردستان لە ١٩٦٦ -١٩٧٠ كە بە (جەلالی) ناسران، دووەم چەك هەڵگرتنی (تەنیا لیژنەی ئیقلیمی كوردستان)ی حزبی شیوعی عێراق لە فەترەی ١٩٧٣- ١٩٧٥ لە دژی شۆڕشی كوردستان، ناسۆیەكی ترسناكی فیكریو

سیاسی و سایکۆلۆجی کۆمەڵایەتی وەرگرت وئەو دیوارە شەرمانەی شکاند، بەو شێوەیە جاشایەتی لە ژێرخانی کۆمەڵگەی خێڵەکی وستونی وعەوام ونەفامیەوە پەڕیەوە ڕیزی ڕەوشەنبیر و سیاسەتەدارو و سەرکردەو کۆمەڵگەی مەدەنیەوە، بانگێشەی ڕاستی پاساویەتی سیاسی بۆ دەکرا..، بۆیە چەمکی "جاشایەتی پەتی "فراوان تر بوو لقی تری لێ بووە وەك: جاشی قەلەم، جاشی ئایدولوژیا، جاشی بێژەر، جاشی سیاسی، ... ئیتر لە جاشایەتیەکی ئامۆی دەگمەن بەرەبەرە بووە پیشەیەکی ئیمچە ئاسای، لەگەل هەندێ هۆکاری تر لەدوای با ـ دەکرێ بە تایبەتی لە شۆرشی نوێی کوردستان بە پێشەنگی (ی.ن.ك) گەورەترین قەبارەی جاشایەتی لە مێژووی کوردستان بەخۆوە بینیوە ... ژمارەی جاش نزیکەی (٤٥٠) جار بە ئەندازەی پێش مەرگە بووە، ئەوەش نەك لە مێژووی کورد، لە مێژووی سیاسی هیچ میللەتێك وێنەی نیەو نەبوە، بەشداری ئەو تاوانانەی ئەنفال، وێران و سوتاندن، کیمیایی، تالآن، ... یان کردووە وبیوونە پێشەنگی سوپای عێراق ، سەرەڕای تێکدەرانەی ڕەوشتی کوردەواری و ڕۆڵێکی مازەکی و مانیانەیان بۆ دەسەڵاتدارانی داگیرکەر کردوە، هەر لەگەل ڕاپەڕینی ١٩٩١ ی کوردستان وتێکەڵ بوونی جاش و پێشمەرگە یەکسەر بەها و نەریتەکانی جاشی زاڵ بوو ... بۆیە سیفەتی پێش مەرگەی نوێ ناوا دزێوە ٠

مێژووی (جاش)لە کوردستان زۆر کۆن نیە، لەگەل مێژووی سیاسی نەتەوەی کوردە لە دەوروبەری سالآنی١٩٢٠ وە دروست بووە، جارجار لە ئەدەبیاتی ئەو سەردەمی ناوی جاش بە دەگمەن هاتووە، هەرچەندە هەندێ مێژووناس زیادە ڕەوی دەکەن وئەو دیاردەیە بۆهەزاران سالْ دەگێرنەوە، هەشە بۆ جەنگی چاڵدێران، ... بەشێکی زۆریش بۆ سوارەی حمیدی دەگێڕنەوە ... ئەو زیادەڕەویە دروست نیە، ئەوە هەمان تێڕوانینە چەوتەکەیە سەبارەت بە مێژووی سیاسی کوردو سەربردەی مەینەتی کورد، .. بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە بەپێ ی پێ ناسەکەشی کە (چەك دژی داخوازیە سیاسیەکانی میللەتی کوردستان هەڵگری )

... ئـەوە نەهـەزاران سـاڵە ونەچالێنێرانیـشە، .. هـەتا سـوارەی حەمیـدیش کـە دیاردەیەکی ناپەسـەند بووە مادام فرۆشتنی ئەرکێکی فکری ونیشتیمانی بە پـاردو پوول بەڵام بە (جاش) حساب نەبوون، چونکە لە دژی میللەتی خۆیان نـەبوون لـە دژی ڕووس و ڕۆژئاوا و تا ڕادەیـەکیش ئەرمـەن، هـەروەك لـەو ڕوون کردنـەوەی کتێبی (الملل والنحل والاعراق) ل٢١٨ هاتووە (عوسمانیەکان سـەربەخۆی تـەواوی دابووە کوردەکان هەتا لە باجیش،، سکەشیان هـەبووە، تـەنها بەرامبـەر ئـەوەی کوردەکان بە میلشیای خۆیان سنورەکانیان بپارێزن ولەکاتی هێرشی دەرەکیش بـە هانای عوسمانیەکان بێن)، هەروەهابە پێی ڕیککەوتنی (سولتان سەبەدلیسی)کە لە ١٥١٤زموّر کرابوو وەك دوو دەولەت لە مـادەی (٤)و(ا) هـاتبوو هـەردوولا لـە کاتی دەسـت درێژی دەرەکی یارمەتی یەکتر بدەن، نەك تەنها کـورد . ئـیتر ئـەوە بەندێکی بنچینەی سیستەمەکانی فـدرالی کۆنفـدرالي و... هـەموو بەرگریـەکی هاوبەشە.. جا سوارەی حەمیدی لەو چوارچێوە مێژووییـە دروسـت بـووە، سـوارەی حەمیدی لە سەردەمی خەلافەت هەتا ١٩٠٨ ز جیایە لەگەل سوارەی حەمیدی دوای ئەو مێژووە، لە ڕاستیدا لە دوای ئەوەی ئیتحادیـە عەلمانیـەکان ئینقلابیـان کـرد بەسـەر خەلافەت و دروشمی تورکایەتیان هەلگرت دژی نەتەوەی تر بوون، ئەوا ئـەو جارە سوارەی حەمیـدی بـەکارهێنرا بـۆ دژی نەتەوەکـەی خـۆی، بـۆ دژی شۆرشـی عبدالسلام بارزانی ومەلا سلیم .. ئینجا ناویشی گـۆرا لـە سـوارەی حەمیدی بـۆ (أفواج خفیفة-ئەو ناوەی ئەفواجی سـەردەمی بەعس لەوە هاتووە ) ... ئـیتر لـەو مێژووە بە (جاش) حسابن ، کەواتە سوارەی حەمیـدی وجـاش لێـك جـودان، هـەتا (مرتزقە)ش نین مادام بۆ هەموو دەسەلاتدارێکیـان نەکردووە، بەپێ ی پـێ نامـی (قاموس سیاسیة)مرتزقە ئەو جەنگاوەرانـەن کـە خزمەتەکـەیان دەفرۆشـنە هـەر یەکێك پێویستیـان پێ بێ بەرامبـەر هەنـدێ پـارەو پـوول بـێ ڕەچـاوی شـەرم و ئەخـلاق وحەرامی نیشتیمانی. ئەگەرچی (سـوارەی حەمیـدی) جێـی شـانازی نیـە، بوار دەدات بکرێتە پاساوێکی فکری و مێژووی بۆ ئـەو دیاردەیـە، لەوسـەردەمی

خێڵە عەرەبەکانیش لەلای خێڵە کوردەکان دەبوونەوە "سوارە"بەناوی (ساریــچە)، لە سەردەمی دەسەڵاتی فارس لە خواروی عێراق بــەو عەرەبانــەی جاشــی فــارس بوون دەووترا "شەبانە"واتە پاسەوانی شەو، لەدوای داگیرکردنی عێراق لــە لایــەن بەریتانیاوە دیسان دیاردەی جاشایەتی لەنێو عەرەب بەناوی شەبانەو "حوشــیە"و فرسان صلاح الدین سەری هەڵدا، لەنێو مەسیحیش بەناوی" لیڤــی" و"تــەیاری" پەیدابون، لەناو کورد زاراوەیەك هەیە وا پێدەچی سەرچاوەکەی جاشــایەتی بێــت، زاراوەی "حیز"، لە حفیز هاتووە بەپێی د علی الوردی، بەوانە دەووترا "حفیز"ی کە هاوشۆی (ئوفیس-offic)ی بەریتانیان دەکرد بە تهێنی، ئەو ووشەیە لــەنێو کوردو عەرەب ناشرین بوو، دوای وای لێهــات هەرچــی بــۆ دوژمــن کــارێکی وای بکردبایە لەنێو عەرەب دەبووە حەفیزو لەنێو کوردیش "حیز".

## لە ئەستۆی کام مەدرەســەیە ؟

زۆر روونە جاشایەتی لــە چوارچێوەی (شــەرعیەتی بەرژەوەنــدی تایبــەت)ەوە دێت، واتە لەو کەسانەی کە لایــەنی مــاددیو دنیاییــان تــەواو زاڵ بێــت بەســەر لایــەنی ئــەخلاقیو ئــایینی، لــەو پۆلــە خەلکــە ســەرهەڵدەدا کــە ئایــدولۆژیاو بیروباوەڕەکــانی بەنــدەی قــازانجو بەرژەوەندیــەتی ... واتــە زیــاتر لیبــرالیە... جێگەی سەرنجە دیاردەی جاشایەتی هەروەك لەگەڵ سەرهەڵدانی عەلمانیەت سەری هەڵداوە ئاواش بە هاوتایی گەشەیان کردووە، کەواتە جاشایەتی زادەی سیســتەمو تەرزێکی تایبــەتی کۆمەلگــەی نــەفامیو مەدرەســەی فیکریو سیاســیە، لــەو کۆمەڵگە داڕووخاوانە شین دەبێ کە بناغەی ئەخلاقیو پەروەردەکانیان داڕمــاوە، بەتایبەتی لە کۆمەلگەی خێڵەکی ستونی دوورە ئاین.

کۆمەلگەی جیهــانی ســێیەم زۆر کاریگــەرە بــە نەفامیونــەریتی عــەوامیو خێڵەکی ستونی، تەنیا ئاینــە ڕێگــە لــە دیاردە نێگەتیڤــە پــەنگ خواردووکــان بگرێ، کاتێ عەلمانیش لەو دۆخە دەیەوێ جێ بە ئاین لەق بکا ئــەوا بــە خێرایــی

بۆشایی مەزن پەیدا دەکا ودیاردەی جاشایەتی وەك (دەرد) ئامادەیە سەرهەڵدا ئەگەر پێویست بێ، چونکە عەلمانی نوێ زیاتر لیبراڵە، کەمتر خاوەنی بنەماو بیروباوەڕو پەروەردەیە تا ڕێگری دەروونی بێت لەو کەسانە، بۆیە لەگەڵ وەرچەرخانی سەرکردایەتی لەدەست سەرکردەیەکی کاریزمی وەك (مەلا مصطفی) بۆ سیستەمی سەرکردایەتی عەلمانی ژمارەی جاش ١٥٠ هێندە زیادی کرد لە قۆناغی نوێدا، بنەماکانی عەلمانیەت لە چەپیو لیبراڵیو سۆشیالیستی تا زاڵ تر بوو بەسەر بنەماکانی ڕەوشتی کوردەواری ئەوا زیاتر زەمینەی دەروونی کۆمەڵایەتی دەسازا بۆ زیادکردنی جاش، هەرچەندە عەلمانیەتی کوردی شۆڕش گێڕو ماندوو نەناس بووینە، بەڵام بیرو کردەو ئایدۆلۆژیایان یارمەتیدەری ئەم دیاردەیە بووە، تا ئەو ساتەش ڕەوتو ڕەفتارو ئەزموونەکانیان هاندەرە با واشیان نەوسیتبێ؛ بۆیە دەبینین ئێستا ئیسلامیەکان زیاتر نیشتمان پەروەرو وڵات پارێزن، بە پێچەوانەوە ئەوەی هاریکاری دوژمنی داگیرکەری کردووەو دەکا زیاتر لە ڕیزی عەلمانیەتە، لە کۆنەوە لەنێو عەرەب لە شام لە میسر لە کەنداو لە عێراق.. خۆیان دەچوون هێزی بەریتانیو فەرەنسی یان ...دەهێنا بۆ سەر وڵاتی خۆیان بەتایبەتی لە کۆتایی سەدەی ١٩، ئنجا ناچار ئیسلامیەکان بە شۆڕش هەڵدەستان، شۆڕشەکانی مەهدی لە سودان خەتابی لە مەغریب بادیسیو عبدالقادر جەزائیری لە جەزائیرو عومەر ئەلموختار لە لیبیا شۆڕشی بیست لە خوارووی عێراق سەرەنجامی ئەو سەربردانەن، لەنێو کوردیش کەمێك ئەو نەریتە بە شێوەیەکی تر هەبووە میرنشینەکان لە ڕقی یەکتر جاروابوە وایان کردووە هەروەك لە براکوژیەکانی ئەو دواییەی نێوان پارتیو یەکێتی وایان کرد، لەو سەردەمەش هەروایەو ئیسلامیەکانی زیاتر بەرگریکەرن هەر لەوساتەی نوسین دەبینین لە سۆماڵ چۆن لایەنی عەلمانی دەسەڵاتدار لەپێناو مانەوەی ئەسیوپیای دوژمنی داگیرکەری (هەرێمی ئوگادین)ی هێناوە لەدژی (اتحاد المحاكم الاسلامية)، هەروەهاش بزوتنەوەی ئەتح لە دوای دۆڕاندنی لە هەڵبژاردنەکەی فەلەستین و

هاوپەیانی نێوان فەتح‌و شوردەن‌و میسر لە دژی حەماس‌و جیهادو نیشتمان پەروەرە دلسۆزەکان، ئەگەر بە وردی سەرنج بدەینە لوبنان، فەلەستین، چیچان، کشمیر، .. زۆربەی ئەو ولاتانەی کێشەی داگیرکاریان هەیە ئەوا بەزەقی دەبینین لایەنە ئیسلامیەکانن ولات پاریز، ئەگەر لوبنان بە نمونە وەرگرین، لە سالی ١٩٨١ ئیسرائیل خوارووی لوبنانی راستەوخۆتر داگیر کرد، ئەو کاتی حزبە عەلمانی‌و نیشتمانیەکان هەموو میلیشیایان لە دژی یەك هەبوو، کەچی کەس بەرگری نەکرد هەتا سوپای لوبنانیش- جا نازانیری ئیتر ئەرکی سوپا چیە ئەگەر پاسەوانی نیشتمان نەکا!!، تەنها لایەنە ئیسلامیەکان (حرکة التوحید والجماعة) بە سەرۆکایەتی فتحی یکن بە رابەرایەتی "حزب الله"یێی هەلسان.

لەسەرەدەمی ناکۆکی لایەنە عەلمانیەکان لەگەل بالی مەلا مستەفا دوو ریانی سروشتی خۆی وا وەرگرت: یەکەمیان بەرەو جاشایەتی‌و دووەمیش بەرەو ولات پارێزی، هەر بەگشتی مەدرەسەی بیروباوەردارەکانی وەك چەپی‌و ئیسلامی کەمتر دیاردەی جاشایەتیان لێی پەیدابوە، بەو دەروازەیەوە دەچینە ناو هۆیەکانی زیادکردنی دیاردەی جاش لە کوردستان بەو ئەندازە نەشیاوە.

## هۆیەکانی زیادبوونی جاشایەتی :

١- قازانج کردنیان لە ئەزموونی جاشایەتی بێ سزاو تەنبیب.
٢- پەرینەوەی ئەو دیاردە لە دواکەوتەیی وخێلەکی بۆ ناو خەلکانی سیاسی حزبی.
٣- ناکۆکی ناوەخۆیی‌و شەرەکانی براکوژی..
٤- پەروەردەی عەلمانی بە هەموو مەدرەسەکانی- چەپی، لیبرالی، سۆشیالستی، نەتەوەیی، ... وای کرد لە جێی رەوشتی کوردەواری بالاو خاوەن بەهای (عەیبەو گوناهە) وەرگەرێ‌و ببێتە دیلی مادەو سەرشۆری...

٥- یەکێ لـە ئەنجامـەکانی خـاڵی (٤) بریتیـە لـە وەرگـەڕانی (بەرژەوەنـدی گشتی) بۆ (بەرژەوەندی تایبەتی)و ئیدی بەدەیان سەرەنجامی خراپـی تـری لیٚ هەڵدەقوڵێتەوە، لەوانەش جاشایەتی.

٦- ماڵ وێرانـی بـۆ لایـەنگیری شـۆڕش (جگـە لـە چینێکی دەسـەڵاتدار)و ئیمتیـازیش بـۆ جاشـەکان، ... بـەردەوامبوونی ئـەو گیانـە مـاددیو کۆمەڵایەتیـەیان لـە دوای راپـەڕینو سـەردەمی حکومەتـەکان هـەرێمی کوردستان ... ئەوا مەزنترین هاندەری دەروونیە..

٧- خیتابی سیاسیو بەرنامەو سیرەی سـەرکردەکانو نـەبوونی دادگـەری بـەر گشتی لەناو شۆڕشو.. هاندەرێکی تری بەهێزی ئەو دیاردەیە.

٨- هەروەك روون کرایەوە جاشایەتی وەك هەنـدێ بـەکتریای پـیس تـەنها لـە شوێنی بۆگەن دەژی، ئاواش جاشـایەتیو دەسـەڵاتی گەنـدەڵیو بـەرتیلو خۆپەرستانو بێبیروباوەڕەکان .. لـە کۆمەڵگەیـەکی نـەخۆشو داڕووخـاو دەژین، کەواتە وەك مەنهەجی ئەوانە کۆمەڵگەی پاکیان نـاوی، ئـیتر ئـەو بارودۆخـە نوێیـەی لـە کۆمەڵگـەی کـوردەواری سـەری هەڵـداوە وەك: بێبەڵێنی، خۆویستی، بەرژەوەنـدی تایبـەت ویـستی، دوورە ئـاین، دوورە بەهای رەسەنایەتی کـوردەواری، بـێ سـەوابتی، ئەوبـەر ئەوبـەر لـەپێناو گیـرفان، شەر لەپێناو دەسەڵاتو ماددە.. هەموو ئەوانە بنەماو زەمینەی بەهێزن بۆ سەرهەڵدانو بەردەوامی جاشـایەتی دروسـت دەکـەن، زیـادیش دەکا لەگەڵ زیادبوونی ئەو دیاردە دزێوانـە، لـەوەش خراتـر بـە ئاشـکراو بێشـەرم دیفـاع لـەو جـۆرە دیاردانـە بکرێـت، هـەموو ئەوانـە بـارێکی دەروونیو کۆمەڵایەتیو نیشتمانیو سیاسیو فیکـری سـانا بـۆ دیـاردەی جاش دروست دەکەن.

٩- دروستبوونی جۆرێك لە رای گشتی سەبارەت بـە چـەند راسـتیەك کـە لـە دوای ئـەزموونێکی زۆر لای خـەڵك وەك (هـەمووی بـۆ گیرفانیـەتی)،

(هەرکەس بۆ خۆیەتی) (هەر فەقیرە تێدەچێ) (پارە بوویتە هەمرو شتێك)...

ئەوانە بتەمای ترسناکن لە داڕووخانی بناغەکانی کۆمەڵو دیوارەکانی عەیبە ئیتر کێ پارەی دەستکەوێ بە هەر ئامرازێك پێی دەڵێت بووە پیاو .... ئەوانە جۆرێك لە میکاڤیلیەتی ماڵداری وای دروست کردووە کە جاشایەتیش لەو پێناوە حەلال بێت..

ئێستاش لەژێر سایەی ئەو گەندەڵیە سامناکەی کوردستان هیچ زەمانەتێك نەماوە بۆ دووبارە نەبوونەوە بە شێوەیەکی فراوان.

## (٢٥)

# میان ڕەوی    الوسطیة ـ اعتدال    Moderate

لەو سەردەمە(میان ڕەوی) وەك زاراوەیەکی جیهانی بە زۆر جۆر بەکارهاتووە ، بەلام ئیستا مەبەست لیّ ی زیاتر ئەو تەیارە ئیسلامیانەیە کە لە دۆخە هەرە سەختەکان و پێویستەکانیش نەرمن وپەنا بۆ بەرگری نابەن، .. گەلیّ جاریش بە هەموو گروپ و دەستەو تاقمێك دەووتریّ "میان ڕەو"کە لە قەیران و گرفتەکان دا هەلوێستیان لاوازە و زیاتر لەگەل بەرنامە و بەرژەوەندی زل هێزان دێتەوە، تەیاری (اخوان المسلمین) زیاتر ئەو زاراوە بەکاردەهێنن وخۆیان بە تەیارێکی میان ڕەو دەناسێنن بۆ خۆجیاکردنەوە لە تەیاری توونـد ڕەو، بەو جۆرە بزوتنەوە ئیسلامی و نا ئیسلامیانەش دەووتریّ توندڕەو کە بە ساناى بۆ داگیرکەرو جیهان خۆران ناوەستن و پەنا بۆ بەرگریش دەبەن وەك بزوتنەوەکانی:حماس و جیهادی فەلەستینی، حزب الله ی لبنانی، کشمیر، چیچان، بەرەی مۆرۆ لە فیلیپین، جەزائر،...، ئەو دابەشیەی میان ڕەوی ئیسلامی وتووند ڕەوی لە دوای شۆڕشی ئیسلامی ئێرانی ١٩٧٩ هات وجیهانی هەژاند، ناوی توند ڕەوی کەوتە سەر ئەو شۆڕشە وهەموو ئەو بزوتنەوانەی لە دواى ئەو سەریان هەلدا، بەلاّم بەرکاهێنانی ئەو زاراوەیە کۆنە، هەردەم داگیرکار بە جاش و لایەنگیرانی خۆی وتووە میان ڕەو، بەبەرەی بەرگری وپێش مەرگەی رزگاری وتووە توند ڕەو، ئینگلیز ناوی توونـد ڕەوی دابووە پال هەموو ئەو کوردانەی ئاواتە خوازی کوردستانێکی سەربەخوبوون ،بەڕابەرانی شۆڕشی بیستی ئێراقیشیان دەووت،هەروەك بە عەرەبەکانی (فلستین) یش دەووترا تووندڕەو کەمتر بە یەهودیەکان ووتراوە ئەگەر

چـی زۆرداریـش بووینــە، ئــەو ناوزەدکردنــە ئێــستا زیــاتر قــەتیس کــراوە بــۆ ئیسلامیەکان، لەوساتەش تەیاری (برایان) ناسنامەی (میان رەوی)یان بـەخۆداوە. لەو سەردەمەی واقیعی راپـەڕینی ئیـسلامی جیهـانی سـێ پـۆلی ســەرەکی لــەو بارەیەوە لــێ خەملیوە:

١- پۆلێکی هەردەم زۆر توند، زیاتر لە (ئەلقاعیدە) خۆی دەنوێنێت لەو ساتەدا.

٢- پۆلێکی هەردەم زۆر نەرم کە خۆی لە (برایان- أخوان) دەنوێنێت لەو ساتەدا.

٣- پۆلی سێیەم پۆلێکی نێوەڕاستی هەردوولایە کـە بـریتین لــە بـاقی بزوتنــەوە ئیسلامیەکانی جیهان کە دوای زیاتری لـێ باس دەکەین.

هەڵبەتە ئیـسلام بە سروشتی خۆی میان رەوە، بەڵام میان رەوی مانای هەردەم نەرمو بێدەنگو بێ بەرگری نیە وەك لە قورئانو فەرمودەکانو فیکری ئیـسـلامدا دەردەکەوێ،(وجعلناکم امة وسطا)، وا هەندێ نمونەی لە رای زانایان هەڵدەبژێرین:

- فارابی لە کتێبی (اهل مدینة الفاضلة) دەڵێ: میان رەوی لە نێـوان هــەردەم پێکەنین وهەردەم داماویە، هەردەم خۆشی وهەردەم ناخۆشیە[1].
- هەرخودی میان رەوی (إعتدال) لەگەڵ (عدالة- دادگـەری) یـەك جەوهــەرن، بۆیــە لــە فیکــری ئیــسلامدا میــان رەوی و دادگــەری لــە (مقاصــدەکانی) شەریعەتی ئیسلامین، (ابن سـینا‌ء) لەوبارەیــەوە دەڵــێ (العدالـة وســط بـين الظلم والظلام).
- لە (دستور العلماء)ش هاتووە: بين التفريط والمفرط.[2]
- پێناسی (حکمة) لە کۆنەوە لە (تعريفات جرجانی) واهـاتووە: (الحكمـة هـي هيئة القوة تحولية العلمية المتوسطة بين الجزيرة التي هي افراط القـوة والـبلادة التي هي تفرطها)[3].

---

١ بۆ زیاتر سەرنج بدە (موسوعة المصطلحات العلم الاجتماع والسياسي في فكر الاسـلامي) مـادة: الاعتدال.

٢ موسوعة مصطلحات جامع العلوم- قاضي نظري.

٣ الجرجاني - ل٥٤

- هەروەها بن یوسف العامری لە کتێبی (سعادة الإ سعاد)دەڵێن: سیاسـەتی ڕاستو میانڕەو ئەوەیە لەسەر هەردوو ئەوەری توندو نەرم، ترغیب وترهیب، بڕواو، هەریەکەیان لە زەمانو زەمینـی خۆی بەکاربهێنی، ئەگینا سیاسەتێکی نادروستە ٠
- ئەرستۆش لە کۆنەوە وتوویەتی: السیاسة أهل الذراوة لاتستوي ولاتستقیم البتة الابالإضافة والهوات، بأن السیاسة اهل الشرق لاتستقیم الا بالکرامة والإحسان.
- د. محمـــد عمارەش لـە کتێبی (معرکة المصطلحات) دەڵێن: وسطیة الاسلامیة ... هی انها عدل والتوازن بین قطبین ... ولیست انحیاز لواحد منهما ولا مقابزة التامة لهما! انها حق بین باطلین، ... والعدل بین ظلمین، والاعتدال والتوازن بین تطرفین وغلوین .

لە پێناسەکانو لە مقاصدی فیکری ئیسلامیشدا دەردەکەوێ کە ئیسلام خۆی میان ڕەوە نەك میان ڕەوی ئیسلامی، هەروەك یاساکانی سروشتیش هەمووی لەسەر بنچینەی عەیارو میان ڕەویە، ئینجا ئەو ژیانەی ئێمەی پێ بەردە.م دەبێت لە نێوان هەموو ئەو دژو جەمسەرانەی وەك: (خێرایی وەستان) (گەرم- سارد)(ڕەق- نەرم) (بەرز- نزم) (مەحال- مسۆگەر)...، خۆ ئەگەر ئەو سروشتەی ئێمە تاك جەمسەر بوایە (واتە تەنها خێرایی‌و گەرمو ڕەق ...، ناوەڕاستەکانیان نەبوایە ئەوا پەکمان دەکەوت، ژیان کۆتایی دەهات، یان ڕاستتر ژیان هەر نەدەبوو، بەڵام خوا ئەم گەردوونەی وا بۆ ئێمە ڕێكو پێخ کردوود بسازێت، بە هۆی ئەو (میانڕەویە)ی لە نێوان زۆر گەرمو زۆر سارد زۆر ڕەق‌و زۆر نەرم، ... خۆ بە هەزاران پلەی گەرمی لەو بوونەوەرە هەیە بە هەزارانیش لەژێر سفر هەیە، سەرنج بدەین ئەگەر زەوی ئێمە لە پلەی گەرمی ١٠,٠٠٠ بوایە یان ١٠,٠٠٠ لەژێر سفر بوایە یەکسەر ژیانو مێژوو دەوەستا، هەموو ئەوانە هاتوونەتە نێوانێکی هاوسەنگ ئەستاندەر، ژیانی ئاسایی‌و تێکرایی لە نێوان ١٥پلەو تا ٥٥

پلە دەجولێ ... ئەو بابەتە لە سروشتی پێ ی دەووترێ (هاوسەنگی)، نە نەرم بێ نەرەق، نەسارد بێ نەگەرم ... نە پێچەوانەکانیش، بوونایەتی (وجود)لـە بـوونی هەردووجەمـسەری دژ بەیـەك دەبێـت، بـەو شـێوەیە ئـەو میـانڕەوی (اعتدالـه) جەستەی ئێمەشـی پێـك هێنـاوە بەدروستی وسـتانددری، هـەر بەزانـدنێك لـەو هاوسەنگی ومیان رەویە چ لەسروشـت چ لـە ژیـانی جەسـتەیان و ئینجـا ژیـانی کۆمەڵایەتیشمان بە کارەساتی ترسناك کۆتـای دێت، لـە یەکـەمیان کارەسـاتی سروشـتی، لـە دووەمـا تەخۆشی سـامناك لـە سـێ یـەما کێـشەو گرفتـەکانی کۆمەلایەتی وسیاسیی و ژیاری .

شـریعەتی ئیـسلامی ویاسـا سروشـتیەکان و میـان ڕەوی کۆمەڵایـەتی یـەك سەرچاوەی هەیەو یەکتریش پاسادان دەکەن، لەسەر ئەو بنچینە قوولانە شـریعەت هاتووە کە هەماهەنگە لەگەل یاساکانی سروشت وتەبیعاتـەکانی مـرۆڤ و لایـەنی فسیولوجی و بـایلۆجی ومرۆڤایـەتی و کۆمـەڵایـەتیش، ئابـەو شـێوە شـریعەتی ئیسلامی خۆی بە میان ڕەوی هاتووە ئەو کاتی کە ئتوونـدە، سـزایە، بکـوژە، .. هـەر میـان ڕەویـە ... مانـای میـان ڕەوی هەرنـەرمی وهـەربێ دەنگـی وخـۆ بەدەستەوە دان نیە، .. ئـەوە بنـەمای ئیـسلامە کەواتـە ئـەو زاراوە ناوێتەیـەی (ئیـسلامی میـان ڕەو ) (ئیسلامی سیاسی) (ئیسلامی نەرم) (ئیسلامی سـەردەم) ... هەڵە وبەڵەیـە، واتەئیـسلامی نامیـان ڕەو ئیـسلامی ناسیاسـی وئیـسلامی توندیش هەیە، ئیسلام پارچە پارچە ناکرێ تا بەشەر بێت چـاك ونیجابیاتـەکانی لێ هەلبژێرێ .. هەروەك د. محمد عمارە [1]، د.یوسف قەرزاوی لەگـەڵ کۆمـەڵێك زانـای تـری لـەو تـرازە وای بـو چـووینە، لەگـەڵ زانیاریـەکی زۆر وخزمـەتێکی زۆریشیان وا پیدەچـی لـەو تێڕوانینـەدا ورد نـەبن کـە دەڵـێن ئێمـە ئیـسلامی میانڕەومان هەڵبژاردووە بە واتا گول بژێرێکی ئیجابیان لە ئیسلام کـردووە ودوای دەستکاری ئەومیان لێ هەڵبژاردووە، بەشێکیش لە ئیسلام کە توونده بـێ کەلکـە

[1] بۆ زیاتر سەرنج بدە (معرکة المصطلحات) .. وای ئۆمارکردووە (الوسطیة الاسلامیة)

بەجێیان هێشتووە !! . ئەوە زۆر ڕوونە ناشێ ونابێت،با ئەو مەبەستەشیان نەبێ ، دەروازەی ترسناك دەكاتەوە لەسەر خودی ئیسلام، دەشێ بڵێ موسوڵمانی توندڕەو، نەرم ڕەو، میان ڕەو یان تەیاری توند ڕەو ونەرم ڕەو بەڵام بۆ خودی ئیسلام هەڵەیە ... ئیسلام خۆی سیاسیە، میان ڕەوە پێویست بە ناوەڵناوی ئیسلامی سیاسی، ئیسلامی میان ڕەو ... ناكا .

هەرچی مدرسەو ئاین وئایدۆلۆژیای ترە كەزیاتر لەژێر كاریگەری مروڤە ئەوا هەڵەو جەوتیەكەی لەوە دێ لایەك زیاتر دەگرێ بە پێ ی (عەقلی كورت بینی) مرۆڤ وناتوانێ ئەو ستاندەرانە بدۆزێتەوە ومیان ڕەوبێت، دەبینین لیبرالیەت ئازادیەكی بێ سنور دەداتە تاك، شیوعیەتیش هەموو ئەو ئازادیەی ستاندۆتەوە، .. لەو لایە دەبینین ئەو مەسیحیەتی ئێستا زۆر لاهوتیە، زۆر نەرمە، هەمووی لێ بووردنە، هەمووی قیامەتیە ... كەچی یەهوودی زۆر توندە . دەبینین بەرنامەی ئیسلام میان ڕەوە لە نێوان ئەو دوو تێپەڕینەو بریتیە لە: ئازادی بە سنور، دنیاو قیامەتی، روحی مادی، لێ بووردەی وسزا، .. هەڵبەتە میان ڕەوی ئیسلام و شریعەتەكەی نەهاتووە بەدوای بەرنامەی مرۆڤ كەوتبێت و بە ڕاستە وساتیمەتر ناوەڕاستەكانی ئەو لاو ئەم لای دۆزیبێتەوەو ناوی نابێ میان ڕەو و ناوەڕاست، نەهاتووە بەرنامەكانی لە نێوان نەرمیەتی مەسیحی وتووندی یەهودی، لە نێوان بەرنامەی سەرمایەداری وبەرنامەی شیوعیەت، لە نێوان رادیكالی و پارێزگاری، لە نێوان نوێگەرای وكەلتورایی .. هەڵبژێریت وبارەگایەكی لە نێوان هەردوولا بكاتەوە ...، بەرنامەكانی دانەڕشتراوە لەسەر بنەمای (توفیقیە بین ماهو موجود)، نەهاتووە هەربەشێك لەلاكانی بەرامبەریەك وەرگرێت، بەڵكو لە پێش ئەوانە ولەسەر بنچینەیەكی قوولی گەردوونی بەرنامەكانی خۆی داڕشتووە، بەرنامەی بەشەریە ئەو ستاندەروناوەڕاستەی نەدۆزیتەوە، بۆیە گەلێ جار مەرج نیە هەق وراستی لە ناوەڕاستی دوولای دژ بەیەك بێت، جاروایە بە حوكمی سروشتی ئیسلام لە لایەك نزیك ترە، هەر بە نمونە،لە دیموكراسی نزیك ترە نەك

دکتاتۆری، لە ئابووری سۆشیالستی نزیك ترە نەك لە هەردوو ئابووری شـیوعیەت سەرمایەداری، لێرەدا هەندێ هەڵوەستە دروست دەبێ لەسـەر لایـەك لـە پـێ ناسەکانی پێشوو بە تایبەتی (د.محمد عمارە) مەرج نیە بە هاوسەنگی لـە نێـوان دوو (باطل)، دوو (غلو)،...، بە پێچەوانە هەموو (باطلەکان) لـە جەمـسەرێکن و بەرنامەی ئیسلام لە نێوانیـان نیـە لـە بەرامبـەریتیان بـە گشتیەکەی نـەك لـە (موفردداتی).

## میان ڕەوی وتەیارە ئیسلامیەکانی نوێ:

هەڵبەتـە مەسـەلەی ئـەو پۆلێنانـەی میـان ڕەوی وتووند ڕەوی هـەر بـۆ ئیسلامیەکان دانەتراشراوە، لە بوهاری شیوعیەتیش ئـەو دابەشـیە هـەبووە، بـە بەشێکی تـەواو پەیڕەوکـەری مارکـسیەت دەووتـرا توونـد ڕەو، ئـەوەی لـە ژێـر ڕۆشنایی سیاسەتی یەکێتی سۆڤیەتی سـەودای لەسـەر بنـەماکانی مارکـسیەت دەکرد گەلێ جار پێ یان دەووترا میـان ڕەو، ئـەو پۆلێنـە بـۆ زۆربـەی بزوتنـەوە بەرگری وشۆڕشگێرەکانی وتراوە، لە زۆربەی ئـەو پۆلێنانـە (بەچەپـیەکانیـشەوە) سێ پۆلی سەرەکی بووینە، هەر بە نمونە لەناو حزب و ڕێکخراوە مارکسیەکانیش (۳) پۆلی سەرەکی هەبوو:

<u>پۆلی یەکەم</u> زۆر توندەکان کە بریتی بوون لە ڕێکخراوەکـانی: بادرمـانیهۆف، الویە الحمراء، فیدائی خەلق، یـەکێتی بـاکۆینن..، زۆر ڕێکخـراوی تونـدی تـری جیهانی سێ یەم، تا ڕادەیەك لـە کۆمەنیـستی (چینـی) نزیـك تربـوون کـە بـە (شۆڕشگێری )بەناوبانگ بوون.

<u>پۆلی دووەم</u> بریتی بوو لە حزبە شیوعیەکانی ئـەورووپا کـە بـە (ئۆرۆشیوعی) ناوزەد دەکران، ئەوانـە تـا ڕادەیـەك نزیـك بـوون لـە ئەزموونـەکانی سوشـیالی دیمکراسیەکان بە ئاشتیانەی هەڵبـژاردن وەسـڵ مـلانـێ ی دیمکراسیانەو هاتوونـە

گۆڕەپانی سیاسی لەگەڵ حزبی برجوازیو لیبراڵیو سیستەمی سەرمایەداری بە گشتی .. ئەوانە تەواو لەگەڵ دەقەکانی مارکسی پێچەوانە بوون.

پۆلی سێیەم حزبە شیوعیەکانی تر کە بە هەردوو ڕێگەی ئامرازی شۆڕشگێڕیو ئاشتی کاریان دەکرد، لەناو ڕابوونی ئیسلامی هاوچەرخیش لەبەر چەندین هۆی مەعریفیو مێژوویی هونەریو سیاسیو سایکۆلۆژی لە کۆتاییدا فرە تەیار لە بزوتنەوە ئیسلامیەکان سەری هەڵداو سێ پرۆژەی سەرەکی لێ خەملی، هەریەکە لە کۆمەڵێك ئامرازی بنچینەی لێك جیان، بەڵام لە ئامانجدا هاوبەشن، بەم شێوەیەی خوارەوە:

## پۆلی یەکەم:

بریتین لە پرۆژەی (اخوان المسلمین)و هەندێ تەیاری نزیك لەوان، ئەوانە پێ یان وایە مەرج نیە جیهاد مانای ناخۆشیو توندوتیژیو بەرگری بێت، ئەوەی بە ناخۆشی دێتەدی بە خۆشیو ئاشتیش دێتەدیو بە بەرهەم تریشە، لە سەردەمی (سیرة وفتح)یش ئەوانەی بە قەناعەتو بانگ (تهذیب بالسیرة) ئیسلام بووینە باوەڕیان قایم تر بووە ...، ئیتر ئەو تەیارە پێی وایە بە هۆی دەوڵەمەندیو فیکرو ئەزموونی ئیسلاما دەتوانن لە گۆڕەپانو لە ڕێی ئاشتیو دیموکراسیانە سەرکەوین، بۆیە دەبێ ئەوپەڕی نەرمیو هێمنی بپارێزێ وەك تاکە ستراتیجیەك دوور لە توندوتیژیو تێك شێوانی، هەڵبەتە کۆمەڵێك پاساوی تریان هەیە لەو کورتە باسە گوزارش ناکرێ، .. ئەو تەیارە لەو ئەزموونە دوورو درێژەی کە خەریکە بگاتە سەدەیەك تا ئێستا نەگەیشتۆتە دروستکردنی نمونەیەکی مورتاح بۆ سەرمەشقی ئەوانی تر، هەرچەندە لە تەقەلایەکی بونرانە لە دوای سەرکەوتنی ﴿ئەزموونی (جیهادی ئێرانە)وە لە ساڵی ١٩٧٩﴾ ئیخوانیش لە ساڵی ١٩٨٠-١٩٨١ جارێ جیهادێکی چەکداری توندیاندا لە سوریا بەڵام شکستیان هێنا.

ئەو ناوو ناتۆرەی وەك (ئوسوڵی، متزمت، توند، متطرف، تیرۆرست، .. لەدوای شۆڕشی ئیسلامی ئێرانو ڕابوونی نوێوە سەری هەڵدا لەلایەن عەلمانیەتی

دکتاتۆری ناوچەکەو دەسەڵاتە جیهانی یـەکان، ئـەوەش زیـاتر پـاڵی بـە ئیخـوان المسلمین نا زاراوەیـەی (میـان ڕەوی) هەڵبـژێرن بـۆ دروسـتکردنی ناسـنامەیەکی تایبەت‌و جیا لە باقی بزوتنەوە ئیسلامیەکان، بە پێی پۆلێن کردن‌و جێگیرکردنـی ئیخوان لە نێوەڕاستی چەند تەیارێکی ئیسلامی ئـەم سـەرو ئەوسـەر هەڵەیـەکی زەقی تیایە، چونکە مەدرەسەکانی سۆفیگەری‌و دەرویـش بـە بزوتنەوەیـەکی سیاسی ڕێز دەکەن‌و توندڕەوە سیاسیە نوێکانیش لەلایەکی تر، ئیتر خۆشیان لـە نێوان هەردوولا ... ئایا ئەوە ڕاستە؟ نەخێر، لەبەر هۆیـەکی زۆر سـادە، چـونکە سوفی‌و دەرویش بزوتنەوەی سیاسـی‌و مـەدرەسە نین، ئینجا ئەگەر سیاسیش بن لـە هەندێ شوێن شێوەی برایانی وەرگرتووە، هەندێ شوێنیش شێوەی جیهادی وەك لە هەندێ وڵاتی ئەفریقی‌و لە کشمیریش حەرەکەی ئینقلابی ئیسلامی سـۆفیگەریە، هەروەها زۆربەی بزوتنەوە کۆنەکانی کورد سۆفیگەری بووە. هەر لـە بنـچینەشدا (برایان) لە بەرگری‌و جیهاد دەمارگرژن، تا ڕادەیەکیش دەمارگریـشن بـۆ ڕێبـازو ئەو فیکرەیەی (اللاعنف)*، هەر بزوتنەوەیەکی جیهادی گەشە بکـا یـان بتـوانێ نمونەیەك دروسـت بکا ئەوا جێگەی ئـیگەرانی پڕۆژەی (اخوان) بووە، بۆیـە گەلـێ جار دوودڵ بوونە لە دۆزینـەوەی ناوێکی ڕاست‌و دروست بـۆ شۆڕشـی ئیـسلامی نێران بزوتنەوە جیهادیـەکانی تـر، دان پیانـەهێنانی (اخـوان) بـەو کۆمـارە وەك دەسکەوتێکی جیهادی لایەکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو مەبەستە.

ئەو پاکانەکردنەش بەو زاراوانە زۆر دادی نـەدا، هەرچـەندە لـەو کاتیـدا کـە بزوتنەوە ئیسلامیەکان لە گەشە بوون گەلێ جار لەلایەن زلٚ هێزان‌و دکتـاتۆرانی ناوچەکە بەسـەر ئەو ڕێبازەو نەرم ئیانەکـەی هـەلگوتراوە بـە (میـان ڕەو تـەیاری عەقلانی‌و شارستـانی..) وەسـف کـراون، بـەڵام هـەرکاتێ هەڕەشـەی بزوتنـەوە جیهادیەکان کەم دەبۆوە بەخێرای لەو وەسفانە پەشیمان دەبوونەوە ئەوانیشیان بەو زاراوەی (ئوسوڵی، متزمت، توند، متطرف، تیرۆرستیش..) تاوانبار دەکـرد، لـە

* کە لەو سەردەمە زیاتر بۆ تیروانینی غاندی دەگەڕێتەوە.

گۆڕەپانی سیاسی بێبەشیان دەکردن، هەروەك ئێستا لە زۆربەی وڵاتان ئەوانیش یان قەدەغە کراون یان بەرەو قەدەغەیین، ئاوە ئاوەش بە کۆمەڵ زیندانەکانیان لێ پڕ دەکەنەوە ... لە ڕاستیدا سروشتی هەموو دنیا جۆرێك وایە دەیەوێ دژەکانی بەناوی جیاجیا پارچە پارچە بکاو بە نۆرە قوتیان بدا، .. نۆرەی هەمووشی دێت، هەتا عەلمانیە ئیشتیمان پەروەرەکانیش کە هەتا ئێستا بەخەم ساردی جارجاریش پارمەتی دژ بە ئیسلامیەکانیان داوە ئەوا نۆرەی ئەوانیش دێت، لە دوا چواچێوەی (مل ملانێی شارستانی) بە ڕوونی ئەوانیش دەگرێتەوە، هەر سەرنج بدە لە سەرەتا سعودیە بە میان ڕەو ئێران بە توندڕەو، ئێستا نۆرەی سعودیە هاتووە بە جۆرێك، هەتا لەناو عەلمانیەتیش سەرنج بدە مەروان بەرغوثی دادگایی دەکرێ چونکە عەلمانیەکی دڵسۆزە کەچی باقی سەرکردەکانی (فتح) لەوپەڕی ئازادیدان لەگەڵ ئیسرائیل خەڵات دەکرێن، نمونە زۆرە، .. شەزموونی جەزائیریان لەو بارەیەوە یەکجا زۆر جێی سەرنجە (محفوظ نحناح) سەرۆکی بەشێ ئیخوان بەناوی (حركة مجتمع سلمي)، لەگەڵ عەلمانیەتی دەسەڵاتدار بەشداری لە دارشتنی ئەو ناو ناو تۆزانە کرد لە دژی ئیسلامیەکان (بە تایبەتی بەرەی ئینقازی ئیسلامی) کە بە دیموکراسیانە ٨٦٪ دەنگی میللەتیان هێنا، لایەنگیری لە ئینقلابەکەی دژی ئیسلامیەکان‌و دژی دیموکراسیش کرد لە دژی بزوتنەوە ئیسلامیەکان، ئەوەندەی دژایەتی چەك‌و بەرگری‌و جیهادی کرد بۆ ڕازیکردنی لایەنی عەلمانی‌و دەسەڵاتدارەکان .. تا بتوانێ بە مورتاحی‌و بێ ناوو ناتۆرە خۆ هەڵبژێری بۆ سەرۆکایەتی، ئەو خەونە هاتەدی لە ١٥/نیسانی/١٩٩٩ لە ناکاو لە بڕیارێکی (ئەنجومەنی پارێزگای دەستوری جەزائیر)دا فەرمانیاندا هەرچی پاڵێوراوێك بەشداری بەرگری چەکداری ڕزگاری جەزائیری نەکردبێت نابێ خۆی هەڵبژێرێ، بەو شێوەیە شێخ (محفوظ نحناح) بە سانایی لادرا، بەهۆی لایەنگیری نەکردنی لە توندو تیژی شۆڕشگێری! نا بەو شێوەیە چۆن شۆڕشگێری تۆمەتە بۆ ئیسلامیەکان ناواش نا شۆڕشگێریش تۆمەتە... کەواتە چۆنی لێ دەردەچن ... بەو زاراوە

سادانە هەڵبەتە لێشی دەرنەچوون، لە تونس ناوی (اتجاه اسلامی) بە (نهضة) گۆردرا تا لەگەڵ یاسای نوێی (حزبەکان) بگونجێ کەچی هەر لە دواتر قەدەغەیان کردن، لە تورکیا لە میسر، ... هتد.

لە دەستورو یاسای دەستکرد (دیفاکتۆ) (دیجۆرا) دیاری دەکا، بۆیە دەسەڵاتدار پاساوی یاسایی کۆتایی نایەت بەرامبەر نێچیرو ناحەزەکانی، هەردەم وە بەردەمی یاسای دەدەنو ئەو پرۆژەیەی ئیخوانیش هەر لە خولگەیەکی داخراو دەسورێتەوە لەگەڵ ئەو خزمەتەشیان بە ڕابوونە ئیسلامیو دڵسۆزیو لێهاتوویی و پاکیشیان هێشتا ئامانجە پیرۆزەکانیان نەهاتۆتە دی بەو ئامرازو ڕێگەیە، ڕەنگە زیاتر لە کاروان بەجێ بێنن، جا بۆ پاساوی ئەو بەجێمانە گەلێ جار بە ناچاری پەنا بۆ تێکدانی پرۆژەی بەدیل دەبەن بە پێی بۆ لوان.

### پۆلی دووەم:

پرۆژەیەکی جیهادیە، بەو مانایەی جهاد تەنها جەنگو بەرگری بێت، ئەوانە بە (١٨٠) پلە بە پێچەوانەی پۆلی یەکەمن، تا ڕادەیەك حوکمی زیاد لە پێویست دەنێرن بۆ پۆلی یەکەم، ئەوانە پێیان وایە تاکە ڕێگەی گەیشتن بە ئامانج تەنها بە جیهادە، ئەوەش پەیرەوی سیرەی ڕاستەقینەیە، پێیان وایە هیچ مافێك لەو جیهانە نادادگەریە بە خۆشی نەدراوەتەوە بێ ماندووبوونو شۆڕشو جیهاد، ئەوانە زۆربەی کۆمەڵە خەڵکێکی دڵسۆزی خوێن گەرمن، کەمتر لە فیقهەکانی (واقع، تغیر، سیاسة شرعیة، تدرج، ممکن،..) گەیشتون، لە حیکمەتو زانستەکانی قورئان فەرموودە کەمێك سەرچیغن بە پێی هەندێ لە زانایانی بالاّ، ئەوانە لەو سەردەمە زیاتر لە تەیاری (ئەلقاعدە) خۆی دەنوێنێ بەرنامەکانیان تا ئێستا نەشیاوە وەك پۆلی یەکەم بە تۆبزیش نمونەیەکی مورتاحیان پێ دروست نەبووە، لەناو خەڵکیش کەمایەتیەکن ناگاتە لە ٥٪، بە پێچەوانە گەلێ نمونەیان تێکداوە لەگەڵ مەبەستی خزمەتکردنی ئیسلامیشیان، بەلاّم زەرەرو زیانێکی زۆریشیان لە ئەزموونی ئیسلامی داوە بە پێی شارەزایانی بواری ئیسلامی،

دەشێ ئەو پۆلە لە هاوکێشەکەی (مۆدی) بنوێنرێت کە پێی وابوو (چاکـسازی لـە کۆمەڵو دەسەڵاتەوە دەست پێ دەکات ئینجا بۆ تاك) کۆمـەڵ ← تـاك. کەچـی چاکسازی ئەدەوی: لە تاك ← بۆ کۆمەڵ کە زیاتر پرۆژەی ئەیاری یەکەم بوو.

## پـــۆلی ســـێ یەم:

ئەو پرۆژەیە زیاتر نێوەندی هەردوولایە، نە نەرمی هەردەم نە ڕەقـی هـەردەم، نە ئەو سەر نە ئەم سـەر،.. ئەوانـە لـە جیهـان وەك هێـزو ئـەزموونێکی زیـاتر واقیعیانە حسابیان لەلایەن دۆستو ناحەز بۆ دەکرێ، لەگـەڵ پـەیامی ئیـسلامی زیاتر ڕێکن، هەم ڕێکیشە لەگەڵ یاساکانی سروشـتو تەبیعاتـە بنـچینەییەکانی مرۆڤ وکۆمەڵ، وەڵامێکی ڕاستەوخۆو واقیعانـەتری جیهـانی ئێـستاشە، ئەگـەر پرۆژەی یەکەم ئاشتی بە تاکە ڕێگەی گەیشتن بە ئامانج بزانی ئەوا پـرۆژەی دووەم جەنگو بەرگری بە تاکە ڕێگەی گەیـشتن بزانـێ ئـەوا پـرۆژەی سـێیەم هـەردوو ئامراز لە بـارودۆخی خـۆی بـە ڕەوا دەزانـێ، واتـە: جیـاوازی بنـچینـەی لەگـەڵ هەردوو پرۆژە ئەوەیە هەریەکە لە ئاشتیو بەرگری بە یەکێ لە ئامرازەکانی کاری ئیسلامی دەزانێ نەك بە تاکە ئامراز، ئەو پرۆژەیە لە شکـستی پـرۆژەی یەکـەمو دووەم سەری هەڵداوە لە دوای هەشتاکانەوە هاتە مەیدانو سەرەڕای سـەر ڕەقی زل هێزانی جیهان بەرامبەر ئەو پرۆژەیەش، بەڵام توانیویەتی بەو ماوە کورتە ئمونـەی واقیعی دروست بکا، دروستکردنی دەوڵەتو ئەزموونی ڕزگاریو ئەزموونی کاری سـیاسیش، ئەو دەوڵەتانـەی پـێ دروسـت بـووە: ئێـران، سـودان، ئەفغانـستان، چیچان، .. ئەگەر ئەو سێیەی دوایش تووشی قەیرانی ترسناکیش کراون بەڵام بـە سروشتی خۆی دروست بوو وەك ئەزموون، ئینجا حزب الله توانی بەو جیهـادە بـۆ یەکەم جار دوای مێژووی خەلافەت خاکی نیشتمانی ڕزگـار بکـاو ئیـسرائیلی لـە خوارووی لوبنان دەرکرد لە سـاڵی ٢٠٠٠ بـە هـۆی ئـەو پـرۆژەو بێئـەوەی وەك میسرو ئوردەنو دەسەڵاتی فەلەسـتین ملکـەچ بـێ بـۆ (الارض مقابـل الـسلام)، ئینجا ئەزموونـەکانی حەمـــاس، جیهـاد لـە فەلەسـتین، بەرگریـەکانی کـشمیر،

چیچان، خوارووی فلپین، بوسنه وکۆسۆڤا.. سەرکەوتنەکانی هەڵبژاردنی بەرەی ئینقازی جەزائیرو پاکستان دوایش بەحرەین فلستین ولبنان، ... ڕاستی دروستی ئەو پرۆژەو نمونە دروست کردنیان پیشان دەدا .. هەروەها ئەو واقعەی لە بەلقان دروست بوو بەهۆی ئەو پرۆژەیە ئەگەر چی کەم و کوریش هەبێت، کێشەی کۆسۆڤا کەوتبووە بەر تەپ و تۆزی مێژوو ئەگەر هەر لەسەر ڕێڕەوی (ئاشتی وبێ توانای) برۆیشتانایە بەلاّم لەساڵی ١٩٩٧(سوپای ڕزگاری کۆسۆڤاـ KLA) دروست بوو بە ماوەیەکی پێوانەی کێشەکەیان بەرزکردەوەو گەیاندیانە ئەو ئاستەی ئێستای ڕزگاری، ئەوە هەموو بەرهەمی پرۆژەی پۆلی سێیەمە، هەروەك چۆن لە گۆرەپانی هێز ئامادەیە ئاواش لە گۆرەپانی دیمکراسی و ئازادی و هەڵبژاردن ئاواش لە گۆڕەپانی خزمەتگوزاری بەرنامەی ژیان.

## لیستی بەراوردە بنچینەییــەکان :

| بۆلی یەکەم | بۆلی دووەم | بۆلی سێ یەم |
|---|---|---|
| ١ـ هێمن ئاشتیانە وەك ئاکە ڕێگە وئامراز | ١ـ توند وشۆڕشگێڕانە وەك ئاکە ئامراز | ١ـ هەردووکیان لە بارودۆخی خۆی |
| ٢ـ چاکسازی لە تاك بۆ کۆمەل تاك ← کۆمەل | ٢ـ چاکسازی لە کۆمەل بۆ تاك | ٢ـ کۆمەل ↔ تاك واتە بە هەردوو ئاڕاستە |
| ٣ـ بەرگریان نیە لە کاتی پێویستیش | ٣ـ لەکاتی ناپێویستیش پەنا بۆ بەرگری شۆڕشگێڕی دەبەن | ٣ـ لە هەردوو باردا لە کاتی پێویست |
| ٤ـ نمونەی سەرکەوتوویان نیە | ٤ـ نیە | ٤ـ نمونەیان زۆرە |
| ٥ـ را دەڕوانە جیهان بە دلنیایی وکۆمەلگەیەکی ساغ | ٥ـ وا دەڕوانە جیهان بە گومان ڕیبلان وسیناریۆ وتاکتیك کۆمەلگەیەکی نەفامی خێرا تەکفیر کردنی خەلك | ٥ـ بۆ هەر ڕوداو و پیش هاتەکان بە ئەندازەی خۆی حوکمی لەسەر دەدەن |
| ٦ـ (امربالمعروف) بێ (نهی عن المنکر) | ٦ـ نهی عن المنکر، بێ (امر بالمعروف) | ٦ـ امر بالمعروف ونهی عن المنکر |
| ٧ـ گفت وگۆو دانوستان وئاشتی بێ هێز | ٧ـ تبلیغ بێ دانوستاندن | ٧ـ هەردوولا |
| ٨ـ لەو پەڕی نەرم | ٨ـ لەو پەڕی توند | ٨ـ لەنێوان هەردوولا |
| ٩ـ بەبەرپرسیاری بێ جورئەت | ٩ـ بێ بەرپرسیاری بە جورئەتی | ٩ـ هەردوولا |

## کامیان میـــان ڕەون؟

ئەگەر سەرنج بدەیتە لیستی بەراوردە کـە زۆر بـەروونی دەردەکـەوێ کامیـان میان ڕەوە، خۆ ئەگەر بچینەوە لای پێناسەکان وهەتا پێناسەکانی د.محمد عمـارە کە گوزارشی لە (ڕێبازی برایان) دەکا هەروەها لە فکـری ئیـسلامیش، هـەمووی کۆکن کە (میان ڕەو) لە نێوان دوولای تێپـەڕیوە، زۆر توونـد، زۆر نـەرم، لێـرەدا

(تەیاری ئیخوان) لە نێوان دوولا نیـە، بـەڵکو لـە پەرگەیەکـە، لـە ناوەڕاسـتەکە تێپەڕیوە، .. بۆیە بەو پەری سادەیی دەردەکەوێ میان ڕەونینە، هەڵبەتە تـەیاری ئەلقاعیدەش میان ڕەونینە، تەیارو پۆلی سێ یەم پۆلێکی میان ڕەون. بەلام لێرە وەك پێناسـەکەی د.محمد عمارە نیە میـان ڕەولە نێـوان دوو باطـل، دوو غلـو، .. ئەو پۆلانەی ئیـسلامی باطـل نـین، هـەموو مەبەسـتەکانیان خزمـەتی ئامـانجی ئیسلامیە بەلکو ئەوە لە ئامرازو ڕێگە گرتنە، بە وردتر دەستنیشانی هەریەکە لە قۆناغەکانی گەشەیان بکەین دەبینین هەریەکە لە قۆناغێك لە زەمـان وزەمینێـك لە (میان ڕەوی) دەکەوێ، پرۆژەی (ئیخوان) لە سەرەتاکانی گەشەکردنی سیاسی و بناغە دارشـتنەوەی کۆمەلگەو ولاتە تـەواو دیکراسـیەکان دا تـەواو میـان ڕەون، دروشمی ئیخوان لە سـەرەتادا (هـەق، هێـز، برایـەتی) ئینجـا دووشـێر وئایـەتی (واعدوا لهم ما اسـتطعتم..) وە بەشداری جەنگەکانی فلستین و سـینایان کـرد بـە دلسۆزی و لە خۆبردەی، بەلام کە ئەو ڕێرەوە (تعمیم) ئەکرێ بەسەر بـارۆدوخێکی وەك کوردستان، چیچان، کشمیر، جەزائیر، .. ئەوا لە میان ڕەوی دەکەوێ.

پۆلی سێ یەمیش لە ولاتێکی دیکتاتۆری ولـە دژی داگـیر کـەر هەلوێـستی شۆر شگێریان هەیـە ئـەوا (میـان ڕەون) بـەلام کـاتی لـە سـەرەتاکانی ڕابـوونی ئیسـلامی و لە ولاتێکی فەزا ئازادا جاری توندو تیژی وجهاد دەدەن یەکـسەر لـە (میان ڕەوی) دەکەون، ..واتە تـەیاری میـان ڕەو ئەوەیـە وەك پێناسـەکەی (بن یوسف العامری) کە دەلێ (سیاسەتی میان ڕەو ئەوەیـە لەسـەر هـەردوو تـەوەری توندی ونەرمی بڕوا هەریەکیان لە زەمان وزەمینی خۆی، .. هەر ئەوەشە لەگـەل (سیرە) دێتەوە، هەرخودی (ادعوا الى سبيل ربك بالحكمة..) مانـای ئەوەیـە بـۆ هاوین تاکە کراسێك لەبەردەکەی بۆ زستانیش جلی قورس، .. هـەر ئەوەشـە لـە مەبەستی پێناسـەکەی (جرجانی لە بارەی حکمە)، لە ڕاسـتیدا تـا ڕادەیـەکی زۆر دەسـەلاتداران بەرپرسن لە لادانی هەریەکە لە تەیاری یەکەم ودووەم لەسـەر ئـەکەی ڕەسـەنی خۆیان بەهۆی ئەو فشارە سیاسـی وئاسـایشی ویاسـای بەسـەریاندا، ئـەگینا

(٢٥) میانڕەوی الوسطية - إعتدال Moderate

لە سەرەتای دروست بوونیان یەك بەش بووینە بە میان ڕەویانە، بەڵام فشاری دەسەڵاتداران زیاتر هەریەکەی بەلایەك دا پاڵداون.

( ٢٦ )

## نیشتمانی الوطنیة patriotic

مانای کۆن و نوێیەکەی ئەو زاراوەیە زۆر لێك جیایە، لە ڕۆژئاواشی گەلێ جار تێکەڵی ناشینالیزم دەکرێ و لێکیش جیان، ئێستا زیاتر مانایەکی سیاسی هەیە لە ڕووی یاسای بریتییە لەو خاکە سنووردارەی کە دەسەڵاتێکی سیاسی نەتەوەیەکی لەسەر بەڕێوە دەچێ یان لە هەوڵی دەسەڵات دروست کردنن، لایەنگرانی تیۆری نەتەوەگەری (نیشتمان) بە تۆخمێکی بنچینەی نەتەوە دەزانن، کاتێ سنووری نیشتمان جووت بێت بە سنووری نەتەوەکەی، ئەوەش بە دەگمەن نەبێ وانەهاتۆتە دی، کەچی هەڵساون ناوی نیشتمانەکەو نەتەوەکەیان جووت کردووە، ئەگەر سنووری نەتەوەیی و سیاسییەکەی یەکسان بێت، بەڵام ئەگەر نەتەوەو نیشتمانی تری بەرکەوتبێت ئەوەیان ترسناکترە، کێشەی نەتەوەیی لەوەوە سەر هەڵدەدا، وەك تورکیا بەناوی (تورکە) کەچی نیشتمانی کوردستان و بەشێکی عەرەبیش بەرکەوتووە بە ناوی ئەسکەندەروونە، ئینگلتراش بەشێکی وێلز و ئیرلەندەی بەرکەوتووە، بۆیە لەوێ بەخێرایی ناوی نیشتمانی بووە بەریتانیا کە ناوێکی ئاینی کۆنە گوزارش لە مانای خواوەندێکیانە، ئێران ناوێکی گشتی هەڵبژارد هەموو لایەك بگرێتەوە کە لە (ئاری)* هاتووە، ئەهات ناو لە وڵات بنێ (فارس)، پاکستان سێ پیتی یەکەمی لە هەرێمەکان هەڵبژارد .. ئەو ناوتۆیە تا ڕادەیەك چاکترە لە بە ناسنامەکردنی ناوی نیشتمان بە نەتەوەکە، .. هەرچەندە

---

* زۆربەی وڵاتانی ئاسیاو ئەورووپا ئارین، ماناشی (ماقوول) یاخود سەربەر، ئیتر سەربەرمانو تیۆری نازی لەوە هات، بە پێی (الموسوعة العربیة المیسرة) یەکەمجار هندۆسییەکان ناوی ئاریان لە خۆ نا.

كوردستانيش لەو شێوەیە بەڵام کۆمەڵێك هۆی سروشتیو مێژووی واقیعی دەگمەن هەیە ئەو ناوەی لەگەڵ خۆی هێناوە، هەرچەندە کوردستان وەك نیشتمان جووتە لەگەڵ نەتەوەیی یەکەشی .

بوونی چەند نیشتمانو نەتەوەیەك لە سایەی یەك وڵاتو دەسەڵاتێك کێشەی نیشتمانی نەتەوەی لێ پەیدا دەبێ ئەگەر بەو ڕوانگەی سەروو (نیشتمان) بسیاسێنرێت، بۆیە هەم ئەو پێناس وڕوانگەی سەروو هەم واقعی نیشتمانی جهانی ئێستا کۆمەڵێك گرفتی سامناکی هەیە لەبارەی: سنوری نیشتمان، هێزە نیشتمانیەکان، پەیوەندی نیشتمان بە مرۆڤەوە، فرەنەتەوەو فرە نیشتمان لە چوارچێوەی یەك دەسەڵاتەوە، ناسنامەی نیشتمانی ...بۆیە هەتا ئەو ڕێکەوتنە یاسای وسیاسی یەی لەسەر پەیوەندی هێزو حزبی سیاسی بە نیشتمانەوە کراوە تەواو ڕاستو دروست نیە کە وتراوە مانای هێزو حزبی نیشتمانی ئەوانەن کە بەرژەوەندی دانیشتوانی ئەو سنورە لە سەرووی بەرژەوەندیەکانی تریەتی، یان بەرژەوەندیەکانی ناسایشی نەتەوەیی.. ئەوەش هەمان کێشەی ناوەڕۆکی ناسایشی نەتەوەییو کێشەی سنوری ڕاستەقینەی نیشتمانە، نەك ئەو سنورانەی ئیمپریالیزمی جهانی لە پێناو بەرژەوەندی خۆی کێشاویەتی یان ئەو سنورەی کەلە ژێر چەپۆکی دەسەڵات دروست بووەو بێ دەسەڵات تیایدا بێبەش کراون .

## گەشەی ئەو زاراوە:

نیشتمان لە بنەچەی دا زاراوەیەکی سیاسی نەبووە، لەسەراتاکان ولەناو عەواما گەلێ جار بەو کێلگەو پاوانو تەوویی دێیەکە وتراوە (مەفتەن)، نیشتمان زادەی نەتەوایەتی نیە مانای زمانەوانی نیشتمان (وطن) لە (لسان العرب)[1] و (قاموس المحيط)[2] بە (منزل الاقامة) هاتووە، الوطن: المنزل تقيم بە وهو موطن

[1] لسان العرب ــ ابن منظور، مادة: الوطن.
[2] قاموس المحيط ــفيروز آبادي.

### (٢٦) نیشتمانی الوطنیة patriotic

الانسان ومحله) ماناکەی لە بنەچەدا لەو فەرموودە هاتووە: (انه نهی عن نقرة الغراب وأن یوطن الرجل فی المکان بالمسجد کما یوطن البعیر) واتە شێوازی مانای تاکی وەرگرتووە نەك کۆمەڵە کەسێك، لە فەرهەنگە کۆنەکانی ئیسلامی نیشتمان و نەتەوە هاوتای یەك نەهاتوونە، ابن خلدون لە (مقدمة) باسێکی نیشتمانی ونەتەوەتی کردووە بەلام جیایە لەگەل تێگەیشتنی ئێستا، هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو لێکدانەوەی خوارەوە کە دەبینین نیشتمان لە(دارالاسلام)دا بەند نەبووە بە نەتەوایەتی وسیاسەت و عەقیدە ... بۆیە (نیشتمان) کراوە سێ بەشی گۆڕاوو هەروەك لە (دستور العلماء) هاتووە :(الوطن الاصلي هو : مولد الرجل في بلد، وطن الاقامة: وهو موضع ينوي أن يستقر فيه خمسة عشر يوما او اكثر من غير أن يتخذه مسكنا، وطن السكني: وهو موضع ينوي فيه الاقامة اقل من خمسة عشر يوما )[1]، ئەو پێ ناسە کراوەیە بەپێ ی دەسەڵاتی سیاسی ئیسلامی، واتە نیشتمان سنوری نەبووە ئیمکانی هەبووە هەموو سەر زەوی بە نیشتمان حساب بکرێ وەك زانایانی ئیسلامی بەتایبەتی( ا. شافعی)ش وای بۆ چووە،لە ئاینە جهانیەکانی وەك مسیحی وئیسلام نیشتمانیان نەبووەو نیە بەڵکو هەموو سەر زەوی نیشتمانیانە ، کەواتەلەو ساتی (دار الاسلام) نیشتمانی هەموو کەسێك بوود بە گواستنەوەشەوە، نەك نیشتمانی عەرەب و تورك و عەجەم و، ....هتد . بۆیە لە ڕەگەزانامەش ناوی نیشتمانی ونەتەوە نەنوسراوە، بەناوی ئیسلامی نووسراوەو بەس[2]، لە فەرهەنگە کۆنەکانی تری ئیسلامیش هەتا (ابن منظوریش) شوێنی لە دایك بوونی کردۆتە (موطن الاصل) نیشتمانی ڕاستەقینە، بەڵام ئەو (ژینگە)شی بۆ زیادکردووە[3] ،(موسوعة الکشاف..)یش هەردوو دۆخی لە دایك بوون وژینگەی بە( نیشتمان) داناوە ... بەکورتی زۆربەی

---

[1] موسوعة مصطلحات جامع العلوم ـ قاضی نگیری ـ مادە ـ وطن

[2] بۆ زیاتر سەرنج بدە هەردوو زاراوەی (ناسنامە) و(نەتەوایەتی) لەو فەرهەنگە

[3] معرکة مصطلحات ـ د. محمد عمارة مادة : الوطنیة فطرة انسانیة

ئەرهەنگەکان ئەو دۆخانەی بە ( نیشتمان) هەژمار کردوە: (لەدایك بوون، بژێوی، جێنشین، ژینگە، ...) ... واتە ( نیشتمان) پێ ناس ومانای تاکی هەبووە نەك بەکۆمەل وسیاسەت.، زۆربەی زاناپان ئەوە بە سروشتی تر لەقەلەم دەدەن هەروەك د. محمد عمارە ئەو پێ ناسە (تاکیەی) سەروری بۆ (نیشتمان) تەواوتر لەگەل (فیترەتی مرۆڤ) دەگونجێنێ نەك ئەو مانایەی ئێستای، بەو شێوەیە لە فەرهەنگی خەلافەت هەتا ١٩٢٤/٣/٣ بەمانای (دار الاسلام) بووە نەك دار( العرب، عجم، تورك، کورد، ...)، لە دوای ئەو مێژووەو سەرهەلدانی عەلمانیەت وبیرۆبروای نەتەوەگەری ( نیشتمان) پێناسێکی سیاسی نیمچە رەگەز پەرستی وەرگرت، لە کەلتووری رۆژئاوا و جیهانی ئانیسلامی ئەگەر مانایەکی هەبووبێ لە سەردەمی رۆمان ومەدرەسەی یۆنانی بە شوێنی لە دایك بوون (مسقط الرأس) وتراوە، بۆیە لە زۆربەی زمانەکانی ئەوروپی ئێستاش نەتەوایەتی و نیشتمانی و جێی لە دایك بوون و... زۆربەی زاراوەی ناشی (natio)، ناتزی، دوتش، فۆلك ،پاتریۆت..هتد وەرگرتووە .

## سەرهەلدانی سیاسی و یاساییانەی :

ئەوپێناسە تاکیانەی سەروو گوزارشی لە سەردەمێك دەکرد کە سەردەمی ئینتمای خیلەکی وئیمپراتوریات بوو، پەیوەندی نیشتمان ونەتەوەو دەسەلاتی سیاسی نەبوو، یان زۆر لاواز بوو، بۆیە زور سروشتی بوو هەردەسەلاتەکی سیاسی لە هەر شوێنێك دروست ببوایە، ئەسکەندەری مەکەدۆنی دامەزرێنەری یونان خەلکی مەکدونیایە ودەولەتی لەبابل بوو، عبدالرحمنی کوری رۆستەم فارس بوو دەولەتی لەمەغریب دروست کردبوو، صلاح الدین دەولەتی لەمیسر بوو، عوسمانی لەناوەراستی ئاسیا لەدەست مەغۆل هەلاتبوون لە ئەوروپا دەولەت بوون، گیان پۆلایەکانی کورد (جنبلاطی ئیستا) دەولەتیان لەشام ولبنان بوو.. ئەو کاتی لە رووی یاسایشەوە (بنەمای (سیادە) نەبوو، سنوری نێو دەولەتی بەگشتی بریتیی

بووه لەو خاكەی لە ژێر پێی دوا سەربازی ئیمپراتۆرە بچووك و گەورەكان، كەمتر تاكیش هەستی بە خۆشەویستی نیشتمان كردووە، بەڵام لە ئیسلامدا ئەو هەستە بە (دار الاسلام) بەشێك بووە لە ناوچەرگەی عەقیدە، هەلبەتە لەگەڵ (وطـن)ی ئێستای نەبووە، پەیوەندی خاك بە مرۆڤ تاك تاكی بووە، تا ئەوكاتەی مرۆڤەكان لەسەر بنچینەی رەچەلەك و نیشتمان تۆیەلیان كرد، ئینجا ئەو پەیوەندییە لە سەدەكانی (١٨بۆ١٩) لە تاكیەوە گواسترایەوەبۆ كۆمەڵ و نەتەوایەتی لێ چەكەرەی كرد، یەكەم جار لە ئەوروپا بوو ئایدۆلۆجیەكانی نەتەوەیی چەكەرەی كردو لە سەرەتاكانی سەدەی بیستەم بە یەكجاریش سیستەمی ئیمپراتۆریەكان گۆڕان بۆ دەوڵەتی نەتەوەیی هاوچەرخ، ئەو كاتی نیشتمان و نەتەوەو دەسەڵاتی سیاسی خرانە پەیوەندییەكی سیاسی تۆرگانیكی، دوایش بەرز بۆوە بۆ ئاستی یاسای نێودەوڵەتی، بەجۆرێك كە ئەو سێ توخمە بنچینەییە سازابی بەپێی یاسای دەولی مافی بوون بەدەوڵەتی پێدراوە ١- هەرێم (نیشتمان) ٢- گەل (نەتەوە) ٣- دەسەڵاتی سیاسی)، لەوەوە بنەمای سیاسی و یاسایی و جارنامەی "مافی گەلان" هاتە دی، ئی دی نیشتمان هەم بووە زاراوەیەكی سیاسی و یاسایی و هەم بووە پرسێكی سیاسی و دەستوری كۆمەڵایەتی و فكریش، لە فەرهەنگە نوێكان نیشتمان یەكسان كرا بە خاكی نەتەوەیەكی یەك زمان ویەك مێژوو ویەك بەرژەوەندی وهەتا بەشێك یەك ئاین ویەك باری دەروونی و فەرهەنگ و كەلتووریش بۆ زیاد كرا، معەممەر قەزافی دەڵێ: القاعدة السليمة هي لكل قوم دين[١]، بەڵام بەدەگمەن وا رێك دەكەوێ، هەڵبەتە رەگەزی تریش دەبێ بۆیە بەرەبەرە حزبی نیشتمانی و دەوڵەتی نیشتمانی جێگەی دەوڵەتی نەتەوەیی گرتەوە، یەكەم جار لە ئەمریكا بە هۆی شۆرشی رزگاری ١٧٧٦ز ئەو وەرچەرخانەی دەوڵەتی نەتەوەیی بۆ دەوڵەتی نیشتمانی بناغەی رێژ كرا، لە زۆربەی دەستوورەكانی وڵاتانی عەرەبی و توركیاش پێناسێكی سەرەتای نیشتمانی كردووە بە بەندی یاسای

[١] كتاب الاخضر.

(٣٦) نیشتمانی الوطنية patriotic

سنورو پەیوەندی بە خەلکی ولاتەکەی بەستۆتەوە، لە بەرامبەریشدا وەك چارەسەری یاسای بۆ نەتەوەو ڕەگەزو ئایین و کەلتوور چەمکی (هاو نیشتمانی- هاوولاتی) داهێنرا لە جیاتی (هاونەتەوەیی)، یەکەم ڕووبەڕوو بوونەوە لە نێوان نیشتمانی و نەتەوایەتی دیسان هەرلە شۆڕشی ئەمریکی ساڵی ١٧٧٦ز گوزارش دەبێ، چونکە بەریتانی و ئەمریکی یەك ڕەگەزو ڕەچەلەك بوون و نیشتمانیان جیا بوو، دیارە فاکتەری نیشتمانیش لە نەتەوەیی بەهێزتر بوو بۆیە شۆڕشەکە سەرکەوتووبوو بەریتانیا دەربەدەرپێندرا، ئەوەش زیاتر لەگەڵ چەمکی و کۆمەڵگەی مەدەنی ڕێك دەکەوێ و لە چەمکی نیشتمانی (نەتەوەیەك) ترازان، بۆیە بەشێکی تر نیشتمانیان بە دەر لەنەتەوە بە دەسەلات بەستەوە وەك لە فەرهەنگی (اعرف مذهبك) هاتووە و دەڵێ نیشتمان ئەو پەیوەندیە توندو تۆڵەیە کە خەلکی ولاتێك پێك دەبەستێت، لێرە سەرچاوەکەی دەسەلاتە نەك سنوری خاکێك ونەتەوەیەك، ئەو پێ ناسەی ئێستاو واقیعەکەش زادەی مەدرەسەی لیبراڵیەو ئەگەر وردتر بڵێین زادەی مەبەستەکانی ئیمپریالیزمی بووە لە چواچێوەی (فرق تسد)ی جهانی بۆ ساناى زاڵ بوون بەسەریدا، هەروەك کاتی فیرعەونەکان لەو ئەزموونە یان دا بۆ زاڵ بوون پانتای ئیمپراتۆریان کردە (٤٢) پارچە، بە هەمان شێوە لە ئامۆژگاری (تەرستۆ) بۆ ئەسکەندەری مەکدۆنی بۆ زاڵ بوون بەسەر ئیمپراتۆریەکەی لە ڕۆژهەلات داوای لێکرد پارچە پارچە یان بکەو هەریەکە دەسەلاتدارێکی ئامۆیان لەسەر بسەپێنی بەلام لە خۆیان بێ، ئیتر لەوەوە بیرۆکەی ئەو دەوڵەتە بچووکانە لەجیاتی (دارالإسلام) هاتە کایەوە لەلایەن ڕۆژئاواو لەسەرەتای سەدەی بیستەم پەیرەو کراو ئەو واقیعەی ڕۆژهەلاتی ناوەراستی لێ هاتەدی بە مەینەتی کوردیشەوە.

(٢٦) نیشتمانی | الوطنیة | patriotic

## ڕای مەدرەسەکان:

ئەو واقیعەی ئێستای نیشتمانی بەهێزی دەسەڵاتەوە گەلێ جار لەلایەن سیاسەتمەدارە باڵاو نووسەرو توێژەرەوەکانیش لایان وەك ڕاستیەکی مێژووی دەردەکەوێ، لەیادیان دەچێ کە ئەو واقیعەی سنووری نیشتمان داهێنراوە بە مەبەستی ئیمپریالیزمی، هەموو مەسەلە پەیوەندیدارەکانیش لەگەڵی بە نەتەوایەتیو دەوڵەتی نەتەوەیی .. پیلان بووە، بە هۆیەوە نەتەوەی سەر دەستو بن دەست دروست بووە، کێشەو پشێوی بەردەوام هەیە ... بەڵام واقعێکە بۆیە سڕینەوەی بەیەکجار لەلایەك و پیرۆزکردنیش لەلایەکی ترەوە هەردووك تێپەڕین و پەڕەگرتنە (تطرف) وەك ئێستا لە ڕای مەدرەسەکان لێ یان دەردەکەوێ :

مەدرەسەی شیوعیەت دان بە نیشتمان ناهێنێ نەك ئەوانەی ئیمپریالیزم دروستی کردووە وەك عێراق، تورکیا، وڵاتانی عەرەبی.... بەڵکو دان بە نیشتمانە سروشتیەکانیش ناهێنێ هەروەك لە مانیفێستەکەی بە زەق تر باسی دەکاو دەڵێ (کرێکاران نیشتمانیان نیەو بەرژەوەندیەکانیان لەسەرووی هەموو بەرژەوەندیەکی ترە)[1]، ئەوە لە چواچێوەی ناکۆکی چینایەتی وەك ناکۆکی بنچینەی لە قۆناغی سەرمایەداریدا، ناکۆکیەکانی تر ناسەرەکین، کرێکارانی هەر وڵاتو سنورێك بەشێکە لە کرێکارانی جیهان، هەر دروشمی (ئەی کرێکارانی جیهان یەکگرن) لەوەوە هاتووە، پاساوێکی تری ئەوەیە زۆربەی ئەو نیشتمانانە ئیمپریالیزم دروستی کردوون ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ کێشەی نەتەوایەتی لەسەر دروست بووە، بە ڕای شیوعیەت قەلاچۆکردنی ئیمپریالیزم وسیستەمی سەرمایەداری هەموو کێشەکانیشی لەگەڵ چارەسەر دەبێ ... بۆیە خەباتی نیشتمانی بە (جزئی) لەقەڵەم داوەو خەبات دژی سەرمایەداری (کلی)یە... هەڵبەتە دووەم لەپێش یەکەمە، (کلی) شەرعی ترە لە (جزئی)، بەڵام بە ڕوونی

[1] بیان الشیوعی ـــ مارکس، ئەنجلس .

دەردەکەوێ فەلسەفەو دروشمی مارکسیزم لە واقعێکی جیهانی گرنگ خۆی لاداوە کە نەخشەی مێژووی نوێ یە و نیشتمان وکێشەکان مەزن ترین بزوێنەر بووینە، هەربۆیەش شیوعیەکان بەزۆری لەرێ ی ئەو رزگاری نیشتمانیە گەیشتونەتە دەسەڵات کەبە (جزئی) لە قەڵەمی داون، نەك لە رێی ناکۆکی چینایەتی و نەگونجانی هێزی بەرهەم هێنەر وپەیوەندیەکانی بەرهەم هێنان کە جەوهەری تیۆری مارکسیە لە بارەی شۆرش، ئینجا کێشەی نیشتمانی وداگیرکاری (جزئی) نیە هەروەك بەشێك لە ئیسلامیەکانیش جارجار بۆچوونی وایان هەبووە بە چەوتی، چونکە داگیرکار هەرداگیرکەرە چ ئیمپریالیزمی بێت چ بچووك و دەڤەری بێت هەروەك ئیبن تەیەمیەش وای فتوا داوە ، بۆیەش بەشێکی زۆر لە فەرهەنگەکان ئیمپریالیزم دەکەنە دووبەش: ئیمپریالیزمی دەرەکی کە بریتیە لە ئیمپریالیزمی جیهانی، دوەم ئیمپریالیزمی ناوەکی کە بریتیە لەو دەسەڵات حکومەتانەی کە نیشتمانی نەتەوەیەکی تریان خستۆتە ژێردەستی خۆیان بە زۆری وەك کێشەی کوردستان، ... دوای ئەزموونێکی زۆر مدرسەی مارکسیزم ناچار هەندێ دەستکاری لە بنەماکانی شیوعیەت کردو هاوێژێکی گرنگ بۆیاساکەی فلسفی مارکس زیاد کرا، وا نوسرایەوە (دەکرێ) "ناکۆکی دووەم لە هەندێ دۆخ جێگەی ناکۆکی یەکەم بگرێتەوە"، لەوانە ناکۆکی بزوتنەوەی رزگاری - نیشتمانی لەگەل داگیرکەران بە پێش ناکۆکی کرێکار وسەرمایە بکەوێ، لەگەل زنجیرەیەك سەرەنجامی تر لەو دەستکاریانە ئەوانیش وەك واقعێك دەولەتی نیشتمانی وماناى نیشتمانیان لە دستور ومەنهەج تۆمار کرد وبەپێچەوانەی راو بۆچوونەکانی (ترۆتسکی کە لە کتێبی- ثورة الدائمة) هاتبوو، بەو شێوەیە شیوعیەکان لە سەردەمی خۆیان رۆلێکی مێژوویی گرنگیان بینی لە رزگاری - نیشتمانیدا. تا رادەیەکیش توانیبیان کێشەی فرە نیشتمانی لە یەك وڵات چارەسەر بکەن .

هەرچی مەدرەسەی لیبرال دیمکراسیشە کە لە سەروو باسکرا بەربرسە لە راپێچکردنی ئەو واقیعە نادادگەریەی جیهانی سێیەم، بەتایبەتی لە دابەشکردنی نیشتمان بەو شێوەیە، بەڵام لەناوەخۆیدا توانیویەتی بەهۆی بە دەستوریکردنی چەمکی (هاوولاتی) لە کۆمەڵگەی مەدەنیدا لە جیاتی (هاونەتەوەیی) زۆربەی کێشەکانی نیشتمانی چارەسەر بکا، هەتا لە قۆناغی ئیمپریالیزمیش چاکتر بووە لە داگیرکەرانی نەتەوەگەری نوێی عەلی، کە بە هیچ شێوەیەك کێشەی نیشتمانی بەو پێناسەی "نیشتمان"- و بەندکردنی بە نەتەوەی (ئومە)- پێ چارەسەر نابێ، دەمارگیریەکی زیادەڕەویان بۆ نیشتمان هەیە، گەلێ جار بە ئایین و پیرۆزیەکی وای دەخەملێنن کە مرۆڤ تیایدا بە ڕاگیرە، هەر ئەو کارەشە، کاردانەوەیەکی لەنێو نیشتمان پەروەرانی کوردستان دروست کردووە سروودی (ئەی ڕەقیب) بکەنە سروودی نیشتمانی کە تیایدا هاتووە (..دینمانە ئاینمانە هەر نیشتمان !)، لە هەمان کاتدا دەبینین سرودی نیشتمانی (چیچانی) (٧) جار (لاآله الا الله)ی تیایە، لە یەکەمدا ئاین دەکەنە بەشێك لە نیشتمان لە دووەمدا نیشتمان دەکەنە بەشێك لە ئاین، ئەو دوو تێڕوانینە زۆر لێك جیایە بەتایبەتی لەو سەردەمە، ئەوانەی بەشی یەکەم عەلمانیەتەو بەرەو کزیو لاواز بوونن لە گیانی بەرگری، ئەوانەی نیشتمان دەکەنە بەشێك لە ئاین ئیسلامیەکان گیانی بەرگریان زۆرەو بەرەو سەرکەوتن لەوانە (چیچان، کشمیر، مۆرۆ..) هەتا ئیسرائیلیش نیشتمانی کردۆتە بەشێك لە ئاینی، بۆیە بەسەر دەسەڵاتدارانی عەرەب چاك زاڵ بووە، کە ئەوان بە پێچەوانەی ئیسرائیل ئاینیان کردۆتە بەشێك لە نیشتمان لە باشترین دۆخیاندا.

لە فیکری ئیسلامیشدا واقیع بەشێکی گرنگی فیقهی ئیسلامە بەناوی (فقە الواقع).. بۆیە ئەو فیقهە وا دەڕوانێتە وەلائی نیشتمانی بە دیاردەیەکی ئەفامی، بەڵام لەبەرئەوەی واقیعێکە ئیسلام بەرپای نەکردووەو بەرپاش ناکا بە پێی (.... قُلْ إِن كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَ

مساكن ترضونها احب اليكم مـن الله ورسوله وجهاد فـي سـبيله فتربصوا حتى ياتي الله بأمره والله لايهدى القوم الفاسـقين)... زۆر روونـه هـهموو ئـهو وهڵامـه شاقولّيانهى: خوێن، ڕهچهڵهك، خێڵهكى، ئابوری، نيشتمان، كۆمهڵايهتى ميراتـى، ... وهرناگيرێن، ئهوانه نيشتمان نـهك ولاء، ئهگـهر وهلانـى مـرۆڤ بهنـد بـوو بـه نيشتماى شاقوولى ئهوا سـهچاوهكانى نهفامى ورهگهز پهرسـتى لێرهوه سهرههڵدهدا، بۆيه له نێو ههموو ئهو ئهلقانه ئهلقهى وهلانى نيشتماى ئاسۆيى وهردهگرێله لايهن ئاين، ... ئـهوه ئهسـلهكهيه، بـهڵام واقعهكـه جـۆرێكى تـر، بۆيـه بهشـێك لـه ئيـسلاميـهكان له قهبلاندنى ئهو بهراوورده لايهك مهغـدور دهكـهن كـه بـه پـىّ ى ئهسل حوكم لهسهر ئهو واقعه دهكهن گهلێ جار لهنێوان ئـهو (ئهسـل) و(واقيعـه) تووشى ناكۆكى ههلوێست دهبن، سهرنج بده گهوره زانايهكى وهك (سـهيد حوى) چهنده بير تيژو وردبينه كهچى دهبينين لهو تێوانه له نـاكۆكى دابـه، لهلايـهك لـه وهسفى (ئوممهت) حهوت يـهكێتى بـۆ هێنـاوه حهوتهمهكـهى (وحدة اللغـة) يـه ئهوهش نهشياوه چونكه ئوممهت چهمكێكى ئاسۆييـه هيچ پهيوهندى به (زمان) نيه كه چهمكێكى شاقوليه، هێندهى پێ ناچێ ئهو جاره له وهسفى (نيشتمان) دهڵێ: (... اما مجتمع الاسلامي فارتباطـه بـالوطن والقوم بقدار إرتبـاط هـذا الـوطن واهله بالاسـلام، فولاء المسلم لإسلامه اولا واخيرا) [1]، بهو شێوه دهبينين لهيهكـهوه به ههله داچوو به حوكمى ئـهو واقعـهو لـهدووهما ڕاسـتى پێكـاوه بـه حـوكمى ئهسلهكه، هاتۆتـه سـهرههمان ڕاى (جمـال الـدين أفغـاني) كـهدهڵێ:(لا جنـسية للمسـلمين الا في دينهم) ، به وردى ئهقهبلانـدن لـه نێـوان واقـع وئهسـل زۆر جـار دهبێته هۆى قهيرانێكى فكرى ئيـسلامى وگهلێ جاريش بزوتنهوهيهكى ڕزگارى ـــ نيشتمانى به (انفصالي، فتنه، تعصب، ..) تاوان بار دهكهن، لهو بارهيهوه (شـێخ سعيد پيران) جوان ترين بنهماى دارشت كاتێ داواى له مهڵبهندى خهلافـهت كـرد كه لهو كاتى عـهلمانى تـوركى زاڵ بـوو، وتـى : يـان خهلافـهت بگهرێنـهوه يـان

[1] (١)(٢) سعيد حوى ـ الاسلام ـ ل ٣٤١_٣٤٢

كوردستانیش وەكو ئێوە خاوەنی دەوڵەتێكی سەربەخۆ بێت، هەرچەندە ئێستا ئەو لەنگیە بەرەو چارەسەریە هەموو لایەك خەریكە تەواو لەو بنەمایەی (شێخ سعید) دەگەن، لەنگیەكە واقعێكی خەستە تێرواتینی هەموو كورت بینێك دەگۆڕێ، وا دەزانن ئەو واقیعە وەختەی نیشتمانی ئێستا ڕاستیەكی مێژوویە، وادەزانن ئیسرائیل هەر لە فەڵەستین بووەو، كوردستان بەشێك بوە لە عێراق ... ئەو وڵاتانەی ئێستا هەروا بووینە .. نەخێر، كوردو عەرەب هەزاران ساڵ لەو نیشتمانەی (عێراق) برا نینە بەڵكو هەزاران ساڵە لە (ئومەتێك) و (دار الاسلام ـ نیشتمانی ئیسلامی) برا بووینە، نەك لەو عێراقەی كە لە ڕێكەوتنی سایكس بیكۆی ١٩١٦ دارێژراوەو ١٩٢١ جێبەجێ كراوە بە مەبەستی پارچە پارچەكردن لە لایەك و لە لایەكی تریش لەپێناو سەركەوتنی بەڵێنی بەلفۆر ١٩١٧ لەگەڵ كۆمەڵێك مەبەستی ئیمپریالیزمی جارِ دراو نەدراو، بۆیە نیشتمانی عێراقی هیچ پاساوێكی مێژوویی، جوگرافی، كەلتووری، فەرهەنگی، ئاینی، ....نیە جاران ئەو شوێنەی ئێستا ناوی عێراقە هەر بەشێك لێی ناوێكی هەبووە ، تا پێكهێنانی عێراق لە ١٩٢١ لەلایەن بەریتانیاوە، لەو ناوانە: أرض السواد، میزوپۆتامیە (بلاد مابین النهرین)، نجد، جزیرە، شام بەلای ڕۆژهەڵاتەكەی ئەریجا، بلاد بابل، بلاد اشور، بلاد كلد، عیراق العربی (بصرە)، عراق العجمی (كوفە) بلاد الرافدین، منتفك، ئەراك، ... ئیتر شیا ئەو نیشتمانە دەستكردە بەناوی عێراق بۆ عەرەب ناوبترێ لەلایەن ئینگلیزەوە (لەلایەن : مسبیل، لورانس، كۆكس) هەڵبژاردراوە، بەڵام تێكەڵكردنی دوو نیشتمانی عەرەبی وكوردی لەژێر ناوێك گەورەترین كێشەی دەستوری و سیاسی و ئاینی و مرۆڤایەتیشە كە چۆن ئێنتمای دوو نیشتمانی ڕەسەن جیا لە نیشتمانێكی داهێنراو لەلایەن ئیمپریالیزمەوە كۆدەكرێتەوە؟ ... لەوەوە كێشەی نیشتمانی بزوتنەوەی ڕزگاریخواز پەیدا بوو، لە سەرەتادا عەلمانیە نەتەوەگەریەكان ڕۆڵی بەرچاویان بینی بەڵام

(٢٦) نیشتمانی     الوطنیة     patriotic

لەو سەردەمە زیاتر بزوتنەوە ئیسلامیەکان هەلگری ئەو بەرگریەن، بابزانین کامیانە.

## کامیان نیشتمانی ترن؟ ئیسلامیەکان یان عەلمانیەکان

.نەتەوەگەری سیاسی وا خۆی دەناسێ کە بۆ رزگاری نیشتمانی وتەواوکردنی بەرنامە سیاسیەکانی نەتەوەیی هاتووە، کەمتر ئەو ئەرکەی بە چەپیەکان و ئیسلامیەکان دەبینن، لەو لاشەوە چەپیە راستەقینەکان نیشتمانیان نیە بە پێ ی دەقی مارکسیەت، بۆیە ئەوانیش ئەو ئەرکەیان بە ئەرکێکی بورجوازی و رەجعی لە قەلەم دابوو، هەرچی ئیسلامیکانیشە هەتا دوای رابوونی ئیسلامی و هەردوو شۆرشی ئیسلامی ئێرانی ئەفغانی‌و ئەو ئەرکەیان بەئەرکێکی عەلمانی دەزانی ... بەلام ئێستا ئەو تێروانین و واقعە گۆراوە، بەدەگمەن نەبێ ئێستا بزوتنەوەیەکی عەلمانی بەنەتەوەگەریشەوە نادوزیەوە خاوەنیەتی بەرگری چەکداری بکا، لە راستیدا بە پێ ی گەشەی تکنۆلۆجی سەربازی ئیمپریالیزم و داگیرکەران قوناغەکانی بەرگریش گۆراوە، بەشێوەیەك کە قوناغی یەکەم تکنولوجیای سەربازی یەکەی داگیرکەران ئەوەندە بەهێز نەبوو ئەوا بە بەرگری یەکی میللیانەو نەتەوەییەکان دەکراو ئەنجامێکی باشی بووە، ئەو قۆناغە هەتا شەستەکانی سەدەی رابووردوو دەوامی کرد، دوای گەشەسەندنی زیاتری ئەو تکنولوژیە لەتوانای نەتەوەگەری نەما ئەو جارە پێویستی بە رێکخستن و پلان و دارشتنی بنەماو ئایدولوژیا بوو، بۆیە چەپیەکان لەو قوناغەدا گەرم بوون قوناغی دووەمی هێرشی ئیمپریالیزمیان پشتەو شکێن کردەوە، .. لە قۆناغی سێ یەم وکۆتای ئیمپریالیزمی کە بە تکنۆلۆجیایەکی زەبەلاح وا هاتۆتە مەیدان ئەوا بەرگریەکەی ئەلەتوانای نەتەوەگەری ئەلە توانای چەپیەکانیشە، زیاتر پێویستی بە بنەمای توکمەو عەقیدە هەیە ،بۆیە ئێستا تەنها ئیسلامیەکان ئەو بەرگریەیان پێ دەکرێ، کەواتە سروشتیە کە دەبینین بزوتنەوەکانی رزگاری ـ نیشتمانی: چیچان،

کشمیر، خوارووی فیلیپین، خوارووی لبنان، فەلەستین، .. تەنها ئیسلامیەکانن، هەروەها ئەو بەرگریەی ئێستای عێراق و ئەفغانستان بە ئاشتی و بە ئاشاشتی، ئەوانەی لەسەرتاسەری بەلقان کرا ... با سەرنج بدەینە (حزب الله) لە خوارووی لبنان، کاتێ ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٨٠ خوارووی لبنانی داگیر کرد ئەوا (حزب الله) لەدایك نەببوو، پڕی لوبنان حزبی عەلمانی و دیموکراسی و نەتەوەیی و چەپی و سوشیالیستی بوو، میلیشیاشیان هەبوو، کەچی کەس بەو ئەرکە هەڵنەسا تەنها، (حزب الله) پێی هەڵسا، هەتا سوپای لوبنانیش بەو ئەرکە هەڵنەستا.... کەواتە ئەو حزبانەو سوپای لبنانیش ئەرکی نیشتمانیان چیە ئەگەر بەرگری داگیرکەریش نەکەن؟ لەو سەرەنجامە بەشێکی زۆر لە عەلمانیەکان بە چەپی و لیبرالی و نەتەوەگەری و سوشیالیستیشەوە بە خێرایی گەڕانەوە سەر بنەماکانی میکافیلی لە سیاسەت، بۆیە زیاتر بەرژەوەندی تایبەتی رەچاو دەکەن تەواو وازیان لە ئایدولوژیاو مەبادینەکانو بەرگری هێناوە، بە دەگمەن لایەنێکی وەك پ ك ك ماوە لەو پۆلە لە ئەرکی بەرگری بێت، بنەمای میکافیلیش لەو سەردەمە هەرگیز بەرگری لە توانادا نیە، هەر خۆی وتویەتی (حبي لروحي دون حبي لبلادي)[1]، ئاواش ئەو جۆرە عەلمانیە پەیڕەوی ئەو بنەمایە دەکەن، بۆیە دەبینین زۆربەی تەیارە عەلمانیەکان لە بێژینگی ئەو هاوکێشەو پرسیارە دەرناچن: ئاخۆ ئەگەر بەرژەوەندی نیشتمانی و بەرژەوەندی حزبی خودی تێك گیرا کامیان سەردەخەن؟ هەڵبەتە روونە یەکسەر بەرژەوەندی خودی حزبەکەیە بەڵام ئەو حزبەی کە مولکی تایبەتی خۆیتیان، وەك لە سەرجەم ئەزموونەکانی کوردستانو عەرەب هاوشێوەکانی دەردەکەوێ، لە کوردستان ئەو پرسیارە هێشتان لە گۆڕەپان وەڵامێکی بەزەقی نیە چونکە ئیسلامیەکان نەیانتوانیوە بەتەواوی بەرنامەی رزگاری نیشتمانی هەڵگرن وەك فەلەستینو چیچانو کشمیرو خوارووی فلیپینو خوارووی لوبنانو بەلکان . . گرار . ئەوانە وڵاتیان لەلایەن (غەیرە ئیسلام)

[1] بڕوانە (الامیر).

داگیرکراوە نازانن داگیرکار هەر داگیرکارە چ ئیسلامی بێ چ نائیسلامی، زۆر لە مێژە (ابن طاوس) ڕێسایەکی گرنگو بزێری داهێناو دەڵێ: (كافر العادل خير من مسلم الجائر) هەروەها (ابن تيمية) لەبارەی داگیرکەریەکانی مەغول فتوای دا: ئەگەر داگیرکەر قورئانی لەسەر سەریش بوو مادام داگیرکەرە بەرگری بکەن تا دەری دەکەن، ئیسلامیەکانی کوردستان بەرگریان کردووەو لە شاخ بووینە، خوێنیان ڕشتووە، بەشداری ڕاپەرینو بەرگریەکانی دوای ڕاپەڕینیان کردووە بەکردە، بەڵام بە گوتە کەمیان لەسەر کوردستانو چارەنوسەکەی وتووە، بۆیە بەشێکی زۆر لە عەلمانی بۆ هێنانی سوپای داگیرکەر بۆ سەر کوردستان یان لە کیمیایی و ئەنفال بەشدار بووە کەچی مزایەدە لەسەر ئیسلامیەکان دەکا، ئەگەر سەرنج بدەیتە ئەو گوفتەیەی (نووسەری حیزبی شیوعی کوردستان کە لە ژمارە-٤٧-ی هەفتەنامەی هاوولاتی هاتبوو) دەڵێت: ئێمە بە ئەندازەی دوورو نزیکی ئیسلامیەکان لە کوردایەتی لێیان نزیك دەبینەوە .

لە کاتێکدا حزبی شیوعی کوردستانی نەبووە، عێراقی بووە، چونکە کوردستانی بە نیشتمانی سەربەخۆ نەزانیوە، ئینجا لەسەر دیوارەکانی شارەکانی کوردستان دەیاننووسی (کوردایەتی شەرمەزاریە).

## یەکێتی نیشتمانی و عەلمانیەت:

لە جیهانی ئیسلامی هەندێ گەلالەی کۆمەڵایەتیو سیاسیو نیشتمانی هەیە لەلایەن عەلمانیەوە دەخرێتە ڕوو کە زۆربەی دەستورەکانیشیان بە هۆیەوە پێ دارشتووە، ئەوانە دەڵێن ئێستا هەموو نیشتمانێك لە چەند ئاین و مەزهەب و تایفە پێك هاتوو، ئیتر هەر دەسەڵاتێکی تری غەیرە عەلمانی بەکەسەر دەبێتە پارچە پارچەو یەکێتی نیشتمانی تێك دەچێ، بۆیە بنەمای عەلمانی دەبێ لە (ثوابت)ەکان بێ، بەهۆیەوە دیکتاتۆریەت پەیڕەو دەکەنو زل هێزانی جیهانیش بە

ڕاگەیاندنو کردەو گۆتە تا ڕادەیەکی زۆر پشتگیری لەو گەلاڵەیە دەکەن، بەتایبەتی لەنێو جیهانی عەرەب.

بەڵام ئەگەر سەرنجێکی بەدیقەت تری بدەینە ئەو گەڵاڵە دەبینین :

١. زۆربەی ئەو وڵاتانەی یەکێتی نیشتمانی تێك چووەو پارچە پارچە بووینە هەر عەلمانی دەسەڵاتدار بووە، جەنگە تایفیو ئاینەکانی: لبنان، چاد، ڕاوندا، بوروندی، ئەنگولا، سۆمال، یەمەن، ... هتد لەو سەردەمەدا، دیسان پارچە پارچە بوونی یەکێتی سۆڤیەت، یۆگسلاڤیا، چیکوسلوڤاکیا، .. هەر لەسەر دەستی دەسەڵاتی عەلمانی بووە، یەك نمونە هەیە لە ئەزموونی ئیسلامی ئەویش ئەفغانستانە کە بووە جەنگی ناوخۆی ئەویش لە پێشدا لە ئەزموونی حزبی شیوعی ئەفغانستانیش کە زل ترین هێزی لە پشتەوە بوو، کەچی ئەك کۆمەڵگەکە خودی حزبی شیوعی بوونە دوو باڵ (پەرچەم) و (خەلق) و لە ملمڵانێی خوێناوی بون، هەردوو سەرکردەشیان (نور محمد تراقی، حفیظ الله امین) کوژران، ئەوە یەك سەدەیە عەرەب پەیرەوی عەلمانیەت دەکا کەچی هێشتا لەو (٢٢) پارچەیە ڕزگار نەبووینە، ئەو جیهانە پڕیەتی لە نموونەی پێچەوانە.

٢. ئەو گەڵاڵەیە پشت دەبەستێت بە ماناو بوونی نیشتمانێك کە ئیمپریالیزم وای دروست کردووە کە ئەو سنورە لەسەر بنچینەیەکی کۆمەڵایەتی سیاسی، ئاینی، جوگرافی، مێژووی، ... ڕاستو ڕەوا نەبێت، ئەوەك ئارامی وەرگری،... نەهاتووە پشت بەمانایەکی ڕاستەقینەی نیشتمانی سروشتی ببەستێت (کە هەیە) بۆ دەستکاری ئیمپریالیزم.

٣. ڕاستە لە هەندێ وڵات دەبینی لەژێر دەسەڵاتو بنەمای عەلمانی ئارامە، لەوانە تورکیا بە نموونە ... بەڵام بەزەبری ئاگرو ئاسن وەستاوە قەدەغەی زمانی زك ماکی کوردی کردووە، لە عێراق گەیشتە ڕادەی کیمیایی بەکارهێنان لە وڵاتە دکتاتۆریەکانی تریش بەو شێوەیە، لە یوگوسلاڤیا هەموو لایەك تێکگیران لە شەڕێکی درندانانەدا، نەك هەر دکتاتۆری زۆر جار لەناو جەرگەی

ديوكراسيش ئەو تێكگيرانە ڕوودەدات لە لوبنان لە نێوان مەسيحىو ئيسلام مەسيحى خۆبەخۆ، ئيسلام خۆبەخۆ بە هەموو ئاراستەيەك، لە هيند لە نێوان سيخو هيندۆس، ئيسلامو هيندۆس هەموو لەگەڵ هەموو، سۆماڵ يەك نەتەوەيە يەك مەزهەبەو ئاينن كەچى هەر هۆزێك دەسەڵاتو نيشتمانێكيان بۆ خۆ جيا كردۆتەوە هەمووش دەسەڵاتى دەستورى عەلمانى بووە، سەربارى نموونەكانى بورندى، رواندا، چاد،... ئينجا كێشەكانى نيشتمانى لە ولاتە هەرە ديوكراسىو عەلمانيەكانى وەك: (فەرەنسا- كورسيكا)، ( ئيسپانيا، باسك)، (بەريتانيا، ئيرلەندا)، (هەردوو ئەمريكاو ئوسترالياـ لەگەڵ دانيشتوانى ڕەسەنەكەى)، (سريلانكا، تاميل)، (هيند، كشمير)، (قوبرس)...هتد.

٤. ئەو يەكێتى نيشتمانيەى ئێستا هەيە، لەسەر فەرهەنگو گەلالەى ڕەگەزپەرستىو زەبرو زەنگى پێچەوانەى بنەماكانى مافى چارەى خۆنووسى ميللەتان دروست بوە، كە ئاينو ياساى نێودەوڵەتى هەموو ياسايەكى مرۆڤايەتى دانى پيا هێناوە.

٥. كەواتە دەسەڵاتى عەلمانى لەو گەلالەيدا ئەگەر چى جياوازى ئاين و مەزهەب ناكا، بەڵام لەو لايە ناتوانێ نەتەوەو نەژادە جياجياكان بسازێنێت لە چالاكيە تايبەتيەكانى، واتە هەر دەبێ دكتاتۆرى بێت، بەو شێوەيە ئەو گەلالەيە لە مەبەستو ڕێرەودا دكتاتۆريانەيە، ڕاستە لە هەندێ ولاتى تەواو ديوكراسى توانيويانە ئەو يەكێتى يەى نيشتمانى بە ئارەزوو مەندانە بچەسپێنن بەهۆى دارشتنى مافى هاوولاتى لە جياتى مافى هاونەتەوەى و هاوئاينى، وەك لە كەنەدا بينيمان لە ساڵى ١٩٩٨ هەرێمى كيبك- كە فەرەنسى زمانن جيان لە كەنەدى زمان ئينگليزى - بە هەڵبژاردنێكى ئارەزومەندانە لە ٥١٪ دەنگيان بۆ مانەوەدا لەگەڵ كەنەدا، لە ئيسلاميشدا مادام فاكتەرى شاقۆلى كاريگەرى نەمێنێ ئەو كێشانە ئۆتۆماتيكيەن چارەسەر دەبێ، كێشەى فرە ئاينيش لە ئەزموونە كۆنەكانى خەلافەتى ئيسلامى بە ساناى چارەسەر كراوە مادام مافى

هاوولاتی بەند نەبێت بە ئایدۆلۆجیاو عەقیدەو ئینتمایەکانی تر، بۆیە دەبینین هەموو کەمایەتیەکی مەسیحی، یەهودی، ئاگر پەرست، گا پەرست، ... بەسەر بەستی لەناو خەلافەتی ئیسلام ژیاون بۆ ئەمەی بچەوسێنرێنەوە بەو ناوە، با سەرنج بدەین دوای ئەوەی قوبرس لە ١٥٧١ لەلایەن عوسمانیەکان گیرا سەربەخۆیی تەواو درابوە کنیسە لەلایەن باب العالی، ئوسقف وەك نوێنەری میللەتی رۆمی ئەرسەدۆکس دووەمین کەسێتی دانرا لە ساڵی ١٧٥٦ لەسەردەمی سوڵتان محمدی دووەم، دوایش لە ١٨٥٦ لە سەردەمی عبدالمجیدی یەکەم ئەنجومەنێکی ئیداری دادگای پێك هێنرا لە چوار ئەندام لە تورکی ویۆنانی[1] ئەمشە دوەم کەسێتی ئەو ئەنجومەنە بوو لەدوای والی، ئیتر ئەو گیرو گرفتانەی تایفی و مەزهەبی و ئاینی لەنا دادگەری دێت جا هەر لایەك بن ٠

[1] موسوعة السیاسیة ـ٣ کیالی

( ٢٧ )

# جەنگــی ڕەوا الحرب العادلة justice war

جەنگ توندترین ناکۆکیە، ئەوە پێناسەیەکی فەلسەفی گشتیە، پرسـیارێکی زۆر هەیە لەبارەی سەرچاوەو بنەچەی جەنگو سەرەتای پەیدابوونی لـە شێوەی: ئایا هۆکاری بنـچینەی جـەنگ کامەیـە؟ جـەنگ هـەر هـەبووەو هـەردەمێنێ؟ جۆرەکانی جەنگ لەگەڵ گەشەی مێژوو گۆڕاون؟ تەرازوویەکی چەسپاو بۆ ڕەوایـی و ناڕەواییەکەی هەیە؟ بۆچی ئەو زاراوەیـە لـە فەرهـەنگی سـەربازییەوە پەڕیتـەوە فەرهەنگی سـیاسیش؟

هەڵبەتە هەر مەدرەسـەو سیـستەمێك بـە جۆرێك وەڵامـی ئـەو پرسـیارانە دەداتـەوەو ڕوانگـەی جیاجیـای بـۆ دروسـت دەبـێ، هەریەکـەش گـوزارش لـە بەرژەوەندی مەدرەسـەیەك دەکا، بۆیە ئـەو زاراوە زیـاتر سیاسـیە نـەك سـەربازی (معجم الحديث للتحليل السياسي) بەو ڕوانگـە پێناسـی جـەنگی کـردوە: (حالـة صـراع بـين كيانـات سياسـة حـادة) (قـاموس الـسياسي)یـش دەڵـێ: (الحـرب في الاصطلاح الدولي، صراع مـسلح بين دولتين او فـريقين مـن دول ينـشب لتحقيـق مصالح وطنية).

## سـەربردەو سـەرچاوەکـانی جـەنـگ:

جەنگ بەشێکە لە مێژووی مرۆڤ، بۆیە زۆربـەی دەیگێڕێتـەوە بـۆ سـەرەتای مێژووی کوشتاری نێوان (قابیل و هابیل)، جار وایە زێدەڕەوی تیا دەکەن و دەڵـێن ئەو کوشتنە یەکەم جەنگی جیهانی بوو، بەشێکی تر دەیگێڕنەوە بۆ ئەو مێژووەی

کە کۆمەڵگەی چینایەتی پێ دروست بووە، واتە بە پێ ی ئەو تیۆرە ( ئەوە تیۆری مادیە کانە - بەتایبەتی مارکسیەت) جەنگ بەند بووە بە قوناغێکی مێژووی، بەشێك لە ئەنسروپۆلۆجیەکان دیاردەی جەنگ و ئەو دڕندایەتیەی لەگەڵیەتی دەدەنە پاڵ کۆمەلگای سەرەتای[1]، (سپنسر)یش دەڵێ:(مانای گەشە کردنی کۆمەڵ بریتیە لە: وەرچەرخانی کۆمەڵگەیەکی دامەزراو لەسەر جەنگ بۆ کۆمەڵگەیکی دامەزراو لەسەر پیشەسازی)، بەشێکی تر لە (تەتەوریەکان) پێ یان وایە هەر خودی مرۆڤ نەوەی ئاژەڵە بۆیە غەریزەی پەلامارو جەنگ خوازی هەیە، بەشێکیش لە تریزۆرە دەرونیەکان پێیان وایە سەرچاوەی جەنگ دەگەڕێتەوە بۆ نەگونجانی ئارەزووە جنسیەکان، لە هەموویان بەناوبانگ تر ڕای مارکسیەکانو بەشێکی زۆریش لە ئابووری ناسەکانە دەڵێن:جەنگ بەهەر هۆیەك‌و لەژێر هەر ناوێك ڕووبدا لە دوا هۆیدا هەر بۆ فاکتەری ئابووری دەگەڕێتەوە، لەوێش ڕا جەنگەکە هەر چونێك بێت هەرلە ماهیەتدا بۆ جەنگی چینایەتی دەگەڕێتەوە با لەسەر خانیشدا ناوو هۆی تریش هەڵگرتبێ، جەنگی چینایەتی جەنگێکی ئابووری یە لەو بارەیەوە (ماوتس تۆنگ کە زیاتریسپۆرە لێی ) دەڵێ:(جەنگ بۆ یەك چرکەش لە ئابووری جیا نابێتەوە)[2]، بۆیە دەڵێن جەنگ لەگەڵ پەیدابوونی چینایەتی پەیدا بووە بە نەمانی ئەو چینایەتیەش (لە شیوعیەت) بەیەك جاری بنەبڕ دەکرێ .

ئەوە کومەڵێك ڕاو بوچوون بوو لەو بارەیەوە، لە ڕاستیدا جەنگ بە جمکی لەگەڵ مرۆڤ هاتوود، قوناغی نیە مادام ڕەگو ڕیشەکانی دەگەڕێتەود سەر دەروونی مرۆڤە کە هەردەم پێك هاتووە لە (جووتە دوودژ ـ زوجی-دیاد)ی (خێرو شەر)، (نەرم ورەق)، (بەبەزەی و توند)، (دەروون و ڕەوشت)، (مادی وگیانی)، (ئاسویی وشاقوڵی)، .. ئەو کۆمەلە دژانە سەرەنجام سروشتێکی تایبەتی وئالۆز

[1] مقدمة في الانثرو پولوجيا الاجتماعية

[2] بۆ زیاتر سەرنج بدە: أ- رأس مال ـ مارکس ب - في التناقض - ماو

بۆ مرۆڤ دروست دەکات، یەك پێوەر ناتوانێ لەهەموو بارێکدا ئەندازە کێشی ئەو سروشت تەبیعاتەی مرۆڤ بەووردی بکا ، هەربۆیەش کێشەی هۆیەکانی هەلچوونی مرۆڤ و بەجەنگ هێنانی ئالوز بێ، جا مەرج نیە ئەو جەنگە هەر بە هۆی ئابووری یان جنسی بێت، زۆر شێوە جەنگی تر هەیە، لەوانە: دەسەلاتەو زالیەتی، عەقیدەو بیروڕا، نەریت و چینایەتی، خێلەکی، ناوچەگەری، نەژادی، نەتەوایەتی، ... زۆر جۆری تر لەجەنگە نوێیەکانی یاسایی، دەولـــــــــی، ڕزگاری، .... مەرج نیە یەك هۆکار -لەوانەی سەروش- پەیدا کەری جەنگ بێت، جار وایە کۆمەلێك هۆکار لەوانە کەلەکە دەکەن هۆکارێکی دوای دەبێتە بەهانەو جەنگی ڕاستەوخۆی پێ هەلدەگیرسێ، لەو کاتە هۆیەکانی جەنگ بۆ هۆیە ڕاستەخۆو ناڕاستەخۆ کان دابەش دەکرێت، هەموو ئەو هۆکارانەی جەنگ کە لە سەروو ڕیز کراون دوو بەشی سەرەکین : یەکەمیان، هۆکارە شاقۆلیەکان، دووەم هۆکارە ئاسۆییەکان، بەهەمان هۆش جەنگی شاقۆلیی وجەنگی ئاسوی لێ دروست دەبێ، جەنگە شاقولیەکانی وەك: جەنگی خێلەکی، نەژادی، نەتەوەگەری، ناوچەگەری، بنەمالەی، ڕەچەلەکیەکانی تر...) لەلایەن زۆریەی ئایدولوژیە مرۆڤایەتیەکان وەك ئاین ئاسا بەجەنگی ئارەوا (دواکەوتەی) لەقەلەم دەدەن ئەگەر بەرگری نەبێ، بەلام لەسەرجەم جەنگەکان جەنگی بەرگری وجەنگی دەست درێژ کار وەك یەك نین، جا ئاسنامەیان هەر چیەك بێت، چونکە بەرگری کەر بەرپرس نیە لە جەنگ وسەرەنجامەکانی ، ئەو مەسەلە کوردی یە تەواو ڕاست نیە کە دەلێن،(چەپلە بە دەستێك لێنادرێ) بەمانای لە جەنگا هەردوولا لێ ی بەرپرسیارن، ڕاستە لە ئاشتیا بە هەردوولا نەبێ ناکرێ بەلام جەنگ بەیەك لاش دەکرێ، بەتایەتی هەندێ مدرسەو سیستەم جەنگ بە (دەرمانی مێژوو) دەزانن، لەوانە ماوکسیەت لە بارەی جەنگی چینایەتی هەروەها تیۆرەکانی یەهودی لەبارەی جەنگی (هرمجدون)، جا لەو کاتە لایەنی بەرامبەر چی بکا، لەو سەردەمەش گەلێ جار دەبینین یاسای نێو دەولەتی بەرانبەر جەنگێك دەکەوێتە

قەیرانی بێ وەڵامی ئاخۆ کامیان دەست درێژکارە ؟ لەبەر پاراستنی بەرژەوەندی ناوێرێ وەڵامێکی بێ پێچ وپەنا بدەنەوە، لەهەمان کاتیشدا تێکرای جەنگ سەلبی نیە هەروەك تێکرای جەنگیش ئیجابی نیە، ئەگەر لای بەرگری کەر (نەك دەست درێژکار) کەمێك بەرنامەیەکی مرۆڤایەتی هەبێ ئەوا زۆر بەسانای وەسفی ئەو جەنگە دەگۆڕێ، ناشێ بلێی ئەو جەنگە شاقۆلیە، ئەو وەسفانە دەبنە وەسفێکی عەوام، وەسفی ورد لەو کاتی وادەبێت دەست درێژکار جەنگێکی شاقۆلی دەکاو بەرگری کەریش ئاسۆیی، بۆیە دەبنە دوو جەنگی مەدرەسی و شارستانی ولێك جیاش، ... بەو شێوە جەنگی بەرگری دەگاتە پلەی جەنگی ڕەوا، ئەوا ئەگەر بەرنامەی سیاسی لایەنی بەرگری زیاتر بەرەو دادگەری بێت، چونکە لەنێوان ئەو هەموو جەنگە هەر جۆرێك لە جەنگی ڕاست و دروست هەیە، کە پێ ی وتراوە "جەنگی ڕەوا"، کەواتە جەنگی ڕەوا دۆخێکی تایبەتی بە لە جەنگە ئاسوییەکان، لە بنەچەدا ناوی (جەنگی ڕەوا) بۆ ئەوە هاتووە تالە جەنگەکانی تر جیا بکرێتەوە، کە بە جەنگی نارەوا ناوزەد دەکرێ، دیسان هەر مەدرەسەو سیستەمێك بەپێ ی ناوەرۆکی ئایدۆلۆژیاکەیان یەکێ لەو جۆرە جەنگانەی پێ (ڕەوایە)، لەوەوە تێك گیرانی سیاسی و فکری و فلسفی مەدرەسەکان ڕوو دەدا و زاراوەی (جەنگی ڕەوا)ش دەبێتە زاراوەو چەمکێکی سیاسی.

## ڕای مەدرەسەکان :

لە کاتێکا لیبرال دیکراسەکان و ڕۆژئاوا هەموو ئەو جەنگ و دەست درێژ کاریانەیان پێ ڕاستەو ڕەوایە کە لە خزمەتی بەرژەوەندی دابێ، ئیتر هەموو ئەو شێوە پەلامارە ئیمپریالیزمی و کۆکەوژی و وێرانی .. ڕەوای پێ دراوە بە دیموکراسی و مەدەنیانەش، دەنگی زۆرایەتی پەرلەمان ورێکخراوەکانی مەدەنی و مافی مرۆڤیان تەواو هەبووە، بەهێزی یاسای دەستوریشەوە، ئەوە هەموو لەلایەك

لەلایەکی تریشەوە بەهەمان تەرازوو ئەو مەدرەسە ڕەوای بە بەرگری دەدا لە بەرژەوەندی لەدژی داگیرکەران و خۆشی کە ئیمپریالیزم بووە، ئەوەش لە چوارچێوەی کارەکانی مرۆڤە کە هەردەم بەشەکانی ناکۆکە لەگەل یەکتر، هەلبەتە ئەو مەدرەسەیە لەجەنگەکانی ٥٠٠ سالەو ١٠٠ سالەو ٣٠سالەی .. ئەورووپی و لە هەردوو جەنگی جیهانیو جەنگە ڕەگەزپەرستی و ئەژادی وناپارتاید و... جەنگی ئێستای شارستانی بەرپرسیارە .

هەرچی مەدرسەی مارکسیەتیشە تەنیا ئەوجەنگانە بەرەوا دەزانێ کە لە نێوان چینەکان ڕوودەدا، چالە هەر قۆناغێکی مێژووی جۆرێك لە جەنگی چینایەتی نواندووە، لە کاتێکا پێی وایە لە (مشاعة البدائیة) کۆمەڵگەیەکی بێ چین بووە، لەوێ جەنگی چینایەتی نەبووە بەڵکو هەرجەنگ بە گشتی نەبووە، بەڵام جەنگێکی تر لەگەڵ سروشت هەبووە، بە هەمان ڕوانگە لە قۆناغی بەندایەتی تەنیا جەنگی بەندە لە دژی (خاوەن- سادە) پێ ڕەوا بووە، لە قۆناغی دەرەبەگایەتی (جەنگی جوتیار دژی دەرەبەگ) ،لە سەرمایەداری (جەنگی چینی کرێکار لە دژی سەرمایەداری) بەرەوا دەزانێ، لە قۆناغی کۆتایی مێژووشدا کە (سوشیالستی وشیوعیەتە) ئەوا جەنگ بە یەکجاری کۆتای دێت[1]، دیسان جەنگی لە شێوەی ناکۆکی لەگەل سروشت لە پێناو بەرهەم دێتەوە، واتە جەنگی ڕەوا لە ڕوانگەی مارکسی لە کۆتاییدا لە پێناوی نەمانی جەنگە ...، تا ئێرە ڕای مارکسیەت بووە .

هەرچەندە لێرەشەوە وەك پێشتر کەوتۆتە ناکۆکی لەگەل خۆ، چونکە لە لایەك دەڵێ هەموو جەنگەکان لە ماهیەتدا جەنگی چینایەتیە و ڕەوایشی پێ داوە، لەلایەکی تریش کۆمەلە جەنگێك بە جەنگی ناڕەوا دەزانێ، ئینجا ئەو قۆناغانەی مێژوو ودابەشیەکەی ڕاست دەرنەچوو هەتا تەرازوو پێوەرەکانی کە لەسەری بنیات دەنێ ڕاست دەرچێ، ئنجا تاکە نمونەیەك نیە تا بیسەلمێنێ جەنگی

[1] بۆ زیاتر سەرنج بدە کتێبەکانی (مارکسی، ئەنجلس، لینین،تروتسکی، ماوتس تۆنگ ..)

# (٢٨)

## زايــۆنی الصهيونية Zionism

بزوتنەوەیەکی سیاسی یەهودی یە، یەکەم جار لەسەر زاری (ناتـان برنبـاوم - ١٨٩٠) ناوبراوە، زایون شاخێکە لە خوارووی قودس لە فەڵەستین وبـە سـەهیونی لە (تەورات) هاتووە، بـە پێـی (جـدول الـشروح –کتـاب المقـدس) بـە (مدینـە الداود)یش هاتروە بە کۆن ترین گەرەکی ئۆرشلیمی پۆلێن کردووە .

مەبەست لێی شاخی (زایون) بکاتە بەڵگەی گەڕانەوەی خـاکی فەڵەستین بـۆ یەهوودی بەهۆی گرێدانی کەلتوری ئایینی‌و مێژوویی بە بەرنامەی سیاسی، ئـاوا زایۆنی وەك زاراوەو ڕێباز یەکەم جار زیاتر لەناو یەهودی ڕۆژئاوا چەکەرەی کـرد، ئەو داوایەی (زایۆنی) کرا ڕای گشتی بەهۆی هۆنینـەوەی سـەربردەو پـێش بینـی ئایینی، ئیتر بووە بەشێك لـە ئـەدەبیاتی نوسـەرانیان لەوانـە: کتـێبی (بحث عـن الصهیون– هەش کایـشر- ١٧٩٥– ١٨٧٤)، هـەروەها کتێبـی (رۆمـاو قـودس ١٨١٢–١٨٧٥)...، بووە هۆی چەکەرەبوونی شەبەنگێکی ئایدۆلۆژی زایۆنی وەك:

١- یەهود سامیەو ڕەچەڵەکی عیبریەو پاکن پێویستیان بە پاك ڕاگرتن هەیە لە خاك‌و وڵاتێك کە تا ئێستا نیانە.

٢- فەلەستین خاك و وڵاتی دێرینی یەهودو ئیسرائیلە.

٣- دەوڵەت تاکە زامنێکە بۆ کۆل نەبونەوەی یەهود بەهۆی پرۆسـەی (دژ بـە سامیەت).

٤- سەرکەوتنی یەهود لەو دەوڵەتە جیهانیش پێ دەحەسێتەوە .

وەك رێکخستن‌و پەیرەوکردنیش لـە بەرنامەیـەکی سیاسـیدا سـاڵی١٨٩٧ بـە سەرپەرشتی هرتزل - خاوەنی کتیبی (الدولة الیهودیة)- کـۆنگرەی (زایـۆنی) لـە (بازل - سویسرە) جاری رێکخراوێکی زایۆنی درا بە ئامادەبوونی زیـاتر لـە ٢٠٠ نوێنەری جیهانیان، تیایدا بڕیاریاندا فەلەستین بکەنە نیشتمانیان.

## سـەرپردەی زا یۆنـی:

ئەو تەقەڵایە زۆر کۆنـە، پاڵپـشت دەکرێتـە سـەر دەقـی ئـاینی، لـە (کتـاب المقدس- جدول والشروح مادە: اسرائیل) وا هاتووە: بەو ١٠ خێڵەی سەرووی سینا ووتراوە (مملکە اسرائیل) کە دامەزرێنەرەکەی یربعامی یەکـەم لـە دوای وەفـاتی سلێمان پێغەمبەر لە ٩٣٠ پ ز، ناوی فەڵەستینیش بە پێی هەمان سەرچاوە لـە (فلسطیا)ی یۆنانی لە رێی دورگەی کریت هـاتووە، چـەندین جـار بـە هاوبەشـی رۆژئاوا ویستویانە (قودس) بگرن، (٢) جـار رزگـار کراوەتـەوە، یـەکیان لەسـەر دەستی (عمر کوری خەتاب) دووەم جار لەسـەر دەسـتی (صـلاح الـدین ئـەیوبی)، تەقەڵا سیاسی‌و بڕواییەکانیش لـەوەش کـۆنترە، بەشـێك زایـۆنی دەگێرنـەوە بـۆ هەمـان مـەبەستی (ماسۆنی)، بەشی هەرە زۆری فەرهەنگـە باڵاکـان قۆناغـەکانی زایۆنی دەبەستنەوە بە تەقەڵاو بزوتنەوە یەهودیەکانی وەك ﴿بزوتنـەوەی مکـابین- (٥٨٦ /٥٣٨)﴾ پ ز، بزوتنـەوەی ﴿بارکوفیا(١١٨ /١٣٨)﴾ دوایـش بزوتنـەوەی مـوزمن کرینـی، بزوتنـەوە (داڤیـد روسـیل)و قوتابیـانی (سـۆلومون مولـوح ١٥٠٠/١٥٣٣)ز بزوتنەوەی (نـشەبین ئیسـرائیل/١٦٠٤/١٦٥٧)، شـیتای زفـی (١٦٢٦/١٦٧٦)، بزوتنەوەی جولەکە لە رۆسیا ١٨٨٢ ز، .. تا دەگاتـە زایـۆنی نوێی (هرتزل) لەکۆتایی سەدەی ١٩، زۆربەیان داوای گەڕانەوەی (گەلی جـوو)یـان کردۆتەوە بۆ سەر خاکی فەلەستین، لە قۆناغی نوێشدا ئـەو تەقەڵایـە ئامـانجێکی بنـچینەی ئیمپریـالیزمی بـوو، لـە سـاڵی١٨٤٠ دیـسان سـەرۆکی بـەریتانیا (بالمرستون) داوای لە یەهودیەکان کرد کۆچ بکەن بـۆ فەڵەسـتین، بالمرسـتۆن لـە

بیرەوەریەکانی دەڵێ تەقەڵایەکی زۆرمان لەگەڵ (سلطان عبدالحمید)دا بە ماددە فەلەستین بفرۆشێ، قایل نەبوو (سلطان عبدالحمید)یش لە بیرەوەریەکانی و لە نامەکەشی بۆ (محمود ابو الشامات)ئەو ڕاستیە دوپات دەکاتەوە؛ ئەوکاتی هەرێم و مەملەکەتی گەورە کڕین فرۆشتنی لەسەر دەکرا لە نێوان ئیمپراتۆرو ئیمپریالیزمە جۆر بە جۆرەکان، ئەمریکا (فیلیپین)ی لە ئیسپانیاو بە ٢٠ ملیۆن $ کڕی یەوە، دوایی زۆربەی ویلایەتەکانی ئێستای ئەمریکای کڕیەوە، بەریتانیا ڕووباری دیجلەی لە ئیتحادیەکان کڕی، کۆرسیکاش چەند جار کڕین و فرۆشتنی لەسەر دەکرا...، هەر بە پێی بیرەوەریەکانی (بالمرستون) وادیارە (سلطان عبدالحمید)و خەلافەتەکەی زۆریش پێویست بە ماددە هەبووە، بەلام بەهیچ جۆرێك قایل نەبووە یەك بستە خاکی فەلستین بفرۆشێ، ئەو ڕاستیە لەلای زۆر سەرچاوەی جیهانی و خودی یەهوودیش هاتووە، بڕی (٥) ملیۆن لیرەیان بردە پێش عبدالحمید نەیفرۆشت، بەلام دوایی ئیتحادیە عەلمانیەکانی تورك و سەرکردەکانی شۆرشی (مەزنی) عەرەبی زۆر بە هەرزانترو بە بڕی (٤٠٠,٠٠٠) لیرەیان فرۆشت یان بە پێی سەرچاوەی تر بە دوو سینیە زێڕ، ڕووباری دیجلەش بە (٢٥٠,٠٠٠) لیرە فرۆشرا بەریتانیا، لەو سەردەمی یەهوودی وەك پەنابەر لە خەلافەت وەردەگیران بە هۆی ئەو ستەمەی لێیان دەکرا لە ئەورووپا، بەلام دوای ئەو جۆجولە گوماناویەیان سولتان عبدالحمید لە ماوەی (١٠) ڕۆژ سێ فەرمانی دەرکردوو بڕیاریدا چیتر وەرنەگیرێن و بنێردرێنەوە ئەو شوێنەی لێی هاتوون، لە راڤەی فەرمانەکان هاتبوو ئەو جووانە ئەگەر ڕاست دەکەن پلانی دروست کردنی دەوڵەتی موسەویان نیە لە فەڵەستین با بچنە ئەمریکا خاکی بێ نەتەوەی لێیە با ئاوەدانی بکەنەوە، لەو هەنگاوەش عەلمانیە تورك و عەرەبەکان پشتگیری یەهودیەکان بوون، ئەو کاتی بە پێی ڕەچەڵەك عەرەبە عەلمانیە نەتەوەییەکان پاگندەی ئەوەیان دەکرد کە یەهودیش لە ئەسڵدا سامین و لە ڕەچەڵەکی عەرەب نزیکترن بەلام عەجەم لە عەرەب نزیك نیە، بۆیە بەشێك لە عەرەبە عەلمانیەکان دژی ئەو فرمانانەی

عبدالحميد بــوون، یەهودیــەکان پــەنایان بــۆ پــرۆژەو چارەســەری تــر بــردووە بــۆ دۆزینەوەو نیشتمانێك، لەوانەش دوزینەوەی برازیل دوای تورگەندا، ئینجــا كینیــا جار جار تۆز لە عیراقیش، چونکە هەتا بارە هــەرە لاوازەکــانی خەلافــەتیش ئــەو ئاواتەی یەهوودی ورۆژناوا نەدەهاتە دی، بەلام لەگەڵ ســەرهەڵدانی عەلمانیــەت و پەرەسەندنی بیری نەتەوایــەتی لــە جــێی خەلاقــەت و دروســت بــوونی قــەوارەی نەتەوەیی و بەیەکجاری داڕوورخانی خەلافــەت لەســەرەتای ســەدەی بیســتەم ئــەو دەرگا قوفل دراوەیان بۆ کرایەوە، ئیتر کەلەشی نیــشتمانی ئیــسلام کەوتــە ســەر سەفرەی چەندین جۆری ئیمپریالیزمی وەك (قسمەکەی فەرمووده‌کە)، یەکەم جــار ڕێکەوتنی (سایکــس پیکۆ - ١٩١٦) بۆ کێشراو جهانی ئیسلامی پارچــە پارچــە کرا بۆ یەکەم جاریش کوردستان وەبەر ئەو پارچــە پارچــە رەسمیــە کــەوت، وایــان دابەشیەوە تاهەر لە تێك گیران و ناکۆکی ناوەخۆیی بخنکێن و بەسانای پلانی تری داهاتوو جێ بەجێ بکرێ، بەو شێوەیە دروست بوون و داهێنانی ئەو وڵاتانەی وەك عێراق و سوریا تورکیا و.... هتد یەکێ لە مەبەستەکانی جێ گیرکردنــی بــەڵێنی بلفــۆری وەزیــری دەرەوەی بریتانیــا (ئەرشــەر بلفــۆر) لــە ١٩١٧/١١/٢ بــۆ یەهودیەکان درا، کە وڵاتێکیــان لەســـەر خــاکی فلــستین بــۆ دروســت بکــەن، لــە دەرفەتێکی گونجاودا لەبەرامبەر یارمەتیدانی ئینگلیز بۆ شۆرشــی عربــی ١٩١٦ لە دژی خەلافەت ودروست کردنی عێراق و سوریا و.... ئەوا ســەرکردەکانی ئــەو شۆرشەش دان بە بوونی ئیسرائیل و بەلفۆر بهێنن، بــەو پێیــە مــەلیك فەیــسەل عێراقی بۆ دروست کرا وەك دەولەتێکی سەربەخۆ، ملك فیصلیش لەگەل وایزمــان نوینەری یەهودی بە ئامادە بوونی (لورانس) پەیمان نامەیەکی دووقــۆلی لــە١١\٣\ ١٩١٩ لەجیاتی عەرەب مۆر کردو پیك هاتبو لــە ٩مــادە دانــی نــا بــە واقعــی سایکس -بیکو و بەڵێنی بەلفۆر هێناو وایزمانیش مۆرەکــەی لــەجیاتی فلــستین کــردوود -دەقــی ڕێکەوتنەکــە لــەکتێبی( ملــك فیــصل الاول ص٢٨-٢٩) بــە ئینگلیزی وعەرەبی بخوێنەوە.

**دەقی بەڵێنەکەی بەلفـور:**

﴿برام/ للۆرد روتشیلد*، خۆم بە بەختەوەر دەزانم لە جیاتی حکومەتی خـاوەن شکۆ ئەو لێدوانەی خوارەوەتان بۆ بنێرم وەك هاوسۆزی بـۆ خواستەکانی زایـۆنی (یەهودی) کە لە ئەنجومەنی وەزیران پێ قایـل بـوون: (حکومـەتی خـاوەن شـکۆ بەسۆزەوە دەروانێتە گەلی یەهودی بۆ دروست کردنی نیشتمانێکی نەتـەوەی لـە فلستین، بەپێی تواناش هەموو ئەرکەکانیان بۆ دەرەخسێنێ ، دەبێ بشزانرێ مافە یاسایی و مەدەنیەکانی غەیرە یەهودی دانیشتوانی فەلەستین پێ شێل نەکرێ ﴾ ـ براتان ئەرشەر بلفۆر-١٩١٧ .

لە ساڵی ١٩٤٨ ئەو کیانە دروست کرا بە دروشمی (مـن النیـل الی الفـرات)، رۆژهەلات ورۆژئاوا و نەتەوەیکگرتووەکانیش لە ١٩٤٩/٣/١١ دانیان پیا هێنـا، دەقی بەلگەنامەکەی دان پیا هێنانیش لە کۆتای ئەو نوسـینە تۆمـار دەکـەین . ئیتر ئیسرائیل خۆی پرچەك کردو ئەوەی نازیەکان بەوانیان کرد تۆلەکـەیان بەسـەر خەڵکی فلستین دارشت، یەهودی خۆی بەدەست ئایـدۆلۆژیای نـازی گرفتـاربوون، بەلام بەهەمان ئایدولوژیای وەرگێردراو بۆسەر زایۆن کاریان دەکـرد، بۆیـە گـەلێ جار بە(نازیة الصهیونیة) ناویان دەبردن، چونکە نەژادی یەهودی دەخەنە سـەرووی نەژادەکانی تر .. ئەو بیرە لـەوە دێ کـەئاینی یـەهوودی یەکێکـە لـەو ئایناتـەی (مکتسب)نیە ،واتە مویەشیر وەعوەی نیە تاخەڵکی نوێ ی لێ وەرگـیرێ، ئـەو سیفەتە ئاینی تریش هەیە ئاوا رەچەلەکی ومیراتیەوەك زەردەشتی بەنموونە، بـەلام زیندەگیەکەی بێهێزە نەبوویتە ئاینێکی نەتەوەی شۆفینـی ، هەرچـی یەهودیەتـە زیندەگی ئاینەکەیان بەهێزە لەلایەك و لە لایەکی تر خەڵکی تـری لێ وەرنـاگیرێ ئیتر ئـەو هێـزە تیایـدا پـەنگ دەداتـەوە بـۆ رەگەزپەرستیو خۆیـە زل زانـی و پەیدابوونی دروشمی (شعب الله المختار) وەك ناسنامەیان-ئـەو تەقەلایـە لەلایـەن

* : بارون رۆتشیلد رابەری جالیەی یەهودیەکان بوو لە بریتانیا .

عەرەبی شۆڤینیش ئاوا دراوە کاتی دەیانەوێ ئاینی ئیسلام بکەنە مولکی عەرەبو زاراوەی ئوممەی عەرەبیو (أمتی العربیة والاسلامیة) بەکاردەهێنن-، گوایە خەلکی تر هەمووی لەپێناو ئەوان دروست بووینە، دەبێ بۆیان یەخ بکرێن هەروەك لە پرۆتۆکۆلی (١١) حکماء صهیون واهاتوە تیایدا خەلکی تر لەلایەن یەهودیەکان بە (جوویم) یان بە (أممي)، ناودەبرێن، جاران یەهودیەکان بە مسیحەیەکانیان دەووت (جوویم)، دوای هەرچی یەهودی نەبوایە بە (جوویم) ناوبراوە بە مانای نەفامو غەوارە، ئیتر جوویم لە پێناوو خزمەتی ئەوان دروست بووینە وەك مێگەلە مەر هەروەك لە (تەلمود)و (پرۆتۆکۆلات صهیون) و ... زۆر سەرچاوەی تریان هاتووەو بنچینەی (شعب الله المختار) لێرەوە دێ، لەگەل کۆمەلێك بیوورای سەیرتر لە بنەماکانی (حیزبی نەتەوەی ئاین)ی زائیف یهوروداك (١٨٩١/١٩٨٢) هاتووە: ((ان الله یظهر نزول مسیح کخلاص البشر بالمعجزة التالیة: جعل کل اراض تحت سلطة الیهود المقدسة التوراتیة)) ئەوەش مەولەتێکی خوایە بۆ داگیر کردن چەوساندنەوەی میللەتانی تر، هەروەك لە درێژەی ئەو مەبدەئانەی تر هاتووە (وکل تنازل یؤدی الی تأخیر نزول المسیح) ئەو بابەتە مێژوویانە لەگەل چەند بابەتێکی داهاتووی مێژوویانە لە مزگێنی سەرکەوتنی (حەتمی) یەك دەخەن لە داستانێك بەناوی (هرمجدۆن).

## بیرۆکەی (هرمجدۆن):

بیرۆکەی بوونی جیهان لەژێر دەولەتی یەهودیو هاتنەخواردوەی (ح. مسیح) و هەلبژاردنی (شعب الله المختار) (کە یەهودن) بۆ ئەو دەورە گرنگە لەلایەن خواوە بۆ رزگاری بەشەریەتە وەك پێویستیەکی مێژوویی، (هرمجدۆن) بەرزاییەکە لە بەرزاییەکانی (جلیل) لە سەرووی فەلەستین، ناوی راستی دەشتی (مجدو)یە، یەکەم جار ناپلیۆن بینیو وتی ئێرە دوا جەنگی یەکلاکەرەوە بەخۆ دەبینیو جیهانیش کۆتای دێت بە پێی (کتاب المقدس)، هەر ئەو جەنگەشە بە ناوی (هرمجدۆن) لە

تەورات، ئیتر زۆری لەسەر نووسراوە تا ئێستاش لەوانـە: (س.س.کەریس ١٩٧١) سەرۆکی قەشەکانی تەوراتی لە ئەمریکا کە بە رادیکالیە مەسیحیەکانیش ناوزەد دەکرێن، (هال لیندرس -الکرة الارضیة العظیمة السـابقة)... لـە هـەموو ئـەو نووسین‌و پێش بینی‌و مێژوویانەدا دەوڵەتی ئیسرائیل‌و هـاتنی مەسـیح بەیەکـەوە دەبەستـنەوە دژی دکتاتۆران زۆرداران‌و ....، (لیندس) ئەو جەنگەی هەرمجـدۆن بـە (کۆتایی مێژوو) دەزانی،و دەڵێ: تەنها (١٤,٤٠٠) یەهودی لە جیهان دەمێنێـت لە دوای ئەو جەنگە، ئەو تیۆرە ئاینیانە بووینـە بنـچینەیەکی سیاسـی دەوڵـەتی ئیسرائیل‌و پێرەوی دەکەن، سەرنج بدە هەتا (رۆنالد ریگن)ی سەرۆکی ئـەمریکای پێشوو دەڵێ: ئەو نیشانەو مەرجانەی هەرمجدۆن بەدیارکەوتن ماوە (مەسـیح)یـش بگەڕێتەوە، هەروەکە لە (مۆلویل، لندس، روبرتسن،..) زۆری تـریش رایـان وایـە کە هەردوو کتێبی پیرۆزی (مقدس‌و ئینجیل) پـێش بینـی گەڕانـەوەی (عیـسی) دەکەن لەدوای جەنگە ناوکی هەر دەشبێ روویدا، ئینجا مەسیحیش دابـەزێ بـۆ سەرپەرشتی جەنگی هرمجدۆن، دوای ئەویش١٠٠٠ سـاڵ لـە جیهـان حـوکم دەکـا پێش ئەوەی بە یەکجاری مێژوو کۆتایی بێت ... ئـیتر تێۆرەکـەی (فوکۆیامـا)ش هەر لەوبیرە داکانەیە دێت بەجۆرو گوزارشێکی تر کە دەڵێ: (کۆتایی مێـژوو) لـە لیبرال دیموکراسیە، لیبراڵ دیموکراسیش ئەو مبادیئـە ١٠٠٠ سـاڵەکەی تیایـە لـە دیموکراسی‌و بەختەوەری رۆژئاواو شارسـتانیەتەکەیان. ئەوانـە هـەمووی کۆمـەڵـە تیۆرو سەربردەو پێش بینی ئایینی بووە بۆ بیرۆکەی زایۆنی‌و دەوڵەتی ئیـسرائیل‌و پاکی ئەو نەژادەو زیاتر باڵایـیـان لـە خـەڵکی تـر، بۆیـە ئـەو بیرۆکەیـە لەلایـەن جیهانەوە بە جۆرێك بە رەگەزپەرستی وەرگیرا تا ئەو رادەیە لە سـاڵی ١٩٧٥ بـە بریاری نەتەوە یەکگرتووەکانی (ژمارە: ٣٣٧٩) بزوتنەوەی زایـۆنی بەشـێوەك لـە شێوەکانی رەگەزپەرستی ناسرا لە رووی یاساییەوەش، ئـەو کـاتی لـە ئـەمریکاو ئەفریقیا ئەو جۆرە رەگەزپەرستی گەرمەی بوو، بەڵام دوای هەڵوەشانەوەی بلـۆکی

سۆڤیەتی پێشوو لە ساڵی ١٩٩١ جارێکی تر ئەو بڕیارە بە خێرایی هەڵوەشایەوە.

لە بەرامبەر هەموو ئەو هەنگاوانەش ئەیاری نەتەوەگەری عەرەبو دەسەڵاتدارانیان ڕۆژبەڕۆژ لە کشانەوەن، لە ساڵانی دوای ١٩٤٨ بە ئیسرائیلیان دەووت (کیان المزعوم) دوای (کیان الصهیونی) ... بووە ئیسرائیلی ئاسایی، ئێستا تەنها داوای زەوی لەدەستچووەکانی جەنگی١٩٦٧ دەکەنەوە، واتە تەنها بە ئۆتۆنۆمی قایلن .. بەو شێوەیە هەتا عەرەب لە ئیسلام دوور کەوتۆتەوە زیاتر سەر شۆری ئیسرائیل بووینە، لە کێشەیەکی جیهانیو ئیسلامی بەرەبەرە بچووک کرایەوە، قۆناغ بە قۆناغ، بووە کێشەیەکی عەرەبیو ئیسرائیلی، دوایی بووە کێشەی نێوان ئیسرائیلو (جبهة الرفظی) ئینجا (جبهة المواجهة)، دوای هەر دژی (ڕێکەوتنی ئاشتی کام دیڤد).. تا لە دوای هەموو گەڕانەوە ڕیزی کام دیڤید، بووە کێشەیەکی ناوەکی نێوان دەسەڵاتی فەلەستین و ئیسرائیل، ئێستا لە ژێر سیستەمی نوێی جیهانیو لەژێر ڕۆشنایی ئەو دۆخەی عەرەب تیایە قایلن بە هەموو چارەسەریەك، وەك ستراتیژی تاقانە ئاشتی خوازن لەژێر گورزی ئیسرائیلو بەردەوامی تیرۆرەکانی بێ ئەوەی لە هیچ هەنگاوێکی واز بهێنن، تەنانەت عەلمانیەتی عەرەب لە ستراتیژیەکانیاندا ئەوەندە نامۆ بووینە دۆستەکانیان خستە خانەی دوژمنو پێچەوانەش بە پێچەوانە، لە جیاتی ئیسرائیل شەڕێکی ٨ ساڵیان لەگەڵ ئێران کرد، تا ئەو ڕادەیە لە کۆنگرەی ١٩٨٧ عەممانی سەرانی عەرەب بە تێکرای دەنگ (جگە لە لیبیاو سوریا) ئیسرائیل بە هەڕەشەی یەکەم حسێب نەکرا بەڵکو ئێران وا حساب کرا، ئێرانیش لەگەڵ سەرکەوتنی شۆڕشیان، سەفارەتی فەلەستینی خستە جێی سەفارەتی ئیسرائیل، یەکەم جارە عەرەب بتوانن بە سەربەرزیو بێ سەودا خاکی خۆیان ڕزگار بکەن لەسەر دەستی (حزب الله)ی لوبنانی هاوپەیمانی ئێران، کە لە ساڵی (٢٠٠٠) توانی خاکرووی لوبنان ڕزگار بکا بە زەبری چالاکی سەربازی لە دوای (٢٠)

ساڵ داگیرکردنی، بە گەڕانــەوەی عــەرەب بــۆ نــاوەڕۆکی ئیسلام فلــستین ڕزگــار دەکرێتەوە وناشتیەکی ڕاستەقینە لەگەل یەهودیەکان (نەك زایۆنی) دەگەڕێتــەوە، هەردوولا مافی چارەی خۆ نووسیان بەدەستی خۆ هەیــە لەســەر خــاکی ڕەســەنی خۆیان بە پێچەوانەی ڕای هەندێ شۆڤێنی عەرەب کە هەموو یەهود بە دوژمــن و (أبنــاء القردة والخنــازیر) دەزانێ، ئەوەیان لە (مقاصد)ی ئیسلام دوورە، لە کۆنەوە تا ئێستا ئیسلام چاکترین نمونەی پێکەوە ژیانی ئاینە جیاجیاکانی پێك هێناوە.

## دەقی بەڵگەنامەی دان پیا هێنانی نەتەوەیەکگرتووەکان بە ئیسرائیل :

وثیقة القرار ٢٧٣ـ١٩٤٩/٣/١١ قبول اسرائیل عضو فی امم المتحدة ... تقرر ان اسرائیل دولة محبة للسلام، لذلك نقرر ان تقبل عضواً فی امم المتحدة:

**لایەنگری بڕیار:** ئەرجەنتین، ئوسترالیا، بۆلیڤیا، بیلۆروسیا، کەنەدا، تــشیلی، چین، کۆلومبیا، کوستاریکا، کۆبا، چیکۆسلۆڤاکیا، دومنکان، ئیکوادور، فرنسا، گواتیمالا، هایتی، هندۆراس، ئایسلاند، لیبیریا، لوکمبۆرك، مکسیك، هۆلەنــدا، نیوزیلاند، نیکاراگوا، نەرویج، پەنەما، پاراگوای، پیرۆ، ڤلیبین، پۆلەندا ئۆکرانیا، جنوب ئەفریقیا، یەکێتی سۆڤیەت، ئەمریکا، ئورگوای، ڤەنزویلا، یۆگوسلاڤیا .

**دژەکان :** ئەفغانستان، بۆرما، میــسر، حەبەشە، هند، ئێران، عێــراق، لبنــان، پاکستان، سعودیە، سوریە.

بێ دەنگ : بەلجیکا، بەرازیل، دانمارك، سلڤادور، یۆنان، سیاح، سوێد، ترکیــا، بریتانیا ..

بەو شێوەکۆی (٣٧) دەنــگ بەرامبــەر ١٢ دەنــگ دژو ٩ دەنگــی بــێ لایــەن ئیسرائیل وەك دەوڵەتێکی ئاشتیخواز بووە ئەندام لــێ.

بۆ زیاتر لە باسی زایۆنی ئەو باسانە سەنج بدە أــ موسوعة الــسیاسیة ب ــ موسوعة الادیان ج ــ معجم دیانــات واســاطیر عالمیــة د ــ اســاطیر المؤســة ـ غارودی

(٢٩)

## تیــرۆر الارهاب terrorism

لە کۆتایی سەدەی ١٩ لە نێوان ساڵانی (١٨٩٤ تا ١٩٠١) پێنج سەرۆک تیرۆرکران، بریتی بوون لە سەرۆک‌و شای: (فەرەنسا، نەمسا، ئیسپانیا، ئیتالیا، ئەمریکا)، دوای لە ساڵی ١٩١٤ جێنشینی نەمسا (ئەرشیدوک فردیناند)و خێزانەکەی لەلایەن (پرانسیپ–قوتابیەکی سربی سەر بە ڕێکخراوی -کف‌الاسود- بوو) تیرۆرکران‌و جەنگی جیهانی یەکەمی لێ هەڵگیرسا، ئیتر ئەو ڕووداوانە بوونە هۆی لێکۆڵینەوەی لە زاراوەی تیرۆر، لە سەردەمی (عصبة الامم)یش لە ساڵی ١٩٣٤شای یوگوسلاڤیا (ئەلەکزەندەری یەکەم) تیرۆرکرا، لەگەڵ زۆر ڕووداوی تر دژ بە دەسەڵات وایکرد تیرۆری دژ بە دەوڵەت ببێتە مادەی لێکۆڵینەوە وەک بەندێکی یاسای نێو دەوڵەتی، بۆ یەکەم جاریش لە مادەی (٢)ی (عصبة الامم) سیفەت‌و سروشتی تیرۆر دیاریکرا، ئیتر بووە مادەیەکی نێودەوڵەتی.

ئەگەر چی (تیرۆر) وشەیەکی لاتینیە، بەڵام لەو سەردەمە بە هەموو زمانەکان بەکاردێت، یان لە هەندێ زماندا وشەیەکی هاوتایان بۆ داتاشیوە، لە عەرەبیدا (ارهاب)یان لە بەرامبەر داناوە، بەڵام تەواو ماناو مەبەستی تیرۆر- بە مانای ڕەشەکوژی- نادا، ئیرهاب بە تۆقاندن‌و زەندەق بردن دێت، یان وەک لە فەرهەنگی (اعرف مذهبك)دا هاتووە ئیرهاب زیاتر لە (Totalitarzm) نزیک ترە، واتە مەرج نیە ئەنجامی کردەوەکەی دابێت، لە کاتێکدا تیرۆر- لە مانای ئێستادا- بە کوشتن‌و ئەنجامدانی کردەوەکەی دێت، وەک لە دوای زیاتر دەردەکەوێ جیاوازیان هەیە.

تیرۆر( به تایبه‌تی تیرۆری سیاســی) زۆر مـشت و مـڕی لەسـەره لـه بـارەی: بنه‌چه‌کەی، شولیه‌تی، ناسنامه‌ی...ئایا هەر دیارده‌یـه‌کی کۆمه‌ڵایـه‌تی و زاده‌ی لایه‌نی شەڕی ئاده‌میزاده یاخود سروشتیه‌و ره‌سه‌نایه‌تی خۆی هه‌یه؟ په‌یوه‌سته بـه قۆناغێکی مێژوویی یان بـه تـه‌ریبی لەگـه‌ڵ مێـژووی مـرۆڤ هـاتووه؟ هه‌میشه سه‌لبیه یان جار جاریش ئیجابیاتی هه‌یه؟ ئایا جیاوازی له نێـوان تـیرۆر وتـیرۆری سیاسی هه‌یه؟ که‌واته تـیرۆری سیاسـی لـه کەیـه‌وه په‌یـدابووه‌و کـێ هه‌میشه‌و ئێستاش به کاری ده‌هێنێ؟ ئایا تیرۆر ناسـنامه‌ی هه‌یـه؟ پێنـاس و نیـشانه‌کانی چیه؟ بۆچی تا ئێستا پێناسـه سیاسیه‌کانی به پێی ئه‌و یاسا(ناداد‌گه‌ریانه‌ش) هـه‌ر نه‌خراوه‌ته قاوغێك؟ ئایا پێوانه‌ی کۆتایی بـۆ دیـاری کردنـی کـاری تیرۆرسـتی و تیرۆر چیه؟ ...

که‌م زاراوه هه‌یه به ئه‌ندازه‌ی تیرۆر مشت‌ومڕو قه‌باره‌ی جیاوازی هـه‌ڵگرێت، هۆیه سه‌ره‌تاکه‌شی بۆ ئه‌وه ده‌گه‌ڕێته‌وه که زاراوه‌یه‌کی زیاد له پێویست سیاسیه، زاده‌ی جم و جۆڵی به‌شه‌ری و رۆژئـاوای دووره ئاینیـیـه، کـه‌متر بناغـه‌ی فکـری هه‌یه، بۆیه بواری لێك کێشانه‌وه‌ی به‌و سه‌رو به‌م سه‌ر گه‌لێك زۆره، هـه‌تا سـاڵی ١٩٨٣ (٩-٢) پێناسـه‌ی ره‌سمی جیاجیای لێ تۆمـار کـراوه[1] ،ئێـستا گه‌یـشتۆته هه‌زاران، به پێچه‌وانه‌ی چه‌مکه ره‌سه‌نه‌کان کـه داکـوتراوێکی فکـری و شـه‌رعی هه‌بێت که‌متر ده‌توانرێ ئه‌وه‌نده مانا جیاجیایه هه‌ڵگرێ.

## بنه‌چـه‌ی تیرۆر:

له سه‌رچاوه‌و فه‌رهه‌نگه کۆن و نوێکانی رۆژهه‌ڵاتی و رۆژئاوای وه‌ك زه‌مخشری، ابن کثیر، لسان العرب، فه‌رهه‌نگی فه‌ره‌نسـی ١٩٦٤، فه‌رهه‌نگی ڤـۆلتێر(١٧٠١) فه‌رهه‌نگی ریشیله ١٧١٩ ..تا ده‌گاته فه‌رهه‌نگی جۆزی ١٩٣٩و دائـره المعـارف

---

[1] بۆ زیاتر بروانه: موسـوعة العربية- بابه‌ت: الارهاب الدولي.

١٩٧٣، موسوعة العالمية، (G.b.Encyclopidioe)ی بریتانیاو فەرهەنگی بەناوبانگی ئۆکسفۆرد.. هەمووی مانای تیرۆرلەسێ خاڵی سەرەکی کۆدەکەنەوە :

١- مانای ترس و توندوتیژی و تۆقاندنی سایکلۆجی.

٢- دەسەڵاتداران و خاوەن هێزەکان لە دژی خەڵکی لە خۆیان بێ هێزتر وەك (تۆقاندن) بەکاریان هێناوە.

٣- هەندێ جاریش بە ڕەفتاری لەشکری داگیرکەر یان داگا بێ بەزەییەکانیش وتراوە تیرۆر.

کەواتە زۆر کۆنە، بەڵام وەرگەڕانی لە مانایەکی: کۆمەڵایەتی بۆ سیاسی، لە سایکۆلۆجی بۆ ئایدۆلۆجی، لە تاکی بۆ کۆیی .. ئەوا هەمەوو توێژینەوەکان یەك ڕان کە لە دوای شۆڕشی فەرەنسی ١٧٨٩ هاتووە کاتێ (ڕۆبسپیر، گۆستر، گۆدون) لە ٢ ساڵی فەرمانڕەوایان بە ناوی دروشمەکانی شۆڕش و ئازادی کۆمەڵێك فەرمانی (تیرۆرانەیان) جاردا، بەسەرەدێری (شمشێری یاسا لەسەر ملی تاوان باران) لە دژی ناحەزانی شۆڕش یان ڕاست تر بڵێین وەك ئێستا ناسا (لە دژی دەسەڵاتی خۆیان) کە بەرەسمی لە ئەنجومەنی نیشتمانی ودەزگا مەدەنییەکانی فەرەنسی دارژا، پێیان دەوترا (پەیڕەوانی ئایدۆلۆژیای چاکۆبیان)، لە دوای کەوتنی (ڕۆبسپێر) بە (٢) ڕۆژ لە ١٧٩٢/٧/٢٩ لە گۆڕەپانی شۆڕش بە تاوانی (تیرۆریزم) لە سێدارەدرا بە هەمان ئەو (مەقسەلەی) کە هاوڵاتی و تێکۆشەرانی پێ لە سێدارە دەدرا، ئیتر لە دوای ئەو ڕووداوە چەمکی تیرۆریزم باوی وەرگرت و لە دیاردەیەکی سایکلۆجی پەڕیەوە بۆ سۆسیۆلۆجی، لە تاکەوە بۆ کۆ، لە ڕەمەکیەوە بۆ ڕەسمی، لە کۆمەڵایەتی بۆ سیاسیشەوە،.. لە سەدەی ڕابردووش زیاتر بە فاشیەکان دەوترا تیرۆریزم وەك لە فەرهەنگی ئەو سەردەم دەردەکەوێ، بەڵام سیاسەتمەدارانی جاران (تیرۆری سیاسیان) بە گشتی دەدا پاڵ ڕارەوی میکافیلی، چونکە ناڕەواترین ئامرازێکە کە پێی بگەیتە ئەنجام و تەنهاش لە ڕارەوی میکافیلی بۆ کاری سیاسی حلال کراوە ...لە هەموو بارێکدا ئەسڵەکەی

لە تۆقاندنی خەلکی یەوە هاتووە لە لایەن کاربەدەستان و تاوانباران، بۆیە هەموو فەرهەنگەکان تا دوای نیوەی سەدەی (٢٠)یش بەو شێوەیە تیرۆریان راڤە کردووە، هەر بە نموونە (قاموس السياسي) لە سالّی ١٩٦٧ نووسراوە پێناسی وەك خۆی ئەوەیە: (محاولة نشر ذعر والفزع لاغراض السياسية والارهاب وسيلة تستخدمها حكومة استبدادية لإرغام الشعب على الخضوع والاستسلام لها أو على شعب من شعوب لإشاعة روح الإنهزامية) لە دوای ١٩٧٠- ١٩٨٠ گۆڕدرا زیاتر بە بەرگری میللەت دژی دیکتاتۆر وتراوە تیرۆر بێ ئەوەی ناو و هۆی (کردەکە- فعل) بەیان بکرێت کە دەسەلأتە دیکتاتۆریەکانن، لە راستیدا لە ریزی میللەت و بێ دەسەلأتانیش کاری تیرۆریستی هەیە. بەلأم زۆربەی کاردانەوەی هەلسوکەوتی دەسەلأتدارانە، لە سیستەمی نوێ زیاتر لە(کار) باز دەدەن بۆ سەر (کاردانەوە) و دەیخەنە ژێر میکرۆسکۆب و دوایش دادگا، تێکەلیەکی نارەوا هەیە لە سنور و ماناو چەمکەکان، پێویستی بە لێك جیاکردنەوە هەیە، لەلایەك کۆمەلێك بریاری یاسای نیو دەولەتی هەیە سەبارەت بە بەرگری گەلان لە مافی چارەی خۆ نوسی وەك: پەرەگرافی (٣)ی مادەی (١)المقاصد، بریاری ژ:١٥١٤ی خولی(١٥)ی سالی١٩٦٠ز، وە بریاری ٢٦٢٥ی ٢٤\ئەکتوبەر\١٩٧٠وتیایدا مافی بەرگری چەکداریشی دا، زۆری تریش بەلأم گەلی جاریش لەگەل تیرۆر تێکەلّ کراون .

## ئیرهاب، تیرۆر، توندوتیژی؛

ئەوانە بە گشتی لێك جیان، لە فەرهەنگی میللەتە تێکشکاوەکانی جیهانی سێیەم بە حوکمی لاسایی کردنەوە و کلکایەتی هەرسێك تێکەلّ کراون، لە کۆتاییدا ئێمەین زەرەرمەند تیایدا، چونکە تێکەلّ کردنی چاك و خراپە، رەسەن و نارەسەن، یاساو نایاسایی، .. لە کاتێکدا تیرۆر بەو مانایەی ئێستای "رەشەکوژی"، سەلبیە، زۆر جیایە لەگەلّ توندوتیژی و ئیرهاب (نەك ئیرهابی سیاسی)کە ئەو دووەی دوای مەرج نیە هەموو دەم سەلبی بن، جار وایە زۆر

پێویستن، له سنوری خۆشی یاسایه‌كی گـه‌ردوونی و سروشـتی و مرۆڤایـه‌تی یـه، وه‌ك له خواردوه به خێرایی باسی ده‌كه‌ین:

## * ئیـرهاب له بوونه‌وه‌ر:

ئه‌گه‌ر ئیرهاب به‌و مانایه‌ی (گۆڕانێكی توندو تیژ) بێت، ئه‌وا سـاناتر لایـه‌نی سه‌لبیو نیجابیه‌كـه‌ی لـه زه‌مـان و زه‌مـین و ناراسـته‌كه‌ی ده‌رده‌كـه‌وێ... لـه‌و بوونه‌وه‌ره‌دا (به گه‌ردوونو سروشت و كۆمه‌ڵه‌وه) دوو جۆر یاسـای گـۆڕان هه‌یـه، یه‌كه‌میان گۆڕانی هێمن و پله به پله هه‌میشه‌ییه‌كانن، دووه‌میـان تونـدو تیـژ و له‌ناكاوه‌كانن، یه‌كه‌میان زۆره‌و دائیمه به‌ڵام دووه‌م چ له گه‌ردوون چ لـه سروشـتی خۆمان نموونه‌ی ده‌گه‌مه‌نی وه‌ك: (ئه‌ستێره ڕه‌شه‌كان (الثقوب السوداء)، ئه‌ستێره نیوترۆنیـه‌كان، سـوپه‌رنوڤا، .... تـا ده‌گاتـه گڕكـان و بروسـكه و لافـاو و ته‌قینـه‌وه‌كانی ترو گه‌رده‌لول و زه‌مین له‌رزین و تاڤگـه‌كان و.... هتـد ده‌شـتوانین ئه‌و دوو گۆڕانكاریه له ڕه‌وتی ڕووبارێـك ده‌رخـه‌ین كـه چـۆن بـه ئاسـایی خـۆی هێمنانه‌و پله به پله ده‌ڕوا به‌ڵام ناوه ناوه لـه ناكـاو ده‌بێتـه تاڤگـه و كۆمـه‌ڵێك گۆڕانكاری خێراتر دروست ده‌كا، ئه‌و نموونه پڕ به پێستی مێژووی كۆمه‌ڵیشه كـه چۆن مێژووه‌كه‌ی وا هاتووه به گۆڕانكاری هێواش و چه‌ندایه‌تی و پله بـه پلـه‌ی و به‌یـژه‌یی شـان به‌شـانی گۆڕانكاریـه چـۆنایه‌تی ناكـاو و تونـده‌كان، جۆره‌كـانی جموجۆڵی ڕۆژانه‌ی واقعیو كۆمه‌ڵایه‌تی بریتیه لـه گۆڕانكـاری یه‌كـه‌م، هه‌رچی گۆڕانكـاری دووه‌مـه (واتـه تونـدو تیـژه‌كان وه‌ك: شۆڕشـه‌كان و یـاخی بـوون و وه‌رگه‌ڕانو جه‌نگ و تێك هه‌ڵچونه‌كـانه (بۆ زیاتر سه‌رنج بـده چـه‌مكی شـۆڕش له‌و فه‌رهه‌نگه‌دا).

## * ئیــرهاب له دهروونی مرۆڤدا:

لایەنی شەڕی مرۆڤ بە هەردوو شێوەی کـپ کـراوی و مـەیلی پەلاماریەکـەی بەشێکە لە سروشتی ئەو مرۆڤە، کە لە ناخی مرۆڤ شـین بـووە لەگـەڵ خێـر وەك "جووتە" (القاعدة الزوجیة-دیاد)ی بوونەوەر،، (بۆ زیاتر سەرنج بدە ناخی مـرۆڤ لەو فەرهەنگە) .

بۆیە مرۆڤی شەڕانی هەم ئیرهابیە هەم ئیرهابیش بـزی دەرمانـه[*]، هـەروەك ئەو ڕێسایە لەسالی ١٨٦٨وە لەلایەن سیرنۆ سیکۆفیچ سەلماندوویە (هێز تەنها بە هێز دەوەستێنرێ)، ئینجا دیگۆلیش جاری دا کە دەرگای ئاشتی بـە کلیلـی هێـز دەکرێتـەوە ....، هـەموو مرۆڤێـك بەرپـرسـاوەی جیاجیـا لـە ناخیـدا (ئیرهـابی) هـەلگرتووە، (فألهمهـا فجورهـا وتقواهـا)، بۆیـە ئەمـەنی بریتیـە لـە گۆڕانـە هێمنـەکانی جەسـتەیی و عـەقلی و کۆمەڵایـەتی و هـەم گۆڕانـە توندوتیـژی و ئیرهابیەکان بە پێی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و باری ئەو کەسـەش لـە هاوکێشـەی نێوان عەقڵ و نەفسدا.

بەو شێوەیە لە هەرسێ تەوەری سروشتی -کۆمەڵایەتی -مرۆڤایـەتی گـۆڕانی توندو ئیرهاب پاسایەکی زیندەکیە شان بە شانی گۆڕانە هێواشەکان.

بە کورتی ئەو جیاوازیانەشیان هەیە هەر بۆ زانین لەو خشتەکەدا:

| گۆڕانی لەسەرخۆ | گۆڕانی توندوتیژ |
|---|---|
| ١. لەسەر خۆیەو هێمنە | ١. خێرایە و توندە |
| ٢. بەرەبەرەیە | ٢. لە ناکاوە |
| ٣. گۆڕانی چەندایەتی یە | ٣. گۆڕانی چۆنایەتی یە |
| ٤. هەمیشـەیی یە | ٤. ناوەناوەیە |
| ٥. ئاسایـە | ٥. دۆخە |
| ٦. قەبارەی گۆڕانی بچوکە | ٦. قەبارەی گۆڕانی گەورەیە |

* ئەوە مانای ئەوەیە کە وێچووی رایەکەی (فریدریك هاکر)ێن کە وتویەتی: (أفضل لنا أن نرهب الاخرين من ان يرهبنا الاخرون)

به گشتی بەشێکە لـە سـوننەتی گـەردون و زینـدەگیش، واتـە ئـەو تـرس و تۆقاندنە بەشێکە لە یاسای ژیان، بەڵام با بزانین کەی و لە کوێ را دەبێتـە سـەلبی وەك هەموو چەمکەکانی تر لە سنوری خۆی ترازا بە سەلبی وەردەگـەرێ وەك لـە پەرەگرافی داهاتوو روون دەبێتەوە٠

## سەلبی و ئیجابی ئیرهاب:

لە راستیدا (تیرۆر) بەو مانایەی سەرەوو (رەشـەكوژی) سـەلبیە، بـەڵام کاتـێ تیرۆرو ئیرهاب تێکەڵ دەکـرێ دەبـێ تـەرازووەکی وردتـر بـەکاربهێنین بـۆ سـنور کێشکردنی لایەنی ئیجابی و سەلبیەکانی، لـەوەو پـێش گەیـشتینە ئـەنجامێکی رەها کە ئیرهاب بـەو مانایـەی (نـەك دەشـێ یـان ناشـێ) بـەڵکو پێویـستیەکی ژیانیشە لە (١٢) شوێن لە قورئان وای باس کردووە، لە هەموان نـزیکتر (واعـدوا لهم ما اسـتطعتم مـن قوة ومن رباط الخيل ترهبون به عدو الله وعـدوكم ..) کەواتە نابێت لەبەر شەپۆلێکی کاتیدا سنورەکان تێکـەڵ بکـرێن و(تعمـیم)ی چـەمرتەکان بکرێن، هیچ شتێك نیە دوو لای چـاکی و خراپـی نـەبێت ئـەوەتا زانـستیش کـە بیناکەرە لە هەمان کاتدا وێران کەریشە، هاوکاری لەسەر (إثم- تـاوان)و سـلبیە، لەسەر چاکەش ئیجابیە، توندوتیژی لەگەڵ پیاو کوژو رێگران چـاکە لەگـەڵ پیـاو چاکانیش خراپە، زۆر جار ئەو لاسایی کردنەوانە بە هەڵەت دەبەن، لەبەر ئـەولێك جیانەکردنەوانـە، وەك دەبیـنین یاسـای ئـەحزابی کوردسـتانی ١٩٩٣ کـە لـە پەرلەمانی کوردستان دەرچوو و دەڵێ (نبذ الإرهاب بجميع أشكالها) جـارێ باسـی ئەوە ناکەین وەك خاوەنی کتێبی بەناوبانگی (ارهـاب الـسياسي) دەڵێـت هـەموو دەسەڵاتدارانی ئیستا (كل اشكال الارهـاب) بـەکاردەهێنن، بـەڵکو مەبەسـتمان لەوەیە هەموو (اشكال ارهاب) سەلبی نیە، بەڵکو ئیرهاب هەیە لە شوێن و کاتی خۆی ئیجابیە وەك لە خوارەوە دەردەکەوێ:

(٢٩) ئیــرۆر                الإرهــاب                terrorism

## ســودەکانی ئیرهاب:

جاروایە ئیرهاب ئەو سودانەی هەیە، زۆر بە کورتی شتێکی لێ باس دەکەین :

١. دەبێتە هۆی پابەندبوونی سەرپێچی کەران بە یاسا، واتە یاسا خۆشی هەوێنی ئیرهابی لەگەڵەو پێویستە لە هەموو زەمان و زەمینێك، خۆ لە ناو جەرگەی ئەمەریکای سەرمەشقی شارستانی (بە حساب) لە کارەبا کوژانەوەکەی ١٩٨٥ی کالیفۆرنیا کە چاوی یاسا کەمێك بزربوو زیاتر لە ٧٠٠ تاوانی لێکرا، واتە ترس و تۆقاندن بۆ ئەو جۆرانە هەردەم پێویستە جگە لەو میللەتەی کە بەتێکڕای دەگەنە پلەیەکی مەدەنی بالا لەچەمکی ئومەت.

٢. دەبێتە هۆی هەڵوەستەکردنی تاوان باران لە تاوان پێش ئەوەی ئەنجامی بدەن.

٣. بەشێکە لە مافی مرۆڤ، چونکە ئەو ترسە(ئیرهابە) وای لێ دەکات هەم گیانی (قوربانیەکە) هەم گیانی (تاوانبارەکەش) ڕزگار بکاو نەوێرێ بیکا ...وەك لە (مقاصد)ی ئایەتەکەش (واعدوا...ترهبون به ....)....ئالێ بیان کوژن دەڵێ بیان ترسێنن با تاوانەکە نەکەن، ئەو ئایەتە لە چوارچێوەی قەڵاچۆی تاوان و وەزارەتی بەرگریە بۆیە دەبینین لە ٣٠ساڵی حوکمی خەلافەتی ڕاشیدین تەنیا دەستی چەند کەسێك بڕاوە کەچی ئێستا مانگانە لەم وڵاتە دەیان کەس گیانی لەدەست دەدات بە قوربانی و تاوانبارەکەش.

٤. دەبێتە هۆی ئاسایش و ئارامی وڵات و جیهان، سەرنج بدە ئەو وەڵامەی وەزیری بەرگری یابان سەبارەت بەو پرسیارەی کە ڕۆژنامەنوسێك لێی پرسیبوو ئاخۆ یابان هەیبوایە بۆمبی ناوەکی بەکاردەهێنا لە تۆڵەی هیرۆشیما و ناگازاکی لە دژی ئەمەریکا. لەوەڵاما وتی ئەگەر یابان چەکی ئەتۆمی هەبوایە ئەمەریکا هەر نەیدەوێرا لە هیرۆشیما و ناگازاکی بدا تا بیر لە تۆڵە سەندنەوەکە بکەینەوە، ئەو نائارامیەی ئێستای جیهانیش لەوەیە کە لایەك پڕ چەکەو تۆقێنەر(مرهب)ە و لایەکیش دەست بەتاڵ، ترسی پێشەکیە کە ڕێگر دەبێ لە تاوان.

٥. دەبێتە هۆی بوون و پارێزگـاری لـە سیـستەم و (تـشکلیة) کۆمەڵایـەتی و سەربازی و هەتا یەکەی خێزانیش.

٦. دەبێتـــە هـــۆی ترســـاندن و تۆقانـــدنی داگیرکـــەر و دەســـت درێژکـــەر و ئیمپریالیزم و مـشەخۆران تـا سـڵ بکەنـەوە لـە پرۆسـەی داگیرکـاری و سـتەم، هەروەك (فرانتز ڤانون) دەڵێ: رزگاری- نیشتمانی- یان راپەڕینی نەتـەوەیی یـان هەر جۆرە رزگاریەکی میللەتان لە کۆتاییدا فەوتانی ئیمپیریـالیزمی و داگیرکـەرە هەر دەبێ بە شێوازی توند و تیژ کۆتایی بێت[1]، بەهەمان شێوە بـۆ سـتەمکار و دیکتاتۆران چ بە تاك چ بە کۆ. ئەو ئیرهابـە پێـچەوانەیە نـەبێت ئـەوا ئیرهـابی ستەمکاران بە هیچ ئامرازێك لە هیچ سنورێك ناوەستێ.

## زیانەکانی:

ئەوەی سەروو سوودەکانی ئیرهابە ئەگەر لە زەمان و زەمینی بەمەرجی خـۆی بەکارهات، بەڵام هەر ئـەو دەرمانـە دەبێتـە دەرد ئەگـەر بـەکارهات لـە دژی: میللـەت، لــە دژی هــەق، چەوســاوان، گــەلێکی بندەســت، ڕەشــەکوژی دژی سیاســەتمەداران و بیریــاران، لــە دژی بیروبــاوەڕی جیــا، لــە دژی ڕەخنــەگر و نۆیۆزیـــسیۆنی مـــەدەنی و یاســـایی، ....بیبێتـــە بیـــانۆ بـــە دەســـت زل هێـــزان و دەسەڵاتداران، ئەوانە هەمووی شێوەن لە ئیرهابی سیاسی کـە بەشـی هـەرە زۆری بابەتی داهاتومانە.

## جیاوازی نێوان ئیرهاب و ئیرهابی سیاسی:

واتە جیاوازی نێوان تیرۆر و ئیرهاب چونکە مانای ئێستای تیرۆر چ سیاسـی چ ئاسیاسی بە مانای کوشتنە نەك تۆقاندن، تیرۆرکرا واتە کوشترا، کە دەڵێی ئەوانە کۆمەڵێکی تیرۆرسیتن یان کەسێکی تیرۆریـستە بـە مانـای بکـوژە..کـەمتر ئـەو

[1] معذبوا الارض - ص١٣

زاراوەیە ڕوو لە حکومەت و دەوڵـەت و دەسـەڵاتی خـاوەن یاسـا دەکـرێ ئەگـەر ڕەفتاریشی تیرۆریستانە بێت، سیـستەمی جیهانی ئێـستا بـەرەو ئـەو بنەمایـەی، دەیەوێ زاری چەوسـاوە بگرێ، بە چەوسـێنەر نـاڵێ بوەسـتە، بـە چەوسـاوە دەڵـێ کاتێ چەوسێنەر ستەمت لێ دەکا هاوار مەکە، مەجوڵێ بەرگری نەکـەی چـونکە دەچیە خانەی تیرۆریزم! ڕەنگە ئەوە یەکێ لە مەبەسـتەکانی (سـایکس- پیکـۆ-۱۹۱٦) بێت لە دابەش و دروستکردنی ئەو دەوڵەتـە سـەرکوت کەرانـە. ئـەوەش نادادگەریەکی زەقی ئەو سەردەمەیە، کەواتە تیرۆر ئەو مانـاو مەبەستە نادا بۆیـە گەڕاینەوە سەر (ئیرهاب) لە جیاتی تیرۆر.

بێجگە لەوەش ئێستا زۆر ڕوونە کە جیاوازیەکی زۆر هەیە لە نێوان (ئیرهاب)و (ئیرهابی سیاسی)، ئەگەر (ئیرهاب) ڕەگـو ڕیشـەی قوڵ ببێتەوە بۆ ناو گـەردوون و سرۆشت و ناخی مرۆڤ ئەوا ئیرهابی سیاسـی بـە هـەموو ڕەنگـەکانی یـەوە وەك: (ئیرهابی فکری، ئیرهابی عەقیدەیی، ئایینی، کەلتوری، نەژادی، نەتـەوەیی، ..) دەرهاوێشتەی جۆرجۆڵی کۆمەڵایەتیەو لە داهێنانی دەسـەڵاتدارانی دیکتاتۆریـە، هـیچ ئەسـڵێکی شـەرعیو مـەبادیئی و گـەردوونی نیـە، تاوانیـشە، زادەی سیاسەتێکی میکافیلیانەیە، دژی سەربەسـتی بیروڕاو دەسـت گـۆڕی دەسـەلات و بزوتنـەوە ڕزگـاری خـوازو ئیـسلامیەکانو هـەتا چـەپی و دیموکراتخوازەکانیـشە، ئێستاش وا کراوەتە چـەکێك بـۆ مانـەوەو پـاوان کردنـی دەسـەڵات و چەواشـەی ڕاستیەکانە، ئیرهابی سیاسی کە زیاتر لە تـیرۆر ئێرکـە چ خـەڵکێك بیکـەن بـۆ گەیشتن بە دەسەڵات یان چەسـپاندنی ڕای خۆیان چ دەسەڵاتدار بیکا بـۆ مانـەوەی لە دەسـەڵات یەك تاوانـە، ئیرهـابی سیاسـی دەکەوێتـە بەشـی پانتـایی سـەلبی ئیرهابەوە، (ئیرهاب)و (ئیرهابی سـیاسی)لێك جیان تێکەڵکردنی ئەو دوو چـەمکە زۆر ترسـناکن ئەوا(تاوانبارو قوربانی)، (چاکەو خراپـە)، (داگیرکـەرو داگیرکـراو)، (تێکدەرو چاکساز)، (دیموکراسیو دیکتاتۆر)، (ئیستعمارو یارمەتی)، (تۆقێنـەرو تۆقێنراو)... هەموو ئەك تێکـەڵ دەکـرێن، بـەڵکو پێـچەوانەش دەبنـەوە، وەك

ئیستاله جیهانی سێیەم بەگشتی و وڵاتانی عەرەبی بە تایبەتی (کوردیش لەو سەلبیەدا وێ چووی وڵاتانی عەرەبە) بە زەبری هێز و زیندانی و ئیرهاب بیروباوەڕیان دەگۆڕن بۆ لای خۆیان، بەشی سیاسی لە ئاسایشەکان بە ئاشکرا دەکرێتەوە،لە هەنگاوێکی هەڵەی پەرلەمانی کوردستان بە یاسای فەرمی لە بڕیاری ژ:٣٥ی سالی ٢٠٠٦ ڕێگەی بە دەزگای سەرکوتی پاراستن وزانیاری داوە بوونی یاسایی هەبێ، سەرۆك هەتا مردن هەر سەرۆکی وڵات و حزبە، نوێ ترین دیاردەش ئەوەیەدەسەلات وحزبەکەی کردوتە مولکیەی تایبەت و میراتوەك لە سوریا ڕوویدا، لە پاداشتی لایەنگیری ئەو ئاهەقیەو دەسەلاتەکەی پارچە زەوی و ئیمتیازو لێبووردن و فیتۆت پێ دەبەخشێ، تەزکیەو (مقاعد خاصة)ت خەڵات دەکا بە پێچەوانەی ئەوانەی کە ڕەخنەیان لێ دەگرن بێ بەشیان دەکەن لە ژیان ئەگەر زیندانی و تیرۆریشیان نەکەن، .....ئەوانە هەمووی جۆرێکن لە ئیرهابی سیاسی بۆیە (دوڤرجە) لە کتێبی (ارهاب السیاسي) دەڵێ,زۆربەی دەسەلاتداران هەموو شێوەکانی ئیرهاب بەکاردەهێنن، لە کۆتاییدا زۆر پێوانەکان تێك دەشێوێ و چڕ دەبێتەوە، بۆ پێوانەیەکی حیزبی و لەوێش بۆ سەرۆك ئەوەش نەك لەگەڵ ئیسلام لەگەڵ مەدەنیەت و بنەماکانی پێشکەوتن و دیموکراسی و دادگەریش هەرگیز ناگونجێ بە تایبەتی بۆ میللەتێك کە لە قۆناغی ڕزگاری یان بیناکردنی کۆمەڵایەتی بیت، کەواتە دیاری کردنی سنوری نیوان ئیرهاب وئیرهابی سیاسی وەك هەموسنورەکانی تری کۆمەڵایەتی (دادگەری و ستەم، سەوداو سوو، یارمەتی و داگیرکردن، چاکەو خراپە، غەریزەو سنوور، ڕادەو ئارەزوو، حیکمەتو تەنازول، گوتەو کردە، .....) بە حیزبێکی سیاسی لیبرالی دیاری ناکرێت، بە یاسا ناکرێت بە بڕیاری پەرلەمانی ناکرێ، بەڵکو قسوڵ دەبێتەوە بۆ تێڕوانینی فەلسەفی، پێویست بە مدرسەی فکری و بەرنامەیەکی ئایدۆلۆژی دەکا کە سیستەمی سیاسی سنووری نێوان ئیرهابی ئیجابی و ئیرهابی سەلبی دیاری بکات.

## مەدرەسەکان و ئیرهاب:

لە باسی تیرۆرو مانای ئێستای زۆر کێشە نیە کە لە لایەن هەموو لایەك بە دزێوی سەیری دەکرێو کەس خۆی لێ ناکاتە خاوەن، بۆیە ناسنامەی نیە، بەلاّم مەسەلەی ئیرهاب جیایە.... هەرچەندە هەموو ئەوانە دیان نەك پێناسێکی سیاسیو فەلسەفیو کۆمەلاّیەتی ڕوونی نیە، هەتا پێناسێکی یاساییو دەولیشی بە یەکگرتوویی نیە، لە کۆنگرەی جاکارتای وڵاتانی موسڵمانیش لە مانگی ٤/٢٠٠٢ نەگەیشتنە هیچ پێناسێکی یەکگرتوو..نەیانتوانیوەو ناتوانن سنورەکانی ئیرهابو ئیرهابی سیاسی، تیرۆرو تیرۆرستانو تیرۆر لێکراو.. لێك جیابکەنەوە.

ئەوەی باسکرا لە بڕگەکانی پێشوو لە ڕاستیدا هەلوێستی فیکری ئیسلامییە کە چۆن لە گەردوون یاسا هەیە ئاواش لە کۆمەڵ، هیچ بەندێکی شەریعەت نییە بناغەی گەردوونیو سروشتی نەبێت، جا زۆرجار هەلەو لادانێك لە یاسا دەکرێ ئەوەیان نادەمی زادەکەیە نەك بەرنامەکە، هەرچی مەدرەسەو سیستەمەکانی ترە لەو بارەیەوە وردنیین، زۆربەیان سنورەکان تێکەڵ دەکەن .... هەر بەکورتی باسێکیان دەکەین:

### ١. مەدرەسەی لیبراڵ دیموکراسی:

وەك لایەنی واقیعیو مێژووییەکەی بریتیە لە داگیرو داگیرکاریو ئیستعمارو خۆ پڕچەك کردنو تۆقاندنو ئیرهابی میللەتان، خاوەنی دووجەنگی جیهانی درندانەن، بەکارهێنەری چەکی ئەتۆمیو کیمیایین لە یابانو ڤێتنامو کەمبۆدیا..، یەکەم تیرۆرو تۆقاندنو بەکارهێنانی چەكو باروتو چەکی قەدەغەی تر لە لایەن ئەوانەوە بەکارهاتووە، چەکی ئەتۆمیو چەکی کیمیایی لە لایەن ئەمەریکا بەکارهات یەکەم جار، گازی ژاراوی لە جەنگی جیهانی بەکارهات، یەکەم فڕاندنی فڕۆکە لەلایەن نەرەنساوە بەکارهات کاتێ سەرکردەکانی

شۆرشی جەزائیری فراند لەناو فرۆکە لە ساڵی ١٩٥٦ کە بـۆ دانوستاندن لەگـەڵ فەرەنسـیەکان بە ئاسمانەوە بوون ، بەهەمان شـێوە چـەندین تیرۆریـان کـردووە لـە کاتی دانوستاندن و دیالۆگ، لە ڕووی تیۆریـشەوە هـەموو زانـاو ئەیلەسـوف بـە سیاسەتمەدارانی ئیستاشیانەوە کۆکن کە هێز و ئیرهابە چارەسـەر ، دروشمەکـەیان ئەوەیە (لە جیاتی بمان تۆقێنن با بیان تۆقێنین) هەتا خودی ئاشـتی لـە ڕوانگـەی ئەوان هەر بە هێز دێتـە دی وەك لـە بنـەما بەناوبانگەکـەی (دیگـۆل) هـاتووە: (دەرگای ئاشـتی هـەرگیز بـە کلیلـی هێـز دەکرێتـەوە)، ئـیتر هـەزاران تـاوان و ڕەشەکوژی و وێران و تۆقاندنی ڕۆژئاوا هەیە، زۆربەشیان بە بڕیار یاسای ڕەسمـی و مەدەنی و دەنگی پەرلـەمانی و دیموکراسـیانە دارێـژراوە، ئێسـتاش بـە هـەمان ماهیـەت بـەردەوامن تـەنیا شـێوەو ئەدرێـسی دەگـۆڕن، ڕاسـتە ئیـستا ئـەوان ڕاستەوخۆ تیرورناکەن بەلام تیروری میللەتان دەکەن، ڕاستەوخو یان لەرێی وەکیلـە دەسەلاتدارەکانیان، پشتیوانی دەسـەلات داری تیرۆریسـتن، هـەروا خـۆ پـر چـەك دەکەن و خەلکی تریش چەك دەکەن، جیهان هەمووی کەوتۆتـە ژێـر تۆقانـدنێکی بێ وێنە.

## ٢. مەدرەسـەی شـیوعیەت:

لایەنی واقعیەکەی لەوەی پێشوو چاتر نیە، مێـژووی ٧٠ سـاڵەی شـیوعیەت سەرباری جەنگ و کوشتارو تۆقاندنی جیهان، ئـەوا ڕەوشـەنبیرو نـەیاران و هـەتا هاوڕێیانی خۆشیان نەك هەر تۆقاندوە بـەلکو تیرۆرکـردووە، وەك مەدرەسـە تـەواو باوەڕیان بەیەك لاکردنەوەی فکری و سـیاسی هەبووە لە ڕێی تیرۆر، واتە پـەیڕەوی ئیرهابی سیاسیان کردووە وەك بنەمایەکی ڕەسەنی شیوعیەت نەك تەنها ڕەفتاری شیوعیەکان، ئەنجلس کتێبێکی هەیە بە ناوی (دور العنف في التـاریخ)، مـارکس ئامۆژگاریەکی بە ناوبانگی هەیە بۆ شیوعیەکان و دەڵێ (ئێـوە ئیـسلاحی مـەبن توندو شۆڕشگێڕ بن) واتە تۆقێنەرو ئیرهابی بن وەك (لینین) ڕوون تـر لـە کتـێبی

(من اين نبدأ) دەڵێ: (مبدئیا نحن لم نرفض ابدا ولایمکننا أن نرفض الارهاب إنه وجه من وجوه الحرب، ربما لایمکن استغناء عنه في بعض الظروف)، لە کۆتاییدا ئەو بنەمایەی باکۆنین لەو مدرسە خەملی کە دەڵێت (خێر لەوەیە: تێك و پێك شکاندنی چی واقعیە)[١]، ئەوەش لەسەر بنچینەیەکی ڕەسەنی مارکسی و یاسای دیالێکتیەکان هاتووە، کە پەیڕەوانێکی زۆری (باکۆنین) هەبووە لە ئەوروپا لە شێوەی ڕێکخراو بە ناوی: (ارادة الشعب)، (إشتراکیون الثوریون)، (إنتقام)، (المرعبون)، (دینامیتیە)، (إتحاد باکونین إیطالیا)، (لجنة الثورة)...ڕێکخراوی تیرۆرستی بوونە، تا ئەو دوایییەش شان بەشانی (ئۆرۆ شیوعیة)و (سۆشیال دیموکاسی)- (الویة الحمراء إیطالیا)، (خلایا المسلحة لاتحاد لشعبی الفرنسا)و ڕێکخراوی (بادرمانیهۆف) لە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا هەبووە- کە دامەزرێنەرەکانی: (ئەندریاس بادرو ئۆلریك فاینهۆف) چەپیەکی برجوازیش بوون، زۆر ڕەوشەنبیریش بوون چاکیش لە مارکسیەت گەیشتبوون .....زیاتر لە دژی ئەو هەنگاوانەی ئۆرۆ شیوعیەکان دروست ببون ...بەڵام لە ڕاستیدا ئۆرۆشیوعیەکان واقعیانە تر بوون بەو بەرنامە هێمنانەیان لە ئەورۆپایەکی دیموکراسی، کەچی ئەو ڕێکخراوانە مارکسی ڕەسەنتر بوون لەوان، لە پێش ئەوانەش لە ڕوسیا ڕێکخراوی ((نیهیلیزم- کە دروست کەرەکەی تورچینۆف بوو) دژی ئاین و لە پەیڕەویدا کوشتنی ئاغار برجوازی تومارکردوە، بۆیە تیرۆریستیان ڕەسەنایەتی لە ناو کۆمەڵگەیەکی جیهانی وەگرت لەگەڵ فکرەی شیوعیەت.

**٢. مەدرەسەی سۆشیالیست و نەتەوەییەکان:**

هەڵبەتە باڵی سەرەکی سۆشیالیستی لەسەر ئەو دوو مدرسەی سەروو حسابە بە مێژووەکانیشیانەوە. ئینجا ئەو ئایدۆلۆژیەی کە ئاوێتەیە و پێك هاتووە لە نیوە نەتەوایەتی و نیوە لیبراڵی یان سۆشیالیستی یان شیوعی ئەوا سیستەمێکی

---
[١] مبادئ الثورة- باکۆنین

ڕادیکـاڵی ترسـناك و تۆقێنـەری لـێ پەیـدابووە وەك: تورانیـەکان، نازیـەکان، فاشیەکان، بەعسیەکان، نەژاد پەرستەکانی تـرو ...هتـد کاریگەریـەکی زۆریـان لەسەر جیهان هەبووە، مەینەتیەکانی کوردی ئێستاو تۆقاندنی لەسـەر دەسـتی ئەوانەیە زیاتر.

## بەرگـــری و ئیرهاب؛

بەشێکی گرنگی تر لەو پیلانەی ئێستای جیهان ئەوەیە بەرگری و شـۆڕش دژی ستەم و چەوساندنەوە بە(ئیرهاب، تیرۆر، عنف) لە قەڵەم دەدەن، دەیەوێ ئـەو بـە نوێترین چەك داتکوتێ و خێرو بێری وڵات بخواو پارەی ئەو فیشەکەت لێسەنێتەوە کە تۆی پێ تیروردەکا، برسیت بکا، سەگت تێ بـەردا، بەسـەرو مـاڵ بتسـوتێنێ هەتا زمانت لێ قەدەغە بکا، ئەوبێتە خاوەن ماڵ و تۆش بێگانە، ئینجـا ئەگـەر بە کۆنە تفەنگێك بەرگریت کـرد پێـت دەڵـێ ئیرهـابی، تیرۆریـــستی، تێکـدەرە، نایاسایی ...، هەڵبەتەداگیرکەران ئەوزاراوە یاسایەیان بۆئامادە کردووین، دەبـێ ئاگادار بین ئەچین بەلای ئەو پێناسـانە کەلە کۆتاییدا دەبێتە تیغ بۆ ملـی خۆمـان، ئەگـەر بـە وردی سـەرنج دەینـە ئـەو پێناسـانەی نێـو دەولـەتی دەیـەوی ئـەو ئیجرائەتانەی لەدەرەوەی یاسا دەکرێ بـە تـیروری پـۆلێن بکـا، هەڵبەتـە ئێمـەی کوردیش خاوەن دەولەت و یاسا نین، بەپێی ئەو پێناسە یاساییانە بێت جم وجۆڵی شۆڕشـــگێرانەکانمان هـــەمووی دەچـــێتە خانـــەی تـــیرۆر بـــە ســـەرکردە مێژووییەکانیشـمانەوەو دوژمـنانیشـمان دەکەونە خانەی هەق ، بۆیە دەبـێ وریـابین لە هەڵبژاردن ولایەنگیری لە پێناسـە جیاجیاکان، ئەگینا تەڵەی ئیقلیمی وجیهانی ئامادەیە بتلیسـتێنی بەتیرور، جگـە لـە کوردسـتانی سـەروش هەتالەودوایـیەش جاروابوە ناوی کوردستانی عیراقیش بە تیرۆر هـاتووە، لەوانـە وتـاری foreign affairs ژ: ٥ سـالی١٩٩٦، هەروەها سەرنج بـدە terrorism and garilla ی (ولتر لاکیور)٠

ئیسرائیل خاوەنی گەورەترین جبەخانەی قەدەغەکانیشە کەچی چەند کۆنـە چەکێك لە ناو باخێرمیەك دۆزرایەوە گوایە هـاتووە بـۆ بـەرگری کـەرانی فلستین خـەریك بـووە دنیـای لەسـەر وەرگـەڕێ، لـە خـوارووی ئـەفریقیا سـپیە نـەژاد پەرستەکانی رۆژئاوا و قوتابیانی لیبرال دیموکراسی، مرۆڤێکی رەشیان خـستبوە ژێر چەپۆکی ۲ سەگی درندە کەچی کە کابرای رەش ویستبووی تەنیا سەگەکان لە کۆڵ خوی بکاتەوە دەمانچەیان لێ راکێشابوو پێیان گوتبو هـەی تیرۆرسـت ئـەوا دەتەوێ لە سـەگەکان بدەی!!

ئەوە پلانێکی زۆر گەورەیە بەسەر فەرهەنگی جیهان و نێودەوڵەتیش، چـونکە هەموو پێناسەکانی کۆن بۆ تیرۆرسـت هـەر دەسـەڵاتدارو داگیرکـەری گرتۆتـەوە، هەتا راپۆرتەکەی (لیژنەی تایبـەتی-UN- دەربـارەی تـیرۆر لـە سـاڵی ۱۹۷۳) دەڵێ: کارە تیرۆریستیەکان دەگەرێتەوە بـۆ ئـەو داپلۆسـینەی کـە دەسـەڵاتداران ئەنجامی دەدەن دژی میللەتانو گەلانی ئازادی خواز کە بۆ مافی چارەی خۆنوسینو ئازادیەکانیان تێ دەکۆشن، لەو سەردەمی بریاری یاسـای نێـو دەولـەتی کـە لـە نەتەوە یەکگرتووەکان دەرچـوو لـە٢٤\ئۆکتۆبـەر\١٩٧٠ژ:٢٦٢٥شـەرعیەتی بـە بەرگری چەکداری وشۆرشیش داوە ، کەچی ئێستا دەیانەوێ هەموو میللـەتان بـێ بەرگری خۆ بدەن دەست، بەڵام یاسای بەرگری یاسـایەکی سروشـتی و گـەردوونی زینـدەگی و خواییـە، ئـەو بەرگرییـە هـەر سروشـت و رووەك گیانـدار و هـەتا بەکتریایەکیش هەیەتی چ جای مرۆڤ، ئەگەر بەرگری نەکا لە قیامـەتیش تاوانبـار دەبێت وەك لە ئایەتەکانی (ظالمی أنفس) هاتووە.

## تاقمـی ئیـرهابی:

لەوەی سـەرەوەدا کـە باسمـان کـرد وامـان لـێ نـەکا هەڵوێسـتی رەهـایی لـە توندوتیژی و بەرگری وەرگرن بێ رەچاوی زەمـانو زەمینـی خـۆی، لـە بـارێکی ئاسایی و ئـازادو دیموکراسـیانە ئـارام ئـەوا بـەکارهێنانی توندوتیـژی چ لـە لای

تاقمەکان چ لە لای دەسەڵاتدار زۆر سلبیە، مانای وایە ئەو دەستەو تاقمانە نوقسانن لە بنەماو بەرنامەو ئایدۆلۆژیاو زەخیرەی فکری، خێرا پەنا دەباتە بەر تیرهاب، لەو سەردەمەدا دوو چینی سەرەکی لە تاقم و کۆمەڵە سیاسیەکان بە ناهەق پەنا دەبەنە بەر تیرهاب وتیرۆر، یەکەمیان: عەلمانیە نادیموکراسیەکان کە لە فکرو مەبادیئا قەلۆش بوونە دووەم هەندێ دەستەو تاقمی خاوەن مەبادیئو عەقیدەش کە بە چاکی لە دەست نیشان کردنی قۆناغ و واقیع نەگەیشتوون، ئەوانەش لە هەموو لایەك هەیە چەپەکان، ناشیونالیزمیەکان، ئاینیەکان، هەتا لیبرالیەکانیش ...(بۆ زیاتر سەرنج بدە زاراوەی (پەردگر) لەو فەرهەنگە)، ئەو نەزانیەنەی چینی دووەم خزمەتێکی زۆر بە بەرنامەی چینی یەکەم و دەسەڵاتدارە دیکتاتۆریەکانیش دەکەن، هەڵبەتە چینی یەکەم لەبەر قەلۆشیان زۆر پێویستیان بە دەسەڵات هەیە تا بە هۆیەوە ئەندام و لایەنگر لە ڕێی ئیمتیاز پەیدابکا، ئەو جۆرە دەسەڵاتدارانە تیرهاب، تیرۆر، توندوتیژی بەکاردەهێنن بۆ پارێزگاری لە دەسەڵات لە ژێر ناوی جیاجیای یاسایی و دیموکراسی و بە ئازادی دەزگای داپڵۆسێنەری دروست دەکا زیندانی پڕ لە سیاسەتمەدار و نووسەر و ڕەخنەگر دەکا. ئا لێرەدایە زۆربەی ڕەوشەنبیرانی دڵسۆز دروشمەکەی بەوورد دادەڕێژن دەڵێن: بەکارهێنانی توندوتیژی و تیرهاب و تیرۆر ناڕەوایە چ بۆ گەیشتن بە دەسەڵات چ بۆ پارێزگاری دەسەڵات، لە ڕاستیدا هەندێ دەستە و تاقمی تیرهابی قاولی گەورە دەدەنە دەسەڵاتدارانی جیهانی و ئیقلیمی و ناوەکیشی، ئەوەش لایەنێکی تری ئاڵۆزی کێشەکانە لەو جیهانە، هەڵبەتە پەنابردنی هەندێ دەستەو تاقمی بچووك لێرە ولەوێ بۆ ڕەشەکوژی و تیرۆر هیچ ئەسڵێکی ئاینی ڕەسەنی نیە، چونکە ئەوەندە دەوڵەمەندە لە فکرو عەقیدە و ئایدۆلۆژیا و سیاسەت و نموونە، هیچ پێویستیەکی بە تیرۆر نیە (لا اكراه في الدين) (فمن شاء فليكفر ومن شاء فاليؤمن) ئەگەر ئاین گۆڕین بە تۆبزی نەبێت چ بنەمایەك بۆ تۆبزی گۆڕینی فکرو سیاسەت دەمێنێ، کۆمەڵ و تاقمەکانی سەر بە مەدرەسەی مەبادیئی

هەردەم پێویستیان بە نێو میللەتە تا بەرنامەکەیان لێ ساغ بکەنەوە، ئەوەش کەشێکی نارامی پێویستە نەك تۆقاندنو ڕاوەڕاو کە سایکۆلۆجیەتی خەلکی پێ دەشکێو. هیچ مەبادیێك بە سروشتی وەرناگرێ، بۆیە لە مێژووی موسلماناندا بە دەگمەن دەستەو تاقمی تیرۆرستی لێ پەیدابووە، لەوانە بەشێك لە (خەوارجەکان) یان (جەماعەتی شێخ الجبل) لە خۆراسان. بەلام جیهانی تر پڕیەتی لە نموونەی کۆنو نوێ لەوانە (فرسان الهیکل، جماعة جوبتیر، السحر الاسود، جمعیة قطاع الطرق، جماعة خصیان روسیا، محاکم التفتیش، کوشتنو سوتاندنی زانایان تا دەگاتە شۆڕشی ڕەشەنبیری ستالینی و دوایش ماوی، هەروەها لەو دوایەش خەمیرە سوورەکان لە کەمبۆدیا، ڕێکخراەکانی (الویة الحمراء) لە ئیتالیا (بادر ماینهۆف - واتە سوپای چەکدار) لە ئەلمانیا، سوپای سووری یابانی، خلایا الثوریة الفرنسیة، اشتراکیون الثوریون، فهد، انتقام. المرعبون، دینامیت، اتحاد باکونین ایطالیا، لجنة الثورة... ڕێکخراوی لەپ ڕەشەکان (کف الاسود)ی سربی.. دەزگاکانی سیار موسادو KGB و میتو موخابەراتەکانی تر، لە پرۆتۆکۆلی (١٨-حکماءصهیون) دەلێت: ((وەکیلەکانمان کارێکی زۆری تیرۆری ماقوولانیان ئەنجام داوە))، جیهانی ئێستاش پڕیەتی لە ولاتانو دەسەلاتی تیرۆرابیو وەك (د.ئەدۆنیس ئەکرە) دەلێت: (تیرۆرابی سیاسی یەکێ لە ئەسلەترین ستراتیجیەتی سیاسی دەسەلاتو حکومەتانی نوێیە)، بەتایبەتی ولاتانی عەرەبیو هەندێ ولاتانی ئیسلامی تر.

## کێ تیرۆریستە؟

پرسیارێکی سانایە کەچی لەسەردەمی بێ دادگەری (یان تەرازوویەکی سەرانسەری)وەك زۆر پرسیاری تری وا سانا وەلامی ڕوونمان دەست ناکەوێت، ٨ سال جەنگی عێراقو ئێران کرا لە پێش چاوان دەزگایەکی ڕەسمی دەولی بوێری نەکرد لایەنی دەستپێکەر دەست نیشان بکا، لە کوردستانیش ئەو هەموو شەڕە

براکوژیە کرا کەس نەیتوانی لایەنی دەست پێکەر دەست نیشان بکا،هەرچەندە لەهەردووجەنگی براکوژی و عیراقی و ئێرانی لایەنی شەڕانی وەك مانگی چاردە دیار بوو، هەتا لە دوا سات لە بەرنامەیەکی ڕادیۆی مونتیکارلۆ (نقطة الساخنة) لە نوێنەری پارتی ویەکێتی هەمان پرسیارکرا، ئەوانیش لە وەڵامی زەق ڕایان کرد ......دەبێت ئەو مەتەڵە چی بێت؟ لەو سەردەمە هەق ناگۆترێت، لە قورئانی پیرۆزدا زۆر بە توندی بەگژ ئەو دیاردەیە داچوەتەوە (ولا تلبسوا الحق بالباطل وتكتموا الحق وأنتم تعلمون) ...لە فەرموودەش هاتووە: (هلك قوم مالم يقل للسيء أسأت..) بۆیە ئەو پرسیارەش ئاخۆ کێ ئیرهابیە؟ قەیرانی بێ وەڵامیان هەیە، ئایا ئەوەی دەچەوسێتەوە بە کیمیاوی لێی دەدرێ؟ ئەوەی زیندانی پڕ لە بیریارو سیاسەتمەدارو هونەرمەندو خەڵکی ڕەش و ڕووت دەکا تیرۆرستە یان قوربانیەکە؟ ئایا کامەن بیرهابی سیاسی پەیڕەو دەکەن میللەتانی ژێر دەستە یان داگیرکەران؟ زل هێزان یان بێ هێزان؟ بەرەی خێر یان بەرەی شەڕ؟ ..پرسیار زۆرە؟

وا پێدەچێ هەر وڵاتەو بە جۆرێك پێناسی سیاسی و یاسایی تیرۆر دەکا بۆیە جار وایە پێناسەکانی ئەوانیش خۆیان و دەوڵەتی زل هێزو دەسەڵاتە ڕەسمیە دیکتاتۆریەکان دەگرێتەوە بۆیە وازیان لە پێناس و نیشانەکانی هێناوە، گەلێ جار ڕۆژئاوا دەیەوێ هەندێ بزووتنەوەی ڕزگاریخواز یان ئیسلامی بخاتە ئەو لیستانە بەڵام هەر بە خێرایی هاوتای بۆ دروست دەبێ کە بڵێن (بانێلیودوو هەوا)، ئینجا ئەو کاتەی تیرۆرست دەست نیشان دەکرێ کە دادگەری لە جیهان هەبێت یان بە لایەنی کەمەوە لەو وڵاتە جۆرێك ئازادی و سەربەستی بیروڕا و دیموکراسی و دەست گۆڕی دەسەڵات هەبێت، دادگەری نیە کاتێ ڕێکخراوی (پ.ك.ك) بە تیرۆریست بلیستێنرێ لەگەڵ ئەوەش هەندێ جەو جۆلی بە دانانیانە نەکردووە بەڵام دەبێ ئەو زەمینەو بارودۆخە ئەوی پەیداکردووە چی یە؟ بریتیە لە چەوساندنەوەی نەتەوەیی، پاکتاوی ڕەگەزی، شۆڤینی. ڕەگەزپەرستی، چەوساندنەوە، سوتاندن، قەدەغەی هەموو شتێك لە کورد هەتا زمانیش لە ژێر

دامو دەزگاکانی تۆقێنەر، ....هەڵبەتە ئەوە بەرهەمی دەبن، ئینجا دادگەری ئەوەیە یەکەم جار (کار)ەکە هەڵسەنگێنێ و بڕی ئینجا کاردانەوەی، هەتا رێکخراوەکانی تری ئەورووپاش لەوانە (الویة الحمراء) لە ئیتالیا کە لە وڵاتێکی دیموکراسی و ئازادی سیاسی پەیدا ببوو بۆیە هیچ پاساوێکی تیرۆرستانەیان نیە، کەچی لە دوای لێکۆڵینەوە دەبینین دامەزرێنەرەکەی (ریناتۆ کۆرشیۆ) مەسیحیەکی ئاین پەروەریش بووە لە کاردانەوەی بزوتنەوەی فاشیەکان کە چالاکیان هەر بە گەرمی مابووەوە، لە ساڵی ١٩٧٠ ئەو رێکخراوەی لە دژیان دروست کردووە ....تا گەیشتە ئەو رادەی (ئەلدۆمیرۆ)ی سەردك وەزیرانیش کە هەڵبژێردرا بوو بیرفێنن و تیرۆری بکەن ...بۆیە پێویستە لە بنچینەکانیان بکۆڵینەوە، دەبینین (کار)ەکان، توندوتیژی دیکتاتۆریانە بووە لە وڵاتەکە، یان وەك جیهانی ئێستاو مەبدەئەکەی ئەمەریکا (یان ئەگەڵمی یان ئیرهابی) گەورەترین ئیرهابە هەر زیاتر ئیرهاب دەزێنێ، ... لەسەرجەم را زۆر بە روونی دەردەکەوێ کە لەگەڵ هەبوونی هەندێ دەستی تیرۆریستی بێ ناسنامە بەلام ئەو هەبوونە بو زل هیزانو دەسەلاتە دیکتاتۆرەکان پاساوێکی دەگمەنە بۆ لێدانی تەرو وشك و ئۆپۆزۆسیون و رەخنەگرو ئەخوێندنەوەی خەلکی تر، ساغ کردنەوەی ململانێی شارستانیەکانەو زیاتر رۆژئاوا دەیەوێ ئەو تۆمەتە بە بزوتنەوەی ئیسلامیو نیشتمان پەروەرە راستەقینەکان وەبنوسێنێ کە لە بەرژەوەندی ئەوان نین، جا ئەو بزوتنەوانە چەکدار بن یان بێ چەك، میان رەو یان توند رەو، ... ئەگەر ئۆپۆزۆسیونی چەکدار تیرۆرستیە ئەوا کۆلۆمبیا، مەکسیك، زۆربەی وڵاتانی ئەمەریکای لاتینی و ئەفەریقا ئۆپۆزۆسیۆنی چەکداری هەیە بۆچی بەوانیش ناوتری تیرۆریست، هۆشی و تۆتسی چیان لێك کرد، بەوانە ناوتری تیرۆریست لە کاتێکدا ئەمەریکا مەشقی چەکداری بەو عێراقیانە دەکرد لەمەجەر بەهەمان شێوەش ئۆپۆزۆسیۆنی ئەفغانی، ئەگەر بزوتنەوەی رزگاری خوازی تیرۆریستن بزوتنەوەکەی تەیووری رۆژئاوا، باسك، تامیل، هندۆسەکان و

سیخەکان، سوپای چەکداری خوارووی سـودان، بە بەشی سـەروو دەوترێ تیرۆریـست کەچی بە بەشی خواروو ناوترێ، بەراستی یاسای تەفامیە بانێك سەد هەوایە. خـۆ ئەگەر بزوتنەوەی ئایینی تیرۆرسـتێ خۆ ئیسرائیل لەسەر ئەو دەقـە ئاینییانـە ئـەو ئیرهابە دەکا، لە پرۆتۆکۆلی (١٨)ی حكماء صـهیون دەڵێ ((...قامـت وكلائنـا بإنجاز عدد مـن الاغتيـالات الفرديـة..))!!، دەیـان ڕێکخـراوی تـری مەسـیحی و یەهودی و بوزی ...چەکدار هەن ...بۆچی ئەوان تیرۆریـست نـین؟ ...خـۆ ئەگـەر ئەوان ڕوون نین ...خۆ ڕەشەکوژی و کوشتنی ژن و منداڵ تیرۆریـستە هـەر دەبیـنین زل هێزان و داگیرکەران و حکومەتە دیکتاتۆریـەکانن پـەیرەوی دەکـەن جـا چ بـە دەمانچە یاخود تۆپ و فرۆکە فەرقی چیە، خـۆ ئەگـەر کوشـتنی سیاسـەتمەدارو موفەکیر تیرۆریـست بێت بکوژانی پـاتریس لومومبـا، ترۆتـسکی ...تـا دەگاتـە فتحی شقاقی، ابوجهاد، محمد بـاقر الـصدر، صـالح یوسـفی، بـە ئاشـکرا دیـارن ....کەواتە کێ تیرۆریستە؟ واتە تیرۆر زارەوەیەکی زیاتر سیاسیە کـەمتر بنـاغـەی فکری و ئایدۆلۆژی و ئاینی هەیە، بۆیە چاك ئاناسرێتەوە دەتوانرێ هەر زل هێزێك بەزنجیرە وەك تۆمەت بەکاری بهێنێ لە دژی بچووك تر لە خۆی لە کاتی پێویـستا بێ هیچ پالپشتێکی یاسایی گشتی، هەتا داواکردنی خەلکی کوردسـتانی سـەروو لە تورکیا بە زمانی خۆیان بخوێنن لەسـەردەمی حکومـەتی ئەجەویـد ئـەوا ئـەو داوایەیان بە داوایەکی تیرۆریـستیانە ناسـاند، با سـەرنج بدەینـە سـێ نموونـەی زەق لەو بارەیەوە:

١. لە سـاڵی ١٩٩٩ ڕوسـیا بـەرەسمی و لـە ڕێـی ڕادیـۆ و تەلـەفیزیۆنی ژن و منداڵ وگیانلەبەری ناو گرۆزنی (چیچان) ئاگادار کردەوە ئەگەر لـە مـاوەی (٤٨) سەعات دەرنەچن بە تیرۆریـست لە قەڵەم دەدرێن!

٢. لە مـانگی ٨/٢٠٠٠ ئەمـەریکا بـە هـەمان شـێوە ڕێکخـراوی (فـتح)ی فەلەستینی ئاگادار کردەوە ئەگەر بەزیِ وام نەبێ لە دانوسـاندن لەگـەڵ ئیـسرائیل ئەوا دەیگێڕێتەوە لیـستی تیرۆر.

٣. نموونەی سێیەم لە هەموان سـەرنج ڕاکێـشترە، دەبیـنین ئەگـەر چـەکداری بزوتنەوە ئیسلامیەکان هۆی تۆمەتی تیرۆر بێت ئەوا بۆ چەکیشیان هـەر تۆمەتـە ...محفوظ نحناح[1] سەرکردەیەکی ئیخوانە لە جەزائیر، زۆر بەناوبانگە کە بە هەموو هەڵوێستێکی خواروو خێچی دەوڵەت قایلە و هەرگیز چەکدار نەبووە بـە ماسـتی سـپی وتـوە ڕەش لەبـەر خـاتری دوورخـستنەوەی لـەو تۆمەتـەی ئیرهـاب، لـە ١٥/٤/١٩٩٤ بە ڕەسمی لە مەیدانی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی دەرکرا بە تۆمـەتی چەکدار نەبوونی لە کاتی بەرگری جەزائیر ...واتە ئەوجارە بـێ چـەکیەکەی بـووە داو و بە ئەندازەی تیرۆر کاری لێکرا. کەواتە چی بکات؟!

[1] لە ساڵی ٢٠٠٢ وەفاتی کردووە

## (۳۰)

## دیموكراسی الدیمقراطیة Democracy

وەك زاراوە وشەیەكی كۆنی ئەغریكی یە لە (دیموس+ كرات) پێك هاتووە، واتە دەسەلاتی گەل، دوای یۆنانیەكان كردیانە دیوكراتی و بەكاریان هێنا، ئێستا (دەسەلاتی گەل) بەمانا(دیموكراسی ئەسینیە) یان (دیموكراسی ڕاستەوخۆ)شی پێ دەلێن بێ نوێنەرو پێناو(وسیط)، جار وایە ئەو وەسفەی سەرۆكی ئەمریكی (ابراهام لنكۆلن)یشی پێ دەدرێ (دەسەلاتی گەل لە پێناو گەل).

### گەشەكردنی:

بە پێی چەندین سەرچاوەی مێژووی لە سەدەی (٦- پ- ز) لە یۆنانی كۆن نموونەی بەكارهێنانی هەبووە، بەلام لە (معجم الحدیث للتحلیل السیاسي) دەلێ لە سەدەی ٤ پ. ز بووە نەك ٦ پ- ز، لەو كاتی لە شارۆچكەیەكی بچووك هاوولاتیان كۆدەبوونەوە بۆ بڕیار دروستكردن،بە پێی (جمهوریە أفلاتون ) شارێك بریتی بووە لە هەرێمی دەولەتێك، بەلام دەبێ ئەوەش بزانین لەو كاتی مانای هاوولاتی تەنیا چینەكانی سەروو وماقولەكانی دەگرتەوە، چینەكانی هەژارو بەندەو ئافرەت وغەوارەو ڕەگەزە بێ هێزەكانی نەدەگرتەوە، كەمایەتیەكی دەگرتەوە بە پێی زۆربەی سەرچاوەكان ژمارە ی دانیشتوانی ئەوسای(ئەسینا) ۳۰۰۰۰ كەس بووینە بە پێی مانای تۆرستكراتی بۆ هاوولاتی كەمیكی لەو دانیشتوانە بۆ دیموكراسی گرتووتەوە كە زانایانی ئەو سەردەمە بە تایبەتی (ئەفلاتون) داوای بۆ كردووە، تا ئەودواییەش ئەو بنەمایە پەیرەو دەكرا لە لایەن

رۆژ ئاوا،لە کاتی داگیر کردنی کوردستان لە لایەن بریتانیاولە کاتی راپرسییەکەی سەبارەت بە لکاندنی کوردستان بە ئیراقەوە راپرسییەکە تەنها ئەوانەی دەگرتەوە کە زیاتر لە ۲۰۰روپیەیان هەیە و تەنها شولی ۲۰۰ کەسی کرد لە سلێمانی* .

هەرچەندە لە نوسینەکانی هەریەکە لە(هیرۆدۆس)، (ئەرستۆ)، (ئەفلاتون).. لە بارەی دیوکراسیان نوسیوە زۆر شاریان بە دیوکراسیانە وەسف کردووە، بە بەراورد لەگەڵ ئەرستۆکراسی و حکومەتی ئۆلیگارکیەوە، بەڵام (شکلی)بووە هەر ئەرستۆکراسیەکە بووە.

سەردەمی واش هەبووە زیاتر دەسەڵاتە لاوازەکان پیادەی دیوکراسیان کردووە، چونکە پێویستیان بە رای خەلکی هەبووە، دەسەڵاتە بە هێزەکان نەیان کردووە، بۆیە زۆر جار لە مێژوودا دیوکرسی مانای دەسەڵاتی لاوازی داوە[1]، رۆمانیەکان دیوکراسیان بەکارنەهێناوە، ناوە ناوە لە مێژوودا بە دەگمەن نمونە دەهێننەوە.

لە ساڵی ۱۲۱٥ ز (ملك جۆن سانتیر) دەستووری (ماگناکارتا)ی لە ئینگلتەرا جاردا و دانی پێهێنا کە خەلکی تریش دەسەڵاتی هەیە شان بەشانی دەسەڵاتی (مەلیك) لە ئەنجومەن ،ئەوە بە سەرەتایەکی دیوکراسی هاوچەرخ دەژمێرن، لە سەدەکانی (۱۷) و (۱۸) لە نێو ئینگلاند دیوکراسی راستەوخۆ بەکاردەبرا، لە ۱۷۹۲دوایی شۆرشی فەرەنسی زیاتر ئەو چەمکە گەشەی کرد، لە سەردەمی رابردووی ئەورووپاو هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریەکان بۆ وڵاتی هاوچەرخ زیاتر باوی وەرگرت، دیاردەکانی پەرلەمان و ئازادی تاك و هەڵبژادن و رەخنەو دەست گۆری دەسەڵاتوو فرەیی و (لا مەرکەزیەت)و ... هەریەك بە

---

[1] G- B- Enciclobia

* لەو ۲۰۰ەش تەنها ۲۲کەس قایل بوون کوردستان بە عیراق بلکێ ،بۆ زیاتر بروانە بەلگەنامەی A-٨٦٣٥ تقریر رقم - ٠-دائرە المعتمد السامي البریتاني في البلاد مابین النهرین .

ڕێژەی خۆی بە دیاردەی دیموکراسی حسابە، بەڵام لەو سەردەمەی پەرەسەندنی دانیشتوان و ئاڵۆزی ژیان پیادەی تەواوی ناکرێ و نەکراوە وەك (ڕۆسۆ) گۆتەنی.

ئەو هۆیانەی بوونە وەرچەرخانی دیموکراسی ڕاستەوخۆ (ئەسینی) بۆ دیموکراسی ناڕاستەوخۆی هاوچەرخ دوانن:

١. زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان.

٢. یەك نەبوونی بەرژەوەندی گشتی...حەقەن بەرژەوەندیەکان لێك جیان بە ناسۆیی و ستونیانەوە، بۆیە یەك دەنگ نابێ ...مەگەر تەنها بە ئایین بێتەوە دی، هەرچەندە (ڕۆسۆ) زیاتر پێی وایە دیموکراسی ئەسینی (نەکراوەو ناکرێ)[1] بە دەگمەن هەندێ نمونەی کۆن و نوێ باس دەکرێ، تەنیا چەند هەرێمێکی سویسرا (کلارس، ئەپێنزل، ئەنتروالد) گوایە دیموکراسین، لیبیاش دەڵێ من دیموکراسیە ڕاستەوخۆ و میللیەکەم، ئیستا هەمووی ناڕاستەوخۆیەکەیە، لە ڕێی ئەنجومەن و دەزگا و نوێنەران بڕیار و فەرمان پەیڕەو دەکرێ، ئەوەش لە مانا ڕەسەنەکەی دادەکەلێ، بەو هۆیەوە لە دوو سەدەی ڕابوورددوا گۆڕانێکی زۆر بەسەر دیموکراسیدا هاتووە وە بگرە هەر وڵات و هەر شارستانیەك بە شێوەیەك دیموکراسی پەیڕەو کردووە، بۆیە زۆر جۆرە دیموکراسی لێ پەیدا بووە، هەندێکیان بە نمونە تۆمار دەکەین لەو پەرەگرافەی داهاتوو .

## جۆرەکانی دیموکراسی:

١. دیموکراسی میللی یان ڕاستەوخۆ، ئەوە دیموکراسی ڕەسەنە (ئەسینی)یە کەیە، ئێستاش لەو جیهانە نمونەی نیە تەنیا (لیبیا) دەڵێ ئێمە لەو جۆرە دیموکرسیەین ! هەندێ هەرێمی سویسراش.

---

[1] في عقد الاجتماعي

٢. ديموكراسي نوينەرايەتى: چەند نوينەرێك لە جياتى ميللەت بريار دەدەن وەك سيستەمى نيستاى وەزارەت و دەزگاكانى پەرلەمان و دەزگاكانى ترى سياسى.

٣. ديموكراسى ناوەندى: داهێنانێكى شرعيەت بووە، واتە ديموكراسيى بۆ ئەنجومەنى سەركردايەتى، گوێرايەڵى خواروو بۆ سەروو يان وەك بنەماى (تفذ ثم ناقش).

٤. ديموكراسى سۆسياليستى ...(سەرنج بدە سۆسيال ديموكراتى لەو فەرهەنگە).

٥. ديموكراسى مەسيحى، يان ئايينى نوێ ..بگەڕێوە بۆ بەرنامەى (عطاط و عبر- راديۆى- مۆنتى كارلۆ) ١٩٩٨/٨/٢٧ دەڵێ: إن الله ديوقراطي في عمله.

٦. ديموكراسى ليبرال (سەرنج بدە ليبرال ديموكراسى لەو فەرهەنگەدا).

٧. زۆر جۆرى ترى ديموكراسى هەيە ...بەلام بە گشتى دەكرێتە دوو جۆر: يەكەميان ديموكراسى راستەوخۆو بەشەكانى تر بە(ديموكراسى ناڕاستەوخۆ) حسابە، ديموكراسى راستەوخۆ نەماوەو ڕەنگە نەشبوبێت، ديموكراسى ناڕاستەوخۆش ئايدۆلۆژياو بنەماو رێبازو مەبادیئی نيە، كۆمەڵە رێكەوتن و بەهايەكى سياسى هاوبەشە، هەموو لايەك كۆكن لەسەرى بۆيە ئەو هەموو دۆخە وەردەگرێ‌و خۆى بە تەنها نيە لەگەڵ تەيارو مەدرەسەيەكى تر بوونى سەربەخۆيى دەبێت.

## هەڵسەنگاندنى:

مەبەست لە هەڵسەنگاندنى هەردوو لايەنى سەلبى و ئيجابيەكەيەتى بەگشتى: هەڵبەتە هيچ شتێك نيە دوو رووى چاكى‌و خراپى نەبێت، بۆيە شتێكيش نيە لە هەموو دۆخەكانى بۆ هەموو لايەك ساف ئيجابى، حەلال، چاك، خێر، .. بێت بە هەمان شێوەش نى يە ساف سەلبى، حەرام، خراپ، شەڕ، ....بێت، ئاواش ديموكراسى ئەو سيستەمە ئەفسوناويە نى يە وەك لە

زۆربەی پەیڕەوانو ڕاپۆرتە سیاسیەکانی لایەنە کوردستانیەکانیش هاتووە، نەخێر، هەروەك لە پێشتر عەلمانیەتی کوردستان لـە قەبلاندنی مارکسیەتدا وا بەهەڵـە داچووبوون و ئەوکاتی پێیان وابوو دیموکراسی ئامرازێکی برجوازیە، کەچی ئێستا بە (دەرمانی هەموو دەردان)ی ناو دەبەن، ڕەنگە بەشێکیان لـە کاردانـەوەی ئـەو سیستەمە دیکتاتۆریانـە بێـت، بەگشتی وەك لـە لایـەن ئیسلامیەکان پێناس دەکرێو دەڵێن، دیموکراسی چاکترینی نێـو عەلمانیەتـە، یـان چـاکترین داهێنـانی بەشەریە، ...نەگینا پڕیەتی لە سەلبیات.

## سـەلبیاتەکانی:

ئەگەر دیموکراسی پڕ لە بالآی خۆشی پـەیڕەو کـرا واتـە میللـەت سەرچـاوەی دەسەلآتیش بێت ئەوا ئەو سـەلبیە سـەرەکیانەی هەیـە کـە هەریەکـەیان دەبنـە سەرچاوەی چەندین لقی تری سەلبیات، وا هەندێکیان لێ هەڵدەبژێرین:

١. زۆرجار بووە و هەمیشە میللەت یەك ڕابووینە کەچی هەڵەبووینە، هەر بە نموونە زاناو و نەزانی سەر ئەو زەویـەی خۆمـان واتـێ گەیـشتبون زەوی ناوەنـدی گەردوونە کەچی (کۆپەر نیکۆس) بە تـەنها پێـچەوانەی ئـەو کـۆ ڕایـە بـوو لـە کۆتاییدا ڕایە تاقانەکەی ئەو ڕاست دەرچوو، کەواتە زۆرایـەتی پێـوەری ڕاسـتی و دروستی ودادگەری نیە، زیاتر لەوەش هەردوو توێژینـەوەی ئایینـی و زانـستی کۆکن کە ڕای گشتی عەوامی خەڵك بەشـی هـەرە زۆری بەهەڵـە داچـووە، زیـاتر ئـەو بابەتانە دەگەڕێتەوە بۆ پسپۆڕی، خۆ ئەگەر ١٠٠ ئەندازیار ڕایان وابوو نەخۆشێك عەمەلیات نەکرێو یەك دکتۆر ڕای پێچەوانە بوو ڕای دکتۆرەکە وەردەگـیرێ، بـا سەرنج بـدەین لـە کۆتـایی مـانگی ٢٠٠٠/١ لـە پەرلـەمانی میـسر کێـشە بەناوبانگەکەی (مافی خولع لە لایەن ئافرەت) ی خستە بەردەم ئەنجومەنی زانـستی (زانکۆی ئەزهەر) کە پێکهاتبوون لـە (٤٠)کـەس، لـە ئـەنجامی دەنـگ دان ٣٥ بەرامبەر (٥)کەسی ناڕازی دەرچوو، دوای لێکۆڵینـەوەیەکی سـەرەتایی دەرکـەوت

ئەو (٣٥) کەسە پسپۆڕ نەبوون تەنها ئەو (٥) کەسە شارەزای (شەریعەت) بوون‌و دەنگیان دژی ئەو (خولعە)دا ....لە کۆتاییدا زۆرایەتی دەنگی هێنا بەڵام ڕاستی ژێرکەوت، بەو شێوەیە دەنگی نا پسپۆڕی وەك یەکە لە دیوکراسی، هەڵبژاردنی خەلکێك بۆ (فەرمانڕەوای) لە هەموان زیاتر پسپۆڕی دەوێ، وەك دەشزانین عەوامی خەڵك (ئەك ئومە) هەرگیز پسپۆڕنین تا بزانن نوێنەری ڕاست بۆ خۆ هەڵبژێرین‌و بەکەم شتێك سەرە ڕۆیانە هەڵدەخەڵەتێن‌و هەنگاوو هەڵوێست‌و دەنگەکانیان نوقسانە، لەیەك لایەنی‌و ناقوولی و ئەنجام لێك ئەدانەوەو هەنوکەییانە هەڵدەقوڵێ،... لەوبارەیە دەقەکانی ئایینی، دەرون ناسی و ئەنترۆپۆلۆژی یەکان ...ڕای میللەت بە ڕایەکی هەڵخەڵەتاوی تێ ئەگەیشتوو لە قەڵەم دەدەن، کەچی لە دیوکراسیەت ئەو ڕایە سەرچاوەی حوکمە.

٢. لە دەنگ دانا دەنگی زانایەك و نەزانێك، فەیلەسوفێك و نەخوێندەوارێك، خۆفرۆش و نیشتمان پەروەرێك، دکتۆرێك و نەخۆشێك، خۆپەرستێك گشت ویستێك ... وەك یەکەو هەریەك دەنگێکە، هەتا لەنێو میللەتانی ئەوروپاش (کە بە حساب پێشکەوتوون) زۆربەی میللەتان لە دەنگ دانا هەڵخەڵەتاون و دەنگێکی قەناعەتی نیە، کێشەکەش لەوەیە خەلکی عەوامی ئەورووپا ئە ئارەزووی سیاسیانەی هەیە نە پسپۆڕیشن لێی، هەڵبەتە پرۆسەی دیوکراسیش بە دەنگدان و هەڵبژاردنیشەوە پرۆسەیەکی سیاسیە ....

٣. لە زۆربەی دۆخەکان ئەو نوێنەرانەی هەڵیان دەبژێرین ئۆتۆماتیکیانە دەبنە نوێنەری بەرژەوەندی خۆیان و دەوڵەمەندان، بۆیە لەو سیستەمە هەژاریەکی زۆر و کەمایەتیەکیش خۆشگوزەران دەبن، هەر لە ئامارێکی ئەمریکی سامانی یەك تاك بە ئەندازەی (٢٠٠)ی ئەمریکیە، ئەو دۆخە لە کیشوەرێك بۆ کیشوەرێکیش ڕاستە، هەر لە ڕاپۆرتی ١٩٩٨ی ئامارەکانی نێونەتەوەیی بە هەمان شێوەش لە (قمة الارض- جوهانس برگ) ئامارى ترسناك تر پێشکەش کرا، ئەو دۆخە گەیشتۆتە ولاتانی خۆشمان، ئەو دیوکراسیە وای بۆ هەندێك ڕەخساندووە بەرپرسی

حزبی و ئیداری وا هەبێت مووچەکەی بە ئەندازەی (٤٩٦) مووچە خـۆری ئاسـایی وەربگرێت.

٤. کێشە سەرکیەکانی جیهان و ناوەخۆش، چ تاك چ بە کۆمەڵ بە دیوکراسـی چارەسـەر نابێت، هەتا کێشەی نەتەوایەتی بێ چارەسـەر نابێـت کـە گوایـە تاکـە چارەسـەریەتی، ئەوەتا لە وڵاتانی دیوکراسیش کێشەی نەتەوایەتی بە گـەرمی لـە ئارادایە وەك: کشـمیر- هند، کوردستان- تورکیا، فلستین - ئیسرائیل، ئیرلەنـدا- بەریتانیا، کۆرسیکا- فرنسا، باسـك- ئیـسپانیا، سـریلانکا- تامیـل، زۆربـەی وڵاتانی هەردوو ئەمەریکاو- گەلانی رەسەنەکەی، ئوسترالیا- بورجوانیـەکان،.... لەو نوقیستانیەیە سیستەمی دیوکراسی تەوافوقی سەری هەڵدا،ئـەوەش دابەشـی دیوکراسـیە بـۆ (دیوکراسـی بەشـی –دیمقراطیـة الجزئیـة-(sub- dimocracy واتە لە هەر بەشەی کیانی نەتەوەو پێکهاتێك پرۆسـەیەکی دیوکراسـی سـەربەخۆ جێ بەجێ دەکرێ، ئەو جۆرەش لـە چیکوسـلۆفاکیای پێشوور قـوبرس و لبنـان و عێراقی نوێش پەیرەو دەکرێ، لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە کوردستان یەك پێکهاتەو نەتەوەو ئاین و مەزهەبە.. کەچی لەژێر سایەی سیستەمی عەلمانی ئـەو دووحزبـە پەیرەوی دیوکراسی تەوافوقی دەکەن، هەرچەندە هەریەکە لەلای خۆی دیسان ئـەو دیوکراسیە شەپرەیەش تێك دەشێوێنی و ناوێکی ماقوول نامێنی لێی بنێێن .

٥. خودی دیوکراسـی دیوکراتخواز دروست ناکا، تەنها بەرژەوەندی پەرسـتەکان دروست دەکا، نموونەی جەزائیر بەڵگەنەویستێکە بـۆ سـەرجەم ئـەو ئەزموونانـە، ئیـسلامیەکان بە دیوکراسیانە زیاتر لە ٨٠٪ ی دەنگیان هێنا کەچی حکومەت و عەسکەر هەڵیان وەشاندەوە و جیهانی دیوکراسیش نەك هەر دەنگیـان هەڵنـەبڕی بەڵکو لایەنگری حکومەت و لایەنـە عەلمانیـە دۆڕاوەکانیـان کـردوە دیوکراسـی سەربڕا لەبەر چاوان.

٦. لە کۆنەوە تێبینـی رەگەزپەرسـتی لەسـەر دیوکراسـی هـەر هـەبووە، لـە کاتێکدا لە هەمـوو مێژوو و بە ئێستاشیەوە بە دەگمەن نموونەیـەکی نیـە لـە نێـو

قولەرەش و بەندان کەگەیشتبێتە پلەی سەرکردایەتی وەك لە ئیسلاما (بلال حبش) پێی گەیشت، پیاوێك ئاوا هەژارو غەوارەو بەندە بە دیموکراسیانە بگاتە پایەکی ئاوا (نموونەی نەبووە)، هەر بۆیەش دیسان راپۆرتی ٢٠٠١ی رێکخراوی لێبووردنی گشتی کە لە کۆتایی مانگی (٧) بلاو کرایەوە رەگەزپەرستی دا پالّ زۆربەی وڵاتانی جیهانی نوێش، ئەو خەلەلە لە ناخی دیموکراسیە مادام راستی و دادگەری بە زۆرایەتی دەنگ و کەمایەتی دەپێورێ لە ئەنجاما زۆرایەتی کەمایەتی دەبا، ئەوەش هەمان یاسای بنجینەیی (دارونیەتی کۆمەلآیەتیە)کە لە کۆتاییدا (البقاء للاصلح) بۆ بەهێزو زۆرەکان دەبێت، ... ئیتر ئەوە سەرچاوەی کۆمەلّێك دەردی ئابووری و نەتەوەیی و چینایەتی و... دەبێت.

٧. لە دیموکراتیا بانێك و دوو هەواو چەند هەوا زۆربەاوی دەبێت، هەر لەژێر خوردکردنەوەی ئەو دیموکراسیە بووە جەنگەکانی جیهانی لێ بڕیاردراوە، بە تاوانەکانی بەکارهێنانی چەکەکانی کیمیاوی و ناووکی و گینۆسایدی تری هەر بە پرۆسەی دیوکراسیش نازیەکان گەیشتنە دەسەلآت، تا ئێستاش تاوانێکی زۆر بەدەنگی رەسمی دیموکراسیانە دەکرێ ...

## ئیجابیاتەکانی:

بێجگە لەو خالآنەی سەروو زۆربەی پانتای دیموکراسی نیجابیە، هەر ئەو وەسفەی رەنگە بەس بێت بۆ ئیجابیاتەکانی کە دە وترێ چاکترین داهێنانی بەشەریە، لەو وەسفەدا ئیسلامیەکانیش تیادا هاوبەشن[1] مەبەستیان لەوەیە مادام حوکمی ئیسلامی ئامادە نەبێت ئەوا دیوکراسی لە هەموویان چاکترە، لە سەربەستیەکانی بیروڕاو دەست گۆڕی دەسەلآت و سەروەری یاسا بۆ گشتی و مافی ئەیاری سیاسی و یاسایی، ...هتد. بەکورتی هەموو ئەو جۆرە سیستەمانەی داهێنانی بەشەری وەك مەدەنیەت، دیوکراسی، سەروەری یاسا، امم المتحدە،

[1] علی باپیر - چارەسەری کورد لە نێران ئیمان و پەرلەماندا

مانـی مرۆڤ، مافی ئافرەت، یاساکانی تری نێودەوڵـەتی، مـافی چـارەنووس، زۆر داهێنانی تر، ئەوانە دادگەری و بەهەشت نـاهێنن بـۆ مـرۆڤ بـەڵکو لـە باشـترین دۆخیاندا لە دۆزەخیان رزگار دەکەن.

تێبینی: هەندێ خاڵی تری سـەلبی و ئیجـابی هەیـە بۆیـە تۆمارمـان نـەکرد چونکە بەشێکی دەکەوێتە ئەستۆی لیبراڵ دیموکراسـی و بەشـێکی تـری دەکەوێتـە ئەسـتۆی پەرلـەمان و .... هەڵبەتـە هەریەکـەیان لەوانـە جیـان لەگـەڵ خـودی دیموکراسی.

## دیموکراسـی و مەدرەسـەکان:

ئەوەی ئێستا پەیرەو دەکرێ لـە جیهـان هیـچی دیموکراسـی راسـتەوخۆ (یـان دیموکراسیە ئەسینیەکە) نیە، فەرمان رەوای راستەوخۆی هەموو گەل بێت، بـەڵکو لە رێی نوێنەران و ئەنجومەن هەڵبژاردنە ، واتە دیموکراسیەکی ناراستەوخۆی یـان (دیموکراسـی نوێنـەراتی) یـە، بگـرە هـەر وڵاتو هـەر شارسـتانیەك بـەجۆرێك دیموکراسـی بۆخـۆی سـوڕاندوە هێناویەتـە سـەر واقیعـی میللەتەکـەی، بۆیـە دیموکراسی ئەمەریکا لەگەڵ رووسیا جیان، لەناو عەرەبیش وەك (معمر قزافی) بـە نوکتە وەسفی دیموکراسی کردو ووتی: لە دوو وشە پێکهاتووە یەکـەمیان یۆنانیـە دیمۆس واتە (حوکم) دووەمیان (کراسی) عەرەبیـە کەواتـە دیموکراسـی مانـــای (حکم کراسی)[١]!! لە کوردستانیش شەڕ لەسەر دەسـەڵات دەکـرێ کەچـی هـەموو لایەکیش بە خۆ دەڵێن دیموکراسی، لە کاتێکـدا دەسـت گـۆڕی دەسـەڵاتو قایـل بـوون بـە ئـەنجامی سـندوقەکانی دەنـگ خـاڵی جەوهـەری دیموکراسـیەو لـەو سەردەمەدا، هەرچەندە دیموکراسیەتی کوردی زۆر پێشکەوتووترە لە دیموکراسیەتی عەرەبی ئێستا، بەهـەر حـاڵ چونکە دیموکراسـی ئایدۆلۆژیـــاو رارەو بەرنامـەو مەبادیئی چەسپاو نین، زیاتر پـەیمانێکی سیاسـیە نـەك رارەوی سـیاســـــی،

[١] لە کۆنگرەی هاوبەشی ئەفریقی ئەورووپی ئەو باسەی کرد.

واته میکانیزمێکه بۆ ڕێکخستنی ڕەنگە جیاجیاکان، (لیـون بـرادەر) لـەکتێبی ((political ideology)) وە (جاك لیڤی)ش لـەکتێبی (democracy) زۆری تریش وەسفی دیکراسی بەبێ لایەن وبێ ئایدیۆلۆژیا و...دەکەن، بۆیە ئازادەیـەك ناونانی حزب وحکومەتێك بە (پارتی دیموکراتی) هەڵەیە، دەشێ حزبێك لیبراڵـی بێت یان لیبرال دیموکراسی بێت، بە هەمان شێوە مدرسەی دیموکراسیش نیە، هـەر مدرسەیەك بە جۆرێك سوودی لێ وەرگیراوە، واتە هـەموویان لەگـەڵ دیموکراسـی لێك جیان، ئەو تۆمەتە زۆر بە هەڵەیی دەدرێتە پاڵ ئیسلامیەکان بە نادیموکراسی ناوزەدیان دەکـەن، کەچـی هیـچیان دیموکراسـی نـین، ڕەنگـە هەندێکیان لەبـەر ترقستانی خۆی زاوزێ لەگەڵ دیموکراسی (یان هەر سیستەمێکی ئیجابی وبـاو) دەکا. ڕاستیەکەی ئەوەیـە لـە بـاری سروشـتی خـۆی دیموکراسـی ئـەو پـەیمان و میکانیزمە دەدا بەو مدرسانە کە تواناکانیان لە ڕێی دیموکراسیەوە بتەقێنێتەوەو کامەیە سەرکەوتوو گونجاو، بۆیە دیموکراسی بەو پلە خستە بەند نیە بە قۆنـاغی مێژوویی و پیشەکیو گەشەی سەرمایەداری و مەدەنیـەت و عـەقلانی ...هتـد، هەروەك (ئـالان تـورین) لـە کتـێبی (مـا هـي الديمقراطيـة؟) دەڵـێ دیموکراسـی نایەتەدی بێ عەلمانیەت[١]، ئێستاش عەلمانیەتی کوردی و عـەرەبی سەر لەنوێ ئـەو بانگێشەیان زیندوو کردۆتەوە و دەڵێن دیموکراسی ئەو کاتـە دێتـەدی کـە ئـایین و سیاسەت لێك بکرێتـەوە...!! ئـەوەیان چ پەیوەنـدی بـە دیموکراسـی نیـە، ئـەوە مەزهەبی میکافیلی و هۆبزیە، ئەوانە بیـانوی دیکتاتۆرانـە کـە لـە دیموکراسـی دەترسن، ئەگینا دیموکراسـی ڕێکەوتنێکـە و بەرهـەمی سـەعاتێکە لـە هـەموو سەردەم و لە هەموو ئاستێك و زەمـان و زەمینێـك دەکـرێ، چـاکترین نموونـەش دیموکراسی سنگالو نایجیریاو هندستان و ....زۆر وڵاتی تر، لێرەدا دیموکراسی ئەو میکانیزمە دەبێت کە کامیانە میللـەت هـەڵی دەبـژێرێ، ئـیتر کـە هەڵبـژێردرا مانای هەڵبژاردنی دیموکراسـی نیـە، مانـای ئەوەنیـە ئـەوەی هەڵبـژێردرا دەبـێ

[١] خۆ دیموکراسیە ئەسینیەکە کە پەیدابوو نە عەلمانی و نە ڕاسمالی هەبوو.

پەیڕەوی دیموکراسی بکا وەك زۆربەی ڕەوشەنبیرانیش وای تێگەیشتون- نەخێر، ئەو مەدرەسەیە بەرنامەی خۆی پەیڕەو دەکا کە لە ڕێی دیموکراسیەوە دەنگی دراوەتێ جا چ شیوعیەتە، چ سۆشیال دیموکراتە، ئیسلامە، لیبرال دیموکراسە، واتە دیموکراسی هەریەکە لە لیبرالی وشیوعی وئیسلامی دەدا بەلام خۆی نە لیبرالەو نە شیوعیەو نە ئیسلامیشە، بەو شێوەیەی زۆر بەکورتی باسێکیان دەکەین.

## ١. لیبرال دیموکراسی:

بەشی زۆری عەوامی خەلك و ڕەوشەنبیرێکی زۆر (دیموکراسی) و( لیبرال دیموکراسی) تێکەڵ دەکەن، بویە هۆی کۆمەڵێك کێشەو هەڵسەنگاندنی چەوت، لە کاتێکدا دیموکراسی تەنها میکانیزمێکە، ئایدۆلۆژیا نیە، ڕێباز نیە، لیبراڵ دیموکراسیە ڕێبازێکی کۆمەلایەتی و سیاسیە وە سیستەمێکی تیۆروانینی ژیانەو ڕۆژئاواش پیشەنگیەتی، کۆمەلێك گۆڕانکاری بەسەرهێناوە، لە کۆتاییدا هەر هەمان مانا دەبەخشێ و ئەو مەدرەسەیە دەیەوێ کۆمەلگەیەکی لیبرالی و ڕێبازێکی ئابووری سەرمایەداری دروست بکا لە ڕێی پرۆسەی دیموکراسی، ئەو سیستەم و شێوازە تەنێ ئەو زادی (عەولەمە)ش نیە، بەلکو بەرهەمی پرۆسەیەکی مێژوویی سەرمایەداریە، دیموکراسیەتێکە گەمارۆ دراوە بە سیستەمێکی کۆمەلایەتی لیبرالی بۆیە هەرچەندە بەرواڵەت پێکهاتووە لە فرە لایەنی و سەربەستی بیروڕاو نوێنەرایەتی پەرلەمان و یاسای ئۆپۆزسیۆن و دەست گۆڕی دەسەلات ...بەلام لە کۆتاییدا هەر دەسەلاتی سەرمایەدارانە بەسەر زۆرینەی گەل، لە جەوهەردا مانای هەر شێوە ی ئەو گەلەیە لە یۆنانی کۆن، تەنها بۆ چینێکە، چینی بورجوازی، بۆیە ئاهەقی مارکسیەکان نەبووە کە بەو جۆرە سیستەمەیان وتووە دیموکراسی بورجوازی، هەرچەندە لە هەموو مەدرسەکانی

تر لە دیموکراسی نزیك ترە کەچی دیسان لە دیموکراسیە ڕەسەنەکە زۆر دوورە، چونکە:

أ. ئەو نوێنەر پەرلەمان و حکومەتەی هەڵ دەبژێرێن دیسان هەر کەمایەتیەکن بەسەر زۆرایەتیە ، زۆربەی جار نوێنەری بەرژەوەندی هەڵبژێر ناکەن.

ب. ئەو دەنگ دانە هەڵخەڵەتاوی تیایە، و دەستورەکان ڕێگرن لە گۆڕانکاری ڕیشەیی، و دیموکارسیشیان تەنگەبەر کردووە.

## ٢.مەدرەسەی شیوعیەت:

خۆی بەرنامەیەکی تیروتەسەلە، (دیکتاتۆری پرۆلیتاریا)ش یەکێ لە کۆڵەگە بنچینەییەکانیەتی، بۆیە لە ڕووی واقعی بریتی بوون لە کۆمەڵێك ڕژێمی دیکتاتۆری ڕەسمی، زۆر بە ناستەنگ جێگەی جۆرە دیموکراسیەك کراوە لە قۆناغێکی گواستنەوە بە ناوی (دیموکراسی ناوەندی)،ئەوەش هەر دیوێکی تری مانای دیکتاتۆریە، ئەوەیان لە کاتی تواناو دەسەلاتی ڕەهایتیان، بەلاّم وەك حزبێکی شیوعی بۆ بەشداری ژیانی سیاسی لەگەڵ حزب و لایەنە نا شیوعیەکان، ئەوەیان مەیدانێکی مشتومڕی خەست بووە، بە شێکی ڕەسەنی شوعی(چەپیەکان بە گشتی) باوەڕیان بە توندو تیژو ئیرهابانەهەبوە لەدژی دام و دەزگای سەرمایەداری بەحزب و لایەنە سیاسیەکانیش، بەشێکی تریش کە زیاتر (ئۆرۆ شیوعیەکان) بوونە پێیان وابوە دەشێت لە ڕێی دیموکراسیانە بینای سۆسیالیستی و دوایش شیوعیەت بکرێ...بەو بنەمایەوە چوونە ناو مل ملانێی دیموکراسیەکانو بەرجەستەیەکی ڕاستەقینە تری شیوعیەتیان پێش کەش کردووە لە چەندین وڵات، خەریك بوو بگەنە دەسەلات لە واتە حزبە شیوعیەکانی فەرەنسا، برتغال، ئیتالیا، .....واتە لە قۆناغێك لە قۆناغەکان دەشێ دیموکراسی وەك ئامرازێك لە خزمەتی شیوعیەت وەرگیرێت، نەك دیموکراسی خۆی ئامانج

بێت .... ئەگینا سەرانی شیوعیەت هەردەم دیموکراسیشیان بە ئامرازێکی بورجوازیانە لە قەڵەم داوە، وەك خزمەتكارێكی سەرمایەداری.

## ٢. مەدرسەی سۆشالیستیەکان:

لە ڕاستیدا ئالیرەدا- واتە سەبارەت بە دیموکراسی - هەردوو سۆشیالیستی سەربە ڕێبازی مارکسی و سۆشیال دیموکراسی و دیموکراسی لێکجیابوونەوە، ناو لە سۆشیالیستی مارکسی نرا "سۆسیالیستی زانستی" تا بە تەواوی لە سۆسیالیستەکانی تر جیابکرێتەوە بە تایبەتی (سۆسیال دیموکراسی) کە بە (دوو ڕوویی) وخراتر لە سەرمایەداری باس کراوە لە لایەن: مارکس، ئەنجلس، لینین،.. لە کاتێکا سۆسیالیستی زانستی هەمان هەڵوێستی شیوعیەتی سەبارەت بە دیموکراسی هەبووە، کەچی سۆشیال دیموکراسیەکان زۆر جیاواز بوینە، تەنانەت لەگەڵ ئۆرۆشوعیەکانیش، سۆسیال دیموکراسەکان لە ئامانجە بنەڕەتیەکانیش هەندێ مەبادیئی سۆسیالیستیان خەفەکردوە بە مەیدەنی دیموکراسی ڕەسەن و ڕای جەماوەر و......بەڵام لە کۆتاییدا ئەوانەش هەر دیموکراسی نین بەڵکو دەیانەوێ کۆمەڵگەیەکی نیمچە سۆشیالیستی لە ڕووی ئابووری پێك بهێنن لە ڕێی پرۆسە دیموکراسیەکان ..بۆیە ناویان نراوە سۆسیال دیموکراسیەکان .....ئێستا ئەزموونەکانی ئەو مدرسەیە سەرکەوتو تر بوو لە ناو شیوعیەت و سۆشیالیستەکانی تر.

## ٤. مەدرسەی ئیسلامی:

هەروەك لە مدوسەکانی پێشوش دەرکەوت کە هەریەکە ڕێگاو بەرنامەو ئامرازە کۆمەڵایەتیەك دەگرێتەبەر بۆ پەیرەوکردن و پێشکەشکردنی نموونەیەکی کۆمەڵگەی دادگەر، لە ئەنجامداو لە کۆتاییدا کۆمەڵگەیەکی دیموکراس دروست نابێت و هەر خودی فەرمایشتی (کۆمەڵگەی دیموکراسی) چەوتە، بەڵکو

كۆمەڵگەیەكی لیبراڵ یان شیوعی یان سۆشیالیستی یان ئیسلامی یان تێكەڵێك لەوانە دروست دەبێت، بە هەمان شێوەش بەرنامەی ئیسلام وا دەخرێتە مەل ملانێی دیموكراسیانە بۆ وەرگرتن و پێشكەشكردنی نموونەیەكی نوێی كۆمەڵگەی ئیسلامی، بەڵام دەبێ بزانرێ كە بەرنامەی ئیسلامی وەك بەرنامەعەلمانیەكانی تری وەك: (شیوعی وسۆشیالیستی و لیبراڵ و ...)نیە كە بەردەوام دەستكاری بكرێت و زیادو كەمی تێدا بكرێت، یان زاو زێی پێ بكرێ لەگەڵ مەرسەمو ریبازو تەوژمی تر، بەڵكو بەرنامەیەكی تێرو تەسەلە جێگەی هیچ هاوردەیەكی تێنا نابێتەوە، بەرنامەیەكی چەسپاوە بۆ كۆمەڵگەیەكی گۆڕاو، ئەو بەرنامەیەی لەسەردەمی نەزانی و مرۆڤ فرۆشتن و ئافرەت لە چاڵ نانەوە كۆمەڵگەیەكی باڵای پێشكەوتووئموونەیی دروستكرد هەمان بەرنامە لە سەردەمی ئینتەرنێت و فابریكەی باڵاو عەولەمی قۆ دروست دەبێتەوە، ئێستا وا نەك هەر ململانێ لەگەڵ مەرسەكانی عەولەمە دەكا بەڵكو بە تاكە چارەسەر بۆ هەموو كۆمەڵ خۆی گەلاڵە دەكا، كەواتە پەیوەندی ئیسلام و دیموكراسی پەیوەندی زاوزێ نیە، هاوبەش نیە، تەواوكەری یەكتریش نین، ..دیموكراسی تەنها ئامرازێكە بۆ گەیشتن بە ئیسلام، واتە قۆناغێكە لە رێگە، لە كاروان، لە نێوان (سفر)و (یەك)دا، بۆیە حوكمەكان لەسەر دیموكراسی بە زەمان زەمین و وێستگەی پێگەیشتنی كۆمەڵگە دەگۆڕێ ....ئەگەر ئاستی كۆمەڵ لە نزیك سفر و ژێر یەك بێت جیایە لەگەڵ ئەوەی لە سەرووی یەك بێت، ئە قەبلاندنی ئەو (ئاستەیە) بوویتە هۆی بەربابوونی دەمەتەقێیەكی بێ پسانەوە لە ناو ئیسلامیەكان لە بارەی دیموكراسی، كە بە سەرەكی دەبنە سێ بەش :

بەشی یەكەم: بە تاكە رێگای گەیشتن بە ئامانجی دەزانن و هەتا دەیگەیننە پلەی هاوبەشی شەریعەت.

بەشی دووەم: بە كوفری دەزانێ.

بەشی سێیەم: ئەو بەشە زیاتر واقعیانە ترو سەرکەوتترو ترە کە بەرێگەیەك لە ڕێگەکانی دەزانێ لەکات و سات و قۆناغی خۆی.

ئەوەی یەکەم و دووەم وەك لە توێژینەوەکانی زۆربەی زانایەکانی سەردەمی ڕابوونی ئیسلامی دەردەکەوێ کە لیبراڵ دیموکراسی و دیموکراسی تێکەڵ کردووە....بۆیە هەریەکە بە جۆرێك دیموکراسی بە ڕێبازێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی لە قەڵەم داوە و ناوی وەك: (أسلوب الحياة، دين المعاصر، عقيدة الديموقراطية، .....)بە پاڵ وەناوە، هەموو ئەو ناوو هاوەڵناوانەش هەڵەن ....ئەوانە دەشێ لیبراڵ دیموکراسی بن بەڵام دیموکراسی ئەو سیفەتانەی نیە، بە تایبەتی دیموکراسی ئێستا مانا ڕەسەنەکەشی گۆڕاوە وەك لە پێشوو باسکرا، زیاتر مانای (دەست گۆڕی دەسەڵات، ئازادی بیروڕا، هەقی معارەزەیی، سەروەری یاسا بۆ گشت، ..) هەموو ئەو ئیجابیانە بە جۆرێك لە جۆرەکان لە ئیسلام دا هەیە، بەڵام لە هەمووشیان لێك جیایەو ....هەر بە نموونە لە دیموکراسیدا (معارەزە) هەمیشەییە ئەگەر بەشداری (حوکم) نەبوو ...کەچی لە ئیسلامدا ئەرکی معارەزە دۆزینەوەی بەڵگەی بێ شەرعیە، واتە هەمیشەیی نی یە، لەسەر هەق لایەنگریەتی ولەسەر ناهەق ناتەبا دەبێت. هەروەها دەبینین باڵاترین شێوەی دیموکراسی (یان دیموکراسی ئیجابی) لە ناو ئیسلام ساغ دەبێتەوە، با سەرنج بدەین: ڕاستی مانای دیموکراسی بریتیە لە(الولاية للشعب) لەوەشدا وەك باسمان کرد کۆمەڵێك سەلبیاتی هەبوو، سەلبیاتەکانیش لە سروشتی ئەو(شعب)ە دێت کە نەزان و نەفام و عەوام و....زاناو پسپۆڕ تێکەڵە، بەڵام کاتێ ئەو (شعب)ە پەروەردە دەبێت و گەشەدەکات بۆ پلەی (ئومە)کە نەزانی و نەفامی و عەوامیەتی تیا نامێنێ ئەوا (ولاية للشعب) دەبێتە (ولاية للامة)، ئەوەش (مقاصد)ی بنچینەی حوکمی ئیسلامە ...بەو شێوەیە (دیموکراسی سەلبی) دیموکراسیە نزم و دواکەوتووەکەیە لەگەڵ ئیسلام ناکۆکە ئەگینا (دیموکراسی باڵا) ناکۆك نیە لەگەڵ بیری ئیسلام، ئەو دۆخە بۆ هەردوو جۆری دیموکراسیەکە ڕاستە

چ ئەسینیەکە (ڕاستەوخۆیەکە) چ گۆڕاوەکە (ناڕاستەوخۆیەکە)، ئەوکیشانە هەر زادەی ئەو دەم ودەستە نیە ئەگەر بەووردی سەرنجی بدەینی دەبینین ئەوەش دەچیتەوە کیشەکانی فقهی کۆن، بەشیك پێیان وابوو شریعەتی خودا لە خودی شتەکان همیە بۆیە وەك پیویستی بەشەری بەرە بەرە دیتە جیّ بەجی بوون، ئەگەر پەیامیشی لەگەل نەبوایە، ئەو ڕەوتە پێی وایە عەقلی بەشەری ڕاست ودروستیش دەگاتە هەمان ڕاستیەکانی پەیام لە دوا گەشتی گەشەسەندنیدا، هەرچی لای تر، عەقلی پیّ دەست کورتەو تەنها پەیام بەتاکە سەرچاوەی دادگەری دادەنیّ، ئیترلەگەل سەرەتاکانی دیموکراسی لەگەلّ (حكم الشعب ) ناتەبا دەبیّتەوە پێی وایە حوکم تەنها نی خوایە، لاکەی تریش پێی وایە حوکمی خوایە،بەلاّم چۆنیەتی پێی گەیشتنی بەدیموکراسی وعاقلا نە لەهەموونامرازەکانی تر چاك ترە، ئەوەش زیاتر لەسەردەمی کۆن ونوێدا سەرکەوتووتر بوینەبە هۆی بەرنامەکانی چاکسازیان.

کەواتە ئەرکی بنچینەیی بزوتنەوە ئیسلامیەکان لە فەزای دیموکراسیدا گەشەپێدان و پەروەردەکردنی تاك و کۆمەڵە بەرەو پێش و بیناکردنی ژێرخانی ئەخلاقی و فکری ئەو کۆمەلگەیە، ئەو کاتی بە ئۆتۆماتیکی خۆی دەبێتە کۆمەلگەیەکی ئیسلامی ئەگەر دەسەلاّتداران لە دیموکراسیەتەکە پەشیمان نەبنەوە ...ئەوەش دەروازەی چارەسەرکردنی تێك گیرانی یەکجاری نێوان دیموکراسی و فکری ئیسلامیە.

* تێبینی: هەڵبەتە جارێکی تر لە زاراوەکانی فیکری ئیسلامیدا دەگەڕێینەوە سەر ئەو بابەتانە.

## ئەزموونە نوێکانی:

لێرەدا کەمتر مەبەستمان لە دیموکراسیەتی ڕۆژئاوایە کە خاوەن کەلتورێکی مێژوویی و زەمینەیەکی ئاینی مەسیحی بۆ سازاوە گەمارۆدراوە بە لیبرالیەتی کۆمەلایەتی و ئابووریەکی سەرمایەدارانە، وای لەو دیموکراسیە کردووە (مسەیەر) بێت، بۆیە دەبینین زیاتر لەبەك سەدەیە ئەو دوو حزبەی ئەمەریکی بە نۆرە فەرمانڕەوان، زیاتر مەبەستمان لە ئەزمونی ولاتانی موسڵمان نشینە، لە دوای شکستی شیوعیەت لە ١٩٩٠ بە دواوە جۆرێك دەروازەی دیموکراسی ناوەناوە دەکرێتەوە بە خێرایی دادەخرێ، لەو ولاتانەی کە بۆ ماوەیەکیش بێت دیموکراسی بە ڕاستی لێ نەهاتبێتەدی. ئەوا بە خێرایی ئەو لایەنانە گەشەی کردووە کە خاوەنی بەرنامەو پەروەردە و ئایدۆلۆژیاو ......بە پێچەوانەش هەموو ئەو لایەنانە شکستی خواردووە کە خاوەن بەرنامەیەکی نامەبدەنی و عەلمانی بووە کە هەر خۆویست و بێ خزمەتگوزاری بووە، بۆیە بینیمان لە ولاتانی جەزائیر، تورددن، تورکیا، بەحرەین، مەغریب، نایجیریا، پاکستان، مالیزیا، هەندێ ولاتی تر ...لە هەمووی ئیسلامیەکان زۆر بە خێرایی لێنی سەرکەوتروبوون، هۆیەکەش سادەو ساکارە، ئەوەیە ئیسلامیەکان دەوڵەمەندن لە بەرنامەو فکرو مەبادینەکان کە بەشی هەموو کەسی پێوەیە، کەچی حزبە عەلمانی و دەسەلاتدارەکان دەوڵەمەتدن لە ماددەو زەبرو زەنگ، مادەکە بۆ کەمایەتیەك و زەبرو زەنگەکەش بۆ زۆرایەتی، بۆیە لە دیموکراسی وئازادیدا زۆرایەتی دەنگ بە ئاسانی لە عەلمانی و دەسەلاتداران لادەداو ئیسلامیەکان دەنگی گەلێ زۆریان دەهێنا، بەلام بەشی هەرە زۆر لەو ولاتانە بە پشتیوانی ڕۆژئاوا لەو دیموکراسیە ڕاستەقینە پشێمان دەبوونەوە، جۆرێك لە دیموکراسی دەتاشرا کە هێزە سەرەکی وکاریگەریەکانی لێ هاوێر دەکرا، ئینجا حیزبی دەسەلاتدار تەنها لەگەڵ چەند حزبۆکەو لایەنی وا دەچوونە نێو پرۆسەکە کە دەرچوونی خۆی مسۆگەر بێت، ئەو دیموکراسیەی جیهانیش ڕوون تر دەردەکەوێ ڕۆژ بە ڕۆژ بە تایبەتی لەو هەموو خۆپیشاندانە

جیهانی و ناوچەکیەکانی ولاّتانی لایەن لە جەنگی عێراقی ٢٠٠٣ کە دیموکراسی و ڕای گشتی و زۆرایەتی دەنگ و شەرعیەتی دەولی ...بەرامبەر هێز هەر ژێرکەوتوو بووە.

(٣١)

## سیستەمی دوو حزبی نظام الحزبين BI-PARTY

سیستەمی دوو حزبی چەمکێکی سیاسی سەربەخۆیە، مەبەست لێی ئەوەیە لە وڵاتێکی دیموکراسی دوو حزبی سەرەکی بۆ منافەسەی دەسەڵات چالاکی سیاسی دەکەن ،حزبی سێیەم و چوارەم و....هەیە بەڵام رۆڵێکی وایان نیە، عادەتەن بە نۆرە دەسەڵات دەگرنە دەست، نەك دوو حزبی منافسی جەنگی لە پێناو دەسەڵات وەك ئەو ئەزموونانەی لە کۆتایی سەدەی بیستەم هەریەکە لە: کوردستان لە نێوان (پ.د.ك)و (ی.ن.ك) روویدا، لە چاد لە نێوان (حسین هەبری و غۆکۆنی عوێدی)، لە یەمەن لە نێوان (حزبی سۆشیالیستی و حزبی کۆنگرە)، لە ئەنگۆلا لە نێوان (یەکێتی نیشتمانی بە سەرۆکایەتی ساڤمبی و بەرەی میللی بە سەرۆکایەتی نۆگستینۆنیتۆ لە ساڵی ١٩٧٦ بەدواوە)...، راستە ئەو ئەزموونانە دوو حزبی بوینە بەڵام دیموکراسیانە نین و زیاتر دوو حزب و دوو دەسەڵاتیشیان بە خۆ داوە بێ ئەوەی بگەڕێنەوە دەنگی میللەت، سیستەمی دوو حزبی دیموکراسیانە ئەوەیە کە لە ئەنجامی دەنگی میللەت و چالاکی سیاسی دروست بوینە، هەریەکەیان کە دەنگی سەرکەوتن دەهێنێ کەمتر پێویستی بە دەنگی حزبی منافسەکەی یان حزبێکی تر دەبێت بۆ هاوپەیمانیەتی و تەواوکردنی ژمارەی یاسایی یەکەی بۆ حکومەت دروست کردن، ئەوەی تر جاری جەنگ نادا بەڵکو دەبێتە معارەزەیەکی یاسایی و تا هەڵبژاردنێکی تر، دەتوانین دوو نموونەی زۆر بەناوبانگ لەو سیستەمە وەرگرین یەکیان بەریتانیا بوو ئەوەی تر ئەمەریکا، کەمێك هەڵوەستە لەسەر مێژووی ئەزموونەکانیان دەکەین بۆ چاکتر تێگەیشتن:

### نموونەی یەکەم – ئەزموونی بەریتانیا (کرێکاران و پارێزگاران):

لە ساڵی ١٦٨٠ز را بەرە بەرە لێك نزیك بوونەوەیەك سەری هەڵدا بۆ یەکخستنی راوبۆچوون و پالێوراوی بۆ دەسەڵات لە لایەن کۆمەڵێك خەڵکی بازرگان و پیشەسازو تەکنۆکرات کە پێیان دەوترا (وێگ –دوای لە چینی برجوازی خەملی)، چینی دووەم زیاتر ئەو خەڵکانە بوون کە دەرەبەگ و جوتیاری گەورە و پیاوانی ئاینی و لایەنگرانیان لە پارێزگارانی داب و نەریتی بەریتانیای رەسەن دەکرد پێیان دەوترا (تۆری)، چینی یەکەم زیاتر ئارەزووی گۆڕانیان هەبووە کەچی چینی دووەم (تۆری) ئەوانە (محافزکار- پارێزکار) زیاتر کۆنەپەرست بوینە، دوای لە چاکسازیەکانی (١٨٣٠، ١٨٧٦، ١٨٨٤)....بە تەواوی بوونە دوو حزبی لیبرال (ئەحرار)و پارێزگاران، لە کۆتایی سەدەی (١٨) حزبی کرێکاران دروست بوو تا گەیشتە ئاستێکی چالاك، لە نێوان ١٩٢٢ تا ١٩٣٥ بووە سیستەمی سێ حزبی (کرێکاران، ئەحرار، پارێزگاران)، لە دوایدا (حزبی ئەحرار- لیبرال) بە جێما، سیستەمی دوو حزبی لە دوای ١٩٣٥ خەملی لە (کرێکاران و پارێزگاران)، تەنها لە دۆخە سەختەکان هەڵوێستەکانیان هاوبەش بووە وەك لە جەنگی جیهانی دووەم بە سەرۆکایەتی (چەرچل) لە ساڵی ١٩٤٥ بۆ یەکەم جار کرێکاران بردیانەوە لە هەڵبژاردن ئیتر تا ئێستا بە نۆرە دەسەڵات دەگرنە دەست.

### نموونەی دووەم-ئەزموونی ئەمەریکا (کۆماری دیموکراسی):

لە دوای سەربەخۆیی ١٧٧٦ز و گەشەی کێشە سیاسیەکانی دەسەڵات زیاتر سیاسەتمەداران بوونە دووبەش (نەك دوو حزب)، یەکێتیەکان بە سەرۆکایەتی (هاملتۆن) و کۆماریەکان بە سەرۆکایەتی (جیفرسۆن)، ئەو دابەشیە لە سەردەمی ج. واشنتۆن بوو، ئەویش زیاتر لایەنگری (یەکێتیەکان) بوو، دوای تەواو بوونی هەردوو دەورەکەی ج.واشنتۆن لە ساڵی ١٧٩٦ ململانێیەکی سیاسی توند لە

نێوانیان پەیدا بوو لەسەر هەڵبژاردنی سەرۆکی نوێ، هەریەکە لە(ج ئادەمز) پاڵێوراوی یەکێتییەکان و(جیفرسون)یش پاڵێوراوی کۆمارییەکان بوو، لە ئەنجاما ئادەمز دەرچوو، لە ساڵی ۱۸۰۰ نۆرەی کۆمارییەکان هات و دەرچوون، لە ساڵی ۱۸۲۸ یەکێتییەکان ناوی خۆیان گۆڕی بۆ (دیموکراسی)، کۆمارییەکانیش بە سەرۆکایەتی (ابراهام لینکۆڵن) وەك خۆیان مانەوە، لە جەنگە ناوخۆییەکانیان دا بەرە بەرە ئەو شێوە حزبییەی وەرگرت، لە ساڵانی ۱۸٦۰- ۱۹۳۳ کۆمارییەکان وەك تاکە حزبێك لە گۆڕەپان بوون ..تا (رۆزفلت)ی دیموکراسی دەسەڵاتی وەگرتەوە لە ۱۹۳۲ وە تا ئێستا هەر بە نۆرە دەسەڵات دەگرنە دەست وەك سیستەمێکی دوو حزبی[1]، دوو حزبییەکەی سیستەمی ئەمریکا توندترە، ڕەنگە لە بریتانیا مۆڵەتی ئەو سیستەمە درێژە نەکێشێ.

ئەوەی سەروو دوو نمونەی مێژووی بو لە دروست بوونی ئەو سیستەمە، بەشێکی زۆر لە لێکۆڵەوەران پێیان وایە ئەم جۆرە سیستەمە بە جۆرێك لە دیکتاتۆری و یان (دیکتاتۆری دیموکراسیانە)ی لە قەڵەم دەدەن، چونکە زۆربەی دابەش و دارشتن و پێکهاتنی هەڵوێستی ئەو دوو حیزبانە لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی چینە باڵاکانە، حزبی بەرژەوەندی لێ دەردەچێت نەك مەبادیئی، ئیتر رۆڵێکی زۆرینەی چینی هەژاری تیا نامێنێ، بەڵام ئیجابیاتیشی ئەوەیە بە سانایی حکومەت پێك دەهێنن، بڕیار دەدەن، کاروبار ڕادەپەڕێنن بێ قەیران، یەکسەر دەنگی یاساییان تەواوە بێ (ئینتلاف)کە یەکێکە لە قەیرانەکانی ئەزموونی دیموکراسی و فرەیی وەك ئەزموونی ی فرنسا کە ماوەیەك لەو قەیرانە وا ئالابوو، هەر کابینەی حکومەت دەگۆڕا .

ئەو جۆرە سیستەمە لە ڕۆژئاوا زۆر درێژەی کێشاوە، وا ئێستا لە عەولەمە ئاسۆی فرە حزبی لێ سەری هەڵداوە، لە جیهانی سێیەم ئەو جۆرە دوو حزبییە چ بە دیموکراسی چ بە نادیموکراسی تەمەن درێژ نیە، لە تورکیا (ئەجەوید و دیمیریل)

[1] بۆ زیاتر بڕوانە –النظم في العالم المعاصر-د.سعاد الشرقاوي. النظم السياسية د.مشهداني

چەند ساڵێك لەهەشتاكانی سەدەی ڕابووردوو بە هاوتایی وا هاتن ،دوای گەشەكردنی (حزبی ڕەفاهو- حزبی دادو پەرەپێدان)ی ئیسلامی ئەو هاوسەنگیەی هەڵتەكاندو لەو ساتەی ئووسین هیچیان تاكە كورسیەكیان نیە لە پەرلەمان، هەروەهاش ئەزموونی یەمەن لە نێوان هەردوو حزبی سۆشیالیستی (علی ناصر)و كۆنگرەی (علی عبدالله صالح) تەنها چەند ساڵێكی خایاند (حركة الاصلاح)ی ئیسلامی وەك هێزی سێیەم كەوتە مەیدان و لە هەڵبژاردنی ١٩٩٣ (٦٣) كورسی هێنا، حزبی سۆشیالیستی تەنها (٥٦) كورسی هێنا، حزبی كۆنگرە (١٢١) كورسی هێنا كوتایشی بە سیستەمی دیارشی (دوانەیی) هێنا.

هەروەها لە پاكستان لە نێوان (ڕابیتەی ئیسلامی-بەسەرۆكایەتی نەواز مشریف)و (حزبی گەل-بەسەرۆكایەتی بنەماڵەی بۆتۆ) ماوەیەك ئەو هاوتاییە پەیدابوو، دوای ڕابیتەی ئیسلامی بە شێوازی دیموكراسی بە یەكجاری زاڵ بوو بەسەر گۆڕەپان تا كودەتاكەی (پەرویز مشرف)، لە كینیاش بەهەمان شێوە (یەكێتی ئیشتمانی)و (یەكیتی دیوكراسی)، ... لە كوردستانیش لە دوای ١٩٧٦ سیستەمی دوو حزبی بە نادیموكراسیانە بەردەوام بووە تا ئێستا، (پ.د.ك)و (ی.ن.ك)، لە یەكەم هەڵبژاردنی نیمچەدیكراسی لە١٩٩٢(پ د ك) ٤٦٪ دەنگی رابەریشی ٤٨٪ ، ٢٥٦٧٢ دەنگی لە یەكێتی زیاتر هێنا، بە هەمان شێوە ئەو دوو حزبەش وەك جیهانی سێیەم وا پێدەچێ هێزی سێیەم لەسەر دەستی ئیسلامیەكان جێگە بە سیستەمی دوو حزبی لە كوردستانیش لێژ بكا. ئەو وەستانەی لەسەر شێوەی سیستەمی دوو حزبی دەق دەگرێ لە جیهاندا گۆڕانی زەحمەتە، بەڵام لە جیهانی ئیسلامی ئەو گۆڕانە تەنها بە (ئیسلامیەكان) دەكرێ چونكە هێزی گۆڕان لە ئیسلام دا خەستە، بۆیە زۆربەی سیستەمەكانی دوو حزبی چ بە دیموكراسیانە چ بە نادیموكراسیان لەسەر دەستی ئیسلامیەكان كۆتایی پێهات. لەهەر وڵاتێك ئەگەر زیاتر لە دوو حزبی لێ پەیدابوو كە قورساییان بایی ئەوە نەبێ بە تەنها حكومەت دروست بكا، ئەوا سیستەمی فرە حزبی پێ

(٣١) سیستەمی دوو حزبی     نظام الحزبین     BI-PARTY

---

دەوترێ، هەڵبەتە هەموو ئەوانە لە چوارچێوەی سیستەمێکی فراوانتری دیموکراسی کە بە(فرە لایەنی- تعددیە) ناو دەبرێ.

(٣٢)

## فره لایەنی التعددية pluralism

چەمكێكی سیاسیە مەبەست لێی بوونی چەند لایەنی سیاسی لە چوارچێوەی دەولەتێكی دەستووری سیستەم دیموكراسییە، زۆرجار فرە لایەنیەكی رواڵەتی دەكرێ وەك لە جیهانی عەرەبی زیاتر، بەلام حزبی سەركردە سەرۆكی هەتا هەتایە ... لە ژێرەوە دەولەتی نادستووری و مولكیەتی دەولەت (پاشای نادستووری) دەسەلات دارە، ئەوەیان فرەلایەنی ساختەیە.

لەو سیستەمەدا وەك پێشوو نیە، زیاتر پێویستی بە هاوپەیمانیەتی و لیستی هاوبەش دەبێت هەم بۆ هەڵبژاردن هەم بۆ پێكهێنانی حكومەت و بەردەوامیەكەی، ئەگینا زۆربەی جار رووبەرووی قەیران و نائارامی دەبێتەوە، زۆرجاریش سەوداو سەوداكاری ماددی بەرامبەر ئەو هاوپەیمانیەتیە دەكرێ بۆ وەگرتنی رادەی پاسایی دەنگەكان، زۆرجاریش ئەو دۆخە رەنگ دەداتەوە سەرباری ئابووری و كۆمەڵایەتی و سیاسی و هەتا سایكۆلۆجیش بە سەلبی، بۆیە هەندێ لە زانایان رەخنەی توند ئاراستەی ئەو سیستەمە دەكەن، هەتا (ملك فیصل) ی یەكەم شای عیراق لە ١٩٢١ زۆر دژی فرە لایەنی سیاسی وحزبی بوو، بەلام سیاسەتی بالای بریتانیا بێ دەنگی كرد ، لە لایەن زانایانەوە ئەو سیستەمە بە ئامرازی دابەش و پارچە پارچەیی میللەت حسێب دەكەن، ئەمە دەسەلات و بەرژەوەندی پەرستی و چەند رووپی و گواستنەوەی وەلائوسەنگەر ...وەك لایەنی سەلبی ئەو سیستەمەیە، سەرباری قەیرانی گۆرانی خێرایی حكومەت، تەنانەت لە فرنسا لە سالی ١٩٤٦ تا ١٩٥٨ (٢١) كابینەی وەزارەت دروست كراو گۆرا.

به تێكڕايى له كۆمارى سێيه‌مى فرنسا نزيكه‌ى ١٠٠ كابينـه دروسـتكراو گـۆڕا ....تا ديگۆل له ١٩٥٨ هاوپايانيه‌كى دروست كرد، ئيتر ئه‌و قه‌يرانه كـه‌م بـۆوه بۆ نێوان ڕاست ڕه‌وه‌كانى-ديگولى‌و چه‌پ ڕه‌وه‌كانى سۆشياليستى، ....بۆيه ئـه‌و سيسته‌مه له چاو ديكتاتۆريه‌ت وسيسته‌مى شولى ئيجابيه ئه‌گينا نموونه‌يى نيه، ئێستا ديسان نه‌خشه‌ى سياسى وا ده‌گـۆڕێ، حزبى سـه‌ره‌كى بـه‌ره‌و لاوه‌كيـه‌و پێـچه‌وانه‌ش، به‌تايبـه‌تى لـه جيهـانى ئيسـلامى كـه بزووتنـه‌وه ئيسـلاميه‌كان كه‌وتونه‌ته گۆڕه‌پانى سياسى به شێوازێكى ديموكراسيانه وا به‌ره به‌ره كۆتـايى بـه سيسته‌مى فره لايه‌نى‌و هه‌تا دوو حزبيش ده‌هێنێ هه‌روه‌ك بينرا له جـه‌زائير لـه ٨٦٪ ى ده‌نگيان هێنـاو بێ پێويستى به هاوپـه‌يمانى له‌گـه‌ڵ هـيچ حزبێكـى تـر، (به‌ره‌ى ئنقازى ئيســلامى جزائـر) بـه ســه‌رۆكايه‌تى پرۆفـسۆر عـه‌باس مـه‌ده‌نى ده‌يتوانى حكومه‌ت يێك بهێنێت به‌هێزى خزمه‌ت و دڵسۆزيه‌كه‌ى بـه‌رده‌وام بێـت، هه‌روه‌ها له توركياش له فره لايه‌نيه‌وه (حزبى دادو په‌ره‌پێدانى ئيسلامى) ده‌نگى ته‌واوى هێنا وه‌ك تاكـه حـزب لـه ده‌سـه‌ڵاتدا ....بـه‌ڵام ئـه‌زموونى جـه‌زائر بـه ديموكراسيه‌وه له لايه‌ن ده‌سه‌ڵاتى سه‌ربازيه‌وه وه‌رگێڕدراوه بۆ ديكتاتۆريه‌وه ..بۆيه ئێستا جيهانى ئيسلامى له‌گه‌ڵ بوونى ديموكراسى ڕاسته‌قينه يه‌كسه‌ر كۆتـايى بـه فره‌لايه‌نى دێت.

ئه‌و دياردەيه هه‌ر له جيهانى موسڵمان نشين نيه، چونكه فـره لايـه‌نى تـه‌واو ڕاست و دروست نيه، له به‌رامبه‌ر ديكتاتۆريه‌ت هاته‌كايه‌وه هه‌رله چـاو ئـه‌ويش ئيجابيـه، ئـه‌وا لـه ئـه‌وروپاش ڕاديكاڵيـه‌كان بـه‌ره‌و گه‌شـه‌ن وه‌ك بينـرا لـه هه‌ڵبژاردنه‌كانى فه‌ڕه‌نسا، نه‌مسـا، ڕووسـيا، ....هه‌ڵبه‌ته ئه‌و تاك حيزبه‌ى سـه‌روو كه ئيسلاميه‌كان به ده‌ستيان هێناوه‌و ده‌هێنن له‌و جه‌وهه‌ره‌دا جيايه له‌گـه‌ڵ تـاك حزبى ده‌سـه‌ڵاته ديكتاتۆريـه‌كانى وه‌ك حزبـى شـيوعى، نـازى، فاشـى..وحزبـه ديكتاتۆريه نه‌ته‌وه‌گه‌ريه‌كان وعه‌لمانيـه‌كانى تر، له يه‌كه‌مدا له ڕێى ديموكراسـى و ڕاى ميلله‌تـه لـه دووه‌مـدا لـه ڕێى ديكتـاتۆرى و ئينقلابـى سـه‌ربازى و ڕاى

کەمایەتی و تاکە کەسێکە ، هەڵبەتە فرەلایەنی زۆر پەیوەستە بە دیموکراسیەوە، تافرە لایەنی هەبێ دیموکراسی پێویستە، بەڵام هەردووکیان ئامانجی ئەبەدی رەهەزەلی نین، لەکرتایدا یەکێ لەو مەدرەسانە دەردەچێت ئیتر کۆمەڵگە بە دیموکراسیانە لایەنەکانی تر خانەنشین دەکا، وەك ئێستای تورکیا وئێران وفلستین و زۆر شوێنی تریش بەرێوە ن .

## مەدرەسەکان و فرە لایـەنی؛

ئەو فرە لایەنیەی باس کرا لە پێش تر بە ئاسایی خۆی ئەوە دەقاو دەق هەڵوێستی مدرسەی لیبرال دیموکراسە، کە تەواوە رەنگ دانەوەی بازاڕی ئازادو چالاکیە سەرمایەداریەکانە، بۆیە فرە لایەنی سیاسی یەکێکە لە کۆڵەگە بنچینەییەکانی بنەمای لیبرال- دیموکراسی، لەو مدرسەیە فرەلایەنی ئامراز نیە ئامانجیشە، واتە فرە لایەنی لە پێناو گەیشتن و دۆزینەوەی ڕاستی و دادگەری تیە، پاساوەکانی فەلسەفی و زانستیش بۆ ئەو هەڵوێستە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریانە ئەوەیە کە سروشت و گەردوون بە تێکڕایی لە ڕەنگ و جۆری جیاجیە پێك هاتوون، بە هەمان شێوەش پێکهاتەی دەروونی بەشەری و کۆمەڵگەش لە تەبیعاتی جیا جیاو ئاستی جیاجیا پێکهاتووە، ناکرێ و ناشێ لەیەك قاوغ کۆبکرێتەوە، بۆیە فرەلایەنی بە دیاردەیەکی ڕەسەن و پێویست دەزانن، تا ڕادەیەك سۆشیال دیموکراسیەکانیش هەمان ڕایان هەیە بە تایبەتی دوای زەق بوونەوەی عەولەمە و دارمانی مدرسەی شیوعیەت، ئەگینا پێش تر ڕایان وابوو کە فرەلایەنی واقیعێکە بەڵام مەرج نیە واقیعێکی ڕاست و دروست بێ، بۆیە هاتنیان بۆ ناو ئەو واقعە بە مەبەستی کۆتایی هێنان بە فرەلایەنی و بەرەو بنیادنانی کۆمەڵگەیەکی سۆسیالیزم بووە.

هەرچی مدرسەی شیوعیەت بوو، تەواو پێچەوانەی ئەو فرەلایەنیە بووە، ئەو مدوسەیە پێی وابوو حزب نوێنەری چینێکە، چینەکانیش لە ناکۆکی (مان و

ئهمان) دان لهگهڵ یهکتر، بوونی یهکیان نهبوونی ئهوی تره، بۆیه فرهلایهنی بـهرای مارکـسیهت دیاردهیـهکی رۆژئـاوایی و لـه خزمـهتی سـهرمایهداری و چـینی برجوازیه، له جیاتی فرهلایهنی فکرهی دیکتاتۆری پرۆلیتاریـا هاتـهدی[1]، کـه لـه کۆتاییدا دهبووه دیکتاتۆری تاکه شهخس و تاك حزبی به تهواوی مانـاو سـیفاتی دیکتاتۆریهو، لهسهر ئهو بنچینهیه له وڵاتانی سۆشیالیستی و یـهکێتی سـۆڤیهت تهنیا بوار به(حزبی شیوعی) دهدرا گوایه نوێنهری چینی کرێکاره به بێ منافهسه و ههڵبژاردن، له دهستوریش را تۆمار دهکرا وهك به روونی له دهستوری سۆڤیهتی ١٩٧٧ رۆڵی حزبی شیوعی وهك سهرکرده و پێشرهو به تاقی تـهنها دهکـا، بـهلام سهرهنجام ئهو تاك رهوی دیکتاتۆریهی شیوعیهت له لایهن کۆمهڵ راپێچی رابردوو کرا، ههڵبهته ئهوانهی دژی فره لایهنن و باوهڕیان به دیاردهی (تاك حزبی و حزبـی سهرکرده) ههیه جگه لهوهی پاسـاویان ئهوهیـه کـه پـهیام و رزگاریـان پێیـه بـۆ ئۆناغێکی میللهتهکهیان یان یهکجاری، گوایه پهرینهوهو دهرباز و جێبهجێکردنی ئـهو پهیامـه تـهنها بـهو حـزب و سـهرکردهیه دهکـرێ ....لهوانـه حزبـه ناسیۆنالیزمهکانی نازی و فاشی، شۆفینی، فالانژسـی، بهعـسی، تـورانی، .... ههروهها چهپیهکان و ههندێ باڵی ئیسلامی سهلهفیش ئهو باوهڕو پاساوهی ههیه.

ههرچی ههڵوێستی فکری ئیسلامیه ئهوا وهك ههڵوێـستهکانی تـر دووبهشـی سهرهکیه له نێوان دروسـتی و نادروسـتی (وهك زیـاتر لـه چـهمکهکانی فکـری ئیـسلامی بـه درێـژتر باسـی دهکـهین)، بـهلام بهشـی هـهره زۆری بزووتنـهوه ئیسلامیهکان رایان وایه که فره لایهنی گۆرهپانێکی ئازاده بـۆ بهشـداری کردنـی خهڵك و دهرخستنی بهرنامهکان، مادام له ههڵبژاردنی ئاینا مرۆڤ ئازاد بێت ئـهوا له ههڵبژاردنی عهقیدهی سیاسیش ئازاده، بۆیه له مدرسهی ئیسلامیدا فرهلایهنی قهدهغه ناکا بهلام تێ دهکۆشێ له پێناو نههێشتنی له رێی پرۆسهی دیموکراسـی،

---

[1] بۆ زیاتر سهرنج بده :          أ- مبادئ الشوعية- انجلس          ب. بيان الشوعي- انجلس- ماركس          ج. الدولة والثورة- لينين          د- نظم السياسية ل٢٢٧

واته هەتا لە کاتی دەسەڵاتی ئیسلامیش بە تۆبزی ڕێ لـە فرەلایـەنی سیاسـی و ئاینی ناگیرێ، هەروەك لە ئەزموونی نوێی سـودان و ئێران بینیمان، مەولەت بـە حزبی نا ئیسلامیش دراوە، لە ئێران ڕێ بە (حزبی توده- حزبی شیوعی)ش دراوە لە تورکیاش (حزبی دادوگەشە) حکومەتە بە تەنها حزبەکانی تریش سەربەستن لـە چالاکی سیاسـی، ئێستا وای لێهاتووە کـاتی ئیسـلامیەکان لەرێـە دەگەنـە دەسەلات بوار بۆ لایەنە عەلمانی ونۆێزیسۆنیش دەکرێتەود، بە هـەمان شـێوە لـە نموونەیەکی مێژوویش لە شوێنێکی وەك قوبرس کـە تزیـك پایتـەختی خەلافـەتی عوسمانیش بووە زۆر لێشی بالاّ دەست بووینە کەچی دەبینین لە دوای ڕزگـارکردنی لەسالی ١٥٧١، لە لایەن (بـاب العـالي)ی عوسمانیـەوە سـەربەخۆیی تـەواو درا کەنیـسە ئۆسقف وەك نوێنەری میللەتی ڕۆم و ئەرتۆدۆکسی قوبرسـی، لـە سـاڵی ١٧٥٩ز وە دووەمین کەسێتی وڵات لە دوای (والي) ناوی هاتووە،، لە سـەردەمی سـوڵتان عبدالمجیـدی یەکـەم (١٨٣٩-١٨٦١) لـە ١٨٥٦ ئەنجومـەنی ئیـداری و دادگای پێکهات لە چوار چێوەی نوێنەری هەریەکە لە یۆنانی و موسـڵمانی[1]، بـە هـەمان شـێوەش لـە قۆنـاغی (ئینتتالیـدا) هـەموو واقعێـك لـە لایـەن فکـری ئیـسلامیەوە هەڵسوکەوتی لەگـەڵ دەکـرێ، بـەڵام بـە مەبەسـتی گـۆڕینی نەك گونجان و ڕاهاتن لەگەڵی، بەو جۆرە وا هەڵـسوکەوتی لەگـەڵ واقعـی فـرە لایـەنی دەکا، هەموو کەرەسـتەو ئامرازی هاوتا بوونی مرۆڤەکانی پێیە لەسەر ئەو زەویـە بێ پێویستی بە فرە لایەنی، بە پێچەوانەی مدوسەی شـیوعیەت کـە بانگێـشەی دژی فـرە لایەنـە و کەچـی بەرنامـەو عەقیـدە سیاسـیەکەی هـەموو کۆمەڵگـە ناگرێتەوە، لـە باشـترین دۆخیـدا چـینێك لـە کۆمەڵگـەی دەگرتـەوە کـە چـینی کرێکـاران بـووە، نـەگینا چـینەکانی برجـوازی و دەرەبـەگو جوتیـارو....هتـد چینەکانی تری کە ناوی نراوە وردە برجـوازیو زۆر توێـژی تـری نەدەگرتـەوە، لـە ئیسلامدا لەسەر ئەو بنچینەیەی چینایەتی و هێزی ماسولکەو قەبارەی مولکیـە

---

[1] موسوعة السياسية ب٤ ل٧٤٦

ناڕوانێته مرۆڤ، بەڵکو لەسەر بنچینەیەك دەڕوانێته مرۆڤ کە هەموو مرۆڤ تیایدا وەك یەك هاوبەشە، ئەویش بنچینەی عەقڵە، بۆیە بەرنامەی ئیسلام کراوەیە بۆ هەموو مرۆڤێك لەسەر ئەو زەویە بێ هاوڕێکردن، هەر بۆیەش مەحاڵ نیە کۆبونەوەی هەموو مرۆڤایەتی لەسەر بەرنامەیەکی عەقلانیەت هەروەك چۆن هەموو مرۆڤایەتی ئێستا کۆکن لەسەر ڕاستی و دروستی (٣+٤=٧)، لەو کاتەدا فرە لایەنی نابێتە پێویست، بۆیە دیاردەی سروشتی و گەردوونی فرە ڕەنگی و فرە ئاستی و جیایی سروشتی و مرۆڤ و جیای شێوەی نابێتە پاساو پەرژین لە ڕێی ئەو هەڵوێستە گەردونیە، دەبێ بە وردتر تێی بنۆڕی، ئەو پاساوانە بۆ فرە لایەنیەکی کۆمەڵگەیەکی ستونیە، واتە پاساوە بۆ ئەوەی ڕەوایی فرەلایەنی ڕەگەزیو تایفیو نەتەوەیی و ئاینی و کۆمەڵایەتی کلاسیکی پێ وەرگری ....بەڵام پاساو نیە بۆ کۆمەڵگەیەکی ئاسۆیی، کە تیایدا تاکەکانی مرۆڤ لە ئینتیما ئاسۆی (عەقلی، فلسفی، سیاسی، ئاینی،....) یەکسان بن.

## فرە لایەنی لە عەولەمەدا:

لە عەولەمەدا گۆڕان بەسەر نەخشەی کلاسیکی عەقیدەو هزرو فەلسەفەو ئینتمای سیاسی هاتووەو زیاتر دێت، لێرەدا سنوری جوگرافی نابێتە فاکتەرێکی پۆلین، نابێتە لە قالب دانی بەبڕوار عەقیدە ...، بەهۆ تێڕوانین و هەتا ئینتمابەکانیش (عابر القارات)ە، هەر بۆیەش ئەو ڕستانەی ئێمەی موسڵمان، تێرەی مەسیحی، ئەوانی هندۆسی، ئەوروپای مەسیحی ... دەقیق نین، وەك مەسەلەکەی نیسبی ئاینشتاینی لێهاتووە ١٠٠٪ ڕاست و دروست نین، بە هەمان شێوەش ئەو ڕستانەی دار الاسلام، دار الكفر، دار الحرب، ... ئەو حوکمە ڕەهایانە پڕ مانا نیە بە تایبەتی لە سەردەمی عەولەمە، مادام ئەو حوکمانەی (دار الاسلام)، (دار الكفر).. لەسەر بنچینەی سنوری جوگرافی دەدری نەك لەسەر بنچینەی عەقلی سیاسی کۆمەڵگە، ئەوە لەو سەردەمە هەڵە دەردەچی....بە

(٣٢) فرە لايەنى التعددية pluralism

تایبەتی لەو ساتەی کە سنوری جوگرافی (لەو عەولەمەدا) کاریگەری لەسەر مرۆڤەکانی نێو باوەشیدا زۆر لاواز بووە، ئێستا هەر تاکێك ڕاستەوخۆ لەگەڵ هەموو جیهان کارلێك دەکا، بۆیە ئەو تاکە کوڕی هەموو جیهانە نەك شوێن و ناوچەو نیشتمانێك، وا ئێستا دەبینین لە (دار الاسلام) -ئەگەر ڕاست بێت دارالاسلام یەکسان بێت بە وڵاتانی موسڵمان نشینەوە- ئەوا پۆشاکی ئیسلامی لێ قەدەغەیە، مزگەوتەکان دادەخرێن، .....کەچی لە (دار الکفر)دا بە دەگمەن نە بێت ئەگینا هەر ئازادی هەیە بۆ ئیسلامەتی، لە (دار الاسلام) پڕیەتی لە ئنتمای شیوعی و سوشیالیستی و لیبڕالی....پڕیەتی لە ئنتمای فەلسەفی و عەقیدەی جیالە ئیسلام، با لە ناسنامەشی نوسرا بێت ئیسلام، بەهەمان شێوەلە ئەوروپاش دەبینین پڕیەتی لەوئینتمایانەو ئینتمای ئیسلامیش، ئەو چوار مدرسە سەرەکی یە (ئاینی، سۆشیالیستی، شیوعی، لیبڕالی) لە فەزای سیاسیدا بە جیهان تەنینەوە بێ ئەوەی فاکتەرە شاقوڵیەکان لە شوێنی جوگرافی و نیشتمان و ڕەچەڵەك ڕێگر بێت، بەو شێوەیە عەقیدە و ئاین و ئینتمای سیاسی بە تەواوی لە جوگرافیا جیا بوێتەوە، ناوچەیەك نیە بە ڕەهای بۆ مدرسە و ئاینێك لەو ساتەدا، ڕەنگە لە ئایندە جۆرە وەسفێکی تر هەڵگرێ، هەر خۆشی ئاین و هەموو بیرو بڕوایەکی ئاسۆیی میراتی نین، لە باوك و دایکەوە بۆی بمێنێتەوە، بەڵکو وەرگیراوە (مکتسبە) و خۆی لێی بەرپرسیارە بە پلەیەك، کەواتە هەڵەیە ئەگەر بڵێین ئەوروپای مەسیحی و سەرووی ئەفریقای ئیسلامی و هندستانی هندۆسی و یاپانی تاوی و .....لە خودی ناویەك میللەت و نیشتمان ئەو ڕەنگانەی تیایە بابە زارەکی و ناسنامەدا ناوی تر هەڵگرێ لە ..مەسیحیەت و هندۆسی و ئیسلامیدا، ئەو ناسنامەیە گوزارش لەجەوهەری مرۆڤی نوێ ناکا، لە ڕاستیدا ئەو جەوهەرە شێوازێکی ترە لە ئینتماو لایەنگیری بۆ مدرسەکان کە پێك هاتوون لە ئاوێتە بوونی ئایدۆلۆژیاو ئاین، ئەو ئاینانەی کە پێویستیان بە تەواوکردن هەیە لە لایەن ئایدۆلۆژیای مرۆڤەوە، واتە لە هەموو جیهان وا بەرەو ئەو ڕەوتەیە

کە لە هەر فەرزایەکی سیاسی ئینتما و بوونی هەر چوار مذهبـــەی ســەرەکی لــێ پەیدا دەبێت، واتە فرەلایەنی لە عەولەمەدا بە لایەنی کەمەوە چوار لایەنی تیایە یان زیاتریش لە پێکهاتەی نێوانیان، ئـەو چـوار لایەنـە لـە ســەرووی دەســتوور و یاسان، ئەوانە تەزکیەی گەردوونیان هەیە بۆ مەزڵەتی چالاکی سیاسی لەو فـەترە مێژووییە، ئەگەرچی لـەو ســەردەمە ئـەو فاکتــەرە (واتــە عەولەمــە) بنــچینەو داینەمۆی فرە لایەنیە بەڵام هەڵەشە ئەگەرفرە لایەنی تەنها بدەینە پاڵ عەولەمە، بەڵکو گەلێ جار دیاردەی لێك ترازان (ئنشقاق)و کێشەی تایبەتی و سزای حزبـی ....بوویتە پەیدابوونی فرە لایەنی، ...هەروەك ئەزموونی حزبـە کوردســتانیەکان بەڕوونی دەردەکەوێ، دەبینین زۆربەی حزبە کوردستانیەکان لە حزبی پـێش خۆیـان جیابوینەوە، بە تایبەتی لە (پ.د.ك) .

دەبێ لە لایەکی تریشەوە تێبینی بکرێت کەوا (عەولەمە) فرەلایەنی دەدا لـە هەمان کاتیشدا فاکتەری سڕینەوەی فرەلایەنیـشی هـەڵگرتووە*، چـونکە هـەتا هەتایی نیە لە کۆتاییدا عەولەمە یەکیان تەزکیە دەکا، بە پـێی یاسـای (البقـاء للاصلاح) یەکێ لەوانە کە لە فکرو فەلســەفەکەی وئینجا پیـادە کردنەکـەی لـە هەموان دەوڵەمەندترە، لە بەرنامەو پەیڕەوکردنا لە هەموان شمولی ترو تێروتەسەل ترە، ئەوەیان سەردەکەوێ و چارەنوس کۆمــەڵی ســەر زەوی دیـاری دەکـا..نـەك هێزی ســەربازی بەڵکو زیاتر بەهۆی پێویستی کۆمەڵ بەو بەرنامـەیە وەك دەریـازو چارەســەری کێشەکانی مرۆڤ و کۆمەڵ.

---

* هەتاکاریگەری لەسـەر لێك نزیك کردنەوەی فرە زمانیش کردووە بۆ یەکخستنی، وا ئێستا لە کوردستان بەرە بەرە زاراوەی زمان لەنێو دەچی لە قازانجی زاراوەی تر، یەکێ لەوانە زاراوەی هەولێرە

## (٣٣)

## پێکدادانی شارستانیەکان اصطدام الحضارات
## the clash of civilization

لە وەرگێڕانی ئەو چەمکە لە سەرچاوە ئینگلیزیەکەی بۆ عەرەبی بە ڕستەی جیاجیایا گوزارش کراوە لەوانە؛ (صراع الحضارات، اصطدام الحضارات، ...... بۆیە لە کوردیەکەش بە (پێکدادانی شارستانیەکان و ململانێی شارستانیەکان، .....) هاتووە.

ئەو ئەدرێسەی سەروو کتێبێکە لە لایەن (سامۆئیل هنتگتون)ی ئەمریکی نووسرابێتەوە، لە دوای شکستی شیوعیەت لە نەوەتەکانی سەدەی ڕابووردوو، زیاد لە پێویست برەوی پێدرا، بە کورتی دەیەوێ بیسەلمێنێ کە جیهانی تری و عەولەمە دابەش بووە بۆ چەند شارستانیەکی جیاجیای سەرەکی ڕۆژئاوای مەسیحی، ئیسلامی، کۆنفۆشیوسی، ئەفریقی، یابانی، هیندۆسی، ئەرتەدۆکسی،..... هتد ئیتر ئەو شارستانیانە لەگەڵ یەك ناسازێن و پێکدا دەدەن، لە پێش هەموویان شارستانی ئیسلامی و شارستانی ڕۆژئاوایی بە هیچ شێوەیەك پێك ناگەن و ناشێت تێك بگەن بە یەك دادەدەن بە پێی ئەو تیۆرە......، سەرەنجامی ئەو ململانێیەش هەم لە ناوەڕۆکی ئەو کتێبە هەم لە کتێب و ئەدرێسێکی تایبەتی تر هاتووە بە ناوی (کۆتایی مێژوو) لە نووسینی فۆکۆیاما، لەگەڵ چەندین کتێب و ئەنزیراتی نوێی تری وەك (سەرکەوتنی بێ جەنگ- نیکسۆن) تەنزیراتەکانی (کیسنجر)...بە هەموویان هەروەك (مەسەلەی جەنگی هرمجدۆن) نامۆژگاریەکی ناڕاستەوخۆی جیهان دەکەن کە بە خێراتر خۆیان تەسلیم بە شارستانی ڕۆژئاوار

(حتمية التاريخية)ی سەرمایەداری بکەن، ئێستا ئەو تیۆرە لە سەردێری کتێبێك دەرچوو بووەتە چەمك و زاراوەیەکی سیاسی و فکری و فەرهەنگی، بویتە چەکی تیۆریو پیادەکردنی رۆژئاوا لەو قۆناغەدا، واتە بە کورتی دروستکردنو تەنزیرکردنی بناغەیەکی فراوانی کۆمەڵایەتیو سیاسی و زانستیو مێژوویی‌و ئابووریو نەژادیو ئاینیشە...بۆ ئەو ململانێ و دۆخەی جیهانیەی ئێستا، بە هۆی ئەو تیۆرە هەموو ئەو ئامانجە داگیرکاری و چەوساندنەوەو جیهان خۆری‌و نادادگەریەکەی کە لە بەرامبەردا خەباتی گەلان و تەقەلای پەیداکردنی زانستی‌و رزگاریەکانی نیشتمانی و فکری و سیاسی و فەرهەنگی.. بە سەریەکی کۆکردۆتەوە بە ناونیشانی (ململانێی شارستانی) پیشانی دەدا، ....بۆیە ئەو تیۆرە ئێستا چەمکێکە گوزارش لە سیاسەتی رۆژئاوا دەکا بەرامبەر جیهان بە گشتی‌و جیهانی ئیسلامی بە تایبەتی، بە هەمان شێوەش بۆ هەڵسەنگاندن‌و لێکۆڵینەوە، لەو تیۆرە نابێت تەنها لە لاپەڕەکانی ئەو کتێبە بۆی بگەڕێین بەڵکو رۆژانە نموونەی نوێی لێ پەیدادەبێ‌و بەڵگەی نوێی بۆ پەیدا دەکەن هەر لە راستیشدا بە درێژایی بەشی هەرەزۆری بەرەی پێك گەیشتنی هەردوو شارستانی ئیسلامی‌و مەسیحی لە جیهاندا وەك هێڵی تەماس ئارام نین و ئارادیەك ئەو تیۆرە بەهێز دەکا، نەك بۆ رووداو جەنگە مێژوویەکانی نێوانیان هەتا بۆ سەردەمی ئێستاش، وەك دەبینین لە نێوان (چیچان‌و رووسیا، ئەرمینیاو ئازەربێجان، ئەلبانیاو کۆسۆفۆو بۆسنەو سربیا، هەردوو بەشی قوبرس، بەرەی مەسیحی‌و ئیسلام لە لبنان، مەغریب‌و ئیسپانیا، سودان‌و خواروو، میسری‌و قبتیەکان، ئەریتریاو ئەسیوپیا، ویلایەتە موسڵمانەکانی نایجیریاو بەشەکانی تری نایجیریا .... تا دەگاتە تەیموری خۆرئاواو ئەندۆنیسیا، فلیپین‌و ئیسلامیەکانی مۆرۆ ....، چەمك و بانگەوازەکانی ئەمریکا لە بارەی تیرۆر، عەولەمە، سیستەمی نوێی جیهانی، ....هەروەها دووبارە دابەش کردنەوەی جیهان بۆ دوو بەرە (یان لەگەڵمی یان دژمی) وەك (ج. بۆش لە دوای ١١/ی سێپتەمبری ٢٠٠١ز

جاری دەدا) هەمان دروشمی دارشتەوە کە لە کێشەی کوبای١٩٦٢ سەری هەلدا ولاتە بچوکەکانی کەوتنەوە ژێر تیرهاب؛ ئەوانەو هێزەکانی ئەمریکاو داگیرکردنی ئەفغانستان و عێراق و هەنگاوەکانی داهاتویشی پەیرەوکردنی ئەو تیۆرەیە.

## بەلگە نوێیەکانی ئەو تیۆرە:

گەرچی ئەو تیۆرە داهێنانە نەك دۆزینەوە، بەلام رۆژانە بەلگەی رواڵەتی (شکلی) دێتە پێش پاساوەکانی ئەو تیۆرە بەهێز بکا، بەشێکیش لەو پاساوانە لە لایەن هەندێ تەیاری ئیسلامی پێشکەش دەکرێ بەو تیۆرە بێ ئەوەی بە چاکی هەست بە خۆیان بکەن، جاردانی جەنگ لەگەڵ رۆژئاوا، تەقینەوەکانی بێ سنور، گوتارەکانی دژ بە سەرانسەری رۆژئاوا.......پارمەتیەکی راستەوخۆی ئەو تیۆرەیە، دەبێتە بەلگەی سەرباری دروستی ئەو تیۆرە، هەر بە کورتی و خەستی بەشێکیان لێ هەلدەبژێرین:

١. هەموو ئەو ململانێیەی کە لە سەروو باسکرا لە نێوان رۆژئاوای و میللەتانی ئیسلام.

٢. پەیدابوون و بەردەوامی ناکۆکی میللەتانی ئیسلام و گەلانی دراوسێیانیشیان. هەر لە: عەرەب و جوو، کشمیر و هند، ئیسلام و هندۆس، ئەرمینیاو ئازربێجان، لیبیاو چاد، سودان و دراوسێکانی خوارووی، .....لەگەڵ نمونەکانی سەرووی پێشێووی نێوان ئیسلام و مەسیحی لە بەرەی جیهانی ئەوا بەلگەیەکی تری پێکدادانی شارستانی ئیسلامە لەگەڵ شارستانی رۆژئاوا. ئیتر لەگەڵ ئەم هەموو تەقەلاو مەزنکردنەی (مەترسی ئیسلامی) بە ئەدرێسی جیاجیای وەك مەترسی تیرۆر، یان وەك دەلێن شیوعیەت بەیەك تەوەر دژایەتی دەکردین خەریك بوو هەلمان لوشی، کە تەوەری ماددی بوو، ئێستا ئیسلام بە دوو تەوەر دەیەوێ هەلمان لوشی. کە(تەوەری ماددی و روحی)یە....یان وەسفکردنی پێغەمبەری ئیسلام بە رابەری تیرهاب، قورئانیش بە کتێبی

تیرهاب، ...... دەیانەوێ ململانێیە فکری و سیاسی و شارستانیە هێواشەکان وەرگێڕن بۆ توندو تیژی کە ئەوان لێی زاڵن.

٣. ئەو فتواو و گوتارانەی ڕابەرانی جیهادی ئیسلامی بەرامبەر بە ڕۆژئاوا: داواکردنی جیهاد لە دژی ڕۆژئاوا ..وەك ئەو هەڵسوکەوت و هێرشانەی (القاعدة) بە شلم کوێری، زۆر فتواو هەڵسوکەوتی تر بێ ویست و ئارەزووی خۆیان یارمەتی چەسپاندنی ئەو تیۆرەیان داوە، وەك بەڵگەی سەرپار بۆ ڕاستی ئەو تیۆرە.

٤. زۆر نموونەو بەڵگەی دروستو ورد هەیە، تا ڕادەیەك ئەو تیۆرە بسەلمێنێ. با سەرنج بدەینە کوردستان کە وڵاتێکی نموونەیی بووە لە پێکەوە ژیانو تەبایی هەروەك لە ڕاپۆرتی لێژنەی نێودەوڵەتی (کێشەی موسڵ ١٩٢٥)یش بە نموونەیی ئەو پێکەوە ژیانەی تۆمار کردووە، لە ڕەوتی مێژوویش جیاوازی مەسیحیایەتیو ئیسلام دوو جۆر ژیانو فەرهەنگو کەلتووری دروست نەکردووە .. بەڵام لە قۆناغی نوێدا وا دەبینین فەرهەنگی مەسیحی کوردستانیش بەرە بەرە بەرەو دۆخێکی تایبەتی دەڕوا، ئینجا لەوەش بە سەرنج تر کە تەواو ئەو تیۆرە دەسەلمێنێ ئەوەیە هەموو ڕێکخراوە بیانیەکان چ خزمەتگوزار خەیری چ سیاسی کە دێتە کوردستان یەکسەر لەناو مەسیحیەکان دەگورسێتەوە، ئەوە بە سادەیی دێتە بەرچاو بەڵام وەك بەڵگەیەکی بەهێز گوزارش لەوە دەکا کە فەرهەنگ و شارستانیەتی مەسیحی ناگونجێ لەگەڵ شارستانی میللەتی کورد، کەچی دەگونجێ لەگەڵ مەسیحیەکانی کوردستان، بە مانایەکی تر واتە شارستانی (مەسیحی کوردستانیش) جیایە لەگەڵ خەڵکی کوردستانی لە دوای زەق بونەوەی عەولەمە.

## بەڵگەکانی دژی ئەو تیۆرە:

بۆ ئەوەی چاکتر لە بناغەو مەبەستەکانی ئەو تیۆرە بگەین پێویستە لە پێشدا چەند ڕاستیەك هەیە بزانرێ کە لە خوارەوە تۆماری دەکەین لە بارەی مەبەستی

ڕاستەقینەی ئەو تیۆرە، ئینجا باری مێژوویی و واقعی ئەو تیۆرە، لەگەڵ پێناس و مانای شارستانی، لەگەڵ چەند خاڵێکی تریش، .....زۆر بە کورتی:

١. بە ڕەخنەیەکی بیناکەرانە بۆ هەندێ نوسینی بەرزی بەرەی شارستانی ئیسلام دەست پێ دەکەین، ئەو نووسینانەی لە دژی ئەو تیۆرە نووسراینەوە چەند کتێبێك و گوتارێکی بەناوبانگ لەوانە (حوار الحضارات- گارودی فرنسی)، (تفاهم الحضارات- خاتمی ئیرانی)، (تواصل حوار الحضاري- مؤتمر قمة العربية).. زۆر بابەتی چاکی لێهاتووە بەڵام دوو تێبینی بنچینەیی هەیە لە بارەیان:

أ. ئەو دەڵێ جەنگە، جاری جەنگیشیان داوەتەوە نووسەری ئیسلامیش بە هەڵاتنەوە داوای ئاشتی دەکەن، وەك مەسەلەی ئیسرائیل و عەرەب، ئەو لە مەیدانە بە چەك و جبەخانە، کەچی گوتاری دەسەڵاتدارانی عەرەبیش هەر داوای ئاشتیەکی سەرشۆڕانە دەکەن و دەڵێن (خيارنا للسلام خيار الاستراتيجي والوحيد)!!.. ئیتر لەو پەڕی دوو ڕاوینە، بە هەمان شێوەش لە بەرامبەر ئەو تیۆرە شێوەیەکی وایە، ڕۆژئاوا بە خۆی و ئەو تیۆرەوە باسی پێکدادان دەکا تۆش هەر باسی دانوستان و دیالۆك دەکەیت، ئەو دەیەوێ ئاشتیەك بێت تیایدا خۆت بدەیتە دەست.

ب. هەر ئەو گەڵاڵانەی (حوار الحضارات) (تفاهم الحضارات)..هتد مانای وایە تەسلیمی ناوەڕۆکی ماناکەی ئەو تیۆرەی (صراع الحضارات) بووی، واتە دابەشی شارستانی هەیە لەو جیهانەو واقعێکە، کەچی وانیە، ئەگەر بە وردی سەرنجی بدەینێ، ئەوە وەك مەسەلەی شەرە نوسینەکەی نێوان (دۆهەرنگ)و (ئەفلس)ە، مارکسیەکان تیۆرەکەی خۆیان بە نوێی دارشت لەسەر بنچینەی (یەك ڤاکتەری- ڤاکتەری ئابووری)، ڕەدەکانی دۆهرنگ لە بنچینەدا تەسلیم بوون بوو بە (یەك ڤاکتەری)، کە دەیگوت ئەخێر فاکتەری ئابوری کۆمەڵ ناجوڵێنێ بەڵکو (چەوسانەوە- الاستعباد) ئەو ڕۆڵەی دەبینی ..بەو شێوەیە لە کۆتاییدا بۆ چوونی ئەفلس بەسەر دۆهرنگ زاڵ بوو، لێرەش بەو شێوەیە لە کۆتاییدا تەسلیم بوونە بە

(پێکدادانی شارستانی) کە لە ڕاستیدا ئەو پێکدادانە نیە جۆرە پێکدادانێکی تـر هەیە.

٢. لە زۆر سەردەم و بۆنە و واقیعی تری جیهانی بـاس لـەوەها ململانێیـەك کراوە وەك (صراع الطبقات- ململانـێی چینەکان) کـە لـە لایـەن مـارکس و ئەنجلسەوە دوایش بووە ڕێبازێکی سەرەکی شیوعیەت، ئینجا لە پێش تر باس لـە (صراع الاقـوام- ململانـێی نەتـەوەکان) کـە لـە لایـەن فەیلەسـوف و زانایـانی ئەڵمانیاو ئیتاڵیاو ئەوروپیەکان هاتبوو دوایش گەیشتە بەشێك لـە سیاسـەتمەدارو زانایانی تورك وعەرەبیش ...بەو شێوە زۆر جۆر ململانێی لـەو شـێوەیە گەلاڵـە کراوە وەك صـراع الاجناس،صـراع الحضاری البربـری ،... سـەرەنجامی نـەبووە، بوویتە هۆی سەرەنجامی سەلبی ڕەگەزپەرستی وەك سـەرهەڵدانی فاشـیو نـازیو بەعسیو ....

٣. بناغە فکریەکانی ئەو تیۆر و ململانێیـە لـە جەوهـەردا دەچێتـەوە سـەر هەمان (صراع الانواع- ململانێی جۆرەکانی) تیۆری پەرەسەندنی داروینی و ئـەو بەشەی کە لە لایەن (سپـنسر)و دوایش بـە نـاری داروینیـەتی کۆمەڵایـەتی بڵاو بۆوە، هەمان هۆکـاری مانەوەشـی پـێداوە کـە لـە تیـۆری داروینی بـە (البقـاء للاصـلاح) باس دەکا، لە کاردانەوەی (هیگـل)و (شـپنگلر) دوایـش (لینـین) کـە هەریەکە لەوانە بە جۆرێك باسی شارستـانیان کـردووە لـە کۆتاییـدا بـە قـازانجی خۆیانیـان سـوڕاندووە، هیگل و شۆێنهاورو نیتچە چارەنوسی شارستانی بۆ نەتەوەی مەزنی ئـەڵمانیا نیـشاندا، هەرچـی شـپنگلرە لـە کتـێبی (داتـەپینی ڕۆژئـاوا) پێشبینی داڕمانی شارستانی ڕۆژئاوای کردوودو گوایـە شارسـتانی ئاسـیا جـێی دەگرێتەوە...

(لینین)یش پێش بینی کۆتـایی مێـژووی سـەرمایەداری کردبـوو لـە کۆتـایی سەدەی بیستەم ....، هندگتۆن سودیش لە تێڕوانینی هەریەکـە لـە (ابـن خلـدون) (ڤیکۆ) (هـارینگتۆن) لـە بـارەی تەمـەنی شارسـتانیەوە وەرگرتـووە هەڵسـاوە،

بەرگێکی هونەری و زانستی زیاتری بە شارستانی داوە کە لە جەوهەردا لەو تیۆرەی (ئەرنۆلد تۆینبی ١٨٨٩- ١٩٧٥) هاتووە لە بارەی (التحدي والإستجابة)، کە تیایدا هاتووە هەرکاتێ (تحدی) واتە دوژمن و ترسی دەرەکی نەمێنێ پرۆسەی شارستانی پێشکەوتن و یەکێتی ناوەوە لەباردەچێ، (تۆینبی) گەلێ جار شارستانی جیهانی لەسەر بنچینەی کۆمەڵگەی مەسیحی ئەرسەدۆکس، کۆمەڵگەی ئیسلامی، کۆمەڵگەی هندۆسی، ....کۆمەڵگەی وەك شارستانی بەکارهێناوە. لەسەر ئەو بنچینانە زۆربەی سەرۆکەکانی ئەمەریکا لە گوتاری سیاسیان دا ترسێکی دەرەکیان داتاشیوە، یان ترسی شیوعیەت، ترسی ئیسلامی، ترسی تیرۆر، ....هتد هندکتۆن سودی لەو تیۆرە وەرگرتووە و لە تیۆرەکانی (نایپول) کە دەڵێ شارستانی رۆژئاوا لە هەموان گونجاو ترە، ئینجا لەوانەی پێشووش بۆ دارشتنی وەها تیۆرێك.

٤. ئەو جۆرە تیۆرانە لە بنەچەدا لە چەوتی زەمینەیەك چەکەرە دەکا کە پێناسی شارستانیە، لەو کۆمەڵگانەی پەیوەستن بە ئاینێکی بێ شەریعەت(بوش) ئەوا زۆر چەمك هەیە بە خێرایی بەرەو ئەو بۆشاییە دێ و پڕی دەکاتەوە، بۆیە لە رۆژئاوا ئەو چەمکانەی وەك: (فەرهەنگ، کەلتور و شارستانی،کۆمەڵگە، مدرسە، فلسفە، یاسا،دەولەت ...) لە پێناس و راڤەدا رۆڵی ئاین دەبینین، وەك لێرەدا پێناسی شارستانی لە لایەن (هندکتۆن)ەوە هەمان ئەرکی ئاینی دراوەتێ، بۆیە ئەو دابەشیەی جیهانی بە خۆوە دەبینی ئەگینا شارستانی ئەو رۆڵ و ئەرکەی نیە (هەروەك زیاتر لە بابەت و چەمکی فکری (شارستانی) باس دەکەین.

٥. کەواتە زۆر روونە ئەو دابەشیەی جیهانی لەسەر بنچینەی شارستانی بنەمای زانستی نیە، لەسەر بنچینەی ئاینە زیاتر، هەمان ململانێی کۆنی کەلتووری ئەوەرەی یۆنانی- رۆمانی دوایی فرنسی و بریتانی بە ئیسلامیە، بەلام بەرگێکی شارستانی بە بەرخراوە ..ئەوانەش لەگەڵ گەشەی زیاتری فکر و هەندێ رووداوی لە ناکاو زیاتر ئاشکرا دەبێ.

٦. ئەگەر لە قوڵایی مێژووش شیاییت ئینتمای شارستانی جارجار پلەیەکی لە جیاوازی وەگرتبێت، هەرگیز لەو سەدەمەی عەولەمی و یەك پارچەیی و تێکچڕژانی دیاردەکانو مولکیەتی گشتی زانست- کە تۆخمی بنچینەیی شارستانیە- ئەوا ئینتمای شارستانی جیاجیا نیە لەو جیهانە، تاوەکو ململانێی شارستانیش هەبێت، دەشێت ئینتمای سەقافی، فەرهەنگی، کەلتوری،ئاینی جیا هەبیت، کە هونەرو ئاین و ئەریت و مێژوویەکی تایبەت دورستی دەکا، ڕەنگە میللەتان، کیشوەرەکان لەوانە لێك جیابن بەڵام لە شارستانیا هەموو دانیشتوانی سەرزەوی لێی هاوبەشن و بابەتێکە لە (منهج)یە، داهێنانی بەشەریە، هەر بۆیەش دەبینین لە (منهج)ی ئیسلام کە لەوپەڕی هەستیاری لە فەرموودەدا هاتووە (زانیاری لە چینیش بوو وەریگرە)، واتە زانست و زانیاری و شارستانی وەردەگیرێ و کارلێك دەکا، بەڵام ئەی وتود دادگەری و پرۆگرام و شەریعەت لە چین یان ئەمریکاش بوو وەرگرن.. (بۆ زیاتر سەرنج بدە جیاوازیەکانی زانست و ڕێباز لەو فەرهەنگە)،

٧. ئەگەر ئەو ململانێیەی شارستانی ڕاست بوایە نابوایە ئەو ڕووداوانە لە چوارچێوەی یەك شارستانی ڕوویدا وەك: جەنگی سەد ساڵەی نێوان فرنسا و بریتانیا، دوای سی ساڵە لە ئەڵمانیا، ئینجا هەردوو جەنگی جیهانی، ئەو هەموو کێشانەی تری ئێستای بریتانیاو ئیرلەندا، فرنسا و کورسیکا، باسك و ئیسپانیا، بەلقان،:هەردوو ئەمریکا لەگەڵ ڕەگەزەکانی تر، ....هەموو ئەوانە لە چوارچێوەی یەك شارستانی بووە، ئینجا جەنگی عێراق لەگەڵ (ئێران، کوێت، کوردستان)، هەردوو یەمەن، جزائر و مغرب، ....کێشەکانی تر، هەروەها کێشەی مەزنی نێوان چین و سۆڤیەت، ڤێتنام و کەمبۆدیا، ....زۆربەی ڕووداوە مەزنەکان لە چوارچێوەی یەك شارستانی بووە، هەتا ئەگەر بە پێناسی و ڕوانگەی (ململانێی شارستانیش) ڕوانیمانە جیهان. بۆیە زیاتر (صراع البدائل) و (صراع المدارس)ە

نەك (صراع الحضارات) واتە لە ڕیزکردنی ناکۆکیـەکان بـە دەگمـەن ئـەو وەسـفە ناچێتەوە سەر ململانێی شارستانی.

٨. لـە عەولەمـەدا زیـاتر دابەشـیەکی ئـەو تەوەرانـە وەردەگـرێ: هـەژاری و سەرمایەداری بە هـەمرو خانەکانیـەوە، لیبرالـی وەمـەبادیتی، ڕزگـاری خـوازی و داگیرکاری، ئاینی و عەلمانی، دیکتاتۆریەت و میللەتان و ئازادیخوازان، .....بۆیە دابەشیەکە نە لەسەر بنچینەی کێشەوەرو شارستانیە نە لەسـەر بنـچینەی زمـان و ڕەگەزو نەژادیشە، سەرنج بدە ئەو هەمور خۆپیشاندان و بەرگریەی لە ڕۆژئاوا لـە دژی عەولەمەی سەرمایەداری دەکرێ، کێشەکانی سەروو و خواروو، سـەرنج بـدە ئەو ململانێ توندەی نێوان بزووتنەوە ئیـسلامیـەکان و دیکتاتۆرە عەلمانیـەکانی ناو شارستانی ئیـسلامی زۆر بەهێزترە لە ململانـێی نێـوان حکومەتـە عەرەبیـەکان لەگەڵ ڕۆژئـاوا، تـا ئـەو ڕادەی زۆربـەی سـەرۆکەکانی عـەرەب دیـالۆك لەگـەڵ ئیـسلامیەکان بە حرام دەزانن کەچی دەرگای دیالۆگ لەگـەڵ ئیـسرائیل و ڕۆژئـاوا هەردەم لەسەر پشتە.

٩. ئـەو هێڵـە تەماسـەی باسـکرا گوایـە لـە بەیـەك گەیـشتنی شارسـتانی ئیسلامی و مەسیحی بەیەکدادانە .... ئەوانـەش هـەمووی کێـشەی ئیـسلامی و مەسیحی نیە، کێشەی شارستانیش نیـە،...ئەگـەر کـەمێك لێـی قـووڵ بینـەوە دەبینین کێشەکان بریتین لە:

أ. کێـشەی ڕزگـاری خوازیـە وەك چیـچان لـە دژی سـۆڤیەت، بۆسـنیەکان و ئەلبانیـەکان لـە دژی سـربیا، فەلەسـتینە عەرەبیـەکان لـە دژی ئیـسرائیل، مەسیحیەکانی خوارووی سودان لە دژی سوودان ....تا دەگاتە تیمووری خۆرئاوا و بەرەی مۆرۆ لە فلیپین .. ئەوانە بەشێك نین لە ململانێی شارسـتانی بەڵکو ئەوانە بەشێکن لەو ململانێیەی جیهـانی نێـوان داگیرکـەرو داگیرکـراوی وەك ئیرلەنـداو باسـکەو کوردسـتان و کـشمیر و کورسـیکاو فلەسـتین و بیابـانی ڕۆژئـاوا وهـەردوو ئەمریکاو ئوسترالیاو تبت...زۆر شوێنی تر.

ب. بەشی دووەم ململانێی کێشەی سنوورەکانە وەك لە نێوان ئەرمینیا و ئازەربێجان، مغرب ئیسپانیا هەتا بریتانیا و ئەرجەنتین.

ج. بەشی سێیەم دەسەلاتی دیکتاتۆریە لەگەڵ گەلانی وەك کێشەی قبتی لە میسر، ویلایەتە ئیسلامیەکان و نایجیریا، ....

د. بە دەیان نموونەی پێکەوە ژیانی ئاسایی هەیە لە نێوان شارستانی ئیسلامیو مەسیحیی وەك دەبینرێ ئێستا لە لبنان، لە فلستین، لە کوردستان، لە زۆربەی وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی تر.

## رەگەزپەرستی و ئەو تیۆرە:

بە روونی رەگەزپەرستی بەو تیۆرەوە دیارە، هەروەك ئەریتی زۆربەی رۆژئاوا وایە، ئەو هەموو جەنگ و ماڵ ویرانانە لەسەر پاکی و ناپاکی نەژاد (سۆپەرمان)و تیۆرەکانی (هەرمن، هەرخۆمان، ...) بۆیە زۆربەی زاناو فەیلەسوفو سیاسەتمەدارانی بە ویژدانی رۆژئاواش لەگەڵ ئەو تیۆرە نین، هەر لە ئەسڵدا ئەو رەوتە تیۆرەو (هندگتۆن) خۆشی پێناسێکی وای لە شارستانی هەڵبژاردووە لایەنی رەگەزپەرستیەکەیە، ئەویش پێناسەکەی (پیترمان)ە لە کتێبی (مدخل الى إجتماع الحضري) مانای شارستانی بە شارو ئەهلی شار لێك دایتەوە بە چینێکی پێشکەوتوو و ژیرو پێشڕەو زانیوە، ئەهلی لادێش بە دواکەوتەیی و (بداوە- رەوەند)و بێ عەقڵی لە قەڵەم داوە ..ئەمو بۆچوونەش هەر لە ئەسڵدا لەگەڵ پێناسو ئەسلی وشەی (شار: civis)کە وشەیەکی لاتینی گونجاوە تا بە پیاو ماقوڵانی رۆمان بووترێ "شارستان"، وشەیەکە بۆ لێك جیاکردنەوە لە خەڵکی ترکەگەلێ جار بە(بەربەر) ناویان براوە، یەکەم نووسەر ئەو زاراوەی بە کارهێنابێ (میرابۆ ١٧٥٧) لە کتێبی (مقال في السكان، مقال في الحضارة) بەڵام بەو رەگەزپەرستیەی پێناس نەکرد زیاتر بە مانای (تمعمیر)، بە کورتی پێناسە سەلبیەکانی زیندوو کردۆتەوە کە باڵایی تەریتو رەوشتو جۆری ژیانی:

ڕۆمان بەسەر خەڵکی تری (بەربەر)، شار بەسەر لادێ (بەداوە)، مەسیحی بەسەر غەیرە مەسیحی (ئەتنیك)..دەردەخا.

هەڵبەتە گیانی ڕۆژئاوا جۆرێك لە ڕەگەزپەرستی تیا دەردەکەوێ لە زۆربەی چالاکییەکانیان، هەتا زانستیش، ئەوان بە ڕوانگەی ڕۆژئاوا مێژووی جیهان دەخوێننەوە، هەموو دۆزینەوەکانو کەلتوری فیکریو بەشەریو زانستی بۆخۆیان پاوان کردوە، سەرنج بدە خەڵکێکی زۆر گەیشتوونە سەر لوتکەی (نێڤرست) لە هملایە، کەچی تا ئوسترالییەك لە ساڵی ١٩٣٥چووە سەری ئینجا ئەو مێژوویەیان بۆ یەکەم مرۆڤ تۆمار کرد کە گەیشتبێتە سەر ئەو لوتکەیە، هەر بۆیەش (داکانەی) زانست بۆ باپیرانیان دەگێڕنەوە وەك: (أب التاريخ- هيرۆدس)، (أب الجغرافية- سترابۆ)، (أب علم الاجتماع: ارستۆ)، (أب علم السياسة: افلاتون)، (أب الديالكتيك: هركليت)، (أب الطب: كيرانتۆس)... ئەو خەسڵەتە لە هونەریش زیاتر ڕەنگ دەداتەوە لە زۆربەی فلیمەکانیان خەڵکی بەوەحش دەنوێنن یەکێکی ڕۆژئاواش دەبێتە ڕزگارکەرو ڕێ نیشاندەریان....ئەوانە هەمووی لە ناخی دەروونێکی ڕەگەزپەرستییەوە هەڵدەقوڵێ با خۆشی ئەوەی نەویستبێ.

ئێستاش هەمان جەوهەری ڕەگەز پەرستیە لەو دابەشییەی شارستانی ڕۆژئاوا بەسەر غەیرە ڕۆژئاوا، بۆیەش ئێستا دەبینین ڕەگەزپەرستییەکی بەربلاو هەیە، خەریکە ڤیتۆ بۆ تەواری ئەمەریکیەکان لە یاسای دەولی پەیداکەن، سەرنج بدە نموونەیەك لە کەنەدا لە ساڵیادی جەنگی کەنداوی ڕزگاری کوێت ڕێپێوانێك کرا نزیکەی ١٨٣ خاچیان هەڵگرتبوو کە یەکسانە بە ژمارەی کوژراوەکانی ڕۆژئاوا لەو جەنگەکە کەچی کوژراوانی کوێتیو سعودیو زۆر وڵاتی تری هاوپەیمانیان هەر بەمرۆڤ و گیان لەبەر حساب نەکران، ئینجا لە قەرەبووی زیانەکانی گیانی وەك دەرکەوت لە نێوان ئەفغانیەك کە بەدەست ئەمریکا گیانی لەدەست دەدا لەگەڵ ئەو ئەمریکیەی بە دەستی ڕۆژهەڵاتیەك گیانی لەدەست دەدا بە ڕەسمی بۆ

ئەمریکییەکان داوای قەوبوی (١٥٠) قـات زیـاتر لـە ئەفغانیەکـەی دەکـرد ، بـە ئەرازووی ئەمریکی لە قەرەبوویانە ئەوروپی و ئەمریکیش جیابوو زۆر.

## مەبەست و نهێنیەکانی ئەو تیۆرە ... ئەو تیۆرە بۆچی؟

رۆژئاوا بە دوای فاکتەرێکی مەبادیئی و سیاسی و کۆمەڵایەتیە کە ئەو تیایدا براوە بێت و نەبووە، نەك هەر بەرامبەر ئیـسلام بـەڵکو بـۆ هـەموو جیهـان جـا هەموو تیۆرەکانی شۆڕشـی کۆمەڵایـەتی، چاکـسازیەکان، بینـای کۆمەڵایـەتی، مەدەنیەت، رەوشی مۆرڤایەتی و دادگەری ....هەرچی مەبادیئی بێت لە کۆتاییدا لە قازانجی سـەرمایەداری نیە، لە دنیای مەبادیئیدا ئیسلام لێی باڵا دەست دەبێ، ئەوەیان لە کۆنەوە لە لایەن سەرکردە سـەربازی و سیاسی و فەیلەسـوفەکانیان بـە روونی هەسـت پێکراوە بۆیە ئامۆژگاریە بەناوبانگەکەی (کرۆمر) کە وتوویەتی بـۆ ئەوەی دەست بەسەر جیهانی ئیسلامی دابگرن هەوڵ دەن ئـەو ئاینـەیان لـە نێـو دەرکێشن، یان بـشێوێنن، ماکینـەی مـەبادیئی و توانـای بەرگریـەکانیان یـەکی دەکەوێ، یەکێ لە مەبەستەکانی سایکس- بیکۆی ١٩١٦و دروست کردنـی ئـەو دەوڵەتۆکانـەی وەك عـیراق وسـوریا وئـوردەن وکویـت و... ئـەوەبوو، هەرچـی رۆژئاواشە یان مدرسەی لیبرالیەتە بەگشتی تـەنیا لـە تکنۆلۆجیـاو زانـست بـاڵا دەستو پێشڕەون، ئەوەش ناسـنامە نیـەو مـوڵکی گـشتیە، ئیتر چـۆن بتـوانن تیۆرێکی ململانێی لەسەر داڕێژین و بیکەن بە موڵکی رۆژئاوایی بە تەنها، هـیچ ململانێیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فکـــری و فلـسفی و... لەسـەر بنـچینەی زانـستی دروست نابێـت، بۆیـە (شارسـتانیان) دۆزیـەوە کـە بنـچینەی زانـستو تکنۆلۆجیای هەیە و بە دەمامکێکی تر بیکەنە ناسنامەو پۆلێنی جیهانی نـوێی پێبکەن، بەو شـێوەیە تیـۆری (ململانـێی شارسـتانی) چـەکەرەی کـرد و بـووە چەکێکی تیۆری و فکری نوێ لە دەست رۆژئاوا، دەتوانین مەبەسـتەکانی رۆژئـاوا لەو تیۆرە لە (٥) خاڵی سەرەکی کۆبکەینەوە:

١. بۆ ئەوەی ناکۆکیە واقعیەکانی ئێستا لە ئاینیی و چینایەتیی و ڕزگاریدا وەرگەڕێ بۆ ناکۆکیەکی وەهمی نێوان شارستانیەکی پێش کەوتوو و شارستانیەکی دواکەوتوو، هەڵبەتە ئەو لە یەکەم لاوازەو لە دووەم بە هێزە.

٢. ڤاکتەرێك بدۆزێتەوە تا جیهان بە جۆرە نەخشەیەکی لێڵاوی و ناڕاستی دابەش بکا کە کێخوایەتی خۆی لێ مسۆگەر بکاو ئەو خاڵە لاوازانەی جیهانی سێیەم لە دواکەوتەیی و نادیموکراسی بقۆزێتەوە بۆ زاڵیەتی بە ناوی شارستانیەکەی، لە کۆتاییدا لە ژێر پەردەی یاسایی و زانستیدا شەرعیەت بە سەرمایەداری، و پێویستیەکانی لە بازاڕو جەنگ و زاڵیەتی مسۆگەر بکا.

٣. هەردەم بتوانێ دوژمنێکی داتاشراو بۆ هەموو ڕۆژئاوا بدۆزێتەوە تا ناکۆکیە ڕاستەقینەکانی چینایەتی و ژیانیەکانی لە ژێر بیانوی (خطر الخارجي- مەترسی دەرەوە) بشارێتەوە.

٤. بتوانن خۆ لەو فاکتەرانە لادەن کە لێی لاوازن بە تایبەتی ڤاکتەری ئایدۆلۆجی، هەر بۆیەش لە چلەکانی سەدەی ڕابردوو دەنگی (کۆتایی ئایدۆلۆژیا) بەرزکرایەوە، ئێستاش گەلێ ئەزانی جیهانی سێیەم و کوردیش ئەو دەنگە هەڵدەبڕن ئازاتن ماناو مەبەستی چ دگرێتەوە لە چوارچێوەی ململانێی شارستانی، ئەوان لە فاکتەرەکانی سیاسی و ئایدۆلۆجی و فلسفی و ئاینی و فکری بەگشتی لاوازن، بۆیە لە ستراتیژیەتی ئەوان دایە کە لە جیاتی (صراع المدارس) بیکەنە (صراع الحضارات)، ئەگەر بە داتاشراویش بێت.

٥. تا بتوانن ئەو (عەولەمە)یە لەسەر بنچینەی ئەو فاکتەرە بێت کە ئەوان لێی بالادەستن، ئەویش سەرمایەداری و تکنۆلۆجیایە، واتە بە فاکتەری ئابووری و زانستە ئەتوانێ عەولەمە بخرێتە ناسنامەی ڕۆژئاوا، نەك بەوە ئایدۆلۆجیا هەموو بەشەریەت یەکخاو ڕزگاری بکا، لە (عەولەمە)وە بگۆڕدرێ بۆ (عالمی) کەسکەو سروشتی خۆیەتی.

(٢٤)

# کۆتایی مێژوو    نهایة التاریخ
# The End of History

ئەوەش وەڵامو ئەدرێسی کتێبێکی هارشێوەی (ململانێی شارستانیەکانە) لە ڕەهەندەکانی فکریو سیاسیو زانستیو ئەزمونیدا، (فرانسیس فۆکۆیاما) نوسیویەتی، کە بە ڕەچەڵەك یابانیەو ئێستا دانیشتووی ئەمریکایە، ڕووداوەکانی دارمانی شیوعیەتو بلۆکی سەربازگەی ڕۆژهەڵات زیاتر بوێری پێدا ئەو تیۆرە گەڵاڵە بکا، بە تایبەتی لە کاردانەوەی جارنامەی سۆڤیەتی (ئیمپریالیزم کۆتایی مێژووی سەرمایەداری یە)[1]، بەخێرایی بووە چەمکێکی سیاسی زۆر بەکار، ویستویەتی ئەو ململانێیە لە (ململانێی شارستانی) ئەخشەکێش کراوە لەو کتێبەدا یەکلایی بکاتەوە بە سەرکەوتنی مسۆگەر بۆ شارستان و نموونەی ڕۆژئاوا لە: بازاڕی ئازادو سەرمایەداریو سیستەمەکانی سیاسیو دیموکراسیو کۆمەلایەتی لیبڕالیو هەروەها سیستەمی یاسایی و ئەخلاقی مەدەنیەتو مافی مرۆڤ .. ئەو ئەدرێسە هەر سەردێری کتێبێك نیە، بۆ ئەو قۆناغە گوزارش لە ڕاو بۆچوونی ڕابەرانی ڕۆژئاوا* دەکا، بەشێکە لەو هەڵمەتە نوێیەی جیهانی سەرمایەداری بۆ دەست بەسەراگرتنی جیهان لە عەولەمەدا، ئەوەش چەکێکی تیۆریە لە بەرەکانی فکرو فەلسەفە و تیۆری سیاسی شان بە شانی چەکی

---

[1] هەڵبەتە ئەمریکاش قەلا مەزنی ئیمپریالیزم بوو بە پێی فەرهەنگی سۆڤیەت.

* هەمیشە دەم کە ناوی ڕۆژئاوا دەهێنین مەبەستمان ڕابەرانی ڕۆژئاوایە، ئەگینا ڕۆژئاوا یەك ڕەنگ و ئاست نیە، چینی جیاوازو هەڵوێستی جیای تیایە.

سەربازی، بۆ ڕووخاندنی وردو بیاری دەروونی جیهان بە گشتیو ئیسلام بە تایبەتی .تا بەبێ جەنگ خۆیدەنە دەست هەروەك لە كتێبەكەی نیكسۆن (سەركەوتنی بێ جەنگ) دایهێناوە، بۆیە گفتوگۆ لەسەر ئەو جۆرە كتێبانە لە چوارچێوەی ڕەوشەنبیری دانیە بەلكو بەرنامەیەكی سیاسیو سەربازیە، هەر ئامۆژگاری نیە بۆ جیهان كە بە پێشڕەوایەتیو سەرمەشقی ڕۆژئاوا قایل بن، بەلكو لا بەلا هەڕەشەلە مدرسەو سیستەمو ئەزموونەكانی تر دەكا وەك مەسەلەی (هرمجدۆن)ی یەهودیەت داوایان لێ دەكا بە خێرایی واز لە ڕێبازونەرهەنگەكانیان بهێنن، چونكە وەك (حتمية التاريخية)ی ماركسیەت ئەویش دەیسەلمێنێ كە هەم شارستانیەكانی ترو هەم نموونەكانی تری ژیانی ڕۆژهەلاتیو مدرسە ئاینەكانی تر شكست دەهێنن و ناتوانن نموونەیەكی زیندوو و سەركەوتوو دروست بكا، ئامارێكی زۆری ولاتانی جیهانی كردووەو هەموو دیاردەكانی دیكتاتۆریو ڕەفتارە فاشیستەكانو جەنگی كۆمەلایەتیو دواكەوتوویەك دەداتە پاڵ غەیری ڕۆژئاوا، وەسفی سیستەمو شارستانیو ڕێگەی ژیانی جیهانی تر دەكا كە گوایە نەگونجاوە لەگەڵ پێش هاتە مەوزوعیەكانی جیهان، لەوەسفێكی تری دا هاتووە: كێشەی ئیسلام لەگەڵ ڕۆژئاوا نیە بەلكو لەگەڵ نوێگەراییە، كە ئیسلام لەگەڵ گەشەی زانستو تەكنیك ناگونجێ.

تا ئێرە بە كورتی ماناو مەبەستو گەلالەی ئەو چەمكو كتێبە كراو لە بەشەكانی شارستانیو مدرسەكان زیاتر باسی ناوەڕۆكو مەبەستی كراوە.

## سەربردەی "كۆتایی یەكانی مێژوو" لە مێژوودا :

هەڵبەتە ئەو ئەدریسە یەكەم جار نیە دەنووسرێ لە بارەی (كۆتایی مێژوو) بە جۆراو جۆر نوسرایتەوە، نوسینەكانی (فۆكۆیاما) وەك بۆچوونەكانی: ئایبولو هیگلو ماركسو لینینو زۆری تر كۆتایی مێژوو بە كۆتاییو (دنیا خرابوون)نازانێ وەك پێش بینیەكانی ئایینی، هە موو ئاینەكان بە جۆرێك لە جۆرەكانی باسی

(کۆتایی میژوو)یان کردووه، تیایدا جیهان کۆتایی دیت، هەرچی مەبەستی نموانمیە گۆڕانی کۆمەلّ لە گەشەی کۆمەلایەتی لەسەر سیستەمێك بە یەکجاری دەچەقی! ..ئەوەش خۆی لە خۆیدا ناچیتە عەقلّەوە، ناکۆکە لەگەلّ یاسا بنچینەییەکانی (گەشەسەندن)، هەموو ئەو تیۆرانە جۆرە هەلّچوونێکە بەهۆی ڕوودانێکی مەزنی ناکاوی ئەو ساتی دروست دەبیّ، لە بۆچوون و قەبلاّندنا زۆربەی جار بەهەلّەش داچوینە، ئەو جۆرە ڕووداوانە بوێریەك دەدەنە نووسەر لە سنووری مەعقولی ڕەت بێت، چەند نموونەیەك لەو جۆرە کۆتاییانە لە تەوەرەکانی زانستی و کۆمەلایەتی و سیاسی دەهێنێتەوە:

- کە یەکەم تەلەفزیۆن لە سالّی ١٩٢٦ لە لایەن (جۆن پێرد)ەوە دامەزرێنراو لە سالاّنی ١٩٣٦ گەشەی کرد..چەندین تیۆر بۆچوون دەرچوون لە بارەی شکستی ڕادیۆ و(گوێ) وتیان تەلەفزیۆن کۆتاییە ...کەچی نە تەلەفزیۆن کۆتایی میژوویی ڕاگەیاندن بوو نە ڕادیۆش شکستی هێنا.

بەهەمان شێوەش کە ڕادیۆ دۆزرایەوە کەوتەکار وتیان کۆتایی بە ڕۆژنامەو خوێندنەوە هات میژوو بووە میژووی گوێ گرتن و ئیتر باس لە کۆتایی میژوو کرا لە (گوێ) نەك لە (چاو)، کەچی لە تەلەفزیۆن جارێکی تر باسی لە (چاو)کرایەوە، بەو شێوەیە کۆتایی میژووی هیچ ئەندامو دەزگایەك نییە، بەهەمان شێوە چاپ پەیدابوو وتیان ئەوە کۆتایی میژووی قەلّەمە.

- نموونەیەکی تریش بۆچوونی خۆشی تیایە ....کاتێ بیرکاری پەرەی سەندو دۆزینەوەی تازەی تیا دەرکەوت و پەلی هاویشت بۆ زانستەکانی تر، ئەوا (فۆری)و زۆر لە زانایانی بیرکاری وای بۆچوون کە هەموو شتێك لەو جیهانە بریتیە لە بیرکاری، ئیتر بیرکاری بە کۆتایی زانستی میژوو و تەرازووی پێشکەوتنیشی حسێبکرا، هاوکێشەیەکی بۆ مۆسیقاش دارشت وتی هەموو شت هەتا مۆسیقاش بە هاوکێشەی بیرکاری گوزارش دەکریّ:

ئەوە هاوکێشەکەیە... $Yn= y_1 \sin n_1 + y_2 \sin n_2 +$

• لە بواری سیاسیو کۆمەڵایەتیش زۆرجار ئەو کۆتاییانە بەسەر ڕژێم و شۆڕشی فرنسیو ئیمپراتۆریەکانی تر هەڵگوتراوە، لە هەموان بەریکوپێك تر (هیگل) تیۆرێکی (کۆتایی مێژوو)ی لە بارەی نەتەوەی (ئارمان) [1] دارشتوە، گوایە مێژوو هەرجارەی لە دەست نەتەوەیەك بووە بە بەسەرمەشقی پێشڕەوئەو جارە بە ڕابەرایەتی نەتەوەیی ئارمانیاوە هەر لە دەست ئەوانیش دەمێنێ چونکە نەتەوەیەکی داهێنەرو پاكو شایستەن ...کەچی وا دەرنەچوو تووشی گەورەترین سەرئێشە بوون بە خۆیەوە.

• هەروەها مارکس (حتمية التاريخ)ی بەهۆی کۆمەڵێك بەڵگەی بەهێزی زانستیو فلسفیو ئابووری دارشت گوایە مێژوو لە (شیوعیەت) کۆتایی دێتەو سەرمایەداریو باقی سیستەمو ڕێبازو ئاینو شارستانیەکانی تر شکست دەهێنن..

• لینین و باقی ڕابەرانی سۆڤیەتی پێشوو لە جەنگی ساردو گەرمیاندا لەگەڵ ڕۆژئاوادا دروشمی (ئیمپریالیزم کۆتایی مێژوو سەرمایەداریە)یان هەڵگرتبوو، ئەو قۆناغەی ڕۆژئاوایان ناونابوو (ئیمپریالیزم)و گوایە ئەوە باڵاترین شێوازو دوا قۆناغی سەرمایەداریە، بە ڕزگاری میللەتان ئیمپریالیزمیش دەڕوخێو کۆتایی سەرمایەداریە..

• بەو شێوەیە تیۆری زۆری تری کۆتایی مێژوو دەرچوو لەوانە نەتەوەگەریی عەرەبەکان بە ناوی (أمة عربية واحدة ذات رسالة خالدة) (خير الأمة)و یەهودیش بەناوی (شعب الله المختار)، و هەروەها هەریەکە لە (هال لیندرس)و (مولویل)و (روبرتسن) کۆتایی مێژوویان لە تیۆرەکە لە(جەنگی هەرمجدۆن) دارشتوە، لەسەر

---

[1] بە عەرەبی ئەلمان هەڵەیەو کورد ناوی (ئارەمان)ی بردووە هەر لە ئەسڵیشدا خۆی ئەرەمانە ئەك ئەلمانیا، ئەسڵدا ڕەنگە لە ئاریەمان هاتبێ و بە ئینگلیزی (german) لەگەڵ وشەی (کرمانج)ی کوردی لێك نزیکن و ڕەنگە یەك سەرچاوەی هەبوو بێ.

دەستى یەهودەکان، (ئۆگۆسـت کونت)یـش کۆتـایی میـژووی بـە بـیرو بەرنامـەی زانستی هێنا لە قۆناغەکانی ژیان (ئەفسانە- لاهوتی- زانست)

• بە هەمان شێوە کەوتنی سـەربازگەی سۆشـیالیـست ئەزموونەکەیان ئەو بـارە فکری و دەولیەی بۆ (فۆکۆیاما)و داڕێژەرانی ئەو تیۆرە دروست کردووە کە جـاری کۆتـایی میـژوو لەسـەرمایەداری بدەنـەوە ...لـە گەلیـشدا جـاری کۆتـایی ئایدۆلۆجیاش داوە..زۆر سودیش لە بۆچونەکانی (نابیول) وەرگرتووە کە بـاس لـە نموونەی سـەرکەوتووی لیبرالی و دیموکراسـی فەرهـەنگی ژیـانی ڕۆژئـاوا دەکـا بـە بەراورد لەگەڵ فەرهەنگی ژیانی جیهانی تر.

هەڵبەتە هیچی ئەوانەی سـەرووش ڕاسـت دەرنەچووە و مێژووش ناوەستێ.

لە ڕاستیدا مێژووی بونەوەر بە زەوی و ئاسمان و ژیانـەوە کۆتـایی هەیـە، لـە چەندین سـەرچاوەی جیا، لە گـەردوونا کۆتـایی فـراوان بـوونی هەیـە کـە دەبێتـە کۆتایی بوونەوەر، دەشێ یەکێ لە(ئەستێرە ڕەشەکان- ثقوب السوداء) قوتمان بدا، دەشێ سووتەمەنی خۆر لە هاوکێشەی $He \leftarrow H_2$ کۆتایی بێت، دەشـێ لەسـەر زەوی بە چەندین هۆی تـر مێـژووی ژیـان کۆتـایی بێـت، .... زۆر شـیانی تـری زانراوە، بە مـۆگەر ژیان و بوونەوەر تـەواو دەبـێ، بـەڵام مـادام ژیـانی کۆمـەڵ بەردەوام بێت کۆتایی بە مێژووی گـۆڕان نایـەت، هـەردوو گـۆڕانی چـەندایەتی و چۆنایەتی وەك دوو یاسای یەك سوننەت بەردەوامە، سەرەڕای ئـەوەی سیـستەمی (سەرمایەداری)و دادگەری دژ بە یەکن ، بۆیە ئـەو سیـستەمە لـە بنـچینەدا بـە نەخۆشی هەمیشەیی ناوزەد کراوە، ژیانو ئەزموونی وەستاوە لەسەر سەرنەکوتنی ئەزموونی تر، نەگینا خۆی ئەزموون نیە، ئەخشەو بەرنامەی نیە، ....هەروەك لە بابەتی مدرسـەکان، کۆمەڵگەی لیبرالی، ...زۆر شوێنی تر باسکراوە، لە ڕاسـتیدا بزووتنـەوەی مێـژووش وەك بزووتنـەوەی زانیاریـە (حرکـة المعرفـة) بزووتنـەوەی زانیاری بە تێکڕایی هەر دەجوڵێ بەڵام تـاك تـاکی (جزئیـات)ی لـە دۆزینـەوەی (ڕاسـتی) دەوەسـتێ، ئـەوەش (قیمـة المعرفـة)یـە، بـە هـەمان شـێوەش مێـژوو

ئاوەستێ‌و هـەردەم لـە جوولەیـە بـە گـشتی، بـەڵام لەکۆتاییـدا ئامـانجی هەیـە (غائیە)، ئەویش وەك تاك تاك لە دۆخە دادگەریەکـەی ئـارام دەگـرێ ...تـا لـە کۆتاییدا هەمووی لە مەبادینەکانی دادگەری ئارام دەگـرێ وەك لایـەنی (ڕێبـازی مێـژوو)، و لاکـانی تـری زانـستی مێـژوو بـەردەوام گەشـە دەکـا،، هەڵبەتـە مەبادینەکانی دادگەریش تەواو جیایە لەگەڵ مەبادینەکانی سـەرمایەداری، بۆیـە شیاتی گۆڕان‌و وەرچەرخان‌و هەتا وەرگەڕانیش لە سیستەمی سـەرمایەداریدا لـە هەموو سیستەمەکانی تر زیاترە.

کەواتـە کۆتـایی مێـژوو لـە ئێـو هـەموو سیـستەم‌و ڕێبـازو ئـاینی‌و مەدرەسەیەك هەیە، لە بەرنامەی ئیسلامیش وا دەروانێتە مێـژوو کـە کۆتـایی دێـت لـە پـەیڕەوی کردنـی شـەریعەتی ئیـسلام لەسەرانـسەی جیهـان نـەك وەك سەرەنجامی دەعوە و ئاینی پەتی، بەڵکو وەك پێویستیەکانی کۆمـەڵ وتـاك، بـۆ چارەسـەرکردنی کێـشە هەمەلایەنـەکانی کۆمـەڵ، هـەروەك ئێـستا دەبیـنین کۆمەڵگەی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلات، ئوسترالیا، ئەفریقیا بە ئەندازەی جیهانی ئیسلام پێویستی بەو بەرنامەیە هەیە تا بناغـەکانی کۆمەڵگەیـەکی دادگـەری دروسـت بکا. لە قورئانیش هاتووە (لقد كتبنا في الزبور مـن بعـد الـذكر ان الارض يرثهـا عبادي الصـالحون ....)، هەروەها لە فەرمویدەش ئەو هاوکێشە هاتووە:

(پەیام) (دادگەری) (میرات) (دیکتاتۆریە) (ئیسلام)

- نبوة - خلافة (الراشدون)- ملك العضوض- جبرية - خلافة الراشدة
- سيبلغ هذا الدين ما بلغ الليل والنهار

زۆربەی مەزهەب‌و ڕێبازە جیاجیاکانی وەها هاوکێشەیەکیان هەیـە بـۆ کۆتـایی مێژوو، وا گرنگترینیان لێ تۆمار دەکەین جگە لەوانەی سـەروو کـە باسـمان کـردن بە(کۆتایی مێژووی فۆکۆیاما)شەوە:

- مارکسیەت: دڕندایەتی ← بەندایەتی ← دەرەبەگایەتی ← سەرمایەداری ← سۆشیالیستی ← شیوعیەت
- ڤیکۆ: سەردەمی پەرستن ← سەردەمی پاڵەوانیەتی ← مرۆڤیەتی ← داڕووخان ← گەڕانەوە بۆ پەرستن.
- ئۆگست کۆنت: لاهوتی ← میتافیزیکی ← زانست
- فریزەر: جادوو ← ئاین ← زانست
- تەتەوریەکان: دڕنایەتی ← خێڵەکی ← ئیمپراتۆری ← پاشایەتی ← کۆماری

Notional

## (٣٥)

## ئاسایشی نەتەوەیی أمن القومي Natrunal Security

چەمکێکی یاسایی‌و سیاسیە لەو سەردەمە ڕاستەوخۆ مانای نەتەوەگەری ناگرێتەوە نەوەندەی گیانی دەسەڵات دەگرێتەوە بە تایبەتی لە ولاتانی دیکتاتور، عادەتەن تەحومەنێکیشی بەو ناوە وەك بالاترین دەسەڵات بۆدروست دەکرێ، هەرچەندە مێژوو نووسان هەردەم ویستوویانە ڕەگو ریشەی ئەو ناوو چەمکانە بۆ قولایی مێژوو بگەڕێننەوەو زۆربەی جاریش دەیگێڕنەوە بۆ مدرسەکانی یۆنانی کۆن، ڕاستە ناوەڕۆك و مەبەستەکانی کۆنە بەلام وەك چەمك (ئاسایشی نەتەوەیی) لەگەل مەسەلەی نەتەوایەتی‌و ودرچەرخانی سیستەمی ئیمپراتۆریەو بۆ (دەولەتی هاوچەرخ) سەری هەلداوەو بوویتە چەمکێکی سیاسی‌و یاسایی و ستراتیژی، گەلێ جار لە سەرووی دەستوورو پەرلەمان‌و حکومەتیشە، ئەرکەکانی فراوان‌و ترسناك ترینیانە، بە پێی پێناسە نوێ و جۆر بەجۆرەکانی وەك: (لیپمان، پرۆفیسۆر بانی، بیدك، د. حامد الربیع، فەرهەنگی وێبستەر، تا دەگاتە موشی دایان‌و کیسنجەر...) ئەو زاراوەیە قاوغێکی یاسایی وسیاسی و هەتا فەلسەفیشی بە ڕوونی نیە، بەلام هەموو لایەك کۆکن لەسەر چەند لایەنێك لە بنەماکانی ئاسایشی نەتەوەیی کە بریتیە لە: دلنیایی خەلك (هاولاتی‌و نەتەوەو دەولەت) بەرامبەر ترس و هەڕەشەی دەرەکی و ناوەکی، ئیتر ئاسایشی تاك‌و کۆمەل و خێزان‌و کۆمەلگەو جیهان‌و بوارەکانی ئابووری‌و ژیاری‌و سیاسی ئایدۆلۆژیایی و نەژادی....دەگرێتەوە، لەکۆتاییدا لەو بوونەوەرە هیچ کەستەواو بەرەهایی دلنیار دووره نبگەران نیە چ لەکاردساتی بەشەری یان سروشتی یان گەردوونی کە

زۆربەیان بەدەرە لە توانای بەشەری بۆیە یەکێ لە وەسفەکانی بەهەشت ئەو جۆرە دلنیایی وئاسایشە ڕەهایە بۆ ئادەمی زاد فەراهەم دەکرێ، (موسوعة السياسية) بە سادەتر پێناسێکی (ئاسایشی نەتەوەیی) بە ڕوانگەیەکی زیاتر یاسایانە نەك سیاسیانە کردووەو دەڵێ: (زامن کردنی سەلامەتی دەوڵەت لە هەڕەشەی ناوخۆو دەرەوە)[1]، بەڵام لێرەدا مەبەستی دەوڵەتێك پێك هاتبێت لەسەر بنچینەی نەتەوەیی، واتە (دەوڵەتی نەتەوەیی) کاتێ سنوری سیاسی ئەو دوڵەتە یەکسان بێت بە سنوری جوگرافی نەتەوەکە (پێی دەوترێ دولة القومية) هەروەك لە (موسوعة العالمية) وا هاتووە، دەبێ تێبینی بکرێ لەو پێناسەدا باس لە هەڕەشەی ناوەخۆشی کردووە، کە لە جیهانی سێیەم (عربی بەتایبەتی) زیاتر مەبەستیان معارەزەی دەسەلاتیشە، ئەوە جۆرێکە لەو ئاسایشە..بوار دەدرێت بە دیکتاتۆر بەناوی هەڕەشە لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی دەست لەمعارەزە بوەشێنی.

لە سەرەتادا چەمکی (ئاسایشی نەتەوەیی) بە ئاسایشی بارودۆخی هێزی سەربازی تایبەت بوو، دوای هەموو لایەنەکانی دەوڵەتی گرتەوە،هەڵبەتە هەموو لایەك کۆك نین لەسەر ئەو بنەمایانەی کە ئاسایشی نەتەوەیی لەسەر وەستاوە، هەندێك پێناسەکانیان هەمان پێناس و ڕێ و شوێنی پارێزگاری دەسەلاتە، بەشێکی تر بەهێزکردنی سەربازیە، بەشێکی تر پارێزگاری بەرژەوەندی ئیمپریالیزمی و داگیرکاریە لە دژی بەرگری کردن، ..زۆربەی چوارچێوەکەی دەدرێتە دەوڵەتێك، جا سروشتی ئەو دەوڵەتە بە خۆی و بە دەستوورو سیستەمی حوکمی چۆنە ئەوەش بەشێکی تری بابەتەکەیە، لە وڵاتێکی نزیك خۆمان کە پێك هاتبێ لە فرەنەتەوەو فرە نیشتمان و فرە فەرهەنگ.. ئەوا لە خوێندنەوەیەکی سەرەتایی بنەماکانی ئاسایشی نەتەوەییدا دەردەکەوێ دوو نەتەوە لە یەك وڵاتی وا جێیان نابێتەوەو تەواو مانای دوو سەرکە بەرانەکەیە، چونکە دوو ئامانج و دوو بنەماو دوو دنیای لێك جیا دەبن (مادام بە پێوانەی نەتەوەگەریە)، سەرنج بدە

[1] الموسوعة السياسية- د كيالي ج١ ل٢٣١

فەرهەنگی دەسەڵاتی عێراقی بەعسی لەبارەی ئاسایشی نەتەوەیی دەڵێ: (فالأمن القومي العربي هو الأمن الوطن العربي الكبير..)[1]، بەو سەرەنجامەدەگاودەڵێ: (..وتجسيداً لايدولوجية حزب البعث، يعتبر القطر العراقي ذلك القطر الذي يجعل بالقول والفعل من امنه الوطني جزءا من الامن القومي العربي...) بەو شاقوڵیەی چ پەیوەندیەك بە ئاسایشی نەتەوەیی کورد وتورکمان و ئاشووری و کلدانی عێراقی هەیە هەتا شیعەی خوارووش، ئیتر ئەو هەموو جەنگ و ماڵ وێرانیە باجەکەی گەلی عێراق بەگشتی دایەوە، هەڵبەتە ئاسایشی نەتەوەیی لە دۆخی وادا (واتە لە دۆخی دەوڵەتی نەتەوەییدا) یەکسان دەبێ بە بەرژەوەندی و تێڕوانینی نەتەوەیی دەسەلاتدار، بوونی ئاسایشی نەتەوەیی بێ دەسەلاتیش بە مانای یاسایی و دەستووری و سیاسیەکەی دەبێتە هەڕەشە لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی سەردەستەکە...، بەو شێوەیە دوو ئاسایشی نەتەوەیی پێچەوانە دروست دەبێ، کۆتایی دێت بە زاڵ بوونی نەتەوەی سەردەست، نەتەوەی بن دەستیش هیچ بوارێکی تری لە بەردەم نامێنێ جگە لە شۆڕش یان خۆبەدەستەوەدان...ئەوە نهێنی کێشەی نەتەوەییە، خەلکی کوردستان نمونەیەکن لە نەتەوەی بن دەست هەروەك نەتەوەکانی تەر سەردەمەی فەلەستین، کشمیر، چیچان، ئیرلەندا، بەربەر، تبت، تامیل، نەتەوەکانی ڕەسەنی هەردوو ئەمریکا و ئوستراليا و..، ئەوانە ماناو بوونی ئاسایشی نەتەوەییان لە چوار چێوەی دەولەتەکە نابینێت، تا لێرەدایە بە زەقی ئاسایشی نەتەوەیی دەوڵەتی وا تێك دەگیرێ لەگەڵ بنەماکانی چارەی خۆنووسی میللەتان و هەتا بەشە یاساییەکەی کە لە بڕگەی (٣)ی ماددەی (١)ی (نەتەوە یەکگرتووەکان) هاتووە، زیاتر لەگەڵ بنەمای یاسای نێو دەولەتی (مبدأ عدم التدخل) دێتەوە، جا لەو کاتەیە هەقی خۆیەتی یان جیابوونەوە وەك (شێخ سەعیدی پیران) هەرزوو هەستی پێکردو جاڕیداو وتی یان دەولەتی سەربەخۆ بۆ ئێمەش یان جۆرە دەولەتێك بێ دوو ڕلە نەتەوەگەری نەژادیو ڕەگەزیو

---

[1] تعريفات ببعض المصطلحات -مادة : (الامن القومي)

چینایەتی....ئەو داوای کرد ئیسلامی بێت، بە تەنها ئەوە دەتوانێ کۆمەڵە مەبادیئێکی نوێی ئاسۆیی وا بۆ فرە نەتەوەکانو فرە فەرهەنگو فرە نیشتمانیەکان داڕێژێتەوە بەشی هەموان بە یەکسانی تیا بێ.

ئێستا ئەگەر بۆچوونی ڕەخنە گرانیش بێت ئەوا کورد کەمتر خاوەنی ئاسایشی نەتەوەییە ئەگەرچی خاوەن کیانی شۆڕشگێڕیش بووە، هەر لەبەر ژێر دەستی نیە بەڵکو بەهۆی هەڵسوکەوتی ڕێبەرانیە لەو سەردەمەدا، مادام لە تێك گیرانی هاوکێشەی نێوان بەرژەوەندی حزبیو کەسێتیو بەرژەوەندی باڵای گەلو نیشتمانا ئەوا یەکسەر یەکەم بەسەر دووەم دەخەن، ئیتر پانتاییەك بۆ ئاسایشی نەتەوەیی نامێنێ، ئەوەش هۆیەکانی زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی ئەو مدرسانەی کە ئەو جۆرە ڕێبەرو حزبانەی پێوە پا پەندە، ئیتر لە ئەنجاما لە بەردەم بنەمای بەرژەوەندی تایبەت هیچ خەتێکی سوورو، ئەگۆڕێك، پیرۆزیەك، قەدەغەیەك... نامێنێ، ئەو دۆخە بەزەقی لە کوردسان دیارە، بەڵام لە جەوهەردا هەمان دۆخە لە زۆربەی وڵاتانی دیکتاتۆری بە تایبەتی وڵاتانی عەرەبی، لە وڵاتانی دیموکراسی ڕۆژئاوا تەواو زاڵ بووینە بەسەر نەریتە سیاسیە خۆییەکان، سەرچاوەی ئەو زاڵ بوونەش لە(ثوابت، مەبادیئەکان) هاتووە لە بەرنامە ئاینیەکان کە بەرژەوەندی گشتی لە سەرووی بەرژەوەندی تایبەتی بێت.بۆیە هەرگیز سەرچاوەی ناگەڕێتەوە بۆ مدرسەکانی لیبڕالیزم و لقەکانی، هەر بۆیەش لەڕۆژ ئاوا ئەگەر(بەرژەوەندی باڵای وڵات و ئاسایشی نەتەوەیی یەکەی) لەگەڵ (بەرژەوەندی حزبی دەسەڵاتی) تێك بگیرێ ئەوا بێ هیچ گرنتێکی وا یەکەم زاڵە بەسەر دووەم، بە پێچەوانەوە لە وڵاتە دیکتاتۆریە جۆربەجۆرەکان دەبێتە چەکێکی یاسایی لە دژی ئۆپۆزیسیونی نیشتمانی، زیاتر لە پێناو ئاسایشی دەسەڵاتە نەك وڵات، هەر لە بنەچەشدا لە ئەزموونی بەشەری یەکەم جار ئەو چەمکە لە لایەن (لویسی چواردە) پەیدابوو (بەپێی زۆربەی شارەزایان) لویس بەهێزبوونی دەرو دراوسێو یەکتر داگیرکردنی بە هەڕەشە زانی لەسەر فرنسا، ئەگەر هێرشیش ڕوو لە فرنسا

نەبێت، لە دابەشی دەسەڵاتو جیهاندا پتەوی ئاسایشی یەکێکیان دەبێتە هەڕەشە لەسەر ئەوی تر، بە تایبەتی ئەوانەی (بەدیلن بۆ یەکتر)، ئاسایشی یەکێتی سۆڤیەت هەڕەشە بوو لەسەر ئەمریکاو پێچەوانەشی بە پێچەوانە، هەتا وڵاتە بچووکەکانی جیهانی تریش بە تایبەتی ناوچەکانی ئاژاوەو درێژکراوەکانی سایکس پیکۆدا، هەتا ئەزموونی سیستەمی دوو حیزبی یەك وڵاتیش، وەك ئەزموونی (پ.د.ك)و (ی.ن.ك)، هەرچەندە ئەوە ئەسڵ نیە .

لە وڵاتە دیموکراسیەکانیش ئەنجومەنو دەستورێکی وا پیادە دەکەن کە لە کۆتاییدا زیاتر لە خزمەتی چینێك بێت، هەرچەندە لە پێناسی دەستووری ئەو ئەنجومەنە وای لێ ناخوێنریتەوە، بەلکو چی لە بەرژەوەندی باڵای وڵات و میللەت بێت بەگشتی ناوا تۆمار دەکرێ، ئەنجومەنی ئاسایشی تورکیا پێك دێت لە زۆرینەی جەنەراڵەکان و بەرپرسی هەرە باڵای دەسەلات، زۆر بە ئاسانی جم وجۆڵەکانی ئیسلامی، چەپی، کوردستانی.. بە هەڕەشە لەسەر ئاسایشی تورکیا لە قەڵەم دەداو قەدەغەی دەکا، هەتا داواکردنی خوێندن بە زمانی کوردی بە داوایەکی تیرۆرستیو هەڕەشە لەسەر ئاسایشی تورکیا ناسانرا، ..بەو شێوەیە ئەو چەمکە لە زۆربەی وڵاتان بەشێك لە داپڵۆسین و چەترێکی ئێدەکی یاساییە بۆ چەوساندنەوەو دەرکردن لە گۆڕەپانو پاوان کردنی دەسەڵاتە بۆ چین و کۆمەڵێك بە تۆرە ئەگەر دیموکراسی بن، هەر جۆرێکی داهێنراوی زیرەکانەی دیکتاتۆریە.

## ڕای مەدرەسەکان:

دوای خوردو سادەکردنەوەی ئاسایشی نەتەوەیی دەبینین تا ڕادەیەکی زۆر پەیوەستە بە (مقاصدەکان)ی دەستوورو سیستەمی دەسەڵات لە لایەك و لە لایەکی تریش بە مدرسەکانی سیاسی، چونکە بەرژەوەندی باڵای هەر میللەتو وڵاتێك لە لایەن مدرسەو شارستانیەکان جیایە لەگەڵ ئەوانی تر، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتن لە ژیانی مرۆڤ، مانای مافی مرۆڤ، فاکتەرە

کاریگەرییەکانی سەر مرۆڤ و کۆمەڵ...بەو شێوەیە (ئاسایشی نەتەوەیی) لە سیستەمی ولاتە شیوعیەکان زۆر جیایە لەگەڵ ولاتانی لیبرالی رۆژئاوا، ئەوانەش لەگەڵ ولاتانی دیکتاتۆری نەتەوەگەری جیهانی سێیەمو عەرەبی، هەمرو ئەوانەش لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامی راستەقینە، .....لە کاتێکدا لە رۆژئاوا زیاتر ئاسایشی جەستەیی و خۆراکی گرنگە (واتە لایەنی ماددیەکەی)، دەبینین لە شیوعیەتدا ئاسایشی چینی کرێکارو نوێنەرایەتی لە دەسەڵاتو پرۆلیتاریا گرنگە، بە هەمان شێوە دەبینین لە سیستەمەکانی حوکمی ولاتێکی وەك عێراقی سەردەمی (صدام حسین)- کە نموونەیەکە لە ولاتانی عەلمانی نەتەوەگەریو دیکتاتۆری - ئەوا ئاسایشی نەتەوەیی کەمتر مانای بەرژەوەندی باڵای میللەت و ولات لە بەردەم خەونەکانی سەرۆك دەمێنێ و زۆربەی سامانی ولات و هاولاتیان و...دەخستە خزمەت بەرنامەیەکی هەڵە...بۆیە لەو جۆرە ولاتە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی نەبووە، ئەو ئەنجومەنە لە ولاتە دیکتاتۆرییەکان بە گشتی هەمر لە هاوکێشەکەی دەسەڵاتی میللەت یەکسانە =بە دەسەڵاتی سەرۆك نقوم بووە، ئەو کاتی مانایەك بۆ ئەنجومەنی ئاسایش و ئەو ئاسایشەش نامێنێ ئەرکاتی ئاسایشی نەتەوەیی بریتی دەبێ بە ئاسایشی دەسەڵاتی سەرۆك، هەروەك بە زەقی لە هەڵسرکەوت جەنگەکانو دانوستانو پەیوەندیە دبلۆماسیەکانی عێراقی ئەو سەردەم بەدی دەکرا، ئەوەش لەوەوە دێت کدیکتاتۆری ئیستا وەك جاران ئیشتمان پەروەر نین زیاتر بەرژەوەندی کەسێتی خۆی دەخاتە سەرووی هەمووان ، هەر بۆیەش دیکتاتۆرو زالمی ئیستا ترسنۆکیشن .

لە ئیسلام دا ئاسایشی نەتەوەیی بەو زاراوە نەبرو (تەنها ئاسایش- أمن- باسکرا بێ) بەلام لە ناوەرۆکدا پەیرەوکراوە و دەکرێ، چونکە ئەو چەمکە جۆرێك لە رەگەز پەرستی تیایە، لە مەبەستو ئامانجدا ئاسایشی هەموو مرۆڤی سەر زەویە، بەلام وەك واقعێکیش کە ولاتی سنووردار هەیە ئەوا بە پێی ئەو واقعە بۆ ئەو قۆناغە هاوشێوەی ئەو ئاسایشەو ئەنجومەنەکەش پیادە کراوە، هەروەك لە

ئێران داتراوە، ئاسایش لە ئیسلامدا هەر تەنها بۆ دەسەڵات‌و چینێک‌و نەتەوەو ئاین‌و سنورێک نیە، لێرەدا ئاسایشی فکری و ئابووری و ئایینی و ئایدۆلۆژی و ژیاری و فەرهەنگی بۆ گشت لایەکە لە باری سروشت و ئاسایی خۆی، نەک لە کاتی دەست درێژی و جەنگا، هەڵبەتە ئاسایش بۆ دەست درێژکارو پیاو خراپ نیە. ئەو ئایەت و فەرموودەو رێسا گشتیەکانی ئیسلام لە بارەی ئاسایشە کە لە خوارەوە تۆماری دەکەین:

- **فليعبدوا رب هذا البيت الذي أطعمهم من جوع وآمنهم من خوف.**
- **من رأى منكم منكراً.........**
- أمر بالمعروف ونهي عن المنكر..

لە بارەی زاراوەی (أمن) لە ئەدەبیاتی ئیسلاما زۆری لەسەر نوسراوە:

- لەبارەی (امن العام)دا زانایانی ئیسلام وتویانە (الأمن اهنأ عيش والعدل أقوى الجيش)
- ماوردي- کتێب (ادب الدين والدنيا): أمن العام تطمئن اليه النفوس، وتنتشر فيه الهم، ويسكن فيها البدي، ويأنس فيه الظعيف.

لە وەرچەرخانەکانی ئێستای جیهان بەرەو عەولەمە زیاتر (ئاسایشی نەتەوەی) بەرەو تەرازوی روانگەی ئیسلامی وەردەچەرخێ، کەمتر ئەو مانار مەبەستە کلاسیکیەی جارانی دەمێنێت، لە ئیسلامدا ئاسایش هەر ناگەرێتەوە بۆ دەسەڵات، بەشێکی زۆریش لێ دەگەرێتەوە بۆ ناو کۆمەڵگە، ئەوەش بەشێکی گرنگی کۆمەڵگەی مەدەنیە لە ئیسلامدا، بلاوکردنەوەی ئاشتی‌و ئاسایش ئەرکی بنچینەیە، زامنکردنی ژیان‌و تەبایی‌و هاریکاری‌و هەموو بنەمایەکی ئەخلاقی‌و دادگەری.. تاکە سەرچاوەی ئاسایشی تاک‌و کۆمەڵە...کە لەو پێناسانە کەمتر بە لای داچوینە، ئیتر دڵنیا کردنەوەی دەزگا کۆمەڵایەتی لە تاک- خێزان- نەتەوە- کەمایەتی نەتەوەیی‌و ئەژادی‌و ئایینی‌و فەرهەنگی چینایەتی هەتا معارەزەی یاسایش بە شەریعەتی ئیسلامی دەچەسپێ کە تومەتێک دروست

بکرێ‌و دادگەریش لە فەرمانڕەواییدا، بۆیە کاتێ نوێنەری ئەهلی کتاب نامەی بۆ ( عمر) هێنابوو، وای زانی ئەویش وەك ئەو سەردەمەی ئیمپراتۆران لەناو چ کۆشك و تەلارو پەرژینی پۆلاو دیواری بڵندو حیمایەو .. کەچی کە پیشانیاندا لە ژێر سێبەری کۆنە دیوارێك پاڵی دابووە وە بە تەنها، ئەو نوێنەرەش سەری بە جارێك سوڕما و وتی، عدلت ثم أمنیت فنمت...

بنەمای هەمرو ئەو دڵنیاییانە کە لە یاسای دراوسێی گشتی، بنەمای تکامل اجتماعي، تکافل اقتصادي، ذمة، اقتصاص، ......لە ئیسلامدا وا هاتووە مادام ئاسایش تاکێك پێشێل کرا ئەوا ئاسایشی گشتی پێشێل کرا، مادام خراپەیەك (منکرات)ێك جێی بۆوە بێبەرگری ئەوا دادگەری تێك رووخا..، مادام زاڵم بووی ئەوا زوڵمیشت لێ دەکرێ و ئاسایش نامێنێ.

لەسەر ئەو بنچینانە دەتوانین چەند بنەمایەك بۆ ئاسایشی نەتەوەیی لەهەردوو ڕوانگەی فکری ئیسلامی و مرۆڤایەتی دابڕێژرێن کە گوزارش لەو قوناغە مێژووییە دەکا وە بۆ زیاتر ناوچەکەی خۆمان:

١. ژێر دەستەیی و چەوساندنەوە سەرچاوەیەکی بەردەوامی نا ئارامی‌و ناسایشە، ڕزگاربوونیش چارەسەریەکەیەتی، نەخشەی (سایکس پیکۆ) لەو وڵاتانەی ئێمە بۆ ناارامی سنورکێش کراوە.....کەواتە هەڵوەشاندنەوەی ئەو ڕێکەوتنامە ئیمپریالیزمانە و قەڵاچۆی داگیرکاری و چەوساندنەوە بنەمایەکی هەرە بەهێزی ئاسایشی نەتەوەیی ئەو قۆناغەیە.

٢. نادادگەری یاساکانی جیهان، بنەمای"بەرژەوەندی تایبەتی" سەرچاوەیەکی تری ئەو نائارامی و ناناسایشەیە، دڵنیایی خەڵك دەشلەژێنێ، لە جیاتی ئەوە بنەمای "بەرژەوەندی گشتی"و دادگەریە دڵنیایی‌و ئاسایشی پێ دەگەڕێتەوە.

٣. دەبێ هەروەك تاکەکان لەسەر بنچینەی یاساو ڕەوشتی بەرز ڕەفتار لەگەڵ یەك بکەن (لایؤمن أحدکم حتى یحب لاخیه مایحب لنفسه) تا ئەو بنەمایە نەکرێتە پەیوەندی دەولیش ئەوە جیهان ئارام نابێ، ئەگینا گەورە بچووك قوت

دەدا، ئاسایشی نەتەوەیی لایەك لەسەر حسابی لایەكی بێهێزتر دەبێ، حوكمەكان بانێك‌و دوو هەوار چەند هەوا دەبێ، هەروەك لە ئیسلامدا بەو جۆرە حوكمانە وتراوە (حكم الجاهلية).

٤. ولآتیش وەك تاك دەبێ لە ژێر بنەمای (لایظلم ولایظلم) نابێ ئاسایشی نەتەوەییەكەی هەرەشە بێت بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەی ولآتێكی تر.

٥. هێزی بەرگری (نەك هێزی هێرشكەر)و توانای ماددی‌و یەكێتی‌و یەك ریزی‌و یەك سەركردەو یەك بیروباوەڕو سپاردەیی لە دەسەلآت‌و پێش كەوتنی زانستی و .....بنەمای گرنگی ئاسایشی نەتەوەییە.

٦. پەروەدەكردنی خەڵكی‌و خەلكی جیهان بەگشتی لەو سەردەمەدا بە رەوشتی بەرزو وشیاری مرۆڤایەتی‌و خۆنەویستی بەشێكی گرنگی زامنكەری ئەو ئاسایشەیە، پێچەوانەشی ئەنجامی پێچەوانە دەداتەوە.

٧. دەزگایەكی بەكارترو دادگەری تر لە جیاتی (UN) وەك دەزگا لە سەرووی هەموان‌و بێ ڤیتۆو بەراستی نوێنەرایەتی فرمیی جیهان بكا بە كەمایەتیەكانیشەوە.

٨. دەسەلآت وەك سپاردە بێت نەك موڵك، كە سەرچاوەی دیكتاتۆریەت‌و پادشایەتی‌و پاوان كردنی دەسەلآتە، ئەوانەش سەرچاوەی نائارامی‌و دڵنیایی‌و تێكدانی ئاسایشی گشتی‌و تایبەتیشە، لە بەرامبەردا دەست گۆڕی دەسەلآت‌و سەربەستی بیرورا‌و ئازادی و هەڵبژاردن و...دەبێتە پتەوكردنی پەرژینە بالآكان‌و خەملینی بنەماكانی ئاسایشی نەتەوەیی لای هەموو تاكێك.

هاتنەدی ئەو بنەمایانە تەنها ناكەوێتە سەر دەستوورو یاسا بەلكو زیاتر دەكەوێتە سەر مدرسەكانی سیاسی‌و فكری سەرەكی (ئیسلامی، لیبرال، سۆشیالیستی، شیوعیەت)..

## ئاسایشی نەتەوەیی کوردستان:

لە ڕاستیدا ئاسایشی نەتەوەیی بە پێی بنەمای بەرژەوەندی دەکرێتەوە چوار بەشی سەرەکی:

١. ئاسایشی زل هێزانی جیهانی لە وڵاتانی سەرمایەداری و ئەوانەی دەیانەوێ کۆنترۆڵی دەروازەکانی عەولەمە بکەن.

٢. ئاسایشی نەتەوەیی وڵاتانی زاڵی نەتەوەیەکی سەردەستە.

٣. ئەو میللەتانەی ژێردەستن.

٤. وڵاتە تاك نەتەوەییەکان یان گرفتی کێشەی سنوری.

هەڵبەتە هەریەکە لەوانە چەند بنەمایەکی هاوبەشی هەیە لە هەمان کاتدا لە چەند بنەمایەکیش لێك جیادەبنەوە، بۆیە نابێ ڕابەراتی عەلمانی کورد ئەو بابەتەش وەك مەسەلەی تیۆری سیاسی و فلسفی و فکری هەڵسن لە پێناو دارشتنی بنەماکانی ئاسایشی نەتەوەیی لە هەر شوێنێك بێت و چۆن بێت هەر بیهێنن...، نەخێر دەبێ زۆر بە وردی بزانن بنەماکانی ئاسایشی نەتەوەیی (کە لە کۆتاییدا تۆماری دەکەین) لە کوێدا سەرچاوەکانی بوون و ڕاست کردنەوەیەتی، لە کوێشدا سەرچاوەی مەینەیی و بەردەوامیەکەیەتی، لەو چوار پۆلەی سەرەوەدا کامەیە شوێنی کوردستان؟ ئاخۆ لە بەرەی عەلمانیەت بن یان ئاینی؟ لە بەرەی نەتەوەگەری یان ئومەتی؟ لە کام بەرەی ململانێی شارستانیەکان بن؟ لەبەرەی میکافیلی و بەرژەوەندی پەرستی؟....هەموو ئەو پرسیارە ئاسایشیانە بە ڕوون کردنەوەی هەرمشەکانی سەر ئاسایشی نەتەوەیی کوردستان ڕوون دەبێتەوە، ئەگەر پێناسەکەش وەك بە سادەیی دەربڕا لێرەش هەر مانای پاراستنی بەرژەوەندیە باڵاکان و نەگۆڕەکانی میللەتانی کوردستان بێت لە هەرەشەی دەرەوەو ناوەوە کە بریتین لە ١- داگیرکەران و هەموو پارمەتیدەرەکانی، ٢- ئەو بیروباوەڕو ئایدۆلۆژیاو یاساو نەریتە دەولیانەی ڕەوایی ئەو داگیرکەریەی لەسەر وەستاوە کە بریتیە لە ئایدۆلۆژیای نەتەوەگەری عەلمانی و سۆشیالیستی دیکتاتۆری، یاسای

(عدم التدخل)و (سیادة الدولة) (ئەندامیەتی دەوڵەتان بۆ UN لە جیاتی نەتەوەکان-(کە ناویشی نەتەوە یەکگرتووەکانە کەچی نەتەوەیەکگرتوو نیە وڵاتە یەکگرتووەکانە)-، نەریتە دەولیەکان بە تایبەتی ئەوەی ئێستاکە هەموو هەڵسوکەوتی رەسمی دەوڵەت بەڕەوا دەزانن هەرچیەك بێت کەچی بەرگریو رزگاری بە نارەواو بەدەر لە یاساو جارجار بە تیرۆرستیش لە قەڵەم دەدەنو زاراوەی وەك (إنفصالي، تجزئة، خروج عن قانون، دعاة العنف، مخربين، أرهابيين...) دەدەنە پاڵ شۆرشگێران· ٣- هەموو ئەو ڕێکەوتنو ڤاکتەرە مێژوویانەی بوینە هۆی مەینەتی خەڵکی کوردستان لە سەرەتای سەدەی رابردوودا دەست پێدەکار بریتین لە:

أ. ڤاکتەری جیهانی کە خۆی لە ڕێکەوتنامەی سایکس پیکۆ ١٩١٦ سان ریمۆ ١٩٢٠، قاهیرە ١٩٢١، لۆزان ١٩٢٣ کە مدرسەی لیبراڵ دیموکراسی و رۆژئاوایی لێی بەرپرسیارە، یان دەکرێ بڵێین عەلمانیەتی جیهان.

ب. ڤاکتەری ئیقلیمی کە بریتین لە سەرهەڵدانی بزووتنەوەی دەستووریو عەلمانیو نەتەوەگەری ئتحادیەکانو دواییش ئەتاتورکو مدرسەی نەتەوەگەری عەلمانی عەرەبی.

ج. ڤاکتەری ناوەکی کە خۆی دەنوێنێت لەو هاوکاریە هەڵخەڵەتاویەی تەیاری عەلمانی کوردی کردیان لەگەڵ تەیاری عەلمانی تورکیو جیهانی بە تایبەتی ئەو وەرگێڕانەی ڕێکەوتنی سیڤەر بۆ لۆزانو وەرگێرانی خەلافەت بۆ کۆماری عەلمانی تورکی.

## بنەماکانی ئاسایشی نەتەوەیی کوردستان:

١- هەموو هەنگاوە پێچەوانەکانی تەوەرەکانی (هەڕەشەی ئاسایشی نەتەوەیی) کە لە سەروو باسکرا بە وردیو تەواویەوە، کە زیاتر هەڕەشەکانی دەرەکیە.. ئەو خاڵانەی داهاتووش زیاتر هەڕەشەو دژە هەڕەشەکانی ناوەکیە.

٢- یەك ڕیزی و یەك ڕابەری و هەموو دەروازەكانی كە دەچێتەوە سەر ئەو یەك ڕیزی و یەك ڕابەریە، بۆ ئەو مەبەستە دەبێ:

أ. ئەو میللەتە وا پەروەردە بكرێ لەسەر ئەو بیروباوەڕو ئایدۆلۆژیانەی كە ڕەسەنن و زۆرایەتی هەرە زۆری قەبوڵی دەكەن نەك ئەو فكرو ئایدۆلۆژیانەی كە دەبێتە پارچە پارچەكردن و نەگونجێ لەگەڵ عەقیدەی زۆرایەتی.

ب. فرەلایەنی لە قۆناغی ڕزگاری- نیشتمانی پەسەند نیە، بەڵام ئەگەر واقعێك بێت ئەوا نەبێتە فرە دەسەڵات فرە ڕێبەر فرە گیانی میلیشیایی.

ج. خۆ دوور خستنەوە لە دەروازەكانی بەرژەوەندی تایبەتی وێرانكەر.

٣. ڕاهێنانی میللەت لەسەر بنەماكانی ئەخلاقی و بەرگری لە كاتی پێویست و وای لێ بكرێ بەرژەوەندیەكانی گشتی بخاتە سەرووی بەرژەوەندی تایبەتی، ئیتر ئۆتۆماتیكیەن دەبنە پاراستنی بنەماكانی ئاسایشی نەتەوەیش، ئەوەش مانای دروستكردنی ئومەتێكە كە ڕاست گۆیی، هاریكاری، بەهاناهاتن، بە ئۆقرە، خۆنەویستی، ڕەوشەنبیر، .... ئومەتی وا فێڵی لێ ناكرێ، لێ ناخوردێ بە هەموو لایەك، بە پێچەوانەی بنەما ئەخلاقیەكانی فكری ماددی، كە دەبێتە هۆی درۆزنی، خۆویستی، هەڵەشە، خۆفرۆشی و میللەت و خاك فرۆشی، نەزانی، پارچەپارچەیی و خێرا گۆڕاوی...... لە كۆتاییدا ناتوانێ بەرگری نیشتمانی بكا لە كاتە سەختەكان.

٤. دروست كردنی ڕێبەرێكی كاریزمی میللی ڕوحی، باوەشی وا فراوان بێت جێگەی هەموو ڕەنگ و تەرزوو چین و بیروباوەڕی جیاو ئایدۆلۆژیای جیا ببێتەوە، ڕێبەرێك بێت لە سەرووی حزبایەتی و مناقەسەو چاو لە تەخت و خۆویست، خاوەن بەرنامەو بیروباوەڕێكی مەزنی وا بێت ئامۆژگاری و ڕێنماییەكانی لە هەڵسوكەوتەكانی دابێ، ... بە كورتی عەقیدەی زاڵ بێت بەسەر ئارەزووەكانی دەروونی.

٥. پەروەدەی زانستیو تەکنیکیو داهێنانی بزووتنەوەی وشیاریو بیناکردنی ژێرخانی کۆمەڵ بە هەموو ئاراستەکانی ئابووریو تەکنیکیو فکریو شارستانیو مەدەنیەتو ئەخلاقیو شۆڕشگێڕیو ئاشتی خوازی و بۆ هەموو ئەو بنەماو دەروازەکانی سەروو دەبێ بە وردی بۆی بگەڕێین ئاخۆ ئەو بنەمایە لە کام مدرسە بەدی دەکرێو پێی دێتەدی لە (ئیسلامی، لیبرالی، سۆشیالیستی، شیوعی) کامە مدرسە دەرچوو ئەوا ئاسایشی نەتەوەیی کوردستان لە ستراتیژیەتدا دەبێتە ئاسایشی ئەو مدرسە لە هەرسێ ئاستی جیهانیو ئیقلیمیو ناوەکی.

(٣٦)

developmentalism

## پێشکەوتوویی التقدم advance- progress

وەك ماهیـەت پێـشکەوتوو نوێنەرایـەتی مانایـەکی کـۆن دەکـا، لەگـەڵ مرۆڤایەتی ماناکەی بەجۆرێك هەبووە بەڵام وەك چەمك زۆر کۆن نیە، تا ڕادایـەك تێکەڵیەکیش هەیە لەنێوان پێشکەوتنەکانی هەریەکە لە: کۆمەڵایەتی، ئـابووری، زانـستی، فیکری، .. ئەوانە لە بنەچـەدا لێـك جیـان، ئـەوەی لێـرە مەبەسـتمانە پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیـە، بـەتاك و کـۆوە، پێـچەوانەی دواکـەوتن بـەجێمانو (رەجعیەت)، جار وایە ئەگەر لە دژەکان نەگەین لەخودی بابەتەکە چاك ناگـەین، دواکەوتوو (رەجعیەت) بەزۆری لەو سەردەمە بەو مانایە بەکاردێ کە یەکێك یـان لایەنێك پشت بە فاکتەرە کلاسیکیەکان ببەستێت لەوانە فاکتـەرە کۆمەڵایـەتیو خێڵەکیو تایفەییو رەچەڵەکیەکانی تر، لە ڕووی ئایدیۆلۆژیاو فکـریش پـشت بـە سـەرخانی ئـەو فاکتەرانـەی سـەرووی کۆمەڵایـەتی ببەسـتێت، یـان لـە ڕووی کەرەسـتەو ئـامراز ئـارەزووی کـەلو پەلـە کۆنـەکانت بێـت، هەڵبەتـە هـەر مەدرەسەیەك بەجیا دەڕوانێتـە هـەردوو چـەمکی (رەجعیـەت)و (پێـشکەوتن)، پێـشکەوتنیش کاریگەرە بـە بەشـەکانی تـری پێـشکەوتنی زانـستیو ئـابووریو تەکنەلۆجی.. بەڵام هەر یەکە ماناو شوێنی خۆی هەیە بەداخـەوە بەشـی هـەرە زۆری فەرهەنگو ئەنسکلۆپیدیەکـــانیش تێکـەڵیان کـردووە، وا هەندێکیـــان لـێ هەڵدەبژێرین.

## ڕا یە جیاجیاکان:

• لەو سەردەمە لە فەرهەنگە دەولیەکان پێشکەوتوویی بە پێشکەوتنی باری ئابووری وڵاتو ژێرخانەکەی لەداهاتو نوێگەرایی و ئاستی زانستیو تەکنۆلۆجی.. لێک دەدرێتەوە، پاشکەوتوویش- تخلف ئەک (ڕەجعیەت) بە پێچەوانەی سەروو لێک دەدرێتەوە.

•ئەو تێڕوانینەی سەروو هەر فەرهەنگە پاسایەکانی نەگرتۆتەوە، فەرهەنگە سیاسیو کۆمەڵایەتیەکانیش کاریگەرن بەو بۆچوونە، فەرهەنگێکی وەك (موسوعة علم الاجتماع) کە لەوانی تر چاکتر بۆی چووە، کەچی لەباسو مادەی (تقدم الاجتماعي)و (تخلف اجتماعي) هەر بە سادەی بە ڕادەی پێشکەوتنو پاشکەوتنی دەزگاکانی لێك دایتەوە، نەك خودی مرۆڤەکان، هەرچەندە لاپاسێکی مرۆڤەکە دەگرێتەوە، لەکاتێکا گەوهەری باسەکەمان مرۆڤە نەك ئامرازو دەزگا.

• فۆری، ابن رشد، .. پێیان وایە پێشکەوتنی هەر میللەتێك بە پێشکەوتنی ئافرەتانیان دەپێوری.

• بەشی هەرە زۆری ئابووری ناسو مەدرەسەی مادیو مەدرەسەی لیبرالیەکانیش پێشکەوتن لایان ماناى پێشکەوتنی ئامرازەکانی بەرهەم هێنانە.

• بیترمان: پێشکەوتنی بە شارو لادێ بەستۆتەوە، لەکتێبی (مدخل الی علم اجتماع الحضري) دەڵێ شار پێشکەوتووەو لادێش دواکەوتوو، زۆر ڕوونە ئەوەیان تێڕوانینێکی ڕەگەزپەرستی کۆنی ڕۆمانیو یۆنانی لە ئەسڵی زاراوەکانی (سیاسەت)و شارستانی)و (مەدەنیەت).. ئەوان وەرگیراوە.

• ئوکست کۆنت: پێشکەوتن ماناى پێشکەوتنی زانستی.

• نەتەوەگەریەکان: پێشکەوتن دەبەستنەوە بە ژینگەو خاكو ڕەچەڵەك، ئیتر ڕەچەڵەکی ئەورووپیو ئاوهەوای ئەورووپی هەر دەبێ میللەتێکی پێشکەوتوو پێشڕەوی جیهان بدات، وەك خۆیان دەڵێن، لەناو عەرەبیش (خاکی پەیامەکان) هەردەبێ پێشڕەوی جیهان بێت، لەناو یەهودو سربو ئەرمەنو تورك... هەریەکە

لە بە جۆرێك دیبێکی وای هەیە.

• پێشکەوتوویی لای زاناکانی تر پێوانەی جیاجیای تری هەیە، لای (سپنسر) بەمانای لە ١- سادەیی بەرەو ئالۆزی ٢- لەیەکچوویی بەرەو پەرش و بڵاوی و دوورکەوتنەوە.

• زۆر جۆرە تێڕوانینی تر هەیە کۆماری لە پادشایی پێ پێشکەوتووترە.

یان بەپێی سیستەمی سیاسی و ئینتمای مەدرەسییەکەی، ...هتد. پێش و پاش کەوتوو دیاری دەکرێ.

لە راستیدا ئەو پێوان و تەرازوانە بۆ پێشکەوتن ئەوەندە وردو تێر نین، زۆربەیان دەردی یەك لایەنی هەیە، جاری پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی گشتی و پێشکەوتنی تاك تێکەڵ کراوە و یەك هۆکارو بنچینەی دراوەتێ، ئنجا مەرج نیە شاریەك لە لادێیەك رەوشەنبیرو پێشکەوتووتر بێت، یان خاوەن ئاشی هەڵمی لە ئاشی هەوای پێشکەوتووتر بێت، یان ئافرەتێکی سەر کۆمپیوتەر پێشکەوتووتر بێت لە ئافرەتێکی سەر دەستاڕ، ئەوەیان راستە ئاشی هەڵمی پێشکەوتووترە لە هەوایی، کۆمپیوتەر لە دەستاڕ، بەڵام مانای وانیە خاوەنەکانیشیان پێشکەوتووتر بێت، بە هەمان شێوە مەرج نیە وڵاتێکی کۆماری پێشکەوتووتر بێت لە وڵاتێك پادشایی زۆربەی وڵاتە گرنگەکانی ئەورووپی پادشایین، کەچی لە ئەفریقا تەنها (سوازیلەندو لیسۆتۆ، مغرب، نیبن) پادشایین ئەوی تر هەمووی کۆمارین بەو تەرازوە بێت ئەوا ئەفریقا پێشکەوتووترە لە ئەورووپا.. ئنجا یابان ئەك پادشاییە، هێشتا سیستەمی ئیمپراتۆریەو زۆر پێشکەوتووشە لە تەکنەلۆجیاو ئیدارەو باری ئابووری.. ئەو مەرجانەی سەروو رەها نین، ئنجا لە رایەکەی (سپنسەر)یش بە رووتی دەردەکەوێ دیاردەیەکی سروشتی و بایۆلۆجییەکانی کردۆتە بنچینە بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی، دەشێ لە بایۆلۆجیا گەشەکردن و پێشکەوتن مانای لە سادەییەوە بەرەو ئالۆزی و لێك دوورکەوتنەوە بێ، بەڵام هەمان مانا لە کۆمەڵایەتی پێچەوانە دەبێتەوە، لێك دوورکەوتنەوەو یەك تەگرتن مانای

٢٦١ پێشکەوتوویی     تقدم     advance- progress

پێچەوانەی پێشکەوتنە..

بۆ لێك کردنەوەی هەموو ئەو لێڵی و تێك گیرانە بەتایبەتی لەنێوان مانای پێشکەوتنی تاكوکۆ ئەوا بە پرسیارێکی سادە دەست پێدەکەین: ئاخۆ مرۆڤێکی پێشکەوتوو چی پێشکەوتووە؟ جلو بەرگو شێوەیەتی یان ماڵ و سامان و سەیارەو کارگە؟ یان بڕوانامەیەکی باڵا و پایەیەکی باڵایە.. کامەیە یاخود شۆڕشگێڕو سیاسەتمەدارێکی بەرزە.. لە سیاسەتمەداریشدا کامەیە میکاڤیلیە، مەبادینیە، لیبرالیە، یان سەرجەمیانە، ئەوانە هەمووی لەلایەك ئەدی گرنگی ڕەوشتو بەها.. لە وەڵامی ئەو پرسیارە بەو خوردکراوەیی کەس بوێری ناکا (پێشکەوتوویی) بداتە پاڵ فاکتەرە ڕواڵەتیەکانی وەك: جلو بەرگو سامانو بڕوانامەو پایە.. بەڵام باسەکە کە لەتاکەوە دەپەڕێتەوە بۆ کیانو کۆو کۆمەڵگا ئەوا ئەو جارە لە وەڵامی پرسیاری هاوشێوەکەی ئاخۆ کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتوو یان وڵاتێکی پێشکەوتوو چی پێشکەوتووە؟ بەخێرایی وەڵامت دەست دەکەوێو دەڵێن پێش کەوتنی باری ئابووریەکەیتی، واتە فاکتەرەکانی کاریگەر لەسەر کۆمەڵ، کامەیە یەکلاکەرەوەی (پێشکەوتن) لەو فاکتەرانە: ئابووری، ڕەچەڵەك، کۆمەڵایەتی، ژینگە، پەیوەندی جنسی، دەروونی، ئاستی فێرکردن، لە بەرهەمەکانی ئاسۆیش (زانستو فەلسەفەو ئایدیۆلۆژیاو ئایینو پێکەوە ژیانی سیاسیو حزبایەتی.. واتە بە کورتی فاکتەرە شاقوڵیەکانە یان ئاسۆییەکانە؟ دەتوانرێ ئەو پرسیارانە ڕوو لە تاکیش بکرێت ئاخۆ کام لایەنی مرۆڤە پێوەری پێشکەوتنی هەڵگرتووە لە شێوەو جلو بەرگ، ماسولکەکانی، گەدەی، باری جنسی، نەژادی، ڕەچەڵەکی، نێرو مێیاتی، ماڵو سامانی، پایەی.. یان هەموو ئەوانە تەنیا هۆکاری یارمەتیدەرن و گرنگەکە ئەوەیە چی لە مێشکدایە. لە وەڵامی (کێ مرۆڤێکی پێشکەوتووە؟) دوای کەمێك دەمەقاڵێ هەموو لایەك دەگەنە ئەو ئەنجامەی کە مرۆڤی پێشکەوتوو دواکەوتوو زیاتر بەوەی لێك دەدرێتەوە کە چی لە مێشکیدایە (بەو مانایەی چی لەدڵو دەروونی دایە)، بەڵام

کە باس لە کیان‌و وڵات‌و جیهان دەکرێ، ئەوا زۆربەی هەرە زۆری پشت بەو واقعە جیهانیە دەبەستریت‌و یەکسەر وەڵامی پێشکەوتن بە مانای پێشکەوتنی پیشەسازی‌و زانستی‌و باری ئابووری وەردەگیرێ، بۆیە جیهان بەو پێوانەیە دابەش کراوە وڵاتە پێشکەوتووەکان، وڵاتانی تازە پێگەیشتووەکان، وڵاتانی دواکەوتوو.. جار وایە بە شێوازێکی ڕێز لێنان بە وڵاتە پاشکەوتووەکان دەوترێ – وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان یان جیهانی سێیەم)، ئەگینا بە بەجێ‌ماوو بەربەرو هەمەج و.. ناوی تریشیان لێ دەنرێ، بەو شێوەیە تێکەڵکردنی پێناسی پێشکەوتوویی بۆ تاك‌و بۆ کۆ بە ئەنقەستە لە بنچینەدا، مەبەستی تایبەتیانە، ئەوەیە لیبرال و سەرمایەدارەکانی ڕۆژئاوا لەڕووی مادی‌و تەکنەلۆجیا پێشکەوتوترن‌و ئیتر دەیانەو لەو فاکتەرەی کە لێی بالادەستن تەرازوویەکی هەڵسەنگاندنی گشتی لێ بتاشن و بیکەنە تێڕوانینیەکی نوێ بۆ ژیانی نەوێ لە پەیوەندیەکانی دەولی تا دەگاتە ئایدیۆلۆژیای تاك و ڕەوشت و بەها مرۆڤایەتیەکانی تر، بەو شێوەیەش تیۆری (ململانێی شارستانیەکان) هاتە کایەوە، وەك بەدیلێك بۆ ململانێی مەدرەسەکانی فیکری‌و سیستەمی سیاسی کە لێی دەست کورت بوون، لە ململانێی شارستانیدا توخمی بنچینەی زانست‌و تەکنەلۆجیایە کە ئەوان لێی دەست درێژن، بۆیە بلیمەتانە ئەو تیۆرەیان داهێناو دایان تاشی (نەك دۆزرابێتەوە)، بەو شێوەیە پێشکەوتن بەند کرا بە شارستانی‌و ئەویش بە زانستی‌و تەکنەلۆجیا.. ئیتر لیبرالی ڕۆژئاوا لێی بالادەستن واتە پێشکەوتوون، گەورەترین چەمکیان بۆ خۆ پاوەن کردووە کە دەروازەیەکی ستراتیجیە بۆ پێشڕەوی‌و سەرکردایەتی کردنی جیهان و هەتا ئیستعمارکردنیشی.

لەوەی سەرەوە بەڕوونی بۆمان دەردەکەوێ کە هەر وڵاتێك مادام تەکنەلۆجیدارو سەرمایەدار بێت پێشکەوتووە کە عادەتەن ئارام‌و بەئەمنیەتی بوون‌و مەدەنیەکی ڕواڵەتیش لەگەڵ دێ، جا با شەڕانگێزو بێبەزەیی‌و ئیستعمارو بێ دادگەریش بن، بەو پێیە ئەڵمانیای هتلەری، ئیتالیای مۆسۆلینی،

ئەمریکای ترومان، سۆڤیەتی ستالینی، هەموو ئیستعماریەتیش ولاتانی پێشکەوتوون! ئیتر پێشکەوتن هیچ ناکۆکی نامێنێ لەگەڵ داگیرکاری و بەکۆمەڵ کوشتن و ئیمپریالیزمی و برسی کردن و دابەش کردن.. لە چەمکە ئەخلاقیەکەی دادەبڕێ، ئەوەش گەورەترین ناکۆکی زەقە چونکە پێشکەوتوویی مرۆڤایەتی پەیوەستە بە (ریباز) نەك (تەنها زانست)، پێشکەوتووی مانای هەبوونی نیە، دواکەوتوویش مانای نەبوونی نیە، بەو پێیە بێت ئەوا لە ولاتی خۆشمان ئاغاو برجوازی و سەرەك خێڵ و دەسەڵاتدارو دەوڵەمەندەکان پێشکەوتوون و جوتیارو کرێکارو پالاو کاسبکارو نووسەرو رەوشەنبیری نەداریش.. دواکەوتوون.

ئەوە تێڕوانینێ رۆژئاوایی لیبرالی دیموکراسی چەوت و بۆپێوەرە، رەتکراوەتەوە لەلایەن هەموو مەدرەسەو سەنتەرو زۆربەی زانایانیش، مەگەر مەدرەسەو لایەنێك کە قەلۆش بێت تەنیا لاسای کردنەوە پەیرەوی بێت، هەڵبەتە لە کۆمەڵگەیەك کە (مەبادینەکانی ملکەچی بەرژەوەندیەکانیەتی) مەحالە پێشکەوتوویی راستەقینەی لێ بێتە دی، وەك تاکیش مادام بەرژەوەندی تایبەتی خستە سەرووی بەرژەوەندی گشتی هەروەك ئێستا زیاتر باوی وەرگرتووە هەرگیز مرۆڤێکی پێشکەوتوویی لێ دروست نابێ بۆیە هەموو ئامارەکان بە ژمارە و کێرڤ (خط بیانی) دەیسەلمێنن کە جیهانی ئێستا - بە پێوەرەی دادگەری -زۆر نزیکە لە یاساکانی دەریاو دارستان با تەکنەلۆجیاو زانستیش هەر پێشکەوتوو بێت.

پێوەرە چەسپاوەکانی فەلسەفەی مارکسیش بۆ هەموو چەمکێك (لێرەش بۆ چەمکی پێشکەوتن) ئەوەیە تا چەند ئایدیۆلۆژیای بەرەو شیوعیەتە بیا ئینتمای چینایەتیشی لەو نەبێت، هەرچی کیانە کۆمەڵایەتی و دەزگا سیاسی و سیستەمە ئابووری و ولاتیش بەگشتی بەوە هەڵدەسەنگێنرێ کە رێڕەوە مێژووییەکەی چەندە نزیك بووەتەوە لە قۆناغی شیوعیەت، چەندە وەرچەرخاوە لە سەرمایەداریەوە بەرەو سۆشیالیستی و شیوعیەت کە دواوێستگەی پێشکەوتنی هەموو جیهان و مێژووشە کە پێی دەڵێن (حتمیة التأریخیة)، جا گرنگ نیە ئەو ولاتە خاوەن

پیشەسازیە، دیکتاتۆریە، جەنگەلستانە، ڕای میللەت چیە..

ڕای سۆشیال دیموکراسەکانیش وەکو زۆربەی جار بە لێلیو دوودڵی دەردەکەوێ، بەشێکیان بەلای ڕۆژئاواییو بەشەکەی تر مارکسیەت، هەرچەندە لەو سەردەمە زیاتر بەرەو ڕۆژئاوان لەو پێناسەشدا.

لە فیکری ئیسلامدا بەتەواوی (پێشکەوتن)ی لێك جیادەکاتەوە (هەر خۆشی جیایە) لەگەڵ پێشکەوتنی زانستیو تەکنەلۆجی، بەندیشی نەکردووە بە زەمەن و قۆناغی کۆمەڵایەتی، لەکاتێکدا مارکسیەتو لیبرالیەکانو مەدرەسەی عەلمانی بە تێکڕای پێیان وایە پێشکەوتن بەشێوەی هێڵێکی بێ گەڕانەوەیە هەموو کۆمەڵ بەدوای یەك پێیدا تێپەڕ دەبن، هێڵەکەش بەندە بە زەمەن لە جەمسەری (کۆن) دەست پێدەکات بەرەو نوێ و پێشکەوتن، واتە هەموو نوێیەك لێرەدا پێشکەوتووتر دەبێت لەوانی پێشەخۆی، یان وەك هێلکاریەکەی مارکسی کە بە سێرینگی سەردەکەوێ، بەهۆی هەرسێ یاسای دیالێکتیکی (١- یاسای ناکۆکیەکان. ٢- یاسای وەرچەرخانی گۆڕانە چەندایەتیەکان بۆ چۆنایەتیەکان. ٣- یاسای نەفی ئەلنەفی)، جارێ بەلای ئەوەدا ناچین ئەوانە چەندە مەرجی (یاسا)ی لێ سازاوە، مەبەست لێرەدا مارکسیەت پێی وایە ئەو گەشەو پێشکەوتنە کە بەهۆی ناکۆکیە ناوەکیەکان دروست دەبێت هەردەم بە پێش دەکەوێ، هەر ئەڵقەیەکی سەرور هەم نەفی ئەڵقەی پێشووە هەم نەفی کراوی ئەلقەی پێش خۆیەتی، هەر یەکەش مانای قۆناغێکی کۆمەڵایەتی دەبەخشێ کە سیستەمی بەرهەمهێنانی پێشکەوتووترە لەوەی تر بەهۆی ئامرازی پێشکەوتوو، بەدوایدا سیستەمی زانستی و سیاسیو کۆمەڵایەتی و فیکری و دەروونیو هەرەدواییەکەی ئاینیشە دەگۆڕێت و پێشتر دەکەوێ، جارێکی تر ناگەڕێتەوە سەر قۆناغی یەکەم، ئەوە (یاسای ڕەوشی مێژووە) هەموو باڵ و مەدرەسەکانی عەلمانی لەسەری کۆکن بەرەو سەرکێشی مێژوویی (الجاذبية التأريخية) دەڕوا.. بەو شێوەیە ئەگەر ئەو تێڕوانینە خوورد کەینەوە بە سادەتر مانای وایە هەردەم وڵاتانی

سۆشیالستی پێشکەوتووترن لە وڵاتانی سەرمایەداری، هەروەها کرێکار بە رەهایی پێشکەوتووترە لە بۆرجوازی، جوتیار لە ئاغا، چینی کرێکاریش لە چینەکانی تر، تەواو پێچەوانەی بۆچوونی لیبراڵی و رۆژئاوایە.. هەر بۆیەش لە تیۆری سیاسی مارکسیدا یەکێ لە مەرجەکانی سەرکەوتنی شۆڕشی (پێشڕەوێکی پرۆلیتاریا)یە، ئیتر لەناو یەك وڵات و میللەتیش پێشکەوتن و دواکەوتن دەبێتە چینایەتی.. کەچی لە واقعدا دەبینین تەواو پێچەوانەیە، هەتا لەو میللەتانەی کە دابەش بوون بۆ سۆشیالیستی و سەرمایەداری وەك کۆریای سەروو و کۆریای خواروو، هەردوو یەمەن، ئەڵمانیای رۆژهەڵات و رۆژئاوا... دەبوایە سۆشیالیستەکان پێشکەوتووتر بێت کەچی پێچەوانەکەی راست تر دەرچوو.

هەموو ئەو تێڕوانینانەی سەروو بە (تطور الخطي)یشەوە، بە تێڕوانینی هەموو مەدرەسە مادی و عەلمانیەکانیشەوە بە ناکۆکی خۆ بەخۆ و بە واقعیش شکستی هێنا و دێنێ..

لە فیکری ئیسلامیدا پلەی پێشکەوتنی کۆمەڵ و تاکیش بەو شێوەیە نادۆزرێتەوە، جارێ پێشکەوتنی میللەتان و مێژووش بە (راستەهێڵ- وەك تەتەوریەکان)ی رۆژئاوا نیە، نەوەك (سپرینگیەکەی) مارکسیشە، لەبەر هۆیەکی سادە، چونکە دادگەری و یەکسانی‌و پیاوەتی و بەزەیی و هاریکاری‌و مرۆڤایەتی لە سەردەمێك زۆر زیاتر هەبووە لە ئێستا کە پلەی زانستی تەکنەلۆجی نزیك سفر بووە.

فیکری ئیسلامی بە راستەقینەتر وەڵامی ئەو پرسیارەی پێشوو دەداتەوە لەبارەی فاکتەری بنچینەی پێشکەوتنی مرۆڤ، لەنێوان جوانی‌و مۆدێرنی‌و شێوەی دەم‌و چاو‌و قژ‌و خوێن‌و سامان‌و کۆشك‌و تەلار پایە رەچەڵەکی‌و خانەدانی‌و پلەی خوێندن و.. هەموو ئەوانە ناتوانن بڕوانامەی پێشکەوتن بە مرۆڤێك بدەن، گرنگ نیە ئەو مرۆڤە چی لەبەرە، چی دەخوا، کوڕی کێیە، کوڕی چ زەمان‌و زەمینێکە، پایەی هەیە، نیە، .. گرنگ ئەوەیە چی لە مێشکیدایە، چی لە دڵ و

دەروونی دا هەیە، یان زانستیانە تر دەری ببڕین تا چەندە لایەنی ئەخلاقی زاڵە بەسەر لایەنی دەروونی (وەك لە بابەتی ئاخی مرۆڤ باسکرا)، واتە تا چەند ئەو مرۆڤە بەرەوشت و هاریکارو بە ئەمەكو خێرمەندو پابەند بە یاساو بەرپرسیاریەتی گشتی و چەندە بە خەم بەرژەوەندی گشتیە چەندە ولاتپارێزە، راستگۆو بەبەزەیی و خۆنەویست و... تا ئەوەیە پێوەری پێشکەوتن هەم لە واقعیشدا هەم بەپێی پەیامیش، ئەوانەش هەمووی مەبادیئەکانی سەرەتای رەوشتن، واتە پێشکەوتنو پاشکەوتنی تاك بە ئەندازەی پانتای رەوشتی هەڵدەسەنگێنرێ تاخۆ ئەو گیان لەبەرە ئادەمیزادە یاخود گورگە، بۆیەش ئامانج(مقاصد)ی هەموو پێغەمبەرەکان (انما بعثت لاتم مکارم الأخلاق)..

بە هەمان شێوەش کیانە سیاسی و دەزگا و کۆمەڵگە و مەدرەسە و وڵات و سیستەمەکانیش بە هەمان پێودر هەڵدەسەنگێنرێ، ئیتر ئاشێ بڵێین هەرگیز پەیوەندی نێو دەوڵەتی پەیوەندیەکی بەرژەوەندیە.. ئەوەیان لەو سەردەمە بارە بەلام ئەوە نیشانەی رەسەنو بنچەی مرۆڤ و کۆمەڵگە نیە، کۆمەڵگەیەکی جیهانی دادگەرو یاسای نێو دەوڵەتی راستو دروست پەیدا نابێ، چاکترین نیشانەی پێشکەوتنی کۆمەڵ بە رەهبەر (مرجع)و سەرزکەکانی دەردەکەوێ چەندە مەبدەئی (سید القوم خادمهم)ی پەیرەو کردووە، کە کۆمەڵگەیەکی خۆنەویست و بە مەبادئیت پێشکەش دەکا.

ئەو بنچینەیەی پێشکەوتن لەژێر خانەکانی رەوشتو عەقلانیەت پەیوەندی بە شوێنی جوگرافیو رەچەڵەكو ئینتمای چینایەتیو نەتەوەی نیە.. بەڵکو دەکەوێتە سەر پەروەردە و پرۆسەی زانستی چاکسازی، هەر بۆیەش بەرنامەی ئیسلام (پوختەی ئاینی هەموو پێغەمبەرەکان بووە) ئاینێکی جیهانی و سەرمەشقی پێشکەوتنیشە ئەگەر بە راستەقینەی پەیڕەو بکرێت، ئاینەکانی دەستکردیش سەرمەشقی دواکەوتن (رجعیت)ە مادام کۆڵەگەکانی فیکری و سیاسی بریتیە لە فاکتەرە شاقوڵیەکان، خۆ ئەگەر هەر بپەرێتەوە بۆ فاکتەرە ئاسۆییەکان ئەوا

یەکسەر دەچێتە سەر ڕاڕەوەی میکافیلی و درۆو بێنەمەکی‌و بەرژەوەند پەرستی‌و خۆویستی، گیرفان پڕکردن و پایە ویستی..گورگایەتی وەك میکافیلی‌و هۆبز نیتشەو..وەسفیان کردووە .

لێرەدا دەگەینە ئەنجامێکی گرنگ ئەوەیە ڕەوتی مێژوویی و پێشکەوتن وەك ڕەوتی مێژووی زانیاری و زانست و فەلسەفە و تەکنەلۆجیا نیە، لەکاتێکدا ڕاستە ئەوانە سیفاتی (monotonice- أطراد)یان هەیە، واتە لەگەڵ زەمەن ساڵ بەساڵ زیاد و فراوان دەبن، ئیتر ئەو کێرڤە وەردەگری، بەڵام پێشکەوتنی کۆمەڵ و تاك بەو شێوەیە نیە، هەم لەناو نەخشەی دەروونی مرۆڤ و هەم لەسەر نەخشەی واقیعی کۆمەڵایەتیش، چونکە هەر مرۆڤێك لەگەڵ بوونی ڕەوشت و بەهاکان بە میرات و زگماکی ناهێنێ نە بەچاك و نە بە خراپ، بۆیە مەحاڵ نیە کوڕی شۆڕشگێڕێك خائین بێت، کوڕی خائینێك نیشتمان پەروەر دەرچێت، هاوسەری فیرعەون چاك و هاوسەر و کوڕی ح.نوح خراپ... هەندێ تێڕوانینی سەردەمی یۆنانیەکان ڕاستی تیابوو لەوانە لەبارەی پێشکەوتن وتویانە: کۆمەڵگە پێش دەکەوێ، بەڵام دوای وەك وەرزەکان لە (بوهار) دەچێتە هاوین و زستان و دەمرن، یان بە دەورەی گەنجی-پیری-مردن، یان قۆناغی (زێڕین)، قۆناغی زیوی، برۆنزی، ئاسن، .. تا ئێستاش ئەو بیرۆکەیە بەردەوامە و بەشێکی ڕاستە کە پێش کەوتن لەگەڵ زەمەن ڕاستەوانە نیە.. بەڵام بازنەیش نیە (وەك وەرزەکان، یان منداڵی و گەنجی و پیری مردن..).

کەواتە ڕەوتی مێژوویی کۆمەڵگەش وانیە وەك لە هێلکاریەکانی (مارکس) یان (تطوریەکان).. ئەوەیان دەشێ ڕاست بێت بۆ پێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆجیا و فەلسەفە و زانیاری، بەڵام پێشکەوتنی کۆمەڵ و تاك بە شێوەیەکی ترە وەك ئەو هێلکاریەی گوزارشت لەگەشەسەندن لەڕوانگەی ئیسلامی ومارکسی دەکا (بڕوانە نامیلکەی : هەڵبژاردن لە نێوان ئیسلام وعەلمانی -نووسەر) ، بۆیە دەشێ بڵێی کۆمەڵگەی کوردەواری پەنجاکان پێشکەوتوتر بووە لە ئێستا، یان

لادێیەك پێشکەوتووترە لە شاریەك، یان کۆمەڵگەی ئیسلامی سەرەتای (ژمارەی پێوانەییە) لە پێشکەوتن، ئەو دوا وێستگەی پێشکەوتنە لە مێژووی کۆمەڵ و دەشێش چەندجارە ببێتەوە، ناشکەوێتە سەر قۆناغی مێژوویی و ناستی زانستی، هەرچەندە کاریشی لێ دەکا، ئیتر ئەو پێوەرانەی گوایە هەردەم شاریەك لە لادێیەك پێشکەوتووترە، یان دەوڵەمەندێك لە هەژارێك، ئەورووپییەك لە ئاسیاییەك، ئاغایەك لە کرمانجێك، بەڕێوەبەر لە فەرمانبەرێك.. ئەم تەرازووانە چەوتن، ئەوە پێوەرو تەرازووی بۆرجوازی‌و لیبرال دیموکراسی‌و زۆربەی عەلمانییەتە.

هەتا ناکەوێتە سەر بڕوانامەو پلەی زانستیش، ئەوەتا چەندین خاوەن بڕوانامەو نووسەرو توێژەرەوەی باڵاو پزیشکان.. بەرژەوەندی تایبەتی بە حەوت قات خستۆتە سەر بەرژەوەندی گشتی لە رەوتی ژیانیدا.

(٣٧)

## ستراتيج سوقي strategic

ئەو زاراوە زیاتر لە کاروباری سەربازییەوە گەشەی کردووە، دوای پەڕیەوە بۆ بوارەکانی تری ئێستا لەنێو سیاسەتو دیپلۆماسیەتو پلانە ئابووریو کۆمەڵایەتیو زانستیو هەتا لە ڕێڕەوی تاکیش بەکاردێت.

لە بنەچەدا وشەیەکی یۆنانیە مانای (خطط عامة- پلانە گشتیەکان)[1]، بەڵام بە پێی (الموسوعة العربية) ئارێکە ئەسڵەکەی لە (strategos) هاتووە، دوو وشەی لێکدراوە، یەکەمیان (stratos) واتە هێزەکان، دووەم (ago) واتە سەرپەرشتی دەکەم[2]، یان خودی، بە مانای سەرپەرشتی کۆمەڵێك هێز کردنو ڕاپەڕاندنی، دوای لە سەدەی (١٩) لەلایەن (کلاوزیفتز) پێناسێکی سەربازیانەی پێدرا، بەو مانایەی ئامانجە سەرەکی و دوورەکان بپێکی، دوای هەریەکە لە (هارت، بۆفر، ماو، سۆلوفسکی..) ڕۆڵێکی گرنگیان بینی لە فراوان کردنی مانای (ستراتیجیەت) بۆ نێو سیاسەت بەهەمان مانای (نەخشەی درێژ لەپێناو هێنانەدی ئامانجی سیاسی)، ئینجا دوایی پەڕیەوە زۆربەی بوارەکانی ژیانی لە ئابووری و کۆمەڵایەتی و فێرکردن و.. هەتا دەگاتە بەرنامە شەخسیەکانیشی گرتەوە، بۆیەش کۆمەڵێك پێناسی بەخۆ وەرگرتووە، بەشێك پێیان وایە هەرچی گرنگیەك ئاسایی نەبێت ئەوا ستراتیجە، لە (موسوعة العربية) پێناسەکانی کۆکردۆتەوە، دەقەکەی بە عەرەبی تۆمار دەکەین: (علم و فن يعنيان بدراسة

---

[1] الموسوعة السياسية ج١ ل١٦٩
[2] الموسوعة العربية- مادة: ستراتيج.

طاقات وقوة المتاحة، وتوفير الخطط والوسائل لتحقيق أهداف السياسية تحقيقاً مباشرة أو غير مباشرة)، زانستيشە چونکە ئەودستێتە سەر زانیاری و وردبوونەوەو ئەزموون، هونەریشە چونکە چۆنیەتی هێنانەدی لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیایە[1]، بەشێکی تریش بە (فن القیادة- هونەری سەرکردایەتی) ناو دەبەن، یان (فن الحرب- هونەری جەنگی) یان دەڵێن (الحرب خدعة) جەوهەری ستراتیجیەتە کاتێ دەبەسترێتەوە بە تاکتیك، لەرووی سیاسیش وا رێکەوتوون کە بریتیە لە (دیاریکردنی رووکاری سەرەکی بزوتنەوەکەو ئیمکانیەتەکانی هێنانە دی ئامانج)، کە ناوی ستراتیج دێت یەکسەر (تاکتیك)یش وەك جمك لەگەڵیدا قووت دەبێتەوە، بۆیە پێناسی ستراتیج لە تاکتیك جیا نەکرایەتەوە، ئەگەر ستراتیج (فن القیادە یان فن الحرب) بێت ئەوا (تاکتیك) (فن القیادة في میدان المعرکة آنیاً) کراوە، واتە تاکتیك تەواوکاری بەش و قۆناغەکانی ستراتیجیەتە، بۆیە لە سیاسەتیش دا پێناسی تاکتیك هەروا هاتووە کە ( بەدەست هێنانی دەستکەوتێکی سیاسی ساتی لە مەیداندا)[2] هەرچەندە زۆربەی جار بەپێی ئەو پێناسانەو بەپێی واقیعی مەیدانیانەش تاکتیك لە جوغزی ستراتیج دەردەچن.. بۆیە دەبینین ستراتیجیەتی ئەو حزبەو لایەنو بەرنامانەی (بەتایبەت کە مەبدەئیش نەبێت) دەبێتە کۆمەڵە کردارێکی تاکتیکی و بەس، بەپێچەوانەی بەرنامە عەقیدەییەکان کە زۆربەی هەڵس و کەوت و مەیدانیەکانیش ستراتیجیەو تاکتیك مەودایەکی زۆری نیە، ئنجا (تاکتیك) زیاتر لەگەڵ دوژمن نەك لەگەڵ دۆستو هاوتاو هاوپەیمانو سنور بەزێنێ بۆ فریودانو هەڵخەڵەتاندنی هەموو کەس، ئەوەش دارنینی ستراتیجە لەناوەڕۆکە ئەخلاقیەکان، (تورقیة) زاراوەیەکە لە فقهی ئیسلامی لە ناوەڕۆکدا تا رادەیەك دەچێتەوە سەر (تاکتیك)، هەرچەندە لە سەرەتای (سیرة) بەکارهاتووە، بۆ هەموو سەرەتایەك و لە قۆناغەکانی بێ هێزی

[1] الموسوعة العربية.

[2] ما العولمة ؟- د.حسن حنفي، د. صادق عظم.

پێویسته، بۆیه له دواییدا لەلایەن (رارەوی شیعه)و بەشێکی زۆری ئیمامەکانی رارەوی سوننەش رێی پێداوه له بارودۆخی خۆیدا، هەروەك ئێستاش زیاتر له هەموان (بزوتنەوەی برایان) بەکاری دەهێنن.. ئەوەی کێشەی لەسەره زیاتر ناخۆ چەندە دروستەو دەشێ لەگەڵ هاورێو لایەنە ئیسلامیەکانی تر بەکاری بهێنن؟ چەندە دروستە بۆ فریودانو هەڵخەڵەتاندن بەکاری بهێنی؟.

لەو سەردەمەدا مەبەست لە ستراتیجیش هەمور ئەو نەخشە درێژخایەنانەیە کە دادەرێژرێ بە بەرنامەو پرۆژەیەك بۆ ئامانجێکی دوور یان چەند ئامانجێك.

هەڵبەتە (تاکتیك)یش لە باری دروستی خۆی مانای ئەو هەنگاوە دەمو دەستانەیە کە لە خزمەتی ستراتیجە، زیاتر ئەو هەنگاوانەش دەگرێتەوە کە لە رووکەش ئاسایی نینو تەواو ناگونجێن لەگەڵ سروشتی بەرنامەکە یان هەتا بەرنامە ستراتیجیەکەش بەڵام لە بنچینەو دیوی ناوەوەدا خزمەتی پرۆژەو ستراتیجیەکە دەکا، ئێستا کەمتر ئیشوکارێك ماوە بێ پلانو بەرنامەو ستراتیجیەت بە تایبەتی لە عەولەمەدا، چونکە بۆ هەر هەنگاوێك، بۆ هەر بەرنامەر پلانێك بەدەیان پلانو هەنگاوی دژ پەیدا دەبێت، مادام ئیشو کارەکانی بەشەریەت زیاتر تێك دەچرژێو بەرژەوەندیەکان راستەوخۆترو بە پانتاییەکی فراوانتر تێك دەگیرێن، بۆیە لەگەڵ ئەو فرەییە، فرە ستراتیج پەیدادەبێ لە هەرە چاكو هەرە خراپ، سەلبیو ئیجابی..، جا ستراتیجی زانستی بریتیە لەم هەنگاوانە:

١- دۆزینەوەی سەرچاوەکانی دروستکەری رووداو واقیعی هەنووکەیی.

٢- دۆزینەوەی جۆری پەیوەندیە دیارو نادیارەکانی ئەو سەرچاوانە.

٣- دۆزینەوەی رووکارو مەوداو ئیمکانیەتو فاکتەری هەرە کاریگەر لێیان.

٤- نەخشەو پلان دارشتن بە پێی ئەو دۆزینەوانە بەهۆی یاسای (علة ومعلول) تا بتوانی دەستکاری هۆیەکانی (علل) بکەی بۆ هێنانە دی ئامانجە ویستراوەکان، دەبێتە هۆی کۆنترۆڵکردنی رووداوەکانو وەرچەرخاندنی لە قازانجی

بەرنامە ستراتیجیەکە، بەو شێوەیە کارێکی پسپۆڕیە نەك عەوامی.. بۆیەش سەرکردەیەکی خاوەن ستراتیجی هەنگاوەکانی هەردەم ئەو نیشانانەی هەیە:

١- قووڵە نەك سەر چیخە.

٢- بابەتیە نەك تەنیا خودی.

٣- ئەنجامەکانی ئەو هەنگاوە تەواو هەڵسەنگێنراوەو ناکاوی تیا نابێ.

٤- هەنگاوەکە هەمەلایەنی لێك دراوەتەوە نەك لەسەر یەك لا بیناکرابێت.

٥- دووربینی تیایە نەك هەنوکەییانە.

ئەو نیشانانە یەکە یەکە لەگەڵ هەنگاوەکانی (سیرة) تەواو جووت دەبێت، هەروەها لەگەڵ زۆربەی سەرکردە دانا و زاناکان کە توانیویانە واقیعی جیهان‌و ناوچەکەیان بگۆڕن، هەر لەو سەردەمەش ستراتیج دەورێکی گرنگی هەیە لە هەموو بوارەکان بۆ وەرگێڕانی رووداوە سەلبی‌و نیمچە سەلبی‌و قەدەری نادیار بۆ ژێر کۆنترۆڵ، بۆ مسۆگەرکردنی چارەنووسێکی دیار، ستراتیجیەتێکی راست‌و دروست هەردەم دەتکاتە خاوەن بەرنامەو پرۆژەی هەمەلایەن و ئەو بەرهەمانەی دەبێت:-

١- بەهۆی ئەو ستراتیجیەتە سوود لە هەموو دیاردە و رووداوەکان وەردەگیری، هەتا سەلبیش بێت ، لای سەلبیاتەکەی ڕوو لە دەربکرێت‌و لای ئیجابیەکەش بۆ ناوەوە.

٢- هەردەم دەزگاو (تشکیلەکان) مونەسەساتی و رێك و پێك دەبێت.

٣- لەپێش ڕووداو دەبێ نەك لە دوای.

٤- ئەو جۆرە بەرنامەو پرۆژانە لە باری ئاسایی‌و نائاسایی، یاسایی‌و نایاسایی، زانستی‌و نەفامی، مەدەنی‌و سەربازی، شەڕو ئاشتی... کاری خۆیان ئەنجام بدەن.

٥- ئەگەر هەڵوێست هەنگاوەکانیشیان لە زەمان‌و زەمیندا لێك جیا بن ئەوا لە ماهیەتدا هاوبەشە.

٦- دیاردەکانی پەشیمان بوونەوە، رەمەکی، عەبەسیەت، ناکاوی، دووبەرەکی، ناکۆکی نێوان کردەو گوفتە، نێوان بنکەو سەرکردە، نێوان ئێستاو داهاتوو، هەنگاوی بێ ئەنجام کەمتر لەو فەرهەنگە جێگەی دەبێتەوە.

٧- لە هەر پرۆژەیەکی ستراجیداردا بەشەکانی سەروو خواروو، لە دەرەوەو لە ناوەوە، رەسمی و نارەسمی.. بێئەوەی ئاگاداری یەکیش بن هەڵوێستەکانیان جووت دەبێت نەك هەر لەسەر رووداوو کێشەکانی رابوردوو، هەڵوێستە سەرەکیەکانی فیکری و فەلسەفی و کۆمەڵایەتی و سیاسی.. هەتا لە رووداوە نوێکانیش.

٨- جم و جۆڵ و چالاکیە جیاجیاکانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و میللی و یاسایی و نایاسایی و هونەری و رەوشەنبیری و وەرزش.. لە کۆتاییدا هەمووی دەرژێتە ناو یەك دەریاچەی ئەو ستراتیجیەتە.

٩- دەتوانرێ لەژێر ناونیشانی جیاجیا ئەو ئامانجانە بهێنرێتە دی.

١٠- هەردەم پرۆژەکە تێرو تەسەل و ستاندەر دەبێ، رەگی قووڵ دەبێتەوە بۆ کۆمەڵایەتی و سیاسی و فیکری و رای گشتی و نیشتمانی و مێژوویی.. هەردەم فرە کارتت لە دەست دەبێت، فرە رێگەو بوارت لەبەردەم دەبێت، زۆربەی دەرگاکانت بۆ والا دەبێتەوە، هەتا لەژێر دەسەڵاتە دیکتاتۆریەکانیش هەموو رێگە و کارتەکانت لە دەست نابێتەوە، هەردەم خاوەن بەدیلو هاوتا دەبێ، بەکورتی لە ئیجابیاتی هیچ رووداو و دیاردەو گەلاڵەیەك بێبەشی نابێ، تاکە سەرچاوەیەك داینەمۆت نابێ تا دوژمن بە ئاسانی وشکی بکا.. هەردەم خاوەن فرەسەرچاوەی..

ستراتیج لە مەدرەسەکانی عەلمانیدا کەمتر مەبەستی خزمەتی مرۆڤایەتی دەبێ، مەبەستەکە لە کۆتاییدا مادی ئابوورییە، لە فیکری ئیسلامیدا ستراتیژیەت بۆ هەموو لایەن دادەرێژرێ و هەموو بوارەکانی ژیان دەگرێتەوە، بەڵام (بیت القصید) بەرز نیە، مەبەست تیایدا خزمەتی مرۆڤە، هەرچەند لە فیکری ئیسلامیدا ئامرازو ئامانج بێ مرۆڤ نیە ئەپەسندیشە، بۆیەش لە هەموان گرنگۆ

ستراتيجيەتی: دروست کردن و بینای کۆمەڵایەتی و مرۆڤە کە لە مەدرەسەکانی عەلمانی ئەو لایەنە گرنگ و ناوەندی نیە، ئیتر بەشی هەرەزۆری بەرنامە و ستراتیجیەتی ئیسلام بۆ ئێستاو داهاتووە نەك بۆ رابوردوو،بە پێچەوانەی پۆلێکی فراوان لە رۆژهەڵاتناسی (مستشرق)ەکانو هەندێ نووسەر باڵای خۆشان کە وەسفی ئایین دەکەن وای دەناسنەوە گوایە ئایین لەگەڵ عەلمانیەت لەو رووەدا بەوە لێك جیادەکرێتەوە کە ئایین گرنگی بەرابوردوو دەداو عەلمانیەتیش بە داهاتوو و چارەنووس.. ئەوەیان بوختانە، راستیەکەی ئەوەیە عەلمانیەت گرنگی زیاتر بە (ئەو ساتە) دەدات، بەڵام ئایینی ئیسلام زیاتر بە چارەنوس، نەك تەنیا (رۆژی دوایی) چارەنووس مرۆڤ لەسەر ئەو زەویە، واتە جگە لە (بڕوا) و (رۆژی دوایی).. ئەوا بەرنامە کۆمەلایەتیو سیاسیو ئابووریەکانیشی هێزێکی ئیمچە سەربەخۆن بۆ لەباوەش گرتنی کۆمەڵو دادگەریو خۆشگوزەرانیو پێشکەوتن.

( ٣٨ )

# پاكتاوى رەگەزى- (تەعريب و تەتريك) تطهير العرقي Ethnic Cleansing

لێرەدا هەردوو چەمكى (تەعريب)و (تەتريك) تايبەتن لە بابەتەكەمان، بەلام ئەو دووەش بەشێكن لە چەمكێكى فراوانتر كە پێى دەڵێن (پاكتاوى رەگەزى)، ئەو دياردەيە نوێيە لەگەڵ سەرەنجامەكانى بيرى نەتەوەيى و هەڵمەتە ئيمپرياليزمى و داگيركارى سەرى هەڵداوە، بۆيە دەبينين ئەو چەمكە كەمتر لە فەرهەنگە كۆنەكان تۆماركراون، هەتا لە (دائرة المعارف العالمية)، (موسوعة العالمية).. نەبووەو نيە، مەبەست لە پاكتاوى رەگەزى ئەو پرۆسەيە كە دەسەلاتى رەسمى هەڵدەستێ بە گۆڕينى ديوگرافى ناوچەيەك، واتە نەخشەى دابەش بوونى رەنگەكان دەگۆڕێ، بەهۆى گواستنەوەى (بەخۆشى يان ناخۆشى) خەلكێكى جيا لە رەچەڵەكى دەسەلاتدارو لەجياتى خەلكێكى تر دەهێننە جێيان كە لەو رەچەڵەكە بن، لە كوردستان ئەو پرۆسەيە لەو سەردەمە بە (تەعريب) ناوبانگى دەركردووە، (تەتريك- بە تورك كردن) كەمتر بۆتەوە.

ئەو دياردەيە هاوكاتە لەگەڵ ئەو هەنگاوانە:

١-پەيدابوونى سيستەمى ئيمپرياليزمى.

٢- پەيدابوونى بيرى نەتەوەيى و عەلمانى.

٣- لەدواى سيستەمى ئيمپراتۆريەت بەگشتى و لە ناوچەكەو كوردستانيش لەدواى لاوازى و دارمانى خەلافەتى عوسمانى سەرى هەڵدا، بەپێى (موسوعة السياسية) دياردەى (پاكتاوى رەگەزى) يەكەم جار لەلايەن نەتەودگەريە عەلمانيە

تورکەکان(کە بە تۆرانی ناوی بردووە) ئەنجام دراوە لە دژی نەتەوەی غەیرە تورکی وەك ئەرمەن و عەرەب و کوردو چەرکەس...، وردتر لەلایەن (توماس بوا) پرۆسـەی (بەتورك کردنی) دژ بە کورد یەکەجار لەسەر دەستی (انور پاشا) گەورە بەرپرسـی حزبی (اتحاد والترقی- عەلمانی نەتەوەیی) کراوە[١]، ئەنوەر پاشاو (ئیتحادیەکان) لەکۆتایی سەدەی (١٩) دام و دەزگایان لەناو خەلافەت دروست کردبـوو هـەر لـەو کاتیەوە بناغەی ئەو دیاردە نوێو سـەلبیانەی: دەمـارگیری نەتـەوەیی، پاکتـاوی رەگەزی، جیاوازی نەتەوەیی، دووبەرەکی، ... دروست ببوو، ئەوە مانای ئەوە نیە پاکانە بۆ دام و دەزگای هەندێ لە خەلیفەو سوڵتانەکان بکرێ، نەخێر، بەڵام مانای ئەوەیە خراپەو چاکەی ئەو خەلیفانە شێوازی نەتەوەگەری نەبووە، بۆیە ئەو شێوازە لەگەڵ سەرهەڵدانی تەیاری عەلمانی نەتەوەگەری کە لە کۆتای سەدەی (١٩) لەناو خەلافەت خۆیان دەمامـك دابـوو، بەتایبـەتی ئـەو (٣) سـەرکردەیەی (ئیتحـاد الترقی- انورپاشا، طلعت پاشا، جمـال پاشـا) هەریەکـە وەزارەتـەکانی (نـاوەخۆ، جەنگ، دەرەوە) یان لەدەست بووە، نیتر کاریگەریان زۆر بوو لەسەر دروستکردنی رووداوەکانی لە جۆری پاکتاوی رەگـەزی لـەدژی ئەرمـەن دوایـش کـورد، چـونکە ئەوانە زیاتر کاربەدەست بوینە بۆیـە نـاوی ئـەو ولاتـە لـە کتێبـەکانی ئـەوروپی بەناوی (ولاتی ئەنوەر) ناسرابوو.

**بنەچـەکـەی**: هەڵبەتە سەرچاوەی ئەو دیاردە بە شەپۆل لای رۆژئـاوا لەگـەڵ بیری عەلمانیەت و نەتەوەگەری سەری هەڵـداوەو هاتۆتـە ناوچـەکەش، پاڵنـەرێکی سیاسی و نابووری و کۆمەڵایەتی ناڵۆزی لەگـەڵ بـووە، هـەروەك لەگـەڵ نەتـەوەو خەلکی هەردوو ئەمریکاو ئوستراليا کراوە، کە نەتەوە رەسەنەکانیان ئەوانەن: لـە بەرازیل (گوارنا، توپنابا)، کۆلۆمبیـا (ئشیبـشا)، پـاراگوای (گـواران)، بۆلیڤیـا (أبهارا)، پیرۆ (انکا، کیشوا)، هندۆراس (مایا)[٢]، ئوسـتراليا (پورجـوان).. کـە

---

[١] بۆ زیاتر سەرنج بدە: تأريخ الأكراد- تۆماس بوا ص١٩٥

[٢] بۆ زیاتر سەرنج بدە الموسوعة العالمية

ئیستا خەریکە ناویان هەر بزر بێت، لە ئەمریکا هندیە سورەکان کەمتر لە ٩٪ی دانیشتوان پێك دێنن. هەروەها لە ئیرلەندای سەرووش (گالی)زمانەکانی ئیرلەندای رەسەن مەزهەبیشیان (کاسۆلیکە) مەزهەبی ئینگلیز (پرۆتستان)ە دووچاری پرۆسەی پاکتاوی رەگەزی بە ئینگلیزکردن بوونەوە،و ئێستا بوونەتە کەمایەتی بەهۆی ئەو پاکتاوی رەگەزیە.

لە هەموو نموونەیەك نزیكتر زەقتر بە فەرەنسی کردنی سەرووی ئەفریقا بوو تا ئەو ساتەش ئاسەواری ماوە، ئیتر لە ئەفریقاو جیهان زۆر نەتەوە هەیە بە زمانو ئەریتو واقیعەوە تراونەوە بەهۆی ئەو پاکتاوە رەگەزیە کە ئێستا زۆربەشیان ئەندامن لە رێکخراوی فرانکۆ فۆنیە، چونکە ئەو پاکتاوە هەر قەتیس نەما لە گۆڕینی دیموگرافی ناوچە، بەڵکو بۆ تەواوکردنی ئەو پرۆسەیە هەڵمەتی پێشینەی (غزو الثقافي)، پاکتاوی زمانەوانی، کەلتوری، مێژوویی، مەزهەبی، ئاینی، رەچەڵەکی، نەژادی، .. زۆر لای تریش دەگرتەوە.

لە هیندستانیش گەورەترین لێك جیابوونەوە بەهۆی ئەو پاکتاوە رەگەزیە دروست بوو لەساڵانی ١٩٤٧ ئاڵوگۆڕێکی دەگمەن روویدا، موسڵمانەکان بۆ پاکستانو هندۆسەکانیش بۆ هیند، هەتا سیکەو بوزیشی گرتەوە، وەك شێوازێکی مەزهەبی، ئەو شێوازە کۆن ترینیانە هەتا لە مێژووی وڵاتانی ئیسلامیش.

لە خوارووی ئەفریقا ئەو جۆرە سیاسەتە تا کۆتایی جەنگی ساردیش هەر بەردەوام بوو، شێوازی نەژادی وەرگرتبوو، سپی پێستەکان لەدژی رەش پێستەکان کە بە رژێمی ئاپارتاید بەناوبانگ بوو، لە فەلەستینیش شێوەی ئاینی وەرگرتبوو. لەدوای هەڵوەشانەوەی شیوعیەتو گەڕانەوەو زیندووبوونەوەی فاکتەرە شاقوڵیەکانی نەتەوەگەری دیسان پاکتاوی رەگەزی بە چەندین ئاڕستەی ئاینی (لەگەڵ موسڵمانەکان)، مەزهەبی (لەگەڵ کرواتیە مەسیحیەکانی کاسۆلیك)، نەتەوەگەری (لەگەڵ رەچەڵەك ئەلبانی لە کۆسۆڤا).. هەموی لەلایەن سربەکان کرا..

لەدواى سەدەى ١٩ هەر بە گەیشتنى بیرى عەلمانیەتو نەتەوەگەرى بۆ سەر دەسەڵات ئەو دیاردەیە رووى لە كورد كردووە، شێوازى وا لە كۆن هەبووە لەسەر بنچینەى مەزهەبىو ئاینىو چینایەتى بە تایبەتى لەلایەن رۆم، بەڵام بەو ماناو مەبەستو ماهیەتە نەبووە، لە كوردستان هەرگیز راگواستن بەو شێوازەش نەبووە، كە جارجار بە یەكێ لەو سێ دۆخو هۆیانە روویان دەدا:

١- كاتێ سەرەك خێڵێك لەناوچەیەك لە دەسەڵاتى (ئیمبراتۆر یاخود فەرمانڕەواى ناوچەكە) یاخى دەبوو دەگەیشتە دەربەدەركرانو بەرەو ناوچەكى تر بە كۆڕەو.

٢- یان لەسەر سنورى نێوان دوو ئیمبراتۆریەت یان دەسەڵاتى دەڤەرى هەست كراوە هەندێ خێڵ پەیوەندى بە ئیمبراتۆرەكەى تر كردووە راگوێزراوەتەوە.

٣- پاڵنەرێكى گرنگ تریش هەیە جار وایە (ئیمبراتۆر) چەند ناوچەیەكى گرنگى بەچەند خێڵێكى بە برشت دەسپارد بۆ پارێزگارى لە هێرشى دەرەوەو ئیتر لە شوێنى خۆیان بەكۆ دەچوونە ناوچەكە بۆ بەرگرىو جێنشین دەبوون، ئەو دۆخەى دواى لەمێژوودا بەرچاو كەوتووە لەگەڵ خێڵەكوردیەكان كراوە، بەلام لە هیچ دۆخێكیان دا گۆڕینى دیموگرافى نەبووە، هەروەك محمدأمین زكى بەگ لە كتێبى (كوردو كوردستان) ل٤٣ هەندێ نمونەى نەقڵ كردووە وەك خۆى دەینوسینەوە: ((شاعەباس گەورە بۆ محافظە كردنى حدودى شمال شرقى ئیران بەرامبەر توركمان بعض عشائیرى كوردى لە شمال غربى ئیرانەوە نقل كردوە خوراسان وەك (شاهدار، زافرانلو، كیوانلو، امانلو..).. ئەوەش جێگەى شانازىو پیاوەتى ئەو عەشیرەتانە بووە)).

هەرچى دیاردەى (بەتورك كردنو بە عەرەب كردن)ە ئەوا لەدواى سەدەى بیستەم لە هەموو لایەك لەگەڵ كورد كراوە، لە یەكێتى سۆڤیەتیش بە تایبەتى لە سەردەمى (ستالین) بە سیاسەتى توانەوەش، بەڵام لە قۆناغى نوێدا لەدواى ساڵى ١٩٥٨ز وگەیشتنى بیرى نەتەوەگەرى عەلمانى (عروب)ى بە دەسەڵاتەوە بۆ

عێراق زیاترو ڕاستەوخۆتر ئەو سیاسەتە پەیڕەو كراوە، لەلای ئێران كەمتر ئەو جۆرە سیاسەتە پەیڕەود كراوە، تایبەتمەندیەك هەیە لەو لایە نەك هەر لە سەردەمی (شۆڕشی ئێرانی دوای ١٩٧٩) بەڵكو لە زەمانی (شا)ش ئەو بیرە نەتەوەییە كەم تر ئەو تەفاعولەی كردووە لەگەڵ میللەتانی ڕۆژهەڵات، زیاتر بیری مەزهەبی زەق تر بووە بەسەر نەتەوەیی، بۆیە دەكرێ‌و دەشێ سیاسەتی مەزهەبی‌و پاكتاوی مەزهەبی لێرەو لەوێ بووبێ، بەڵام (بەفارسی كردنی كورد) وەك زاراوەش دەگمەنە، لەكاتێكا ئەو شەپۆلە هەمە لایەنەی پاكتاوی ڕەگەزی لە دژی كورد كە لایەنەكانی زمانەوانی، كەلتوری، مێژوویی، كۆمەڵایەتی، ئابوری، جوگرافی‌و مێژوویی‌و زانستیشی گرتبۆوە ئەوەندە بە گوڕو تین بووە تا ئێستاش كە (١٦) ساڵە لەدوای ڕاپەڕین‌و دروست كردنی حكومەتی خۆی كەچی دیاردەی تاوانەوەی نەتەوەی كورد لە پرۆسەیەكی ئاڵۆز لەناو جەرگەی كوردستان‌و دەوروبەری هەر بەردەوامە (بەتایبەتی كە بەرنامەی بیناكردنەوەی مرۆڤ لەلایەن حكومەت وحزبە كوردستانیەكان ڕەچاو ناكرێ)، لەو (٣) ڕەوەرە:

١- بەدرێژایی سنوری بەیەك گەیشتنی نێوان كوردو عەرەب لە خوارەوە.

٢- لەناو هەولێر لەگەڵ توركمان بوون.

٣- هەڵوەشانەوەی ئینتمای نەتەوەیی مەسیحیەكان بەرەو ئاینی‌و كەلتوری ڕۆژئاوایی.. سەرەڕای كۆچ‌و هەڵوەشانەوەی تری ئینتماكانی نیشتمانی‌و نەتەوەیی.

ئەو مێژووەی بۆ پاكتاوی ڕەگەزی نەتەوەی كورد (یان هەر بە گشتی) دانراوە كە دەیگێڕنەوە بۆ قوڵایی مێژوو هەروەك گێڕانەوە مێژوویی سیاسی‌و مەینەتی كورد بۆ قوڵایی مێژوو.. هەردووكیان چەوتە، هەڵبەتە چەوسانەوە هەبود، ئەوەی دەڵێین نەبووە چەوسانەوەی نەتەوەییە، هەر بۆیەش لەسەردەمی خەلافەتدا ڕەنگە بنەماڵەی سەردەست‌و بن دەست هەبووبێت، بەڵام هەرگیز نەتەوەی سەردەست‌و بن دەست نەبووە، بەهەمان شێوەش سیاسەتی (تەتریك- بەتورك كردن) نەبووە،

ئەسڵەن تورك ئەوەندە دەسەڵاتدار نەبووینەو ئیمتیازی زیادی نەبوە ئەگەر کەمتریش نەبووبێت، بۆیە ناوی (تورك) زیاتر هاوتای (أعرابي) بووە [١]، هەتا لە کوردستانیش ناوی سەربازی عوسمانلی بە تورك نەهاتووە لەبارە هەرە خراپەکانیش لە کوردستان ناویان بە (جل خوارەکان) یان (گورگەبۆرەکان)[٢] ناوو نازناوی هیچ خەلیفەوسەرکردەیەك بە تورك نەهاتووە، (د. قوتیبە شەهابی) فەرهەنگێکی دەگمەنی لەناو نازناوی خەلیفەو پادشاو سوڵتانو والیەکانی مێژووی ئیسلام کۆکردۆتەوە بەناوی (معجم ألقاب أرباب السلطان في الدول الإسلامية من عصر الراشدي حتى بدايات القرن العشرين).. لەو (معجم)ەدا تەنیا نازناوێکی نەتەوەگەری یان رەچەڵەکی تیا نیە وەك شانازی بە عەرەبایەتی یان بە تورکایەتی یان بە کوردایەتیو فارسایەتی.. کرابێ، تەقەلایەکی تریش لەو شێوە لە لایەن (ساطع حصري) کراوە، ئەندامانی پەرلەمانی (مەبعووسان) نوێنەری نەتەوەو ویلایەتەکەیان نەدەکرد بەڵکو هەریەکە بەپێی مادەی (٧١)لە دەستووری عوسمانی (مەشرووتیەی یەکەم) نوێنەرایەتی هەموو میللەتی عوسمانی دەکرد، تەنانەت لە دەزگای رەگەزنامەی عوسمانلیەکان ناوی نەتەوەیی تۆمار نەدەکرا، یەکەمجار هێمای (ع)* لەبەرامبەر ئەفسەرە عەرەبەکان دانرا لەسەردەمی ئیتحاد والترقي بوو لەدوای ١٩٠٩، بۆیە خەلافەتی ئیسلامی لەو دیاردەو تاوانانە بەرپرس نیە، بەپێچەوانە هەر لەگەڵ نەمانی دەسەڵاتی خەلافەتو سەرهەڵدانی فیکری عەلمانیەتو نەتەوەگەری پەیدا بووە، هەر بۆیەش دەبینین نەخشەی کوردستانی ئێستا بەهۆی پرۆسەی پاکتاوی رەگەزی ناوا بچووك بوویتەوە، نمونەخشەیەی لایەنی کوردی بڵاوی دەکاتەوە ئەو نەخشەیە لە سەردەمی خەلافەت بووە.

---

[١] بۆ زیاتر سەرنج بدە (ساطع حصري- محاضرات في نشوء القديمة).

[٢] بۆ زیاتر بڕوانە: (یاداشتەکانی- رفیق حلمی).

* واتە عەرەب، گوایە ئەو ئەفسەرانە گومانی ئەوەیان لێدەکرا کە پەیوەندیان بە سوپای هاوپەیمانان هەبێ لە جەنگی جیهانی یەکەم

نەخشەی کوردستان لە سەردەمی خەلافەت لە چەندین سەرچاوە هەیە، بۆمان دەستنیشان دەکەن وەك سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی (لە سەدەی ١٧)، گەڕیدەکانی ئیبن بەتووتە، معجم البلدانی یاقووت حەمەوی، (شەرەفنامە) کە لە سەدەی (١٥٤٣-١٦٠٣)، لە کتێبی (کوردو کورستان- ئەمین زەکی بەگ-سەدەی بیستەم)، لە ڕێکەوتنامەی سیڤەری ١٩٢٠ بەندی (٦٢) بەشەکانی سەروور خواروو دیاری دەکات، هەروەها لیژنەی (تحکیمی موصل) کە لە ١٣/١٠/١٩٢٤ دروست ببو پێکهاتبور لە (ڤۆنت نیکلی، موسیو برست، کولومل پولس) ڕاپۆرتەکەیان لە ١٦/٧/١٩٢٥دا (عصبة الأمم) تیایدا هاتووە: ناو موصلیس کوردی زیاتر بووە بە ڕێژەی ٨\٥ یان بە پێی هەندێ سەرچاوەی تر ٨\٧، لە هەولێر ڕێژەی تورکمان ١,٥٪ هەرچەندە لە سەرانسەری (سەرژمێریەکە) کوردێکی زۆر ناونووسی نەکرابوون لە ترسی سەربازی کردن.[1]

ئنجا بەڵگەنامەکانی تری مێژوویی، لەوانە ئیبن خلدوون (جبل حمرین)ی ئێستای کە زیاتر لە ١٠٠کم لە کوردستان دوورکەوتۆتەوە بە (جبل الأکراد) ناوبردووە، هەروەها زۆر لەناوی شاخەکانی.. هەتا لە لبنان لە نزیك (مرجعیون) (جبل الأکراد)و زۆر ناوی تری کوردی لێ هەیە، لە میسریش زۆر لەناو ئیداری و سەربازیو کوردین..، لە نەخشە کۆنەکانی ئیسلامی (ئیدریسی) (مسعودی) (ئەلبیرۆنی) (ئستخاری)[2].. ناوو خاکی کوردستانی لێ تۆمار کراوە لەبەر گەورەیی، زۆر سەرچاوەی تر لەبەر بەهێزی شەخسیەتی کورد بەدرێژایی خەلافەت وا هەستیان کردووە کە میللەتانی تری عەرەبو تورکو تورکمان و ئاشوریو کلدانیو کەمایەتی تر تواوەتەوە، لەوانە (تۆماس بوا) دەڵێ: تا سەرەتای

---

١ بە درێژی لە (کوردو کوردستان) ئەمین زەکی بەگ بخوێنەوە.

٢ بۆ زیاتر سەرنج بدە: نەخشەکانی نموانە لە (العراق في الخوارط القدیة )، هەروەها بروانە: (أطلس حضارة الإسلامیة).

٤- نەتەوە لە باشترین بنـچینەی زمـانو خـاكو میـژووو رەچـەڵەك دروسـت دەبێت، کەچی ئومە لەسـەر بنچینەی عەقیدە دروسـت دەبێـت بـێ پێویـستی بـە پرۆسـەی میژوویی هاوبەش لە خاكو میژوو و زمان..

٥- نەتەوەیی ـلەو سەردەمە ـزیاتر بەرهـەمی سـایکس ـپیکـۆی ١٩١٦و پرۆژەکەی ئیمپریـالیزمو سـیکۆلاریش بـەرپێوەی دەبـات، ئومـەتیش پرۆژەیـەکی ئیسلامیە، بزوتنەوە ئیسلامیەکان بەرپێوەی دەبەن .

٦- فراوانترین سنوری ئیمکانیاتی نەتەوە سنوری نەتەوەکەیە، کەچی سـنوری ئیمکانیـەتی ئومـە هـەموو مرۆڤـی سـەر زەویـە بـە نەتـەوەو نـەژادو رەگـەزی جیاجیاشـەوە، بۆیە لە (ئومە) مانای کەمایەتیو (ئثنی)و زۆرایەتیو.. نامێنێ.

٧- ئەو دەوڵەتەی لەسـەر بنـچینەی نەتـەوە دروسـت دەبـێ، سـنوورداره لـە هەموو لایەك بە تایـەتی لە رووی جوگرافیـەوە کەچی دەوڵەتی ئومە جیهانیە.

٨- نەتەوە ئینتمایەکی کۆمەڵایەتیە، ئومە ئینتمایـەکی سیاسـیە، واتـە لـە یەکەمدا تەنها ئینتمایە، لە دووەمدا ئینتماو وەلایە، لـە یەکەمـدا چـالاکی وەلا دەبتە رەگەزپەرستی، لە دووەم دەبتە مرۆڤایەتی.

| ئومـــە | نەتـــەوە |
|---|---|
| ١- ئینتمایەکی ستوونیە. | ١- ئینتمایەکی ئاسۆییە. |
| ٢- میراتە. | ٢- وەرگیراوە. |
| ٣- جیهانیو بێ سنورە. | ٣- دەڤەریو سنوردارە. |
| ٤- ئایدیۆلۆجیە. | ٤- بایۆلۆجیە. |
| ٥- فرە زمانی. | ٥- تاك زمانی. |

## (٤١)

## بیری نەتەوەیی فكر القومي nationalism

لە وەرگێرانی ئەو كۆمەڵە زاراوانەی وەك: نەتەوە، نەتەوایەتی، بیری نەتەوایەتی، ئایدیۆلۆژیای نەتەوایەتی.. لە بەرامبەرەكەیان بە ئینگلیزی یان لە لاتینیە رەسەنەكەی هەندێ گرفتی زمانەوانی رووبەڕوو دەبێتەوە، لە راستیدا نەتەوەو نەتەوایەتی، نەتەوایەتی‌و بیری نەتەوایەتی، .. هەتا لەگەڵ ئایدیۆلۆژیای نەتەوایەتیش لێك جیان، (نەتەوە) بە كۆمەڵە خەڵكێكی هاوزمان دەوترێ، تەنها چەمكێكی كۆمەڵایەتیە نەك سیاسی، نەتەوایەتی دەبێتە چەمكێكی سیاسی، بەمانای كۆبونەوەو وەلاء، لە زمان تێ دەپەڕێ بۆ داڕشتنی بنچینەی زیاتری وەك، مێژوو، خاك، بەرژەوەندی باڵا، .. (بەپێی هەندێ سەرچاوە ئاین‌و دەروون‌و كەلتوریش، ..) نەتەوەگەریە،نەتەوەپەرومریش ئەو كەسانەن كە ئەو ئەركە سیاسیە دەخەنە ئەستۆی خۆیان، هەرچی بیری نەتەوەییە.. زیاتر لەوانە قووڵ دەبێتەوە، لەباشترین دۆخیدا بریتیە لەو بیرو بەرنامەیەی كە دەیەوێ جم‌و جۆڵی سیاسی‌و جیهانبینیەكەی بە تەرازووی بەرژەوەندی نەتەوەیی بۆ مرۆڤایەتی داڕێژێ ودەگەڕێتەوە سەر بنەمای (انصر أخاك ظالما أو مظلوما)، هەر چەندە خاوەنانی ئەو بیرە ویستویانە وەسفی بە : بیری مرۆڤایەتی، بیری سەردەم، بیری رەسەن، .. بكەن، بەڵام لەبەرامبەریشدا وەسفی بەبیری رەگەزپەرستی‌و تەسكو نەژادی و.. كراوە، هەروەك لە پێناسەكەی سەرووش وشەی (دەیەوێ)ی تیادایە، واتە شایەنی پەیڕەوكردن نیە بە ئاسایی، بۆیە زۆربەی زاناو ئەنترۆپۆلۆجی‌و

سیاسەتمەدارانیش بە بیرێکی نوقستان بگرە هەر (نەتەوایەتی) بە ئایدیۆلۆجیاش نازانن، جگە لە لێکدانەوەی زیادەڕەو..

لە راستیشدا یەکێ لە سروشتەکانی مێژووی مرۆڤایەتی بە زانستیو سیاسیشەوە ئەوە بووە لەگەڵ دۆزینەوەو پەیدابوونی دیاردەیەکی نوێ، شەپۆلێکی هەلچوون لە لایەن کۆمەڵێك لە رەوشەنبیرو جیهان بینو سیاسەتمەدار دروست دەکا لە رادەی خۆی تێ دەپەڕێ، هەروەك دەبینین لە مەسەلەی نەتەوایەتیش، کە دیاردەیەکی ئاسایی گەشەی مێژووە (لە غیابی ئاینی راستەقینە)، ئیتر ئینتمای نەتەوایەتی ئاساییە، تاوان نیە، بەڵام کاتێ ئەو ئینتمایەو ئەو بەهاو رەوشتو نەریتو فەرهەنگو کەلتوری سەروەری نەتەوەیەك بەسەلبیاتو ئیجابیاتەوە، بە کۆنو نوێ یەوە، بە ستەمو ناهەقیەکەیەوەش.. ئاوێتە بکەیت بۆ بەرنامەیەکی سیاسی، بیکەیتە رێ نیشاندەرێك، تەرازوویەك، .. نەتەوەی ترو مرۆڤی تر پێ هەڵسەنگێنی..و جیهانی پێ ببینی بەو روانگەیەوە.. ئەوەیان بیری نەتەوەییە، کە دیاردەکانی شۆڤینی، رەگەز پەرستی، فاشی، نازی، تۆرانی، جەنگە جیهانیەکان، دیکتاتۆریەکان، .. تەعریب، تەتریكو پاکتاوی رەگەزی، .. هەتا بەشێکیش لە ئیمپریالیزمیو دەکەوێتە ئەستۆی ئەو بیرە، بە کێشەو مەینەتی کوردیشەوە چ فاکتەرە دەرەکیەکانی داگیرکاری چ فاکتەرە ناوەکیەکانی هۆی رزگارنەبوونی، بۆیە ئەو بیرە ئەگەر چی لە سەرەتادا لایەنێکی لە کاردانەوەو مەبەستی رزگاری بووە وەك ئێستا ئەو دەوڵەتە نەتەوەییانەی پێ دروست بووە، هەر خێرا بووە هۆی جۆرە داگیرکردنێکی (ناسۆی)تر، نەتەوەی سەردەستو بن دەست، ستەمی نەتەوەیی.. لێ دروست بوو لە بەرامبەریشدا بزوتنەوەی رزگاری نیشتمانی لێ پەیدا بووە، گەلێ جار ناوی –ئیمپریالیزمی نیشتمانی یان عەلی –لی نراوە.

بۆیە هەریەکە لە بیری نەتەوەییو ئینتمای نەتەوەییو هەستی نەتەوەیی لێك جیان، هەر چەندە زۆرێك لە نووسەرو بیریارە نەتەوەگەریەکان تا ئێستاش تێکەڵی

دەكەن، لە ڕاستیدا نەتەوایەتی ئینتمایە نەك وەلاء، بایۆلۆجیە نەك ئایدیۆلۆجیا، خوێنە نەك سیاسەت، هەستە نەك عەقڵ، فسیۆلۆجیە نەك سوسیۆلۆجی، جمو جۆڵە نەك حزبو بەرنامە، هۆنراوەو پەخشانە نەك فكر، هەڵچوونە نەك زانست، وەختیە نەك دائیم، .. بیری نەتەوەیی دەیەوێ ئەو سنورانە ببەزێنێ بیكاتە (وەلاء، ئایدیۆلۆجیا، سیاسەت، ..هتد)، هەڵبەتە ناشبێتێ بۆیە دەبینین بیری نەتەوەیی بە تەنها بیرێكی شۆڤێنیو ڕەگەز پەرستیە یان داپۆشراوەو تەواوكراوە بەیەكێ لە مەدرەسەكان، هەر بۆیەش حزبە نەتەوەییەكانیش ناوەڵناوێكی مەدرەسەیەكی تری هەڵگرتووە، وەك حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی، حزبی دیموكراتی كوردستان، حزبی سۆشیالیستی نەتەوەیی -نازی)، .. هتد، لە كۆنگرەی دامەزراندنی حزبی بەعس هاتووە: (.. یۆمن بان الاشتراكية منبعث من صميم القومية العربية)[1]، چونكە وەختیشە بۆیە دەبینین دروشمەكە (وحدة-حرية-اشتراكية)، كۆتای بە مەدرەسەكە دێت نەك بە عەرەبیەكە، بەشێك بەوە نەوەستاون دوو مەدرەسەیان هێناوە بۆ تەواوكردنی ئەو بیرە نەتەوەییە، جمال عبدالناصر دەڵێت: (بیری نەتەوەییمان بە دوو باڵ دەفڕێ، سۆشیالیستیو دیموكراسی)[2]، ئیتر ناوەرۆكی ئەو بزوتنەوە نەتەوەییە تا ڕادەیەكی زۆر دەكەوێتە سەر ئەو مەدرەسەیەی كە بیرۆكەكەی پێ تەواو كراوە، بۆ نموونە ئەو حزبو بزوتنەوانەی بە سۆشیالیستیان تەواوكردووە ئەوا (فاشیەتو نازیەتو بەعسیەتی..) لێ پەیدا بووە، بەڵام دیموكراسیو ئیسلامیەكان جۆرێكی ترن.. بەدەرن لە ڕەگەز پەرستی، ئەوەش گەڕانەوەیە بۆتەفامیو پۆلینە كۆنەكەی یۆنان كە خەڵكی دابەش كرا بۆكاتژای زێڕو زیو وناسن..و لەكۆتاییدا بنەماكەی ئەرستۆ (الناس ليسوا كأسنان المشط)ی لێ هاتەدی، بەپێچەوانەی پەكسانی ئیسلام، بەو پێیە بێت ئەوە بیلال حەبەشی تەنەكەیەو (أبو جهل) یش زێڕ.

---

[1] مؤتمر تأسيسي ١٩٤٧-مادة (٤).

[2] فلسفة الثورة- جمال عبدالناصر.

فەلسەفەی رەگەز پەرستی‌و زیانی بیری نەتەوەیی‌و نامرۆڤایەتیەکەی لە بنچینەدا لەوە دێ کە وەلائی مرۆڤ نابێت لەسەر بنچینەی ئینتمای زگماکی بێت، هەموو ئەو فاکتەرە کۆمەلأیەتی‌و نەژادی‌و رەگەزیەی دەگرێتەوە کە بوون‌و ئینتمات تیایدا بەدەست خۆت نیە، وەك بوونت لە بنەمالەو هۆزو تیرەو نەژادو نێرینەو مێینە و.. بیری نەتەوەیی وەلائی مرۆڤ لەسەر بنچینەی ئینتمای نەتەوایەتی بەند دەکاو بیرو ئایدیۆلۆژیەکی رەگەزپەرستی لێ زادە دەبێت، کەنا مرۆڤایەتیە، ئایدیۆلۆژیاو بیری مرۆڤانە بەلایەنی کەمەوە دەبێ لەو سنورە بێت کە وەلائی مرۆڤ لەسەر بنچینەی عەقل‌و بەرهەمەکانی بێت کە ئینتماکردنی لەدەستە خۆتەو ئایدیۆلۆژیاو فکرو ئاین‌و حزب‌و بزوتنەوە عەقیدیەکان.. دەگرێتەوە، یان بە گوزارشتێکی تر ئەگەر تەوەری رزگاری -نەتەوەیی زال بوو بەسەر تەوەری رزگاری -کۆمەلایەتی ئەوا رەگەز پەرست دەردەچێ، پێچەوانەشی بە پێچەوانە.

مێژووی گەشەی ئینتماو وەلاء واهاتووە هەروەك لایەك لە ئامانجی شۆرشی پێغەمبەرەکانیش ئەوە بووە کە: وەلائی خەلکی لەسەر بنچینەی زگماکی (لە: خوێن، رەچەلەك‌و نەژادی‌و دەڤەری...) بگۆرنە سەر بنچینەی عەقلی، کە بریتیە لە بیروبڕوا تا ئومەتێك دروست بکەن نەك نەتەوەی جیاجیا، لە بەرامبەریشدا هەموو دەسەلأت‌و بەرنامە نەفامیەکان تا ئەوساتەش ویستویانە وەلائی مرۆڤ لەسەر بنچینەی دەسەلأتی بنەمالەیی، خێلەکی، ئیمپراتۆریەتی، نەتەوەیی.. دروست بکات، هەر ئەوەش مێژووی گەشەی بەندایەتیە، وەلائی جاران بە ئەوروپیشەوە هەتا سەردەمی رابوونیش جگە لەو وەلانە کۆنەپەرستانەی سەرووش بۆ (دۆق، برگندیا، پادشا، شازادە، ئیمپراتۆر، کاتۆلیکی مقدسی، پاپا، کنیسە، ..) بووە، وەلائی نەتەوەیی گەشەی ماهیەتی ئەو فاکتەرە کۆنانەیە هەروەك عەلمانیەتیش گەشەی ماهیەتێکی کۆنی ئەو پۆلەیە، گەشەی سەردەم هەردووکی کۆکردتەوە لە پێك گەیشتنی کۆمەلێك هۆکاری تر بۆی لەوانە:

١-كۆتایی وەلاتی ئیمپراتۆریەكان بۆ نەتەوایەتی.
٢-فراوان بوونی ئینتمای خێڵەكیو دەڤەری.
٣-بەندبوونی تاك بە دەسەلاتی دەولەتی نەتەوەیی زیاتربوو لە دەسەلاتی ئیمپراتۆریەت كە ئەوكاتی تاك ئەوەندە راستەوخۆ لە ژێر كاریگەری دەسەلاتی سیاسی نەبوو.
٤-پەرینەوەی ئینتما لە خێڵەكی یەوە بۆ بۆشاییەك (كە ئاینی راستەقینە یان مەبادیێكی مرۆڤانە ئامادە نەبێت )ئەوا بەسروشتی خۆی بەوەلائی نەتەوەیی دەگا.

ئەگەرچی ئینتمای نەتەوایەتی كۆنە جا مرۆڤ هەستی پێ كردوون یان نا، ئینتمابەكی نوستوو بووە، هەتا ئەووروژێ ناجوولێت، ئەو هۆكارە مێژووییانەی سەرروو بووتە وروژێنەر، بۆیە (ئەزەلیو ئەبەدی نیە)و (حقیقة خالدة) نیە[1]، وەك لە راپۆرتی (حزب البعث)و زۆر سەرچاوەی تر هاتووە، لە ئاینیش رەسەن تر نیە وەك ساطع حصری دەلێت: (تا ئێستا عەرەب (٣) ئاینی گۆڕیوە، كەچی عەرەبایەتیەكەی نەگۆڕاوە.. واتە رەسەن ترە)، بەلكو لە قۆناغێكی درەنگی مێژوویی هاتە مەیدان، ئەو دیاردە مێژووییانە زیاتر بەپێی پێویستو فاكتەری بابەتی (لە غیابی ئاینی راستەقینە) دروست دەبێت، بیری نەتەوەیی لە ئەورووپا لەو بۆشاییە ئاینە سەری هەلدا، لە لایەن چەند فەیلەسوفێك لەوانە (هیگل: بنچینەیەكی فەلسەفی بۆ دارشت، گەیشتە ئەو ئەنجامەی كە مێژوو لە بالای نەتەوەیی پروسیا دوایش لە (نازیەتی*) كۆتای دێت، بسمارك بەو رێنمونیە ئەلمانیای لە سالی ١٨٧١دروست كرد،دوای سۆپەرمانو سۆشیالیستی نەتەوەییو نازیەتی لێ پەیدابوو..)، بۆ رۆژهەلاتو جیهانی ئیسلامیش لەگەل هاتنی عەلمانیەتو كزبوونی خەلافەت دەستی پێكرد، یەكەم جار لەنێو چەند

[1] سەرنج بدە : تقرير سياسي التأسيسي حزب البعث -١٩٤٧- مادە (٣).
* هەرخودی ئاری بەمانای ماقول وسوپەر مان دێت

ناوەندو سەنتەرێك لە لبنانو ئەستەمبوڵو قاهیرە.. زیاتر لای مەسیحیە عەرەبەکان سەری هەڵدا،لە نێو تورکیش لەسەر دەستی یەهودیەکانی دۆنمە لەسالۆنیك سەری هەڵدا، چونکە مەسیحیەکان وەك پاڵنەری دەروونی (خۆ دەرخستن) لە فاکتەری (ئاینی)دا بوونێکی کۆمەلایەتیو سیاسی لاوازیان هەبووە، بۆیە بەدوای فاکتەرێکی تر گەڕان- کە نەتەوەییە- بەهۆیەوە گوزارشیکی بە هێز تر لە ئینتماکەی بکا، هەربۆیەش کۆنگرەی (پاریسی ١٩١٣نەتەوایەتی عەرەب) نیوەی مەسیحی بووەو بووە هۆی سەرهەڵدانی بیری نەتەوەیی بەخێراتر، بزوتنەوەی (ئیتحاد الترقي-کەلەساڵی ١٨٨٩ز دروست بوو، دوای احمد رەزا سەرۆکایەتی وەرگرت )و کەسانی وەك (انور پاشا، طلعت پاشا، جمال پاشا) لە پایتەختی خەلافەت دروست بوون، بەهاوتای بیری ئسلامیو میللەتی عوسمانیو بیری نەتەوەیی دروست بوو، لەوانە (نکین ئەلب) (٥) بەرگی لەسەر (تۆران) نووسی، نجیب عازوری کتێبی (یقظة الامة العربیة)ی نووسی، وەکتێبو تەنزیراتەکانی (ساطع الحصري) ..ئیتر ئەو بیرە لەسەرەتای سەدەی بیستەم هاتە جیهانی ئیسلامی، پێشتر نەبووە، هەتا لە (هند)یش کە خاوەن شارستانیەکی قووڵیان هەیە سەرەتای وشیاریو بیری نەتەوەیی بۆ ساڵی ١٨٨٥ز دەگێڕنەوە، کە (حزبی کۆنگرەی نیشتمانی هندی) دروست بوو، لە ساڵی ١٩٠٥ بووە ڕێکخستنێکی میللیو دوایی لە ساڵی ١٩١٦ غاندی سەرکردایەتی ئەو حزبەو ڕزگاری نیشتمانی کرد، بەهەمان شێوە هەمو سەرچاوەکان ئەو هەستو سەرەتای بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستان بۆ سەرەتای سەدەی بیستەم دەگێڕنەوە، بەڵام بیری نەتەوایەتی لەناو میللەتی کوردو هەندێ میللەتی تری وەك فارس، بلوش، چەرکەس، .. تا ئێستا ڕەگو ریشەی وای نیە، ئەوەش وەك وەسفەکەی (ابن خلدون) نیشانەی پێشکەوتنە.

## راى مەدرەســـەكان :

ئەگەر چى نەتەوايەتى‌و بيروكەشى بەفرە مەبەست بەكارهاتووە لە كۆن‌و نوێدا لەلايەن رۆژئاواوە، لەوانە : بۆ رزگارى خۆيان، بـۆ داگيركردنـى خـەلكى تـر، بـۆ دابەش كردن‌و تێك گـيران‌و نانـەوەو هەلگيرسـانى ناوەنـدى نـاكۆكى..، بۆيـەش دەبينين بەلێنە ئيجابيەكانيان بۆ ميللەتان‌و بەكورديشەوە جـێ بـەجێ نـەكردووە، وەك : بەلێنـەكانى هاوپـەيمانانى رۆژئـاوا لـە فـەترەى جـەنگى جهـانى يەكـەم، ١٤بنەماكەى ويلسون لە١٩١٨، بەلێنەكانى جۆرج ١٩٢٠، سـيڤەر ١٩٢٠..)، كەچى سەلبيەكانيـان هەمو جـێ بـەجێ كـردوون وەك (بـەلفۆر ١٩١٨، سـايكس بيكۆ ١٩١٦، لـۆزان ١٩٢٣، سـعد ئابـاد ١٩٣٧، جـەزائير ١٩٧٥..هتـد)، تـا ئێستاش ئەو دۆخە بەردەوامە..

هەرچى ولاتانى سۆشياليستى‌و مەدرەسـەى چەپيـشە، بـەحوكمى بنـەماكانى بيرى ئومەمى لە ماركسـيەت دان بەبيرى نەتـەوەيى نـانێن‌و هـەتا مـل ملانێـى نێوان داگيركەرو داگيركراويش بەسانەوى دەژمێرن، هەر چەندە هەنـدێ ئاخـافتنى ماركس هەيە سەبارەت بـە ئێرلەندە، بـەلام لـە دواى ئـەوەى زۆربـەى ولاتـانى سۆشياليستى دروست بوو بە پێچەوانەى ئەو (ئەسلە ماركسيانە)كە گوايـە دەبـى لە ولاتانى پيشەسـازى دروسـت ببـێ، بـەلكو لـە ولاتـە كـشت‌و كـالى‌و لـەرێى بزوتنـەوەى رزگـارى خـوازى نەتەوايـەتى دروسـت بـوون.. ناچـار دەسـتكارى (ئەسلێكى) گرنگى ماركسيان كرد لە مەرپايەكانى ناكۆكى.. وە تۆمارپـان كـرد كە: دەشێت جارجار (ناكۆكى پلەيەك -كە ناكۆكى كريكار وبەرجوازيە -بـچێتە جى ى ناكۆكى پلـە دووو بـە پێـچەوانەش)، نموونـەو پيادەكردنيـشيان نـاكۆكى بزوتنەوەى رزگارى خوازى نەتەوەيى دژ بە ئيمپرياليزم بوو، كە بـەردەوام‌و توونـد بوو، كەچى بەردەوام نـاكۆكى كريكـارانى رۆژئـاوا و سـەرمايەدارەكان لەسـەرخۆ بوو..، مەدرەسەى چەپى بە چـاكى نـەيتوانى ئـەو سـنورانە لێـك بكاتـەوە كـە ئينتما و هەستى نەتەوايەتى‌و بيرى نەتەوايـەتى جيايـە، رزگـارى- نەتـەوەيى‌و

رزگاری-نیشتمانیش لێك جیان، ئنجا حزبی نەتەوەیی لە وڵاتێکی داگیرکراوو لـە وڵاتێکی سەربەخۆ دیسان لێك جیان.

لە ئیسلام دا ئـەو لێـك جیاکردنەوانـە بـە وردی دەسـت نیـشان کـراوەو لـە قورئانیش هاتووە: ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾، واتە بۆ (تعارف) نەك (تقاتل) یان (احتلال) یان (افتخار). تەعاروفیش واتە دان پیاهێنـان بـە یـەکتری، بـەڵام لـەو سنورە بترازێو ببێتە وەلائو بیرو ئایـدیۆلۆجیا و.. ئـەوا ئیـسلام دژی وەسـتاوە: (لیس منا من دعا الى العصبية)، (لينتهين اقوام يفتخرون بآبائهم ماتوا انما هم فحم جهنم.. الناس بنو آدم، آدم من تراب)، چاکترین دەستکاری ئـەو بنەمایـەی ئینتماو وەلائەی (أنصر أخاك ظالما أو مظلوما) کرا لەلایەن پێغەمبـەر ﷺ رەگەز پەرستی و نامرۆڤانەی وەرگێرا بۆ مرۆڤایەتی بێ ئەوەی دەستکاری شێوەی بکا تەنیا ماهیەتی گۆری، کە لە پێشتر مانای پارمەتی هاوخوێنی خـۆت بـدە چ لەسەر هەق بێت یان ناهەق.. وەری گێرا بەو مانایەی.. ئەگەر هەق بوو یارمـەتی بدە، ئەگەر ناهەقیش بوو یارمەتی بدەو دەستی بگرە تا نەیکا.

## تەقەلاکانی بە ئایدیۆلۆژی کردنی نەتەوەیی:

ئەو سەردێرە لەوە هاتووە کە نەتەوایـەتی بـیرو ئایـدیۆلۆژیا نیـە، وەك (إبـن خلدون)یش دەڵێ: (النسب علم لا ينفع و جهالة لا تضر)، بۆیە زۆر تەقەلای کۆنو نوێ هەیە تا بنچینەیەکی ئایـدیۆلۆژی بـۆ نەتەوایـەتی بدۆزنـەوە، هەنـدێکی لێ هەڵدەبژێرین:

١-شەیتان بە یەکەم وروژێـەرو شانازیکەر بە رەچەڵەك دەژمێرێت، بووە هـۆی ئەو دۆخەی ئێستای شەیتان، کاتێ وتی من لە (صـنـادەم) گـەورەترم، رەچـەڵەکم ئاگرە، نەسڵی ئادەمیش لە قورە.

٢-بەشێکی تر بنچینەی دەروونی زیرەکایەتی دەگێڕنەوە بۆ رەچەڵەك، (شعب الله المختار) ی یەهودی و(ارض الرسالات)ی عەرەب لەوە هاتووە، لە پروتوکولاتی(٥)ی حکماء صهیون هاتووە : وقد منحنا الله العبقرية كي نكون قادرين على القيام بقيادة العالم) ناشیونالیستە عەرەباکانیش ئەوە دەڵێنەوە،تەنانەت لە کتێبی (العروبه بين الشعوبيه والاستعمار) دەڵێ: هەموو خەڵکی زەوی وئاسمان پێویستیان بە عەرەب وخاکی عەرەب هەبووەو هەیە، لەولاش هەریەکە لە : (ئەرسەر دی گۆبینۆی فەرەنسی، شامپرلینی ئینگلیزی، بەواس، فیشەر، ...) وای بۆ چوون کە توانای عەقڵی نەتەوەیك لەگەڵ نەتەوەیەکی تر جیایە، گوایە هەندێ نەتەوە شایستەی پێشڕەوایەتی و سەرکردایەتی سیاسی جیهان بکەن و خەڵکی تریش لە خزمەتیان بن، گۆبینۆ پێی وایە ئاریەکانن شایستەی هەڵگرتنی پەیام بۆ هەموو بەشەریەت، وەك بنەمایەکی ئایدیۆلۆجی، ئەوەش هەمان بۆچوونی کۆنی (رۆم) بووجگە لەخۆی خەڵکی تری بە (بەربەر) لەقەڵەم داوە هیرۆدۆتس -کە بە باوکی مێژوونووس دادەنرێت- شەڕی ئاسیایی وئەورووپی بەجەنگی بەربەرو مەدەنیەت لە قەڵەم داوە وەك (شیشرۆن ١٠٦-٤٣ پ ز) وەسفی دەکا[1]، هەمان تیۆری داروینیەتی کۆمەڵایەتیشە).. بەڵام (باستیان) لە کتێبی (وحدة النفس)و (راتزل) لە کتێبی (حضارة التقليدية) سەلماندیان کە تواناى عەقڵی مرۆڤ یەکسانەو بەند نیە بەرەچەڵەك و نەتەوەو فاکتەری جوگرافی.. ئەوەش هەمان رای ئاینی راستەقینەیە بە ئیسلام و چەپیشە.

٣-هیگڵ و چەند فەیلەسوفێکی تر بنچینەیەکی تری مێژوویی و فەلسەفی و جیهانیان دۆزیەوە بۆ ئایدیۆلۆژیای نەتەوەیی، گوایە مێژوو راهاتووە هەر جارەی نەتەوەیەك پێشڕەو بووە ئێستاش نۆرەی نەتەوەی ئەڵمانە پێشڕەوبن و گەیشتونە لوتکەی گەشەسەندن و ئەوە کۆتای مێژووە.. بۆیە دەبێ نەتەوەی ئەڵمان

[1] شیشرۆن نازناوی "باوکی مێژوو"ی بە هیرۆدۆتس دا .

سەرکردەی سیاسی‌و ئایدیۆلۆژیای جیهان بێت، لەوەوە بانگێشەی پاکی ئاریەتیش لە رەگەزەکانی تر هات‌و دیاردەکانی سوپەرمان‌و نازیەت‌و بەجەنگی جیهانیشەوە لەسەر ئەو بنچینەیە دروست بوو، ئەو هەمو کوشت‌و کوشتارەی توخمی نا ئاری کرا گوایە تا خزمەت بە مرۆڤایەتی بکری‌و توخمی ئاری بەپاکی بمێنێتەوە تێکەڵ بە توخمەکانی تر نەبێت بەتایبەتی (یەهودی)، هەمان فکرەی (تۆرانیەت)و کوشت‌و بری (ئەرمەنی) و.. دوایش ئەنفال‌و کیمیایی دژ بە کورد کرا لە سەر هەمان بنچینەی جارنەدراو .

٤-بەشێکی تری نەتەوەگەریەکان بەهەندێ (سەفسەتە) دەیانەوێ بیسەلمێنن کە فاکتەری نەتەوایەتی بەهێز ترە لە فاکتەری سیاسی‌و ئایدیۆلۆجی‌و هەتا لە ئاینیش، ساطع الحصری دەڵێ: (لە قۆناغێکی دیاری کراودا عەرەب (٣) ئاینیان گۆڕیوە کەچی عەرەبایەتیان نەگۆڕاوە، کەواتە عەرەبایەتی رەسەن ترە لە ئیسلامیش)، (ملك فیصل)یش دەڵێ: (...و أننا عرب قبل موسىء عیسىء محمد)[1]، شبلی عیسمیش دەڵێ: (أحیانا العروبة أوسع من الاسلام)[2]، علی ناصر الدین دەڵێ: (الإلحاد بالدین غیر هامء لكن الإلحاد بالعروبة جریمة)، العلایلی دەڵێ: (القومیة هي دین العرب)، هەروەها لە (قضیة العرب )ئیسان دەڵێ: عەرەبایەتی ئیوەی سەردەمە ) .. عمر فاخوریش لە کتابی (کیف ینهض العرب) دەڵێ: (عەرەب سەرناکەون هەتا خۆشەویستی ئیسلامی بەعروبایەتی نەکوژێننەوە )، لە کوردستانیش لە شیعریکی ئیبراهیم ئەحمد دەلی: لەپیش ئاینا ئیمە هەرکورد بووین وهەر کورد دەبین، لە سرودی ئیشتمانیەکەش وا هاتووە: (دینمانە ئاینمان هەر نیشتمان).

٥-هەردەم نەتەوەیی‌و خوێن بەهێزترە لەبیروبڕواوەو هەتا عەقیدەی ئاینی، بەشێکی زۆری نەتەوەگەریەکان بۆ پاڵپشت کردنی ئەو بۆچوونەیان دەگەڕێنەوە

---

[1] خیتابەکەی لە شام.

[2] العلمانیة، الدولة الدینیة، شبلي عیسمي ل٢١٣.

سەر (ئیمام غەزالی)و (ابن خلدون) کە وتوویانە پەیوەندی خوێن بەهێزوو داتیمترین پەیوەندیە[1]، بۆیە هەتا نەتەوەگەریە میان ڕەوەکانیش کردوویانە بنچینەی ئایدیۆلۆژی نەتەوەیی، سەرنج بدە (کتاب الاخضر) کە بە دەستوری لیبیا دەژمێرێت دەڵێت: (...العوامل الاجتماعية هي العلاقة القومية ...، ينتصر حتما العامل الاجتماعي على العامل السياسي، .. لذلك.. العامل القومي هو المرك الحقيقيء الدائم للتأريخ)[2].

٦-نەتەوایەتی یەکێتی دروست دەکا، لە دوای دارشتنی ئەو سنورە دەستکردانەی پەیمانی سایکس بیکۆ ١٩١٦ بەپێی نەخشەی ئیمپریالیزمی.. ئیتر لەلایەن نەتەوەگەریە عەرەبەکان ئەو واقیعە نوێیەی زادەی ئیمپریالیزمیش دەکەنە بنچینەیەکی فکری بۆ یەکێتی نەتەوەیی و نیشتمانی، کورد لە هەموو خەڵکی تر لەو پاساوەزیان پێ کەوتووترە، کەچی نەتەوەگەری کوردیش گەلێ جار پەنا بۆ ئەو پاساوە دەبەن بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە مەزنەی فکرو ئایدیۆلۆجی (بیری نەتەوایەتی)، دەڵێن ئاین دەبێتە هۆی پارچە پارچەیی نیشتمان و نەتەوە.. بە پێچەوانەوەش بیری نەتەوایەتی دەبێتە یەکێتی نیشتمانی، ئیتر لە (ڕاپۆرتی سیاسی کۆنگرەکانی حزبە نەتەوەییەکان) زۆر دژی بزوتنەوەی ئاینی هاتووە، هەروەك (کتاب الاخضر) دیسان دەڵێ: (العامل الديني الذي يقسم الجماعة القومية، .. لذا، .. القاعدة السليمة هو أن لكل قوم دينا)[3]، لە ڕاپۆرتی کۆنگرەی (حزب البعث) هاتووە: (..يعطوا الدعوة للوحدة العربية مضمونا ديمقراطيا اشتراكيا بعيدا عن صبغة الدين)..

٧-لەگەڵ ئەو هەڵمەتەی دژی ئاینیش، بەڵام لە لایەکی تریشەوە بەکاریشی دەهێنن بۆ بنیاتنانی ئایدیۆلۆژی نەتەوەیی، یەهودیەکان دەڵێن ئێمەین (شعب

---

[1] لە ڕاستیدا ئەوانە وتویانە (پەیوەندی خوێن و ئاین نەك خوێن بەتەنها..).
[2] کتاب الاخضر -معمر القذافي- ل١٤٣،١٢٣.
[3] کتاب الاخضر -معمر القذافي- ل١٤٣،١٢٣.

الله المختار)و یهوداك دەڵێن: (نیشانەیەك هەیە بۆ هاتنەوەی مەسیح و رزگارکردنی مرۆڤایەتی، ئەویش ئەوەیە كە دەبێ لەوكاتی یەهودی دەسەڵاتی سیاسی جیهانی وەرگرێ.. بۆیە هەر رێگرتنێك لەو دەسەڵاتە رێ گرتنە لە رزگاری مرۆڤ)[١] -بۆ زیاتر سەرنج بدە كێشەی (فەڵەستین) لەو فەرهەنگە-، زۆر باسی تر لەو شێوەیان، لەسەر ئەو بنچینە ئایدیۆلۆژیە ناینیە دەوڵەتێکی سیاسی عەقیدەیی نەتەوەیی (عبری)یان دروست کردووە، لەناو نەتەوەگەری عەرەبیش ئەو تەقەلایە گەیشتۆتە رادەی هۆنینەوەی فەرموودەش وەك: (حب العرب من إيمان)، (العرب مادة الاسلام، إذا ضل العرب ذل الاسلام)، لە كۆتاییدا دروشمی (أمة عربية واحدة، ذات رسالة خالدة) و (العروبة قبل الاسلام) و.. ویستویانە (بیری نەتەوەیی عەرەبی) دەوڵەمەند بكەن بەهۆی: گوایە نەتەوەی عەرەب پەیامی ئیسلامی بۆ هەمو جیهان هەڵگرتوە، وەك میشێل عەفلەق دەڵێ: (العروبة جسم والاسلام روحها) هەڵبەتە ئەوەش هەمان بیرۆكەی هیگلە كە نازیەتی لێ پەیدا بوو، هەمان بیری تورانیەتە كە عوسمانیەتی پێ رووخا قڕی ئەرمەنو كوردی پێ كرا، هەمان بیری زایونییشە كە ئیسرائیلی پێ دروست كراوە، .. لە تەقەلایەكی تری بەستانەوەی بیری تەسكی نەتەوەیی بە دەریای ئیسلامەوە میشیل عەفلەق دەڵێ: (هیچ عەرەبێك نیە ئیسلام نەبێ، .. سەرم سوڕماوە كە ئیسلام عەرەبی خۆش نەوێ)[٢]!

ئەو جۆرە تەقەلایانە زۆر لایەنی تری گرتەوە، لە كۆتاییدا كۆمەڵێك فاكتەری فراوانتریان بۆ بیری نەتەوەیی داتاشرا وەك: هاوبەشی مێژوو، بەرژەوەندی مادی، هاوبەشی دەروون، هاوبەشی ئاین، هاوبەشی خاك، .. و زاراوەی وەك (تومە) بەكارهات، هەتا پەنایان بۆ فكری ماركسیەتیش برد كە وەك ئیسلامیش نیە

١ بۆ زیاتر سەیری ا-أمريكا طليعة الانهيار، ب-الاساطير المؤسسة.. روجيه غارودي، ج-مادە هرمجتون، ل مصطلحات.

٢ الكتابات السياسية كاملة -ميشيل عفلق.

جیاوازی بکا لە نێوان نەتەوەو نەتەوەگەری‌و بیری نەتەوایەتی، ئەو هەمووی بە ڕوویەکی تری بورجوازی لەقەڵەم دابوو.. کەچی نەتەوەگەریەکان هەندێ ئاخافتنی (مارکس)یان لە بارەی ئێرلەندا دۆزیبۆوەو کردبوویانە بنچینەیەکی ئایدیۆلۆجی‌و بۆ بیری نەتەوەیی.. هەروەك زۆربەیان بەهۆیەوە ناوەڕۆکێکی سوشیالیستی نەتەوەییان دابووە ئەو بیرە نەتەوەیی‌یە..

## زیانەکانی:

لە ڕاستیدا هەموو ئەو تەقەلایانە لە ماوەیەکی کورت نەبێت سەرکەوتوو نەبووە، چونکە تێکەڵکردنی کۆمەڵێك چەمك‌و خانەی جیاجیا بووە، هیچ نەتەوەیەك نیە بەرژەوەندی جیاجیاو ئینتمای جیاجیای تری نەبێت، نە خاك‌و نە ئاین‌و نە مێژوو.. ئەو فاکتەرە بەهێزو بەتەنهایە نین بۆ نەتەوەیی، ئنجا ئەو بیرە یەکێتی نەتەوەیی عەرەبی لە یەکپارچەیی کردۆتە زیاتر لە (٢٢) پارچەی ڕەسمی، سۆماڵیکی یەك نەتەوەو یەك مەزهەب‌و یەك، .. کردۆتە دەیان پارچە.. لوبنان، ڕواندا، بوروندی، ئێرلەندا، هیند، عێراق، یوگوسلافیا، سۆفیەتی جاران، ..) پارچە پارچە بوون.. یەکێتی نەتەوەی نەیتوانی یەکێتی ئەمریکی‌و بەریتانی بپارێزی بەڵکو شۆڕشیان لەدژی بەریتانیا لە ١٧٧٦ز هەڵگیرساندو بە داگیرکەریان وەسف کرد، ئیتر لەوساتیەوە دەوڵەتانی نەتەوەیی وەرچەرخان بو دەوڵەتی نیشتمانی‌و چەمکی هاووڵاتی دەستوورریانە هاتە جێی هاونەتەوەیی، لە چەندین شوێنی ئەو تەقەلایانە ئینتمای زگماکی‌و ئینتمای (مکتسب)یان تێکەڵ‌و پێکەڵ کردووە.. بۆیە ئێستا ئەو بیرەنەتەوەییە لەژێر ڕۆشنایی گەشەی زانستی‌و شکستی ئایدیۆلۆجیای مارکسی‌و عەلمانی بەگشتی پێناسە عەولەمەوە.. لە هەموو کات زیاتر لە قەیران‌و قەڵۆشی دەژی، جگە لە دەسەڵات پاڵپشتێکی تری وای بەدەستەوە نیە، ئەوەش سەرچاوەکەی کۆمەڵێك زیانی تری سیاسی‌و شارستانی‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابووری و.. لە ڕاستیدا کاتێ (ابن خلدون) وتویەتی

(النسب علم لا ينتفع وجهالة لا تضر).. سەردەمى (نەتەوايەتى) نەبووە بۆيە تەنها لە پۆلى نەفامى بۆ زيانى ريـز كـردووە، بـەلام لەسـەردەمى وروژانـدنى نەتەوەگەرى زيانێكى زۆرى هەبووەو هەيە، ئەگەر بابرايە تـا نيستا دەسـتكارى (..جهالة لا تـضر )ى دەكرد و(لا)يەكەى هەلدەگرت، ئـەوەش ليـستێكى زيـاترى زيانەكانى بيرى نەتەوايەتيە كە بە كورتيەكەى:

١-بووە هۆى پارچە پارچە كردنى جيهانى ئيسلامو هەتا يەك نەتەوەش، كورد بووە چوار پارچەى سەرەكى.

٢-سەرقالّ بوون پێك، بووە هۆى وەستان لەگەشەكردن.

٣-بووە هۆى دروسـت بـوونى نەتـەوەى سـەر دەسـتو ژێـر دەسـتو ستەمو برختان.

بەدەگمەن نەبێت هەموو نەتەوەگەريە عەرەبـەكانو تـورك نكـولّى لـە بـوونى كێشەى كورد دەكەن، لە توركيا لە هەموو دەسـتورەكان لـە دواى خەلافـەت بـە توركى شاخى ناوبراون.. سەرنج بدە (موسوعة السياسية -الكيالي)، بە حيساب زانستيەو بۆ لايەنەو خەلكى فەلەستينيە نەك عێراقى سەبارەت بـە بزوتنـەوەى رزگـارى كوردسـتان چ دەلـێ كـە لـە كەسـێتى (بـارزانى) كـزى كردۆتـەوەو نووسيويەتى:

(قائد المتمردين الانفصاليين الاكراد في شمال العراق، .. تمرد على الحكومة المركزية بالأتفاق مع قوة أجنبية،و عمل مع قوة الاستعمارية العالمية و محلية على استنزاف العراق عسكريا واقتصاديا و سياسيا و منعه من توجه الى فلسطين)!!.

٤- هەمو ئـەو ديـاردە ترسـناكانەى (ئيمپريـاليزمى، جەنگـە جيهانيـەكان، ديكتاتۆريەكان، فاشيەت، نازيەت، تۆرانيـەت، ئـەنفال، بەعـسيەت، ..) بەشـى زۆرى دەكەوێتە ئەستۆى ئەو بيرە..

با تێچاوێك بخەينە (ترخمەكانى فاشيەت-عناصر الفاشية) كە بريتيە لە:

ا- گێرانەوەى سەروەريەكانى نەتەوەگەرى رۆمانى.

ب- دیکتاتۆریەت.

ج- بیروباوەڕی ئاوێتەی سۆشیالیستی و دیموکراسی.

د- مەرکەزیەت.

هـ- نەتەوایەتی سیاسی واتە (ولاء القومي).

راستی خاڵی (٤) بە روونتر دەردەکەوێ،کە زۆربەی حزبە نەتەوەگەریەکان ئەو ترخمانەی هەڵگرتووە، لەگەل پەرەسەندنی ئەو نەتەوە گەریە بەرەو لوتکە زیاتر میللەتانی جیهان بەرەو کارەسات دەبا، تیایدا تاکە کەسێك دەکرێتەسەروەری، سرودو هۆنراوەی بەسەردا هەڵدەڵێن، بەپێی (القاموس السياسي) یەکەم سرودی نیشتمانی لە جیهان لە هۆلەندا بەناوی (مير وليەم نيساو-١٥٧٠) دەرکەوت، دوای سرودەکان روو لە نیشتمانی ئەو سەرۆکانە کرا، وەك سرودەکانی ئەلمانیا لە سەرووی هەموانە، هەموو نەتەوەگەریەکان سرودێکی وروژێنەریان بۆدروست کرا، ئیتر بەرەبەرە سرودی نەتەوەی بە دەستووریش کرا لە جهانی ئیسلامیش.

٥-نەتەوایەتی بەپێی ئەو واقیعەی دەرهاوێشتەیەکی ناچاری گەشەی مێژووە بۆیە لەباروودۆخی خۆیدا رەوایە، جا ئەو رەواییە سنورو مەوداو ناوەرۆکی هەیە.. کە رەت کراو سنورەکە بەزێنرا دەبتە دەرد، کیانی ئەو بیرو نیمچە مەدرەسەیە لە کارو کاردانەوەو وروژاندن پێك دێت نەك رەسەن، بەشێوەیەك: کارەکەی بریتیە لە رەگەز پەرستی و داگیرکاری و کاردانەوەکەش خەباتی رەوای گەلانە، ئەگەر بە فراوانتر بیلێین ئەوا ناوەڕۆکی ئەو نەتەوایەتیە ئەوەستێتە سەر پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە فکریەی کە لە بنەماکانی خەباتی نەتەوەیی هەیە، بە جۆرێك ئەگەر بە مەدرەسە توندە نامرۆڤایەتیەکان پڕکرێتەوە ئەوا لە رزگاری خوازی وەردەچەرخێتە داگیرکەرو ستەمکار، هەروەك (ئەهرۆ)ی هندی بە (مصطفى کمال)ی وتبوو: نموانە دوێنێ رزگاری خواز بوون کەچی ئەورۆ ستەم لە کورد دەکەن[1]، نمونەی نموانە زۆربەی ولاتانی عەلمانی جیهانی سێ یەمە، لە هەندێ شوێنی تر بە

[1] لمحات من تأريخ العالم -نهرو-.

(شیوعیەت) ئەو ئایدیۆلۆژییە تەواوکراوە وەك: کەمبۆدیا، ڤێتنام، ئەنگۆلاو وڵاتانی تری ئەفریقی.. سەرەنجام وڵاتی دیکتاتۆری لێ پەیدا بووە، بەشێکی تریشی ئاینی بووە وەك: (ئێرلەندا، ئیسرائیل، پاکستان، ..)، ئێستاش زۆربەی بزوتنەوە رزگاری خوازەکان ئیسلامین وەك (کشمیر، چیچان، فلەستین، خوارووی لبنان، مۆرۆ، ..)، ئەگەر تێ بینی بکرێت بەرگری ئیشتمانی بەرەبەرە لەگەڵ گەشەی تەکنەلۆجیای داگیرکەرو ئیمپریالیزم گۆڕا بەسێ قۆناغ: یەکەم لەسەرەتای رابوونی نەتەوایەتی ولاوازی تەکنەلۆجیای سەربازی داگیرکەران ئەوا بزوتنەوەکانی بەرگری نیشتمانی زیاترلە ئاستی توانای نەتەوەگەرییەکان بوو؛ قۆناغی دووەم: لەگەڵ پەرەسەندنی تەکنەلۆجیای سەربازی چیتر لە توانای تەیاری نەتەوەیی نەما، ئەوجا نۆرەی چەپیەکان هاتو پێشەنگو سەرکردەی بزوتنەوەی رزگاری نیشتمانیان کردتا هەشتاکانی سەدەی رابووردوو، قۆناغی سێیەمو ئێستاش لە عەولەمەدا بەرگری نیشتمانی لە توانای هەردوو تەیاری نەتەوەیی و چەپی نەماوە، تەنها بە ئایدیۆلۆجیەکی بە هێزی وەك ئیسلامیەکان دەکرێ .

**ئەنجام:**

باس لە واقیعی نەتەوایەتی و سەرەنجامەکانی ناکەین، کە چەندە دەردەسەری بووە، نەك نەتەوەی بن دەست هەتا سەردەستیش، بەتایبەتی عەرەب و تورك و سرب کە زیاتر پابەندبوونینە بەو بیرە.. ئێستا ئەو بیرە بەجێ ما.. بەڵام لێرەدا باسی ئەو فاکتەرانەی هاوبەشی مێژوویی و خاك و زمان و بەرژەوەندی و دەروون.. لە ژێر رۆشنایی (مێژووی بینراو) باس دەکەین.. ئاخۆ بزانین ئەو فاکتەرانە چەندە توانیویەتی ئومەتێك یان هەتا مانای میللەتێك، یان گەلێك دروست بکا بەهۆی ئەو فاکتەرە نەتەوەییانە، هەر بە سووکە خوێندنەوەیەکی واقعی نەتەوایەتی جیهانی و ناوەخۆش دەردەکەوێ تەنها (زمان) راستەقینەیە، هەروەك ئاینی

ئیسلام بەتاکە فاکتەری نەتەوەیی داناوە.. ئەگینا فاکتەرەکانی تری وەك ئێستا یەکە یەکە باسیان دەکەین:

•**مێژووی هاوبەش:** مێژووی نەتەوەکان هاوبەش نیە، با هەر لە کورد دەست پێکەین بەپێی ئەو مێژووەی قۆناغی نەتەوەیی دەبینین یەك دەنگو یەك رەنگ نەبووینە، نەك بۆ کێشە کۆمەلایەتیو عەقیدیەکان هەتا بۆ کێشەی نەتەوەییش، بەشی هەرە زۆری لە رێزی داگیرکەر بوون، لە پێش راپەرینی ١٩٩١ ژمارەی جاش زیاتر لە (٣٠٠) هێندەی (پ.م) بووە، ئنجا ئەو چەند هەزارەی (پ.م)ش لە شەری براکوژی بووینە، کەواتە مێژووی کام لایە مێژووی نەتەوەیی هاوبەش، کامە مێژووە پێکهێنەری نەتەوایەتی کوردی کردووە، ئێستاش خراتر، بەهەمان شێوە ناو عەرەبیش بریتیە لە فرە تەیاری جیای ناکۆك، هەر لە خودی نەتەوەییەکان تەیاری زۆرایەتی (ئیستسلامی، رادیکالی، رۆژهەلاتی، رۆژئاوایی، ..) بەش بەشو مێژوویەکی مل ملانێ یانەیان هەبووە ..

•**بەرژەوەندی هاوبەش:** هیچ نەتەوەیەك بەرژەوەندی هاوبەشی نەبووەو ناشبێ، هەر دیسان لە کوردستان چینی جیاجیای دژ بەیەك، بەرژەوەندی جیا وای کردووە ئەو هەموو خائینو خۆ فرۆشە نیشتمانو نەتەوەش بفرۆشن، ئیستاش چینایەتی تیك گیرانی بەرژەوەندی نەتەوەیی کورد بە هێز ترە لە جیاوازی چینایەتی براهماو شودراو مەنبوز لە هند .

لە مارکسیەت بەرژەوەندی چینایەتی هاوبەشەو بەس، بۆیە لە (بیان الشیوعی) دەلێ: کرێکاران نیشتمانیان نیە،کەچی دوای (ئەنجلس) کەوتۆتە ناکۆکی لە مەرجەکانی نەتەوایەتی، بۆیە مارکسیەکان تا درەنگ کوردستانیش نەبووینە و تارووخانی ئینجا شیوعیە کوردستانیاکان گەرانەوە سەر نەتەوەگەری.

•**دەروونی هاوبەش:** دەروون بەندنیە بە رەچەلەكو ژینگەو نەتەوەو سنوری جوگرافیو رەگەز.. ئەوەیان باسێکی زانستیە هەروەك (باستیانو راتزل سەلاندیان)، ئێستاش دەبینین لەناو یەك نەتەوە دەروونی جیاجیا و تەبیعاتی

جیاجیاو پێچەوانەی یەکترە.. بەڵکو بەندە بە هاوکێشەیەکی دەروونی کە لە(چەمکی ناخی مرۆڤ)باسمان کردووە،ئەوەیان دوورترینیانە.

◆**خاکی هاوبەش:** خاکی هاوبەش کوردی یەك نەخستووە وا چوار پارچەیە، کورد خۆشی وا زیاتر ژمارەی پارچەکانی زیاد دەکات، عەرەب زیاتر لە (٢٢) پارچەن،کۆریا یەك خاکەو دووکیانی سیاسی جیای داوە ...، ئەو مەرجە ساغ نیە چونکە کوردی زمان هەیە لەسەر ئەو خاکەش نیە کەچی ئێستا کوردیەکەی زیاترە.. ئەو کۆچە بەکۆمەڵەی خاك بەجێ هێشتن چاکترین بەڵگەی بێ‌هێزی ئەو فاکتەرەیە.. لەسەر ئەو بنچینانە نەتەوەیەکی وەك کورد کە لە گەرمەی قوناغی نەتەوەییە کەچی ژێرخانی لە ئاینی گواستراییەوە سەر ئەو فاکتەرانەو بوویتە هۆی لەباریەك هەڵوەشاندنەوەی قولپەکانی .

ئەگەر لەسەرجەم دا تێی بروانین، دەبینین (ئیسرائیل) هیچ کۆمەڵگەیەکی لەو وەسفانە نەبوەو وابووبە کیانی نەتەوەیی، لەلایەکی تر هەمرونەو فاکتەرانە لە نێوان ئەمریکاو بریتانیا سازاوە تەنها خاکیان جیا بو کەچی لێك جیابوونەوە بە شۆڕشیش لەولایەش بۆ عەرەب ئەو فاکتەرانە سازاوە دیسان ٢٢پارچەن .. کوردیش زۆربەی لێ سازاوە کەچی پارچە پارچە بووە،کەواتە ئەو مەرجانە تەواو دروست نین .

ئەوەی بێ گیروگرفت فاکتەری نەتەوەییە (زمانی هاوبەشە).. راستەو بەس.

(٤٢)

## Kurdish Nationalism کـوردایەتی

گوزارشتێکە هاوتای بزوتنەوەی رزگـاری خـوازی کوردسـتانە، لەسـەر شـێوەی (عروبة)، لە قۆناغێکی درەنگەوە پەیدا بووە، مەبەستی بنچینەو کۆتایی دروست کردنی دەوڵەتێکی نەتەوەییە لەسـەر خـاکی کوردسـتان هـەروەك خـەڵکی تـر، کۆتایـشی دێ بـەرزگاری ئـەگینا دەبێـتە چـەمکێکی رەگەزپەرسـتی، بۆیـە ئـەو زاراوەیە لە هەموان ناسك تر وشیاو ترە بۆ وەرگێڕانە سەلبی، زاراوەیەکی نیـسبی وبە ندە بە بارودۆخ‌و قۆناغی خۆی، هەروەك لە (عروبة)ش وا دەخوێندرێتەوە، لـە کاتێکدا بەسـەرسـوڕمانەوە دەڕواننە هەندێ بۆچونی سـەبارەت بە عروبە بە تایبەتی لەلایەن ئیسـلامیەکانەوە هەروەك ئەنوەرجوندی کە گوایە جیاوازیشی کـردووە لـە نێوان (قومیة )و (عروبة)، قومیـەی ڕەت کردۆتـەوەو عروبەشـی بەسـتۆتەوە بـە ئیسلام*، ڕەنگە ئەوە بۆ قۆناغی خۆی جـوان بێـت بـەڵام ئێـستا بەتایبـەتی بـۆ غەیرە عەرەب گوتارێکی قیزەونە، زاراوەی کوردایەتیش ئاوایە، دەبـی ماناکـانی سنور کێش بکری بە زەمان‌و زەمینی خۆی نەکرێتە دائیم، ئـەگینا وەك ئـەنوەر جوندی و زۆری تر بۆنی ڕەگەز پەرستی لێدێت، لە فەرهەنگەکانی نـازی وفاشـی‌و تۆرانی و بەعسی نەتەوەگـەری دائیمـە، سـەرنج بـدە فەرهـەنگی حزبـی بـەعس

---

* بروانە :معلمة الاسلام -م٢ -العرب والاسلام ص٢٦٠-٢٦٩ (واهاتوە:العرب مادة الاسلام، اختار الله تبارك وتعالي العرب لحملة رسالة الاسلام -ص٢٦٤،..وعلاقة الاسلام بالعروبة هي علاقة عميقة الجذور بعيدة المدى حتى تكـاد ان تكون علاقة عضوية -ص٢٦٠) لێرە جیاوازیەکی ئامێتی لەگەل ناشیونالیزمیەکان .

(الشخصية القومية.. لها قابلية التجدد والإنبعاث وهذا ما جعلها أهلا لحمل رسالة خالدة[1])٠

بەپێی هەمو لێکۆڵەرەوەکان زاراوەی کوردایەتی لە نیوەی سەدەی بیستەم بەولاوە بەو فراوانیە نەبووە، لە شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١ زیاتر پەرەی سەند، لە کاردانەوەی داگیر ودابەش کردنی کوردستانەوە هاتە کایەوە، مێژووی نوێو نزیکی ئەو زاراوە باشترین بەڵگەی ترە کە کێشەی نەتەوەی کورد ناگەرێتەوە بۆ (١٥١٤ز) چالدێران، بەڵکو لە قووڵترین مێژوویدا لە سەدەی بیست تێ ناپەڕێ، (بۆ زیاتر سەرنج بدە زۆربەی سەرچاوەکانی مێژووی بزوتنەوەی رزگاری خوازی کورد - محمد ئەمین زەکی، بلە چ شێرکۆ، د.عبدالرحمن قاسملۆ، جلال تالەبانی، د.کمال مەزهەر، رفیق حلمی، د.شزینی، د.مجید جعفر، جلیلی جلیلی.. هەروەها کورد لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیا، کورد لە بەڵگەنامەکانی ئەرمەنی،،، کتێبە بیانیەکانیش..)، هەتا ئەو زاراوانەی عەرەبیش وەك: عروبة، وطن العربي، قومية العربية، امة العربية، امتي العربية والاسلامية، رأي العام العربي ... لە سەرەتای سەدەی بیستەم هاتووە، مەگەر زاراوەی (امة العربية) کەمێك زیاترو لە چارەکی کوتایی سەدەی ١٩ لەسەر دەستی (نجيب عازوری) هاتە کایەوە لە کتێبێك بە ناوی (يقظة امة العربية)٠

هەر چەندە کوردایەتی زاراوەیەکی تایبەت بە کوردە، بەلام دیسان پێناسەکەی بەندە بەو مەدرەسەیە کە پێناسی دەکا، بەلام بەتێکڕایی لە لایەن کەمایەتیەك نەبێ مانای بیری نەتەوایەتی نەداوە، هەر بۆ زانیاری جگە لە نەتەوەگەری تورك و عەرەب، نەتەوەکانی تری ئیسلام لە کوردو فارس و عەجەمو ئەفغانو چەرکەسو ئەلبانو بەربەرو.. کەمتر خاوەنداری بیری نەتەوەییان کردووە، دوور نیە ئەو دەمارگیریە پەیوەست بێت بە بەهاو نەریتی بەدەویەتو بیابانی، چونکە هەردووکیان (مسقط رأس) یان بیابانیە. هەرچەندە کوردو بەربەرو ئەلبان

[1] تعريفات ببعض المصطلحات -مادة: شخصية القومية

دراوسێی (عەرەب‌و تورک‌و سرب) هەرسێکیان بیری نەتەوەییان تیا پەیڕەو کراوە، بەتایبەتی کورد لە نێوان دوان بووە، ئەویش لەکارداتەوەو لاسایی کردنەوەدا هەندێ توندڕەوی تێکەوتوە لەسەر ئاستی فکر، هەر بە نمونە لە ئەوروپا ئەو پرسیارە گەڵاڵە بوو: کام لە پێش کامەیە؟ ئایین یان نەتەوە، ئیتر لەنێو عەرەب‌و تورکیش ئەو پرسیارە سەری هەڵداو تورکە نەتەوەگەریەکان وەڵامیان بە ئینقلاب لەسەر خەلافەت داوە ، هەریەکە لە ساطع الحصري‌و ملک فیصل‌و زۆری تریش باسیان لەوە کرد کە ئینتمای عەرەبی لە پێش یەهودیەت‌و مەسیحیەت‌و ئیسلامیش بوە، بە هەمان شێوە ابراهیم احمد بە شیعر دەڵێ: لە پێش دیانەتاو لە پێش عیسی‌و موسی‌و محمد ئێمە هەر کوردین‌و هەر کورد دەبین، ئەوەش زیاتر کاردانەوەی داگیرکاریە، جگە لەوانە چەمکی کوردایەتی لەوەدەمە مانایەکی مرۆڤانە دەدا:

١- بۆ مەبەستی رزگاری نیشتمانی نەك رزگاری- نەتەوەیی.

٢- هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لە کوردستان دەژین لە تورک‌و مەسیحی عەرەب .. نەك تەنها کورد، هەر بۆیەش بواری هەموو مەدرەسە جیهانیەکانی فکری‌و سیاسی هەیە بە ئەستۆی بگرن، هەتا ئیسلامیش.. ئیتر ناسنامەی جەوهەری کوردایەتی زیاتر نەکەوێتە سەر ئەو مەدرەسەیەی کە بە ئەستۆی دەگرێ... ئەگەر بێ مەدرەسەش بوو، ئەوا کوردایەتیەکی ڕەگەزپەرستی لێ دەردەچێ.. کە کەمتر بووە تا ئێستا، بەڵام هەڵگرانی فیکری ئەو مەدرەسانە بەتایبەتی مارکسی‌و ئیسلامی کەمتر توانیان ئەو دوو چەمکەی (کوردایەتی‌و مرۆڤایەتی) پێك ببەستن بۆیە ماوەیەکی دوورو درێژ (حزبی شیوعی عێراق) کوردستانی نەبووە، تا (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان) لە شۆڕشی نوێدا کۆتایی بەو قەیرانە هێنا، دوایی حزبی شیوعیش بووە کوردستانی، هەروەهاش لە ریزی ئیسلامیەکانیش هەتا (رابیتەی ئیسلامی‌و دواییش بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستان)، ئەو قەیرانەی کۆتایی پێ هێنا ئێستا (یەکگرتوی

ئیسلامیش..)- کە عێراقـی بـوو- بـووە کوردسـتانی.. پەیوەندیـەکی روون و راستەوخۆ تر لە نێوان کوردایەتی وەك تەوەرێکی وەختی، دەڤەری، شاقولی، ..و مرۆڤایەتیش وەك تەوەرێکی دائیم، جیهانی، ئاسۆی.. دۆزرانەوە،کـە بریتیـە لـە تەوەری:

١- رزگاری- نیشتمانی.

٢- رزگاری-کۆمەلایەتی..

کە لە دوایی زیاتر باسی دەکرێ..

نەزانینی پێناسی کوردایەتی لەسەر ئەو بنـچینەی سـەروو تـا ئێـستاش تـەك نەتەوەگەری عەرەب هەتا هەندێ لە ئیسلامیەکانیش نەیانتوانیوە تێی بگەن کـە ئەوە (انفـصالی)و (تعـصب القـومی) و.. نیـە، بەهـەمان شـێوەش مەدرەسـەی شیوعیەت لە دوو لا ناوەرۆکی ئەو زاراوەیەی پێ هەرس نەدەکرا، لە لایـەك هـەر بنەماکانی ماکسیزم ناخێوێتە بەسیاسی کردنی نەتەوایەتی و نیـشتمانی، بۆیـەش دەبینین (حشع) زۆر لەو کوردایەتیـە مورتـاح نـەبووە تـا ئـەو دواییـەش لەسـەر دیوارەکانی کوردستان وەك دروشمێکـی چەپی هاوچـەرخ دەنووسـرا: (کوردایـەتی شەرمەزاریە)، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ رابەکـەی (منـصور حکمـت) (ناشـیۆنالیزم شەرمەزاریە)، لەوێش بۆ مارکسیەتی رەسەن کە دەڵێن،(بەرژەوەندی کرێکاران لـە سەرووی هـەموو بەرژەوەندیەکـەو.. نەتەوایـەتی دوورووییـە)، هـەر بۆیـەش ئـەو ئەزموونەی (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردسـتان-کە مارکسی بوو) تەواو سەرکەوتوو نەبوو، چونکە بەشێکی گرنگی لێی جیابوونـەوە بـەناوی (عێراقـچێتی)و دیـسان کوردایەتی و کوردستانیان پێ بەند نەدەکرا بە مرۆڤایەتی و مەبادیئەکانی رزگـاری کۆمەلایەتی.

ئەو زاراوەی (کوردایەتی) زۆر بەندە بە مێژوویەکی نـوێی سـەدەی بیستەم و زاراوەی (کوردســـتان)و کۆمـــەڵێك ســـەرکردەی وەك (شـێخ عبیداللـە، شـێخ عبدالسلام، ملا سلیم، شێخ سەعید، سمکۆی شکاك، شێخ مـەحمود، سـەید رەزا،

قازی محمد، ملا مصطفی بارزانی، د.قاسملو، عبدالله ئۆجەلان، جەلال تالَەبانی، مەسعود بارزانی، ..)، هەروەها بابەتی تری وەك (کورد لە مێژوودا، سەرهەڵدانی کێشەی کورد، بەرپرسیاریەتیەکەی، بەردەوامی مەینەتیەکەی، حزبە کوردستانیەکانیان، چارەنووسی، ..)

هەروەها ئەو ڕووداوانەش:

١- دارمانی خەلافەت.

٢- سەرکەوتنی هاوپەیمانان.

٣- هاتنی بیری عەلمانی —نەتەوەگەری.

٤- سایکس پیکو...

بەلاَم لە پێش ئەواتەو بۆ ئەوەی لەو بابەتانە بگەین زاراوەی (کوردستان) دەخەینە پێش.

## (٤٢)

# کوردســتان Kurdistan

ئەگەر چی لە بنەچەدا زاراوەیەکی جوگرافییە، لە هەرە بەرزترینی دەبێتە زاراوەیەکی کۆمەڵایەتی، بەڵام لەو سەردەمەی کە لە لایەن وڵاتانی داگیرکاری کوردستانەوە نکوڵی لە بوونی کوردو کوردستان دەکرێ، بووەتە زاراوەیەکی سیاسی لە نووسینو هۆنراوەو بابەتی سیاسیدا، هەروەك لە هەمو جیهان فەرهەنگی داگیرکەرو داگیرکراو لێك جیایە، بگرە پێچەوانەش، لەلای داگیرکەر (خەباتی رزگاری-تەخریبو ئیرهابە، کوردایەتی-عەمالەتە، حزبایەتی خارج القانونە، شۆڕش عصاتە، .. بەڵام لای ئەو جاشو خائینو خۆفرۆش- صف الوطنیة.. بە فەرهەنگی داگیرکەر (کۆسۆڤۆ)یە لای خۆیان(کۆسۆڤا)یە، لەلایەن ئیسپانیاوە دوورگەی ئیخلیایە، لە لای مەغریب لەیلایە، لەلای بریتانیەکان (کیبك)ە لەلای فرنسیەکان (فرنسای نوێیە)، لەلای تورك قوبرسە لەلای یونانی کیریاکە ..بەو شێوەیە لەلای ئێمەش کوردستانە، لە لای داگیرکەر شمال العراق یان جنوب شرقی ترکیا، لە لای ئێران کەمتر چونکە ئوستانەکە بەناوی کوردستانە.

لەڕووی یاساییەوە ناوی کوردستان بەلگەیەکی تری پێگەیشتنی پەیوەندی یاسایی نێوان هەرێم وگەل ودەسەلاتی سیاسیە،بۆیە ئەوناوانەی کە گوزارش لە ناوی مێژوویی نەتەوەکەی دەکا ناسنامەیەکی ئاشکراو زەقتری هەلگرتووە لەو ناوانەی ئەو گوزارشتە ناکەن وەك عیراق بە نموونە کەناوێکی عەرەبی نیە فارسیە، بەمانا پەیوەندی هەرێمی عێراقو گەلی عەرەبیو دەسەلاتی سیاسیەکەی

بێبنچینەیە، پێش ئەوەی لە مێژوو ئەو ڕاستیە دەرکەوێ لـە خـودی ئـەو ناوانـە دەردەکەوێ.

وەك روونـە (سـتان) بـەزمانی نـاری (جێگـە) دەگرێتـەوە، وەك هندسـتان، پاکستان، قەبرستان، دارستان، .. بەپێی هەندی سەرچاوە (ستات)ی ئەوروپی کـە دوای مانای دەوڵەتی وەرگرت لەو ستانە هاتووە، لـە بنەچـەدا کوردسـتان واتـە نیشتمانی کورد، بەڵام ئێستا لەو مانایە فـراوانترە، کـە دەگـۆترێ (کوردسـتانی) تەنها کورد ناگرێتەوە، هەرچی لەسـەر ئەو خاکە لە کـوردو تورکمـانو ئاشـوریو عەرەبیش دەگرێتەوە..

یەکەم جار سوڵتان سنجاری سەلجوقی (سەدەی ٥-٦م) لە رووی ئیداری ناوی لە ناوچەکانی کرمانشا تا کوردستان، یەکەم جاریش لەنوسینی فـەرمی لـەکتێبی (نزهة القلوب)ی ابن المستوفی لە سەدەی ١٢ هاتووەو وەسفی کوردستانی بـە ١٦ هەرێم کردووە،کەچی بەشێکی تر دەڵێن لەپێش ئەویش ئەو ناوە هەبووە، بەڵام بـۆ یەکەم جار هەرلەسەر نەخشەی ابن مستوفیش ١٣٣٩م کوردستان تۆمارکرا، بـۆ یەکەم جاریش لە سـەردەمی عوسمانی کوردستان وەرچـەرخا بـۆ نـاوێکی ئیـداری وسیاسیو ئابوورە ئیالەتیش .

ئیتر نیشتمانی کوردان عێراقو کوردستان نیە پێکـەوە.. ئـەوە یەکێکـە لـە گێروگرفتەکانی نێوان داگیرکەرو داگیرکراو.. عێراقێکی سنور دەستکردی سایکس بیکۆ ١٩١٦ نابێتـە بـەدیلی نیـشتمانی، ئـیتر وشـەی لێکـدراوی (کوردسـتانی عێراق-کوردسـتانی ئێران..) هەڵەیە، هـەتا کوردسـتانی خـواروو یـان سـەرووش تەواو دروست نیە کە جار وایە بەبـەدیلی ئـەو ناوانـە بـەکاری دەهێـنن، چـونکە کوردستانێکی (پارچە پارچە نەکراو) زۆر لـە پـێش ئەوانـە بـەناوو ناوەرۆکـەوە هەبووە، مێژووی تورکیا زۆر روونەو ناوێکی (بیدعە)ی نوێیە، بەڵام ناوی عێـراق کەمێك مشتو مڕی لەسەرەو گوایە کوردو عەرەب بە هـەزاران سـاڵە بـران لـەو نیشتمانە! ئەوەیان گوتاری داگیرکەرەو.. راسـتە بران، بـەڵام لـە عێـراق هاوبـەش

نێو یەك نیشتمان نیە.. بۆیە لاباسێکی راست کردنەوەی بۆ تەرخان دەکەین بەخێرایی..

١ -لەسەردەمی خەلافەتی ئیسلامیو ئیمپراتۆریەکان بەگشتی ویلایەتەکان لەسەر بنچینەی نەتەوایەتی نەبووە، زیاتر لەسەر بنچینەی ئیداری یان جوگرافی بووە، هەتا لەسەردەمی مەشروتیەی عوسمانیش سەرنج بدە مادەی (٧١)ی دەستووری عوسمانی، بۆیە نەك کوردستان هیچ لە نیشتمانێکی نەتەوایەتی ویلایەتێکی سەربەخۆی نەبووە.. هەر بۆیەش هەتا لە کوردستانیش -کە لە میللەتانی تر زیاتر سەربەخۆییان هەبووە بەتایبەتی لەسەردەمی خەلافەتی ئیسلامی هەتا سەدەی بیستەمیش.. میرنشینەکانی کوردیش لەسەر بنچینەی نەتەوایەتی نەبووە یان خێڵەکی یان جوگرافیو بنەماڵەیی بووە.

٢- نەك کوردستان ئێستا واتێ بینی دەکرێ زۆربەی داگیرکەران نەتەوەی رەسەنی ناوچەکە نەبوونە، بەڵکو داگیرکراوەکان رەسەن تر بوونە[1]، باسك نەتەوەی ژێر دەستی ئیسپانیاو بەشێکیشی لە دەست فەرەنسیە، کەچی لە هەمو ئەوروپا مێژوویان قوڵترە، بەهەمان شێوە بەربەریەکان بەرامبەر عەرەبو ئەفریقیەکان، تامیلیەکان بەرامبەر سەنهالیەکان لە سریلانکا، هەروا تبت، کشمیر، فەڵەستین، دانیشتوانی رەسەنی هەردوو ئەمریکاو ئوسترالیا، کورسیکیەکان بەرامبەر فەرەنسا، ئێرلەندیەکان بەرامبەر ئینگلیز، هەتا ئەسیوبیاش شارستانیەکی کۆنی هەیە کەچی تگری لەوێ رەسەن ترە ... بەهەمان شێوەش کوردستان بەرامبەر ولاتانی وەك عێراقو تورکیا..، ناویشی لە پێش ناوی عێراقو تورکیاو.. هەبووە،بەو شێوەیە ناوی کوردستانیش بەو مانا نیشتمانیو سیاسیەی ئێستای نەبووە، زیاتر بەناوچەی سنە وتراوە، بەلاّم لە نەخشەکانی کۆنی ئیسلامیو جهانی وەك: هیرۆدتس (سەدەی ٥، ٥پ ز )

---

[1] ئەوەش هەر نیشانەیەکی ئاشکرای بێ دادگەری جیهانە کە لە قورئان وەسفی دەکا (إِنَّ الْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوا أَعِزَّةَ أَهْلِهَا أَذِلَّةً وَكَذَلِكَ يَفْعَلُونَ).

وتیرانتۆس( ١٩٦ پ ز).. بە میدیا گوزارشیان کردووە، ئیبن حۆقـل (٩٧٧ز)بـە بلاد الجبال گوزارشی کردووە، ابن مستوفی ( لە سەدەی چاردە) ڕاستەوخۆ ناوی کوردستانی لەسەر نەخشەجیهانیەکەی خۆی تۆمـار کـرد، کەچـی ناوی عێـراق‌و ئەوانی تر یان نەهاتووە یان لە سەرووی بەسرەو بەس[1].

٣- خاکی کوردان (یـان کوردەسـتان) هـەتا سـەدەی بیـستەمیش واتـە هـەتا کۆتایی خەلافەتیش پانتاییەکی فراوانی هەبوو، نیشتمانێکە لـە عێـراق‌و تورکیـا گەورەترە، هەر چەندە ئامارێکی نوێ‌و وردی پانتای نیە چەندی بـەرەسمی وتـراوە زۆر زیاترە، بەپێی ئەرهەنگی (کوردستانی -گیوی موکریـانی )٤٠٠-٥٠٠کـم[2]، بەپێی معجم البلدانی یاقووت الحموی وابـن بەتوتـەو نەخشەئیسلامیەکان وتـا شەرەفنامەو سیاحەتنامەو بەندی ( ٦٣)ی ڕێکەوتنی سیڤەر.. هاتووە یان ئەوەی لە (محمد امین زەکی بەك-کوردو کوردسـتان)، هـەتا لێژنـەی (ناوبـژی ویلایـەتی موصـل)یش..، لە نووسینەکانی (ابن خلدون)یش ناوی (جبل حمرین)ی ئێـستا بـە (جبل الاکراد) هاتووە، لە شامیش جبل الاکراد، حـصن الاکـراد، زۆرن هـەروەك (جۆرج حنا)ش دەڵـێ: بـوونی کـوردی لێ بـەهێز بـووەو زۆر لـە ناوەکـانی شـام کوردین[2]، بۆیە ئەو سنورەی لەهەندێ نەخشە بە زیادەڕەوی دەردەکەوێ بنـچینەی خۆی هەیە، ئیبن بەتووتە کە لە بەسرە بەرەو شیراز بەڕێ کەوتووە لە ڕێگا میوانی خێڵە کوردەکان بووە وەك خۆی باسی دەکا، یاقووت الحموی باسی نـاکۆکی کـورد وچینێکی تر بە ناوی (اهل الجامعە) لە ناو حیللە دەکا، بۆیە کووفە نـاوی عـراق العجم بووە خۆ هەتا کۆتایی سەدەی ١٩ لە ناو بەغداش هەسـت بـە شـوینەواری عەرەبی نەدەکرا تەنانەت ڕۆژی یەك شەم پشوودان بووە[3]، ئیتر سنووری کوردستان لە سەروو دەگەیـشتە نزیـك ئـاراراتو بـەرەو شـام وقـەراغ دەریـای ناوەڕاسـت،

---

[1] بۆ زیاتر بڕوانە:أ-نەخشە کۆنەکانی ابن حوقل، ئیستخاری.. تا دەگاتە نەخشەکانی هیرۆدتس‌و بەتلیموس، ب- (أطلس حضارة الاسلامية) ل٢٤٥- نەخشەی ئیدریسی-ل١٧١٧.

[2] قصة الانسان-جورج حنا ل٩٥.

[3] بڕوانە الاسلام والعلمانية واثرهما في نشاة الدولة العراقية الحديثة

دەهاتەوە فرات بەرەو بەغدا بو نزیك كەنداو لە رۆژهەڵاتیش تانزیك هەمەدان و تەورێز، ئەو سنورە پانو بەرینە كوردستان بووە هەتا سەردەمی خەلافەت بووە، كە عەلمانیەتو بیری نەتەوەیی لەجیاتی خەلافەتی ئیسلامی هات لەسەرەتای سەدەی (٢٠)، ئنجا كوردستان بچووك كرایەوە تا ئەوساتەش بەردەوامە..

٤- لەو وڵاتانەی كێشەی نەتەوەیی هەیە هەمو ئەو سنورە بەو ناوانە دەستكردو نوێن*، ئێرلەندای سەروو ناوێكە لەساڵی ١٩٢٠ بۆ ١٩٢١ بەفەرمانێكی بەریتانیا (٦) هەرێمی لە ئێرلەندەی گەورە جیاكردەوە ناوی نا ئێرلەندای سەروو كە تیایدا زۆرایەتی پرۆتستانتی ئینگلیزی مسۆگەركرد، .. لەساڵی ١٩٧٢ ناوی سریلانكای لێ نرا كە جاران زیاتر بە (سیلان) ناو دەبراو سری لانكا بە مانای (زەوی درەوشاوە)، (٢٢) سەدەیە زیاترە تامیلیەكان لەوێن كەچی لەو سەدەیە بەو سنورە دەستكردو ڕابوونی نەتەوەیی بوونە كەمایەتی، (بۆ زیاتر سەرنج بدە ئەو ناونەسڵی ئەو وڵاتانە لە بابەتی (نەتەوایەتی) ل٥٢).

ئەو وڵاتانەی كە كێشەی نەتەوەیی هەیە وەك ئیسرائیلو فەلەستین، بەربەرو جەزائیرو مەغریب، بەلقان، كشمیر، كۆمارەكانی سۆڤیەت، ..هتد، زوربەیان ناونیشتمانی خویان رەسەن ترە لەو وڵاتەی پێیەوەی لكاوون، بەهەمان شێوە نێوانی كوردستانو عێراقیش، بۆیە پێویستە كەمێك زیاتر لەسەر ئەسڵی عێراق بوەستین:

● موسوعة التأريخ الاسلامي-ب٧، ل٦٢ دەڵێ:.. كما يشمل أرض السواد و هي التي تسمى العراق والتي تضم جزء الجنوبي من العراق الحالي، وكانت جزء من بلاد الفارس.

● مختار الصحاح-الرازي: ناوی عێراق فارسیة، عەرەبی نیە.

---

* هەندێكیان هەبوینە لەوانە یۆنان كەلە بنەچەدا لە ناوی ئەیونس هاتووە، هەروەها ئەسیوپیاش لە لایەن هیرودوتس ئەوناوەی لێنرا بە مانای وڵاتی دەم وچاو سوتاو چونكە یەكەم جار كەبینران وایان زانی ئەوە دەم وچاویان سوتایە بۆیە ئەوەندە ڕەشن .

- (موسوعة المصطلحات العلم والاجتماع والسياسة في الفكر العربي و الاسلامي) هاتووه: له بارەی مانای (أرض السواد).. بەو بەشەی سەرووی (جزیرەی عەرەب) وتراوه (سواد)، چونکه بینیان که لـه (جزیرة) زەویەکی سپی بەیار، بێ دارو درەختو گیا، لەدەست کیسرا بوو، دوایی ناوی لـێ نرا عێراق به مانای زەوی ڕاستو بێ دۆڵو بڵندایی و شاخ و داخ..
- (الاحكام السلطانية-أبو يعلي الفراء الحنبلي): (سمو عراقا لأستواء أرضيه خلت من جبال تعلوا وأودية تنخفض، والعراق في اعلام العرب هو: الاستواء).
- لسان العرب: بەمانای شاری شاهنشاهیەکانو ناوێکی فارسی تەعریب کراوه، جارجاریش بەمانای لیواری دەریا هاتووه.
- المنجد: دەڵێ بەو زەویە خوێیاوییەی بێ گژوگیا وتراوه عێراق.
- له نەخشه کۆنەکانی ئیسلامی (ئەلبیرۆنی، ئیدریسی، مسعودی، ..) یان ناوی نەنوسراوه یان له سەروی بەسرەو خوارووی کووفه عێراقی عەرەبی بوەو باقیەکەی تر عیراقی عەجەمی بووه، لەسەر نەخشەکەدیاری کراوه، (سەرنج بـده: الاسلام والعلمانيـة واثرهما في نـشأة الدولـة العراقيـة الحديثـة، وه هەروەها: اطلس الحضارة الاسلامية).
- له هەندێ سەرچاوەی تر وتراوه عراق العربي و عێراق العجمي: مەبەست لێی عراق العربي بەسرا بووەو عـراق العجمـيش لـه کووفەرا تاسەروو بۆ پاتتایی خاکی فارس بووه. (له سەرچاوەکان: مختار الصحاح-الرازي، أطلس حضارة الاسلامية، الملل والنحل، سیاحەتنامه، شەرەفنامه، لسان العرب، قاموس المحيط، ...ناوێکی فارسیه له ئەراك هاتووه بـەمانای شـاری شـا، لەراستیدا زوربەی هەرەزوری شارەکانی ئێراقیش فارسی بوویتـه نـەك هـەر بەغداو سامرا هەتا موسلیش ناوی ئەسلی ئەو نەردەشیره، بابل یش لـه بافیلی فارسی هاتوه، الحديثة ناوی نودێ بووه[1]...).

[1] بروانه : الاسلام والعلمانية واثرهما في نشأة الدولة العراقية الحديثة .

• لەنەخشە کۆنەکانیش تاسەدەی بیستەم کەمتر ناوی عێراق هاتووە ئەو ناوچەیە زیاتر بە میزۆبۆتامیا* هاتووە لە نەخشەکانی یانی، لەنەخشەکانی ئیسلامیش ئەگەر هاتبێت بەبچووکی لەنزیك بەسرە، لەهەموان ڕوون تر لەنەخشەی ابن الحوقل هاتووە لەچوارگۆشەیەکی بچووکی نزیك بەسرە ئاماژەی پێکراوە، ئەگینا لە هەموو ئەو نەخشانەی کتێبێکی وەك (تاریخ العالم DTV-) تاسەدەی بیستەم ئینجا ناوی عێراق هاتووە.

بەو شێوەیە عێراق بەو سنورەی ئێستای کە هەرگیز نەگەیشتۆتە بەغداو هیچ ڕەسەنایەتیەکی مێژوویی و ئاینی و جوگرافیشی نیە، هیچ بنچینەیەکی نیە بۆ ناسنامەی هاوبەش، بۆیەش هەزاران ساڵو بگرە دەیان ساڵیش نیە کوردو عەرەب گوایە بران تیای.. لەو کاتەی عێراق دروست بووە وەك (جمکێکی) دڕدۆنگ هەردوو جمکەکە لە ئازار دان، ئاواش هەردوو نەتەوە خۆشیان لێك نەدیوە بەتایبەتی خەڵکی کوردستان ڕووبەڕووی کۆ کوژی و وێرانی و جەرگ بڕین و کیمیایی و ئەنفال و پاکتاوی ڕەگەزی.. بوویتەوە..نەخشەی وڵاتەکەی دووچاری بچووك بوونەوە بووە، دووبران -لە بەش کردنا- لەبارە هەرە باشەکەی ئەوەیە ئەوان لە خواروو هەتا سەربانی بۆ خۆیان و بەشە زۆرەکەش کە لەسەربانی هەتا ئاسمانە دەدەنە کورد!.

مام هەژاریش دەڵێ:

| | |
|---|---|
| بە فەرموودەی ئەو لە ژینا | هاوبەشین لە شایی و شینا |
| شین بۆ منو شایی بۆ ئەو | من ئەبێ لەبرێم ئەو قەڵەو |

---

* هەندێ سەرچاوەی کوردی مەزەندەیان بۆ ئەوە دەچێ،کە میزۆبۆتامیا لە جزیرەو بۆتان هاتبێ، ئارادەیەك بۆدەچێ چونکەئەو ناوە لەلایەن یۆنانیەکان بەو ناوچەیان وە نرا، ئەوانیش زیاتر لەو ناوچانەی جزیرەو بۆتان بوون،هەڵبەتە ئەو ناوە پەیوەندی بە (بلاد مابین النهرین)ـیە کە لە لە ئەوراتیش بە ئارام نهرین هاتووە، بەڵکو ناوی (مابین النهرین)یش لە بنەچەدا بەپێی معجم البلدانی یاقووت حموی لە (میان ڕۆزانی)ـەوەجەمی هاتووە .

لەسەر ئەو بنچینە نەتەوەی سەردەست بانگەوازی (عێراقی مەزن )و (یەکیتی عیراق)و (ابناء بلد الواحد )..دەکا

ئەو سنورە دەستکردەی (سایکس-بیکۆ١٩١٦)* ئەك هەر جەرگ برینی کوردە، هەتا نەتەوەگەریەکانی عەرەبیش بەنارەوایی دەزانن بۆیەك خستنەوەی هەموو عەرەبو بە سنووری دەستکردی دەزانن، ئیسلامیە کانیشیان زۆر بە خەست تر، بۆیە لەیەك کاتدا ئینتمای تاك بۆ دوو ئیشتمان نابێت، ئیشتمانی راستەقینەی خەلکی کوردستان عێراق نیە، کوردستانە، مادام ئیشتمانی لەسەر بنچینەی فاکتەرە شاقولیەکانی بناسرێت، هەرکاتێ فاکتەری ئاسۆییش بووە بنچینەی پێناسی ئیشتمان ئەوا ئەو ئیشتمانە وەختیانە بەو مانایە نامێنێت ودەبێتە هەموو جیهان یان وەك زاراوەی ئیسلامی پێی دەووترێ (دار الإسلام).

## مێژووی کورد:

مێژووی سیاسی هیچ نەتەوەیەك لەسێ سەدە تێ ناپەڕێ، ئیتر باقی مێژووەکەی تری نەتەوەیی نیە، بۆیە پشکنینو گوشینی رووداوە مێژووییەکانی نەتەوەیەك بەدوای رەگەزی سیاسی تیایدا زۆر قورسە، دەتوانرێ ئەو مێژووە لەسەر بنچینەی جوگرافی زیاتر دیاری بکرێت، (واتە رووداوەکانی ناوچەکە نەك فلان نەتەوە).

بەگشتی لە پێش ئیسلام ئەو مێژوانە زۆر لێلن، ئەگەر چی چەند شارستانیو کیانێکی سیاسی لەناوچەکە هەبووە، هەریەکە لە : هێرۆدۆش،، ستراپۆ زەینەفون..لە دوای ئەوانیش زانایانی ئیسلام باسی کورد زەمانیان کردووە.. ئەوەی بەروونی دەردەکەوێ کورد لەسەر ئەو خاکەی کۆنترین میللەتێکە ئەك لەسەر ئاستی ناوچەکە هەتا لە هەمو جیهانیش..

---
*

بەپێی سەرچاوەیەکی زۆر (مـنادەم) لـە دەوروبـەی (هیمالایـە) دابـەزیوە[1]، نـەوەکانی بـەو جیهانـە پـەرتو بڵاوبوونـە، تـا تۆفانەکـەی (مـنـوح) دیـسان ئادەمیزاد کۆتاییـان هاتـەوە، چـونکە تۆفانەکـە سەرانـسەری جیهـانی گرتبـۆوە هەروەك لە کتێبە جیاجیاو سـەرەکیەکانی جیهـانی کـۆن دەردەکـەوێ: قورئـانی پیرۆز، ئینجیل، مانۆیهندی، چیـمالپۆکی مەکـسیکی، کتێبـی پـیرۆزی هندیـە سورەکانی ئەمریکا، پۆپۆڵ ڤۆنخ، زەندە-ئاڤێـستا، .. هەروەکـە لـە ناوچـەکەی خۆیان دەنگـو باسی تۆفانەکەیان لەیـەك کاتـدا نـەقڵ کـردووە[2]، لـەو بارەیـەوە (معجم دیانات‌و أسـاطیر العـالم)یش دەڵێ: ئەو تۆفانە لە بەسـەرهاتەکانی یۆنـانی کۆن، ئـەمریکاو هنـد.. بـاس کـراوە لەیـەك سـەردەم، هـەمووش گێرســانەوەی کەشتیـەکە بۆ (جودی) دەگێڕنەوە. هەرچەندە بەشێك لەوانـە د.أحمـد سوسـە لـە کتێبی (حضارة العربیة)و إمام عبـدالفتاح إمـام لـە (معجـم دیانـات و أسـاطیر العالم)و (موسوعة العربیة المیسرة) بەشێکی تری فەرهەنگە عەلمانیەکان دەڵێن: لە ئەرارات گیر بووە، راست ترین کتێب (أصدق الحدیث)یـش دەڵـێ: کەشـتیەکەی

هەر لەراستیدا مەبەستەکانی سایکس پیکۆ بریتیە لە:١- زامن کردنی بەلفور ١٩١٧ز ٢-پارچە پارچە کردنی جیهانی ئیسلامی ٣-لێکجیاکردنەوەی گەلانی ئیسلام ٤-لاوازکردنی توانای دەولەتو شارستانی ئیسلامی ٥-دروست کردنی دەولەتۆکەی بچووك بچرکی وەك عیراق سوریا وئوردن ..تا هەروا بێتوانا و ناکۆك بن ٦-هەردەم جیهانی ئیسلامی نائارام بێت بەهۆی خستنە ژێردەستی هەندێ لەگەلان بۆ گەلی سەر دەست وەك کورد ٧-بۆ ئەوەی لەرێی تەکنیکیشەوە دواکەوتەو بەکارهێنەر بن نەك بەرهەم هێنەر ٨-تا ئەو ناوچەیە دیموکراسی‌و ئازادی بەخۆوە نەبینی وهەر دیکتاتۆر بێت ٩- هەلبەتە ئەو دابەشیەش تۆمانیکی دەبێتە هۆی لەناوچونی فکرەی دار الاسلام و ئومەی ئیسلامی‌و ..ئیتر هەڵتەکاندنی رابوردوو ١٠- بۆ ئەوەی ئەو دەسەلاتدارانەی لەو دەولەتۆکانە پیلە دیت تواناو گیانی شۆرش وبەرگری ریشە کێش بکا ١- بۆ ئەوەی بە خێرایی زال بن بە سەریاندا لە کاتی پێویست ...

[1] (إبن کثیر)یش لە (البدایة النهایة) ئاماژەیەکی پێ کردووە،هەروەکە لە ابن العباس وطبرانی‌و ابو النعیم‌و ابن العساکر بە هەمان شێوە، بە پێی ئەمروودەش لە هند هاتە خوارێ، رایەکی لاوازیش هەیە دەڵێ لە تایف هاتـە خوارێ، لە (اطلس القران ) دەڵێن لەسیلان –سرندیب) سیلانکای ئیستا هاتە خوارێ‌و ابن بەتوتەش یەکەم جار زیارەتی ئەو مەزارگەیەی کردووە .

[2] بۆ زیاتر سەرنج کتێبی (کۆنترین رووداوەکانی مێژوو)-ئەلکسەندەر گەربۆفسکی.

(مـنوح) له شاخی (جودی) کوردستانی سەروو گیرسایتەوەو جارێکی تر مێـژووی مرۆڤایەتی لەوێ دەستی پێ کردۆتەوە بۆ هەمو جیهان، زۆربەی شـارو دێـیـەکانی نزیك (جودی) نازناوی (نوح)ی پێوەیە، هەتا (شارناخ)یش گوایـە مانـای (شـاری نوحە)و گۆڕی (ح.نوح)و خانەوادەی لە خوارووی جودی یە لە شـام، بـەو پـێ یـە کورد کۆنترین میللەتن لەسەر خاکی خۆیان لەو جیهانەو ناویشیان زور بەچڕو پڕی بەندە بە جردیو خودایی .

له دوای ئەو ڕووداوە تەنها مێژووی میللەتە بـالا دەسـتەکانی وەك: فـارس‌و رۆم‌و ئاشووری‌و یۆنانی و.. ڕونە، باقیەکەی تر زۆر لێڵـە مـادام پەیوەنـدی خـاك وگەل‌و دەسەلاتی سیاسی بەو جۆرە نەبووە، بەڵام بەمـسـۆگەری سـەرۆکی هەنـدێ دەسـەلاتی ئیمپراتۆریەتی کورد بوونە بەرەچەڵەك، ئەوزانیاریانە دەگەڕێنـەوە بـۆ قوولایی ٤٥٠٠ پ.ز، له (لولو، گوتی، ماد، کاردۆخی، کاردوو، ..) هەتا لـەناو فارس‌و دوایش عەرەب، بەپێی هەندێ سەرچاوەو ناوەڕۆکی ئـەو نامەیـەی لـە لایـەن (تـەوزدانی پێنجـەم) بۆدامەزرێنـەری ئیمپراتوریـەتی سـاسـانیەکان (ئاردەشـێر)چـووە دەردەکـەوێ بەرەچـەڵەك کـورد بـووە،، زۆربـەی سـەرەتای شارسـتانیانەکانیش لـە بنەچەدا درێـژکراوەی پـەیامێکی ئاسمـانی بـووە، پـاش ئیسلامیش هەتا دەوڵەتی ئەیوبی‌و میرنیشینەکانی کـوردیش‌و تـا ڕاپەڕینـەکانی سەرەتای سەدەی بیستەمیش بەناوی نەتەوایەتی‌و کوردو کوردستان نـەبووە، وەك هەموو میللەتانی تر قۆناغەکـەی وابـووە، پەیوەنـدی سیاسـی وپاسـایی نـەبووە لەنێوان هەرێم (نیشتمان)و گەل(نەتـەوە) ودەسـەڵاتی سیاسـی وەك ئێـستا، پـێ ناسی کۆن‌و ناوەڕاست‌و ئێستاو داهاتووی نیـشتمان‌و نەتـەوەش گـۆڕاوە، جـاران بنەماڵـە نەتـەوە بـوو، دێیەکـەش نیـشتمان، ئینجـا بـۆ هۆزەکـەو دەڤەرەکـە بە"هۆیە"ئاوزەد کراوە وەك چۆن عەرەب ناوی نـاوە (دیـرە)، ئێـستاش نەتـەوەو نیشتمان لە پەیوەندی ڕاستەوخۆدان کە دەسەڵاتی سیاسی لەسەر دروسـت دەبـێ،

له عەولەمەشدا رەنگە(زەمین) هەموو نیشتمان بێت، یـاخود (دار الإسـلام، دار الاشتراکیة، دار اللیبرالیة، ..).

واته نیشتمان له سنوری جوگرافی دەردەچێو دەبێتـه مەدرەسـەو ئینتمـای مەدرەسـی، جـارێکی تـریش بگەڕێنــەوە سـەر دەسـتوری ئیـسلامو نیـشتمانی ئیسلامی ببێتەوە بنچینەی ئینتمـای نیـشتمانی.. ئـەوەی زۆر روونـە لـە پـێش ئیسلامەوەئەو کوردستانە کەوتبووە نێوان رۆمو فارس هەر جارەی یەکێکیان داگـیری دەکردو سەرانەی زۆرو ئازارو سوغرەو بێگاری.. زۆریان لێ دەکرا.

له رووی کۆمەڵایەتیشەوە هەردوو رێبـازی( مـازدەك)و (مـانی)یـان لـە نێـو بڵاوکرابۆوە، جۆرە دیموکراسـیو لیبرالیەکی کۆمەڵایەتیو جنسـی وابـوو کـەس خاوەنی کچو خێزانی خۆی نەبوو، مافی شەوی یەکـەم ( diving right at the king) بۆ میرو وەکیلەکانی داگیرکەر بـوو، خـەڵکی کوردسـتان لەوپـەڕی بـاری ئابووریو کۆمەڵایەتیو سیاسی خراپ دابوو، پەرۆشی رزگارکـەرێك بـوون، بۆیـە هـەر ئاوبـانگی ئیـسلامو دادگەریەکـەیان بیـست، لـە هـەنگاوێکی دەگمـەنی میللەتانی تر، لەلایەن ژیرەکانی کورد هەر له سالی (١٤-١٦)ی کۆچی (گابـانی کوردی) به نوێنەر چووە سەردانی پێغەمبـەر وو پەیوەنـدی بـە ئیـسلام کـردو رێکخستنەکانی بەنهێنی له کوردستان بڵاوکرایەوە، هەر بۆیەش لـە جەنگـەکانی ئیـسلام لـە کوردسـتان (کـە لـە راسـتیدا دەکـا جـەنگی سـوپای ئیـسلام دژی داگیرکەرانی کوردسـتان)، بە پێی بەڵگەنامـەی راسـت هـۆی تێـشکانی رۆسـتەم ولەشکری فارس بە یەکجاریەدەگەرێتـەوە بوتـەو یارمەتیـە مەزنـەی هێزەکـانی (دێلم)ی کورد دایە پاڵ لەشکری ئیسلام له شەری قادسیە لەدژی ئەو هـەموو زوڵم وزۆریەی فارس کەلە دوای شکستی میدیەکانەوە دەکرا[1]، ئیتر نەك بەرگری نەکرا،

---

[1] بۆ زیاتر بڕوانە : ١- شەرەفنامە ٢-آمجد الاکراد –رزژهەڵاتناس ماستیان دەڵێ:بۆیە دیلم وا بە توندی لە سوپای فارس داو لایەنگری سوپای ئیـسلامی گرت لەتۆڵەی میدیەکانی بابپرانیان کە بەدەستی فارس تیك روخا، بەلام وایێناچی چونکە ئەو روداوەی میدیەکان ٦ سەدە پێش ئەو جەنگە

بـەڵکو پێشوازی لێکـرا، چـونکە ئـەو سـوپایە عـەرەب نـەبوون زیـاتر سـوپای (حمرابوو- سوپایەکەی دێلم لەبەر ئازایی ناوی لێنرابوو حەمرا) لە هەنـدێ شـوێن دەبووە ڕاپەڕین دژی هێزە داگیرکەرەکان کە بـەرگری سـوپای ئیـسلامیان دەکـرد وەك ناوچەی شارەزوور، ئینجا یەکسەر والی ناوچە کوردەکان (والی حـەران و والی جەلولا..) لەو حەمرایە ئەو کوردانە دانران، بۆیە ئـەو شـوێنەوارانەی بـە نـاوی ناودارانی ئەسحابەی عەرەب لەکوردستان گوایە لە جەنگ شەهید بووبن، ڕەنگـە بێ بناغە بن .

(تۆماس بوا) دەڵـێ: شـەڕێکی وا شـایەنی بـاس نـەکرا لـە کوردسـتان، بـە پێچەوانەوە بەخێرایی شارستانیو زانیاری بڵاوبۆوەو شەخسیەتی کوردیش بەهێزتر بۆوە[1]، دەسـەڵاتێکی زۆریشیان پەیداکرد[2]. (سـیر مارك سایکس)یش دەڵـێ: کـورد بە ئاسانی ئیسلامیـان وەرگرت، لە کتێبی (کوردو کوردستان -محمد امین زەکـی بەگ)یش دەڵێ: لە شانزەمین ساڵی هیجریدا تەماسیان لەگەڵ ئیـسلام کـرد، لـە (روح المعانی) ناوی ئەو هاوەڵە کوردانەی تیادایە.

چونکە ئیسلام هێزێکی (وەك ئیمپراتۆریەکانی تر) داگیرکەرو خێرو بێـر خـۆر نەبوو، بەڵکو خاوەن بەرنامەیەکی هەمەلایەنی ژیان بووە، چرایەکی ڕوونـاك لـەو تاریکستانە بوو، مەبەستیشی گەیاندنی ئەو بەرنامە بوو تـا هەرکەسـە حـوکمی خۆی بکات، بۆیە کوردیش لەدوای ئیسلام بوونیان بوونە خاوەنی خۆیـان، ئـەگینا لە دروستکردنی دەوڵەتی ئیسلامی تەنیا (٢٠٠٠) مـسوڵمانێك هـەبوو، بەشـی هەمرو دنیای چۆن کرد.

لـە تەقەلایـەکی زانـستیانە وا پێدەچـێ لـە لایـەن هەنـدێ بـاڵی عـەلمانی توندیشەوە بێت، یان بەپێی هەندێ سەرچاوە بەهاوبەشی لەگەڵ (د.سعید) ئـەو

---

جـــــەنگە بووە، بۆیە زیاتر بەلای ئەوە دەچی کە دیلەو جەنگاوەرەکان سەر بە ڕێکخستنەکانی ئیسلام بووبن لە ڕێی گابان .

[1] تأریخ الاکراد- توماس بوا، ل١٨٨.

[2] هەمان سەرچاوە، ل١٨٩.

كەسەی كە ئاینی مەسیحی هەڵبژاردو بەرنامەی (تەبشیری) لە (مۆنتاكۆ)و (رادیۆی پیرۆز بە زمانی كوردی) هەبوو لە ئەسڵدا خەڵكی سنەیە، .. ئەوانە پێستێكی نووسراویان گوایە لە ناوچەی هەورامان دۆزیتەوە تیایدا باس لە زوڵم و زۆری سوپای ئیسلام دەكا (لە كۆتایی ئەو بابەتە دەقی نووسینەكە تۆماركراوە لەگەڵ تێبینیەكانی شارەزایان..).

باشترین بەڵگەی خۆشەویستی خەڵكی كوردستان بۆ ئەو بەرنامەیەی ئیسلام ئەوەیە:

١-یەكسەر ناوی منداڵەكانیان لەو سەردەمی تا ئێستاش هەموو بووە (محمد، علي، عمر..)، كەچی بەدەگمەنیش ناوی (یەزدەجور) یان (هەرقەڵ) وەك ئێستاش نیە بەناوی (ئەتاتورك)، (صدام)، (پەهلەوی)، (لینین)، (بۆش)، ..

٢-لە كوردستان بەپێچەوانەی جەزیرەی عەرەب دیاردەی هەڵگەڕانەوە نە لەكاتی بەهێزی نە لە كاتی بێ هێزی ئیسلام رووی نەدا.

٣-ئەو هەموو سەركردەو والی‌و هونەرمەندو رەوشەنبیری لێ پەیدابوو.

٤-تا ئێستاش هەم كەلتوورو نەریت‌و ئەخلاق‌و عەقیدەی ئیسلامی لە هەموو كەلتوورو فەرهەنگەكانی جیهانی‌و عەقیدەكانی سۆشیالیستی‌و شیوعی‌و لیبراڵ دیموكراسی بەهێزترە.

٤-تەنانەت لەدوا ساتی هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت،كورد شۆڕشی دژی ئەو هەنگاوە كرد وداوای گەڕانەوەی خەلافەتی كرد،واتە خێری لێ بینیبوو بۆیە هەریەكە لە شێخ عبد السلام وملا سلیم وشێخ سعیدی نورسی وشێخ سعیدی پیران‌و هەتا ئیحسان پاشاش ئەو داوایەی كرد .

بەو شێوەیە كورد مێژووی راستەقینەی بۆ دروست بووە، سەرەڕای بەدكاری هەندێ خەلیفەو والی‌و سوڵتانەكان، بەڵام كورد شەخسیەت‌و دەسەڵاتێكی زۆری پەیداكرد لە بوارەكانی سیاسی‌و ئابووری‌و كۆمەڵایەتی‌و زانستی‌و هونەری‌و

سەربازیو شارستانیو هەتا سایکۆلۆژیو تەندروستیش، تا ئەو رادەیە بۆ یەکەم جار سەرکردایەتی جیهانی کرا لە دەوڵەتی ئەییوبی هەروەك شارەزایانی مێژووناسانی کوردیش هەمان بۆچوونیان هەیە، تۆماس بوا دەڵێ: بە درێژایی خەلافەتی ئیسلام (جگە لە هەندێ دۆخی تایبەت نەبێت) سەربەخۆییەکی بێ وێنەیان هەبووە[1].
بەشی زۆری مێژووی کورد بە رێکەوتن بووە هەروەك: هاتنی سوپای ئیسلام بەهۆی رێکەوتنی کابانو پەیامبەر دوایی لەگەڵ مەیمونی کوڕیدا، دوایش لەگەڵ دێلم، لە سەردەمی ئەمەویو عەباسی لە بارودۆخێکی باش نەبووینە هەروەك زۆربەی میللەتانی مسوڵمان بەتایبەتی بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ لە دۆخێکی تەنگەباری بووینە، سەرەرای ئەوەش بەپێی (الملل والنحل والأعراق) و زۆر سەرچاوەی تر، جگە لە هەندێك دۆخ نەبێ ئەگینا کورد سەربەخۆی تەواو بووە.

لە سەردەمی عوسمانلیش بە هۆی ریکەوتنی شێخ ئیدریسی بەدلیسیو سوڵتان سەلیمی یەکەم لەگەڵ ٢٣ میرنشینی کورد لە ساڵی ١٥١٤، پێك هاتبوو لە (٥) مادە تیایدا هەردوولا یارمەتی یەکتر بدەن لەکاتی پێویست، بە رێکەوتن کوردستان لە شەر لادراو، بووە هۆی دروست بوونی سیستەمی ویلایات و لامەرکەزیشو وەرچەرخانی سەلتەنەتی عوسمانی بۆ خەلافەت، چونکە ئەو رێکەوتنە بووە هۆی داگیرکردنی وڵاتانی عەرەبیو وەرگرتنی بەیعەتی خەلافەت لە (متەوەکیل) لە میسر.

ئەو دۆخە بەردەوام بوو هەتا کۆتایی خەلافەتی ئیسلام لە سەرەتای سەدەی بیستەم، کە کۆمەڵێك گۆرانکاری تریشی لەگەڵ بوود، هاتنو سەرهەڵدانی عەلمانیەتو بیری نەتەوەیی، کۆتایی وەرچەرخانی ئیمپراتۆریەکان بۆ دەوڵەتی نەتەوەیی.. لەوێشرا مەینەتی کوردی وەك مەینەتی نەتەوایەتی دروست بووە.. ئیتر بەردەوام دەبین لەباسی مێژووی کورد لەو مەینەتیەوەو هەم وەك زنجیرەی چەمکەکانیش.

---

[1] توماس بوا: تأريخ الاكراد. هەروەها بڕوانە: الملل والنحل والاعراق.

**دەقی نووسـراوی سەر پێستەکە:**

لە سـەرچاوەی نا ڕەسمی دەست کەوتووە:

**هورمزگان ڕمان ئاتران کوژان**

**ویشان شاردەوە گەورە گەورەکان**

**زۆر کار ئارەب کردە ندە خاپوور**

**گناو پالەیی هەتا شارەزور**

**ژەن و کەنیکان و دیل بشینا**

**مەرد ئازا تەلی دەرووی هەینرا**

گوایە ئەوە بوو لەسەر ئەو پێستە نووسرابۆوە.ئەو پێستەیە وەك باسی دەکەین ئێستا گەیشتۆتە مۆزەخانەی بەریتانیا، وا تێ بینی دەکرێ:

١-بەپێی پسپۆرانی زمانەوانی زۆر وشەی نوێی تیادایە.. بۆیە بە دەستکرد دەچێت وەك ئەو ڕووداوەی (أنسان پلتداون)، کە ویستیان هەندێ ئێسك وا تەزویر بکەن لەگەڵ (تیۆری پەرەسەندنی-داروینی) بگونجێ..

٢-هەمان ئەو بەندانە بەش بەش لە شێنی ژنانی دەرسیم هەیە، لێرە هەندێ ناوی تری (ئارەب)، (شارەزور).. زیادکراوە.. بۆ زیاتر سەرنج بدە کتێبی د.نووری دەرسیمی (دەرسیم لە مێژووی کوردستان)- دەقی هەڵبەستەکە بەلاتینی لە لاپەڕە (٤١) هەیە.

(٤٤)

## Kurdish Calamity مەینەتی کورد

ئەو زاراوەش بە وشە تایبەتە بە کورد، بەڵام بە ناوەرۆك زاراوەیەکی جیهانییە، مەبەست لێی چەوساندنەوەی نەتەوەییە، هەڵبەتە لە پێش تریش لە قوڵایی مێژوو چەوسانەوە هەبووە وەك چەوسانەوەی : چینایەتی، کۆمەڵایەتی، ئاینی، خێڵەکی، رەگەزی، دەسەڵاتو بێ دەسەڵاتی، بەهێزیو بێ هێزی، ..تاد، بەڵام میللەتێك میللەتێکی تر بچەوسێنێتەوەو خاكو وڵاتی لێ داگیر بکاو بە پێی دەستورو یاسای رێکخراو نەتەوەی سەردەستو بن دەست دروست بێت ئەوەیان نوێ یە..، هەڵبەتە پرۆسەی هەڵمەتو داگیرکاریو پەلاماری ئیمپراتۆریو هەتا میرنشینو خێڵەکیانەش زۆربەی پانتای مێژوو پڕ دەکاتەوە، بەڵام دیاردەی چەوسانەوەی نەتەوایەتی لەگەڵ نەبووە وەك لەو (٢) سەدەیەی دوایی جیهانیو بەنسبەت کوردیش لەو سەدەی دوایی، .. بۆیە رستەی گوایە کورد هەزاران ساڵە دەچەوسێتەوە.. هەڵەیە، کە لە لایەن نەتەوەگەریو عەلمانیەکان بێ زانیاری دەگوترێ.. ئەگەر عاتیفیو هەڵچوونانەش بێت راستەوخۆ لە خزمەتی داگیرکەر دەبێت.. مانای وادەدا ئەو دۆخەی داگیرو دابەشکردنی کوردستان نوێو شاز نیەو داگیرکەران بێ تاوان دەکەن بەخۆڕایی! هەروەك سەرۆکی فرنسی وتی خۆ ئیمە لە مەینەتی کورد بەر پرسیار نین، بەڵکو مێژوو بەرپرسیارە، .. نەخێر هەروەك ئێستا زۆربەی میللەتانی جیهان رۆژی رزگاریو جەژنی نیشتمانیان هەیە، ئاواش رۆژو ساڵی داگیرکراویان هەیە..

جا بابزانین ئەو مێژووەی مەینەتی کورد لەکەیەوە بووە، دەست نیشان کردنی زۆر چەمکی بنەڕەتی سیاسیو کۆمەڵایەتیو نەتەوەییش دەگۆڕێو راستی دەکاتەوە.

ئەگەر بەووردی سەرنج بدەینە قەترەی ئینقلابەکەی ۱۹۰۸ بۆ ڕێکەوتنی نهێنی (سایکس- بیکۆ١٩١٦ز )ی لێ بەسترا هەتا ساڵی ١٩٢٤ز کە خەلافەتی ئیسلامی تیادا رووخا، مەودایەکی پڕ لە رووداو وەرچەرخانی گرنگە بۆ هەر کەسێك کە دەیەوێ لە بنەچەو سەرچاوەو زەمان زەمینی "مەینەتی کورد" بگات، کەوتۆتە ئەو نێوانە.. کە باری کورد لەڕووی چۆنایەتیو سیاسیو کۆمەڵایەتیو شەخسیەتی مەعنەویو دەسەڵاتو نەتەوایەتیش، پێشو پاشی ئەو فەترەیە لە جەوهەردا لێك جیایە.. ئەوەش هەر هەمان مانای ئەدرێتی باری کوردە لە پێشو پاش خەلافەت، بۆیە ئەو بەراوردە بە وردتر ئەو رۆژەمان بۆ دیاری دەکا کە کورد تیای کەوتوە..

## باری کورد لە پێشو پاش خەلافەت:

یان هەمان مانای ئەوەیە باری کورد لەسەردەمی خەلافەتو لەسەردەمی عەلمانیەت، بە بەراوردێك زیاتر هۆو لایەنە بەرپرسەکانی ئەو مەینەتیە دەردەکەوێ:

١-بەدرێژایی سەردەمی خەلافەت کوردستان سەربەخۆ بووە، جگە لە هەندێ دۆخ، کە بەهۆی پەناندانی هەندێ لایەنی دژ بەیەك لە دەسەڵاتی باڵای خەلیفە دەبووە هۆی تێوەگلانی کورد، هەڵبەتە ئەوەش مانای ئەوە نیە حوکمی خەلیفەو سوڵتانەکان زێڕینو دادگەریو ئیسلامی راستەقینە بووبێت، نەخێر.. ستەمو ئازاریان هەبووە بەڵام بۆ گشتی بووە، شێوازی ستەمی نەتەوایەتیو دەسەڵاتی نەتەوایەتی نەبووە، عەرەب بەسەر کورد یان تورك بەسەر چەرکەسو عەرەب، .. یان کورد بەسەر عەرەبو تورك و..هتد.

بۆیە (د.س.شاذلی) ڕاست دەکات دەڵێ: (فقد إكتفى معظم خلفاء في دولتين الاموية‌و العباسية بتعبيرات الولاء من قبائل الكردية دون ممارسة حكم المباشر عليهم من دمشق‌و بغداد)[1]؛ کەواتە تەواوو ڕاستە (د.نوری دەرسیمی) کە دەڵێ هەتا ساڵی (١٩٣٦ز) کاتێ عەلمانیەتی تورکیا دەسەڵاتیان گرتە دەست ئنجا بۆ یەکەم جار بەدرێژایی مێژووی خەلافەتی ئیسلامی سوپای بێگانە هاتە دەرسیم[2]، ئیتر بووە سەربازگەی داگیرکەرو مەیدانی کوشتو کوشتارو قڕکردن تا ئێستاش.

کەواتە هەموو بەڵگەنامەکانی مێژوویی کە مێژووی جوڵانەوەی ڕزگاری نیشتمانی کوردستان بۆ سەرەتای سەدەی (٢٠) دەگێڕێتەوە هەماهەنگە لەگەڵ ئەو ڕاستیە، قووڵترین مێژوو لە لایەن (بەڵگەنامەکانی کورد لە بەریتانیا) دەیگێڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٠٨ز، هەشە بۆ پەیمانی سایکس بیکۆ-١٩١٦، بەشێکی تر بۆ شۆڕشی ئۆکتۆبەر ١٩١٧ کە تیایدا ئەو پەیمانەی (سایکس بیکۆ)ش ئاشکرا کرد، بەشێکی تر بۆ ساڵی ١٩٢٤و دەقاو دەق بۆ ئەو ڕۆژەی کە خەلافەت لە ١٩٢٤/٣/٣ هەڵوەشایەوەو دەسەڵاتی عەلمانی هاتە جێی، ئەو هەڵمەتە سیاسی‌و فەرهەنگی‌و کەلتوری‌و سەربازیەی کراهسەر کورد، بەشێکی تریش پێیان وایە لەگەڵ سەربەخۆیی نەتەوە سەردەستەکانی کوردی تیادا هاوبەشەمەینەتی کورد دروست بووکە دەکاتە سەرەتای سەدەی بیستەم.

٢- بە درێژایی خەلافەت بەپێی سیستەمی سیاسی سەردەم دەسەڵاتی کورد هەرلە دەست خۆیان بووە، میرنشین‌و نیمچە ئیمپراتۆریەتیان هەبووە، هەر لە شەدادی‌و مەروانی (لەسەردەمی عەباسی) تا دەگاتە سەردەمی عوسمانلی دادگاو ئیدارەو هەتا سکەی دراویشیان هەبووە، بەزۆری شەریعەتی ئیسلامیشیان پەیرەو دەکرد، بەڵام لەدوای خەلافەت‌و لەسەردەمی عەلمانیەت کوردستان دابەش‌و

---

[1] ملل و النحل و الاعراق ل٢١٨.

[2] مێژووی دەرسیم- د. نوری دەرسیمی.

داگیرکراوە، نەك میرنشین بەلکو ئەگەر ڕێکخراوێکیش هەبوو بێت دەبێ لە کەلێنە شاخەکان بێت و کیمیاوی و ئاگرو ئاسنی تێ گیراوە.

٣- لەسەردەمی خەلافەت هەتا دوا سوڵتانیش دەسەلاتێکی زۆریشیان لە خودی دەولەتی خەلافەت هەبوو، بۆ ماوەی سەدەیەك دەسەلاتی وەرگرتووە، ئنجا پایەی سیاسی بەرزیشیان هەبووە، هەر لە کۆتایی خەلافەت سەرۆکی مجلس أعیان (شێخ عبدالقادر)و سید تەهاش، سەرۆکی ئەنجومەنی شورای دەولەت بووە، بە هەزاران نمونەی تر، سەفیرو وەزیر کورد بووە، (شێخ الإسلام)و سەرۆك وەزیرانی چەرکەس و کوردو عەرەب و.. لەسەر بنچینەی کەفائەتر جارجاریش لەسەر بنچینەی وەلائی شەخسی، بەلام لەسەر بنچینەی وەلائی نەتەوەیی نەبووە، سەرباری سەرکردە سەربازی و.. زاناو پێشەوای ئاینی و زانستی تر.. لەو کوردستانە.. تا ئەو رادەیە زۆربەی والیەکانی شام و میصرو شوێنانی تریش کورد بوونە، تا ئێستاش خانەوادەکانیان لەو ولاتانە وەك چرایەکی رووناك ماون، هەروەك (تۆماس بوا) دەڵێ: دەسەلاتی کورد لە دوای ئیسلام بوونیان ئەوەندە پتەو بووو زیادی کرد دەسەلاتیان دەگەیشتە دەرەوەش[1]، هەروەها لە (ملل و النحل و الاعراق) هاتووە: (وقد ترك سلاطين ال عثمان الشيوخ القبائل الكردية قدرا واسعا من الحرية في إدارة شؤونهم الداخلية و اعفوهم من الضرائب من مقابل تكوين ميليشيات تحرس حدودهم..)[2].

بەلام لەسەردەمی عەلمانیەت لە تێکڕای بەرەکان کورد زەرەری کردووە بە پاشیان خستووەو هاوولاتی نەك پلە دوو، بەلکو جار وایە وەك پێشوولە حساب کراوە.

٤-دەسەلات و (نفوز)ی کورد لەبارە هەرە خراپەکانی خەلافەتیش هەر زۆر بووە، باشترین نمونە.. لە کۆنگرەی (بەرلین)و ڕێکەوتنامەی (سان ستیفانۆ)

---

[1] تۆماس بوا: تأريخ الاكراد ل١٨٨.

[2] ملل و النحل و الاعراق، ل٢١٨.

رۆژئاوا پشتی (ئەرمەنیان) گرتو داوایان لـە خەلافـەت کـرد کـە سـەربەخۆیی‌و مافیان بدات، کەچی ئەرمەنیەکان داوایان لەسەرانی کۆنگرە کرد کـە تـەنها داوا لە سەڵتەنەت نەکەن، داوا لە سەرکردە کوردەکانیش بکەن کـە قایـل بـن نـەگینا سەڵتەنەت بە تەنها بێ کورد ناتوانێ مافمان پێ بدات، هـەروەك لـە بەنـدەکانی (١٦، ٦١) ئەم رێکەوتنە وا هاتووە، سەرنج بدە لەسەردەمی خەلافـەت خـەڵکی تر داوای مافی خۆی لە کورد کردووە، لە دوای خەلافەت‌و لەسەردەمی عەلمانیەت هەر کوردە نەك مافی زمانیشی لێ قەدەغە کراوە کە تەیرو گیـان لەبـەریش بـە زمانی خۆی قسە دەکەن، هـەر کـورد داوای کـەمترین مـافی خـۆی دەکـاو چـی پێ‌کراوە.

٥- هەموو ئەو دیاردانەی تەتریك، تەعریب، چەوسانەوەی نەتەوەیی، زیندانی سیاسی نەتەوەیی، کۆکوژی، پاکتاوی رەگـەزی، دابەشـی کوردسـتان، بەیاسـایی کردنی نیشتمانێکی تـر... هـەموو ئـەو دیاردانـە بـۆ یەکـەم جـار لەسـەردەمی عەلمانیەت لە دوای ساڵانی ١٩٢٠ دەسـتی پـێ کـردووەو بەرەبـەرە لەگـەڵ تـۆخ بوونی عەلمانیەت مەینەتی کوردیش خەست تربووە، بە پێی (توماس بوا-تـاریخ الاکراد)[١] یەکەم جار (انور پاشا) تەتریکی کـردووە، یەکـەم مێـژووی.کۆکـوژیش دەگەرێتەوە بۆ (مصطفی کمال)کاتێ لە خـەربوت گـازی ژەهراویـشی بـەکارهێنا بەپێی رۆژنامـەی (wr-aglu) ژ:٣٨٣ لـە ١٩/٩/١٣، یەکـەم نەخـشەش کـە کەرکوکی لە کوردستان جیا کـردەوە نەخـشەی سـایکس -پیکـۆ ١٩١٦ بـوو، یەکەم تەقەلای تەعریبیش ئینگلیز کردی لە کیشەی ویلایـەتی مرسـڵ لـە دوای ١٩٢٣.

---

[١] تاریخ الاکراد- توماس بوا ل١٩٣.

## مەینەتی و.. ساڵیادی:

مەبەست لێرە دەست نیشانی ئەو زەمسانو زەمینەیــە کـە کـورد وەك نەتــەوە مـەینەتی چەوسانەوەکەی دەستی پیّ کـردووە، بریتیشە لـە مێـژووی بزوتنــەوەی رزگاری خوازی کورد، ریشەی زاراوەی کوردایەتیشە، ..ئەوەی زۆر بەدڵنیاییــەوە هەڵیە ئەوەیە کە دابەشی کوردستانو مەینـەتی کـورد بگێرنـەوە بـۆ جـەنگی چالّدێرانی ١٥١٤ز.. لەگەڵ هیچ پێوانەیەکی مێژوویی‌و نەتەوەیی ناگونجیّ بۆیەش (تۆماس بوا) دەڵیّ هەر لەدوای ١٥١٤ز میرنشینو دەســەڵاتی کـورد زۆر تۆکمـە بوو لە ئیدارەو فەرهەنگو هەتا سکەی دراویشیان هەبووە[١].

هەڵبەتە لە نێوان باری چاکی کورد (نسبیەن) لەسەردەمی خەلافەتی ئیســلامو تێك چوونی ئەو بارە حەتمەن رووداو وەرچەرخانی دیاری کراو هەیە، دەبـی (خـالّی وەرگـەران) بـوویێ لـە ژیـانی ئـەو کوردسـتانە.. ئـەوەی تێبینـی دەکرێـت وەك تویّژینـەوەیەکی زانستی‌و واقعـی ئـەك سیاسـی‌و فکـری، وا دەردەکـەوێ لەگـەڵ هەنگاوەکانی جێگیر بوونی عەلمانیـەت (بەهەمو باڵەکانی چەپی‌و سۆشیالیستی‌و نەتەوەیی‌و لیبراڵ دیموکراسیشەوە..)و دەزگاکانی وەك بیروباوەڕو حزبـی ئیتحـادو الترقی‌و دەستوور(مەشرووتیەت)و پەرلەمان (مەبعوسـان)و رێکخـراوە مـەدەنی‌و هەتا گۆرانی پادشایی بۆ کۆماریش لە زیانی کێشەی کـورد بـووە، بۆیـە بەشـێك مـەینەتی کوردی راسـتەقینە لەبەشـی خـواروو بـە وەرگـەرانی لـە پادشـایی بـۆ کۆماری لە ١٤ی تموز ١٩٥٨ دەزانن، هەر چەندە لەگەڵ دروست بوونی عێراق لـە ١٩٢١ سازدراوە، بۆیە یەکیّ لە هەڵە سـتراتیژیەکانی سـەرکردایەتی عەلمانیـەتی کورد لەسەرەتا تا کۆتایی ئەوەیە، پێشوازیان لە هەموو ئەو هەنگاوانـەی تەقـەلا دەستوریەکەی مدحت پاشا لە ناوەراستی سەدەی ١٩، حزبی ئیتحادوالترقی سـالّی ١٨٨٩، دروستکردنی کۆمـاری عەلمانیـەتی تـورکی لـە ١٩٢٢و هەڵوەشـانەوەی

---

[١] تأریخ الاکراد-توماس بوا ل١٩٣.

خەلافەت لە١٩٢٤، لە دوایشدا گۆڕینی شورا بۆ (مجلس وطني)، گۆڕینی عەقیدەو ئینتمای ئیسلامی بۆ بیری نەتەوەییو ئینتماکەی، .. ئەگەرچی (مەلا مصطفى بارزاني) سەرکردەیەکی عەلمانی نەبووە، بەڵام لە ژێر کاریگەری عەلمانیەتو بارودۆخی ئەوکاتیو دووره وڵاتی وا دەردەکەوێ دڵخۆش بووە بە شۆڕشی ١٩٥٨ تموز، کە ئەوەش بەشێکە لەو هەڵەیەی پێشو باس کرا، چونکە هەمو هەنگاوەکانی عەلمانیەت بریتیە لە زیاتر جێگیر بوونی شەرعیەتی لەو وڵاتانەی کە لە (سایکس بیکۆ) ١٩١٦ دامەزرێنران، ئەوەش بێ دوو دڵی لە زیانی ستراتیجی کوردە، ئەوە توێژینەوەیە (شەرم ناکا) ئەگەر راستی بڵێین هەر هەنگاوێکی ئیجابی بۆ عێراق (یان هەر داگیرکەرێکی تر) (نەك گەلی عێراق) ئەوا ئۆتۆماتیکیەن هەنگاوی سەلبیە بۆ کوردایەتی، ئەوە یاسای پوڵاینی (چارەی خۆنوسی کوردستانە)، کەواتە زۆر روونە لەگەڵ دروست بوونی دەوڵەتی نەتەوەیی بۆ تورکو عەرەب و.. مەینەتی کورد دروست بووە، ئەوەش هەنگاو بە هەنگاو لە دژی خەلافەت دەستی پێکردووە بە زیانی قورسی کوردیش کۆتایی هاتووە بەو شێوەیە:

١- هاتنی دەستوور لەق کردنی شەریعەتی ئیسلامی لە کۆتایی سەدەی ١٩و دروست بوونی لە(١٨٧٦ز).

٢- هاتنی بیری عەلمانی نەتەوەیی لەسەرەتای سەدەی ١٩دەست پێ دەکاو پەیدابوونی شەخسیاتی وەك (ئەنوەر پاشا، جمال پاشا، طلعت پاشا) کە سێ ناوەندی دەوڵەتی عوسمانی گرتبووو وەزارەتەکانی (دەرەوە، ناوەوە، بەرگری)، تا گەیشتە رادەی لادانی عبدالحميد لە١٩٠٩ بە راشکاوانەتر هاتنە مەیدان.

٣- پەیدابوونی اتحادو الترقي لە ١٨٩٩ز.. لە ساڵی ١٩٠٨ز ئینقلابیان کرد.

٤- لە ساڵی ١٩١٦ ریکەوتنی (سایکس بیکۆ) کرا، لە لایەن فەرەنسا.. بەریتانیاو وڵاتانی رۆژئاواو رووسیای قەیسەریش‌و کوردستان کرا (٦) پارچە.

٤- لە سالّی (١٩٢٣) ڕێکەوتنی لۆزان کرا لە نێوان تورکیای عەلمانی و ڕۆژ ئاوا، هەنگاوەکان یەك لا کراوە، سایکس بیکۆ جێبەجێ کرا، خەلافەت لێ خرا، لە جیاتی شەریعەت بووە عەلمانی، کوردیش بێ بەش کرا لە کۆی ١٤٣بەند ناوی کوردی تێدا نەبوو..لە کوردستانی خواروش کرنگرەی قاهرە لە١٩٢١ گرێ درا وعێراقی پێکەوست بوو کورد لەکاروان بە جێما·

٦- ئەو هەل ملانێیەی عەلمانی و خەلافەت لەسەرەتای سەدەی بیستەم و بەلابەلاش لە چاریەکی دوایی سەدەی (١٩) دەستی پێ کرد بوو، دوای جەنگی جهانی ١٩١٨ دەسەلاّتەکان لێك جیابوونەوە، دەسەلاّتی عەلمانی لە ئەنقەرە بوو، دەسەلاّتی خەلافەتیش لە ئەستەمبوڵ، خەلافەت لە بڕیارێك دا مافی هەمو گەلانی دا، کە سەردەمی (دەولەتی نەتەوەیی) هات (هادی پاشا) نوێنەری (سولتان محمد وحیدالدین) بوو لەگەڵ ( شێخ عبدالقادر شەزینی وشەریف پاشا) مۆریان کرد کە سەربەخۆیی بدەنە کوردستان و هەردوو لاش لەگەڵ نوێنەری ئەرمەن (بوغوس پاشا) ڕێکەوتنی سیڤەریان مۆرکرد.. بەو شێوەیە کورد چارەنوسێکی ڕوونی لە خەلافەت دیاربوو بە کەوتن و هەلوەشانەوەی خەلافەت بەتایبەتی لە ڕۆژی ١٩٢٤/٣/٣ز بە دواوە کە بووە هۆی سەرکەوتنی عەلمانیەت بەیەکجاری بەسەر خەلافەت، دەستوری بەسەر شەریعەت، بیری نەتەوەیی، بەسەر عەقیدەی ئیسلامی، عەوام بەسەر ئومەت، ئەنقەرە بەسەر ئەستەمبوڵ، .. لەگەڵ شکستی ئەو بەرەیە'کوردیش شکستی هێنا.. ئیتر هەلّمەتی کوشت و بڕو داخستنی ناوەندو مونەسەسە زانستی و فەرهەنگی و سیاسیەکانی کوردیش کە زۆربەیان لەژێر دەسەلاّتی خەلافەت بوو تار و مار کران و پەلاماری سەربازی و کۆکوژی (مصطفی کمال) دەستی پێ کرد و هەتا ئەو چەند ئەندامانەی کوردی لایەنگریشی لە سێدارە دان، .. ستەم و چەوسانەوەی نەتەوەیی کوردستان لەو ساتیەوە دەستی پێ کردو.. تا ئێستاش بەردەوامە.. کە پێی دەڵێن (مەینەتی کورد).

## هۆیەکانی مەینەتی کورد:

پوختــــە:

لەبارەی شادنەبوونی کورد بە دەوڵەتو مافی چارەی خۆ نووس زۆر هۆی جیاجیا باس کراوە، لەوانە:

١- داخراوی کوردستان. ٢- نەکەوتنی سەر لێواری دەریا. ٣- نەبوونی مەڵبەندی بازرگانی. ٤- پێکهاتەی کۆمەڵایەتی. ٥- ناوشیاری. ٦- هۆیە مێژووییەکان. ٧-کەوتنی لە نێوان دوو ئیمپراتۆریەتی گەورەی وەك عوسمانیو سەفەوی. ٨-دەوڵەمەندی کوردستان لە نەوتو کانزاو داهاتی تر. ٩- بوونی وەك نەتەوەیەکی ئیسلامیو قینی ڕۆژئاوا لە دژی بەتایبەتی لە تۆڵەی گورزەکانی سەلاحەدین.. لەگەڵ زۆر جۆر هۆی تر باس دەکرێ.

ئەوەی ئەم توێژینەوانە خستی تر دەکا ئەوەیە بەپێی یاسای دەولیش کورد خاوەنی توخمەکانی دەوڵەت بووە. ١- هەرێمێکی دیارو ڕوونی هەبووە سنووری بریتی بووە لە سنووری نەتەوەی کورد. ٢- گەلێکی ڕێکترو جێگیر تری لەسەر بووە لەچاو گەلی عەرەبی عێراقی بە نموونە. ٣- دەسەڵاتی سیاسیش هەبووە کە خۆی لە حکومەتی شێخ محمود دەنواند.

بەڵام لەلایەکی تریش هاوشێوەی کوردستان هەبووە بەو مواسەفاتە سەلبیانەی کە لەو خاڵانەی سەروو باس کراوەو کەچی ڕزگار بووەوو ئێستا دەوڵەتن.. بۆیە هۆی بنچینەیی یەکەی ئەو خاڵانەی سەروو بە تەنها نییە، ئەو بابەتە لە توێژینەوەیەکی سادە دەردەچێت بۆ مەدرەسەو تەوەرە جیهانییەکان، بەرپرسیاریەتیو مەینەتیو بەردەوامیەکەشی تاساتەش لە ئەستۆی عەلمانیەتە وەك مەدرەسە، بەو شێوەیەی خوارەوە:

تەوەری یەکەم (جیهانی): لە نێوان سایکس –پیکو ١٩١٦ بۆ لۆزان ١٩٢٣ دەنوێنێتو بەردەوامیەکەشی جەوجۆڵی ئیمپریالیزمی بە تایبەتی لە پەیمان

نامەکانی (پاریس ۱۹۱۷، لۆزان ۱۹۲۳، سەعد ئاباد ۱۹۳۷، بەغدا ۱۹۵۵، ..
هەتا دەگاتە پەیماننامەی ۱۹۷۵ جەزائیر، ..

**تەوەرەی دووەم( ئیقلیمی):** بریتی بوو لە گەیشتنی بیری نەتەوەو عەلمانی‌و دروستبوونی ئیتحادو الترقی، کەمال ئەتاتورك، تۆرانیەت، .. دروستبوونی دەوڵەتە نەتەوەییەکان لەسەر ئەو بنچینەیە کە بریتیە لە (سەربەخۆیی نەتەوەیی تورك‌و عەرەب..) لە تورکیاو عێراق لە سەرەتای سەدەی بیستەم لەسەر حیسابی بێ بەشی کورد.

**تەوەرەی سێیەم (ناوەکی):** بریتیە لە هەموو ئەو تەقەلاو دەرفەت لەدەست چوونەی کە عەلمانیەتی کورد لەو سەردەمیدا بەهەڵەیی پارمەتی تەیاری نەتەوەیی‌و بە عەلمانی کردنی خەلافەتیاندا.. هەروەك (رۆبرت ولسن) دەڵێ: (..نەتەوەییە تورکەکان وا سەر نەدەکەوتن ئەگەر عەلمانیەتە کوردەکان وا یارمەتیان نەدابوونایە لە دژی ئەستەمبۆڵ (خەلافەت).. (خالد بەگی کوردیش لەسەردەمی خۆی گۆتبوی: ئەو یارمەتیەی مصطفی کمال‌و ئیتحادیەکان‌و دژایەتی ئەرمەنیش، شمشێرە تیژی دەکەین بۆ ملی خۆمان)[1]، راستیان‌وتووە.. هەردوولا- بەکورتی‌و پوختی هۆیەکانی مەینەتی کورد لە دیاریکردنی ئەو وەرچەرخانە گرنگانە لە هەناوی خەلافەت‌و ناوچەکە رویدا، بەو شێوەیە :

۱- دارمانی خەلافەتی عوسمانی‌و جێگرتنەوەی بە دەوڵەتی نەتەوەیی.
۲- جێگرتنەوەی دەستوری عەلمانی لە جیاتی شریعەت .
۳- جێگرتنەوەی بیری نەتەوەگەری عەلمانی لە جیاتی بیروبروای ئاینی .
٤- جێگرتنەوەی بنەمای بەرژەوەندی تایبەتی لە جیاتی گشتی .
۵- سەرکەوتنی هاوپەیمانان بەسەر ولاتانی ناوەند لە جەنگی جیهانی یەکەم... هەموو ئەو وەرچەرخانانە لە نێوان ۱۹۰۸– هەتا ۱۹۲٤ رویداو مەینەتی کوردی لێ دروست بوو.

---

[1] رابەرینی شێخ سەعید- روبرت ولسن، ل ٦٨.

## هـۆی بەردەوامی مـەینەتیەکـەی:

پوختـە:

هۆکار زۆرە، بەڵام دیسان لەو سێ تەوەرەی سەرەوە کۆدەبێتەوە: ئەو بنەمایەی کوردستانی پێ دابەش کرا هەمان جەوهەرو (مقاصد العلمانیة)یە لەو جیهانە کە بریتیە لە (بنەمای بەرژەوەندی تایبەتی) کە هەمو سەرمایەداری لەسەر بنیات نراوە، ئێستاش هەمان ئەو بنەمایە پەیوەندیەکانی جیهانیو ئیقلیمیو هەتا ناوەکیش رێك دەخاو سەرمەشقیەتی، کەواتە بەردەوامی مەینەتی کورد هەر ئەو تەوەرانەی سەروو لێی بەرپرسیارن، یەکێ لە ئەنجامە هەرە سادەکانی ئەو بنەمایە ئەوەیە ناکۆکی داگیرکەرانی کوردستان هەردەم بچووك ترە لەچاو بەرژەوەندی هاوبەشیان لە مانەوەی دابەشی کوردستان، بەهەمان شێوەش پەیوەندی دەولیو جیهانیش، واتە ئەوبەندانەی یاسای نێو دەوڵەتی لەبارەی مافی چارەی خۆنووسی لاوازترن لە چاو ئەو بەندانەیوەك (سیادە)و (عدم التدخل للشؤن الداخلیة)و بنەمای (تعایش السلمی) .. بۆیە مەینەتی راستەقینە کۆتایی نایە هەتا عەلمانیەت کۆتایی نەیەت یان جەمسەری بەرامبەریشی کاریگەر نەبێت، (هەروەك لە پرۆژەکانی رزگاری کوردستان زیاتر باس دەکرێت).

بۆ هەموو ئەو بەشانەی سەروو لە ئەتەوەییەوە تا مەینەتی کورد.. هەموو ئەو بەڵگەنامانەی پێویست لە نووسینێکی تایبەت سەبارەت بە (کوردستان) تۆمـاری دەکەین.. هەندێ بەڵگەنامە نوێن بڵاو نەکراینەوە.

١

(٤٥)

# پـــــارت حـــزب party

مانای باوی ئێستای لەگەڵ ئەسڵەکەی کە لە قورئان هاتووە تا رادەیەك جیاوازە، حزبی ئێستا بە مانای (حزبی سیاسی)، بەو کۆمەڵە خەڵکەوتراوە کە پەیوەندیەکانیان رێکخراوە[1]، بەڵام لەوەرگێرانی ئەو چەمکە (بەو مانایە) بۆ عەرەبی‌و ئنجا بۆ کوردی هەندێ کەمو کورتی لەپێناس‌و ماناو تەمەن‌و دابەش بوونی لەگەڵ خۆی دێنێ، چونکە حزب بەمانا قورئانیەکەی هەم بە مانا سروشتیەکەی زۆر فراوانترە لە (حزبی سیاسی)، هەتا چەمکەکانی هاوتاش لە (شورا)و (سەرۆك)و (بەرنامەو نەخشە)و... هەر بۆ سیاسەت نیە، بۆ دەزگا کۆمەڵایەتی‌و بازرگانی‌و زانستی.. هەتاوەرزشیەکانیش دەبێت، ئەوانە زیاتر چەمکی ژیانن؛ هەرچەندە سیاسەتیش‌وا بەرەو فراوان بوونە، بەرەو پێناس‌و مانای قورئانی دەڕوا..

پێناس: هەڵبەتە حزبیش زۆر جۆرە پێناسی هەیە، جیاوازیەکانی دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی مەدرەسەو تێروانینی سەرچاوەکان،وا بەشێکی لێ هەڵدەبژێرین:-

- فرانسو گوجیل: ئەو کۆمەڵە خەڵکە رێکخراوەن بە مەبەستی بەشداری لە ژیانی سیاسی کردن بۆوەرگرتنی بەشێك لە دەسەلآت یان هەمووی.
- هـ.کلسن: پەیکەرێکە کۆمەڵە پیاوێکی هاوڕا لەنێوی کۆدەبێتەوە بۆ مسۆگەرکردنی بەشداریەکی ڕاستەقینە لە کاروباری گشتی.

---

١ المصطلحات السياسية في الإسلام- د.حسن الترابي، هەروەها (علم السياسە- صدرالدين قبانجي).

### (٤٥) پـــارت ـــــ حـــزب ـــــ party

- بۆردۆ: بە هەموو ئـەو کۆمەڵـە خەڵکـە دەوترێ، کـە هـاوبیری سیاسـین‌و دەیانەوێ زیاترین خەڵك کۆکەنەوە بۆ دەسەڵات وەرگرتن یان بە لایەنی کـەم کار لە بڕیارەکان بکەن.[1]
- دوڤرجە: کۆمەڵە خەڵکێکی یەکگرتوون لەسەر بنچینەی سیستەمێك.[2]
- فەرهـەنگی (Oxford):[3] ڕێکخراوێکـی سیاسـیە هاوبەشـن لـە بـڕواو ئامانج‌و دەنگ دان لە هەڵبژاردنەکان.
- زۆربەی فەرهەنگ‌و ئەنسکلۆپیدیە بەناوبانگەکانی ڕۆژهـەڵاتیش (جگـە لـە مارکسیـەت) لەژێر کاریگەرەی ئەو پێناسـە دەڤەریانەی ڕۆژئـاواین، لەوانـە: (موسـوعة العالمیـة)، (موسـوعة العلـم الاجتمـاع)یـش هـەر (دەسـەڵات‌و یەکێتی) کردۆتە توخمی بنچینەی حزب.
- (النظم السیاسیة)ش هاوشێوەیە توخمی (ڕێکخستن، ئایدیۆلۆجیا، ئامانج) بۆ حزب کردۆتە بنچینەو دەڵێ: (حزب بریتیە لە ڕێکخستنی کۆمەڵە خەڵکێکی هاوبیر، لەپێناو دروستکردنی ڕای گشتی بۆ خۆی‌و گەیشتنی بەدەسەڵات).

زۆر بەڕوونی لەو پێناسانە دەردەکەوێ کە زیاتر گوزارش لەڕاو نەریتی سیاسی سیستەمێك دەکا کە ڕۆژئاواییە، توخمە بنچینەییەکانی ئەوانە بـووە: ڕێکخسـتن، ژیانی سیاسی‌و دەنگ وەرگرتن‌و ئامانجە وەختیەکانی تر..

هەڵبەتە حزب پشت بە فەلسـەفەیەکی قووڵ دەبەستێ، ئارادەیـەکی زۆر بەنـدە بە پێناسی سیاسەت بۆیە (چاکـسازی گشتی) یەکێکە لە بنچینەو ئامانجی کە لەو پێناسانە نەهاتوون، ئنجا ئەو پێناسانە نـاتوانی باوەشـی فـراوان بکـا بـۆ حزبـە شۆڕشـگێڕو ڕادیکـالی‌و معـارەزە... زیـاتر پێناسـی لیـبرالین، لـەکاتێکا حـزب وەرگەڕانێکی گرنگە لەوەرچەرخانی ڕەوتی کۆمەڵ لەسەر بنچینەی فاکتـەرەکانی

---

١ بڕوانە: (النظم السیاسیة، علم السیاسة ،...).
٢ الأحزاب السیاسیة.
٣ Oxford-a.l.d.،٢٠٠٠.

شاقوولی ڕەچەڵەکیو کۆمەڵایەتیو نەژادیو هاوخوێنیو بۆ فاکتەرە ئاسۆییەکانی بیروبڕواو ئـاینو بەرنامـەو سیاسـەت..، واتـە خـودی حـزب دانەیەکـە لـە فاکتەرەئاسـۆییەکان، ئـیتر دەوری ئـاین دە بینـی یـان بـە بـەدیل یـاخود بـە یارمەتیدەری، واتە تەواوی بەرنامـەکانی ژیـان دەگرێتـەوە.. نـەك بـەو پێناسـە سادانە.. تا ئەو ڕادە (کلسن) تـەنها بـۆ پیـاوانی تـەرخان کـردووە هـەروەك لـە پێناسەکەی سەرووی دەردەکەوێ، بۆیە کەمێك قوڵتری گەڕانەوەدی بۆ مێژوو دەوێ لەبارەی سـەرەتای پەیدابوونو ماناکەو ئنجا پێناسـی..

## سـەرهەڵدانی حـــزب:

ناتوانرێ بەچاکی لەحزب بگەین ئەگەر لە پرۆسە مێژووییەکـەی سـەرهەڵدانو دروست بوونی نەگەین.. کە بەو پرسیارانە دەسـت پێدەکـەین: بۆچـی حـزب لـە سەرەتا نەبووەو بە درەنگەوە پەیدا بوو؟ پەیوەندی گەشەی کۆمـەڵو حـزب چـیە؟ ڕەوتی مێژووی کۆمەڵ لەکام لا بـۆ کـام لایـە لـەو فاکتەرویەیوەسـتە شـاقولیو ئاسۆییانە: بنەماڵەیی، خـوێن، خێڵـەکی، نەتەوایـەتی، کۆمەڵایـەتی، ئـابووری، چینایەتی، فیکری، سیاسی، ئایدیۆلۆژی، ئاینی، ...؟ وە مانای چی دەگەیـەنێ؟ کەواتە چەندە ڕاستە دروست بوونی حزب لە (غیابی ئـاینی ڕاسـتەقینە) هـەمان مەبەسـتی پەیامـە وەك داهێنـانی بەشـەری؟ ئەوانـەو چـەندین پرسـیاری تـر دەروازەکان دەکاتەوە.

هەڵبەتە پێشکەوتن سیفەتی بنـچینەی بـەتاقی تـەنهای کۆمـەڵـە، نـەك وەك مادیەکان ئەو سیفەتەیان داوەتە سروشـتو هـەموو گـەردوون، ڕاسـتە مـادە لـە سروشت دەگۆڕێ بەڵام گەشە ویـێش نیـە، زیـو نابێتـە زێـڕ، ئاسـن نابێتـە زیـو لەخۆوە، ئاو نابێتە جیوە، .. ڕووەکـی سـێو مـۆزت ناداتـێ... ئـەو تیۆرانینانـە هەمووی هەڵە دەرچوو گۆڕان لە سروشت بازنەییە، ئاو تەنها دەتوانێ لەو بازنـە بخولێتەوە لە گۆڕانە چەندایەتیو چۆنایەتیـەکەی (شلە- هـەڵم- سـەهۆڵ- شـلە)،

ڕوەکیش: (دەنکۆڵە-شتل- ڕووەك- بەر- دەنکۆڵـە).. هـەتا لایـەنی بـایۆلۆجی مرۆڤیش هەر بازنەییە (بە پێـچەوانەی تیۆرەکـەی لامـارك‌و داروین): (مـرۆڤ-نطفـة- کۆرپەلـە- منـاڵ- مرۆڤـ).. بـەو شـێوەیە تـەنها کۆمەڵـە بـەکراوەیی (نابازنەیی) گەشە دەکا لە سەلبیەوە بەرەو ئیجابی، لە خـوارەوە بـۆ سـەرەوە، لـە چەندایەتیەوە بۆ چۆنایەتی، لەکـەم دەسـەڵاتی بـۆ کـۆنترۆڵ کردنـی سروشـت‌و پەیداکردنی ئامراز، لە کاری ماسولکەی بـەرەو کـاری زیهنـی، لـە هەسـتەوەش بەرەو (عـەقڵ)، لـە فاکتـەرە شـاقوڵیەکان بـەرەو ئاسـۆییەکان، ... لـە خـودی مرۆڤیش ئەو گەشە فراوانە بە ئەمپیرێکی تەسك پیشان دەدرێت کە بریتیـە لـە کاریگەری زیهن (عەقڵ) بەسـەر کاریگەریە زیادەڕەویەکانی تـری گـەدەو جنس‌و خۆویستی‌و باقی ئارەزووە دەروونیەکانی تر کە (دەروون-نفس) نوێنەرایەتی دەکا.

هەڵبەتە ئەو گۆڕان‌و گەشەکردنانە هەروا ڕەمەکی نین، چـەندین یاسـاو ڕێـسا هەیە فەرمان لەسـەر ئەو گۆڕانکاریانە دەکاو کارکەرە دەرەکی‌و ناوەکیەکان ڕێـك دەخا، چەند ڕێسایەکی لۆژیکی هەڵدەبژێرین کە لێرەدا پێویستمان پێیەتی: •

١- لە هەر پرۆسـەیەکی (گەشـە) هۆکارە دەرەکـی‌و ناوەکیـەکان لەسـەرەتا تـا کۆتای لە پلەی (پێویست-ضروري) بەشداری دەکا.

٢- لەسەرەتادا هۆکارە دەرەکیەکان بنچینەیی تـرن بەرەبـەرە لەگـەڵ ڕەوشـی گەشـەکردن (بنـچینە یـایەتیەکـە) لەلایـەن هۆکـارە ناوەکیـەکان لـەهۆکارە دەرەکیەکان دەستێنرێتەوە.

ئەو ڕێسایانەی سەرەوە بە ساناییی چـەند ڕاسـتیەکمان بـۆ دەردەخـاو چـەندین لوغزیشمان بۆ دەکاتەوە وێنەیەکی بەرجەستەی سەرەتای کۆمەڵیشمان پـێ دەدا بەو شێوەیە:

١- زۆربەی پەیام‌و موعجیزەی هەستیاری.

٢- کاری سروشت لەسەر کۆمەڵ خەست تر بووە.

٣- پێویستی تاك‌و خێـزان بـە بنەماڵـەو خێڵ بـۆ پارێزگـاری لـە دوژمـن‌و

کارەساتە سروشتیەکان.

٤- ئاسۆی فیکری کۆمەلآیەتی تەسك بووە، چونکە هەر کۆمەڵە دیاردەیـەکی سروشتیو کۆمەلآیەتی دووبارە بوویان بە میراتی فیکری بۆ دەماوە.

٥- هێزی ماسولکە زیاتر یەکلاکەرەوە تر بووە لە هێزی عەقڵ.

... بەلآم دوای گۆڕانو گەشەسەندنی کۆمەڵ ئێستا لەرووی هۆکـاری نـاوەکی بەو شێوەیە:

١- پچڕانی پەیامی ئاسمانیو بوونی یەك بەرنامەی چەسپاوو سەرتاسەری.

٢- کەمتر ئیعتماد دەکرێتە سەر سروشت، لەجیاتی پەیوەندی جارانی مـرۆڤو سروشت راستەوخۆیانە بەرەبەرە ئامێر بووە (ناوەند) لە ئەنجامدا زیـاتر کـۆنترۆڵی سروشت کرا.

٣- کۆمەڵــە بەشــەریەکانیش لــە بنەماڵــە بــەرەو خــێڵو نەتــەوە وا بــەرەو عەولەمەن.

٤- ئاسۆی گشتی فیکری کۆمەلآیـەتی زۆر فـراوان بـووە لـە بازنـە تەسـکی نیمچە میراتی دەرچووە.

٥- هێـزی ماســولکەی ئێـستا تـەنها لــە پلـەی (پێویـستە نـەك بنـچینەو یەکلاکەرەوە) ئەو رۆڵە وا لای چالاکی عەقڵیو نەخشەو بەرنامەو پلانە.

٦- کۆتای مرعجیزە وکارتێکەرە هەستیارەکانەو سەردەمی بـوونی بەڵگـەی عەقڵی یە.

ئەو گەشەکردنەی لەســەروو باس کرا لەلایـەن زۆریــەی زانــاو پــسپۆڕان رێکـن لەســەری، بــەلآم هەریەکـە بــەجۆرێك دەریــان بڕیــوە، وا هەنــدێکی بەنمونـە لێ هەڵدەبژێرین:

● ابن خلدون: بداوە (رەوەندی) ←خێڵەکی ←دەوڵەت .

● مارکسیەت: دڕندایەتی ←بەندایەتی ←دەرەبەگایەتی ←ســەرمایەداری ←سۆشیالیستی ←شیوعیەت.

(٤٥) پارت حزب party

- ئۆگست کۆنت: لاهوتی ← میتافیزیکی ← زانست .
- فریزەر: جادوو ← ئایین ← زانست .

تەتەوریەکانی مادی: دڕندایەتی ← خێڵەکی ← ئیمبراتۆریەتی ← پادشایی ← کۆماری .

ئیسلام: نبوە ← راشدین ← میرات ← دیکتاتۆری ← گەڕانەوەی ئیسلام (راشدین).

بە هەمان شێوەی سەرووش گۆڕانکاری قوول لە مرۆڤیش وەك تاك روویدا، بە تایبەتی رزگاربوونی لەدەست فاکتەرە شاقولیە کۆمەڵایەتیەکانی کلاسیکی کە عەقڵی زیندانی کردبوو نەتوانێ ناسنامەی ڕاستەقینەی خۆی وەرگرێ لە فاکتەرە ئاسۆییەکان کە جەوهەری مرۆڤ لەوێ دیاری دەکرێو مرۆڤەکە دەکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی عەقڵ کە جاران لەژێر کۆنترۆڵی میراتیو رابوردوو نائیرادی بووە.

ئیتر بە ساناتر کۆمەڵگە رێك دەخرێتەوەو پۆلێن دەبێت لەسەر بنچینەی ئاسۆی چینایەتیو فیکریو سیاسی.. کە پێشتر بەهۆی پەیامیش بە زەحمەت دەکرا، مرۆڤ ئەندامێکی کۆمەڵایەتی بووە بەهۆی پەیام کۆمەڵگەی ئاسۆی لێ دروست بووە، بەڵام بەشێوەی رەوەی لێك دابڕاو، هەر پەیامی لێ پچڕا بێت بەخێرایی گەڕاوەتەوە سەر فاکتەرە شاقولیو کۆمەڵایەتیە کلاسیکیەکان، بەپێی قۆناغی گەشەی کۆمەڵ، هەروەك (مرسی) تەنها ٤٠ رۆژ لێیان دابڕا لە بەرنامەیەکی مرۆڤانەی زانستی دادگەریو مەدەنی گەڕابوونەوە سەر یاساو سیستەمی نەفامیو گۆلك پەرستی. بۆیە تا ئامرازی هاتو چۆو بینینو بیستنیش گەشەی نەکرد ئینتمایەکانی نەگۆڕا تا سەرەتای سەدەی (١٩) بەرەبەرە لە ئینتمای دەڤەری بۆ ئینتمای عەولەمی چەکەرەی کردو جوڵا، ئیتر بەرەبەرە بوو بە کۆمەڵە ئینتماو ئەلقەی یەکتربڕ، (نەك تەماس)،وەك خێڵو نەتەوەو نەژادو چینو توێژو تایفەو رەشو سپیو ئایینی جیاجیاو دەستەو کۆمەڵەی فیکری لێك جیاو پیشەو پسپۆڕی جیا، لە یەك کاتدا مرۆڤی نوێ ئینتمای هەیە بۆ زنجیرەیەك

ئەلقەی کـۆك‌و نـاکۆك، شـاقولی‌و ئاسـۆیی، کلاسـیکی‌و تریگـەرایی، ئـیرادی‌و ئائیرادی، عەقڵی‌و رەچەڵەکی،.. لەکاتێکدا کوردێکی هەژارو عـەرەبێکی ئاسـایی جیان لە ئینتمای نەتەوەییـداو ناتـەبان، کەچـی هـەردوولا یەکدەگرنـەوە لـەدژی دەوڵەمەندێکی عـەرەبی‌و کـوردی، نـاکۆکن لەگـەڵ ئەمریکیـەکی رەش لەسـەر بنچینەی جوگرافی‌و کەلتوری، یـەك دەگرنـەوە لـە دژی سـەرمایەداری، نـاکۆکن لەگەڵ تورکێك لە هەمان کاتدا یەکدەگرنەوە لەسەر بنچینەی ئایین، بـەو شـێوەیە لەناو یەك میللەت‌و شارێکدا ئەو هاوبەشی‌و جیاییە بە هەمان ئەندازە هەیە، ئەو ئەلقە کۆك‌و ناکۆکانەش لە کاریگەریدا یەکسان نین، لە هـەر زەمـان‌و زەمینێـك ئەلقەو ئینتمایەك گەشتر‌و سەرەکی تر دەبێت لەوانی تر، بـۆ نمونـە لـە کوردسـتان بەهۆی ستەمی داگیرکـەری ئەلقـەی کوردایەتیەکـەی سـەرەکی تـر دەرچـووە لـە چینایەتی‌و نەژادی‌و خێڵەکی‌و تایفەیی.. لە ئەفریقاش نەژادی یەکەی، لە ئەوروپا چینایەتیەکەی،.. لەگەڵ تێکەڵ بوونی ئەو ئەلقانە زیـاتر دەوروژێ، ئـالێرەدا وەك گەشەی ئامرازی گوزارش لەو سۆزو هەستە فیکرەی حزب گەڵاڵە دەبێت.. چۆن؟ تا کێشەی مرۆڤ دەقەری بوو لە ئاستی خێڵێك‌و بنەماڵەیەك بووە ئەوا پەیوەنـدی خزمایەتی روون بوو پێویستی بە کۆکردنەوەو ناونووسین‌و رێنمایی نەبوو، بەڵام لە نەتەوەو چین‌و ئایینێکی گشتی (نەك ئاینێکی بە بەرنامە) هـیچ پەیوەندیـەکی وا توندی رێکخـراوی راسـتەوخۆ نیـە کۆیـان بکاتـەوەو رایـان بـەرێنن بـە هـۆی ئۆتۆماتیکیەتی پەیوەندیە شاقولیـە هەست پێ کراوەکان،تا یـەك رایـان بکـا... بەو شێوەیە ئۆرەی لەدایك بـوونی فیکـرەی حـزب دێتـە کایـەوە وەك پێویسـتی بەشەری، ئەگینا وەك پەیام مێژوویەکی کۆنی هەیە، بەڵام فکری بەشەری بەدەیان سەدە لەدوای پەیام ئنجا بە گەشەی تایبەتی خۆی پێی دەگا.

## یەکەم حــزب لە کوێ پەیدابوو؛

هەڵبەتە لەوەش زاناو توێژەرەوەکانی رۆژئاوا ئەو سـەرەتایەش دەگێڕنـەوە لای

خۆیان، پێیان وایه فیکرەی حزب یەکەم جار لە ئەوروپا سەری هەڵدا، لە سەرەتادا کۆمەڵە خەڵکێك یەك را دەبوون بەرامبەر هەڵبژاردنو دوای لە پەرلەمان (کوتلەی رای جیاجیا) دروست دەبوو.. بەو شێوەیە مێژووی حزب بەو شێوەی ئێستای لە ساڵانی ١٨٥٠ز دەست پێدەکات بەپێی (احزاب السیاسیة- دۆڤرجە)، زۆربەی سەرچاوەو فەرهەنگە جیهانیەکانیش هەمان رای (دۆڤرجە)یان هەیە کە حزب لە سەدەی ١٨ بۆ ١٩ پەیدا بووە.

(موسوعة علم الاجتماع)یش هەمان مێژووی تۆمارکردووەو دەڵێ: ((هەتا ساڵی ١٨٥٠ز لە هیچ وڵاتێك حزبایەتی لێ نەبووە بەو ماناو پێناسەی ئێستای حزب)). ئەگینا دەستەو یانەو کۆبونەوە هەبوە، بەشێك لە مێژوونووسانی تر دیاردەکانی دژایەتی کردنی پادشاکانی ئەوروپایان‌وەك ماهیەت بە جۆرێك لە حزبایەتی وەسف کردووە لە سەدەکانی (١٦) کە ناوی (وینگ)و (توری)یان لێ نراوە، بەڵام بەو پەیکەرو زیندەگیە سیاسیە نەبووە، لە ئەمریکاش لە نیوەی سەدەی هەڤدەم (تۆماس جیفرسون) حزبی دیموکراسی -کۆماری دروست کردووە، لەپێش ئەو مێژووەش وێچوویەك هەبووە وەك (موسوعة العالمیة) باس دەکا دەڵێ: (هەڵمەتەکانی ئەندرۆجاکسن بۆ سەرۆکایەتی لە ١٨٢٨ لایەنگرانی ناویان لەخۆ نابوو دیموکراسیەکان، بەڵام نەك شێوازی حزبی بێت)[1]. وەك ئەزموونی بەشەری مێژوویی رۆژئاوا روونترە بۆیە مێژووی سەرهەڵدانی بۆ ئەوێ دەگەرێتەوە جا چ لە ئەوروپا بێت یان لە ئەمریکا.

بەڵام هەمووی یەك دەگرنەوە کە ئەو حزبایەتیە لەژێر سێبەری چالاکیەکانو ململانێی فراکسیۆنەکانی پەرلەمان هاتووە، ئەوانەش ئەو جۆرە حزبانەن کە پێناسەکانیان بۆ داڕێژراوە (کە لە سەرەتا تۆمارمان کرد)، دوایی لەسەر دەستی یەکەم جار سۆشیالیستەکانو ئنجا شیوعیەکان بەتایبەتی (لینین) گەشەی پێکردو ناوەندیەتیو دیسپلینیو مەکتەب سیاسی بۆ زیادکردو ناوەرۆکێکی

---

١ الموسوعة العالمیة — ج- ص٣٢٢.

نوێی بە حزب دا، تا ئێرە ڕای باوو ئەکادیمیە کە لەو سەردەمە ڕای ئـەکادیمی زۆر لە ژێر کاریگەری ئایدیۆلۆژیای ڕۆژئاوایە ئەگەر چی بە بێ لایەنیش دەژمێررێت.

بەداخەوە زۆربەی فەرهەنگو ئەنسکلۆپیدیەکان کەمتر گەڕاونەتەوە سـەر ئـەو مێژووەی کۆمەڵگەی مەککە کە چەند حزبی لێ بوە بەو شێوەیە: حزبی ئیسلامی (پێیاندەوت حزبی محمد)، بێبـاوەڕانیش حزبـی بـوون، عـەوامو عەشـیرەتەکانیش هەریەکە حزبو نوێنەریان لە (دار الندوة) هەبوو، ئایندارە کلاسیکیەکانی تـریش حزبێك بوون..واتە کۆمەڵـە حزبێـك هـەبوو لـەو شـارە.. ﴿وَلَمَّا رَأَى الْمُؤْمِنُونَ الْأَحْزَابَ...﴾.واتە زۆر حزبی لێ بووە، بەلاّم بەگشتی دوو بەشی سـەرەکی بـووە، (حزب الله)و (حزب الشیطان)وەك لە قورئانی پیرۆز وای دابەش کردووە. هەڵبەتە چالاکیەکانی تەبشیری ئاینیو بزوتنەوەی ماسـۆنیو.. هـەموو ئەوانـە سـەرەتای حزبی بوونە.

بۆ ناو جیهانی ئیسلامیشوا پێدەچێ یەکـەم حزبـی عـەلمانی (اتحاد التعـالي والترقـي) عـەلمانی تـورکی بێـت کـە لـە سـاڵی ١٨٨٩ دروسـت بـووە، بـەپێی پشکنینەکان لەپێش ئەوە حزب نەدۆزراوەتەوە، هەرچەندە لەپێشدا (ترکیا الفتاة — جوان تورك) کە لە ١٨٦٥ سەری هەڵداوە، لەناو عەرەبیش (جمعیة العلم السوري کە لە ساڵی ١٨٥٨) سەری هەڵداوە، بەلاّم بە فەرمی حزبی نەبوونە.

بەپێی (موسـوعة العالمیة) لەناو عەرەب کۆنترین حزب (حزبی ئومەی میسریە) کە لە ١٩٠٧ بە سەرۆکایەتی (حسن عبدالرزاق)، بەشێکی تر حزبی تونس الفتـاة کە دامەزرێنەرەکەی عەلی پاشا لە ١٩٠٨ز بە یەکـەم دادەنێـت، بـەپێی هـەمان (موسوعة)، یەکەم حزبیش لە عێراق (حزب الحر العراقي)١٩٢٢ دامەزرێنەرەکەی (محمود نقیب)ە، کە بە فیتی ئینگلیز دایمەزراند، بەلاّم ئەگەر عێـراق کوردسـتانی ئەوسـای گرتبێتەوە، ئەوا لە کوردسـتان (تعالي و ترقي کورد جمعیـت لـەر) لـە سـاڵی ١٩٠٨ز دروست بووە،واتە (موسوعة العالمیة) بە هەڵەدا چـووە ئنجـا لـە پێش ئـەو مێـژووەش کۆمەڵـەو حزبـی تـر هەبوونـە لەوانـە: حـزب العهـد بـە

سەرۆکایەتی عزیز میــسری –لــە بنــەڕەتدا چەرکەســی بــوو، جمعیــە النهــضة بــە ســەرۆکایەتی محمد سەدر، حزبی ئیــسلامی بەســەرۆکایەتی محمد داغــستانی ...

ئێستاش بە هەزاران حزب لەو جیهانە پــەرش‌و بــڵاو بــووە، بوودتــە بەشــێکی گرنگ لە چالاکی بەشەریەت‌و وێنەکێشانی چارەنووســەکانی، یــەك جــۆرو یــەك پێنــاس ناتوانــێ شــێوازی ئــەو هــەموو حزبانــە لــەخۆ بگــرێ، بــەڵام دەتــوانین گوزارشێکی تەواو گشتی بدۆزینەوە کە هەموو لێی هاوبەش بن، **حزب بریتیە لــە یــەکگرتنێکی ئارەزوومەندانــەی کۆمەڵــە خــەڵکێك لەســەر بنــچینەو کۆمەڵــە ئامانجێکی نیمچە هاوبەش.**

## حزب لە روانگەی مەدرەســەکان:

ئەو پێناسە جیاجیایانە گوزارش لە دیدە لێك جیاکـانی مەدرەسـەکان دەکـا، حزب لە روانگەی مەدرەسەی لیبرال دیموکراسیدا زۆر جیایە وەك لە مەدرەسەکانی تر، لێرەدا ئەو پەروەردەو ئایدیۆلۆجیاو مەبادیئەکان بەشێکی لاوەکین لەچاو یــەك گرتنی بەرژەوەندیەکان، بەرژەوەندی گــشتیش نیــە، بەرژەوەندیــەکی هەنوکــەیی، بۆیە حزبایەتی لەوێ یان هەڵخەڵەتاویە یان چینایەتیەکی روتە، لــەو ســەردەمەش کەم وایە حزبێك توێنەرایــەتی چــینە هــەژارەکان بکــا هــەر چــینەکانی ســەروون خاوەنی بەرژەوەندیــەکی هاوبەشــن‌و چــالاکیە حزبیــەکان بــەکار دەهێــنن، بۆیــە هەڵخەڵەتاوی بۆ چینەکانی خواروووە.

هەرچی مارکسیەتیشە لە کاردانەوەی ئە رەوتە لیبرالیــە، پێــی وایــە حــزب‌و بیروبــاوەڕو سیاســەتیش بەگــشتی رەنگدانــەوی بــاری چــینایەتیەکەیەتی، واتــە ئینتمای چینایەتیەکەی لەژێرخاندا بە ماناى ئینتمای فیکریش لەسەر خان دیاری دەکات.. بۆیە حزب بەروانگەی فەلسەفەی مارکسی تۆخمێکە لەسەرخان‌و هەردەم حزب گوزارش لە چینێك دەکا.. لە کۆتاییدا بۆچوونێکی هاوشــێوەی ئیــسلامی هەیە لەو دابەشیە دیارشــەی (یان حزب الله یان حزبی شــەیتان)، ئــەوا ئــەوانیش

یان حزبی پرۆلیتاریایە کە بریتین لە حزبە شـیوعیەکان یـان حزبـی برجوازیـە کـە بریتیە لە حزبە نەتەوەیی‌و کۆمەلآیەتی‌و لیبرالیـەکان..

لە راستیشدا کۆمەڵە بنچینەو پاڵنەرێك هەیـە یـەك یەکـەو پێکەوەشـی بـۆ پێکهێنانی حزبی جوداجودا وەك:

١ - بەرژەوەندی چینایەتی بە تایبەتی لە جیهانی سەرمایەداری.

٢ - پایەو پوول وەك حزبە دەسـەڵاتدارو دیکتـاتۆرو حزبی سەرکردە.

٣ - بەرگری، وەك بەشێك لە حزبـە نیـشتمانی‌و نەتەوەییـەکانی بـن دەسـتەو نەژادە چەوساوەکان‌و هەندێ کەمایەتی تر.

٤ - بیروباوەڕی، وەك حزبە ئیسلامی‌و حزبە مارکسیەکانی پێشوو...و هەنـدێ حزبی رادیکالی تر.

وەك دەردەکەوێت ئـەو ئامـانج‌و بنـچینانە هـەمووی خێـر نیـە، هەرچـەندە دیاردەی پەیدابوونی حزب لە مێژوودا نیشانەیەکی زەقـی پێـشکەوتنی کۆمـەڵو بیری بەسـەریە، نیشانەی وەرچەرخانی قورسایی:

کاریگەری‌یـە کۆمەلآیەتیەکانەبەرەو کاریگەریـە فـیکریـەکان، لـە کاریگەریـە بایۆلۆجی‌و میراتیەکان بەرەو ئایدیۆلۆجی‌و فێربوون، لە کاریگەریە (لا إرادیەکان) بۆ (إرادي)، ... بە کورتی لە ئینتما شاقولیەکان بـۆ ئاسـۆییـەکانە، ئـیتر مانـای بەرەبەرە مرۆڤـ لەگەڵ کۆنترۆڵی خۆی‌و سروشت کۆنترۆڵی مێـژووش دەکـا، بـەڵام رەوتی مێژووی کۆمەڵ ئۆماتیکی‌و میکانیکی نیە بە یەك جار بپەڕێنەوە، وەك لە تێروانینی (تطوریە مادیەکان) هاتووە، نەخێر، پاش ماوەو شـوێنەواری فاکتـەرە کلاسـیکیەکان لەگـەڵ خـۆی راپێـچی مێـژووی نـوێ دەکـا، بۆیـە کـاروان‌و حزبایەتیەکـەش (خێـرو شـەڕ)و (سـەلبیات‌و ئیجابیـات)، (رەنجـەرو رەنجبـەر)، (داگیرکەرو رزگاری)، (هەق‌و ناهەق)... بـە جەمکـی دەهێنێ،هەربۆیـەش لەگـەڵ پەیدابوونی حزب کۆمەڵێك جۆرە حزبی لەگەڵ پەیدا دەبێت، وا هەنـدێکی بەنونـە تۆمار دەکەین:

### ١- حزبە نەتەوەگەریەکـان:

ئێستا زیاتر لە وڵاتانی عەرەبو تورکیاو سربیاو رووسیاو... لە ئەورووپاو ئاسیاو بەرەو لاوازیە، لە کوردستان کەمتر نمونەی ئەو جۆرە حزبە هەیە، نیشانەیەکی روکەشی ئەو حزبانە (نەك جەوهەری) ناوەکانیان لە کۆتاییدا ناوی نەتەوەکەی پێوەیە نەك وڵاتو نیشتمانەکە، وەك حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی، پارتی سوشیالیستی کورد، بەرەی تورکمانی، .. کۆمەڵگە لەسەر دەستی ئەو حزبانە زۆر تاڵی کێشتووە، بۆیە حزبە دەسەڵاتدارەکانی لەو جۆرە هەردەم مەڵبەندی پشێوی جەنگە لە ناوچەکە.. هەروەك جاران بینیمان لە هەڵمەتەکانی ناپلیۆنو شۆڤینیەتەکەی، فاشیو مۆسۆلینی، نازیو هیتلەر، ئالاتۆیسیو جنرال فرانکۆ ..وە ئیستاش دەبینین عێراق، تورکیا، سربیا کە زیاتر لەو جۆرە حزبە دەستەڵاتدارە بوونە بۆیە لەگەڵ هەموو دەوروبەرو لە ناوەخۆشی سەرچاوەی ئائارامین.

لە کوردستان سەرەڕای داگیرو دابەشو ستەمی نەتەوەیو دراوسێی دوو تەوەری جیهانی لەو ترازە حزبانەن کەچی کەمتر لەو جۆرە حزبەی لێ پەیدا بووە، نمونەی دەگمەن (کاژیك)و (پاسۆك)ە.

### ٢- حزبە نیشتمانیەکـان:

ئەو جۆرە حزبانە گەلێ بڵاون، جیاوازیەکی سادە لەنێوان حزبی نەتەوەگەریو نیشتمانی (نەك لە جەوهەردا) وەك لە سەروو نیشانمان دا، لە ناوەکەشی دەردەکەوێ، کە لە کۆتاییدا ئاخۆ ناوی نیشتمانەکەی پێوەیە یان نەتەوەکە، لە کوردستان زۆربەی حزبەکان (کوردستانین- نەك کورد) واتە نیشتمانین نەك نەتەوەگەری.

### ٣- حزبی نەژادی:

بەشێك لە توێژەرەوەکان هەردوو حزبی کۆماریو دیکراسی ئەمریکی بەو جۆرە حزبانە دەشوبهێنن، لە ئەفریقاو هەندێ شوێنی تر بەلاوازی ماوە.

### ٤- حزبــه دیمکراسیــه‌کــان:

تا راده‌یه‌ك ئه‌و ناوه به هه‌ڵه باوی وه‌رگرتووه (حزبی دیکراسی) نیه چونکه (دیکراسی) ئایدیۆلۆژی نیه، بۆیه ده‌بینین ولاّتیکی دیکتاتۆری وه‌ك ئه‌ڵمانیای رۆژهه‌ڵات ناوی ئه‌ڵمانیای دیکراسی بوو، که ئایدیۆلۆژیای شیوعیه‌ت بووه، یان بەرەی دیکراسی فه‌له‌ستین، ... له راستیدا له‌و سه‌رده‌مه‌دا حزبه دیکراسیه‌کان به مانای زیاتر حزبه لیبرالیه‌کان دێت، هه‌ر حزبێك سه‌ر به مه‌دره‌سه‌یه‌کی رادیکالی نه‌بێت ( -که له‌و سه‌رده‌مه‌ش قه‌یرانی هه‌یه- ) به لیبرالی حسابه، بۆیه زۆربه‌ی حزبه‌کانی جیهانی به‌ره‌و ئه‌و ترازه‌ن، هه‌ڵبه‌ته رۆژئاوا پێگه‌ی سه‌رهه‌ڵدانی ئه جۆره حزبانه‌ن.

### ٥- حزبــه سۆشیالیستیه‌کــان:

ئێستا له‌دوای دارمانی شیوعیه‌ت حزبه سۆشیالیسته (به‌ناو زانستیه‌کان) هه‌ڵوه‌شانه‌وه زیاتر حزبه سۆشیال-دیکراسیه‌کان ماوون، ئه‌وانه‌ش زیاتر به‌دیلی حزبه لیبرالیه‌کانن له رۆژئاوا، بۆیه به‌خێرایی په‌ڕینه‌وه بۆ ئه‌فریقاو ئاسیاش که جاران که‌متر هه‌بوو.

٦- حزبه خێڵه‌کیه‌کان :

ترازێکه به‌ده‌گمه‌ن ماوه، نمونه‌ی هه‌ره زه‌قی (حزبی ئه‌نکاسا)یه له خوارووی ئه‌فریقا که نوێنه‌رایه‌تی خێڵی (زۆلۆ) ده‌کا به سه‌رکردایه‌تی بۆته‌لیزی.

### ٧- حزبــه تــایفیــه‌کــان:

له‌و شوێنانه هه‌یه که ململانێی تایفی له‌ویه، له شوێنێکی وه‌ك لبنان هه‌ریه‌که له حزبی مه‌سیحی به هه‌ردوو تایفه‌وه حزبی تایفیان هه‌بوو (حـزب کتائب) به سه‌رۆکایه‌تی بنه‌ماڵه‌ی پێیر جومه‌یل، حزبی (الوطنین الاحرار) به سه‌رۆکایه‌تی بنه‌ماڵه کمیل شمعون، هه‌روه‌ها حزبی سوننی‌و شیعی هه‌یه (حرکه أمل)، حزبی دورزی- هه‌رچه‌نده ناویشی سۆشیالیسته (حزبی سۆشیالیستی پێشکه‌وتوو- بنه‌ماڵه‌ی جونبلات) له پاکستان‌و ئه‌فغانستان‌و هند به پێی تایفی

هندۆسی، ئیسلامی به هەردوو باڵی (سوننەو شیعه)، له بۆرِندا له نێوان هۆتـۆر تۆتسی، .. هەتا له ئاپجیریا وا تێبینی کراوه که سێ ئایینی سەرەکی لێ بووه لـه کۆتاییدا سێ حزبی سەرەکی لێ پەیدا بووه.

### ٨- حزبه ئاینیه کلاسیکیەکان:

وەك لەو نمونانەی هیندو ئاپجیریا باسکرا، له ترازی نوێش ئەو حزبه مەسیحیی‌و یەهودیانەی بەخێرایی له زۆربەی وڵاتانی رۆژئاوا پەیدا بووینه، هەنـدێ دەسـتەو کۆمەڵی واش لەناو ئیسلام هەیەوەك (کۆمەڵەی موسـڵمانانی ئەندەنوسـیا) یـان (رابیتەی ئیسـلامی پاکسـتان، ....).

### ٩- حزبـی دەسـەڵات:

له هەمو شوێنێکی دیکتاتۆری هەیه، بێ مەبادینه، لەگەڵ دەسەڵات دایه به چارەنووسەوە، گەلێ جار به حزبی مووچەو پایەش ناو دەبرێت.

### ١٠- حزبـه ئومـەمیەکـان:

حزبه شیوعیەکانن، که جاران گـەورەترین فراکسیۆنی جیهـانی بـوون، بـەڵام ئێسـتا له: چین، ڤێتنـام، کۆریـای سـەروو، کوبـا، لاوس وەك حزبـی دەسـەڵاتدار ماوون به قەیرانەوه، بەڵام ئومـەمی تـەواو جـووت نیـه لەگـەڵ ئامانجـەکانیان، چونکه ئەوان له هەر ئومـەتێك چینێك تیایـدا ئامانجـه (کـه چـینی کرێکـاره-پرۆلیتاریا)و چینەکانی تر دوژمنن، بۆیه ئومـەمی نـین لـه راسـتیدا، هەرچـەنده واش ناوی وەرگرتووه.

### ١١- حزبه ئیسـلامیەکـان:

ئەوانـه ئومـەمین بـەڵام بـه سـەرەتایەکی ئیشـتمانی دەسـتیان پـێکردووه، هەرچەنده ئیسلامیەکان بەخۆیان ئه بەناوی (ئومەمی) نه به (عەولـەمی) قـایلن دەڵێن ئێمه جیهانین، بەرەو گەشەن، لەدوای ١٩٨٠ی سەدەی رابـوردووو لـەدوای هـەردوو شۆرشـی ئێـرانو ئەفغانسـتان بـەخێراتر سـەریان هەڵـداو پـەیامێکی گەردوونیان بـۆ هـەموو بەشـەریەت هـەڵگرتووه، چارنامەیـەکی رەتکردنـەوەی

هەموو ئەو دابەشیەی سەرووە، داماڵینی مرۆڤە لە وەڵای هەموو جۆرە ئینتمایەکی شاقولی، نەك رەت کردنەوەی ئینتمایەکە.

## چەند دابەشیەکی پێچەوانە:

چەند جۆرە حزبێك هەن هاوتاو جمکن، بۆیە پێکەوە ناویش دەبرێن، لەوانە:

١- حزبە رادیکالیو حزبە محافزینەکان: بەجۆرێك یەکەمیان خاوەن بەرنامەو گۆڕینی ریشەیی‌و دووەمیشیان پارێزگاری کردنە لە واقیعەکە.

٢- حزبە میکافیلی‌و حزبە مەبادیئیەکان: یەکەمیان بەرژەوەندی‌و فرت‌و فێڵ‌و فریودان‌و نەچەسپاوی‌و بەرژەوەندی پەرستی‌و هەموو جۆرە ئامرازێکی رەواو نارەواو بۆ مەبەستی تایبەتی، کەچی دووەمیان حزبی راستگۆو یەکێتی گۆتەو کردەو بەڵێن‌و مەبادیئە، ئەندامان‌و سەرکردەکانی خزمەتێکی بیروباوەڕێك دەکەن لە پێناوا بۆی دەژین کەچی لە یەکەما لەسەری دەژی.

٣- حزبە عەلمانی‌و حزبە ئاینیەکان: یەکەمیان لە هەرە باشیدا ئاین لە ژیان‌و دەوڵەت‌و سیاسەت جیادەکاتەوەو بەرێزەوە خانەنشینی دەکا دەیکاتە مەسەلەیەکی شەخسی‌و لەچوارچێوەی دەستور چەند بەندێکی بۆ دەکاتەوە. دووەمیان ئاین بە سەرچاوەیەك وەك (مەسیحی‌و یەهودی‌و بوزی‌و هندۆسی و...هتد.) دەزانن یان وەك ئیسلامیەکان بە تاکە سەرچاوەی یاساو دەستوور دەزانن بۆ رەوتی تاك‌و کۆمەڵ، لێرەدا ئاین دەستوور رێك دەخا نەك پێچەوانە.

٤- حزبە چەپ ڕەو راست ڕەواکان: کەمتر ماوە، بەکورتی گوایە یەکەم نوێنەرایەتی هەژاران دەکاو دووەمیشیان دەوڵەمەندان.

## پێشکەوتوترین حزب:

بۆ وەڵامی ئەم پرسە هەموو حزبێك بە خێرایی دەڵێن من پێشکەوتووم، مۆدێرنم، دژی رەجعیەت‌و دواکەوتوویم، بەڵام پێوەرو تەرازووی مێژووی،

کۆمەڵناسی، ئەنسرۆپۆلۆجی، ... سیاسی، ئنجا واقعی لەو وەڵامە بەرپرسیارە، زۆر ئاڵۆزو لێلیش نیە، مادام ئەسڵی حزبایەتی مانای پەرینەوەی کۆمەڵگەو تاکە لە کاریگەرە شاقولیەکانی ئنتمای تاك وتائیفیەت و ئاینی کلاسیکی و خیلەکی و رەچەڵەکی و نەژادی یە بۆ کاریگەریە ئاسۆییەکانی ئنتمای عەقیدەی و فکری و مەدەنی یە، واتە دیاردەی حزبایەتی تا رادەیەکی زۆر لە پرۆسەی مەدەنی دەچێت ئەویش و حزبایەتیش بریتین لە داڕنینی کاریگەریە کۆمەڵایەتی یەکان و فاکتەرەکانی سەروو لە سەر تاك و دارشتنەوەی کاریگەرو خستنە ژێر رێنمای کۆمەڵێکی کراوەی نوێی فکری، بەو شێوەیە ئەو حزبانەی لەسەر بنچینەی خێڵەکی نەژادی و نەتەوایەتی و جوگرافی و تایفەگەری دروست دەبێت یان هێزێك لەوانە وەردەگرێ بە (حزبی دواکەوتوو کلاسیکی) حسابن یا هەر ناوی نوێگەرایش لە خۆ بنێن یان لە ولاتێکی تەکنۆلۆجیداریش بێت، لە کۆتاییدا هەروەك نەخشە کۆمەڵایەتیەکان بەرژەوەندی تایبەت باڵەری سەرەکی جەمو جۆلە سیاسی و ناسیاسیەکانی دەبێت.

بە پێچەوانەش ئەو حزبانەی بە ساقی لەسەر بیروباوەڕ دروست دەبن و ئەندام و لایەنگرانیا رەچەڵەك و نەژادو نەتەوەو چین و زەمینی جیاجیایە ئەوەیان پێشکەوتووە، جا لەو پێشکەوتوەش دیسان پلە هەیە، هەڵبەتە حزبە مارکسیەکانیش لەو خانەن واتە بیروباوەرین، مەبادیئەکانیان جیهانیە بەلام چینایەتیە واتە (پرۆلیتاریا) دەگرێتەوە، بەهەمان شێوەی تەسك ترو خێراتر حزبە لیبرالیەکانی رۆژئاواش چینایەتیەو (چینی برجوازی) و جوگرافی تەسك دەگرێتەوە، بۆیە پێشکەوتووترین حزب ئەو حزبەیە مەبادینەکانی جیهانی بێت و کراوەش بێت بۆ هەموو مرۆڤ لەسەر ئەو زەویە بێ هاوێر.. ئەوەش تەنها حزبی ئیسلامی راستەقینەیە، دەتوانین جۆری حزبایەتی لەسەر بنچینەی دواکەوتوویی و پێشکەوتوویی بەو شێوەیە رێز بکەین:

حزبی خێڵەکی، حزبی نەژادی، حزبی تائیفی، حزبی نەتەوەگەری، حزبی

نیشتمانی، حزبی لیبرالی، حزبی نوەمەمی، حزبی ئایینی، حزبی ئیسلامی، لێرەدا تێبینی دەکرێ حزبی لیبرالی لە ریزەکانی پێشووە، لە راستیدا ئەو حزبە نەیتوانیوە بە حزبایەتی خەلکی لە کاریگەر کۆمەلایەتیە کلاسیکیەکان رزگار بکا بەلکو ئەوە زادەی پرۆسەی دیموکراسیو بازاری ئازادو سەروەری یاساو دەولەتی مەدەنی یە، بەلام ئەو جۆرە هەل وەشاندنەوەیە بۆ بیناکردنەوە.

(٤٦)

# حزبە كوردستانیەكان الاحزاب الكوردستانیة
# Kurdistani Parties

وەك زاراوە بەكاردێت بۆ ئەو حزبانەی كە سنوری چالاكی سیاسیان تەنها كوردستانە،واتە لە كۆتایی ناوەكەی (كوردستان)ی پێوەیە وەك ئیشتمانی كوردستان، لەو سەردەمەدا بریتین لە: (پدك)، (ینك)، (حسك)، (حشك)، (یەكگرتووی ئیسلامیی كوردستان)، (كۆمەڵی ئیسلامی كوردستان) ...

هەڵبەتە حزبایەتی (لە غیابی دادگەری راستەقینەدا) داهێنانێكی بەشەری نیجابیە، هەرچەندە پرۆسەیەكەوا دەردەكەوێ پارچەپارچەكردنی میللەت بێت، وەك مەسەلەی (درۆ)یە هەرچەندە سەلبیە، بەڵام كە منداڵ درۆی كرد نیشانەی جوڵان و سەلامەتی عەقڵیەتی (وەك لایەنی ئیجابی)، جا بەگوێرەی پێشكەوتنی شارستانی و سیاسی و باری ئایینی و فەرهەنگە گشتیەكانیان و دۆخی دەروونی چین و توێژەكانی میللەت ئایدیۆلۆژیاو رای گشتی حزبە سیاسیەكان دەخەملن.

لەسەر ئەو بنچینە زۆر ئاساییە پەیدابوونی حزبایەتی لەناو میللەتانی جیهانی سێیەم پاشكەوتووش، سەرەرای ئەوەش حزبایەتی لەناو كورد (بەتایبەتی لەناو رەوشەنبیرانی) بگرە لە پێشەنگا بووینە، بەڵام لە پەنجاكان بەدواوە زیاتر بووەتە بزوتنەوەیەكی میللی، ئەوەش بەهۆی:

١- داگیر و دابەشكردنی كوردستان و ستەمی نەتەوەیی.

٢- گەیشتنی فیكری ماركسی.

## مێژووەکـــی خێـــرای حزبایـەتی لە کوردســـتان:

کوردستان و رەوشەنبیرانی کوردستان وادیارە دەورێکی گرنگیان هەبوو لە دروستکردنی بڕیارو ڕوداوو مێژووی سیاسی ناوچەکە.

بەپێی زۆربەی سەرچاوەکانی دروستکردنی (حزبی ئتحادو الترقی -کە دوایی بووە، مولکی نەتەوەگەریە عەلمانیە تورکەکان) دامەزرێنەرەکەی کورد بووە، ئەو چوار قوتابیەی پزیشك دامەزرێنەری (اتحاد الترقی) بوون: ئیبراهیم تەمو، محمد رەشید چەرکەسی، د.عبداللە جودت، د.ئیسحاق سکوتلی)[1]، ئەمو دوو ناوەی دوایی (کوردن)، زۆربەی بڵاوکراوەو راگەیاندنو رێکخراوە مەدەنیەکان لەدەست کورد بووە، شەریف پاشا گۆڤاری (مشروطیەی عوسمانی) بەڕێوە دەبرد، دوایی رێکخراوی (تشکیلات اجتماعی عوسمانی) لە دەست ئەمین عالی بەدرخانی، .. دواییش رادیکالی عوسمانی هەر لە دەست شەریف پاشا بووە، د.عبداللە جودت گۆڤاری (عوسمانی) لە دەست بووە، سەرەڕای زۆربەی پایەکانی تری ئەنجومەنی دەوڵەت، شورا، جاروایە باب العالی، شێخ الإسلام، زۆرێك لەوالیەکانی دەرەوەی کوردستانیش، سەفیرەکان، ... لە دەست کورد بووە، یەکەم جاریش لەسەر دەستی د. عبداللە جەودەتی کورد پیتی لاتینی هێنرا نێو تورکیای هاوچەرخ.

هەر لەدوای ئاشکرا بوونی نیازی تورکایەتیەتی (ئیتحادو ترقی) ئەوا هەر خێرا ئەوانەو شەریف پاشاو (ذو الکفل)و ئەمین عالی بەدرخان حزبی (تعالی و ترقی کورد جمعیتلەر)یان دروست کرد لە ١٩٠٨، بە یەکەم حزبی بە مانای حزبایەتی لە کوردستان دروست بووە، بە سەرۆکایەتی شێخ عبدالقادر، هەرچەندە راوبۆچوونی تر هەیە لەسەر یەکەم رێکخراوی، بەپێی بەڵگەنامەکانی ئەرمەنی دەڵێن (یەکێتی کورد) یەکەم رێکخراوی کورد بووە بە سەرۆکایەتی (شێخ

١ ترکیا الفتاة... فرنست راموز، هەروەها (کوردو کردستان في وثائق البریطانیة.. و زۆربەی بەڵگە نامەکانی تری روسی عوسمانی ئەرمەنی دویاتی دەکەنەوە.

عبیداللە نهری)، راستە لەپێش (کورد تعالی‌و ترقی جمعیەت لەر) وەك (ئەمین زەکی بەگیش) تۆمارى كردووە ریکخراوی تری وەك (کۆمەڵەی هێڤی)، (رادیکالی عوسمانی)، (تشکیلاتی اجتماعی)، (لامرکزی)، (رادیکالی عوسمانی)، ... بەڵام ئەوانە ریکخراو بوون نەك حیزب[١].

لەناو حزبی تعالی‌و ترقی کورد کێشەیەکی توونـد هەبوو لەسەر هەڵوێست وەرگرتن لەمەڕ کێشەی خەلافەت کە لەو سەردەمی خەلافەت ببوە دوو دەسەڵات، یەکەمیان تەوەری عەلمانیە نەتەوەگەریە تورکەکان بە سەرۆکایەتی (مستەفا ئەتاتۆرك) لە ئەنقەرەو دووەمیان لە ئەستەمبوڵ (بە سوڵتانیەتی محمد وحیدالدین) سەرەك وەزیرەکەشی (فرید پاشا) بوو بەتایبەتی لە فەترەی ١٩١٨-١٩٢٢، لەبەر ئەوەی سولتان بە کردە مافی کوردی دابوو تا دروست کردنی دەوڵەت هەروەك لە رێی وەفدی تایبەتی سوڵتان (هادی پاشا)و وەفدی کوردی (شریف پاشا)و (عبدالقادر شمزینی) هەم لەسەر سیڤەرو هەم لەسەر گەشەسەندنی نوێی کێشەی نەتەوەکان.. بەڵام لەگەڵ مستەفا ئەتاتۆرك هیچ رێککەوتن‌و مۆرکردنێك نەبووهەر خەریکیش بوو لە ژێرەوە ئەو پاساو ئیمتیازانەی کە کورد بە درێژایی خەلافەت بە دەستی هێنابوو هەمووی هەڵوەشێنێتەوە، هەتا سیڤەریشی کردە (لۆزان) لەسەر هەموو ئەو جیاوازیانە ئەوا باڵی ئیسلامی ناو (حزب اتحاد والترقی کورد)و باڵی عەلمانی کۆك نەبوون، لە دەرەوەش کێشەی هەبوو لەگەڵ عەلمانیە کوردەکان، باڵی ئیسلامیەکان پێیان وابوو لەرێ خەلافەت مافی کورد زامن ترە، کەچی عەلمانیەکانی وەك: شەریف پاشا، بەشێك لەبدرخانیەکان، ئیسحاق سکوتلی... لەو لایەش حسن خەیری‌و برنجی زادەو ٧٢ نوێنەری کوردی تریش لە ئەنجومەنی نیشتمانی تورکیا بوون، کوردی عێراقیش لە عەلمانیەکان بەرەو لای (ئەتاتۆرك) بوون هەروەك (رفیق حلمی) لە یاداشتەکانی باسی دەکا، باڵی ئیسلامیەکان دەرفەتیان بە عەلمانیە کوردەکان دا تا لەگەڵ

---

[١] بۆ زیاتر بڕوانە: حزبە کوردستانیەکان لەو فەرهەنگە .

ئەتاتورك میللەتی کوردیان بەرەو هەڵدێر برد، ئیتر لە کۆتایی رووداوەکان و سەرکەوتنی ئەتاتورك بەسەر سوڵتان ئنجا دانیان بە هەڵەکان هێنا و ئیسلامیەکانی کورد بەخۆکەوتن و هەریەکە لە شێخ عبدالقادر، شێخ سەعیدی پیران و سەید ئەورەسی و زۆری تر.. تا شۆرشی شێخ سەعید دەستی پێ کرد لە ١٩٢٥و لە کۆتاییدا سەرکەوتوو نەبوو، حزبی ئتحاد والترقی لە ١٩٢٧کۆتای پێ هات، ئنجا نۆرەی حزبی خۆیبوون هات و حکومەتی ئەراراتیان دروست کرد بە سەرۆکایەتی (احسان پاشا) ئەو ئەزموونەش سەرکەوتوو نەبوو.

کورد تا ئەو سەردەمەی دوای جەنگەکانی جیهانی لەشام و مسریش دەوری سیاسی گرنگیان هەبوو، لە نیوەی سەدەی رابوردووش ئینجا لەلای تەواوی خەڵکی کوردستان ستەمی نەتەوایەتی( حزبایەتیش) هەستی پێکراو بزوتنەوەی رزگاری نیشتمانی کوردستان لەگەڵیدا پەیدابوو کە دەوری هەرەگرنگی دەگەڕێتەوە بۆ بەروبرواى (پ دك -ئەویش بۆ ژ ك)و قۆناغێکی نوێ دارشت لە مێژووی حزبە کوردستانیەکان، وەك لە دوایدا دەردەکەوێ بریتیە لە (حزبی دایك)و هەموو ئەو حزبە عەلمانیانەی ئێستا حزبە کوردستانیەکان پێك دێنن لە لق و پۆپی ئەو هاتوون، هەردوو سەرکردە (قازی محمد- مەلا مستەفا) زیاتر ئەو تەوژمە روحیەیان پێدا کەوا بچەسپێ لەناو میللەتی کورد.

## ١- پارتـی دیموكراتی كوردستـان:

لەساڵی ١٩٤٦ لە یەك گرتنی هەردوو حزبی رزگاریو شـۆڕش بـەناوی پـارتی دیوكراتی كورد دروست بوو كە هەمان سـاڵی جـاڕدانی كۆمـاری مەهابادیـشە، دامەزرێنەرەكەی (هەمـزە عەبـدالله)، بەپێی ئـەدەبیاتی ئـوێی (پ د ك) دەڵـێن: سەروەری دامەزراندنی ئەو پارتە هـەر بـۆ (مـەلا مـستەفا)* دەگەڕێتـەوە، كـە ئـەوكاتی لـە كوردسـتانی ئێـران (پ د ك) بـاوی وەرگرتبـوو تـا لـەوەدیوەی كوردستانیش دروست بێتو هـەر بـە سـەرۆكایەتی خـۆی، هـەر لایەنـەی حزبـی شۆڕشو هیوا لە دوای جەنگی جیهانی دووەم را ڕەگو ریشەیان دروست ببوو، بە چەندین قۆنـاغو كێشـەو دووبەرەكیدا تێپەڕین تـا گەیـشتنە دروسـتكردنی (پ د ك)، بەكارترین شەخسیەتەكانی (ئیبراهیم ئەحمەد، شێخ لـەتیف، هەمزە عبدالله، جەلال تاڵەبانی، سالح حەیدەری، ...).

هەرچەندە ڕای تر هەیە كە ئەو حزبە لە بیستەكانی سـەدەی رابـووردوو كـاری كـردووە – بـۆ زیـاتر بڕوانـە نووسـینێكی فـراوانو تایبـەتی لـە بـارەی حزبـە كوردستانیەكان -توێژەر

### ئایـدیۆلـۆژیاكـەی:

بە گەلـێ قۆناغو وەرچەرخاندا تێپەڕیوە بەپێی كاریگەرو نزیكـی جـۆری ئـەو سەركردەو مەیلی فەلسەفیان لەناوەندی بڕیارەوە، بـە كـورتی بـەپێی كاریگـەری بارزانی ناوەڕۆكی ئایدیۆلۆژی بۆ دروست بوە، بارزانی زیـاتر مـەیلی بـە ئـایینیو رێڕەوی ڕەسەنی كورددا كەوتوە، كەمتر كەوتۆتە ژێر كاریگـەری ئـەمری واقیعـی ڕۆژهەڵاتیو ڕۆژئاوایی، بە گشتیەكەی حزبێكـی نیـشتمانیو نەتەوایـەتی بـووە،

* بۆ زیاتر بڕوانە: حزبە كوردستانیەكان (دانەر)- تیایدا هاتووە كە ئەو حزبە دامەزرێنەرەكەی ئە هەمزە عبدالله یە نە مەلا مستەفا .

جارجاریش مارکسی بوون له غیابی بارزانی وه‌ك له کۆنگره‌ی ۱۹٥۳ی کەرکوك بەرەو مارکسی چوون، له سالّی ۱۹۷۹ کۆنگره‌ی (۹) به ته‌واوی له ماده‌ی (٥)و (٦) دیسان گەڕانەوە سەرمارکسیەت که لەو سەردەمی لە کوردستان باوی وەرگرتبوو، لەدوای شۆڕشی ئیسلامی ئێرانو کۆنگرەی (۱۰) جارێکی تر گەڕانەوە سەر نەتەوەیی‌و دیموکراسیەکەیان، ئێستا وەك حزبێکی لیبرالی نەتەوەی نەوەندە گرنگی بە مەبادیءو بیروباوەڕ نادەن، زیاتر کۆکردنەوەی خەلکیە لەسەر بنچینەی بەرژەوەندیءو تارادەیەکیش مێژووی سەروەریەکەی.

### کەمێك لە مێژووی:

• لەدوای شکستی مەهاباد مەلا مستەفا کەوتە یەکێتی سۆڤیەت تا شۆڕشی ۱۹٥۸ عبدالکریم قاسم گەڕایەوە عێراق (پارتی) قەدەغە بوو، بێ ئەو سەرکردەش بالّی ئیبراهیم احمدو بالّی همزە عبداللە هەر لە ململانێ بوون، دوای همزە عبداللە بە یەکجاری دەرکرا.

• لەو نێوانەی ۱۹٥۸ هەتا لە سالّی ۱۹٦۱ عبدالکریم قاسمو مەلا مستەفا نەگەیشتنە هیچ ئەنجامێك.

• لە ۱۱ی ئەیلول ۱۹٦۱ شۆڕشی دەستی پێکرد بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفا وا باوە دەلّێن بە ڕێبەرایەتی (پ دك)یش کە مەلا مستەفا سەرۆکی بووە، بەلاّم بەپێی هەندێ سەرچاوە لەوانە (لا أصدقاء سوی الجبال) یەکەم جار پارتی بەیانی دژی ئەو شۆڕشە دەرکردووە دوای چووەتە ناوی، واپێدەچێ ئەو پارتە هەموو دەم لەگەلّ مەلا مستەفا یەك نەبووبێ .

• لەسالّی ۱۹٦۳ عبدالسلام عارفو حزبی بەعس ئینقلابیان بەسەر عبدالکریم قاسم کردو هەلّمەتێکی بە تەوژم تر کرایە سەر کوردو حزبی شیوعی عێراقیو خەلکێکی نوێ چووە ڕیزی شۆڕش.

• لەبەر نەبوونی ئایدیۆلۆژیایەکی توندو تۆلّ کێشەی فرەتەوژمی تیابووە،

بۆیە لەدوای کۆنگرەی (٦) قەلادزە لە ١٩٦٤ ساڵی (م.س) بە سەرکردایەتی (ئیبراهیم احمد- جلال تالەبانی) دیسان لەدژی (مەلا مستەفا) راست بوونەوە، گوایە رەچەی و خێڵەکی یە بەناوی (مەلایی)و (جەلالی).

• لەساڵی ١٩٧٠ لە١١ی ئادار رێکەوتن نامەکە راگەیەنراو عێراق بە دەستووری دانی نا بە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان، بۆ ماوەی ٤ ساڵ جێ بە جێش بکرێ .

• لە هەمان شەوی ١١ی ئادار بارزانی لێبووردنێکی گشتی گرنگی جاڕدا بۆ جاش و جەلالی، ئەو سەردەم زۆربەی ئەخشەکانی حکومەتی هەڵوەشاندەوە، جەلالیەکانیش بە خێرایی کۆنگرەیەکیان بێك هێنا بەناوی (پارتی شۆرشگێری کوردستان) چوونە ناو (پ دك).

• لەو ئەترەیەی ١٩٧٠-١٩٧٤ بەهۆی باشی ئیدارەو کاریزمی سەرکردەکەی بووە گەورەترین حزب، زیاتر لە ١٠٠٠٠٠ ئەندامی هەبوو.

• لە ١٩٧٣/٧/١٧ حزبی بەعس و حزبی شیوعی عێراقی بەرەیەکی دووقۆڵیان راگەیاندو بەو شێوەیە ئەو حزبە دیسان کەوتەوە سەنگەری حکومەت و پارتی بەجێهێشت، بەبیانوی گوایە بەرگری لە حکومەتێکی نیشتمانی و خۆماڵی ئەوت دەکەن لەدژی ئیمپریالیزمی ئەمریکی ئەوەك وەك ئەزمونی تشیلی و سلفادۆر ئەلیندی دوبارە بێتەوە، گەیشتە رادەی چەك وەرگرتن لە حکومەتی عێراق .

• لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٤ حکومەت یەك لایەنانە یاسایەکی دەرکرد بەناوی یاسای ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان هەردوو ئەفورمەنی (یاسادانان)و (جێبەجێکردن)یکی لاوازی دروست کرد، یەکسەریش دەستی بە شەر کردەوەو هێزی هێنا کوردستان و پرۆسەی (تعریب)یش هەر بەردەوام بوو.

• دوای یەك ساڵ شەر لەلایەن شۆرشی کورد بە رابەرایەتی (پ دك) پشتیوانی شای ئێران و ئەمریکاو حکومەتیش لەگەڵ حزبی شیوعی و جاشێکی

زۆرو وڵاتانی سۆشیالیستی‌و لە ڕێکەوتن نامەی جەزائیر ١٩٧٥/٣/٦ عێراق‌و ئێرانی شا کۆتاییان بە شۆڕشی ئەیلول هێنا، لەبەر ئەوەی ئەو حزبەو شۆڕشیش زۆر بەند بوو بە شەخسی مەلا مستەفا وەك سەرکردەیەکی زۆر خۆشەویست بۆیە کە مەلا مستەفا جاڕی کۆتایی شۆڕش‌و دەست کێشانەوەی لە سیاسەت دا بە یەکجاری هەم شۆڕش‌و هەم (پارتی)یش کۆتایی هات.

بۆیە بەشێك لە ناحەزانی ئەو شۆڕشە ئەو پرۆسەیە بە زاراوەی (ئاشبەتاڵ) ناوزەد دەکەن، چونکە لەکاتی جاڕدانی کۆتایی شۆڕشی خاوەنی ئیمکانیەتێکی زۆری مادی‌و بەشەری بووو هیچ مافێکی نوێی بۆ کوردیش دەستەبەر نەکرد.

## - قۆناغی نوێی حزبایەتی -

مەبەست لەدوای ١٩٧٥ بەدواوەیە، کۆمەڵێك سیفات‌و نیشانەی تایبەتی خۆی هەیە جیا لە پێشتر.

## ٢- یەکێتیی نیشتمانی کوردستان:

له ١٩٧٥/٦/١ له شام دروست کرا لەلایەن (جلال حسام الدين تاڵەبانی- مام جەلال)، له پێکهاتنی سێ باڵی سەرەکیو کۆمەڵێك کەسایەتی خاوەن ئەزموونی وەك (نەوشیروان مستەفا- د.فؤاد مەعصوم- د.کمال حسن خۆشناو- د.کمال فؤاد- د.عمر شێخ موسی..).

## باڵەکانی ناو یەکێتی:

پێکهاتنێکی داهێنەرانەی زۆر بلیمەتانەی پیادەکردنی یاسای سێیەمی مارکسی بوو له فەلسەفە (قانون وحدة و صراع المتناقضات) بەو شێوەیە:

١- کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان: بەپێی تەقویمی خۆیان لە ١٩٧٠/٦/١٠ لە لایەن (شهاب شێخ نووری-وەستا ئەنوەر- جعفر کۆیی) دروست کراوە، بەناوی کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان تارادەیەك لە سەرەتای ١٩٧٦(ماویانە) بووە، بوو بە باڵێك لەناو یەکێتی.

٢- باڵی بزوتنەوەی سۆشیالیستی کوردستان: بە تەقویمی خۆی هەر لە دوای ئاشبەتاڵ مانگی ١٩٧٥/٤ بۆی دانیشتن لە ورمێو بەرەسمی لە مانگی ١٩٧٦/٨ یادی دروستبوونی دەکەنەوە.

٣- باڵی خەتی گشتی: ئەو باڵە بیدعەیەك بوو لە مارکسیەت، چونکە بنچینەی چینایەتیو مەنهەجی دیالیکتیکی نەبوو، بەڵام توانرا لەو باڵە کۆمەڵە خەلکێکی بیروباوەری جیاو نیتمای جیا لە ئاغاو نیشتمان پەروەرو نامارکسی جێگەیان ببێتەوە، زیاتر جەماوەری تایبەتی مام جەلال بوون.

بەو شێوەیە وەك سکرتێری یەکێتی وەسفی دەکرد یەکێتی ئەو تەیرە جوانە بووە کە بە دوو باڵ دەفڕیو لەشە گەورەکەشی خەتی گشتی بوو، قاوغەکەی را داڕێژرا بوو، کە بیانوو بواری هیچ تەیارو لایەنێکی تری فکریو سیاسی نەمێنێ لە دەرەوەی ئەو قاوغەدا.

ئایدیۆلۆژیای: ڕێکخراوێکی مارکسی بوو له سەرەتادا بەلای (ماوی) دا، دژی ئیمپریالیزمی جیهانیو سەرمایەداریو ڕەجعیەتی ناوچەکەو برجوازیەتی ناوخۆ بوو، دۆستیشی ولاتانی سۆشیالیستیو هێزە ڕزگاری خوازو شۆڕشگێڕەکان بوو، نوێنەری زەحمەتکێشو هەژاری کوردستان بووه..ئەوەش ستراتیجیەت وخەتی سووری شۆڕشی نوێ بوو.

## دۆخی دروست بوونی:

١- باری ناوەکی: پ دك زۆر بەبێئومێدی جاری کۆتای شۆڕشی ئەیلوولی دا بە حزبایەتیشەوە، بۆ ماوەی سالێك تەنها جەو جۆلی حزبی شیوعیو پارتی- عزیز عقراوی-و پارتی شۆڕشگێڕی-عبدالستار تاهیر شریف-و بزوتنەوەی پێشکەوتن خوازانی-عبدالله اسماعیل- مەلا ماتۆر...هەبو، هەموویان لەریزی حکومەت بوون، حکومەتیش زۆر توندو زال بوو، ئیتر کوردایەتی دیسان کەوتەوە نێو شیعرو گۆرانیو شانۆگەری، کۆمەلە رایەك لەو سەردەمی باوی وەرگرت کە زیاتر گوتاری یەکێتی بوو گوایە ئەو شکستەی کورد لە ئەنجامی کوردایەتیەکی کلاسیکیو خێلەکیو ناکرەو دەست کورت لە: تیۆری زانستیو عەلمانیو مارکسی بووە، بەتایبەتی ئەو شکستەی ١٩٧٥ هاودەم بوو لەگەل سەرکەوتنە مارکسیەکانی ڤیتنامو کەمبۆدیاو لاوسو ئەنگۆلاو مۆزمبیق و... بەو شێوە تەیاری عەلمانی مارکسی زۆر تەشەنەی کرد لە کوردستانو حزبی شیوعیش لەبەر عیراقیانەیو لاوازی هەلوێستی بەرامبەر کورد ئەو شەپۆلەی پێ هەرس نەکرا، بۆیە ئەو شەپۆلە بووە زەخیرەیەکی قەبە بۆ (ی ن ك).

٢- باری ئیقلیمی: هەرسێ ولاتی (عیراق-بەعس، ئێران-شاه، تورکیا- ئەتاتۆرکی) ڕێکەوتنی خنکێنەریانەهەبوو لەدژی کورد، سوریاو عیراق ناکۆك بوون.

٣- باری جیهانی: جیهانی سەرمایەداری بەپێی (مەبدەئی بەرژەوەندی) ئەو لایەنە بوو هەر تیایدا بە کورد وە دەدرا (مـن جحـر واحـد..)، ولاتانی

شۆسیالیستو یەکێتی سۆڤیەتیش پەیمان نامەی ۲۰ ساڵی هەبوو لەگەڵ عێراق، ولأتانی جیهانی سێیەمو جامعەی عەرەبیش شۆڤێنیانە پاڵپشتی عێراقیان دەکرد، تەنیا کۆمەڵە ولأتێکی وەك (چین، کۆریا، لیبیا) لاتەریك بوو، ئەویش جگە لە (لیبیا- معمر قذافي) کەمتر ئامادەی هاوکاری بوون، بۆیە بارودۆخێکی ناوەکیو ئیقلیمی جیهانی زۆر سەخت بوو بۆ شۆڕشی دروست کردنەوە، بەلأم رێچکەیەکی تەسکی وا لەبەردەم مابوو کە کوردایەتیەکی بە ناوەرۆك مارکسی هاوچەرخ جیا لە مارکسیەتی شیوعیە رەسمیەکان دروست بێت ئەویش (ی ن ك) بوو.

## کەمێك لە مێژوی:

● هەر ساڵێك لەدوای دروست بوونی چالاکی پێش مەرگانەشیان لە شاخەکانی کوردستان دەستی پێکردو بە گەیشتنی کەسانی وەك (علي عسکری، د.خالد سعید، سید کاکە، محمد حاجی محمود..) بۆ ریزی شۆڕشی نوێ لەناوەوەدا تەکانێکی مەزنی پێدا، زۆر بەخێرایی رووبەرووی کێشە کۆنی (جەلالیو مەلایی) بوونەوە، لە هەموی ترسناك تر شەڕی هەکاری بوو لە ۱۹۷۸/٦/٤ (ی ن ك) شکستێکی گەورەی هێناو زۆربەی سەرکردە مەیدانیەکانی لەدەست دا، لە سەرەنجامدا کێشەش زیاتر کەوتە ناو ریزەکانی بە تایبەتی لەنێوان هەردوو باڵی بزوتنەوەو کۆمەڵە، (ی ن ك) هەر تەنها (۷۰) پێشمەرگەیەکی بۆ مایەوە.

● لەساڵی ۱۹۷۸ شۆڕشی ئیسلامی ئێران دەستی پێکردو لە ۱۹۷۹ سەرکەوت، ئیدی باری (ینك)و کورد بەگشتی لەو تەنگە خنکیە رزگاری بوو.

● لە هەمان ساڵ عێراق دیسان لە حزبی شیوعیداو دیسان بە کوردستان خۆیان گرتەوەو ئەو تیۆرەی (لا أصدقاء سوی الجبال) دەرکەوت بۆ ئەوانیشە، هەرچەندە هەڵوێستی حزبی شیوعی بەرامبەر جمو جۆڵی پێشمەرگانەی یەکێتی سەلبی بوو، بە رجعی دژ بە میری نیشتمانی لەقەڵەمی دابوو.

● لە ۱۹۷۹ بەهۆی کۆمەڵێك هۆکاری فیکریو ئیداریو مێژووییو دەروونی

بزوتنەوە بەتەواوی لە (ینك) جیا بۆوەو زیاتر لـە نیـوەی پێشمەرگەو فەرماندە هەرە چالاکەکانی لەگەڵ خۆی برد کە نزیکەی ۷٥۰ نەفەر دەبوون بە سەرۆکایەتی رەسول مەند.

● لەسـاڵی ۱۹۸۰ دوو بـەرەی دژ بەیـەك دروسـت بـوو، یـەکیان زیـاتر بـە سەرکردایەتی (یەکێتی) دووەمیان بە سەرۆکایەتی تەوەری پارتی‌و حسـك، حزبـی شیوعی لە هەردوو بەرەدا ئەندام بوو.

● لەدوای هەڵگیرسانی جـەنگی عێـراق- ئێـران، جـەنگی نـاوەخۆی کـە بـە (براکوژی) ناودەبرا بە گەرمی لـە هـەموو لایـەك‌و بەهـەموو روکارێـك دەسـتی پێکرد.

● لەساڵی ۱۹۸۱ یەکەم شەڕی سەرتاسەری براکوژی دەستی پـێ‌کرد و بـەهۆی درەنگ بەهاناهاتنی هێزەکانی (پدك) حسك شکستی هێنا، رۆڵی یـەکێتی زیـاتر پتەو بوو.

● لەساڵی ۱۹۸۲ (ینك) بەهانای حزبی دیمکراسی کوردسـتانی ئێران چوو، کـە بەرەو شکست بوو لـە بەرامبـەر هێزەکـانی پاسـداران‌و پ د ك، ئـەوکاتی نـاوی هێزەکانی یەکێتی بەهێزی پشتیوان دەخوێنرایەوە.

● لە یادی ۱۹۷٤/٤/۲٤ی بەردومانەکەی قەلادزەدا یـەکێتی تـوانی جـۆش‌و خرۆشێکی بێ‌وێنە بە خەڵکی بداو خۆپیشاندان‌و بەرگریەتی میللی لەناو شارەکان دروست بکا، زۆربەی ناوچەکانی سۆرانی گرتەوە، یـەکێتی زیـاتر بـەرەو گەشـەو حزبەکانی تریش بەرەو کزی بوون.

● لە جەژنی هەمان ساڵ بڕیاری دا لە (لەشکری ئیسلامی) بـداو هـەموویانی چەك کرد کە لەشکرێکی زیاتر دروست کراو نارەسمی بـوو، پەیوەنـدی زیـاتر بـە لیبیا بوو نەك ئێران، بەڵام (معمر قذافی) چاکەی بۆ کورد زۆر بوو وەستا.

● دوای ئەوە پەیکەری ئیداری‌و سیاسی‌و سەربازیشی گۆڕی، چوار مەڵبەنـدی کردەوە: مەڵبەنـدی (۱) لـە حـاجی مامەنـد (مـەلا بـەختیار بەرپرسـی بـوو)، مەڵبەندی (۲) لە یاخسـەمەر (جبار فەرمان بەرپرسی بـوو)، مەڵبەنـدی (۳) لـە

لەوەرتێ (سید مجید بەرپرسی بوو)، مەڵبەندی (٤) لە بالیسان (د.کمال خۆشناو) بەر پرسی بوو، کە پێکهاتبو لە (٣) بەرپرسی کۆمەڵەو یەکێتی شۆڕشگێڕان- کە لە یەکگرتنی بزوتنەوەی پاشاوەکەو خەتی گشتی یەکیان گرتبوو.

- لە ساڵی ١٩٨٢ لە سەرکردایەتی (حزبی شیوعی- حسك- پاسۆك)ی داو، گەورەترین زیان بە حزبی شیوعی کەوت، هێزی (پ دك) کەمتر لەناو کوردستانی عێراق بوو.
- هەموو ئەوانە زەمینەیەکی سازدا بۆ دانوستانێکی نیمچە ڕەسمی لەگەڵ حکومەتی عێراق بۆ ماوەی ساڵێکو تیایدا حکومەتی عێراق زۆر سوودی هەمەلایەنی وەرگرتو لەبارە هەرەتەنگەکەی فشاری سەربازی ئێرانی دەرچوو.
- سەرنەکەوتنی یەکێتی لەو ستراتیجیەی دانوستان لەلایەکو لەلایەکی تر ماندووبوونی حزبی شیوعیو حسك بە بیرۆکراسیەتی بڕیاری ئەوسای پارتی (وەك خۆیان دەیانوت)، لەولایەش ئەخشەی قەڵاچۆی کوردو ئەنفالو کیمیای بەرێوە بوو.. هەموو ئەوانە پاڵێنان نان بەرەیەکی (٨) لایی پێك هات لە ١٩٨٨/٥/٧، بەبێ ناوهێنان یەکێتی بوود سەرکردەی ئەو بەرەیە چونکە:

١- بە حوکمی بوونی یەکێتی لە مەیدان.
٢- ئامادەو جورئەتو مونەسەساتیەکەی.
٣- چالاکی خەستی سەربازیەکەی.
٤- داهێنانی سیاسیو ئیداریو پێشڕەوایەتی لە گۆڕانو بەرەنگاری.
٥- چاوشکانی لایەنەکانی تر.

- لەدوای ئەم هەنگاوە زۆربەی لایەنەکان، جگە لە حزبی شیوعیو بزوتنەوەی ئیسلامی پاسداریان لەگەڵ خۆ هێنا.
- لەدوای وەستانی جەنگی عێراقو ئێران کەوتنە دیوی ئێران، دارمانەکەی مارکسیەتیشی بەسەرهات، زۆربەی کادیرانو پێشمەرگەکانیان یان هاتنەوە عێراق یان بەرەو ئەورووپا چوون.
- لەو ماوەتریە چالاکی هەموو حزبەکان زۆر سست بوو، جگە لە جموجۆڵی

سکرتێری (ینك).

● لە ٢/٨/١٩٩٠ عێراق کوێتی گرت و بووە هۆی لێدانی، هەروەها هەڵگیرسانی راپەڕین لە ٥/٣/١٩٩١ کە دایەمۆکەی دیسان یەکێتی بوو زیاتر لە هەموان.

● یەکەم کۆنگرەی (ینك) لە هەولێر لە ١٩٩٢ بەسترا و تیایدا:

١- هەردوو باڵی کۆمەڵەو شۆڕشگێڕان هەڵوەشانەوە.

٢- سۆشیال دیموکراسی هاتە جێی مارکسیەت.

● لەدوای هەندێ کێشەی ئیداریو ناهاوسەنگی (بەرەی کوردستانی)و تەقەلای یەکێتی وەك حزبی سەرکردە گەیشتنە ئەو ئەنجامەی هەڵبژاردنێك بکرێتو یەکێتی وای دەبینی کە لە ٧٠٪ی دەنگ دەهێنێ، کەچی لەگەڵ زەحمەتکێشان بەیەك لیست دابەزین، ئنجا ٤٣،٨٪ی بەدەست هێنا، ١٤٠٤٦ دەنگی لە (پارتی) کەمتر هێناو یەکێتی بەو ئەنجامە قایل نەبوو، سیستەمی (پەنجا بە پەنجا) حکومەتو پەرلەمانیان دروست کرد.

● لە کۆتایی مانگی/١٢/١٩٩٣ شەڕێکی سەرتاسەری لەگەڵ (بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستان) کرد.

● لە ١/٥/١٩٩٤ خولی یەکەمی شەڕیشی لەگەڵ پارتی کرد، دوای گەشەسەندنی ئەو شەڕە هەریەکە لە پارتیو یەکێتی هێزی ئەقلیمیان هێنا بۆ ئەو شەڕە، لە ئەنجامدا بووە هۆی دوولەت بوونی ئیدارەو وەستانی پەرلەمان. تا لە ٢٠٠٢ یەکەم دانیشتنی پەرلەمان کراو یەکێتی بە ئەنجامەکەی هەڵبژاردنی ١٩٩٢ وەك خۆی قایل بوو، لەدوای ئەو هەموو شەڕو شۆڕە لەسەر دەسەڵات وا دەرکەوت یەکێتی دەسەڵاتی لاواز تر بوو.

## ٢-پارتی دیموکراسی کوردستان- سەرگردایەتی کاتی (س.ك) قيادة مؤقتة :

لەدوای شکستی ١٩٧٥خانەوادەی مەلا مستەفا بەرەو رۆژئاوا چوونو خەلکی تریش بێ هیچ رێنماییەك پەرتو بلاوبوون بە سەرکردەو بنکەوە، بەشێکی تریش گەڕانەوە عێراق، بەشێکی کەمی تری بزۆز بە نیازی نیشکردن بوو، لەوانە (سامی عبدالرحمن، د.محمود عوسمان، ...)، د.محمود بەتەواوی لێیان جیابۆوەو (پ د ك- لیژنەی ئامادەی) دروست کرد، عەلی سنجاری (یەکێتی دیموکراتی کوردستان)ی دروست کرد، سامی عبدالرحمن یش سەرکردایەتی کاتی (پ د ك) دروست کرد، بەپێی تەقویمی خۆیان لە ١٩٧٦/٥/٢٦.

ئایدیۆلۆژیای ئەوجارەیان زیاتر وەرچەرخا بوو وەك (یەنك) بەرەو سەربازگەی سۆشیالیستیو مارکسیایەتیو دوورکەوتنەوە لە رۆژئاواو دەرەبەگی ناوەخۆ، لە باروودۆخێك دروست بوون هەروەك لە پێشەکیەی (یەنك) نووسراوە، بەپێی ئەدەبیاتی (یەنك) ئەوانە لە کاردانەوەی دروستبونی یەکێتی دروست بوون، ئەگینا وازیان هێنابوو.

### کەمێك لە مێژووی:

بەپێی تەقویمی خۆیان هەر لەگەڵ دروستبوونی ئەو، (س.ك) لە مانگی (٥)ی گولان مەفرەزە سەرەتاییەکانی پێشمەرگەو (شۆرشی گولان)ی لێ دروست بۆوە.

- لەدوای دروست بوونەوەی کێشەی سەرکردایەتیان هەبوو، بارزانی قایل نەبوو بەو شۆرشو حزبایەتیە نوێیە، بۆیە لە سەرەتاوا رێکەوتن کە (ئیدریس بارزانی)وەك رابەرێکی هێنا، بەلام لە کۆنگرەی (٩) بە یەکجاری (سامی عبدالرحمن) لادراو (مسعود بارزانی) بووە سەرۆكو (س.ك) نەماو بۆوە (پارتی دیموکراتی کوردستان).

● سامی عبدالرحمن (حزبی گەل)ی دروست کرد.

● کەمتر دەهاتنە ناوچەرگەی کوردستان، زیاتر چالاکیان سنگۆشەی سنورەکان بوو، لە سالآنی ١٩٧٩، ١٩٨٠، ١٩٨٢، .. دەهاتنە کوردستانو لەلایەن یەکێتی دەردەکران.. تا بەرەی ١٩٨٨.

●لەدوای سەرکەوتنی شۆرشی ئێران ١٩٧٩ ئەوانیش بوژانەوەو لە وەلآمی پیرۆزبایی سەرکەوتنی (أ.خمینی) داوای لە بارزانی کرد بگەرێتەوە ئێران، بەلآم پێرا نەگەیشت، لە ١٩٧٩/٣/١ لە ئەمریکا وەفاتی کرد، بەپێی وتارەکەی نیسانی ١٩٧٩ی (مسعود بارزانی) مردنەکەی ئاسایی نەبوو بەدەستی ساواکو سیا بووە.[1]

● لەو ماوەیەدا زیاتر سەرقالّ بوو بە شەری حدکای دیوی کوردستانی ئێرانو لەولایەش لەگەلّ یەکێتی.

● لە ١٩٨٨/٥/٧ لە بارەگای حزبی شیوعی بەرەی کوردستانی جاردرا.

● لە راپەرینی ١٩٩١/٣/٥ بە شلۆقی هاتنەوە کوردستان لە چوارچێوەی بەرەی کوردستانی، هەرچەندە بەدوودلّی دەیانزوانیە ئەو ئەنجامەی راپەرین، بەلآم تەکانو خۆدروستکردنیان لە هاتنی سەرۆکی پارتی خۆی بۆ گۆرەپانی کوردستان راستەوخۆ ئەو تەوقانەی شکاند کە پێشتر بەری گرتبوون، تا لە شەری کۆرێ خۆی سەربەرشتیان بوو.. ئەگینا کادیرو لایەنگری کەم توانای هەبوو.

● لە کۆنگرەی (١١) کۆمەلێك کادیرانی بەتواناو ئەزموونی سۆشیالیستو پاسۆك هاتنە ناو پارتیو ناوەکەی بووە (پارتی دیمکراتی کوردستانی یەکگرتوو).

● لە هەلّبژاردنەکەی پەرلەمانو رابەرایەتی دەنگی یەکەمیان هێنا بەرێژەی ٤٥,٢٪ دەنگی رابەرایەتیش لە ٤٨,٣٪، ٢٥٦٧٢ دەنگی لە سکرتێری یەکێتی

---

[1] بۆ زیاتر بروانە وتارەکەی کاك مسعود لە ١٩٧٩ کە لە زنجیرە کتێبی (ئەوەی بەعس پێی نەکرا أ-رەوشەن کوردی) فیصل دباغ- لە بەرگی دواوەی نووسراوەتەوە، ئەو وتارە بە کاسێتیش بلاو بۆوە وەختی خۆی.

زیاتر هێنا.

- حكومەتو پەرلەمانیان بە (پەنجا بە پەنجا) دروست كرد، یەكەم شەڕیان بە هاوبەشی دژ بە (PKK) بوو، بە هاوكاری حكومەتی توركیا.
- لەدوایدا ڕووبەڕووی شەڕی ناوخۆی بۆوە لەگەڵ یەكێتی هەروەك قۆناغەكانی لەوێ نوسراوەتەوە.

## ٤-حزبی سۆشیالیستی یەكگرتووی كوردستان (حسك):

لە سالی ١٩٧٩ لەیەك گرتنی بالی جودابووەوەی (بزوتنەوەی سۆشیالیستی كوردستانی ناو یەكێتی) بە سەرۆكایەتی رسول مەمەندو (لیژنەی ئامادەیی-پارتی دیمكراتی كوردستان) بە سەرۆكایەتی د.محمود عوسمان دروست بوو، وا رێكەوتن كە رسول مند سەرۆكی ئەو حزبە بێتو د.محمود جێگر.

ئایدیۆلۆژیای: نەتەوایەتی+ سۆشیالیستی زانستی.

### كەمێك لە مێژووی:

بەدیلی ئەو دۆخە مێژووییەی بە میرات وەك تاكۆكی مابۆوە لەنێوان (جەلالیەتو مەلاییەت).. بە زاراوەی خۆیان) وا دەهاتە بەرچاو كە هێزێكی سێیەم بێت، بۆیە لە سەرەتا حسك زۆر گەشەی كرد كەسانی سیاسیو سەربازی وەك :(شمس الدین موفتی)، (عدنان موفتی)، (قادر جەباری)، (تاهر علی والی)، (مەلا ناصح)، (محمد حاجی محمود)، (قادر عزیز)، (عادل مراد)، (عبدالخالق زەنگەنە)، .. (سید كاكە)، (عولا بۆر)، (عولا سور)، (سید سلیم)، (ئەنوەر مجید سولتان)..تیابوو.

● لەدوای ئەو لێك جیابوونەوانە نەخشەیەكی سەربازیو سیاسی وا خەملی كە ناوچەكانی بادینان تەنها پارتی لێ بوو، سۆرانیش حسكو یەكێتی تێك ئالابوون، ئیتر بەو عەقڵیەتە ستالینیانەی ئەو سەردەم هەمر زوو تێك گیرانو بەخێرایی مێژوویی ئەو حزبە بووە شەڕی براكوژی با ئەشی ویستبێ.

● ئەویش لەسالی ١٩٨٠ لەرێی د.قاسملو دانوستانێكی یەك لایەنی جارنەدراوی لەگەڵ حكومەتی عێراق كرد بێ هیچ ئەنجام.

● لەسالی ١٩٨١ رووبەرووی شەڕێكی سەرتاسەری بوو لەگەڵ (ینك)و شكستی هێنا هەرچەندە لەسەربازیش ئەو بەهێزتر بوو، بەلام لە ئەخشەو پلانی

سیاسی زیاتر شكستی هێنا.

● لەدوای كارەساتی پشت ئاشانی ١٩٨٢ بە یەكجاری ئاودیوی ئێران كران.

● لە ١٩٨٥/١٢/١٢ قادر عزیز وەك تەیاری ماركسی ناو حسیك جیابووەوەو حزبی زەحمەتكێشانی كوردستانیان دروست كرد.

● لەدوای ماندوبونێكی زۆر بە سستی پارتیو بیروكراتیەتی- وەك لەوكاتی وتیان لە١٩٨٧پێش جاڕدانی بەرەی كوردستانی بەخۆیانو سەركردایەتیان لەگەڵ حزبی شیوعی تەسلیمی ئەمری واقیعی یەكێتی بوونەوە، بە یەكجاری وازیان لە هاوپەیمانیەتی پارتی هێنا، دوایش بوونە لایەنێكی لاواز لە بەرە هەشت قۆلیەكە.

● لە راپەڕین رۆڵێكی بەرچاویان هەبوو لە چوارچێوەی بەرە.

● لە هەڵبژاردنەكەی ١٩٩٢ لە ٢,٥٪ دەنگیان هێنا، بۆ راپەڕیش د.محمود تەنها ٢٣٣٤٢ دەنگی هێنا.

● لە ١٩٩٢/٢/٥ بوونە دووبەشی (سید كاكەو محمد حاجی محمودو قادر جەباری) لەگەڵ (پارتی گەل- سامی عبدالرحمن) یەكیان گرتو یەكسەر هاتنە ناو پارتی، بەشەكەی تریشی بە سەركردایەتی رسول محمد چوونە ناو یەكێتی.

● لە كۆنگرەی (١١)ی پارتی جارێكی تر دیسان محمد حاجی محمود لە پارتی جیابووەوەو حزبی سۆشیالیستی دیمكراسی كوردستانی دروست كرد، تا ئێستاش وەك لایەنێكی ناسەرەكی جمو جۆڵی سیاسی هەیە.

## ٥- حزبی شیوعی کوردستان (حشك):

بەرەسمی لە ١٩٩٣/٦/١٨ بەدراوە بە حزبێکی کوردستانی لیست دەکرێ، لە کۆنگرەی (٥)ی (حشع) کە لەژێر دروشمی (الدیمقراطیة والتجدید) بەسترا، پێشتر لیژنەی هەرێمی کوردستان بوو لە (حزبی شیوعی عێراقی-حشع)دا، ئینجا بووە حزبێکی سەربەخۆ بە سەرۆکایەتی (کریم احمد).

ئایدیۆلۆجیاکەی روونە- مارکسی- لینینی.

### کەمێك لە مێژووی:

هەڵبەتە بەپێی پێناسی (حزبە کوردستانیەکان)، (حشع) حزبێکی کوردستانی نیە تا ئەو مێژووەی سەروو، بەڵام مێژووی (حشك) هەر مێژووی (حشع)ە، بۆیە دەبێت شتێکی بەخێرایی هەر لێ باس بکەین.

+ لە ١٩٣٣/٣/٣١ بەناوی (لجنة مكافحة الاستعمار) بزوتنەوەیەك دروست بوو بە سەرۆکایەتی (عاصم فلیح)، لەدوای گەڕانەوەو دەرچوونی لە (زانکۆی شیوعی) مۆسکۆ.

+ لە ١٩٣٥ بووە (حشع)، دوای لە ١٩٣٨ سەرۆکایەتی بە (یوسف سەلمان-فهد) سپێردرا (مسیحی بوو)، لەگەڵ (عزیز محمد، زکی خیری، عامر عبدالله، مکرم تالەبانی، کریم احمد...).

+ هەڵوێستیان بەرامبەر کێشەی کوردجێگیر نەبور جاروابور بە نازیو کرێگرتەیان لەقەلەم دەدا جاریش وابوو داکۆکیان لە مافی چارەی خۆ نووسیبۆ کوردستان دەکردەوە، بەتێکڕاییەکەی بەندیان کردبوو بە چارەنووسی کێشەی پرۆلیتاریا لە عێراق.

+ زۆر جار دوو لەت بوونە یان لەتی تری لێ بوویتەوە لەوانە :(کتلة العمل، وحدة النضال، لجنة الوطنیة الثوریة، الاتحاد، رایة الشغیلة).. بەڵام سەرەکیەکەی

لە ساڵی ١٩٦٧ لەسەر کێشەی چینیو سۆڤیەتی ئەوانیش لێرە دابەش بوون بۆ:

١- قیادە مرکزی- عزیز الحاج- چینی.

٢- لجنە مرکزی- عزیز محمد- سۆڤیەتی.

+ لەدوای چوونە ناو شۆڕشی ئەیلول لە ١٩٦٣ هەتا دوای ڕێکەوتنی ئادار دیسان لەگەڵ حزبی بەعس (بەرەیەکیان) ڕاگەیاند لە ١٩٧٣و چەکیشیان وەرگرت.

+ لە شەڕی چارەنووسی ١٩٧٤-١٩٧٥ لە بەرەی حکومەت بوون.

+ لە دوای شکستی ١٩٧٥و نەمانی شۆڕشی کورد یەکسەر هەم چەك کرانو سیاسەتی (ضغط على القواعد وتقريب القيادة)یان لەگەڵ بەکارهاتو زۆر لاوازی کردن تا لە ساڵی ١٩٧٨ بەناچاری دیسان بەرەو شاخەکانی کوردستان هاتنەوە.

+ لە ١٩٨٣/٥/١ لەدوای نێوان کردنێکی نەزانانەی شەڕی براکوژی خۆیان بوونە گەورەترین بەراگێر، بە کارەساتی (پشت ئاشان) بەناوبانگە کە نزیکەی ٢٠٠ کادیرو پێشمەرگەیان بەدەستی (ی ن ك) لەناوچوون بەدیلەوە، هەریەکە لە (کریم احمد، احمد بانی خێلانی)و سەرکردەکانی تریان دەستگیر کران.

+ تا لە ١٩٨٨/٥/٧ لە ڕێکەوتنە سەرانسەریەکە (حشع)یش لایەنێك بوو لەو (٨) لایەنەی بەرەی کوردستانی.

+ لەدوای ڕاپەڕینو دارمانی شیوعیەت لە مەدرەسەوە زیاتر فیکرەی دروست کردنی (حشك) هاتە ئارا، بەتایبەتی ئەو دەنگەی لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانی کوردستان کە تەنها ٢١١٢٣ دەنگی هێنا دەکا لە ٢٠,٠٪

+ لە کۆنگرەی (٥)ی شەقلاوەی ١٩٩٣ (حشع) بووە چەند پارچەیەکی وێستراو ئەویستراو:

١- حشك- کریم احمد

٢- پارتی کاری سەربەخۆی کوردستان (ابو حکمت)و (محمد حەلاق).

٣- حشع- دحمید موسی.

جیابوونەوەی (حشك) بە ڕێکەوتن و نەخشەو پلان بوو، لە ئەسڵدا ئەوە لیژنەی هەرێمی کوردستان بوو کە لە کۆنگرەی (٣) ی ساڵی١٩٦٧ بڕیاری لەسەر درابوو، ئەو حزبە بە حوکمی مێژوویی و دابڕانی لە کێشەی کوردو ئایدیۆلۆجیە (مارکسی لینینی)یە زەقەکەی ئێستا وەك حزبێکی بچوك لە کوردستان کەمتر ئاسۆی گەشەکردنی لە پێشە.

## ٦- کۆمـەڵ و بزوتنەوەی ئیسـلامی لە کوردستان:

چەند بەراوردێکی جیا لە ئەدەبیاتی ئەو بزوتنەوە هەیە وەك یادی دامەزراندنی، چونکە لەپێشتر ڕێکخستنی (ئیخوان) لەپەنجاکان لە کوردستان هەبووە، بەشێك دەیگێڕنەوە بۆ پێش ۱۹۸۰، بەڵام ئەوەی روونە لە ساڵی ۱۹۸٤ بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی لە کوردستان دامەزرا بە رابەرایەتی ئۆرمی م.شێخ لەتیف و .شێخ محمد بەرزنجی، دوای لەساڵی ۱۹۸۷ لە ئەنجامی یەککگرتنی کۆمەڵە زانایەك لەگەڵ ئەو (پەیوەندیە) بزوتنەوەی ئیسلامیان راگەیاند بە رابەرایەتی (شێخ عوسمان عبدالعزیز)و یەکسەر جاری شۆڕشیان دا، دابەزینی هەریەکە لە شێخ محمد بەرزنجی و . شێخ لەتیف لە رابەرایەتی و متمانە پێدانە رابەری نوێ ئەزموونێکی نوێ بوو لە سیستەمی سەرکردایەتی و وەدەست گۆڕی دەسەڵات و هەتا دیموکراسیش کە لە قۆناغی نوێی کوردایەتی هەر شەڕی لەسەر کراوەو وادەکرێ.

### کەمێك لە مێژووی:

+هەر کەوتنە شاخ زۆر بەخێرایی هێزەکانی دروست کرد بەناوی لەشکری قورئان، لەچەند داستانێك وەك قەڵاتووکان، دەشتی هەولێر، سلێمانی ... متمانەیەکی سەرەتای لەناو خەڵك دروست کرد، کە پێشتر ئەزموونی (لەشکری ئیسلامی) بێمتمانەی کردبوون، هەرچەندە سەرکردایەتی ئەو بزوتنەوەیەش هەمیشە لە سەرەتادا دەست کورتی لە ئەزموونی سیاسیو واقیعو پەیوەندیە ئیقلیمیو جیهانیەکان پێوە دیار بوو.

● لە ئەفترەی ۱۹۸۸ تا راپەڕین تاکە لایەن بوون کە ئەو جۆلی ڕێکخستنیان لە گەشەکردن بووە، بۆیە لە راپەڕینەکان بەشداریەکی کاریگەریان هەبوو لە پلەی (۲) (۳). هەم لە ڕاپەڕینەکەو هەم لە بەرگریەکانیشدا لە هەندێ دۆخدا لە پلەی

یەك بوون.

• هەم لە دانوستانەکەی ۱۹۹۱ی بەرەو حکومەت بەشدار نەبوون، هەم لە هێنانی پاسدارانیش بۆ کوردستان ئەوانو حشع بەشداریان نەکردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا ئەندامیش نەبوون لەو بەرەی کوردستانیە.

• لە دوای راپەڕین زۆر بەخێرایی گەشەیان کرد، یەکەم کەناڵی تەلەفزیۆنی لە کوردستان لە رانیەیان کردەوە.

• لە هەڵبژاردنەکانی ۱۹۹۲ سێیەمین دەنگی هێنا بەرێژەی ۵٠,٠٠، ٤۹۱٠۸ لە لیستی رابەرایەتیش ۳۸۸۱۵.

• لە مانگی ۱۹۹۳/۱٠ لە چەمچەماڵ دوایش لە مانگی ۱۹۹۳/۱۲ لەگەڵ (ی ن ك) تووشی شەڕ بوون.

•لە بۆسەیەکی بازگەی گەرمیانی (ینك) لە ۱۹۹۳/۱۲/۱۸ لە سەیارەیەکی (باسك) دراو سەرەتای شەڕێکی سەرتاسەری بووە شکستی بزوتنەوە.

• لەلایەن ئێران، مجلس أعلی، حزب الدعوه، حزب الله ی کورد، حزب الله ی لبنان، حزبی رفاه، ... زۆربەی بزوتنەوە ئیسلامیەکانی تریش نارەزاییان دەربڕی، حزبە کوردستانیەکانیش یان بێدەنگ بوون یان لارییان نەبوو.

• ئەو شکستە نەبووە داستان بۆ یەکێتی وەك جاران لەگەڵ (پدك)و (حسك)و (حشع) کردبووی، چونکە بە کەمێك پێشمەرگەی بزوتنەوە بەرگریەکی بێوێنەی هێزێکی زۆری (ینك) دەکرا، بۆیە هۆی شکستیەکە بە سادەیی دەرکەوت کە بێبەرنامەیی سەرکردایەتی بوو.

• رەوتی گەشەیان لەکار نەکەوت، هەرچەندە متمانەو ئەوژمی رابوون لە بەرهاریدا پشتەوشکێن کراوە.

• لە جەنگەکانی مانگی ۱۹۹٤/۵ بە قورسی خۆی سەلماندەوەو هاتەوە مەیدان.

•لە خولی دووەمی جەنگ بەشدار نەبوون، بۆیە لە کۆتاییدا لە پاوانکردنی

هەر لایەی بۆ دەسەلاتی خۆی روبەرووی تەنگەبەری بوونەوە لە هەردوولا.

- لە کابینەی (٣)ی پارتی بە دوو وەزیر بەشدارییان کرد.
- لە دوای شەڕو پێکدادانێکی زۆر لەگەڵ (یەنک) لە نیسانی ١٩٩٧وەستانی جەنگ، رێکەوتننامەی تارانیان مۆر کردو لە حکومەتی سلێمانیش بەشدار بوون بە دوو وەزیرو بووە هۆی کشانەومیان لە حکومەتی هەولێر.
- لە کۆنگرەی (٧)یاندا کۆمەڵێك گۆڕانکاری ناوەکی لەسەر هاتە دی، لەوانە گۆڕینی رابەر لە (م. عوسمان) بۆ (مەلا علی عبدالعزیز) کە ئەوە سێیەمین رابەر بوو دەگۆڕا.
- لە ١٩٩٨/٨/٢١ لەگەڵ (بزوتنەوەی راپەڕین) یەکیان گرتو (بزوتنەوەی یەکبوونی ئیسلامی کوردستان) یان لێ هاتە دی.
- دوای لەکۆنگرەی (٨) هاوپەیمانیەتی هەردوو باڵی عەلی باپیرو صدیق عبدالعزیز دەرچوون و باڵی عەلی عبدالعزیز شکستی هێنا.
- ئەو ئەنجامە لەلایەن جەماعەتە دەرنەچووەکان قەبوول نەکرا، بۆیە بوونە سێ بەش: ١- زۆرایەتیەکەی کۆنگرە کۆمەڵی ئیسلامی بە ئەمیرایەتی م.عەلی باپیریان دروست کرد ٢- ئەنصارو ئیسلام ٣- لە هەموان لاوازتر ئەوانەی دەنگیان نەهێنابوو تاویان لە خۆناوە بزووتنەوەی ئیسلامی.

## ٧- یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان :

بزوتنەوەیەکی ئیسلامی چاکسازیە (وەك خۆیان وایان پێخۆشە بگوترێ) هەرچەندە هەموو بزوتنەوەیەکی ئیسلامی بگرە هەموو بزووتنەوەیەکی سیاسی چاکسازیە، لە ١٩٩٤/٢/٦ بە ئەمینداریەتی (م. صلاح الدین بهاءالدین) راگەیەنرا،واتە پێشتر هەبوونیە نەك لەو بەروارەدا، لە ریز رارەوی (ئیخوان)ی جیهانیە، لە کورستانیش جەو جۆڵی خێرخوازیو جارجار سیاسیش هەبووە، بەڵام رێکخراوێکی کوردستانی نەبوونە، وەك مەسەلەی (حشع)، بۆیە لەو بەروارەدا مێژووی سیاسی دەست پێدەکات بە پێی پێناسی (حزبە کوردستانیەکان).

### کەمێك لە مێژووی :

- لە دوای دارمانی خەلافەت لە١٩٢٤/٣/٣ بە تەواوی، لێرەولەوێ لەنێو رەوشەنبیرانی بیر ئیسلامی رێکخراوو دەستەو کۆمەڵە دروست بووە، هەر لە ئەندۆنیسیا هەتاولاتانی عەرەبی، لە هەمووی گرنگتر (برایانی موسڵمان).. بەڵام ئەو بزوتنەوانە لەدوای شۆرشی ١٩٧٩ی ئێران تەکانی پێدراو لە (افبة)ی دابەزی بۆ ناو شەقامو گۆرەپانی سیاسی گشتیو میللەتانەش. ئەو کاریگەریە لەبەر چەندین هۆی گشتیو تایبەتی زیاتریش لە کوردستان کرد.. ئیتر لە جەو جۆڵی خێرخوازیو رێکخستنی زیندانی دەرچوو بە تایبەتی کە شۆرشی ئەفغانستانیشی بەدوادا هات.
- زەمینەیەکی جیهادی سازا، بۆیە (ئیخوان)ی جیهانیش لە سەرەتا بە خێرایی بەرەو جیهادی وەرچەرخان، بەڵام لە یەکەم ئەزموونی (سوریە)یاندا شکستی هێنا، دیسان هەڵومستەیان کردەوە.
- لە کوردستانیش بە هەمان شێوە لە سەرەتادا لەگەڵ بزووتنەوەی ئیسلامی پێکەوە بوون تا لە هەڵبژاردنەکەی ١٩٩٢ بە یەك لیست دابەزین، دەتوانین بە

حیسابێکی سادە ڕێژەی دەنگەکانی ئەوانیش دەرخەین، سەرجەم دەنگی لیستی پەرلەمانی بزوتنەوە ٤٩١٠٨ دەنگ بوو، ڕابەریش ٣٨٨١٥ بوو، خەتی برایان (واتە یەکگرتوو) ڕایان بۆ ڕابەرایەتی نەدا، بۆیە دەنگی یەکگرتوو دەکا: ٤٩١٠٨ - ٣٨٨١٥= ١٠٢٩٣، بەڵام هەر لە سەرەتادا تێبینیو وریایەکی زۆریان بەرامبەر سەرکردایەتیو ڕابەری بزوتنەوەی ئیسلامی هەبوو لەبارەی کەم ئەزموونیو نەشارەزایی لە زانستی سیاسەتو پلانو ستراتیجیەتو کۆمەڵێك کێشەی تر، بۆیە هەر لە گەرمەی شکستی بزوتنەوەو بەرامبەر شەڕی یەکێتی یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان ڕاگەیەنرا، کە زۆرجار (ئەوکاتەو هەڵو مەرجە) جێی سەرزەنشتی هاوڕێیانی ئیسلامیەکانی تریانە.

لەدوای دروست بوونیان بەخێرایی دەزگاو بارەگاکانیان دروست بوو، یەکەم کۆنگرەی ئاشکرایان گرێدرا بێ ئەوەی گۆڕانێکی وا لە نەخشەی سیاسیو سەرکردایەتی بێتە دی، لە ناوچەکانی بادینان زیاترو بەرچاوتر گەشەیان کرد کە پێشتر ئەو وەڵامە جەماوەریە کەمتر بۆ حزبی تر بووە، بەڵام لەدوای فشارو تەنگەبەری دیسان بەرەو لاوازبوونەوە چوون لە کاتێکا کە هیچ هێزێکیان نیە بۆ پارسەنگی فشارەکان.

## لە پارچەكانی تری كوردستانی

لە راستیدا حزبە كوردستانیەكان وەك زاراوە زیاتر حزبەكانی چوارچێوەی ئەزموونی كوردستانی عێراق دەگرێتەوە، بەڵام كە دەڵێن حزبە كوردستانیەكان هەرگیز فراوانترە لەو ئەزموونە.. بۆیە دوو نمونەی سەرەكی كوردستانی ئێران و توركیا بە خێراییەك باس دەكەین.

## ٨- حزبی دیمكراتی كوردستانی- ئێران (حدكا)

لە ساڵی ١٩٤٦ی ئەزموونی كۆماری مەهاباد دروست بوو،– وەك لە پارتی بەشی عێراق باس كرا –لە پێشیدا لە ١٩٤٥/٨/١٦ (ژ ك) بوو بە حزبی دیمكراسی كوردستان بە سەرۆكایەتی قازی محمد.

● دیارە پەیوەندی (پ دك) بەشی عێراق و شای ئێران (حدكا)ی خستبوە دۆخێكی تەنگ تا رووخانی شا، هەر بۆیەش دوو حزبی ناوەرۆك تەواو لێك جیان.

● لە نزیك كۆتاییەكانی شۆڕشی ئێران (حدكا) دەوری پەیدا كرد بە سەرۆكایەتی د.قاسملو، ئەویش لە ئەوروپا گمرایەوە ناوچەرگەی رووداوەكا، لەگەڵ سەركەوتنی شۆڕشی كوردستانی ئێران بارێكی تایبەتی بەخۆوە گرت بەهۆی ئەو حزبەو (كۆمەڵە) زیاتر ماركسی بوو كە لەلایەن (محمد مهتدی) دروست كرا كە پێش تر ئەندامێكی ئەو حزبە بوو.

● سێ شەڕ لەناوە، سنە، نەغەدە، هەلگیرسا، زیاتر حدكا دەركەوت.

● چەندین شەڕودانوستان شان بەشانی یەك كران و هەریەكە لە (أ. تالەقانی)و سەركردەكانی كوردستانی عێراق ئامۆژگاری (حدكا)یان كرد كە جەنگ لە قازانجی كورد نیە.. بەڵام وا دیاربوو هەر یەكە لە (كۆمەڵە)و (مجاهدین و فدائی خەلق) لە ئێران و حكومەتی عێراقیش رۆڵێكی چالاكیان بینی لە دروستكردنی

ئەو شەڕە.

● لە ساڵی ١٩٨٠ شەڕی عێراق-ئێران دەستی پێکرد، بەدوای ئەوەدا (حدکا) بە تەواوی لە بەرەکان لە بەرامبەر هێرشەکانی (پاسدارو قیادة مؤقتة) شکا، یەکێتیو عێراقیش هاتنە پشتیوانی حدکا.

● ئەو حزبەش بەهۆی فیکری عەلمانیو کاریگەری چەپی زۆر جار روبەڕووی دوولەت بوون بووە، لە کۆنگرەی ١٩٨٠/٦/٢١ گرۆهی (٧) نەفەری بە سەرۆکایەتی (غەنی بلوریانی) جیابوونەوەو ناوی مارکسیو سەر بە توودەیان لێنرا، جارجاریش لەو لایە لەگەڵ کۆمەڵە تووشی شەڕ دەبوون، لەگەڵ قیادەی مرەقەتەی (پارتی) هەر لەشەڕدا بوون.

● حدکا جارێکی تریش دوو لەت بوونەوە باڵی (جلیل گادانی- نەقەلیەت) جیابوونەوە.

● د.قاسملو لە ١٩٨٩/٧/١٣ لەڤیەنا تیرۆر کرا، د.شرف کەندی هاتە جێی، دوای ئەویش تیرۆر کرا.

● دیسان (حدکا)بوونە دوولەت ئەو جارە سکرتێرەکەی (مستەفای هجریە)و باڵی نەقەلیەت گوایە عبداللە حسن زادەیە،چالاکی عەسکەری لە ساڵی ١٩٩٦وە بە یەکجاری نەماوە

● چەند جارێك هێزی ئێرانی بەناو سنوری یەکێتی هاتونە سەر بارەگاکانیان لە کۆیە.

● ئێستا زیاتر روو لەو بۆچوونەیە کە سود لەو ئازادیو ژیانی سیاسیەی هەڵبژاردن وەرگرن کە رەخساوە لە ئێران بەهۆی دەستورێکی شەریعەتیەوە.

## ٩- پارتی کرێکارانی کوردستان PKK :

- ڕاپەڕینەکانی کوردستانی تورکیا: ١٨٢١، ١٨٤٧ بۆتان، ١٨٥٣ جزیرە، ١٨٨٠ شێخ نەهری، ١٩٢٠، ١٩٢٥، ١٩٢٧، ١٩٢٨، ١٩٣٠، ١٩٣٤، ١٩٣٧، ١٩٣٨، ١٩٣٩... لە پاش چلەکان جۆرە بێئومێدیەك باڵی کێشا، دیارە شۆڕشی ئەیلول ئەو ئاسەوارەی نەبووە لەسەر کوردستانی سەروو بۆیە (پارتی لقی تورکیا بەرەبەرە پوکایەوە)
- لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران جیهان بەگشتی هەژا، کوردیش لە هەموان زیاتر، بۆیە لە سەرەتاکانی ٨٠ زیاتر لە ١٢ لایەنی (مارکسی) تەنها لە کوردستانی سەروو دروست بوو، لەوانە: (کاوە، دەنگی کاوە، ئاڵای رزگاری، دەدە قادە، حزبی سۆشیالیست، PKK، ...).
- بەپێی تەقویمی خۆیان لە ١٩٧٨/١١/٢٧ لە ناوچەی ئامەد (دیاربەکر) دروست بوونە، یەکەم کۆنفرانس لە ١٩٨١/٧/١٥ کراو، یەکەم جەو جوڵی پێشمەرگایەتیشیان لە ١٩٨٤/٨/١٥ لە شەمزینیان دەستی پێکرد، ئەو حزبە مێژووەکەی زۆر بەندە بە سەرۆکەکی (عبداللە ئۆجەلان- ئاپۆ) کە لە ساڵی ١٩٧٠ لە چالاکی خوێندکاریەکەی دروست بووە و بڵاوکراوەی (سەربەخۆبوون)ی دەرکردووە، لەسەر رێبازی (مارکسی- لینینی)ی هەرە شۆڕشگێڕیان پەیڕەو کردووە.
- پەیوەندیەکی بەتینی لەگەڵ (بەرەی میللی فەڵەستین- جۆرج حەبەش) هەبوو بۆیە گەریلاکانی لە لوبنان ڕادەهێناو (ئاپۆ) خۆی لە بیقاع بوو.
- دوای ڕاپەڕینی١٩٩١ی کوردستانی خوارود ئاسۆیەکی فراوانتری بۆ ڕەخساندن، لە سەرەتادا زۆربەی لایەنە چەپی و عەلمانیەکانی کوردستانی عێراقیش (ئاپۆ)ی بە ڕابەرو مونەزیری خۆی دەزانی.
- پرۆژەی ئابووری و سیاسی باش دارشتو حزبەکانی تری لاوازکردو، تێزگەو

کەناڵی ئاسمانی دروست کرد.

● لە ١٩٩٢ بۆ یەکەم جار رووبەرووی هێزی هاوپەیمانی (پدك)و (ینك) بۆوە بە هاوکاری تورکیا.

● بە یەك لایەنی تا ئێستا ئەوە پێنجەمین جارە شەڕ رادەگرێت بێ ئەوەی تورکیا وەڵامی هەبێ.

● لە ١٩٩٥/٨/٢٥ لەناکاو هاتە ناو شەڕی ناوخۆی کوردستانی لە قازانجی یەکێتی لە دژی پارتی، هەرچەندە بەپێی PKK هۆکەی دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دەڵێن (پدك) لە ١٩٩٢ڕا شان بەشانی تورکیا لەناو خاکی کوردستانی تورکیا شەڕو راوە پێشمەرگەی PKK دەکا، هەرچەندە ئێستا هەڵوێستی سەرکردایەتی کوردی ئێراق بەرامبەریان باشە.

● لە ١٩٨٨ تورکیاو ئیسرائیل کەوتنە هاوپەیمانیەکی ستراتیژی‌و ئوردنیشیان راکێشاو چواردەورەی سوریا تەنگ بۆوە بووە هۆی دەرپەڕاندنی (ئاپۆ)و دوای لە کینیا لە ١٩٩٩/٢/١٦ کەوتە داوێکی ئاڵۆزی دەزگا سیخوریەکانی سیاو میتو مۆساد رفێنراو بە سڕکراوی بۆ ئیسرائیل‌و لەوێش بۆ تورکیا تا ئێستا زیندانیە بۆ هەتاهەتایە.

● دوای ئەو هەنگاوە PKK شەڕی وەستاندو‌و هێزەکانی کشاندۆتەوە دەوروبەری قەندیل لە دوای چەند شەڕێك لەگەڵ (ینك) زیاتر جێگیر بوو.

**( ٤٧ )**

## ماسۆنی الماسونية Masonism

ڕێکخراوێکی فیکری و نهێنی کۆنی خێرخوازی و مرۆڤایەتی یە بە پێناسی خۆیان، ئەوانە سنووری جوگرافی کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتی و ئاینیان نییە، جیهانینە، خۆ بە ڕزگارکەری مرۆڤایەتی دەزانن، بە ناوی (بنیاتنانی سەربەستی)یەوە .

بوونی ڕاستەقینەیان و دروستبوون و دامەزرێنەرەکانیان لێڵترین بابەتە، بۆیەش ڕیوایەتی زۆری لەسەرە، بەشێك پێی وایە لەگەڵ بوونی مرۆڤ و مێژوو ئەوانەش هەنە، بەشێکی تر زیاتر مێژووەکی دیاریکراویان بۆ نووسیوە دەیان گێڕنەوە بۆ ٤٠٠٠ ساڵ (پ. ز)، بەشێکیش تر پێیان وایە ڕاستەوخۆ ڕێکخراوێکی یەهوودی یە، بەمەبەستی زاڵ بوونیان بەسەر جیهان دروست بووینە، لەوانە فەرهەنگی ( الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب المعاصرة)[1] بەڕاشکاوەتر دامەزرێنەرومێژووەکەی دەستنیشانکردووەو گوڵیە لە (٤٤ ز) شای ڕۆمان (هیرۆدس ئەکریا) دروستی کردوون بەهاوکاری ڕاوێژکارە یەهودییەکان، هەشە پێی وایە لە سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەورووپا دروست بووینە، بەشێکی زۆریش هەیە پێی وایە ماسۆنییەت هەر گۆتەیەو ڕاستەقینەی نییە،

[1] لە ماددەی (الماسۆنیە) سەرنج بدە .

## سەربردەو هۆی دروست بوونی:

لە لایەن ئەوانەی کە پێیان وایە ماسۆنی یەت بوونی ڕاستەقینەی هەیە بەبێ لایەنی دەیتوێژنەوەوای بۆ دەچن کە لە بنەچەدا خەڵکانێك بوونە پیشەیەکی تەکنیکی سەرەتاییان هەبووە، ئەو پیشەیەش لەلایەن دەسەڵاتدارە کۆمەڵایەتی یەکان بەرەبەرەکانی کراون، بۆیە ئەوانە پێویستیان بە پارێزگاری هەبووە لە دەسەڵاتی دەرەبەگو ئاغاو سەرەك خێڵەکانی ئەو سەردەم، بۆ ئەو مەبەستە ڕێکخراوی (ماسۆنیان) دروست کردووە لە سەدەی (١٣) لە پەنای کنێسە، بەناوی (ماسۆن) واتە بیناکەر، لەوشەی (froacs-masone) هاتووە واتە ( البناؤون الأحرار) (بیناکەرە ئازادی خوازەکان)، گوایە ئەو ناوە وێنەی ئەو جوولەکانەیە کە لە بابل گەڕانەوە بە دەستێك شمشێرو بە دەستێکی تر ئامرازی بیناکردنیان هەڵگرتبوو، لەناو فۆلکلۆری کوردیش ئەو ناوە نامۆ نی یە بە سەلبی هەیە کاتی وەسفی یەکێك بە خراپەو فێڵبازو ڕقەستوور دەکرێت پێی دەڵێن ( ئەو فەڕماسۆنە).

یەکێ لە ئامانجەکانیان دروستکردنەوەی پەیکەری (سلێمان) لە قودس، هەرچەندە تا ئێستا گەڕاونو دەگەڕێن بە دوای ئەو پەیکەرە لە قدس تەدۆزرایەوە، بۆیە تا ڕادەیەکی زۆر هاوبەندن لەگەڵ ( زایۆنی)، بەو شێوەیە شان بە شانی دەسەڵاتی سیاسی ئەوان لە پەنای دەسەڵاتی (ناسیاسی) هاتوون، جێ پەنجەیان لە زانستو فەلسەفەو ئایدۆلۆجیاو تیۆرە سیاسی یەکان هەیە، لەدوای وەرگەڕانی کنێسە بۆ شۆڕشی پیشەسازی، بارەکانیان ئەوجارە کەوتەوە ژێر پەردەی کۆمپانیاو خەستەخانەو بیناکانی حوکومەتی ستراتیژی، تا دەگاتە ڕێکخراوە خێرخوازو دەزگا جیهانییەکانی تری مرۆڤایەتیو زانستیو تەندروستیو منداڵ پارێزی ... هتد، لەوەوە تێڕوانینێکی گومانلوی خستی ڕەمەکیو ئارەمی بە زیادەوە دروست کردووە لەسەر دیاردەو ڕووداوو هەڵوێستەکانی جیهانی، بە سەلبیو نیجابی بەوە، ئیتر تیۆری (گومان، پیلان،

سیناریۆ ...) ..وەك نەخۆشی بەشێکی زۆری ڕوشەنبیرو سیاسەتمەدارانی جیهانی سێیەم بەگشتیو جیهانی ئیسلامی بەتایبەتی گرتۆتەوەو گومان لە هەموو شتێك دەکەن، جاروایە گومان لە هەڵوێستو ڕووداوی ڕاستەقینەش دەکەن، ..ڕەنگە ماسۆنی یەتیش مەبەستی بێ کە گومان دروست بکا.

## ئینتیماکردنی :

بەپێی هەندێ لەوانەی کە لەو ڕێکخراوە بوونە ئەوا ئینتیماکردنی ماسۆنی یەت بە سەرەتای (غسل دماغ)و شێوە ڕێوڕەسمێکی سوێندخواردنەوە دەست پێدەکات، بە پێی (قاموس السیاسة) بوونو گەشەکردن لەنێو ماسۆنییەت هەتا ٣٣ پلەی دەبڕێ، ئینجا لە کۆتایی (٣٣) پلە، کە دەبێتە (مامۆستای مەزن-یهوذا)، دەڵێن ئەوانەی تا ئێستا گەیشتوونە ئەو پلە جوولەکەن، وەرگرتنیشی لەشێوەی تاك تاكو بە کۆمەڵیشە، گوایە سەرۆکو پاشاش ڕێك دەخا لەو ماسۆنیەتە، هەندێ سەرچاوەو فەرهەنگ ئەو زانیاریانەیان کۆکردۆتەوە کە بە پوختەیی لێرە تۆماری دەکەین :-

- دروشمیان: (یەکسانی، برایەتی، سەربەستی)یە.
- یەکەم بارەگای نهێنیو لەژێر پەردە لە ١٧١٧ز لە بەریتانیای کردەوە.
- دوایی لە ئیرلەنداو ئیسکوتلەنداو ئەمەریکاو ئەورووپا کردەوەو لەگەڵ شەپۆلی ئیمپریالیزمیش بە جیهاندا تەنینەوە، ژمارەی ئێستای بە (٣٠٠٠٠) زیاتر لە قەڵەم دراوە.
- بە دژە ئاینو لایەنگری ئاینییش لەقەڵەم دراون، بەڵام ڕەنگە بە پێی پێویست هەردوو دەور ببینن.
- هەندێك ژمارەی ئەندامانیان ئامارکردووە تا کۆتایی سەدەی ڕابردوو بە (٦) ملیۆن، بەڵام دوای ڕووخانی (سۆڤیەت) زیادەکەیان لە ئەندازە دەرچووە.

- ١٣ سەرۆکی ئەمەریکی بە ماسۆنی تۆمارکراون، گوایە زۆربەی دامودەزگاکانی ئەمەریکاش بە ماسۆنی پڕکرایتەوە.
- یەکەم بارەگای نهێنی بەناوی (محفل فلسطين) لە بیروت لە ساڵی ١٨٦٢ کرایەوە.
- لە بەسرەش لەگەڵ هێزی بەریتانیا لە ساڵی ١٩١٤ز کرایەوە.
- زۆربەی چالاکی‌و بەرهەمەکانی عەلمانییەتی جیهانی ئیسلامی لەلایەن بەشێك لە زانایانی ئایینی بە دەستی ماسۆنییەت لەقەڵەم دراون ...
- وادیارە لە سەروبەری شکستی جیهانی ئیسلامی لە کۆتایی سەدەی (١٩) هەندێ لە ناودارانی ئیسلامیش پەیوەندیان پێوە کردووە، لەوانە جمال الدين الافغاني، محمد عەبدە ..گوایە کاتێ بە ماهیەتەکەیان زانیوە وازیان لێ هێناوە، بەڵام سوڵتان عبدالحميد هەر بە گوماناوی دەیڕوانیە ئەو زانایانە.

بەپێی ئەو سەرچاوانەو سەرچاوە نزیکەکانی ماسۆنییەت دەڵێن: زۆربەی ڕووداوە گرنگەکانی جیهان لە دروستکراوی ماسۆنییەتە لەوانە:- ڕابوونی ئەورووپی، شۆڕشی فەرەنسی، شۆڕشی ئۆکتۆبەرو شیوعییەت، سەربەخۆیی ئەمەریکا، هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت، جەنگەکان، سایکس بیکۆ .. تا دەگاتە دروستبوونی دەزگا جیهانییەکانی وەك (عصبة الامم‌و un) ... دەیانەوێ بڵێن مێژوو لەلایەن ماسۆنییەتەوە وێنە دەکرێ‌و دادەڕێژرێ.

دەبێ بزانین لەولاشەوە بەهەمان تەوژم لە (پرۆتۆکۆڵ حکماء) پڕوپاگەندەی لەو شێوەی تیایە هەر بەوەندەش نەوەستاوەو دەڵێ: هەر لە شیوعییەت‌و شۆڕشی فەرەنساو ئۆکتۆبەر ...هەتا ڕێکخراوی ماسۆنییەتیش دروستکراوی ئێمەیە، ئەوەی زیاتر هانی ئەو گومانە دەدات هەندێ لایەنی هاوبەشی ماسۆنییەت‌و زایۆنییەتە لە لایەك‌و لەلایەکی تر ئەو دەزگاو دیاردە کۆمەڵایەتییانەیە، هەر بە نموونە دروشمی ماسۆنی بریتییە لە ( یەکسانی- برایەتی – سەربەستی)* دەبینین

* لە کتێبی (جمهورية افلاطون )یش ئەو دروشمە( سەربەستی و یەکسانی) بەدی دەکرێ.

دروشمی شۆڕشی فەڕەنسی سێکوچکەی (سەربەستی – برایەتی – یەکسانی)، دروشمی (ئیتیحادو الترقی)یش خەلافەتیان داڕوخاند پڕیتی بوو لەو سێکوچکەیە (یەکێتی – سەربەستی – چاکسازی )، دروشمی (حزب البعث) یش (یەکێتی- سەربەستی - سۆشیالیستی) ..، لە پڕوتوکۆلاّت حکماء صهیون دەڵێن: هەموو ئەو دروشمانە لەلای ئێمە دروست دەکرێ، ئەو وێکچوونە گومان دەخاتە سەریان بۆیە لە هەڵبژاردنی وەها دروشمێك جاروایە بێئەوەی ئاگاداربیت ئەو گومانە دروست دەکەی، هەرچەندە ئەوە مەرج نیە، چونکە دروشمی (إخوان المسلمین)یش سێکوچکەیەك بووە (ڕاستی – هێز، سەربەستی)، دروشمی (ژ ك)یش بریتی بوو لە (حەقیقەت، کوردایەتی، تەمەدون) دروشمی (یەکگرتوو)ش ئەو سێ کوچکەیەیە، بەلاّم دیسان ئەوەش بواری بە هەندێ گوماناوی داوە ئەوانەش لەو پۆلە ڕیز بکا، ... ئەوەش زۆر ڕوونە بە مەبەستی شکاندنی دەروونی بەرامبەرەکەیە تاوای لێ بکات گومان لە دەوروبەرو سەروو خوارووی خۆشی بکا، باوەڕی بە (ڕاستی) نەمێنێت ...کاریگەرییەکی سەلبی زۆری هەیە وای کردووەو وابزانری ماسۆنیەت ئەوەندە بەهێزە شایستەی بەرگری نیە، چونکە لە کۆنەوە تا ئێستا ڕێبازە چەوتەکان تەنها سوودیان لە تێکەڵبوونی ڕاستیو چەوتی کردووە، سودیان لە (گومانو چەواشە)وەرگرتووە، بەهۆیەوە توانیویان زیاتر ڕای گشتی هەڵخەڵێنەر دروست بکەن، هەر ئەوەشە لەو سەردەمە خۆراکی ماتەوەی سیاسەتی میکاڤیلی بەرامبەر سیاسەتی ڕاستی، لێرەدا بەشێکی تریش پێیان وایە ئەو ڕێکخراوە بوونی ڕاستەقینەی نیە تەنها ڕاگەیاندنێکی داڕێژراوە لە پەنای وەها ناوێکی خەیاڵی کارە تێکدەرانەکەی خۆیان لە دژی جەماوەری بەرامبەر دەکەن.

لە ڕاستیدا بوونی ڕاستەقینەی ماسۆنی یا نەبوونی لەگەڵ پڕوپاگندە زلەکانی پڕۆتۆکۆلیش دەبێ بزانین پلانو سیناریۆو ستراتیژییەتی داڕێژراو هەیە لە دژت، دروستکردنو داتاشینی بیروبڕوا و کەسێتی هەیە، بەلاّم هەر یەکە لەوانە نیشانەی

خۆی هەیە، با لە خۆمانی ئاڵۆز نەکەین، ڕەنگە وەها ڕێکخراوێك هەبێت بەڵام ئەو دەسەڵاتەی نیە، بەتایبەتی لە هەندێ نووسەرو بیرەوەری کەسانی ناودار کە ماوەیەك کاری نهێنیان لەگەڵ ماسۆنییەت کردووە دوای وازیان هێناوە، لەوانە (یوسف الحاج) کە کۆمەڵێك نهێنی لێ ئاشکرا کردوون لەبارەی هاریکاری ماسۆنییەت لەگەڵ زایۆنی دژ بە جیهانی ئیسلامی‌و جیهانی سێیەم .. هەتا مەسیحییەتی ڕاستەقینەش، هەرچەندە بەشێك، ئەو بیرەوەری‌و دان پیاهێنانەش بە بەشێك لە (سیناریۆ) دەزانن، بەڵام لە سەرجەمدا مانای وایە ئەو ڕێکخراوە کاریگەری لەو جیهانە هەیە، واتە هەیە، ئەوە لە ڕێساکەی (دیکارت)یش زیاتر، کە دەڵێ: (من مادام بیر دەکەمەوە واتە هەم) .. لێرە مادام کار لە جیهان دەکات واتە هەیە: بەڵام بەپێی قەبارەی خۆی بوونەکەی بۆ دیاری بکەی.

- بۆ زیاتر سەرنج بدە :

١- موسوعة الأديان .

٢- أساطير المؤسسة..روجيه غارودي.

٣- موسوعة السياسية.

٤- پرۆتۆکۆل الحكماء.

# زاراوه سـیاسـیه‌كان

* به‌شی رابردووو بریتـی بـوو لـه چـه‌مكه سیاسـیه‌كان (مفـاهیم سیاسـیة- polical conept) ئه‌گه‌ر چی گه‌لیٚ جاریش بۆ ساده‌كردنی گوزارش به زاراوه‌ش نـاوزه‌د ده‌كـرین، ئـه‌گینا لیٚـره‌وا رێكـه‌وتین كـه ئـه‌و زاراوانـه‌ی رای جیـا جیـا هه‌لٚده‌گرێ‌و قوولاٚییه‌كی فكری‌و فه‌لـسه‌فی هـه‌یێت بـه (چـه‌مك) ناومـان بـردن، ئه‌وانی تریش كه پێناسی جیا جیـاو بۆچـوونی جیـا جیـای زۆر له‌سـه‌ر نیـه بـه (زاراوه) ناوی ده‌به‌ین، وامان چه‌مك پۆلێن كرد، كـه زیـاتر لـه (رێبـاز) نزیكـه، كه‌چی (زاراوه) له (زانست) نزیكه.

* له‌نێو ئه‌و هه‌موو زاراوانه ته‌نیا ده‌توانین ئه‌و زاراوانه هه‌لٚبژێرین كه:

١. لیٚره زۆر دوباره ده‌بێته‌وه‌و خه‌لكی پێویستی پیٚ هه‌یه.

٢. ئه‌و زاراوانه كه له خزمه‌تی چه‌مكه‌كانن‌و تیٚگه‌یشتن‌و زانیاری بـۆ یـه‌كتر ته‌واو ده‌كه‌ن.

* هه‌لٚبـه‌ته ئه‌وانه‌ش به كورت‌و پوخت تر باسیٚكیان ده‌كه‌ین .

(١)

## ڤیتۆ حق النقض VETO

وشەیەکی کۆنی لاتینیە بە مانای (قایل نیم)، پێش تر بۆ یەکەم جار لە (ئەنجومەنی موحەلفین) لە دادگاکان ئەو مافەیان هەبووە بەناوی (ڤیتۆ) بەکاریان هێناوە بۆ تێهەلچوونەوە لە دادگاکان هەروەکو ئێستاش، بە گشتی لە مێژوودا ئەو مافە دەسەلاتێکە زیاتر بۆ کەسانی بنچینەیی یان نوێنەری زل هێزو خاوەن دەسەلاتیك بووە لە ئەنجومەنە دەڤەریی وجیهانیەکانیش، هەندێ پادشا ئەو مافەیان لە وڵاتەکەی خۆیان پێ دراوە لەوانە پاشای بریتانیا کە بە پێی (القاموس السیاسي) لە ساڵی ١٧٠٧ ز وە ئەو مافەی بەکار هێناوە، بە هەمان ماهیەت لە جیهانی ئێستا بە رەچەی‌ر بە پێ یاسایی ئەو مافە تایبەتەو چەسپاوە، هەندێك بە راستەوخۆ بەشێکیش بە ناراستەوخۆ، بەشێکە لە درێژکراوەی مافی تایبەت بۆ خەڵکی تایبەت لە چوارچێوەی یاساو نەریتە ئەفامیەکان، لەو سەردەمەش (ڤیتۆ) زیاتر بەدەسەلاتی ئەندامی هەمیشەیی ئەنجومەنی ئاسایش دەگوترێ کە مافی هەڵوەشاندنەوەی بڕیاریان هەیە، ئەنجومەنی ئاسایش لەئەندامیەتی (١٥) وڵات پێك دێت، هەر ٢ساڵ جارێك هەڵدەبژێرین لە کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، کاری جێ بەجێ کردن دەبینن بۆ بڕیارەکانی (UN)، واتە ئەنجومەنی ئاسایش لایەنی راپەراندنی نەتەوە یەکگرتووەکانە، پێنج ئەندام هەمیشەیی ئەندامن لەو ئەنجومەنە بێ ئەوەی ئەو هەلبژاردنە بیان گرێتەوە، ئەوانەش بریتین لە (ئەمریکا، بریتانیا، فرنسا، روسیا، چین) بە پێ ی مادەی (٢٧) لە بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان مافی ئەوەیان هەیە هەریەکە بەیەك لایەنی بڕیارێکی (ئەنجومەنی ئاسایش) هەڵوەشێنێتەوە

بەهۆی بەکارهێنانی ئەو (ڤیتۆ)یە[1]، بە پێی (قاموس المصطلحات السیاسیة والدستوریة والدولیة) لە ساڵی ١٩٤٦-١٩٩٢ سەرجەم ڤیتۆکانی بەکارهاتوو بەو شێوەیە بوو: یەکێتی سۆڤیەت ١١٤ جاری بەکارهێناوە، ئەمریکا ٧٩ جار، بەریتانیا ٢٩ جار چین ٣ جار، فەرەنسا ١٨ جار.

هەنجەتی ئەو مافە ئەوەیە کە تاکو (کۆ دەنگ) لە بڕیاردکان دروست ببێت بە پێی کاریگەری ئەو وڵاتانەو بۆ چەسپاندنی ئاشتی، بە پێی (قاموس السیاسی) ئەو وڵاتە خاوەن ڤیتۆیانەش مافی بەکارهێنانی نابێ ئەگەر لایەنێك بێت لە کێشەکە. ئەو وڵاتەش هیچ تایبەتمەندیەکی ئەخلاقی نیە جگە لە هێز نەبێت، زۆربەی ئەو ڤیتۆیانەش لە نادادگەریو بەرژەوەندی زل هێزان لە دژی وڵاتو میللەتانی هەژار بەکاردێت، لەو سەردەمەدا زۆربەی ڕەهای ڤیتۆکانی ئەمریکا لە دژی وڵاتانی عەرەبو قازانجی ئیسرائیل بەکارهاتووە، ئیتر ئەو جیهانە پڕیەتی لە ڤیتۆی بە دەنگو ڤیتۆی بێدەنگ لە ئەنجومەنی بچووكو گەورە بەکاردێت، لە هەموو دامودەزگاو یەکەیەکی کۆمەڵگە نادادگەری ماهیەتی ئەو ڤیتۆیەی دەدۆزیەوە، ئەگەر ئەو ناوەشی نەبێت، ئەو ڤیتۆیە لە بنەچەدا مانای بەدەرو لە سەرووی یاسا، واتای بانێلەو دوو هەوا، واتە یاسا بە یەکسانی هەموان ناگرێتەوە، ئەوەش لەگەڵ زۆربەی بەڵگەنامە مرۆڤایەتیەکان ناتەبایە بەتایبەتی بەندی (٧)ی جارنامەی مافی مرۆڤ، کە دەڵێ: (هەموو کەس یەکسانە لە بەرامبەر یاسا......)[2]، هەروەها لەگەڵ بنەما یاساییەکانی جیهان (مساواة الدولیة) کە تیایدا هاتووە (تنص مادة (٢) منه علی ان: تقوم الهیئة علی مبدأ المساواة في السیادة بین جمیع اعضائها)، لە (عصبة الأمم) کاتی خۆی بە ڕوونتر هاتبوو: (أن الاعتراف بحقوق واجبات واحدة لجمیع الدول من مبادئ اساسیة التي

---

١ (موسوعة العالمیة)، ب ١٧، ل ٦٤٧.

٢ بڕوانە جارنامەی (مافی مرۆڤ).

تقوم علیها عصبة)[1]، لە فکری ئیسلامیو فەرهەنگەکانیدا جێگەی وەها زاراوەیەك نەبووەو نیە، بە دوو تەرازووو دوو ڕووی یاسایی نەفامی ناوزەد کراوە، هیچ کەسو هێزێك لە سەرووی شەریعەت نیە، ئەوەش بەوردی لەو ڕووداوەی دزیەکە دەدرەوشێتەوە، کاتێ یەکێ لە ئەشرافەکان دزی کردبوو و خەڵکێکی ماستاوکەر داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کرد کە لەوە ببورێ شەریعەتی بەسەر جێبەجێ نەکرێ چونکە لە ئەشرافەکانە، پێغەمبەر ﷺ زۆر بە توندی ئەو داوایەی ڕەت کردەوە ئەو فەرمودە بەناوبانگەی کردە دروشم: (ئەگەر فاتیمەی کچی محمدیش دزی کرد دەبێ دەستی ببڕێ). چونکە یاسای بەشەریەت لەرزۆکە لە مێژووو ئێستاش کێ بەهێز بێت هەردەم ڤیتۆی هەیە، بە پێی زنجیرەی دەسەڵاتو هێزی، هەر لە بڕیارە جیهانیەکان تا ئیقلیمیو دەڤەری خۆشمان، زەقترین نمونەی نزیك، ئەنجامەکانی هەڵبژاردنی پەرلەمانی لە کوردستان لە ساڵی ١٩٩٢ بە (ڤیتۆ) ئەنجامەکەی ڕەت کرایەوە، وترا (من قایل نیم)، چونکە هێزیشی هەبوو، قایل نەبوونەکەی ئەنجامی هەبوو، لە هەڵبژاردن دەنگی میللەت کرا بە ڕێکەوتن (تەوافوق).

---

١ القاموس السیاسی- ل ١١٧٢.

## (٢)

## نەتەوە یەکگرتووەکان     أمم المتحدة     UN

دەزگایەکی جیهانی گشتیە، پێك هاتووە لە نوێنەری وڵاتە سەربەخۆکان، هەرچەندە ناوی نەتەوە یەکگرتووەکانە، بەڵام وەك ڕاستی زیاتر دەوڵەتە یەکگرتووەکانە نەك نەتەوە، چونکە نوێنەری هەمو نەتەوەیەکی تیانیە بەپێی ئاماری (القاموس السیاسی) نزیکەی (٣٠٠٠-٥٠٠٠) نەتەوە هەیە کە ژمارەیان لە ملیۆنێك زیاترن‌و زمانی تایبەتی خۆیان هەیە، کەچی نوێنەری وڵاتان ١٩١ ئەندامە، هەرچەندە هەمرو دەوڵەتێکیشی تیا نیە لەوانە (سویسرا) تا ئێستا ئەندام نیە لێی، لەو ماوەیە دیسان ئەندامی نوێی بۆ زیاد بووە دوا ئەندامی تا کاتی ئەو نوسینەدا تەیموری خۆرئاوا بوو، بەڕەسمی بوو بە ئەندام لێی لە مانگی ٢٠٠٢/٩ بە ژمارەی (١٩١)یەمین ئەندام، هێشتا بوار هەیە زیاد بکا..، زمانی ڕەسمی (ئینگلیزی، فەرەنسی، ڕوسی، چینی)یە، بەڵام زیاتر ئیش بە زمانی ئینگلیزی‌و فەرەنسی دەکرێ، بارەگاکەی لە نیویۆرکە بە پێی بەڵگەنامەیەکی دەستوری کە پێکهاتووە لە (١٩) بەش‌و ١١١ مادەو دیباجەیەك کە ئیازەکەی ئەو دەزگا دەردەخا لە بنچینە ئەخلاقی‌و ئاشتی‌و دادگەری‌و سەربەخۆیی گەلان، بەشەکانیش بریتیە لەو دەزگایانە (١ـ ئەنجومەنی گشتی. ٢ـ ئەنجومەنی ئاسایش. ٣ـ ئەنجومەنی ڕاسپاردەی ئابووری. ٤ـ دادگای لاهای ٦ـ سکرتاریەتی گشتی. ٧ـ ئاژانسە پسپۆرەکانی تر[1]).

کارو فەرمانی بنچینەیی، ڕێکخستنی پەیوەندیەکانی نێو دەوڵەتیە، ئاشتی‌و هاریکاری‌و پابەندی بە یاسایی‌و ڕێکەوتنەکان‌و سەرهەڵئەدانی ئاکۆکیەکان، دەتوانین بڵێین حکومەتێکی جیهانیە، هەڵبەتە ئەو فکرەیەش لە بنەچەدا لە

---

[1] بۆ زیاتر سەرنج بدە: أ- موسوعة السیاسیة ب- دیباجة بیان المنظمة .

جیهانیەتی پەیامەکان هاتووە، بەڵام وەك پەیڕەوی بەشەری لە کاتی پێویستەکانو گەشەی کۆمەڵ دەیسەپێنێ، ئەوەش سەرەتایەکی ڕاستەوخۆی عەولەمەیە، پەیڕەوکردنی یاسای (حەڕەم)ە کە لە ژیانو سروشتو گەردوون بەکارە، بۆیە بە پێی فراوانی گەشەی کۆمەڵ وەها دەزگایەکیش زیاتر پێویست دەبێ کە بناغەکەی لەوە دێ: (اذا كنتم ثلاثة فأمرو أحدكم) هەروەك لە چەمکی (سەرکردە) دیاریمان کرد، هەموو کۆمەڵە تاکێك لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا پێویستیان بە یاساو جێبەجێ کردنو سزاو پاداشت تەرازووو پێوەر هەیە لە لایەن دەزگایەکی سەرووتر، ڕەنگە کۆمەڵگەی پەرتو بڵاوی جاران کەمتر پێویستی بە دەزگایەکی وا باڵا هەبووبێت، بەڵام لە دوای گەشەی تەکنیكو پەیوەندیو سەربازیو ئابووریو بازرگانی، ... لەلایەكو لەلایەکی تر زیاتر گەشەی عەقڵی بەشەری ویژدانی مرۆڤایەتیو بەها باڵاکانی مرۆڤ کە یەکێك بووە لە ئامانجەکانی پەیامی ئایینی ... ئەوا بەرەبەرە پێویستی زیاتری هەمەلایەن بە دەزگایەکی جیهانیوا دەبێت لە بوارەکانی سیاسی، ئابووری زانستی، یاسایی، مرۆڤایەتی، ... ئیتر تۆرەی ڕێکخراوی جیهانی لە شێوەی مافی مرۆڤ پزیشکانی بێ سنور، مافەکانی تری چینو توێژەکانی جیهان ...

<u>مەرجەکانی بوون بە ئەندام</u>: ئەو مەرجانە لە سەردەمی (عصبة الامم)و دوایش لە (امم المتحدة) هەرلێك نزیك بوو، مەرجەکان لە پەرەگرافی (١)ی مادەی (٤)و هەروەهاش لە مادەی (٥٢)ی میساقەکەش هاتبوو، بریتین لە:

١- بۆ هەموو دەوڵەتێکی ئاشتی پەروەر بە یەکسانی.

٢- بتوانێ پابەند بێت بە میساقو بڕیارە نێو دەوڵەتیەکانێ.

٣- پێویستە لە کۆی ١٠ ئەندامی ئەنجومەنی ئاسایش (٩)ی لاگیر بێت بێجگە لە وڵاتە خاوەن ڤیتۆکانیش- لە عصبەی پێشوو ئەو مەرجە وا هاتبوو کە (٣\٢)ی ئەنجومەنی (عصبة) لاریان نەبێ.

٤- سەرەڕای ئەو مەرجە سەرەتاییانەی وەك: بوونی هەرێمو گەلو دەسەلاتی سیاسیو سەروەری هەرێمو بوونی ئیرادەی بوون بە دەوڵەت ....

ئەگەر بە وردی سەرنج بدەینە مەرجی یەکەمی مادەی (٤)ی سەروو دەبینین باس لەوە دەکا هەر دەوڵەتێك دەتوانێ ببێتە ئەندام ... ئەمەش گیروگرفتی یاسایو بگرە ناکۆکی یاسایشی تێدایە چونکە باس لەوەرگرتنی دەوڵەت دەکا نەك گەلێك یاخود دەسەلاتێك، بەلام دەلێن مەبەست لێی هەر دەسەلاتێك کە لەسەر خاکی خۆی موومارەسەی دەسەلات بکا بە دەوڵەت حیسابە، بەلام هەمووش بەو لێکدانەوە قایل نین، کەچی بەردەوام ژمارەی ئەندام زیاد دەکا ئێستا دوانەندامی مۆنتینگرۆ بوو ژمارەی گەیشتە ١٩٢ کەواتە پێویری راستەقینە ئەوەیە:

أ- بە شانوبالی خۆت هەولدەی.

ب- ئەو دەوڵەتەی داگیری کردووی بە پێیوپێژدانی مرۆڤانەو بە یاسایانە ئازادت بکا.

ج- یان راستی ئەوەیە هەردەمەکی ولاتە زل هێزەکان ئیرادەیان لەسەر بێت دوو لەت بوون دەبێت.

## سەربردەی نەتەوە یەکگرتووەکان:

لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم لە سالی ١٩٢٠ لە پەیاننامەی فرسای بە هۆی ئەو هەموو گیروگرفتو هەژانەی جیهان ئەنجومەنێکی جیهانی دانرا بەناوی (عصبة الامم) بارەگاکەی لە سویسرە بوو، ئەو بیرە کۆنە لە بیری ئاشتی جیهانگیری وەرگیراوە، ئەو پێشنیارە لە دوای جەنگی سی سالە – کە لە ویستیفالیای ١٦٤٨ کۆتایی هات- کرا، دوای ئەمانوئیل کانت لە کتێبی (نحو السلام العالمي) ئەو پێشنیارەی کردەوە، لە سەرەتای سەدەی بیستەمیش جنرال سمتیس پیش نیاری کردەوە، تا لە کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم ١٩١٤-١٩١٨

لە لایەن ویلسون سەرۆکی ئەمریکی لەمیانەی ١٤ بنەماکەی خاڵی چواردەمی پێشنیاری کۆمەڵەی نەتەوەکانی کرد، لە فرسای بریاری پێکهێنانی درا، بەڵام لەپێش جەنگی جیهانی دووەم زۆربەی وڵاتەکانی لێ کشایەوەو هەڵوەشایەوە بە تایبەتی کاتێ زۆر بە ناپاساییانە ئیتالیا حەبەشەی داگیر کرد، سەرلەنوێ لە ساڵی ١٩٤٢ چەندین کۆبونەوە کرا بۆ پێکهێنانی ئەنجومەنێکی نوێ لە مۆسکۆ دوای لە دیرتون، تا لە دوای جەنگ لە ١٩٤٥/١٠/٢٤ بە ئامادەبوونی (٥٠) وڵاتی[1] هاوپەیمانانو لایەنگرانیان لە (سان فرانسیسکۆ) بڕیاریان لەسەر (بەڵگەنامەکانی)داو لە ١٩٤٥/١٢/٢٤ مۆریان کرد، نەتەوە یەکگرتووەکان لێ دروست بوو، ئەو ناوەش لە پێشنیارەکەی سەرۆکی ئەمریکی فرانکلن رۆزفلتە، هەمان ئەو مێژووەش یادی دامەزراندنی، ... یەکەم ئەمینداری گشتی بۆ ماوەی ٤ ساڵ بۆ دوو دەورەش:

١- (تریجیفی) نەرویجی بوو لە ١٩٤٦ هەتا ١٩٥٣.
٢- هامرشۆ لە (١٩٥٣- ١٩٦١ سویدی).
٣- تویانت ١٩٨١-١٩٧١ بۆرمی بوو .
٤- کورت ڤالد هایم ١٩٧٢-١٩٨١ نەمساوی بوو.
٥- بیدس دیکویلار ١٩٨١- ١٩٩١ پیرۆیی بوو.
٦- بطرس غالی ١٩٩٢- ١٩٩٦میسری بوو تەنها یەك دەورە هەڵبژێردرا.
٧- کوفی عنان لە ١٩٩٦-٢٠٠٧ غانایە.
٨- بانکی موون ٢٠٠٧- ؟

پێك هاتووە لە سێ بەشی سیاسی سەرەکی:

---

[1] (٥٠) وڵاتەکەش ئەمانەن: ئەرجەنتین، ئوستراڵیا، بۆلیڤیا، روسیا، کەنەدا، شیلی، کۆلۆمبیا، کۆستاریکا، تشیکۆ، سلوڤاکیا، دومنیکان، ئەکوادور، سلڤادور، ئەسیوپیا، فەرەنسا، یۆنان، گواتیمالا، هایتی، هندوراس، هیند، عێراق، ئێران، لوبنان، لیبریا، لیکسمبورگ، هۆلەندا، نیوزلەندا، نیکاراگوا، نەرویج، پاراگوای، فیلپین، میسر، سعودیە، خوارووی ئەفریقا، تورکیا، ئوکرانیا، یەکێتی سۆڤیەتی ئورگوای، ڤەنزەویلا، یوگوسلاڤیا، پۆلەندا ژمارەی (٥١)ی تەواو کرد.

١- ئەنجومەنی گشتی وەك دەزگای یاسادانان.

٢- ئەنجومەنی ئاسایش کە پێکهاتووە لە (١٥) ئەندام، (١٠)ی هەردوو ساڵ جارێك هەڵدەبژێرین لەلایەن ئەنجومەنی گشتی، (٥) ئەندامی هەمیشەیشی بریتین لە: (ئەمریکا، بەریتانیا، فەرەنسا، روسیا، چین) لەگەڵ مافی ڤیتۆش، ئەو ئەنجومەنە جێبەجێ کردنی بڕیارەکانی ئەنجومەنی گشتییە.

٣- دادگای لاهای (دادگای جیهانی): زۆر لە کۆنەوە ئەو فکرە هەیە لە ساڵی ١٩٢٠ لەگەڵ عصبة الامم (کۆمەڵەی نەتەوەیی یەکەم) دروست بووە، لە ١٥ قازی پێك هاتبوو بۆ ماوەی ٩ ساڵ هەڵدەبژێرا، لە ساڵی ١٩٤٥ لەلایەن (نەتەوە یەکگرتووەکان) بە دەزگای قەزائی رەسمی ناسراوە، بووە بەشێکی گرنگ لێی، ئامانجی ئەو دادگایە بۆلێنك کردنەوەی جەنگو ناکۆکیەکانە، دەزگایەکی مرۆڤانەیە لە مەبەستدا، بەلاّم ئەو ئەنجومەنانەش وەك ئەنجومەنی کۆنو عەوامی دیوەخانەکان خۆ لەڕاستیو هەق گۆتن دەبوێرن، بڕیارو هەلوێستەکانیان تا ڕادەیەکی زۆر (باتێکەو دوو هەوا ... الکیل بالمکیالین) پێوە دیارە، زیاتر یاساو بڕیاردکان لە قازانجی زل هێزو ولاّتە دەوڵەمەندو داگیرکەرانە، کەمتر بۆ میللەتو زەحمەتکێشانو داگیرکراوەکان بووینە، هەتا لە دروستبوونی ئەو دەزگایەش ئەو لاریەی تیا بووە ئەتەوەکان ئەندام نەبووینە کیانە سیاسیەکان ئەندامن، واتە دیفاکتۆیی بووە، بۆیە سکالاّی میللەتانی بێ دەوڵەت ناخوێندرێتەوە وەك میللەتێکی کوردی ٤٠ ملیۆنی کەچی دەوڵەتی چەند هەزاری هەیە دەنگو ڕەنگی خۆی هەیە لەوێ، نوقستانی بنەڕەتی ئەو ئەنجومەنە نەبوونی دادگەرییە بە بڕیارو هەلوێستو تەشریعەکانەوەش، هەتا لە وەرگرتنی ئەندام دەبوایە کۆمەڵێك مەرجی مرۆڤایەتی دادگەریو ئازادی تیا بوایە بە لایەنی کەمەوە وەك ئەو مەرجانەی (یەکێتی ئەوروپی) چۆن مەرجی هەیە وا تورکیا وەرناگرێ، بەو شێوە دەبینین بێ هیچ بەرگریەك هەموو ئەو ولاّتانەی کوردیان بەسەر دابەش کراوە لە ساڵی

١٩٤٥ یه‌کسه‌ر بوونه ئه‌ندام هه‌رچه‌نده به‌شێکیان له‌وانه (عێراق) به پێی بەڵێنی ئینتدابی‌و رێکه‌وتنی له کێشه‌ی موصل ١٩٢٥و به‌ڵێنامه‌کانی وه‌رگیرانی له (کۆمه‌ڵه‌ی نه‌ته‌وه‌کان) له ١٩٣٢... که ره‌چاوی مافی کورد بکا ئه‌و مه‌رجه‌ی به‌جێ نه‌هێناو پێشێلی زۆرێك له‌و رێکه‌وتنه جیهانیانه کراوه، ده‌ریش نه‌کران له ئه‌نجومه‌نی گشتی، یاخود به‌لای که‌می دووباره له نه‌ته‌وه یه‌کگرتووه‌کان پێیان نوێ بکردابوونایه، به‌هه‌مان شێوه ئیسرائیلیش له ١٩٤٩/٣/١١ بوو به ئه‌ندام‌و به ئه‌ندامێکی ئاشتیخوازیش وه‌سفی کرا، زۆر وڵاتی تری ره‌فتار فاشی‌و درنده له‌گه‌ڵ میلله‌تانی خۆی بوونه ئه‌ندام له مێژووی دروستبوونی نه‌ته‌وه یه‌کگرتووه‌کان، سه‌رکرده کوردستانیه‌کان زۆر هه‌وڵی په‌یوه‌ندی پێ کردن بوونیه، بێ هووده بووه، جار وابووه به مه‌سروفێکی زۆر ده‌وڵه‌تێکی تریان له دوور قایل کردووه، که باسێکی کورد بکا له‌و ئه‌نجومه‌نه، شین گێڕیش وه‌ك جه‌رگ سووتاونیه.

له دوای هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه‌ی سۆڤیه‌تی جاران‌و سه‌رهه‌ڵدانی تاك جه‌مسه‌ری له ١٩٩١ ده‌سه‌ڵات به ئه‌مریکاو هاوپه‌یمانی درا له‌لایه‌ن نه‌ته‌وه یه‌کگرتووه‌کان به زه‌بری هێز عێراق له کوێت ده‌ربکه‌ن به‌ناوی (گه‌رده‌لولی بیابان- عاصفة الصحراء) له ١٩٩٢، دیسان ده‌سه‌لاتی درایه بچێته سۆمال به‌ناوی (اعادة الامل) له کۆسۆڤاش له ١٩٩٩، ئه‌فغانستانیش له ٢٠٠١-٢٠٠٢، .. گرتنی عێراقی ٢٠٠٣ بێ بریاری یاسایی نێوده‌وڵه‌تی بووه هه‌ربه‌که له بریاری ٦٨٨و هێلی ٣٦ دڵنیا له ساڵی ١٩٩١ بۆ یه‌کەم جار بۆ کورد له‌و سه‌ده‌یه‌دا وه‌ها بریارێك ده‌ربکه‌ن.

بۆ زیاتر سه‌رنج بده :

١ـ موسوعة العالمية. ٢ـ قاموس السياسي.

(۳)

## fascism الفاشیة فاشی

وەكوشە لە رۆمانی كۆن بەكار هاتووە بە مانای هێزو یەكگرتووی پۆلایتی دەدا، وەك زاراوەش بە پێی القاموس السیاسی، المورد، زۆربەی فەرهەنگەكانی تر لە (فاشیۆ) ی ئیتالی هاتووە، بە مانای باوەشە دارێكی درێژی پێچراو دێت، كە نیشانەی توكمەیی و یەكپارچەی دەدا، دوایی مۆسۆلینی لە حزبی سۆشیالستی نەتەوەی ئیتالیا بە تیۆرێكی سیاسی دایرشتەوە، تیایدا سەروەریەكی خست بە مێژووی نەتەوەو سەركردەكانیان دەداو هەموو لایەكی چالاكی كۆمەڵگەو دەوڵەتی خستە رێی خزمەتی نەتەوەیی، ناوەناوە لە كاتی شلۆقیدا وشەی (فاشی) زیندوو دەكرایەوە، دوایی فاشی بەو مانا سەلبی و كارساتییەی بە بەخەی بزوتنەوەی (مۆسۆلینی) بەسترا لە ئیتالیا، لە سەرەتای سەدەی بیستەمیش دەسەڵاتی پێ گرتە دەست .

ئەو بیرەی فاشی لە دوای سەرهەڵدانی بیری نەتەوەیی لەسەر دەستی كۆمەڵێك زانای رۆژئاوایی وەك میكافیلی، نتچە، هیگل، گوبینو، .. لە ئیتالیاش فكری (گازیبانی، مزینی..) هەروەك زۆربەی فكرەكانی تر، بیری نەتەوایەتیش یەكەم جار زۆر بە تەرژم هات، (هەروەك لە چەمكی نەتەوایەتی) باسكرا ئایدۆلۆژیایەكی ناتەواو نوقستانە، بۆ پڕكردنەوەكەی پەنا بۆ مەدرەسەیەكی فكری و سیاسی بردراوە، بیری نەتەوەی خۆی لە تێزە بۆ سەركێشی بەرەو رەگەزپەرستی و دكتاتۆریەت و عەسكەرتاریەت و تەقدیس كردنی رابەرو پێشەوا، جا ئەگەر ئەو بیرە تەواو كرا بە مەدرەسەیەكی مرۆڤایەتی، ئەوا تا رادەیەكی چاك ئەو دژواری و توندییەی سست دەكاتەوە، بەرەو عەقلانیەت و مەدەنیەت دەیگێڕێتەوە، بەڵام ئەگەر بە مەدرەسەیەكی توندو شۆڕشگێڕی نامرۆڤایەتی تەواو كرا وەك مەدرەسەی سۆشیالیستی یەكان یان چەپیەكان یان ئاینێكی نارەسەن ئەوا بزوتنەوەیەكی رادیكالی نەتەوەیی توندو پیتێنراو دروست دەكا،

کە هەردەم لە بارێکی نائاسایی‌و هاندان‌و جۆش‌وخرۆشی جەماوەری دەبێت لەسەر بنچینەی وروژاندنی سەروەریەکانی مێژووی نەتەوەی شانازی بەباب‌و باپیران‌و نیشتیمان ... ئەوانەش ترخمەکانی فاشین، جا ئەو بزوتنەومیەی نەتەوایەتی ئەو ناوچە بەشێکی زۆر لە جۆرێك لە (سۆشیالیست) کە ئەستونگەی دکتاتۆری‌و گۆرانی توندو تیژە، لە هەموان توندتر (باکونین) دەڵێ: (تەرت‌و وێران کردنی هەر واقعێك خێرە)[1]، زاوزێ کردنی بیری نەتەوەی لەگەڵ سۆشیالستی بەناوی (سۆشیالستی نەتەوەیی) یان (سۆشیالستی نیشتمانی) بزوتنەومیەکی ترسناکی لە شێوەی فاشی‌ونازی‌وبەعسی‌و ...هتد بەبەرهەم هێناوە .

لە پێناسی (فاشی)دا (مارتین دودج) چوار پێناسی بۆ سۆشیالی نیشتمانیەکان دەکات:

١. حکومەتێکی شمولی .
٢. پروپاگەندەی دیوکرسی‌و هەڵبژاردن بە ساختە .
٣. زاڵی حزبایەتی بەسەر مونەسەساتی یاسایی‌و دەستوری.
٤. هەردەم حکومەتی جەنگی‌و بودجەی بەرگری لە سەرووی هەموان[2].

لە راستیدا بە پێی پێناس‌و ئەو نیشانانە زۆربەی وڵاتە نەتەوەگەری شەرانیەکان بە جۆرێك لە جۆرەکان فاشی بوونە، هەروەك زۆر لە توێژەرەوەکان هەڵمەتەکانی فەرەنسا بە سەرۆکایەتی ناپلیۆن بە سەرەتای فاشی دەزانن، بەڵام بۆچی وا بەزەقی بە ئیتالیاو (مۆسولینی)یەوە لکا؟ زۆر جار ئەو مێژوونوس‌و چاودێرانەش سەر چیخ‌و سادەن ئەگینا فاشی هەر لە ئیتالیا نەبووە، لە پاش‌و پێش ئەوان هەبووە، بەڵام چونکە مۆسۆلۆنی هەمان ئەو هێمایەی فاشی رۆمانی کۆنی کردە دروشم، کە بریتی بوو لە باوەشێك داری بەیەك بەستراو تەوشیەکیش لە سەرویەوە، ئەوەش مانای یەك رێزی‌و پۆلاینی دەسەڵات دەدا لە سەردەمی رۆم کە بە زاراوە پێی دەووترا (فاشی)، مۆسۆلۆنی هەمان هێمای هەلگرت‌و ناوی فاشی پێوە زەق بۆوە، (مۆسولونی) بەخۆیی‌و ئەو ئایدۆلۆژیە فاشیەی بە رەسمی لە

---

١ مبادئ الثورة – باكونين.
٢ اعرف مذهبك – مارتين دودج ل ٧٦.

سالی ١٩١٩ ڕاگەیاند، لە ٣٠/ئوکتوبەر/١٩٢٢ دەسەلاتی گرتە دەست بۆ ماوەی ٢١ سالّ بە تاك ڕەوی بەوەو کارەساتێکی زۆری لە شەڕو شۆڕو دکتاتۆری‌و مال وێرانی دروست کرد، هەتا لە سالی ١٩٤٣ ڕووخا، ... لەو ماوەیەدا ئەو ئایدۆلۆژیە تەنیەوە، بووە جۆرێك لە سیستەمی دەسەلات، بە هەموو دەسەلاتێکی نەتەوەییە ڕادیکال‌و پەڕەگرەکان دەووترێ فاشی یان ڕەفتار فاشی، زۆر ڕێکخراو دروست بوو لەسەر ئەو تۆخم‌و بنچینانەی فاشی لە ئەورووپاو بەتایبەتی (ئیسپانیا، بەلجیکا، ڕۆمانیا، بەریتانیا، فەرەنسا، .. ئەلمانیاش) پەریەوە جیهانی سێیەمیش، هەندێ حزبی خاوەن میلیشیاش فاشیەتی لێ دەدرەوشێتەوە، ئێستا قاوغێکیان بۆ دارشتووەو دەلێن هەموو دەسەلاتێك ئەگەر:

١- ئابووری‌یەکی ڕەها ئازاد.
٢- گورەپانێکی ئائازاد.
٣- بەسانسورێکی گشتی حیزبانە.
٤- ئیدارەو سەروەری تاکەکەسی یەکەم (پالەوانیەتی).
٥- هەلبژاردنی‌و دەست نەگۆری دەسەلات.
٦- حزبی سەرکردە.
٧- خۆ پڕ چەك‌و هێزکردن.

## ئەوانە دەروازەی فاشی نوێن.

مەدرەسە سەرەکیەکان ئامادە نین فاشی بکەنە کەلتووری خۆیان، بۆیە هەریەکە دەیداتە پالّ دژەکەی، مەدرەسەی مارکسی ئەو دیاردەیە دەدەنە پالّ سەرمایەداری‌و وای بۆ چووە (اکثر اشکال النظریة الدکتاتوریة راس مال صراحة، والفاشیة ئایدولوجیة برجوازیة استعماریة هدفها سحق البرولیتاریا) بۆیەش لایەنە چەپیەکان زۆر بە وردی بۆ ئەو زاراوەیە دەچوون کە بە هەر جۆرێك بێ لە مەدرەسەی سۆشیالستی‌و مارکسیەت دوری بخەنەوە، بۆیە دەبینین (حزبی بەعس) ئەو هەموو تاوانە بێ‌وێنانەی ئەنجام دەدا، کەچی لەلایەن (ی. ن. ك )وە قەدەغە بوو بە (حزبی بەعس) بگوترێ حزبێکی فاشیە، دەبوایە بوترابایە (ڕەفتار

فاشی)، چونکە بەپێی ئایدۆلۆژیای یەکێتی حزبی سۆشالیستی نابێ فاشی بێت، تەنها سەرمایەداری و ڕۆژئاوا میراتگری فاشین، هەرچەندە ئێستا بە ۱۸۰ پلە دژی ئەو بۆچوونانەی خۆیانن، هەرچی لیبراڵ دیموکراسی سەرمایەداریشە ئەو دیاردەیە دەداتە پاڵ هەموو ئایدۆلۆژیایەکی ڕادیکاڵی بە شیوعیەتیشەوە.

لەو سەردەمە لیبراڵ دەیەوێ بداتە پاڵ ئایدۆلۆژیای ئیسلامیش، هەندێ فەرهەنگی بالآش ویستویانە ئەو تێك گیرانە لێك بکەنەوەو لە هەموویان دور بخەنەوە، وەك (موسوعة العالمية)وای دارشتووە: (فاشية= نزعة قومية متطرفة + علمانية ضد شيوعية + دكتاتورية ضد ديمقراطية + تمجيد الزعيم الى درجة قوله يساوي قانون + نظام منضبطة + التعبئة العامة.....)، بەلآم واش نیە (فاشی)یش ڕەچەڵەکێکی لە نێو جموجۆڵی بەشەریەوە پەیدابووە، ئەگەر کەمێك شێی بکەینەوە دەبینین هەر لقێکی دەچێتە سەر مەدرەسەیەك لە مەدرەسەکانی عەلمانی، فاشی پێك هاتووە لە ئایدۆلۆژیایەکی ئاوێتەی: نەتەوەگەری + سۆشیالستی + بازاڕی ئازاد ... کەواتە لە ئەوەی هەر سێ مەدرەسەی مارکسی و لیبراڵی و نەتەوەگەریە، ...واتە دیاردەیەکی عەلمانی پەتیە دوور لە ئاین، چونکە ئایینی ئیسلام لەگەڵ سەرەتاکانی فاشی تێك دەگیرێ، کە بناغە نەتەوەگەریەکەی شانازی بە باب و باپیران و ڕەچەڵەك و دەمارگیری کردنە، ئەمووی بە ئایەتو فەرموودە ڕاستەوخۆ دژیەتی، بێجگە لەوەی دژی سۆشیالستی و بنەمای ئیمپریالیزمی و دیکتاتۆریشە..، ئینجا مۆسۆلینی مەزنترین عەلمانیە نەك لەبەر هەڵس وکەوتەکانی، بەلکو بە هۆی بیروباوەڕەکانی کە ڕێککەوتن نامەیەکی دەگمەنی عەلمانیە لەگەڵ پاپا لە ساڵی ۱۹۲۹ مۆرکرد لەسەر بنچینەی: مرۆڤ تازیندووە بۆ موسیلینی بێت لەدوای مردن بێتە مولکی ئاین!! ئەوەش بڕبڕەی پشتی عەلمانیەتە[1].

[1] بروانە : الإسلام والعلمانية وأثرهما في نشأة الدولة العراقية الحديثة .

(٤)

## ناازی النازیـة Nazism

بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی سۆشیالیستی نەژاد پەرست بوو لە ئەڵمانیا سەری هەڵدا، وەك‌وشە ( نازی ) کورتکراوەی دووبڕگەی یەکەمی ناوی پارتی کرێکاری سۆسیالیستی نەتەوەی ئەڵمانی‌یە، National so zialis Tishe Deutsche Arbeieer partei [1] Nazi

توخمو پێکهێنەرەکانی نازیش وەك فاشی بریتی بووە لە: سەروەری نەتەوەیی‌و شانازی بە باپیران‌و پیرۆزی‌و باڵای نیشتیمان‌و بەسەردا گوتنی پاڵەوانیەتی کەسی یەکەم‌و سەرکردە، ئەوەش زیاتر خست بوو، کاتێ بزوتنەوەی نەتەوایەتی پەرەی گرت بە زیادەڕەوی‌و زاراوەی ئومەمە بۆ نەتەوە بەهێزەکان بەکار هات، لە ئەنجاما تیۆری سیاسی‌و ئایینی سۆسیۆلۆژی بەکارهات‌و جارێکی تر بنەمای (انصر أخاك ظالما أو مظلوما) بەکارهات لە دەمارگیری خێڵەکی بۆ نەتەوەیی‌و نیتر زاراوەکانی وەك: شۆفینی لە فەرەنسا، فاشی لە ئیتالیا، فالانژیسی لە ئیسپانیا، تۆرانی لەنێو تورك‌و بەعسیەت لەنێو عەرەب‌و نازی لە ئەڵمانیا... سەری هەڵدا .

نازیەت زیاتر لە کاردانەوەی ئەو شکستانەی لە دوای جەنگی سی ساڵەی (کە بە ئاشتی ویستفالیا لە ساڵی ١٦٤٨ز کۆتایی پێهات) هاتە کایەوە، هیگل زۆر بە رۆمانسی‌و خەمناکی سەرەنجامە سەلبیەکانی ئەو جەنگەو ویستیفالیای نووسی، داخی ئەوەی خوارد کە گەلی ئەڵمانیا ببوە نزیکەی ١٨٠٠ کیان‌و ٣٠٠ میرنشین –تا بسمارك لە ساڵی ١٨٧١ کۆی کردنەوە لە ئەلمانیا، ئەو کەلتوورە لە دوای جەنگی جهانی یەکەم‌و شکستی ئەڵمانیاو ئەو هەموو مەرجە خراوە سەر

---

[1] موسوعة العالمية ب ١٧، ل ١٩٤، همروەها ( القاموس السياسي) .

ئەڵمانیا لە كۆنگرەی فرسای لە ١٩١٩\٧\٢٨، بووە هۆی سەرهەڵدانی تیۆری سیاسی نەژادی، ئاریایەتی وەك ڕەگەزێك بە پاكەو باڵاترین نەژاد حیساب كرا هەر خودی مانای ئاری واتە ماقوڵی، لە چەند تەوەرێكەوە سەرهەڵدانی نازی بەو ئەو زەمانو زەمینە كۆ ببۆوە، لە هەموویان گرنگتر كاردانەوەی شكستەكانی ئەڵمانیا لە جەنگی جیهانی یەكەم، سەرەڕای ئەو بیروباوەڕە نەتەوەییو نەژادی هەریەكە لە: شامپرلین، گۆبینۆ، هیدر، هیگڵ، نتچە، فیشتە، شۆپنر، شپنگللر ...، جگە لە شامپرلنو گۆبینۆ ئەوانی تر زۆربەی زاناو مونەزیری ئەڵمانین زۆر بە خەستی ئەدەبیاتی فەلسەفیو سیاسی هونەری ئەو سەردەمەیان كردە بیرۆكەی باڵای نەتەوەیی ئەڵمانیاو ئاری، بەتایبەتی لە كاردانەوەی هەڵمەتی ناپلیۆن .

هیگڵ دەڵێت : مێژوو وا هاتووە لە هەر سەردەمێك لەسەر دەستی نەتەوەیەك پێشڕەوایەتی جیهان كراوە، ئەو جارە ئەو ڕابوونو تەكنیكو زانستو دادگەرییەی پەیامە لە لایەن ئومەتی ئەڵمانیاو نەژادی ئاری بۆ جیهان، دوا هەنگاوی مێژووەو ئیتر ئارییە وەك باڵاترین نەژادی مرۆڤایەتی دەبێتە سەرمەشقو پێشڕەوی میللەتانی جیهانو كۆتایی مێژووش لەو ئومەتە دێت، گۆبینۆش لە كتێبی (حول عدم تساوي أجناس البشرية) دەڵێ: توخمی ئاری سازاوترینیانە بۆ ژیان، لە پۆلێنی نەتەوەكانی تر میللەتی یەهوود بە نزمترین ژمێردرا، لەو سەردەمی، لە دوای سەرهەڵدانی (تیۆری پەرەسەندنی- داروین)و ( تیۆرەكانی سپنسر) پەیدابوونی تیۆری (داروینی یەتی كۆمەڵایەتی) گەلێ لەو پۆلێنانەی (كۆمەڵگەكانی جیهان) بە ڕوانگەی ڕەگەزی دادەڕێژرا، لەلایەكی تر لە سەرەتای سەدەی بیست كۆمەڵێك زانای وەك ( شوورنی- ١٨٤٢ -١٩٢١) شپنگلر - ١٨٨٠-١٩٣٦) .. بەدیدیكی سۆشیالیستی نیشتیمانی (بە جیاكردنەوە لە سۆشیالیستی ئومەمی) داڕشترا، لەگەڵ تیۆرەكی هیگڵو زاناكانی تر... گەیشتنە پوختەیەك كە پاككردنەوەی ئەڵمانیا لە نەژادە خوێن پیسەكانی

تری وەك یەهوود خزمەتی مرۆڤایەتی یە - کە بە (اللاسامیة) ناو دەبرێ، ئەوانە هەمور لەچەند مەبەستو داخوازی یەکی سیاسی کۆکرابۆوە وە لە (٢٥) بەند وەك مافە نەتەوەییەکانی سەرەتای ئەڵمانیا لەوانە ١- هەڵوەشاندنەوەی پەیاننامەی فرسای ٢- یەکگرتنەوەی ئەو ناوچە ئەوروپییانەی کە بە ئەڵمانی دەدوێن ( مستەعمەرەکان )و زانکۆیەکی جەرمانی - کە ڕێکخراوێکە لە شێوەی فرانکۆفۆنیو تورانی وزانکۆی عەرەبی ئێستا دەیویست ناریەکان تیا کۆ بکاتەوە، لەپێش جەنگی جیهانی یەکەم لەلایەنی ڕێکخراوی ( یەکێتی گشتی ئەڵمانی ) بە سەرۆکایەتی ( ئەلمەرکلاسی) دروست ببوو بەناوی ( زانکۆی جەرمانی ) ٣- ناسنامەی ئەڵمانی نەدرێتە "غەیرە ئاری" بەتایبەتی یەهوود .. لەگەڵ چەند داخوازییەکی تری چاکسازی ئابوری و چینایەتی کە لەگەڵ بنەما دیکتاتۆریە سۆسیالیستییەکانی نیشتیمانی دەگونجا، ئەوانە بەئەمای (نازی) بوو کە لە بنەچەدا حیزبێکی کرێکارانی بوو، دامەزرێنەرەکەی (ئەنتوان درکلر)ە، بەو شێوە زەمینەیەکی فیکریو کەلتوریو فەرهەنگیو ڕەگەزی سازا بۆ پەیدابوونی پیاوێکی وەك (ئەدۆلف هیتلەر) کە (عریف) بوو لە سوپای ئەڵمانیا لە ٢٠/ ئەپریل /١٨٨٩ لە (برۆناوە) دنیەکی ئەمساوی یە لە دایك بووە، زۆر بە بیرۆکەی (سوپەرمان)ی (نیتشە) کاریگەر بووە، بۆیە سروودی ئەڵمانیش (ئەڵمانیا لە سەرووی هەموو ) ی ساڵی ١٨٥٢هێناوە مەیدان وەك سروودی نیشتیمانی.

سوپەرمان زاراوەیەکە لەلایەن (نیتچە) دارشترابوو لەسەر هەمان بۆچوونەکانی سەروو بەناوی (رجل الخارق — سوپەرمان) کە لە پەیرەودا مەبەست لوێ ئەوە بوو خوێنێکی پاکی ئاری لە ئەوەکانی داهاتوو دروست بکاو لە پیسو پۆخڵی یەهودو سامیو نەتەوەی تر پاك بکاتەوە ... هەربۆیەکە لە : ئایدۆاۆجیای تومەمی مارکسی، لیبرالی یەتی ڕۆژئاوایی، بوونی یەهودی یەتی، .. وا لیستاند کە هۆکاری شکستی ئەڵمانیا بووینە لە جەنگی جیهانی یەکەم ... بەڕای هیتلەر سەرکەوتنی ئەڵمانیا واتە سەرکەوتنی شارستانی مرۆڤایەتیو ئەوەش

دەگەشێتەوە بۆ توخمی ئاری کە ئەو پەیامەیان هەڵگرتووە، بەو رەوتە توندە (هیتلەر) هاتە گۆرەپان لە دژی هەمرو جیهان جگە لە ئارییەکان نەبێت، لە ساڵی ١٩٢٤ لە زیندانیدا باوەڕەکانی خۆی لە کتێبی بەناوبانگی (تێکۆشانم – کیفاحی mine comfe) دارشت بە مەودای (پان ئەڵمانی)و یادی بسمارکیو ئەزمونەکانی فاشی ئیتالیاو زانکۆی ئەڵمانیا، ئەو بارو دۆخانەو جۆشو خرۆشی شۆرشگێری لەنێو جەماوەر لەگەڵ هەندی هۆکاری تر لەوانە :

١- دواکەوتنی یەکخستنەوەی ئەلمانیا تا ساڵی ١٨٧١ز.

٢- ئەوەش بووە هۆی دواکەوتنی بزوتنەوەی تەکنیك وسەرمایەداری .

٣- لەبەر هەمان هۆ بەشی لە (مستعمرات ) کەم بوو .

ئەوانە وای کرد لە ساڵی ١٩٣٣ بە هەڵبژاردنێکی دیوکراسییانە هیتلەرو حزبی (نازی ) (٢٨٨) کورسی بەدەست بهێنێ وبە دەنگی یەکەم دەرچێت لە پەرلەمان- راینشتاغ، هیتلەر بووە (راوێژکارو سەرەك وەزیرانی ) ئەڵمانیا، هەمرو حزبەکانی تری هەڵوەشاندەوەو بووە خاوەنی ٨ ملیۆن ئەندام، ئەو ١٢ ساڵەی دەسەڵاتی لە دژی دیوکراسیو ئازادیو نمونەی درندەیی دەسەڵاتی دیکتاتۆریو شۆڤێو شەڕانگێزی بووە، بەکورتی سروشتو رەفتارو دەسەڵاتی نازی وا پێناس کراوە رێبازێکی تاکیانەی لیبرالی دەوڵەتی یە، دەوڵەتیش لە ژێر فەرمانی حزبێك بووە، حزبیش لە ژێر فەرمانی تاکە کەسێك بووە بە ناوی (ڤۆهر – رابەر)* کە تیایدا ( راوێژکاریو سەرۆکایەتی کۆمارو وەزارەتیش) کۆکردبوۆوە لە دەسەڵاتی خۆی، بەو شێوەیە ئەو بزووتنەوەیە ئەشەنەی کردو ئەڵمانیاش لە زانستو تەکنیكو بوارەکانی تر زیاتر پەرەی سەند بوو، جەنگی جیهانی دووەمی لەسەر درووست بوو، درووشمە کۆنەکەی ئیمپراتۆری یەکان (بەتایبەتی تەیموور لەنگ) کە شەریان بە بیانۆی ئەوەی (یەك خوا هەیە لە ئاسمان دەبێ یەك

* ئەوەش هەمان پێ ناسی (ئیتحاد الترقی) تورانی تورکیە، کە وەسفی وادەکرا: هەمەو عوسمانی لەژێر دەستی ئیتحادیەکان، ئەوانیش لەژێر دەستی مرکز عامو ئەوش لەژێر فەرمانی أنور .

حوکومەتیش هەبێت لەسەر زەوی) هەڵدەگیرساند، هیتلەریش جەنگی جیهانی دووەمی بەو ئایدۆلۆژیایە هەلگیرساند، یەکەم جار داوای هەڵوەشاندنەوەی پەیاننامەی فرسای کرد بۆ یەکخستنەوەی هەموو ئەوانەی بە ئەڵمانی قسە دەکەن لە: ( نەمسا، سوید، بەشێك لە چیکۆسلۆڤاکیا، بەندەری دانزاگ لە پۆلەندە، ..) هەندێ وردە بەشی تریش، جەنگی جهانی بە هۆیەوە بەردەوام بوو، سەرگەوتنی مەزنی بەدەست هێنا پاریس‌و مۆسکۆشیان گرت، تا لە سالی ١٩٤٥ سوپای سووری سۆڤیەتی پێشوو (لە سەردەمی سەرۆکایەتی ستالین) چووە ناو بەرلین نازیەت شکستی هێنا.

لەو نێوانەدا بزووتنەوەی نازی زۆر ناوبانگی رۆیشت‌و زۆربەی بزووتنەوەکانی نەتەوەگەری بە جۆرێك لە جۆرەکانی کاریگەری نازییەتیان پێوە دیار بووە، ئەگەر بە وردی سەرنج بدەینە بزووتنەوە (تۆرانی‌یەت)ی (پان تورکی) -کە لەسەر دەستی ( نیکیتن ئەلب) نووسرایەوە بە (٥) بەرگ — وە تا ئێستاش کاریگەری ماوە، دەبینین هەمان داخوازی یەکخستنی سەرتاسەری تورك زمان‌و بالأی نەژادی تورکی‌و سەروەری باب‌و باپیران‌و نیشتیمانی پان‌و بەرینی (تۆران)، .. بەهەمان شێوە دروشمەکانی (پان عەرەبی) لەلایەن عەرەبە نەتەوە گەرییەکان، .. تا دەگاتە بزووتنەوەی زایۆنی‌و (شعب الله المختار)، بەلام جێگەی هەڵوەستەیە لە رۆژهەلاتی میللەتانی (نا ئاری) وەك عەرەب‌و تورك کاریگەر نەبووینە بەو بیرە، هەرچەندە دروشم‌و ئامانجەکانی ئاری یانە بوو، هەتا نیشانەی (+) نازیایەتی کە بە ئەڵمانی پێی دەوترا (سواستکا) ئەوە نیشانەی ( خاچ ) نەبوو، بەڵکو هیمایەکە میللەتانی پێشووی مەغۆل‌و جەرمانی کۆن‌و هەتا هیندی سوورەکانیش هەڵیانگرتووە، بەپێی هەندێ سەرچاوە لە بنەچەدا ئەو دروشمە لەلایەن پاشماوەی زەردەشتی‌یەکانی ئێستای ناوەراستی ئاسیا (سەرووی ئێران ماوە لە هەندێ مەحەف)، یەکەم جار لە سالی ١٩١٩ لە بەڵتیق سەربازانی ئەڵمانیا هەڵیان گرت، دوایی بووە نیشانەیەکی حکومەت‌و حزبی نازی .. بۆیە

ئەگەر فاشی پەت سەرجەلەکەی لە ڕۆم دابدۆزرێتەوە ئەوا نازی سەری لە ڕۆژهەلات و کەلتووری زەردەشتی ئارییەتی دێتەوە، چونکە (نیتچە) کاریگەرییەکی زۆری لەگیشتنی فلسفەی نەتەوایەتی بەنازی هەیەو لەهەمان کات کتێبیشی هەیە بەناوی (هكذا تكلم الزرادشت) .

بۆ زیاتر سەرنج بدە :-

١- كفاحي – هيتلر
٢- موسوعة السياسية-د.كيالي
٣- مقدمة في أنثروبولوجيا الإجتماعية
٤- الموسوعة العالمية - هيئة الموسوعات
٥- قاموس السياسي - د.أحمد عطية الله

(٥)

## شۆڤینی الشوفينيه Chauvinism

بەجۆرێك لە ڕەگەزپەرستی توندو پەڕەگری نەتەوەیی دەوترێ، لە بنەچەدا ئەم زاراوە فەرەنسی یە، لەواقیعی سەربازێكی ناپلیۆن هاتووە كە ناوی (نیقۆلا شۆڤان)[1] بووە، هەتا بڵێی سەربازێكی دڵسۆز بوو بۆ ناپلیۆن. لە هەمان كاتدا تا بڵێی دەمارگیرو توخم پەرست بووە، ئەو دەمارگیرییەی لەگەڵ دڵسۆزی یەكەی بۆ ناپلیۆن گوزارشت لە ماناو سەردەمێك دەكا كە ڕابوونی نەتەوەیی بە سەلبیو نیجابییەوە لێی تەنیبۆوە، هەڵبەتە (ناپلیۆن)یش سەركردەیەك بوو لە هەناوی ئەو ڕابوونە دروست ببو، بەشێكی زۆری ئەو واقیعەی فەرەنسار هەڵمەتەكانی ناپلیۆن بوونە دروست كردنی توخمەكانی فاشیو نازیو..، بۆیە گەلێ فەرهەنگی بەناوبانگ ناوی ناپلیۆن وەك فاشی یەك دێت، جا بوونی سەربازێكی دڵسۆزو دەمارگیری وا گوزارشت لە پابەندبوونی بە ڕێبازێكی سیاسیو ئایدۆلۆژی ناپلیۆنو مەبەستەكانی هەڵمەتەكانی دەكا، بۆیەش ناوی (شۆڤان) وەك نمونەیەكی سەرمەشق كەوتە نێو ئەدەبیاتو نووسینەكانی فەرەنسی كە دەوترا (شۆڤینی) بەمانای دڵسۆز بۆ ڕێبازی نیشتیمانیو نەتەوەیی فەرەنسا، ئیتر ناوبانگی زاراوەیی پێ بلاوبوەوە، هەڵبەتە تا هەڵمەتو ئەزموونەكە ڕوو لە سەركەوتنە بە نیجابی باسی دەكرێ، لە دوای شكستی ئینجا دەبێتە سەلبی، لە سەرەتادا لە هەندێ دۆخدا ئەوروپی یە نافەرەنسی یەكان دیاردەی شۆڤینیان وەك دیاردەكانی فاشیو نازی پۆلێن كردبوو، ڕاستیشە هەموو ئەو ڕێبازانە كۆ دەبێتەوە لە ڕێبازێكی لیبرالی كۆمەلایەتی دەوڵەتی، دەوڵەتەكەش لەژێر سەركردەی حزبێكە، ئەو حیزبەش یەك كەس هەڵی دەسوڕێنێ بێ قەید، زۆر

---

[1] الموسوعة السياسة ل ٥٠٣

بەشیان ئایدۆلۆژی نەتەوەیی بە توندەکەیان بە جۆرێك لە سۆسیالیستی نەتەوەیی تەواو کردبوو، بۆیە هەندێ جار لەلایەن شیوعی یەکان تاوانی شۆڤینی یەت دراوەتە پاڵ سەدرەسەی سۆشیال دیموکراسی یەکانیش، چونکە خەباتی نەتەوەیی یان خستبووە سەرووی ئینتیمای چینایەتی لە چوارچێوەی چالاکی یە سیاسی یەکان لە دەنگدانی پەرلەمانیو دیموکراسی دا، ئەوانەی پەیامی ئیمپریالیزمی یان هەڵگرتبوو پەندیان لە ئاینی ئیسلام زۆر وەرگرتبوو کە ئیمپراتۆر بێ پەیامو بەرنامە تەنها مانای داگیرکەرو دوژمنایەتی دەدا، بۆیە لەلایەن زاناو فەیلەسوفەکانیان دەست کرا بە دارشتنی (پەیامی جیهانی) لەسەر دەستی گەلان، ئیتر هەر ئیمپریاتوریەتیك پەیامو پاساوی بو خۆی پەیداکرد، زۆربەی بانگەششەی رزگاریو قەدەغەی بازرگانی بە قولە رەش وەرزۆ ئارامی وتێرکردنی برسیان، ...دەکرد، لەو سەرو بەرەش سەردەمی رابوونی نەتەوەیی بوو بۆیە بەرنامەی سیاسیو پەیامەکانیان ئاوێتەیەك بوو لە (نەتەوەی دەڤەریانە)و (سۆشیالیستی جیهانیانە)، کە سۆسیالیستی نەتەوەیی لێ زادە دە بوو، ئیتر هەریەکە لەوانەی بە ئیازی ئیمپریالیزمی روویان لە جیهان کرد تەنزیری بە جۆرە بەرنامەیەکی نەتەوەیی دەکرد، فەرەنسا بە شۆڤینی، ئیتالیا بە فاشی، ئەڵمانیا بە نازی، ئیسپانیا بە ڤالانژیسی، تورکیا بە تۆرانی ...،

ئیستا زاراوەی (شۆڤینی) زۆرتر مانای خۆویستو رەگەز پەرستی نەتەوەییو جیاکردنەوەی نەتەوەییەك لە نەتەوەیەکی ترو دانانی پلەی یەكو دووو سێ .. کە راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ بەبلاوی پەیرەو دەکرێ، هەموو ئەو زاراوانەی رەگەز پەرستی، نەژادپەرستی، شارستان پەرستی، نەتەوە پەرستی ئەپارتایتی، .. هاوتای شۆڤینین، ئەپارتایدی راستەوخۆ هەتا کۆتای سەدەی بیسەمیش لە ئەفریقیا بە دەستووریش کرابوو، لە ولاتێك کە کەمایەتی یەکی سپی ئەو سیاسەتەی ئەپارتایتیان بەسەر زۆرایەتی رەش سەپاندبوو، لە هەردوو ئەمەریکاو ئوستورالیاو هەندێ لایەنی باسایی ئەورووپیش هێشتا پاك نەبوویتەوە لە

شۆڤینیەت بەمانای شارستانی یەکەی، گەلانی کوردستانو فەلەستینو چیچانو کشمیرو بەلقانو زۆر شوێنی تر بەخەستی دووچاری ئەو جۆرە سیاسەتە بووینەوە، خەلکی کوردستان بە ئاشکرا شۆڤینی یەتی کۆنو تازەی بەسەردا سەپێنراوە، جگە لە هەلمەتەکانی کوشتنو برو جینۆسایدو وێرانو کیمیایی و ئەنفال (لە سەرووی کوردستانیش) قەدەغەکردنی زمانیش، ئەوا پاکتاوی رەگەزی بە شۆڤینیانە لەگەل کراوە لە بەعەرەب کردنو بە تورك کردنی ناوچەکانی کوردستان ولەدوای دروستبوونی مەینەتی کوردیش هەرگیز بە پلە دوو بەسەرمەوە لەناوەندەکانی پێکهاتەی ئەو دەولەتانە ریزکراوە .، هەمرو ئەواتە لە دوای بلاوبوونەوەی شۆڤینی لە جیاتی (برایەتی ئیسلامی) سەریان هەلداوە .

بۆ زیاتر سەرنج بدە :

١- الموسوعة السياسة

٢- G-B-Encyclopedia

(٦)

## بەربەری البربریة Barbarism

زاراوەیەکی فرە مانای سیاسی و کۆمەڵایەتی و شارستانی یە، بەپێی تیۆری (تەتەوری یەکان) بەتایبەت (مۆرگان ١٨١٨ –١٨٨١ ئەمەریکی یە) لە کتێبەکەی (المجتمع القدیم ١٨٧٧) باس و مانایەکی تری بۆ (بەبەری) داتاشیوە، مارکس و ئەنجلس و زانایانی سەر بەو خەتە دوای مۆرگان زۆر گرنگیان بەو تۆێژینەوە داوە، بەپێی سەرجەم تۆێژینەوەو تیۆرە مەیدانییەکانیان بەربەر بریتیی بوە لە کۆمەڵگەی هەرە کۆن و شێوەیەك لە دڕندە بووینە، بێ مولکی یەت و بێ زمان یاسا و ئاین و... دایك سالاری بووە، لە دوای ئەو قۆناغە سەرەتایی یە ئینجا کۆمەڵ کەمێك گەشەی کردووە، بەتایبەتی لە بەخێو کردن، ناوی ئەو قۆناغە نراوە ( بەربەر) ئەوە لەگەڵ (ڕەوەند-بدوی) لێك جیایە، بەپێی (کوردن چایلد) پەیدابوون و دۆزینەوەی (نووسین) خاڵی وەرچەرخانە لە بەربەر بۆ مەدەنیەت، کوردن چایلد بەو قۆناغەی نێوان کۆمەڵگەی سەرەتایی و دۆزینەوەی نووسین دەڵێ (بەربەر)، بەوشێوەیە هەموویان لەگەڵ (مۆرگان) ڕێکن لە پۆلێن و دابەشی شارستانی بەو شێوەیە: دڕندایەتی← بەربەری← شارستانی ... هەڵبەتە هەموو ئەو دابەشیە لە بنچینەدا بۆ تیۆری (پەرەسەندنی داروین) دەگەڕێتەوە کە ئێستا فرێ بەسەر ڕاستی و زانستی نەماوە.

کەواتە ڕوونە ئێستا وەك زاراوەی سیاسی ئەو ناوەی (بەربەر) بەهەرکەس و کۆمەڵێك بوترێ مانای ئەوەندە کۆنەپەرست و دژ بە مەدەنی و بەدرەوشت و تێنەگەیشتوو (هەمەجی)یە، بەکارهێنانی مێژووی ئەم تۆمەتە بەناوی (بەربرایەتی) دەگەڕێتەوەبۆ کۆمەڵگەی ڕۆمانی کۆن، هەروەك چۆن ئێستا شێوە ناخاوتنێك ماوە لەناو سیستەمی کۆمەڵایەتی هۆزە داخراوەکان چۆن بەهەموو کەسێکی دەرەوەی هۆزەکەیان دەڵێن (بێگانە) ئاواش کۆمەڵگای ڕۆمانی بە

هەمرو ئەو کەس‌و میللەتانەی تریان دەووت (بەربەر) کە لەوان نەبوایە بەتایبەتی ئەوانەی دژایەتی ڕۆمیان بکردایە، (هیرودتس)یش شەڕی ئەورووپی‌و ئاسیایی بە شەڕی بەربەرو مەدەنیەت لە قەڵەم داوە،، بەپێی هەندێ مێژوونووس یەکەم جا لە ئەورووپی خۆیەخۆ بەو تیرو هۆزە جەرمانیانەیان وت (بەربەر) کە دەوڵەتی ڕۆمانی تێك‌و پێکدا، ئەگەرچی وەك سیاسی بەتۆمەت بە خەڵکێکی زۆر کۆنەپەرست‌و ڕەفتار ناشیرین دەوترێ، ئەوا وەك زاراوەیەکی زانستی بەو کۆمەڵە خەڵکەش دەوترێ (بەربەر) کە نەخوێندەوارە، بەو هۆزو خێڵە دواکەوتووو دابڕاو لە جیهان کە تەکنۆلۆجیای نوێ بەکارناهێنن دەووتری بەربەر، (إبن خلدون) عەرەبی لە هەموان بە (بەربەر)تر لە قەڵەم داوە، ئەگەر ئایینی ڕاستەقینەی تیا نەبێ، بەڵام ئەیکردۆتە ڕەچەڵەك بەڵکو کردوویەتی بە پیشە، جا ئێستا نەتەوەیەکی گەورەش هەیە پەرش‌و بڵاو بووینە لە مەغریب، جەزائیر، لیبیا، تونس، مۆریتانیا، بەناوی بەربەر، زمانیان ئەمازیغی یە، سوننی موسوڵمانیشن، (إبن خلدون) ئەو (بەربەر)یەی بەو (بەربەر)یە نەبەستۆتەوە، ئەو نەتەوەیە لەپێش هاتنی ئیسلامیش هەر بەناوی (بەربەر) بووینە، جا بە ڕوونی نازانرێ ئەو ناوەیان لە بنەچەدا لە کێ بۆ هاتووە، ڕەنگە هەر ڕۆمی یەکان ئەو ناوەیان لێ نابن لە چوارچێوەی دژەکانی ڕۆم، چونکە ڕۆم ناریان لە هەمرو ئەفریقیا نابوو (بەربەر)، ئەوکاتیش بەربەر لەوێ ژیاون، بەپێی زۆربەی مێژوونووسان نەتەوەی بەربەر لەو ناوچانەی خۆیان ژیاوون پێش ٣٠٠٠ ساڵ (پ.ز) یان بەپێی کتێبی (أقليات في خطر) ٤٠٠٠ ساڵ لەمەوبەر، بە خۆشی بووینە ئیسلام لەسەردەمی ئەمەوی لە نێوان (٦٦١ – ٧٥٠) خاکەکەشیان هەر ناوی (باربەریا) بووە، ئێستا زیاتر قورساییەکەیان لە مەغریبە نزیکەی (١٠) ملیۆنن، ڕێژەیان لە مەغریب ٣٧٪ لە جەزائیر (٦) ملیۆنن ڕێژەیان٢١٪، ڕەنگە ژمارەیان زیاتر بێت، چونکە خەڵکێکن وەك خەڵکی کورد پارێزگاری لە کەلتوورو زمان‌و نەریت‌و خاکی خۆیان بە چاکی دەکەن، بۆیە ڕەنگە هەمرو دانیشتوانیان تۆمار نەکرابێ ..، مێژوویەکی پڕ بەرگرییان هەیە، هەتا لە قۆناغی توێی ڕزگاریشدا ئەوان لە ساڵی ١٩٢١ز لە

دژی ئیسپانی شۆڕشیان هەلگیرساند، بۆیە زۆر ئاساییە ئەو ناوو ناتۆرەی سەلبی لە دژی ئەفریقیا بەوان وەنوسێ، ئەوانە خاوەن دەسەلات بووینە، خاوەنی ئیمپراتۆریەتی (المرابطين) بوون کە گەورەترین دەسەلاتیان هەبوو لە جەزائیری ئێستا (ئەوکاتی بەناوی مەغریبی ناوەڕاست بوو)و لە هەموو ئەو ناوچانە، تارقی کوری زیادیش هەر لەوانە، ڕەنگە ئەو ناوەی (بەربەر) گەشابێتەوە لەگەل هەلمەتەکانی (طارق) بۆ سەر ئەوروپا، چونکە زۆربەی سەرکردەو سەربازە نازاکانی (طارق) بەربەر بووینە. ڕۆژئاوا لەسەردەمی ڕابوونی یەوە تا ئێستاش لە تەقەلایەکی بێووچاندایە کە پێشکەوتنی زانستی گشتی بکاتە مولکی تایبەتو تێکەلی سیستەمی ژیانی خۆی بکا .. تا شارستانییەتی بالای دەستکەوێ بەرامبەر کۆمەلە شارستانییەکی نزم هەروەك لە تیۆرەکانی (ململانێی شارستانی)و (کۆتایی مێژوو) ..وا وێنە کراوە، هەلبەتە ئەو تێڕوانینەو تێڕوانینەکانی تری سەرروشی بە (مۆرگان)یشەوە لە توێژینەوەکانیان یەکلایەنانە (تعميم) کراوە بەچەوتی، هەلساون نونەیەکی بچوکی ناوچەیەکی هەرە دواکەوتووی ئەفریقیا، یان ئەمریکایان هەلبژاردووەو ئەنجامەکانیان کردۆتە یاسا بۆ هەموو کۆمەل، ئێستا زۆر ڕوونە ئەو دابەشیەی قۆناغەکانی مێژوو لەلایەن مۆرگانو مارکسو ئەنجلسو هۆلباخو ئۆگستو تایلەرو ...زۆرانی تر لە زاناو فەیلەسوفانی مادی (تەتەوری) لەلایەن زانستی نوێوە بە هەلە دەرچووە، کۆمەلگای سەرەتایی کۆمەلگایەکی دڕندایەتی نەبووە، لەدوای ئەویش بەربەرییەت نەبووە، ئێستا دۆزینەوەکانی شارستانی تەواو دان دەنێن، کە لە هەموو سەردەمێك وەك ئێستاش سیستەمی مرۆڤایەتیو شارستانی شان بەشانی سیستەمی نەفامی دڕندایەتی هەبووە .

بۆ زیاتر سەرنج بدە :

١- المجتمع القديم – مۆرگان.

٢- الموسوعة الفلسفية المختصرة.

٣- G.B.Encyclopedia .

(٧)

# چەپگەریو ڕاستگەری     اليمينية واليسارية
# Leftism and rightism

زاراوەیەکی سیاسی زۆر بەربلاو بوو، لە بنەچەدا ئەو زاراوە لە چۆنی یەتی دابەشی چینایەتی هاتووە، هەر لە کۆنەوە ئەو دابەشییە بە پلە یەکو دوو ...، پیاو ماقولانو هەژاران، ئاغەو جوتیار، بنەماڵەو غەوارە، ... ئیتر هەردەم شوێنیان جیا بووە، ئەگەر تێکەڵیش ببونایە دیسان هەریەك لە لایەك بووینە، یان لەباشترین شێوەدا هەروەك لای خۆشمان ( کە ئایینی ئیسلامی ڕاستەقینەی لێ دوور کەوتبێتەوەو نایەتی .. إن أكرمكم عند الله أتقاكم - ئەرازوو نەبروبێ ) ئەوا ئەنجومەن ودیوەخانەکان وا ڕێبووینەوە، کێخواو دەوڵەمەندو شێخو ماقوڵانو مەلا لەلای سەروو، هەژارو غەوارەو خزمەتکارو بێکەسەکانیش نزیك دەرگا دانیشتوون، بۆیە ئەو پۆلێنە لە مێژ بوو بۆ دۆزینەوەی وەها زاراوەیەك، کاتێ ئەنجومەنی نیشتیمانی فەرەنسی لە ١٧٨٩دروست بوو دوای شۆڕشی فەرەنسی ئەو زاراوەیەش سەری هەڵدا لەوکاتەی پیاو ماقوڵو دەوڵەمەندان لەلای ڕاستی سەرۆکی ئەنجومەن دادەنیشتن، نوێنەرانی میللەتی هەژاریش لەلای چەپ[1]، بەپێی هەندێ سەرچاوەلەپێش ئەو مێژووەو شۆڕشی فەرەنسی ئەو نەریتە بە جۆرێك هەبووە، بەو شێوەیە بێ بڕیارو ڕێککەوتن ئەو نەریتە تەنیەوە نێو زۆربەی ئەنجومەنەکانی تری ئەورووپا، هەتا لە پەرلەمانیش ئەو نەریتە دروست بوو، لە دوایدا نوێنەری ڕادیکاڵوکراوەو پێشکەوتووەکان بە تۆماتیکی لەلای چەپ دادەنیشتن، .. ئیتر پەری یەوە ناو زاراوەی سیاسیو زۆر فراوان بوو بە هەموو ناراستەیەك، سەردەمێك بەنوێنەری حوکومەت دەوترا ڕاستڕەو بە ئۆپۆزسیۆنیش

---

[1] بۆ زیاتر بڕوانە ( الموسوعة السياسية ل ٤١٦)

(معارضة) دەوترا چەپڕەو، دوای بە مەدرەسەو تەیارە شۆڕشگێڕو ڕزگاریخوازو ڕادیکالییەکان دەوترا چەپڕەو، بە تەیارە سیاسییە پارێزگارو برجوازیو دەسەڵاتدارەکان دەوترا ڕاستڕەو، .. لەدوایدا کەوتە ناو یەك مەدرەسەو یەك تەیارو یەك حزبیش، هەتا حیزبی شیوعیشی گرتەوە، لە کێشەکانی نێوان: سۆشیال دیموکراسو سۆشیالیستی زانستی، ترۆتسکیو ستالینی، چینیو سۆڤیەتی، ئۆرۆ شیوعیو شیوعییەکانی تر، شیوعیە کلاسیکەکانو مارکسیە نوێیەکان .. ئەو زاراوەی ڕاستڕەویو چەپڕەویانە لەدژی یەکتر بەکاردەهێنا، لەنێو باڵە دژ بەیەکەکانی کوردستانیش بە خەستوخێرایی یەکتریان بە ڕاستڕەوی تۆمەتبار دەکرد، نیتر ڕاستڕەوی تۆمەت بوو و هەریەکە بە ناحەزی خۆی دەووت ڕاستڕەو، هەرچەند لینین لە کتێبێکی بەناوی (اليسار الطفولي) کەمێك لەو تەوژمەی کز کردەوە، تا بەو دواییەش لەلایەن مارکسییەکانەوە بە هەموو تەیارێکی نەتەوایەتیو نیشتیمانیو ئاینیو کۆمەڵایەتیە کلاسیکیەکانی تر دەوترا ڕاستڕەو، لە داوی دارمانی بلۆکی شیوعیەتو یەکێتی سۆڤیەت ئەم زاراوەیە بە خێرایی کز بۆوە.

ئەو زاراوە نەیتوانی بچێتە ناو فیکری ئیسلامی، چونکە جەوهەری شەریعەتی ئیسلامی نایەڵێ دیاردەی وا ڕەسەنایەتی وەرگرێ ئەگەر هەندێ دژخیش وێ بچن، هەروەك لە سورەتی (عبس) هاتووە هەتا خوای گەورە سەرزەنشتی پێغەمبەری ﷺ کرد، چونکە لەو مەجلیسە کەمێك زیاد ڕووی لە نوێنەری دەوڵەمەندو پیاوماقوڵان (ڕاستڕەوەکان بەپێی ئەو زاراوە) کردبوو، کەمێك نوێنەری هەژارانی فەرامۆش کردبوو کە خۆی لە (عمری کوری بن مکتوم) دەنواند، ئەگینا لە فیکری ئیسلامی ئەو زاراوەیە تەواو پێچەوانەیە (ڕاست) پەرۆزترە هەر لە (شەهادە هێنان)و خێرکردن ... تا دەگاتە وەرگرتنەوەی ئەنجامی تاقیکردنەوەی دونیا، ئەگەر بەدەستە ڕاستەوە وەرت گرت سەرکەوتوو بوویی، ئەگەر بەدەست چەپیش بێ، ئەوا تێکەوتی.

(٨)

## قۆڵی پێنجەم طابور الخامس fifth column

بە هەموو ئەو خەڵك‌و تاقمانە (کە لەناو کۆمەڵێکی فراوانترن) دەوترێ قۆڵی پێنجەم کە لە هەڵس‌وکەوت‌و ئاخاوتن لە قازانجی هێزێکی ناحەزی دەرەوەی ئەو کۆمەڵەن. لە بنەچەدا ئەو زاراوەیە وەرگێردراوی ئیسپانیە، لە سەردەمەکانی جەنگی ناوەخۆی ١٩٣٥ هەتا ١٩٣٩ ز هاتووە، کاتێ جەنەراڵ فرانکۆ ویستی لە چوار قۆڵ هێرش بکاتە ناو (مدريد) -هەرچەندە بەشێکی تر ئەو بۆچوونە وەسفە بۆ ( جەنەراڵ ئەمیلیۆ مولا) دەگێرنەوە نەك فرانکۆ-وە وتی قۆڵی پێنجەمیشمان لەنێو مەدریدە یارمەتیمان دەدەن، وتیان چۆن؟ وتی پروپاگندەی وامان بۆ دەکەن کاریگەرییەکانی بە ئەندازەی قۆڵێکە، کەواتە بەو لایەنگرانەی فرانکۆی وترا (قۆڵی پێنجەم) کە لەناو مەدریدن، لەنێو جەنگی جیهانی دووەم زیاتر ئەو تاکتیکە بەکارهات، (ڤیدگۆن) کۆنە وەزیری بەرگری نەرویج هەمان رۆڵی (قۆڵی پێنجەمی) بۆ ئەڵمانییەکان بینی بۆ داگیرکردنی نەرویج ...، ئەودۆخە سەربازییە بەخێرایی پەرییەوە نێو فەرهەنگی سیاسی، بۆیە لە سنووری ئەخشەی سەربازی دەرچوو، مەرج نیە قۆڵی پێنجەم کۆمەڵە مەفرەزەو چەکدار بن، ئێستا بە هەموو ئەو جەنگە دەروونی‌و پروپاگندانەش دەوترێ قۆڵی پێنجەم کە لە قازانجی هێزێکی ناحەزی دەرەوەی کۆمەڵگایەك یان هێزێك یان کیانێك‌و وڵاتێك دەکرێ‌و وردیان پێ دەرووخێنن، لەناخی هەموو میللەت‌و هێزێك ئەو قۆڵە هەبووە، ئەگەر چی وەك زاراوە نوێیە ئەگینا ماهیەتی کۆنە لەگەڵ کۆنی مێژوو، هەر لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ بێبڕوایانی قورەیش‌و عەرەبە دووڕووەکان لە قۆڵی پێنجەم بۆ هێزە هێرشکەرەکانی دەرەوەی مەدینە، نەك هەر بە پروپاگندەو جەنگی دەروونی‌و ڕاگەیاندن، بەڵکو گەلێ جار بە شیرو تیریشەوە، ئێستا پلە بە پلە ئەو

قـۆڵی پێنجه‌مـه‌وه‌ك تۆمـه‌تو بیـانووی سـزادان بـه‌كاردێت له‌لایـه‌ن زلهێـزان‌و ده‌سه‌ڵاتداران بۆ هێزه‌كانی له‌خۆ بچوكتر، ئه‌وانیش بـۆ زیـاتر بـچوكتر، .. ئـه‌و زاراوه هه‌ر له فه‌رهه‌نگی سیاسی قه‌تیس نه‌ماوه په‌ڕیـیه‌وه بواره‌كانی ئایدۆلۆجیاو فه‌لسه‌فه‌و ئـه‌ده‌بیاتو ڕاگه‌یانـدن‌و .. هـه‌تا ڕێكخـستنی سیاسـی‌و مـه‌درسـه‌ی فیكری‌و سیاسیش، له‌ناو جیهانی مسوڵمان نشین‌و جیهانی سێیه‌م.

جاران بـۆ هـه‌ردوو بـه‌ره‌ی ڕۆژهـه‌ڵاتو ڕۆژئـاوا ده‌بوونـه قـۆڵی پێنجـه‌م بـه ڕێكخـستنی سیاسیـشه‌وه، بـه‌و شـێوه گه‌لـێ جـار ده‌بوونـه قـۆڵی یه‌كـه‌می داگیركه‌ران، له نێو وڵاتانی عه‌ره‌بی له كۆتایی سه‌ده‌ی (١٩)وه باڵی نه‌ته‌وه‌گه‌ری ته‌غریبی بۆ ڕۆژئاوا وه‌ك قۆڵی پێنجه‌م كاریان كردووه له‌سـه‌ر هـه‌موو ئاسـتێك، له‌نێو ده‌وڵه‌تی عوسمانلیش ئه‌و بزوتنه‌وه‌ی كه پێـی ده‌وو‌تـرا (عوسمـانی لاو دوای توركیای لاو دوای (اتحاد والترقی) .. وه‌ك قۆڵی پێنجه‌م كاریان كرد تا لـه دوایـی بوونه قۆڵی یه‌كه‌م‌و خه‌لافه‌تیشیان ڕوخاند، بۆیه (ئه‌میل لودفیغ) ووتی: ئه‌تاتورك له ناپلیۆن به‌هێز تره، چونكه ناپلیۆن نه‌یتوانی خه‌لافه‌ت بڕوخێنێ به‌ڵام ئه‌تاتورك توانی[1]، واته قۆڵی پێنجه‌م جارواپه ڕۆڵی قـۆڵی یه‌كـه‌م ده‌بینـێ، لـه‌و دواییـه‌ش دیسان بۆ یـه‌كێتی سـۆڤیه‌تی كـرا لـه ئه‌فغانـسـتان‌و زۆر شـوێنی تـر، ئێـستاش به‌هه‌مان ماهیه‌ت بـۆ ڕۆژئـاوا ده‌كـرێ، زۆربـه‌ی جـار ده‌سـه‌ڵاتداره دیكتـاتۆرو شـمولیه‌كان خۆیان ئه‌و ڕۆڵه ده‌بینن، ئه‌و زاراوه‌یه له‌گه‌ڵ بـازدانی عه‌وله‌مـه بـۆ قۆناغێكی باڵاتر زیاتر مانای هه‌مه‌لایه‌نی وه‌رگرتـووه، هـه‌تا ده‌گاتـه كـه‌لتوورو شارستانی‌و فه‌رهه‌نگ‌و نه‌ریت‌و .. هتد، ئێستا له‌ژێر ڕۆشنایی تیۆری (ململانێی شارستانی) هه‌موو ئه‌و ڕێبازانه‌ی سه‌ر به مه‌درسـه‌ی لیبـراڵ — دیموكراسـی‌یـه له‌ناو جیهانی ئیسلامی به سروشتی خۆی ده‌بنه قۆڵی پێنجه‌م له چوارچێوه‌ی ئـه‌و ململانێیه شارستانیه، هه‌روه‌ك پێشتریش مه‌درسـه‌ی چه‌پی ده‌بووه هه‌مان قۆڵ بۆ یه‌كێتی سۆڤیه‌ت، ... له‌ناو میلله‌تانی داگیركراوو دواكه‌وتووه‌كانیش ئـه‌و قۆڵـه

[1] بروانه :الاسلام والعلمانية واثرهما في نشأة الدولة العراقية الحديثة ص١٥٧

زۆر بەزەقیو بەناو ئەدرێـی ئاشکراتر ناو دەبرێن وەك خۆفرۆشی، خائن، جاش، بەپێی ڕای ئیسلامیو نیشتیمانپەروەرەکان لە هەندێ دۆخدا قـۆڵی پێنجـەم زۆر ترسناکترە لە بەرەکانی تری دەرەکی، چونکە عادەتەن ئەو قۆڵە لە خانەی ڕەگەزی خۆت دایە، بۆیە ناونران (منافق)، هەروەك ئێستاش دەبنین بەربەرەکانی دوژمنـی ئاشکرا چەندە سـاناتر لەگەڵ عەلمانییەتی نـاوەخۆی بـا تـەکنۆلۆجیای لاوازیـش بیت ... ئەو قۆڵە چاکترو شارەزایانەتر دەست دەوەشـێنن لـە ئیسلامیو هێـزە نیـشتمانیەکان، ئـەوە لـە لایـەك، لەلایـەکی تـر دوور لـەناوی وەك داگیرکـەرو ئیمپریالیزمو غەیرە دینو .. بەرنامەکان جێبەجێ دەکەن، ئەوانە نـاوی خۆمـاڵی وەك ڕزگاریو دادگەریو ئاینیو نەتەوەیی .. هەڵدەگرن.

گەلێ جار قۆڵی پێنجەم بـە نەخـشەو بەرنامەیـەکی نهێنـی ترسـناكو ئـاڵۆز کارەکانی جێبەجێ دەکات، وەك نمونەی ئەو وەزیرە بەکرێگیراوەی لـە ئـەزموونی ئەوروپای ڕۆژهەڵات چۆن تەنیا کـارو فـەرمانی ئـەوەبوو خـەڵکی ناشایـستە لـە شوێنی شایـستە دابنێ وە بە پێچەوانەش تـا ژێرخـانی ئـەو ئیدارەیـە بڕزێتـەوە، ئاواش جاروایە هێزو تاقمیوا لە ڕیـزی میللـەتێکی داگیرکـراوو کـارو فـەرمانی ئەوەیە بناغەکانی کۆمەڵو بەهاو ڕەوشتەکان بڕزێنێتەوە بۆ ئـەوەی بـە ساناییو بێ بەرگری ئەو میللەتەو نیشتیمانەکەی داگیر بکرێ، ..وەك ئێستا دەبینـرێ لـە کوردستانیش بە هەموو ئاڕاستەیەك ئەو پلانانە جێبەجێ دەکـرێ، جامـەرج نیـە هەمووی سـەرکردایەتی هەستی تەواوی پێ بکا، بۆیە گەلـێ جاریش تاقمو هێـزی سیاسیوا بەهۆی ئەو نەخشە باڵا ئاڵۆزانەی جیهانی دەبتە قۆڵی پێنجەم بێئەوەی هەست بەخۆی بکا.

(٩)

# سیستەمی نوێی جیهانی        نظام عالمي جديد
# New International Order

زیاتر زاراوەیەکی سیاسی دەماودەستە، هاوتای عەولەمە نییە وەك هەندێ فەرهەنگی سیاسی وای بۆچوونە یان بە سەرەتای (عەولەمە)یان لەقەڵەم داوە، ئەو زاراوە لەدوای تێکڕوخانی بلۆکی سۆشیالیستیو یەکێتی سۆڤیەتی سەری هەڵدا بە هەڵچوونەوە بە بۆنەی سەرکەوتنە سەربازیو سیاسیو یاسایەکەی هاوپەیانان بەسەرۆکایەتی ئەمەریکا لە جەنگی کەنداوی دووەم بەسەر عێراقدا، تیۆرێکی سیاسی نوێ بە درێژایی سالآنی ١٩٩٠ – ١٩٩٢ ڕاگەیەنرا لە لایەن (جۆرج بۆش – باوك) بەناوی (سیستەمی نوێی جیهانی) تیایدا کۆمەڵێك نەریتی جیهانی نوێی هێنا پێش، جیا بوو لەگەڵ نەریتو سیستەمەکانی سەدەی بیستەم لەوانە: بازاڕی ئازاد، دیموکراسی، مافی مرۆڤ، پابەندی یاسای نێو دەوڵەتی، تەدەخولو نەوەستان لەسەر سەروەری سنووری نێو دەوڵەتی...

هەڵبەتە گەلێ جاری تر جاری، سیستەمی وا جاڕدراوەو ناونراوە سیستەمی نوێی جیهانی وەك ئەو رێکەوتنەی لەدوای جەنگی سی ساڵەی ئەوروپیو دوای لە ڕێکەوتنی ویستیفالیا ١٥٤٨ز بەستراو (عائلة الاوروبي) لێ دروست بوو، دوایی بووە سیستەمێك هەموو جیهانی گرتەوەو دەوڵەتی عوسمانلیش لە سەردەمی سوڵتان عبدالمجید لە ١٨٥٦چووە ناویەوە، لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم دیسان ئەو ١٤ بنەمایەی ویلسون لە ١٩١٨ز لەبارەی جیهانو (عصبة الامم) ئەوکاتی بە سیستەمی نوێی جیهانی خوێندرایەوە، زۆرجاری تریش ... زۆربەشیان تەدەهاتە دی، هەتا لە سیستەمە جاڕدراوەکەی ویلسونی ئەمریکی لە خاڵی ١٤ پێشنیاری پێکهێنانی (عصبة الامم)ی کردبووکەچی خۆشی نەبووە ئەندام تیایدا

بەهۆی قایل نەبوونی کۆنگریس، ئەو جارەش سیستەمی نوێی جیهانی نەبووە قۆناغ و وەرچەرخانێك، چونکە هەر لە سەرەتایدا دووچاری قەیرانێکی ناوەندی ترسناك بۆوە، ئەویش ئەوە بوو جاڕنامەکەی زیاتر دیموکراسی بوو کەچی ئەو دیموکراسی یە لە جیهانی موسوڵمانشین بووە هۆی سەرکەوتنی بزوتنەوە ئیسلامییەکان لە هەڵبژاردنە دیموکراسیەکان وەك لە جەزائیرو ئوردن و تورکیاو تاجیکستان و بەحرەین و کویت و عێراق و فەلەستین ... گەلێ شوێنی تر .. بۆیە بەهۆی عەلمانییەتی ناوچەکە بە خێرایی لەو دیموکراسی یە پەشیمان بوتەوە، کەوتەوە پشتیوانی دیکتاتۆری و ئینقیلابچی یەکان. تا لەوکاتەدا ئەمریکاو رۆژئاوا لە جیهانی ئیسلامی دۆستی ئەو لایەنە دەسەڵاتدارانەن، کە لە هەڵبژاردن دەرنەچوونەو دەسەڵاتیش بە دیکتاتۆرانە بەڕێوە دەبەن لەوانە دەسەڵاتی فتح لە فەلەستین، پەرویز موشەڕەف لە پاکستان، عەلی مەهدی لە سۆماڵ ... بۆیە ئەو جاڕنامەیەی (سیستەمی نوێی جیهانی) لەگەڵ گۆڕانی سەرۆك و هاتنی (بیل کلینتۆن) بە خێرایی لە عەولەمە توایەوەو قۆناغێکی تری ئەو ئەخشەیە هاتە پێش بەناوی (ململانێی شارستانی)، ئیتر لەسەردەمی (کلینتۆن) لە نوسین و سەردێرا کەمتر باسی لە سیستەمی نوێی جیهان دەکرا، گۆڕا بۆ باسای عەولەمە کێشە شارستانی یەکان، سەرەڕای ئەوەش چەند نیشانەیەکی روونی پێوە دیار بوو، لەوانە:

١- بالکێشانی تاك جەمسەری و تاکڕەوی ئەمەریکا بەسەر جیهان و دەزگا نێو دەوڵەتییەکان بە زاراوە ناونراوە (أمركة).

٢- زۆربەی کارو هەڵمەتەکانی ئەمریکا لە سەرەتادا لەژێر چەتری یاسایی و یاسای نێو دەوڵەتی و کۆکردنەوەی دەوڵەتان بوو بۆی، .. دوایی بەرەبەرە ئەو چەترەشی فەرامۆش کراو دەکری.

٣- بنەمای (بانێك و دوو هەوا) بەسەر زۆربەی بوارەکانی ژیانی سیاسی و یاسایی و شارستانی و باری نێو دەوڵەتیەوە دیارە.

٤- زل کردنی فاکتەری ئابووری بەهۆی بازاڕی ئازاد. بەسەر هەموو فاکتەرەکانی تری بەکار لە جیهاندا وەك فاکتەری ئایینی‌و سیاسی، ئایدۆلۆژی، کۆمەڵایەتی، نەتەوەیی، جوگرافی، نەژادی، ...

٥- لە جەنگی هەمەلایەنەدا یە بۆ ئەو خاڵانەی سەروو .. بە هەموو ئاستەکانی‌یەوە لەوانە: ململانێی شارستانی وەك لایەنی فیکری، تیرۆر وەك لایەنی یاسا، بازاڕی ئازاد وەك لایەنی ئابوری، لیبراڵی وەك لایەنی کۆمەڵایەتی، عەلمانییەت وەك بەدیلیی لایەنی ئایینی، سیستەمی دیکتاتۆری وەك لایەنی سیاسی،.. لێرەدا تێبینی دەکرێ ئەوانەی سلبیە دەنێردرێتە دەرەوە، ئیجابییەکان بۆخۆی گل دەداتەوە، ئینجا ئەو دیکتاتۆری‌و سلبیاتە تەنها بۆ جیهانی ئیسلامی دەنێرێ، ئەگینا ڕاستە وا جەنگ لەسەر دیموکراسی دەکا لە شوێنانی تر.

٦- لەبەر ئەوەی ئەمەریکا هێزەکەی ڕێکخراوە بەرامبەر هێزی دیارو ڕێکخراو سەرکەوتووە، بەڵام بەرامبەر هێزی بزرو پارتی زان سەرکەوتوو نیێ، چ لەو سەردەمە چ لەکۆنەوە، هەروەك لە شۆڕش‌و بەرگریەکانی خەتابی لە مەغریب عومەر موختار لە لیبیا، عبدالقادری جەزائیری، مەهدی لە سودان شۆڕش‌و بەرگری شێخ محمود لە کوردستان‌و زانایانی ئایینی لە نەجەف‌و کەربەلا، تا ئەو ساتەش هەروایە زۆر بە ئاسانیی ڕووبەڕووی دەوڵەتی عێراقی بۆوە، کەچی تا ئێستا چارەی ئەو بەرگریەی نێو سوننی عەرەبی پێ ناکری، بۆیە لە تەقەلایەکی بێوچان دایە تەنیا شەرعییەت بداتە بوونی ڕەمی، تا بتوانێ بەئاسانیی زاڵ بێت بەسەریاندا، ئیتر شەرعییەتەکانی شۆڕشگێڕی‌و جەماوەری‌و ... کپ بکاتەوە بەناوو ئاتۆرەی (تیرۆر، تێکدەر، بەدەر لە یاسا ...) ئەوەش یەکێ لە مەبەستەکانی سایکس-بیکۆ بووە لە دروستکردنی ئەو دەولەتۆکانەی وەك: عێراق، ئوردەن، سوریا، کوێت .... .

٧- ڕۆژئاوا گەلێ جار بەڵێنی وای لە شێوەی (سیستەمی نوێی جیهانی)یەوە جاڕداوە تەنها لایەنی سەلبییەکانی جێبەجێ کردووە، بەلام لەلایەنی ئیجابی

یه‌كان هه‌ر ده‌نگ بووه‌و به‌س، ئیتر به‌و شێوه له كۆنه‌وه‌ش دروشمی بـه‌ناوی (عـدم إنتشار البارود) به‌هه‌مان شێوه‌ی ئێستای كه چۆن مل له‌بـه‌ر ملـی ئـه‌و ولآتانـه ده‌نێت كه له‌گه‌ڵ به‌رژه‌وه‌ندی ئه‌و تێك ناكاته‌وه ئه‌وا به‌ناوی (عدم إنتـشار أسـلحة الدمار الشامل ) ( .. نووی ) .. ڕوو به‌ڕوویان ده‌بێته‌وه

## په‌یوه‌ندی سـیسـته‌می نوێی جیهـانی به ســایكس بیكـۆو ملـملانێی شارســـتانی یه‌كان:

ململانێی شارستانی له هه‌مناوی سیسته‌می نوێی جیهـانی نـه‌هاتووه، بـه‌ڵكو تیۆرێكی كۆنه به‌شێوه‌ی جیاجیاو ناوی جیاجیا په‌یڕه‌و كـراوه، سیـسته‌می نـوێی جیهانی قۆناغێك بوو له‌و (ململانێ‌یه)، له سیـسته‌می نوێی جیهانی دا كۆمه‌ڵێك فاكته‌ری سیاسی نوێ هاته كایه‌وه له‌وانه: ١- تێك ڕووخانی بلوكی سۆسیـالیستی ٢- سه‌رهه‌ڵدانی ڕابوونی ئیـسلامی ٣- جـه‌نگی دووه‌مـی كه‌نـداو .. وای كـرد ئه‌وجاره ئه‌مه‌ریكا به به‌رپرسی جیهان‌و نوێنه‌ری ڕۆژئاوا بێته‌وه گۆڕه‌پـان له‌سـه‌ر شـێوه‌ی (ڕۆم)ی كـۆن‌و هه‌ڵمه‌تـه ئیمپریـالیزمی یـه‌كانی ناوه‌راسـت‌و شـارلمانی فه‌ره‌نسی ...، به شێوه‌یه‌ك یاری دا به‌سه‌ر عه‌لمانی یه‌تی ناوچه‌كه‌ر خودی نه‌خشه‌ی سایكس -بیكۆی ١٩١٦، بۆیه له‌پێشدا ده‌بێ لایه‌نێك له نیـازه نهێنـی یـه‌كانی په‌یاننامه‌ی سـایكس - بیكـۆ تۆمـار بكـه‌ین، ئینجـا زیـاتر لـه‌و سیـسته‌مه‌و ململانێی شارستانی تێدگه‌ین به تایبه‌تی له‌ناوچه‌كانی جیهانی ئیـسلامی :

## مه‌به‌ســـته‌كانی ســایكس- بیكــۆ:

جگه له نیازه ئاشكراكانی كه ئیمپریالیزمه ئه‌و نیـازه شاردراوانه‌شـی تیایـه زۆر به‌كورتی:

١- بۆ دابەشكردنی جیهانی ئیسلامیو یەك نەگرتنەوەی ﴿لە چوارچێوەی یاسـای (فرق تسد) كە لە زەمانی ئەسكەندەری مەقدۆنیەوە پەیڕەو كراوە[1]﴾.

٢- ئاسانی زاڵبوون بەسەر جەنگی میللی، لـەرێی دەســەڵاتی عـەلمانی ناوچـەو وڵاتەكە، ئەو نەخشەیە لە زەمانی فیرعەونـەكان پـەیڕەو كـراوە بـۆ زاڵبـوون بەسەر تەواوی خەڵكی وڵاتیان كردە (٤٢) هەرێم، لەلایەكی تر ڕۆژئاوای ئەو ساتیو ئەمەریكای ئێستاش لایان سانایە سزای هەر دەوڵەتێك بدا بـەڵام لای زۆر قورسە بەسەر بزووتنەوەیەكی میللی زاڵ بێت، بۆیـە ناوچـەكەیان كـردە چەندین دەوڵەتۆكەو هەریەكەشی دیكتاتۆرێكی بەسەردا سەپاندووە.

٣- بۆ ئەوەی بەڵێننامەی بەلفۆر١٩١٧بچەسپێ.

٤- هەردەم ناوچەی نائارامی دروست بێ وەك پاساو بۆ هاتنـەوەو سـزاو دەست تێوەردانی ناوچەكە.

٥- دارشتنی دامو دەزگا نوێكان لەسـەر بنـچینەی عەلمانییـەتەو بۆشـاییـەك بەجێ نەمێنێ، كە جارێكی تر دەوڵەتی ئیسلامی جێی بێتەوە.

ئەو خاڵانە نزیكەی $3/4$ سـەدەیەكی خایانـدوە، بـەڵام دوایـی دیـسان ڕابـوونێكی ئیسلامی لەپاش شۆڕشی ئیسلامی ئێرانی خومەینی ١٩٧٩ سەری هەڵداوە، زۆر بەخێرایی ئەمەریكاو ڕۆژئاوای ترساند، لەگەڵ ڕەخساندنی بـاری جیهـانی بـەرەو پێشچوونی تەكنۆلۆجیاو هەرەسی بلۆكی سۆشیالیستیو فاولی عێراق لە جـەنگی كوێت، وایكرد ئەمەریكا خۆی بێتەوە مەیدان جـارێكی تـر نەخـشەی سـایكس-بیكۆ سـەرلەنوێو لەسـەر بنـچینەی سـەدەی (٢١)و بـە بنـەماكانی ململانێـی شارستانی دارێژرێتەوە، لـە دوای ١١ی ئـەیلول- ٢٠٠٢ بـە سـەربازیش هاتـەوە گۆڕەپـانو سیـستەمی نـوێی جیهـانی كۆتـایی هـاتو قۆنـاغی پـەیڕەوكردنی

---

١ كاتی ئەسكەندەر سەركەوتووبوو بەسەر ڕۆژهەڵاتو لە خاكی فارس ڕا نامەیەكی بۆ ئەرستۆی مامۆستای نارد وداوای لێكرد ئاخۆ چی بكاو چۆن زاڵ بیو لە كاتێكا لە جەنگ زاڵ بووە خاكی گرتووە چۆن بەسەر تاكیش (میللەتانیش) زاڵ بێ، لە وەڵامدا ئەرستۆ وتی سیاسەتی (پەرتكەو زاڵ بە) یان بەسەردا بسەپێنە.

ململانێی شارستانی نوێی هات، لە سەرەتادا ئەفغانستان و دوایی عێراقی داگیر کرد .. بەڵام سەرەنجامەکانی واپێدەچێ زۆر بەترسناکی ڕوو لە ئەمریکا بکاتەوە، چونکە لەلایەن ئیسلامییەکان بەربەرەکانێی ڕاستەوخۆی ئەمریکاو ڕۆژئاوا ساناترە، نەك بەربەرەکانی عەلمانییەتی خۆماڵی با تەکنۆلۆجیای یەکەم بەهێزتریش بێت، بۆیە ئێستا ئەمریکا بیر لە چاوپیاخشاندنەوەی ئەو هەنگاوە گۆبەندییە (مجازفیە) دەکاتەوە، چونکە هەر وڵاتێك داگیر دەکا ئەوا لەدوای حکومەتە عەلمانییە دیکتاتۆریەکە یەکسەر ڕابوونی ئیسلامییەکی بەهێز لەجێی دەتەقێتەوە، کە پێشتر لەلایەن حکومەتە عەلمانییەکە وەك پاسەوانێکی ڕۆژئاوایی سەرکوتی کردبوو، بەلادانی ئەو قەپاغە یەکسەر ڕابوونەکە دەتەقێتەوە. بۆیە هاتنی ئەمریکاو گۆڕینی لە ناڕاستەوخۆ بۆ ڕاستەوخۆ زۆر لە قازانجی ئیسلامییەکان بووەو دەبێ کەچی ئیسلامییەکان ئەو ستراتیژیەیان پەیڕەو نەکردووە هەروا دژی ئەمریکان بە پلە یەك.

(١٠)

# ناردنـــی شـۆڕش تصـدير الثـورة

# Export Revolution

به‌ مانای به‌رپاکردنی جموجۆڵی سیاسی تا پله‌ی شۆڕشی بـه‌هۆی فاکتـه‌رێکی ده‌ره‌وه‌، ئه‌و زاراوه‌یه‌ له‌سـه‌رده‌می شۆڕشـی ئۆکتۆبه‌ری ١٩١٧بـه‌ سـه‌رۆکایه‌تی (لینین) که‌مێك به‌و شێوازه‌ سـه‌ری هه‌ڵـدا، بـه‌ڵام نـه‌بووه‌ زاراوه‌یـه‌کی سیاسـی، له‌دوای سـه‌رکه‌وتنی شۆڕشـی ئیسلامی ئێرانـی به‌سـه‌رۆکایه‌تی (آ.خمـینی ) لـه‌ ١٩٧٩ ئه‌و زاراوه‌یه‌ سه‌ری هه‌ڵدا، ئه‌وشورشه‌ جموجۆڵو رابوونێکی فراوانی خسـته‌ ناو جیهانی ئیسلامی، چـونکه‌ چۆنایه‌تی شۆرشـه‌که‌ زۆر جۆشـده‌ر بـوو، یه‌کـه‌م جاریش بـوو شۆڕشـێکی جـه‌ماوه‌ری به‌سـۆز بـه‌ناوی ئیسلامی ئـاوا سـه‌رکه‌وێ بێئه‌وه‌ی پاڵ بداته‌ رۆژهه‌ڵات یا رۆژئاوا، له‌دوای سه‌رکه‌وتنیش سه‌رکرده‌و رابـه‌رانی شۆڕشی ئێرانی به‌دوای ژیانو خۆشگوزه‌رانی نه‌بوون، یه‌کـسه‌ر روویـان لـه‌ کێـشه‌ نادادگه‌ری یه‌کانی جیهان کردو هه‌ر خـودی ئـه‌و شۆڕشـه‌ش زۆر ورووژێنـه‌ر بـوو، هه‌موو جیهانی له‌ زۆرداران به‌خه‌به‌ر هێناوه‌ سه‌لماندی به‌وه‌ که‌ هێزی جه‌ماوه‌ر لـه‌ ته‌کنۆلۆجیای سه‌ربازی به‌هێزتره‌، بێئه‌وه‌ی ئه‌وان جارێ بتوانن بیرژێنه‌ سه‌ر ناردنه‌ ده‌ره‌وه‌ی شـۆرش هـه‌ر خـودی رووداوی (شۆڕشـه‌که‌ )بـووه‌ هانـدانی خـه‌ڵك لـه‌ زۆرداری‌و دیکتاتۆره‌کان هه‌ڵسن، به‌و شێوه‌یه‌ جمو جۆڵو نائارامی یه‌کی بێ وێنـه‌ جیهانی ئیسلامی گرته‌وه‌، شۆڕشی ئه‌ڤغانستان به‌ناوه‌رۆکی ئیسلامی زیاتر ته‌قی یه‌وه‌، له‌ تورکیا له‌ عێراق لـه‌ وڵاتـانی عـه‌ره‌بی ... هتـد خـوارووی ئاسیاشـی گرته‌وه‌، زۆربه‌ی شۆرش‌و به‌رگری یه‌ میللی یه‌کانی داگیرکه‌رانیـشی گه‌شـانده‌وه‌، به‌رگری فه‌له‌ستین، مۆرۆ، کـشمیر، خـوارووی لبنـان.. زۆر گه‌شـه‌ی بـه‌ شۆڕشـی کوردیش کرد، ... به‌و شێوه‌یه‌ له‌به‌رامبـه‌ر ئـه‌و دیمه‌نـه‌ ترسـناکه‌ی ده‌سـه‌ڵاتداره‌

دیکتاتۆریو زلهێزانی ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاوا ئەو زاراوەیە دۆزرایەوە بەناوی (تصدیر الشورة)، بۆ ئەوەی ئەو دۆخە شۆڕشگێڕییەی کەوەك شەپۆڵ ولاتانی دەگرتەوە بە سروشتی بیخەنە ئەستۆی دەوڵەتێك، ئیتر میللەتان لە ئەنجامی باری خراپی دەسەلاتداران بەخەبەر دەهاتنەوەو کێشەکە لە نێوان میللەتو دەسەلاتدارانی دیکتاتۆری بوو .. بەهۆی ئەو زاراوەیە دەویسترا بکرێتە کێشەیەکی نێوان دەوڵەتو دەوڵەتێکی تر، .. بەو شێوەیە ئەو زاراوەیە زۆر گەشەی کرد ... تا بە هەموو لایەك جەنگی عێراق دژی ئێرانیان سازدا کە لە نزیکەوە دیوارێکی پۆلاینی لە پێش ئەو شۆڕشە دروست بکا، لەکۆتاییدا بەرەبەرە ئەو زاراوەیە بووە تۆمەتێك هاوتای ئەو زاراوەیە، زاراوەی وەك (ئوسولی، تزمت، تیرۆریست، ئیسلامی، ... ) لەگەڵی پەیدا بوو، پێکیشیان دەبەستەوە، لە ژێرەوەش تەقەلایەکی جیهانی خەست تر هەبوو بۆ بەرگرتنی ئەو (تصدیر الشورة ) بەدەیان کۆبونەوەی ڕەسمیو نارەسمی سازدرا، لە هەمووی گرنگتر لە نێوان ئەمریکاو ئیسرائیل کۆمیتەیەکی بالای هاوبەش پێکهات بەناوی (کۆمیتەی گشتی هاوبەش) بەدەیان سەنتەری توێژینەوەی لەبەردەست بوو، بودجەیەکی خەیالی بۆ تەرخان کرابوو، کارو فەرمانی دۆزینەوەی ئیختیلافەو زیندووکردنەوەی جیاوازی مەزهەبی وەك شیعەو سونەو ئیسلامی سیاسیو ناسیاسیو ...پەیداکرد، لەو ڕووەوە دەسەلاتدارانی ولاتانی عەرەبی بەشداربوون بە تایبەتی میسر، ولاتانی کەنداو، عێراقی بەعس، .. ئەو لێژنەیە ئەرکی زۆر فراوان بوو هەتا دروستکردنی کەسێتی ئیسلامیو بانگخوازو بیروباوەڕی توندو ناکۆك، لەچاپدانی کتێب بۆ ئەوەی ناکۆکی لە ڕیزی ڕابوونی ئیسلامی دروست بێت تا ئەو جۆشو خرۆشە جیهانییە کپ بێتەوە، .. بەو شێوەیە تا ڕادەیەك توانیان پێش لەو شەپۆلە بگرنەوە، بەلام هەر کاریگەرییەکەی بەردەوام بوو هەتا ئەو ساتەش، لەکاتێکا جەنگی عێراقو ئێران بەردەوام بوو بۆ بەرگرتنی ئەو (تصدیر الشورة) دەبینین پەرییەوە ئەفغانستان بەرەو ڕۆژهەلات لەولایەش پەرییەوە ولاتانی عەرەبیو

سودان‌و جەزائیرو تونس، .. تا لەنێو تەیاری سێیەم بە ناوی (سەلەفییەت) لەناو ڕابوونی ئیسلامی دروست کرا، کاریگەرییەکی لە هەموان زیاتر لەو (تصدير الثورة) کردو کۆمەڵێك جیاوازی نوستووی بەخەبەر هێنایەوە، زیاتر دەسەڵاتداران‌و زلهێزانی حەساندەوە .

(١١)

## تۆرانی الطورانیـة Toranism

بیرێكی عــه‌لمانی نه‌تــه‌وه‌یی توندڕه‌وه هاوتــای فاشــی و نــازی شــۆڤینیی‌و ئالانزیسی‌و به‌عسی، له ناوه‌ڕاستی سه‌ده‌ی ١٩ چه‌كه‌ره‌ی كـرد، بـه‌ڵام لـه‌دوای ســاڵانی ١٩٠٨ پــه‌ره‌ی ســه‌ند، وه‌ك ئــامرازێكی ترســناك لــه دژی عوســمانلی‌و نه‌ته‌وه‌كانی تری موسوڵمان، ده‌قی بیری تۆرانی ئه‌وه‌یه: كه له‌كتێبه‌كانی ( تكین ئــه‌لب) هــاتووه بــه نــاوی (تــۆران) : تــۆران پارچــه خــاكێكی ڕه‌ســه‌نی توركــه له‌ناوه‌ڕاستی ئاسیا[1] بــه‌ڵام تــۆرانی بزوتنه‌وه‌یــه‌كی ڕه‌گــه‌ز په‌رســتی سیاســی بــه مه‌به‌ستی كۆكردنه‌وه‌ی هه‌موو ئه‌وانه‌ی به توركی ده‌دوێن لــه تــورك‌و توركمــان‌و ته‌ته‌رو مــه‌غۆڵ‌و قورغیــزو ئــازه‌ری‌و ئۆزبــه‌ك‌و .. بــه هــه‌موو ئــه خاكــه پــان‌و به‌رینه‌شی یه‌وه كه له‌سه‌ری ده‌ژین، به‌و شێوه‌یه ئه‌خشه‌ی سیاسی‌و جوگرافی‌و مێــژوو یــی‌و ئه‌خــشه‌ی عوســمانلی زۆر لێــك جیــان، ئینجــا بیروبــاوه‌ڕو مێــژوو و فه‌رهه‌نگ‌و كــه‌لتوورو .. هــه‌تا ده‌گاتــه عه‌قیــده‌و تێڕوانین‌و ئامانجه‌كانیــشیان، له‌جیاتی (په‌یوه‌ندی ئاسۆیی ئیــسلامی عوســمانلی) كرایــه په‌یوه‌نــدی ئــاقوڵی ڕه‌چه‌ڵه‌ك، ده‌ستكارییه‌كی بنچینه‌ی ئه‌ده‌بیات‌و ڕووی مێژوور كه‌لتوورو بیرو ڕوا نینتیماكانی كردووه، له ئاسۆیی یه‌وه بــه‌ره‌و ئــاقوڵی، لــه پێشكه‌وتوویی یــه‌وه بــه‌ره‌و دواكــه‌وتویی، لــه مرۆڤایــه‌تی یــه‌وه بــه‌ره‌و ڕه‌گــه‌ز په‌رستی، مێــژووی عوسمانیشی كرده به‌شێك له‌و پرۆسه‌یه‌ی پانتایی تۆرانی .. له‌سه‌رده‌می عوســمانی بیری نه‌ته‌وه‌یی نه‌بوو، خه‌لافه‌ت به‌ناوی ئیسلامی بوو نــه‌ك توركایــه‌تی، هــه‌موو نه‌ته‌وه‌و هێزو توێژی جیاجیا به‌یه‌كسانی ئینتیمایان له‌و خه‌لافه‌ته بــووه ســه‌ره‌ڕای به‌دكارییه‌كی زۆری سوڵتانه‌كان به‌ڵام ئه‌وخراپییه‌یان به‌ناوی نه‌ته‌وه‌یی نــه‌بووه، هــه‌ر

[1] له سه‌رووی ئێرانیش ناوچه‌یه‌ك هه‌یه به‌ناوی (توران) به‌ڵام ئه‌و جیایه له‌گه‌ڵ ئه‌و تورانه

بۆیەش نازناوی سوڵتانەکانیشیان بەناوی تورکایەتی نەبووە نازناوی وەك سوڵتان، خادم حرمین، خاقانی بروبحر، .. بۆ زیاتر سەرنج بدە (موسوعة الألقاب ...) هەتا لە هیچ شوێنێك بە سەربازی عوسمانی تەوتراوە سەربازی تورکەکان، هەر وتراوە سەربازی عوسمانی یەکان یا سەربازە ئیسلامیەکان، لەناو کوردیش بە خراپەش کە ناویان هاتووە بە ناوی (جل خوارەکان) یان (گورگە بۆرەکان) لەناو عەرەب بە (ئەفاندم) ناویان هاتووە، بەناوی تورك نەهاتووە[1]، هەروەك هەندێ ئەرهەنگو ئەنسکلۆپیدیاو نووسەری ئێستا جاروایە تورکو عوسمانی یەکان تێکەڵ دەکەن بەتایبەتی گوتاری ئیمپریالیزمی یەکان، بۆ ئەو مەبەستە سەرنج بدە (ساطع حصري) کە جیهانبینێکی نەتەوەگەری توندی عەرەبیشەو لە سەردەمی خەلافەت (قائیمقامی) مەقلۆنیا بووەو باوکیشی قازی بوو بە هەموو هەرێمەکانی عوسمانلی دا گەرابوو دەڵێ: لە هیچ شوێنێك ئەو هەستەی نەتەوەیی لای هیچ لایەك نەبوو لەلای تورکەکانیش[3]، لە دەزگاکانی ڕەگەزنامەش لە ناسنامەدا ناوی نەتەوە نەدەنووسرا تەنها ئاین دەنووسرا[4]، (محمد أمین زەکی بەگ)یش لە پێشەکی کتێبی (کوردو کوردستان) دووپاتی ئەو ڕاستی یە دەکاتەوە، لەراستیدا توێژەرەوان تا ئێستا زۆر گەڕاون لە نێو بەڵگەنامەکانی عوسمانی بەڵگەیەکی نەتەوەگەریان نەدۆزیتەوە تیایدا لایەنگیری ڕەگەزی تورك بکا، بە پێچەوانەوە زۆربەی تورکمانو ئازەرو.. دژی عوسمانی بوون زیاتر لایەنگیری سەفەوی بوونە، کەچی کوردو عەرەب لای عوسمانی بووینە.

بەو شێوەیە ئەگەر سەلبیاتو ناداد گەریش هەبووبێ لە ڕووی نەتەوەیی نەبووە، بۆیە لەدوای داڕووخانی خەلافەت زۆربەی نەتەوە (ناتورکەکان) سەرلەنوێ داوای گێڕانەوەی خەلافەتیان کردووە، نەتەوەگەری یە تورکەکان بەو دۆخەی ناو

---

١ بۆیە زیاتر سەرنج بدە (بیرەوەریەکانی ڕەفیق حلمی).

٣ و ٤ بۆ زیاتر بروانە: محاضرات في نشوء القومیة- ساطع حصري .

عوسمانلی قایل نه‌بوون، ئیتر جاری ئه‌وه‌یان دا که ڕه‌گه‌زی تورك له خه‌لافه‌ت‌و ئه‌و ( رابطة)یه‌ی ئیسلامی زه‌مه‌ریه‌تی، هـه‌روه‌ك ( مـصطفی کمـال ) لـه وتاره‌کـانی هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه‌ی خه‌لافه‌ت دووباره‌ی ده‌کرده‌وه، ئه‌و چینه خه‌ڵکه زۆربه‌ی (دۆنمی) بوون ئه‌و جوانه‌ن له سه‌ده‌ی (۱۸) له ئیسپانیا ده‌رکران‌و له سـالۆنێك داڵـده‌دران له‌لایه‌ن خه‌لافه‌تـه‌وه دوای ئیـسلام بوونیـان، بـه‌ڵام وا ده‌گـوترێ کـه لـه ژێـره‌وه به‌ته‌واوی‌و هه‌موویان ئیـسلام نه‌بوونه، ئه‌وانه وه‌ك مـه‌سیحی ناو عه‌ره‌ب ڕۆڵێکی گرنگیـان هـه‌م بـۆ دامـه‌زرانـدن‌و بڵاوکردنـه‌وه‌ی تـۆرانی پـه‌ت بینـی هـه‌م بـۆ ئینقیلابه‌که‌ی ۱۹۰۸ له‌وانه: مصطفی کمال - که له‌بنه‌چه‌دا سـه‌ر به خێزانێکـی یۆنانی ناوچه‌ی ڕیـسه، حـسین جاهد، جاوید به‌گ، ... له‌بنه‌چه‌دا زۆربه‌ی سـه‌رانی ئه‌و بزووتنه‌وه وه‌ك : ئه‌نوه‌ر پاشا، طلعت پاشا، جمال پاشـا، تکینـی ئـه‌لب، زیـا ئه‌لب کۆك، .. ڕه‌چه‌ڵه‌ك‌و ڕه‌وتیان لێڵ بوو، تورك نه‌بوون، ... گومانه‌که لێـره‌وه درووست ده‌بێ که ئه‌وانه تورك نه‌بووینه‌و هاتوون تیۆری سیاسی ناسۆنالیزمی یان بۆ تورك دارشتووه‌و باسی چه‌وساوه‌یی تورکیان کردووه له هاوکێشه‌ی عوسمـانلی، تا ڕاده‌یه‌ك ئه‌گه‌ر واشـبێت هۆیه‌که‌ی ده‌گه‌ڕێته‌وه بـۆ ئـه‌و وه‌سـفه‌ی (تـورك -بـێ ئیـدارك )[1]، تـورك زۆر خـه‌ڵکی بـه‌توانای ئیـداری‌و فکریـان نـه‌بوو هه‌رچـه‌نده جه‌نگاوه‌ری ئـازاش بوونـه، ئـیتر زۆربـه‌ی پایـه سـه‌رکییه‌کانی نـاو خه‌لافـه‌ت خه‌ڵکانێك بوونه له عه‌ره‌ب‌و کورد‌و چه‌رکه‌س‌و ئـه‌لبان‌و ...، بۆیـه بزووتنـه‌وه‌ی (تۆرانیه‌ت) بناغه‌یه‌کی تری ته‌واو جیای دارشـتموه بـۆ ئـه‌و سیـسته‌مه‌و بـانگی سه‌روه‌ری باب‌و باپیران‌و ڕه‌چه‌ڵه‌ك‌و ئه‌و خاکه فراوانه‌ی جیهانی تورکی کـرد ئـه‌ك جیهانی ئیسلامی، داوایه‌کی هاوشـێوه‌ی ئازاپایـه‌تی کـرا، لـه ڕاسـتی دا دیـسان گه‌ڕانه‌وه سه‌ر فاکته‌ره شاقوڵی یه ڕه‌چه‌ڵه‌کی یـه‌کان کـه لـه‌مزه‌مانی یۆنـای کـۆن دابه‌شی یه ڕه‌چه‌ڵه‌کی یه‌کانی کۆمه‌ڵایه‌تی به (ته‌نه‌که، ئاسن، زیو، زێـڕ) دابـه‌ش کرابوو، له‌لایه‌نی ئیـسلام به‌یه‌کجاری‌و به واقیعی تێکه‌ر پێـك شـکێنراو هه‌ریه‌کـه

[1] بروانه (ساطع حصري – محاظرات في نشوء القومية)

لە (بیلالی حەبەشی، سوهەیبی ڕۆمی، سەلمانی فارسی، گابانی کوردی...) شان بەشانی عەرەب سەرکردەی ئەو کۆمەڵگەیە بووینە، بیلال حەبەشی بە حیسابی یۆنانی (مادەی تەنەکە بووە لە ئاژەڵ نزیك بووە نەك مرۆڤی تەواو) ... هەموو ئەو جیاوازیانە هاتنەوە ناو میللەتی ئیسلام، هاو شێوەی ڕۆژئاوا کە نازییەتو فاشییەتو زانکۆی جرمانی، زانکۆی ئەمریکا، ئەنگلوسکونی، فرانکۆفۆنی ئێستاو زانکۆی عەرەبی ... تۆرانییەتیش بە خەست تر لەوانە هاتە مەیدان .. هەر بەو هۆیەشەوە دەستیان بە پاکتاوی ڕەگەزی کرد، ئەو گورزەی لە ئەرمەن وەشێنرا هەر لە دەستی تۆرانییەکان بوون چ لەنێو ناوەندەکانی خەلافەت چ لە دوای ١٩٠٨و دەسەڵات وەرگرتنیان، هەر ئەوانیش دەسەڵاتدار بوون زیاتر خەلافەتی عوسمانلی ئەوکاتی بە (پیاوە نەخۆشەکە) ناوبانگی ڕۆیشتبوو، بەرەبەرە گوتاری سیاسیو مێژوویی و کەلتووریو فەرهەنگیان گۆڕی هەتا پیتی نووسینیش، تا لەکۆتایی نووسینەکانی (تیکین ئەلب)یان کردە پەیڕەو، ئەو نووسەرە بەهێزە (٥) بەرگی لەبارەی ڕەچەڵەکی تورکو ڕەوشتو خانەدانیو نیشتیمانی تورکو جەنگەکانو پیاوەتییەکانی نووسی بەناوی (تۆران)، تیایدا جۆرە گوتارێکی داڕشتەوە زۆربەی ڕووداوە مێژووییەکانیان سەر لە نوێوە نووسییەوە بە ڕوانگەیەکی نەتەوەگەری نائیسلامی، لە سەرەتای سەدەی بیستەم ئەو بیرە بڵاوبۆوە وەك: جوان تورکو تورك ملیکشیو ئیتیحاد الترقیو تورك ئۆجاغی..و ئینقیلابەکەی ١٩٠٨ی لەسەر دروست بوو، ئەوان دەسەڵاتیان گرتە دەست لە ساڵی ١٩٢٠ سوڵتان خەلافەتی بەجێهێشت، تا لە ١٩٢٤/٣/٣ بە یەکجاری خەلافەتی ئیسلامی (عوسمانلی) هەڵوەشێنرایەوەو کۆماری تورکیای عەلمانی لەجێی داڕشترا لەسەر دەستی (مصطفی کمال)، لەگەڵ داڕمانی خەلافەتو سەرکەوتنی بیری تۆرانییەت مەینەتی کوردیشی لەگەڵ دروست بوو، بەڵام لە کۆتاییدا ئەو بیرە هەم تەواو سەرکەوتوو نەبوو هەم زیانێکی کوشندەشی لە ئیسلامو میللەتانی ئیسلامیو هەتا میللەتی تورکیش دا، ئەگەر بەو تەرازووە

نەتەوەگەرییانەش هەڵپەسەنگێنین دەبینین ئەو عوسمانلییەی دەسەڵاتی لە ئەورووپاو ئاسیاو ئەفریقیا هەبوو بچووك بۆوە بۆ خاکێکی بچوکی تورکیا بە پێی مادەی (١٠)ی چارنامەی ویلسونو مەرجە کوشندەکانی لۆزان دروست بوو، لەیادی ساڵانەی سەربەخۆی تورکیای ئێستا پێویستە لەجیاتی ئاهەنگ شین بگێڕن، هەروا بەدوای مەرجەکانی یەکێتی ئەورووپیەوە پێی ناگا، ڕۆڵێکی وای نەك لە جیهان لە ناوچەکەشی وەك پارێزگایەکی بەرژەوەندی ئەمەریکی کار دەکات..

بزووتنەوەی تۆرانییەت لەگەڵ ئاوەزووەکانی (مصطفى كمال) تەواو نەهاتەوە بۆیە ئامانجەکانی نەهاتە دی، بەڵام وەك بیرێکی نەتەوەیی لە تورکیا باوی هەبووە، ئەو دوایەی هەندێ حزبی تورکیاو (بەرەی تورکمانی عێراقی) کە داوای یەکگرتنەوەی جیهانی تورك دەکەن هەمان داواو مانای تۆرانییە، .. هەر ئەو بیرە درێژکراوەیەتی ئێستا زمانی کوردیان قەدەغە کردووە، لە دوا هەڵبژاردنی ئەو جۆرە ڕێکخستنو بەو ڕێبازانەی تۆرانییەت تەواو شکستیان هێنا، ئێستا سەر لە نوێ ئیسلامییەکان لەو هەڵبژاردنەی (٢٠٠٢) بە ڕەهای دەرچوون لە پەرلەمانو حکومەتو ئاسۆیەکی پێچەوانەی نوێیان بینا کردووە، بەڵام دەسەڵاتی تەواویان بەرامبەر سوپا نی یە، لە بەرامبەردا بزوتنەوەی تۆرانی نەتەوەگەریو عەلمانی تورکی بە گشتی دیەنێکی ناشیرینی هەیە، چونکە بە ئاشکرا خۆی داوەتە دەست سوپاوەك پارێزەری بنەماکانی عەلمانیەت ئەگینا قەڵۆش بووە.

(١٢)

# هەڵوەشاندنەوەی سۆڤیەت          تفكك إتحاد السوڤياتي
# USSR break up

ڕۆژی ١٩٩١/١٢/٣١ بە یادی هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەتو دارمانی مەدرەسەی شیوعیەت دەناسرێ، ڕووداوێکی سیاسیو کۆمەڵایەتی و فەلسەفیو شارستانیو ستراتیژی مەزن بوو، ڕەوتی مێژوویی بەتەواوی گۆڕی .

## سەرەتاو کۆتا

هەرچەندە شۆڕشی شیوعی لەسەر دەستی (لینین) لە ١٩١٧ مانگی ئۆکتۆبەر لە ڕوسیا کرا کە بە شۆڕشی ئۆکتۆبەریش ناو دەبرێ، بەڵام درووست بوونی یەکێتی سۆڤیەت لە ١٩٢٢/١٢/٣٠ بووە، خاکەکەی ٦ملیون میل دوجا (سۆفیەتی جاران ٢٢ ملیون کم[٢]) ولە ١٦٪ ی جیهانە، پێکهاتبوو لە ١٢٠ نەتەوەو ١٤ کۆمار: (ڕوسیا، ئۆکرانیە، کازاخستان، ئۆزباکستان، ڕوسیای سپی، جۆرجیا، لتوانیە، ئازەربێجان، مالدڤیە، تاجکستان، لاتڤیا، ئەرمینیا، تورکمانستان، ئستونیە، قیرغیزستان) لەگەڵ هەندێ هەرێمی خود موختاریش بەناوی (یەکێتی کۆمارەکانی سۆڤیەتی سۆشیالیستی- إتحاد جمهوريات الإشتراكيه السوفيتيه)، ناوی نەتەوەیی بە ڕوسی (سویز سۆڤێتك سوسیالیستی سیکخ ریبدبیك)، لە بنەچەدا (سۆڤیەت) وشەیەکی ڕووسی یە بە مانای (ئەنجومەن) یان (شورا)، یەکەمجار لە ڕاپەڕینە کرێکاری یەکانی ١٩٠٥ درووست بوو کە ( لینین) ناوی بردن بە پرۆڤەی شیوعی یەت، دوای لە شۆڕشی ئۆکتۆبەر ١٩١٧ ئەو (سۆڤیەتە) دروست بوو کاتێ کرێکارانو جوتیارانو سەربازانیش ئەو

ئەنجومەنەیان پێك دەهێنا بۆ هەڵبژاردنی نوێنەریان و دوای بوو سیستەمی بنچینەیی دەوڵەت، **سەرۆکەکانی سۆڤێتی بریتی بوون لە :**

( لینین: ١٩١٧ – ١٩٢٤)، (ستالین: ١٩٢٤ - ١٩٥٣)، (خرۆتچۆف: ١٩٥٣ – ١٩٦٤)، (برێجنێف: ١٩٦٤ – ١٩٨٢)، (ئەندرۆپۆف : ١٩٨٢ – ١٩٨٤)، (تشارنیکۆ: ١٩٨٤ – ١٩٨٥)، (گۆرباتچۆف : ١٩٨٥ ١٩٩١) دوا سەرۆك بوو.

یەکێتی سۆڤیەت بەهۆی ئەو ئایدۆلۆژی یە شیوعی یەتە توانی بینایەکی مەزن لەناوەخۆ درووست بکا بگاتە ئاستێکی وا ڕۆژئاوای وێلە هێنابۆوە، بەتایبەت دوای جەنگی جیهانی دووەم ڕۆڵی زیاتر دەستی پێکرد، وەك ڕزگارکەری جیهان لەدەست نازی ناوی دەرکرد، لەگەڵ ڕۆژئاوا هەردەم لە جەنگی ناڕاستەوخۆ و جەنگی ڕاگەیاندنی فکری و سیاسی و فەلسەفی و شارستانی بووە کە بە ( جەنگی سارد ) ناوبراوە، هەتا دوای حەفتاکانیش هەر لەزیاد بوون دا بووە، دوای ئەوە هەندێ قەیرانی زانستی و سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و دەروونی وای بۆ پەیدا بوو کە کاری زیاتر لەژێرخانی ئەو یەکێتی یە کرد، بە سیستەم و مەدرەسەی شیوعی یەت چارەسەر نەدەبوو هەروەك لە نامەکەی (أ.خمینی بۆ گۆرباتچۆفیش وا هاتبوو )، بۆیە ویستی لە ڕێی قووت دانی جیهانی بەهۆی هێزی سەربازی یەوە چارەسەری یەکانی دەست کەوێ کە بە (بنەمای برێجنێڤ) ناوزەد دەکرا، ئیتر سوپای سۆڤیەتی و کوبی و ئەڵمانی وەك ئامادە گاردی کۆماری جیهانی بە ئاشکرا دەچوونە پاڵ کێشەکانی ئاسیا و کەمبۆدیا و لاوس سەردەکەوتن و ئەمەریکا بە ترسناکی شکستی هێنا و لە گۆڕەپانی جیهان کشایەوە، لە ئەفریقیاش لە دوای سەربەخۆی ئەنگۆلا لە نێوان ( بەرەی میللی بە سەرۆکایەتی ئوگستینۆ نیتۆی شیوعی سەر بە سۆڤیەت و بەرەیەکی ماوی پێکهاتبوو لە بەرەی نیشتیمانی و یەکێتی نیشتیمانی بەسەرۆکایەتی جوزیف سافیمبی لەوپەڕی ناکۆکی دابوون، هێزەکانی ڕوسی و کوبی و ئەڵمانی بەهانای بەرەی میللی هاتن و ئەنگۆلایان کردە سەنگەرێکی تری شیوعی بۆ ئەفریقیا،

پەلاماری تۆگادینی زانستی درا دوای ئەسپریار سۆشیالیزم ... لە هەموو پرۆسە سەربازی یەکان زەق تر هاتنیان بۆ ناو ئەفغانستان بوو لە ساڵی ١٩٧٩، لەدوای ململانێیە خوێناوی یەکەی نێوان دوو باڵی حزبی شیوعی ئەفغانستان (پەرچەم)و(خەلق) ئەوە بوو (حفیظ الله آمین) زاڵ بوو بەسەر( نور محمد تراقی )و کوژرا، سوپای سۆڤیەتی ڕاستەوخۆ لە فڕۆکەخانە دابەزینو یەکسەر (حفیظ الله آمین) کوژراو (بابراك کارمل) یان کردە سەرۆك، بەو شێوە ویستیان هەموو جیهان قووت بدەن .. دیارە ئەو یاسایەی (قانون دورة الحضارات) کە لە قورئانی پیرۆزیش بەڕوونی باسی کراوە، زانایانیش هەر لە (ئەرستۆ) هەتا (إبن خلدون)و (توینبی) باسیان کردووەو (ناپلیۆن) لێی کوشیوەو لە یاسایەك دەقەکەی دەڵێ: شارستانی یەکان بە پارووی گەورە مردوون، ئیتر یەکێتی سۆڤیەتیش بەو پاروە گەورە هاتە مردن هەروەك ئەڵمانیاو بریتانیا لەپێش ئەو وا ئەمەریکاش خەریکی هەمان پاروە .

## هۆیەکانی کەوتنی :

خورد کردنەوەی هۆیەکانی کەوتنی سۆڤیەت گەلێ درێژخایەنە هەر دەتوانین بەشە سەرەکی یەکانیان لێ هەڵبژێرین، بەشێکی لە ژێرەوە کاری کردووە وەك لە سەروو باس کرا هەندێ قەیرانی بەردەوامیش هەر هەبوو لە ئابووریو سیاسیو کۆمەلایەتیو نەژادی ... هەندێکیشیان ڕاستەوخۆبوون بەو شێوەیە :

١- **فاکتەری زانستی** : ئیمپراتۆری یەتی سۆڤیەتی بنچینەکەی ئایدۆلۆژی بوو .. هەتا ئایدۆلۆژی یەکەی سەلامەت بوو زۆر گەشەی کرد لەناوەوەو دەرەوە، دوای ئەوە زانستو دۆزینەوە نوێکانی گەردوونیو کیمیای و فیزیاییو بایۆلۆجیو بە ڕووکاری ئامادیو ئاینی ( یان وەك خۆیان گۆتەنی بەرەو میسالی) بە

پێچەوانەی بناغە فەلسەفییەكانی ئەو ئایدۆلۆژیایە هاتەوە[1] ژێر خانەكانی شكاندو بەرەو قەیرانی ترسناك رۆیشت .

٢- ئابووری: ئەو هەموو بودجەو پێویستی یە مادی یەی بۆ بەرێوەبردنی ململانێ لەگەڵ رۆژئاوایەكی خاوەن تەكنۆلۆجیاو سەرمایەداو ئابووری یەكی زەبەلاح، هەردەم بارێكی قورسی ئابووری كەوتبووە سەر شانی، تێچووەكانی گەلێ زیاتر بوو لە داهاتەكانی، سەرەرای جۆری بەرنامەی ئابووری‌و فەلسەفەی مولكی یەت‌و خراپی تەرزەكانی بەهۆی شیوعی یەت لە بەرهەمدا.

٣- سیاسی: چەند رووداوێك لە جیهان هاتە پێش لەوانە:

أ- بزووتنەوەی سەندیكا كرێكارەكانی ولاتانی سۆسیالیستی ئەوروپای رۆژهەلات لەدوای سالانی ١٩٨٠ سەریان هەلدا بەتایبەتی لە پۆلەندا بە سەرۆكایەتی (لیخ ڤاونسا)، ئەوانە نەك تەنیا داوای چاكسازیان كردبێ لەو ولاتانەی خۆیان بەلكو داوای نەمانی شیوعییەتیان دەكرد، ئەو حالە زۆر كاریگەر بوو چونكە بە حیسابی فەلسەفەی ماركسیزم چینی كریكار (پرۆلیتاریا) شیوعی یەت دێنێتە دی كەچی ئەو بزووتنەوەی كرێكاران دروست بوو یەكەم داوای سرینەوەی شیوعییەت بوو نەك سەرمایەداری كە پێچەوانەی هەموو بنەماكانی شیوعییەت‌و فكری ماركسی بوو .. ماكینەی فیكری شیوعییەت كەوتە سەرسوڕمانێكی ئالۆز تا ئەو سەندیكایە لە پۆلندا لە ١٩٩٠/١٢/٩ بۆ یەكەم جار لەمێژی هەڵبژاردن دەرچوون حزبی شیوعی لە بەرامبەریان مەزنترین شكستی هێنا.

ب- شۆرشی ئیسلامی لە ئێران: شۆرشێكی سەرتاپایی بوو بە هەموو مانا پێچەوانەكانی (باسای شۆرش لە شیوعییەتدا)، مەزنترین شۆرش لەدژی بەهێزترین قەلای سەرمایەداری لەسەر دەستی مەدرەسەیەك (ئایینی) كە

[1] بۆ زیاتر بروانە بەشی زانستی لەو فەرهەنگە.

(مارکس) بە (أفیون الشعوب)ی وەسف کردبوو، گوایە سستترین فاکتەر ئایینەو لێرەدا بەکارترین فاکتەر دەرچوو، بووە داینەمۆیەکی بەهێزی گۆڕانی جیهانیش زۆر بەکارتر لە شیوعییەت، جێگەشی بە شیوعیەت لەق کرد.

**جـ- شۆڕشی ئیسلامی لە ئەفغانستان:** لەدژی داگیرکەری سۆڤیەتی، بۆ یەکەم جار سوپای بەهێزی سۆڤیەتی دوچاری شکستێکی وا بێتەوە، دیمەنێکی ناشیرینی بۆ جیهانو بۆ ناوەخۆش دروست کرد .

**د- ڕووخانی دیواری (بەرلین)یش:** کە لە ١٩٦١/٨/١٦ دروست کرابوو لە ساڵی ١٩٨٩ میللەت ڕووخاندیان، ئەو دیوارەوا دروست کرابوو کە خەڵکی لە ئەڵمانیای (ئەزموون سۆشیالیستیو شیوعی) ڕای دەکردو ئەو دیوارە ڕێگری بوو، ئیتر بە ڕووخانی ئەو دیوارە دیمەنی شیوعییەتو بلۆکی سۆڤیەتی شەرمەزارو ناشیرین کرد ...

**٤- فاکتەرێکی زۆر دەگمەنو یەکلاکەرەوە:** لە ماوەی سێ ساڵ لە ١٩٨٢ هەتا ١٩٨٥ سێ سەرۆك مردن ( چونکە لە سیستەمو حوکمی سۆڤیەت سەرۆك نەدەگۆڕا مەگەر بردبایە)، هەریەکە لە (بریجنێف، ئەندرۆبۆڤ، تشارنیکۆ) بەوماوە کورتە مردن، ئیتر ڕێ خۆش بوو کە (گۆرباتچۆڤ) بگاتە ترۆکی دەسەڵات بەخۆیو ئەو بیروبۆچوونەی (بیرۆسترۆیکاو گلازنۆست -واتە الانفتاح والاصلاح وأعادة البناء)،ویستی سەر قەپاغی ئەو مەنجەڵە هەڵچووە هەڵگری پێش ئەوەی بتەقێتەوە، ئەوە پاساوی ئەو چاکسازییانەی گۆرباتچۆڤ بوو کە لە ژێرخانی یەکێتی سۆڤیەتیو پەیوەندییەکانی ئەنجام دەدا، ڕەوتی ئەو چاکسازییە بەرەبەرە کۆنترۆڵو ناوەندییەتی دەسەڵاتی لەدەست دەداو میللەتانو کۆمارەکانی سۆڤیەتیش بەرەبەرە سەریان ڕاست کردەوە، گەورەترین کاریگەریش یاخود دوا چەکوچی مەرگ ئەو ئینقیلابەکەی حزبی شیوعی بوو لە ١٩٩١/٨/١٩ دژی گۆرباتچۆڤ کردیانو سەرکەوتوو بوون، گۆرباتچۆڤیان خانەنشین کرد بەناوی (بێتەندروستی)و دوور خرایەوە بۆ دوورگەی (قەرم)، لێرەدا

ده‌وری (بۆریس یالتسین) بۆ ڕۆژی دووه‌م ده‌رکه‌وت که ئه‌و کاتی سه‌رۆکی کۆماری ڕوسیا بوو (له‌ چوارچێوه‌ی یه‌کێتی سۆڤیه‌ت)، له‌ دژی ئینقیلاب ڕاپه‌ڕیو خۆپیشاندان‌و مانگرتن له‌ناو (مۆسکۆ) ده‌وروبه‌ری‌و ناڕه‌زایی کۆماره‌کانی تر دوای (٣) ڕۆژ ئینقلابچی به‌ شیوعی یه‌کان پاشه‌کشه‌یان کرد، گۆرباتچۆڤیان هێناوه‌ ده‌سه‌لات، به‌لام وه‌ك دوا خه‌لیفه‌ی عوسمانلی تاسا به‌بێ ده‌سه‌لاتی و به‌ پیاوه‌ نه‌خۆشه‌که‌ مایه‌وه‌، زیاتر کۆنترۆل‌و ناوه‌ندیاتی له‌ده‌ست چوو، کۆماره‌کانیش داوای سه‌ربه‌خۆییان به‌ ئاشکراتر کردو حزبه‌ شیوعی یه‌کانی کۆماره‌کانیان دوورخسته‌وه‌، دوا ده‌ستی پۆلاین له‌ یه‌کێتی سۆڤیه‌ت‌و گۆرباتچۆڤ وه‌شێنرا ئه‌و کۆبوونه‌وه‌ی نێوان (بۆریس یا لتسین -سه‌رۆکی ڕوسیا، لیۆنید کراتشۆك-سه‌رۆکی ئۆکرانی، شوسکیچ -ڕوسیای سپی) له‌ ١٩٩١/١٢/٨به‌سترا‌و کۆتاییان به‌ یه‌کێتی سۆڤیه‌تی هێنار هه‌لیان وه‌شانده‌وه‌ به‌ ڕه‌سمی له‌ ١٩٩١/١٢/٣١ له‌ ته‌مه‌نی (٦٩) سال‌و یه‌ك ڕۆژ .

له‌دوایدا کاری کوشنده‌ی کرده‌ سه‌رجه‌م فکری شیوعی و له‌ چالاکی که‌موت، هه‌رچه‌ند پاشاوه‌ی شیوعی یه‌کان ته‌نزیرێك ده‌که‌ن ده‌لێن ئه‌وه‌ پرۆڤه‌یه‌ك بوو مادام سه‌رمایه‌داری مابێت ئه‌وا شیوعی یه‌ت هه‌ر به‌دوای دێت، به‌لام ئه‌و ته‌نزیره‌ی (پرۆڤه‌)ش لاوازه‌ چونکه‌ کاتی خۆی (لینین) ناوی له‌ شۆڕش‌و ته‌قه‌لاکانی ١٩٠٥و ١٩٠٧ ی ڕووسی نابوو (پرۆڤه‌) .

# جەنگ‌و کێشە جیهانییەکان

ئەو چەمکانەن پەیوەستە پێی لەهەمان کاتدا پەیوەستە بە بیری سیاسی‌و باویشی هەیە لەو سەردەمە .

● هەڵبەتە ئەو جیهانە هەروا بەردەوامە لە جەنگ‌و کێشەو زۆرداری قووتدانی بچووك لەلایەن گەورەو بێ هێز لەلایەن بەهێز ... بەڵام هەمووی بەناو ئەدرێسی نوێی‌وەك: پێشکەوتوویی، ڕزگاری، دیموکراسی، دادگەری، قەڵاچۆکردنی تیرۆر، دژ بەیاسا، جیاوازی خوازی، ...

هەڵبژاردنی کۆمەڵێك لەو جەنگ‌و کێشەجیهانیانە زیاتر ماناو زانیاری خوێنەر لەبارەی ئەو چەمك‌و زاراوانە پتەو دەکا سەبارەت بە: ناسنامەی مەدرەسەکان، لایەنی تیۆری‌و واقیعەکەی، هەروەها ئەو دەزگا جیهانیان، ڕەوتی جیهان، ... هێزی بەرگری، مەبەستەکانی شاراوە، ... زۆر لایەنی تر ڕوونی دەکاتەوە.

● باسێکی ئەو جەنگە نزیك‌و دوورانە گەلێ جار خوێنەر بەئاگا دەهێنێتەوە لەو بەنج کردنەی دووچاری دەبێ لە ئەنجامی رووتێکردنی ڕاگەیاندنەکان بە ئاراستەیەکی ناهەق، وەك ئەوەی دەگۆترێ‌و ناوە ناوە لەناکاو گەلاڵەی وا دێتە ئاراوە گوایە زۆربەی کێشەو جەنگەکان لەناو جیهانی ئیسلامی‌و وڵاتە هەژارەکانە، گوایە ئەوەش بەرەنجامێکی سروشتی ئەو سایکۆلۆجی کەلتووری توندو تیژیەی کە لە ڕێنماییەکانی پەروەردەی ئیسلامی دروستی دەکا بۆی، ئەوەش لەکۆتایی دا دەخرێتە چوارچێوەی ئەو ململانێ شارستانی و بنەمای (مانەوە بۆ چاکترین شارستانی– البقاء للحضارة الأصلح) ماناو قووڵایی‌و کۆمەڵە

ئامانجێکی ترسناك دەبێتەوە، بەنەفامیەوە کۆمەڵێك نووسەری دەسەڵاتداران بێ تێگەیشتن لەو قوڵاییە بە خێرایی هەمان بەند دەبێژنەوە، ... لەکاتێکدا لەمێژووی کۆن و نوێ دەبینین، تەواو پێچەوانەیە، جەنگەکانی ئەوروپا زۆربەی ناویشی جەنگی سەد ساڵە یان سی ساڵە ...، لەسەردەمی نوێشدا هەر لەهەردوو جەنگی جیهانی و جەنگی سارد و گەرمی نێوان یەکێتی سۆڤیەت و ئەمەریکا، ڤێتنام و کەمبۆدیا ولاوس لەگەڵ ئەمەریکا، ڤێتنام و کەمبۆدیا خۆیەخۆ، ڤێتنام لەگەڵ چین، هەردوو کۆریا، جەنگەکانی ئەنگۆلا موزەمبیق، ڕواندا، بۆرندی .. زۆری تری خۆیەخۆو لەگەڵ یەکتر و هەمووی لەگەڵ ئیمپریالیزمی جیهانی، جەنگی فۆکلاندی نێوان بەریتانیاو ئەرجەنتین، کرواتیاو سربیا، ... گەلێ لە جەنگ و کێشەی تریش ... بەڵگەی زەقی پێچەوانەی ئەو بۆچوون و گەلاڵەن، هەڵبەتە لە نێو جیهانی ئیسلامی و وڵاتە دواکەوتووەکانیش ئەو کێشەو جەنگانە هەیەو هەبووە، بەڵام هۆیەکەی (ئیسلام) نیە چونکە زۆربەی دەسەڵاتدارانی جیهانی ئیسلامی سەر بەیەکێ لە مەدرەسەکانی ڕۆژهەڵاتی یان ڕۆژئاوایی بووە، ڕاستە تا ڕادەیەکی چاك دەسەڵاتی دیموکراسی جەنگ و کێشەی کپ دەکاتەوە، بەڵام هێشتا زۆربەی کێشەکانی ئێستای جیهانیش لەدەرەوەی وڵاتانی ئیسلامیە، ئەگەرچی وڵاتانی ئیسلامیش بەهۆی ئەو مەدرەسان پاکانەیان بۆ ناکرێ، لەوانە: ئێرلەنداو بەریتانیا، باسك وئیسپانیا، کورسیکاو فەرەنسا، زۆربەی وڵاتانی ئەمەریکای خواروو، زۆربەی وڵاتانی ئەفریقیاش، لە ئاسیاش سریلانکاو تامیل، کێشەکانی ناوەخۆی هند، جگە لە کشمیر وەك هندۆس و سیقی، لە چین کێشەی تبتیەکان، زۆری تر، ....

لەناو وڵاتانی ئیسلامیش ئەو کێشانەی سەری هەڵداوە لە دوای دارمانی خەلافەتی ئیسلامی پەیدا بووە، وەك کێشەی کورد لەگەڵ هەر چوار داگیرکەری، مەغریب و بیابانی ڕۆژئاوا، ئەفغانستان خۆیەخۆ لەگەڵ داگیرکەرەکانی، جەزائیر، سوودان، بەشێکی تر میللەتانی ئیسلامە داگیرکراوە لەلایەنی تر وەك چیچان و

ڕوسیا، کشمیرو هیند، خوارووی لوبنانو ئیسرائیل، فەڵەستینو ئیسرائیل، کۆسۆڤاو سربیا، بۆسنەو سربیا، مۆرۆو فلیپین، ..دەتوانین بڵێین ئێستا هەر ڕۆژئاوایە هێزەکانی جەنگی بە جیهان پەرت کردووە بە دەگمەن وولاتێکی ئیسلامی هێزی لە دەرەوەی سنوری خۆی هەبێ.

- باسکردنی چەند دانەیەك لەو کێشانە کە هەم کاریگەری لەسەر ڕەوتی فەرهەنگەکە هەیە هەم لەسەرواقیعی ئێستای جیهانی (هەڵبەتە زۆر بە کورتیو پەستراوی) لە چوارچێوەی پێناسیکی سەرەتایی بۆیان، تا خوێنەر زیاتر ئاسنامە جیاجیاکانی ئەو چەمکو زاراوانەی لەو پێکهاتە ئالۆزەو هۆر ئەنجامو ئامانجو لایەنەکانو ڕەوتو فاکتەرەکانی لەو کێشانە بدۆزێتەوە، بەهەمان شێوەش بو ئەو کێشانەیوا تازە سەر هەڵدەدەن ...هتد.
- لە کێشەی ئیستیمانیو نەتەوەییەکان کە لەدوای جەنگەکان دێتەوا تێبینی دەکری زۆربەی ئەو میللەتانەی کێشەیان هەیە لەگەڵ نەتەوەیەکی سەردەستی داگیرکەر، ئەوا میللەتە ژێردەستەکە ڕەسەنترە نەك هەر لە نەتەوە سەردەستەکە بەڵکو لە هەموو نەتەوەکانی ناوچەکەش، وەك کورد لە هەموو میللەتانی ناوچەکە ڕەسەنترە لەسەر خاکی خۆی، باسك لە ئیسپانیاو لە هەموو ئەورووپییەکان کۆنترە لەوێ، بەربەر لە هەموو عەرەبو ئەفریقیەکان کۆن ترە،.. بەو شێوەش دانیشتوانی ڕەسەنی هەردوو ئەمەریکاو ئوستورالیا، تگریەکان لە ئەثیوبیا- هەرچەندە ئەثیوبیاش شارستانیەکی کۆنی هەیە لە ئەفریقیا بەڵام سەرەتاکەی لە مەملەکەتی ئەکسۆسیت دەست پێدەکا (٥٠٠ ساڵ پ.ز) لە ناوچەکانی تیگری-، ئینجا مۆرۆ لە فیلیپین، تامیل لە سریلانکا، ئێرلەندی غیلی زمانیەکان لە ئینگلیزەکان، فەڵەستینیە عەرەبەکان لە ئیسرائیلیەکان، ڕۆمی (غەجەر) لە وڵاتانی ئەورووپی، ...هتد.

## (١)

## جەنگــی جیهانی یەکـــەم الحرب العالمية الأولــى

جاران بەو پێوەرە جیهانیەتی جەنگ دەپێورا، کە زۆربــەی وڵاتــە گرنگــەکانی جیهان بەشدار بوونایە، بەڵام بە سەرنجێکی خێرا بەپێی سـەردەمو ئاسـتی جیهـان گەلێ جار بەو پێوەرە جەنگی جیهانی ڕوویداوە ... بۆیە ئەو پێوەرە زۆرورد نیـە، نهێنیو فاکتەرێکی تر هەیە کە جەنگی پێ بووەو دەبێتە جیهانی ئەویش ئەوەیـە جیهان لە سـەدەکانی (١٧– ١٨) بەرەو (جیهانگیری - عەولەمە - جیهانایـەتی) دەڕوا ... یان بەراشکاوانە تـر بڵێیـــن ئـیتر لێـرە بـەولاوە هـەر جـەنگێك بێـت جیهانیە مادام جیهان بووبێتە دێـیەکی بچووك، ئیتر تەنها دوو جـەنگی جیهـانی ڕووی نەداوە، جـەنگی عێـراقو ئێـران، کوێـت، کۆسـۆڤا، ... ئەوانـە هـەمووی جەنگی جیهانی چوارەمو حەوتەمو دەیەمە،... . بەڵام بەپێی ئەو ڕیزکردنە باوانـە ئێمەش لەسـەری دەڕۆین:

جەنگی جیهانی یەکەم: لە سـالی ١٩١٤دا دەستی پێکـرد لـە سـالی ١٩١٨ کۆتـایی پـێ هـات، ئـەو عەقلیەتیـەی ئیمپراتۆریـەتیو پـەلامارو زاڵیەتییـە فراوانەکەی جاران جێـی نـەدەبۆوە لـە سـنووری وڵاتێکـی نەتـەوەیی دەمـارگیر، بەتایبەت تەکنۆلۆجیای سـەربازیش ڕوو لە گەشە بوو، ئەو بارودۆخە هەڵـچوویەوە چووە ناو سەرمایداری جیهان ... ئیتر چەندین ئەوەرەی خۆویـستیو بەرژەوەنـدی لە کاکڵەی لیبـراڵیزمێکی بێ بیـرو بڕوا یەکی دەگرتـەوەو سـەرەنجام ناوەنـدێکی دژوارو نائارامی لە ئەوروپا دروست کردبوو کە پێکهات بوو لەچەند بەرەیەکی دژ بەیەك، ئەڵمانیا زۆر پەرەی سەند لەولایەش بەریتانیاو فەرەنسا لـە دژی ئـەڵمانیا بوون ئیتـر وای لێهات ئەڵمانیاو مەجەرو نەمسـاو بولگاریـا بوونـە بەرەیـەك بـە ناوی وڵاتانی تەوەر، بەریتانیاو فەرەنـساو ئیتالیـاو بـەلجیکیا کەوتنـە بەرەیـەك بەناوی هاوپەیمانان، لەدواییدا عوسمانیش کەوتـە بـەرەی ئـەوەرو ئـەمریکاش بـۆ

بەرەی هاوپەیمانان، بە پێی (world book encyclopedia) بەریتانی چوار هۆی سەرەکی هەیە بۆ ئەو جەنگە:

١- سەرهەڵدانی نەتەوە گەرایەتی.

٢- زیاد بوونی هێزی جەنگ.

٣- ململانێو ناکۆکی لەسەر وڵاتانی داگیرکراو.

٤- هاوپەیمانیە سەربازیەکان.

بەڵام لە هەمووش گرنگتر ئەوەیە لایەنی شەڕی مرۆڤە کە دەسەڵاتی بوو، لە ژێر گەشەی تەکنۆلۆجیای جیهانی-وەك ئێستاش- کە بەرەو ترسناکی دەڕوا (ئاسایش) زامن نابێ مادام سەرچاوەکانی هێز لەدەست کەسانێك بن (لایەنی دەروونی زاڵ بێت بەسەر لایەنی ئەخلاقی)، فاکتەرێکی بەرز هەبوو لەو جەنگە بۆی ئەچووینە ئەویش ئەوە بوو، هەریەکە ویستوویەتی بە فاکتەرە زاڵەکەی خۆی کۆنترۆلی عەولەمەیەك[1] بکا کە لەو سەردەمی هەر ناویشی لێنەنرابوو ...

ئیتر زۆر هۆی تر هەبووە ئەوانە ناویان نراوە هۆیە ناڕاستەوخۆیەکان، هەرچی هۆی ڕاستەوخۆشە بەهۆی تیرۆرکردنی (جێنشینی پادشای نەمسا) (ئەرشیدۆك فرانسیس فردیناندو هاوسەری) لە ٢٨/ یۆنیۆ / ١٩١٤ بەدەستی (پرانسیب)ی قوتابیەکی سربی لە ڕێکخراوی تیرۆریستی (کف الاسود) بوو، بەهۆی داگیرکردنی بۆسنیاوە، لەدوای ئەو ڕووداوە نەمسا مۆلەتی (٤٨) سەعاتی بۆ صربیا دیاری کرد تا ئەو بکوژانە تەسلیم بکا، یەکسەر شەڕی نەمساو صربیای لێ هەڵگیرسا، هەریەکە لە فەرەنسا، بەریتانیا، ڕوسیا (قەیسەر)، لای صربیان گرت، ناویان (هاوپەیمانان بوو)، ئەڵمانیاو مەجەریش لای نەمسایان گرت بە (هێزی ناوەند یان تەوەر) ناو دەبران، عوسمانیش لەسەردەستی ئیتحادیەکان خزانە نێو ئەو جەنگە لە قازانجی ئەڵمانیا، بێ ڕەزامەندی خەلیفە، دوای زۆربەی وڵاتانی جیهان کەوتنە نێو ئەو جەنگە، بۆ یەکەم جار لەو جەنگە فڕۆکەی شەڕکەرو چەکی تۆماتیکیو

[1] بۆ زیاتر تێگەیشتن بڕوانە ( چەمکی عەولەمە) لەو فەرهەنگە.

غەواسە بەکار هات کە زۆربەی لەلای بەریتانیاوە بەکاردەهات، لە سالّی ١٩١٥ش ئەلّمانیا گازی ژەهراوی بەکارهێنا، دوایی هاوپەرمانانیش بەکاریان هێنا، لە سەرەتادا ئەلّمانیا سەرکەوتنی بەدەست هێنا، دوایی ئەمەریکاش لە سالّی ١٩١٧ لە قازانجی هاوپەیمانان هاتە ناو جەنگ، تا سالّی ١٩١٨ (بەرەی ناوەند) شکا کۆتایی هات بە کۆمەلّێك رێکەوتن، بە پێی ئامارەکان (١٠) ملیۆن مرۆڤ کوژران، بایی ٣٣٧ ملیۆن دۆلار زیانی ئابووری بوو، کارێکی زۆری سەلبیو ئیجابی کردە سەر جیهان، گۆرانێکی زۆریش روویدا، یەکێ لە سەرەنجامەکانی داروخانی عوسمانی بوو، لەدوایش دروست بوونی مەینەتی کورد.

بۆ زیاتر بروانە:

١- الحرب العالمية الأولى ٢- الموسوعة العالمية .

(٢)

## جەنگی جیهانی دووەم          الحرب العالمیة الثانیة

ئەو جەنگە لە ساڵی ١٩٣٩ هەڵگیرسا لە ساڵی ١٩٤٥ کۆتایی هات، زیانی گەلێ زیاترو فراوانتر بوو، بەشێکی زۆری درێژکراوەی هۆیەکانی جەنگی جیهانی یەکەم بووە، ئەوجارە (ئەدۆلف هتلەر) بەخۆی بە ئایدۆلۆژیایەکی نەتەوەگەری سۆشیالیستیو تەکنۆلۆژیای سەربازی تۆکمە کردبوو بۆ تۆڵە سەندنەوەی سەروەریەکانی ئەڵمانیاو جەنگی جیهانی یەکەمو هەتا هەڵمەتەکانی ناپلیۆنیش تادەگاتە ڕووداوەکانی جانەی سی ساڵەکەش، کە ڕێکەوتنی ویستیفالیای ساڵی ١٦٤٨ی لێ هاتە ئاراوە، .. ململانێ لەسەر زاڵیەتی جیهانیو ناحەزیەکانی لەگەڵ (هاوپەیمانان)یش هەر بەردەوام بوو، ئەوەی گۆڕا بوو ڕووسیا لە قەیسەریەوە وەرگەڕا بۆ شیوعیەتو ئەو سەردەمی (ستالین) سەرۆك بوو، بەرەکانی جیهانی بەو شێوە دابەش ببوو: ئەڵمانیاو ئیتاڵیاو یابانو دوایش ئەلبانیاو بولگاریاو تایلاندو ڕۆمانیاو فنلەنداو مەجەریش هاتنە ئەو بەرەی بە ناوی (وڵاتانی تەوەر - دول المحور)، ئەو وڵاتە گرنگانەی تریش هەموو لەلایەك بوون یان هەڵسوکەوتی نازی هیتلەری وای لێکردن بچنە بەرەی (هاوپەیمانان) کە ژمارەیان (٥٠) وڵات بوو، لە سەرەتادا ئەڵمانیا سەرکەوتنی مەزنی بەدەست هێنا پاریسو مۆسکۆش گیرا، لە ساڵی ١٩٤١ ئەمەریکاش هاتە مەیدان تا ساڵی ١٩٤٣ بەرەبەرە ئەڵمانیا شکستی هێنا، جەنگی یەکلاکەرەوە لە ڕووسیا دروست بوو، سوپای سووری ڕووسی بەخۆی ئەو عەقیدە مارکسیە توندو تۆڵە ئەڵمانیای شکاند، لە ٧/ مایۆ / ١٩٤٥ تەواو شکستی هێنا، بە پێی هەندێ ڕیوایەت دواشەو هتلەر (ئیڤای) خۆشەویستی گواستەوە، سوپای ڕووسی گەیشتنە ناو بەرلین، هەواڵی جیاجیا لەسەر چارەنووسی هتلەرو ئیڤا هەبوو گوایە خۆیان کوشتبێ، ژمارەی کوشتار بەپێی هەندێ ئامار گەیشتە (١٧) ملیۆن سەرباز جگە لە هاوڵاتیان.

## ( ٣ )

## جەنگی عێراق – ئێران          الحرب العراقية الإيرانية

لە پێش چوونە ناو ئەو جەنگە چەند لایەنێكی هۆكاری ئەو جەنگە هەیە بەبێ ئەوانە ناتوانین روو بچین لەگەڵی: -

١- حزبی بەعس لە عێراق لە ساڵی ١٩٦٨ از دەسەڵاتی گرتە دەست، حزبێكە لە ریزی فاشی و نازی بوو، ئایدۆلۆژیایەكی ئاڵۆزی ترسناكی هەبوو، بە شیتەڵ كردنی ئەو ئایدۆلۆژیایە دەردەكەوێ سەرچاوەكانی لە كۆیە، پێكهاتبوو لە: شۆڤینیەتی نەتەوەگەری (وەك لایەنی كۆمەڵایەتی) + رێبازی میكاڤیلی وەك (لایەنی سیاسی) + دیكتاتۆری و تاكڕەوی وەك (لایەنی دەسەڵاتی ئیداری) + سۆشیالیستی نیشتیمانی وەك (لایەنی عەقیدەیی) = حزبی بەعس .

وەك تێبینی دەكرێ دۆخە هەرە سلبی مەدرەسەكانیان وەرگرتووەو تێكەڵیان كردووە ئەو رێبازەی لێ دروست كرابوو لەلایەن (میشیل عەفلەق، شبلی عیسمی، الیاس فرح..) ئەوانەش لە عەلمانیە كاریگەریەكانن، بەتایبەتی ئەو (سۆشیالیستی نیشتیمانیەو شۆڤینی نەتەوەگەریەكە ..) هەمان تۆخمی بنچینەی ئایدۆلۆژیای فاشی و نازی بوو، جا ئەو حزبە بەو تونديەی جلەوی عێراقی گرتبووە دەست .

## پێكهاتەی عێراق :

وەك ئاشكرایە عێراق لەئەنجامی دابەشی سایكس بیكۆ ١٩١٦ ئەو قەوارەی وەرگرت، ئەگینا نەكوردستان و نە (وادي الرافيدين) نەفرات الاوسط و نەویلایەتی بەسرەو نەناوچەكانی (مدن المقدسة) سەر بە عێراق نەبوونە، عێراق ویلایەتێكیش نەبوو، كەوتبووە نێوان كووفەو بەسرە، ئیتر ئەو قەوارە بۆ

مەبەستی ئیمپریالیزمی دروست کرا، .. بۆیە ناهاوسەنگیو تایفەیەکی خەستی ببوە بنچینە، لە ٥٣٪ شیعە، ٢٢٪کورد، ٥٪کەمایەتی، ٢٠٪سوننە، حزبی بەعسو سەرکردایەتیەکەی بەو ڕەوتەی لە نێوان ئەو (٢٠٪)یە پێکهاتبوون ... بەلام تا پێش شۆڕشی ئیسلامی ئێرانی ١٩٧٩ نەخشەیەکی تری کۆمەلایەتی زاڵ بوو، ئەویش ٢٢٪ کورد، ٧٨٪ عەرەب، ئەو نەخشەیە لەگەڵ دروست بوونی عێراق لە سالی ١٩٢١و ڕابوونی نەتەوەیی بەردەوام بوو، ئەو نەخشەیەو دیکتاتۆریو تاکڕەویو شۆڤینیەتی حزبی بەعس قورساییو ستەمی نەتەوەییەکی زۆر لێکەوتبووە سەر کورد، بۆیە کورد لە شۆڕشو تەقەلایەکی مانو نەماندا بوو، تا لە ڕێکەوتنی جەزائیر ١٩٧٥ (صدام حسین) بەشێکی زۆری لە خاکو ئاوی (شط العرب)یدا بەشای ئێران بەرامبەر پیلانێکی فراوانی نێو دەولی جەرگ بڕ لە دژی شۆڕشی ئەیلولو شکستی پێ هێنا، کورد یەکجاری کەوتە مەینەتییەکی بێوێنە، لە خوارووش شیعەکان لە ناوەندە گرنگەکانی عێراق بێبەش بوون، لە مێژووی ئەو عێراقە نە شیعەیەك (کە زۆرایەتیشن) نە کوردێکیش سەرۆك نەبووینە، کەواتە ئەو بارودۆخە زۆر ناسكو لەرزۆکە لە تێزە بۆ هەر وروژانێك، .. لێرەدا شۆڕشی ئیسلامی ئێرانی دەستی پێکردو سەرکەوت دەبێ چەندە کاریگەر بێت لەسەر ئەو عێراقەوە بەو دۆخەی .

- شۆڕشی ئیسلامی لە ئێران لە ١٩٧٨ دەستی پێکرد بەو سۆزو هەلچوونە ئیسلامیەی ڕابەرەکەشی لە نەجەف بوو، بە فەرمانی حزبی بەعسی دەرکرا، لەوێ بۆ فەرەنساو دوایی لە گەرمەی شۆڕش گەڕایەوە ناو ئێرانو شۆڕشەکەیان سەرکەوت لە ١٩٧٩ ... هەر لەگەڵ سەرکەوتنی ئەو شۆڕشە جیهانی هەژاندو بەخەبەری هێنانەوە، لەهەموان زیاتر کاری لەسەر عێراق کرد، شۆڕشی کوردستان بە تەوژمتر هەلگیرسابۆوە، نزیکەی (٣) بەشی عەرەبی عێراق هەستو نەستێکی نوێی بۆ دروست بوو، نەخشەی ئینتیمایەکانی گۆڕی، بەو شێوە هەم سیستەمی سیاسی عێراقو، هەم

سیستەمی کۆمەڵایەتی عێراقی کەوتە مەترسی، لەگەڵ چەندین هێزی ناوەکی ترو ئیقلیمیو دەولی، (صدام حسین) خۆی بۆ ئەو جەنگە ئامادە کرد، لەسەرەتادا( أحمد حسن البکر)ی لێ خستو خۆی جێی گرتەوە، کۆمەڵێك سەرکردەی حزبی بەعسیشی لە سێدارەدا، بە دەست لەپشتدانی رۆژهەڵاتو رۆژئاواو زۆربەی رژێمە دژ بە میللەتانی ناوچەکە بەپێی هەندێ سەرچاوەی بێلایەنی ئەمەریکی ئەوا (ئەمەریکاو سعودیە) زیاترین هاندەرو سازدانی ئەو جەنگە بوونە، یەکەم هەنگاو بە هەڵوەشاندنەوەی رێکەوتنەکەی جەزائیری ١٩٧٥ لە رۆژی ١٩٨٠/٩/١٧ دەستی پێکرد، دوای چەند رۆژێك (صدام حسین) جاری جەنگی لەگەڵ ئێراندا، دیسان ئەو (رێسایە) هاتەدی کە دەڵێن تا کێشەی کورد چارەسەر نەبێ نە عێراقو نە ناوچەکە ئارامی بەخۆوە نابینێو جەنگی عێراق ئێرانو دوایش کوێت هەر درێژکراوە جەنگی عێراق لەگەڵ کوردستان دروست بوون .

## قادسیەی صدام:

ئەو ناوە ئەدرێتی هێرشەکەی عێراق بوو لە ١٩٨٠/٩/٢٢ بۆ سەر ئێران لەناکاو، لەکاتێکا سەرکردایەتی نوێی ئێرانی سەرقاڵی رێکخستنەوەی دامودەزگای دەوڵەتی ئێران بوون، کەمتر ئامادە بوو بۆ ئەو جەنگە، لە سەرەتادا عێراق لاسایی هێرشەکەی ئیسرائیلی بۆ سەر عەرەب کردەوەو هەڵسا بە فڕۆکە بۆردومانی زۆربەی فڕۆکەخانەکانی بەشی رۆژئاوای ئێرانی کردو هێرشی زەمینیش دەست پێ کرد، رووبەرێکی فراوانی زەوی داگیر کرد یەکسان بوو بە (٢ هێندەی رووبەری لوبنان) وەك (عدنان خیرالله) لەوکاتە رایگەیاند، لەوکاتەوە عێراق وای ئەنجامی ئەو جەنگەی دەخوێندەوە کە چەند رۆژێك بخایەنێو بەسەرکەوتوویی بگەڕێتەوە ناو عێراقو چاوی نەیارانی پێ بشکێنێ، .. بەڵام رەتکردنەوەی ئێران بۆ هەموو دەست پێشخەریەکی عێراقیو جیهانی هەموو

نەخشە سیاسیو سەربازیەکانی عێراقی هەڵوەشاندەوە، لەسەرەتادا هاوسەنگی هێزی نێوان هەردوو لا بەو شێوەیە لەلایەن چاودێرە ستراتیژیەکان دیاری کرا:

لە زەمینی عێراق بەهێزتر بوو، لە ئاسمانی کەمێك ئێران، لە دەریایی ئێران زۆر بەهێزتر بوو، داوا سیاسیەکانی عێراق لە شێوەی مەرج بوو، بریتی بوو لە گێڕانەوەی ئەو ناوو خاکەی دراببوو شاه لە ڕێکەتنی جەزائیر ١٩٧٥، هەندێ داوای تریشی هەبوو لەوانە: گێڕانەوەی (طنب الکبری) (طنب الصغری)و (جزیرة أبو موسی) بۆ (شانشینی عەرەبی یەکگرتوو).

ئەو جەنگە بە (٣) قۆناغی سەرەکی تێپەڕی، یەکەم هێرشو سەرکەوتنەکانی عێراقو بەردەوامی تا ساڵی ١٩٨٢، قۆناغی دووەم هێرشە پێچەوانەو کوشندەکانی ئێران بوو توانی سوپای عێراقی لەناو هەموو خاکی ئێران دەربپەڕێنێو چارەنووسی ڕژێمی عێراق لەو پەڕی ترسناکی دابوو، بەڵام هەموو جیهان ئەوجارە بەڕاستەخۆتر بەهانای عێراق هاتن، بەتایبەتیوڵاتانی کەنداو (ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو) یان ڕاگەیاند لە ٦ / ٢ /١٩٨١ کە پێکهاتبوو لە (ئیمارات، بەحرەین، سعودیە، قەتەر، عەمان، کوێت)، ئینجا (٣) فڕۆکەی ئۆفاکسی سیخوری باڵای ئەمەریکی هاتە سعودیە بۆ سەرپەرشتیو ڕێنماییو چاودێری ئەو جەنگە، شارەزایانی جەنگی فەرەنسیو ڕووسیو زۆر وڵاتانی تر هاتن بۆ نەخشەی نوێو داڕشتنەوەی سوپای عێراقی کە تێکەو پێك شکابوو، لەگەڵ زۆر ئیجرای ئیقلیمیو جیهانیو ناوەکی لەوانە ڕێککەوتنی ئێران (ی.ن.ك)و حکومەتی عێراق بۆ دانووسان لەو ساتە ناسکەدا، بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دژ بە ئێران .. هەموو ئەوانەو چەندین فاکتەری ستراتیژی تری نهێنی عێراق توانی بەو واقیعە نوێیەی سەربازی هاوسەنگیو وەستانێك بەو جەنگە بدا کە بریتیە لە قۆناغی سێیەمی جەنگەکە، لە ساڵی ١٩٨٤ەوە تاکۆتایی جەنگ، ئەو جارە دیسان خەریك بوو عێراق وەك جاری دووەم تێك بروخێ، بەڵام سوپای ئەمەریکی بە ڕاستەوخۆ هاتە کەنداو کەوتە جەنگ لەگەڵ ئێران، ئەو ڕۆژەی کە

عێراق (فاو)ی گرتەوە لە سەرانسەری کەنداو جەنگی نێوان ئەمەریکاو هاوپەیمانانی بوو لەگەڵ ئێران، ... تا لە رۆژی ١٩٨٨/٨/٨ ئێران بەناچاری قایل بوو بە بریارەکانی وەستانی جەنگ کە لە لایەن (UN) راگەیەنرابوو شەری (٨) ساڵەش کۆتایی هات.

لەو جەنگەدا هەریەکە لە (UN)و دەزگا جیهانی ئەکان هەتا راگەیاندنیش زیاتر دەرکەوتن کە هەروا هێزە بریار دروست دەکات نەك هەق، ساناترین پرسیاریان پێ وەڵام نەدەدراوە ئاخۆ کام لا لە ئێرانی یان عێراقی دەست درێژکارن، هەرچەندە ئەو جەنگە لەبەر چاوی ئەو جیهانە روویدا، تەنانەت یەکجار وەزیری دەردوەی ئەڵمانیا دانی پیا هێنا کە عێراق دەست درێژکارە بەڵام بەخێرا یی لێی پەشیمان بۆوە، ئەوە لەکاتێکا بوو هەتا ئەگەر کەسێك بێ ئاگا بووبێ لەو جیهانەو لەسەر ئەستێرەیەکی تر بهاتبایە سەرنجێکی ئەو جەنگەی بدابوایە ئەوا چەند نیشانەیەکی زەقی پێوە دیار بوو کە کامیلێ دەست درێژکارن، لەوانە :

١- ناوی ئەو جەنگە لەلایەن عێراقەوە ناو نرابوو ( قادسیە صدام ) لەلای ئێران ئەو جەنگە ناوی نەبوو، تەنها ناوی هێرشەکانی هەبوو .

٢- لەسەرەتادا عێراق بوو مەرجو داخوازی هەبوو، لەوانە: ناوی کەنداو، سیف سعد، زین القوس، طنب الکبری والصغری .... .

٣- لەسەردتادا عێراق سەرکەوتوو بوو ئێران هێزی لە سنوور نەبووە.

٤- لە رەوتی جەنگەکە عێراق وازی لە مەرجەکانی هێناو هەر ئێران بوو مەرجی هەبوو .

٥- لە هەمووی گرنگتر هەر ئێران بوو داوای لێژنەیەکی جیهانی دەکرد کە بێن دەست نیشانی دەست درێژکار بکەن، عێراق یەك جاریش ئەو داوایەی نەکرد یان پێی قایل بێت ..

٦- دوای بەردەوامی جەنگەكە عێراق لە تەقەلایەكی بێوچان بوو بۆ گۆڕینی مێژووی هەڵگیرسانی جەنگ لە (٩/٢٢ بۆ ٩/٥).

ئیتر هەر عێراق بوو لە بەرامبەر مێژووی جەنگو زەمانو زەمینی دەست پێكردنی دەستكاری واقیعێكی دەكرد لە پێش چاوان، زۆربەی وڵاتانی كەنداو بەتایبەتی (كوێت) بە ڕەش‌و سپیەوە، بە خراپ‌و چاكەوە .. هەر لای عێراقی دەگرت‌و .. ئەو فەرموودەش پڕ بەو وەڵامەی عێراقە بۆ كوێت ﴿مَن أعان ظالما سلّطه الله عليه ...﴾ (هەرچی یارمەتی زاڵم بدات خوای گەورە وەبەر زوڵمی ئەویشی دەخا).

ئەو جەنگە كۆتایی هات بەڵام عێراق كەوتە ژێر بارێكی قورسی قەرزو پابەندی نەخشە سیاسیەكان، لەگەڵ سروشتی شەڕانگێزی ڕژێمی عێراق بازی پێدا بۆ جەنگێكی تری كەنداوو داگیركردنی كوێت كەدۆست‌و پشتیوانی جەنگی پێشووی بوو.

## ( ٤ )

# جەنگی عێراق - کوێت

یان ڕاست تر بڵێین داگیر کردنی کوێت لەلایەن عێراق چونکە کوێت بەرگریەکی وای سەرپای زەبەلاحی عێراقی پێنەکرا هەتا بەئەندازەی هێزو بەرگری پێشمەرگەی کوردستانیش .

## بارودۆخی جیهانی و ناوچەکە :

کۆمەڵێك بارودۆخی نوێ هاتە پێش لە جیهان و ناوچەکە، سەرکردایەتی عێراق(صدام حسین) هەستی بە گرنگیەکەی نەکرد، لە هەموان گرنگتر کەم بوونەوەی ڕۆڵی بوو بەرامبەر قەڵای ڕابوونی ئیسلامی (بەوەسفی ڕۆژئاوا)، لەلایەن ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوەو وڵاتانی عەرەبی و کەنداو بە پشتیوانی هەواڵگیریەکانی ئەمەریکاو ئیسرائیل توانیان ئەو شەپۆلەی بەناوی (تصدیر الثورة ) ی ئێران ڕابگرن، ئیتر (صدام حسین) ئەو نازەی پێشتری لەلای وڵاتانی عەرەب و هەموو بەرەی دژ بە ڕابوونی ئیسلامی لێ بووە تەفرەو لەخۆبایی لە قەبلاندنی بارو دۆخی جیهانی و ناوچەکە، گەلێ جار یاخی دەبوو لەو بەرەیە، بەتایبەتی لە ژێر ڕۆشنایی ئەو گۆڕانکاریە ترسناکەی لە هاوسەنگیەکانی جیهان ڕوویداو جەمسەری یەکێتی سۆڤیەت بەرەو هەڵوەشانەوە بوو، ڕۆڵی تاکجەمسەری و زاڵیەتی ئەمەریکی سەری هەڵدا ..

لەئاستی ناوچەکەش تێکنەگەیشتنێکی ترسناك هەبوو لە نێوان عێراق و وڵاتانی عەرەبی بەتایبەتی کەنداو، لەولایە (صدام حسین) بەڕوانگەیەك ئەو ئەنجامانەی جەنگی عێراق و ئێرانی دەخوێندەوە کە هەر ئەوە پارێزگارو پاسەوانی دەرگاو دەروازەکانی ڕۆژهەڵاتی عەرەب و گوایە ئەو نەبوایە شەپۆلی (خمینی) لە

ولاتانی کەنداو نەدەگەڕایەوە،، لەو لایەش ولاتانی کەنداو خۆیان دەیانزانی ئەگەر ئەوان بەهانای عێراق نەهاتبوونایە ئەو هەموو پشتیوانەی ڕۆژئاوا لەرێی ئەوان نەبوایە عێراق لەساڵی ١٩٨٢ تێکو پێك دەشکا .. ئیتر ئەو هۆکارە دەروونیەو چەندین هۆی تر جۆرێك لە ناتەبایی عێراق و بەشێك لە ولاتانی کەنداوی گرتبۆوە.

لەناوەخۆی عێراقیشدا (صدام حسین) زۆر زاڵ ببوو، هەموو کوردستانی لەسەرجەم (٨٠ – ٩٠ کم٢) کۆکردبۆوە، هەموو دێو شارۆچکەکانی کیمیاباران و وێران کرد بوو بێ سزاو نارەزاییەکی جهانی وا، لە خوارووش هاوێنەیەکی سەروو، هەموو ئەوانەو شەرانگێزی سەرکردایەتی عێراق بووە هۆی خولێکی تری جەنگی لەگەڵ کوێتی پارەمەتی دەری لە دژی ئێران و کورد و .. لەگەڵ کوێت پێنج جۆرە ڕێکەوتنی دراوسێی و عەرەبی و جیهانیش هەبوو ..

## کوێت :

کەوتۆتە دامێنی عێراق، ڕوبەرەکەی ١٧٨١٨کم٢، پەرە لە نەوت، جاران ولات و پایتەختەو دانیشتوانی یەك بوو، تا ساڵی ١٩٤٦ زۆر هەژار بوون، مێژووەکی ناوەدانی وای نیە جگە لەچەند بنەماڵەیەکی ڕەوەند، لەکۆنەوە پێش ئیسلام سەر بە ئیمپراتۆریەتی فارسی بوونە، پەیوەندیان لەگەڵ ئینگلیز لەسەدەی (١٧) را دەست پێ دەکا، لەسەردەمی عوسمانی بەشێك بووە لە ویلایەتی بەسرە (ئەوەشە پاساوی داگیکردنەکە بووە) بەلام ئەو کاتی عیراقی سیاسی نەبووە، لە ساڵی ١٩٦١ کوەیت سەربەخۆیان وەرگرتووە، شێوەی دەسەلاتیان (ئەمیریە)، سوپایان لەچەند هەزار پاسەوانێك تێناپەرێ، ئێستا ژمارەی دانیشتوانیان نزیکەی (٢) ملیۆن دەبێ و کرێکارێکی زۆری بیانی و ئاسیایی ئەفریقی خزمەتیان دەکەن، لە ڕاستیدا زۆربەی سەرۆکەکانی عێراقی هەر لابەلا داوای کوێتیان کردووە، هەر لە نووری سەعید، عبدالکریم قاسم،،،، تا صدام حسین، هەرچەندە بەلگەیەکی یاسایی ومێژوویی تەواویش نیە ..

چونکە عێراق خۆشی بەڵگەیەکی مێژووی نیە، لە جەنگی عێراق – ئێران، کوێت زۆر بە توندی پشتیوانی عێراقی کرد، (شێخ عبدالحمید کشك) لەووتارێکی هەینی دا لە ساڵی ۱۹۸۰ ڕایگەیاندووەك پێشبینی.. ئەگەر عێراق لەو جەنگە نارەوایەی دژ بە ئێران سەرکەوێ خۆشترین و نزیکترین سەندەویچ (کوێت)ە .. ئەوە بوو دوای (۸) ساڵ هاتە دی ..

## داگیرکردنی کوێت:

بەیانی ڕۆژی ۱۹۹۰/۸/۲ عێراق بلاوکراوەیەکی جاڕداو جیهانی سەرسام کرد، تیایداوا هاتبوو کە گەلی کوێت ڕاپەڕیوون و تەختی بنەماڵەی (صباح زادە)یان تێك ڕووخاندووە، تا ئێرە بەیانەکەی عێراق بوو، لەلای (کوێت)یش هەموو دامودەزگای ڕاگەیاندنی وەستابوو تەنها یەك ئێزگەی ڕادیۆی لەکار نەکەوتبوو، ئەویش تەنها یەك بانگەوازی بۆ جیهان دووبارە دەکردەوەو هاواری دەکرد کە جیهان بەهانایان بێت بۆ ئەو مەینەتیەی خەڵکی کوێت تێیکەوتووە، لە دوای چەند ساتێك دەرکەوت هێزەکانی عێراق کە ماوەیەك بوو لەسەر سنووری کوێت بەزیادەوە کۆ ببوونەوە هێرشیان کردووەو کوێتیان داگیر کردووە، هەرچەندە عێراق بەردەوام بوو لەسەر ئەو سیناریۆیەی جاڕنامەکەی و (علاء محمد علی) کوێتیەکی کردە سەرۆکی کوێت دوای ماوەیەك ئەو (سەرۆك علاء) خۆیو دەوڵەتی کوێتی گوایە بە یاساییانە هەڵوەشاندەوەو بووە شاری نۆزدەیەمی عێراق، ئیتر کاردانەوەی جیهانیو عەرەبی زۆر بەتوندی دەستی پێ کرد لە هەموو لایەك، خێراترین سزای ئابووریەکە بوو لە ۱۹۹۰/۸/۱٦ بە داسەپاندنی ئابڵوقەی ئابووری کە دەماودەست کاریگەری توندی لەسەر عێراق کرد، چونکە خۆی کۆمەڵێك ئابڵوقەی ناوەکیو ئیقلیمی خستبووە سەرەخۆ، ژێرخانی ئابووری عێراق بریتی بوو لە (۳) تەوەری ئابووری سەرەکی، یەکەمیان: کشتوکاڵ کە بەدەستی خۆی وێرانی کردبوو، دووەم: پیشەسازی لە جەنگەکانی عێراق – ئێرانو

عێراق – كوردستان وێران كرابوو، سێیەم: بازرگانیشی لەگەڵ وڵاتە دراوسێیە سەربەخۆكان بە بازرگانی نەوتیشەوە داخرابوو، تەنها لەگەڵ وڵاتانێك كە سەر بە رۆژئاوا بوون، بۆیە هەر ئابڵۆقەكە جاردرا لەلایەن (UN) یەكسەر سەركەوت بە تۆكمەیی.

چەندین بڕیاری تری لەسەر دەرچوو تا لەكۆتاییدا مۆڵەتی یاسایی نێو دەوڵی درا دوا مۆلەت ١٩٩١/٢/١٥ بە ئەمریكاو هاوپەیمانان كە بە زەبری هێز عێراق لە كوێت دەربەڕێنن تا لە ١٧-١٨ / ٣ /١٩٩١ هاوپەیمانان (٣١ وڵاتی جیهانی) هێرشیان دەست پێكردو عێراق زۆر بە توندی شكستی هێنا، هاوپەیمانان دەیانتوانی شاری بەغداش بگرن، بەڵام جەنگیان ڕاگرت.

## سەرەنجامەكانی ئەو جەنگە:

- لە هەردوو بەشی سەروو و خواروی عێراق میللەت ڕاپەڕین لە (٨٠٪)ی خەڵكی عێراق هەڵسان، بەڵام توانی بەهۆی هێزەكانی گاردی كۆماری كە لە بەرامبەر هێزی بیانی بەكاری نەهێنا بۆ میللەتی خۆی بەكاری هێنا و بە دڕندانە كوژاندنیەوە، بەرەزامەندی ئەمەریكاوە.
- لە دوای كۆمەڵێك بڕیارو دانوستاندا، كوردستان لەژێر كۆنترۆڵی حكومەتی عێراق بە یەكجاری دەرچوو.
- بە هۆی زیاتر لە (٤٠) بڕیاری (UN) عێراقیان خستە زیندانیەكیوا لەكار كەوتبوو، هێڵی (٣٦)و ناوچەی دژە فڕین سەربەخۆی عێراقی شلۆق كردبوو.
- بە پێی ئەو بەلگەنامەیەی (٦٨٧)ی ١٩٩١/٤/٣ لیژنەی پشكنین دروست بوو.
- سزای ئابووریو ئابڵۆقەدانیش هەر بەردەوام بوو.
- كێشەی توندیو نەرمی نێوان لیژنەی پشكنینو عێراق ناوە ناوە هەر بەردەوام بوو و ئەمەریكاش بەردەوام ناوە ناوە لە عێراقی دەدا.

- لە ١٤/ ٨ /١٩٩٨ سەرۆکی ئەمریکی بناغەی یاسای رزگاری عێراقی مۆر کرد.
- لەگەڵ چەندین هەنگاوی ترو ڕووداوی ١١ی سپتێمبر داگیرکردنی عێراقی خێرا کردەوە تا لە ئاداری ٢٠٠٣ سوپای ئەمەریکی و بەریتانی عێراقیان داگیرکرد، بێ ئەوەی بەرگرییەکی وا بکا .. ئەوەش بە جەنگی سێیەمی کەنداو ناسراوە .

** **

ئەوە جەنگە گرنگەکانی نێوان دەوڵەتان بوو، ئێستا کێشەکانی میللەتان لەگەڵ دەوڵەتانی داگیرکەرەکان باس دەکەین.

(٥)

## کێشەی خوارووی سوودان

ئەو ڕێسایە نیوەی ڕاستە کە دەڵێ: کێشەی نەتەوەیی نوێ لەگەڵ سەربەخۆیی نەتەوەی سەردەست دروست دەبێ، هەر لەوەشە ئەو وتە بەنرخەی (نهرۆ)ی هیند لە کتێبی (لمحات في تأريخ العالم)کە دەڵێ: تا دوێنێ ئەوانە (مەبەستی تورك و عەرەبە ..) خۆیان چەوساوەو ژێردەست بوون کەچی ئێستاوا بێ بەزەییانە خەڵکی کورد ژێردەستە دەکەن.

خوارووی سوودان کە زۆربەی مەسیحین یەکێکە لەو کێشانە، سوودان وڵاتێکی کۆنە لە مەعجەمەکانی یاقووت حەمەوی و ئیبن بەتووتەو تابتلیمۆس ئیبن خەلدوون هاتووە، لە ١٩٥٦/١/١ سەربەخۆیی وەرگرتووە، هەر لە ناهەنگی سەربەخۆییدا وەرچەرخا بۆ ئەو کێشەیە، لەکاتێکا عەرەبی سەروو ناهەنگیان بوو خەڵکی خواروو کەوتنە نیگەرانی و ئەو کێشەیە زیاتر زەق بۆوە بەچاکی بەشداری ناهەنگەکەشیان نەکرد، لەوکاتیەوە تاوە تاوە ڕاپەڕیوون، مادام سیستەمی دەسەڵات شاقوڵی و نەتەوەگەری بێت ئەوا ڕاستە لەگەڵ سەربەخۆی نەتەوەی سەردەست ئۆتۆماتیکی لە دەستدانی سەربەخۆی نەتەوەیەکی هاو سنوورەکەیەتی، یان بەگشتی کە سنووری سیاسییەکسان نەبێ بە سنووری جوگرافی نەتەوەییەکەی، بەڵام نابێ ئەو ڕاستیە زەقە ڕاستیەکی شاراوەمان لەبیر بباتەوە ببێتە پاکانە بۆ سیستەمی ئیمپریالیزمی، چونکە لە وەرچەرخانی ئیمپراتۆریەکان بۆ دەوڵەتی هاوچەرخی یاسایی ئەوا سەرجەم داگیرکاریە گشتی و پانو بەرینەکانی ئیمپراتۆریش دەگوازرێتەوە بۆ داگیرکاریەکی خەستو تایبەت تر، هەر بۆیەش لەگەڵ وەرچەرخانی سیستەمی ئیمپراتۆری بۆ سەربەخۆی سوودان ئەو ژێردەستە گشتیەی جاران چڕ بۆوە بۆ سەر خواروو، ئیتر شۆڕش و بەرگری تایبەتیش دروست دەبێ، یەکەم تریشقەی سەرهەڵدانیان بۆ ساڵی ١٩٥٥ دەگەڕێتەوە، گەلێ جار ڕاپەڕیون، دواجار ساڵی١٩٨٣ شۆڕشیان دەستپێکردەوە

بە سەرۆکایەتی ئەفسەرێکی سوپای سوودان (جۆن گەرەنگ) لەدایك بووی ١٩٤٣، بەناوی ( بزووتنەوەی رزگاری خوارووی سوودان ) لە ژێرناوی (سوپای رزگاری گەلی سوودان - spla= Sudan people liberation army ) زۆربەی حکومەتەکانی نەتەوەگەری عەرەبی سوودانی ئەو جوولانەوەیان بە کرێگرتەو جیاوازی خوازو تێکدەر لەقەڵەم داوە، بەلام لەدوای نۆهەتەکان لەسەردەمی حکومەتی (ئینقاز)و کاتێ د.حسن ترابی زیاتر دەسەلاتدار بوو چەند جارێك دەست پێشخەری کرا بۆ ( راپرسی – إستفتاء ) بۆ یەکلا کردنەوەی ئەو کێشەیە، بەلام وا دیار بوو (spla) نیازی زیاتری هەبوو یان پێی سپێردرابوو کە قایل نەبێ، چونکە لەو کاتی هەریەکە لە میسرو ئۆگەنداو ئەریتریاو ئەسیوبیا .. لە دژی سوودان بوون لەگەل بەرەی جیهانی، لەناوەخۆش ئۆپۆزسیۆنی سەروو (حزب الأمة + حزب الأتحاد ... ووردە حزبەکانی تری وەك حزبی شیوعی و ناسری و .. لەگەڵ (سپلا) بەرەیەکیان پێك هێنا لە ژێر رۆشنایی بەرە جیهانیەکەی دژ بە رابوونی ئیسلامی، ئەو جارە داواکاریەکانی (جۆن گەرەنگ) لە سنووری کێشەی خواروو دەرچوو کەوتە چوارچێوەی ئەو بەرەیە، هەموو لایەك چ عەلمانیەکانی بە رەگەز ئیسلام و چ مەسیحیەکانی خواروو پێکەوە داوای سەرەکیان ئەوە بوو: نابێ لە دەولەت جیا بکرێتەوە، لەگەڵ رەوای ئەو کێشانەش لێرە دا ناسنامە راستەقینەکان ناوەلا دەبن و ئەو جۆرە سەرکردانە بە شێکن لە مەینەتی میللەتەکەیان، ...

ئەو کێشەیە بەردەوامە بەو دۆخەی، لەکۆتایی سالی ٢٠٠٣ رێکەوتنێك مۆرکرا لەنێوان حکومەت بەسەرۆکایەتی عمر حسن بەشیر و جۆن گەرەنگ، گەیشتنە ریکەوتنیك بۆ ماوەی ٥ سال، بەشدار بن لە حکومەت وجیگری سەروك کومار لەوان بێ، دوای ریفرونداميك بکەن بو برياری چارەنووس، جون گەرەنگ پایەی جیگری سەروك کوماری وەرگرت و دوای لە فرۆکە کەوتە خوارەوەو مردو جیگرەکەی هاتە جێی .

# ( ٦ )

## كێشـەی فەلەسـتین

لە بابەتی (زایۆنی) بنچینەكانی ئەوبڕوكە باس كرا، تكایە سـەرنجی بـدەوە، هەڵبەتە چاوبڕینی یەهودو ڕۆژئاوا لە فەلەستین كۆنە، جارێكی تر سەلاحەدین ئەو چاوچنۆكییەی بۆ چەندین سەدە دوورخستەوە، ئەوا لەقۆناغی توێدا دیسان بیرۆكەی ( شعب الله المختار) زیندوو كرایەوە زایۆنی لێهاتە دی، ئیتر بەدوای نیشتیمانێك بوون پەیدای بكەن بۆ دارشتنو بانگی ئەو بیرەو بەرجەستە كردنی لە دەولەتێكـدا، لەگەڵ قۆناغی نوێی ئیمپریالیزمیش تێكی دەكردەوە، یەكەم جاری (بارون هـرش) تەقەلای ئەوەبوو وڵاتێك بۆ یەهودیەكانی ڕووسیا لە (ئەرجـەنتین) دروسـت بكـا، ئـەو وڵاتانـە ئـەو كـاتی تـازە دەدۆزرانـەوەو دەكـرانو دەفرۆشـان لـە لایـەن ئیستعمارەكان بەیەكتر، دوای (تیۆدۆر هرتزل) داوای كرد نیشتیمانێك بدۆزرێتـەوە بۆ هەموو یەهودی جیهان نەك تەنها یەهودی ڕووسیا، فەلەسـتینیان دەست نیشان كرد، هرتزلو حاخامی گـەورەیان دووبـارە داوایـان لـە (عبدالحمیـد) كـردەوە تـا سنجاقی (قدس)یان پێ بفرۆشێ .. قایـل نـەبوو ... بـەڵكو (عبدالحمیـد) زیـاتر فەرمانی دەكرد تا زەوی‌و زار لەو ویلایەتی نەفرۆشنە یـەهودیان، عبدالحمیـد لـە بیرەوەریەكانی خۆی دەڵێ ئەوەی زۆر دڵتەنگی كردم لە (ئنقلابی ١٩٠٨) بەسـەرم دا ئەوەبوو ئەو لێژنەیەی هاتە لام بۆ تەبلیغو دەست لەكار كێشانەوەم كـە بینـیم ئەو یەهودیەی تیایە كە چەندجار هاتە لام تا فەلەستینی پێ بفرۆشم !!

یەكەم جا وا پێشنیار كرا كە (ئۆگەندا) یان (كینیا) ئەو نیشتیمانە بێـت، لـە جەنگی (حەتین) وا لە (صلاح الدین) ترسا بوون نەدەوێران ئەو ئەزموونە دووبـارە بكەنەوە، بۆیە جارجار تامی زاری سوڵتانەكانیان وەردەگـرتو داوایـان لێـدەكردن كە بەپارە فلستینیان بفرۆشنێ وەك چۆن ئەمەریكا فلیپینی لە ئیسپانیا بـە (٢٠

ملیۆن) دۆلار کڕی‌و بەریتانیا (کۆرسیکا)ی لە ئیتالیا کڕی، لەو سەردەمی ئەو کڕین‌و فرۆشتنەی ئیشتیمانێکی تەواو باوی هەبوو، (ڕۆچیلد) دەوڵەمەندی بەناوبانگی زایۆنی نوێنەرێکی ناردەوە لای (سوڵتان عبدالحمید) بۆ کڕینی سنجاقی قودس ... بەڵام سەرکەوتوو نەبوو[1]، ئەوەیان بەهیچ شێوەیەك نەکرد، هەر کە خەلافەت لاواز بوو ئەو تەقەلایانە دیسان بە ئاشکراتر ڕوویان سوڕاندەوە بۆ فەلەستین، دوای ئینقلابی ۱۹۰۸ عەلمانیەتی تورکی بەهاریکاری عەلمانیەتی عەرەبی ئەو پرۆژەیە زیندوو بۆوە، ئیتحادیەکان لەگەڵ بەرپرسانی عەرەب لە کێبەرکێ دابوون بۆ فرۆشتنی ویلایەت، لیبیا هەراج کرابوو بەدرو بەلەمی جەنگی بۆ ئیتالیا، ڕووباری فوراتی فرۆشتە ئینگلیز، ..یەکێ لە هۆیەکانی ڕاپەڕینی شێخ عبدالسلام لە کوردستان لە دژی ئیتحادیەکانی تورك ئەو خاك فرۆشتنە بوو، کاتی خۆی بڕی (٥ ملیۆن) لیرەیان بە (عبدالحمید)دا بۆ کڕینی فەلەستین، بەتوندی ڕەتی کردەوە، بەڵام ئیتحادیەکان بە (٤٠٠٠٠٠) لیرەیان فرۆشت، دوایش عەرەب خۆیان بەگەر لەشکری ئینگلیز کەوتن بە سەرۆکایەتی جەنەراڵ لنبی‌و فەلەستینیان لە عوسمانی ستاندەوەو تەسلیمی بەریتانیا کراو، ئەویش بۆ ئیسرائیل ئامادەی کرد، کەچی جێی گاڵتە جارێیە لەلایەن عەرەبە نەتەوەگەریە عەلمانیەکانەوە بەو پرۆسەیەی (شریف بن حسین) دەڵێن: (الثورة العربیة الکبری)!!.

لە پێشدا پەیمانی (سایکس – بیکۆ) ۱۹۱٦دارێژرا تا میللەتانی ئیسلام پارچە پارچە بکرێ‌و توانای یەکبوون‌و یەك بەرگری نەبێ، هەر تێکبگیرێن، تا ڕێ خۆش بێت بۆ پەیمان‌و بەڵێنێکی تر، بەو شێوەیە لە بەڵێنی بەلفۆری ۱۹۱۷ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا (ئەرسەر بلفور) بەڵێن بە یەهودیەکان درا وڵاتێکیان لە فەلەستین بۆ دروست بکەن، دەقی بەڵێنەکە:

---

[1] بۆ زیاتر بڕوانە موسوعة سفیر تأریخ الإسلامي- الدولة العثمانیة- ل٧٢، هەروەها خفایا عهدین- حسام الدین ئەرتوك، هەروەها بڕوانە (العلمانیة والاسلام واثرهما في نشأة الدولة العراقیة الحدیثة).

خۆم بەبەختیار دەزانم لەجیاتی مەی خاوەن شکۆ شای بەریتانیا ئەو ڕوونکردنەوەتان لەبارەی قایل بوونمان لە ئەنجومەنی وەزیران بۆ ئەو بەڵێنانەی بە یەهودیە زایۆنیەکان دابوومان- ﴿حکومەتی خاوەن شکۆ بەچاوی سۆزەوە دەڕوانێتە دروستکردنی وڵاتێك بۆ گەلی یەهود، چی لەتوانای دابێ بۆ ئەو مەبەستە دریغی ناکا، دەبێ لای هەموان ڕوون بێ نابێ لە فەڵەستین پێشێلی مافە مەدەنیو پاسایەکانی خەڵکی تری (نایەهودی) بکرێت﴾ زۆر سوپاستان دەکەم، ئەو ڕوون کردنەوەم بە یەکێتی زایۆنی بگەیەنن – دڵسۆزتان ئەرسەر بلفۆر ٢/تشرینی/١٩١٧.

بەو شێوە لەدوای داڕمانو دابەشکردنی خەلافەتو بە پێی نەخشەی سایکس بیکۆی ١٩١٦ز مەینەتی گەلانی وەك فەڵەستینو کوردو میللەتانی تر دروست بوو، فەلەستین لەدوا قۆناغی لەدەست بەریتانیا بوو بە پێی سیستەمی (ئینتداب)ی کە وڵاتانی وەك: عێراقو سووریاو ئوردنو عەرەبیەکانی تری پێ دروست بوو، ئەو چەکە ئینتیدابیەی کە (عصبة الامم) مۆریان کرد بۆ بەریتانیا لە ٢٤ یۆلیۆ/١٩٢٢ز لە ٢٨ بەند پێك هاتبوو، تیایدا: بەڵێنی بەلفۆری تۆمارکرا بوو، ساناکردنی کۆچی یەهود (جوو)وە وەرگرتنی ناسنامە لە پاڵ عەرەب بۆ یەهودیش، زمانی ئینگلیزیو عەرەبیو عەبری ڕەسمی بێت .. بەرەبەرە بەرنامەکەی بلفۆری تەواوکرد تا لەناکاو لە ١٩٤٨ کشایەوەو فەڵەستینی بە (نەتەوە یەکگرتووەکان) سپارد، لە ١٥/ ٥ /١٩٤٨جاڕی دروست کردنی قەوارەی زایۆنی درا لەسەر بەشێك لە فەڵەستین بەناوی (دەوڵەتی ئیسرائیل) کە لە دەستووریدا بەو پێناسە هاتووە (ناوی دەوڵەت کۆمارێکی سەربەخۆی دیموکراسی ئیسرائیلە)، ئیسرائیل وشەیەکی کەنعانی کۆنە لە دوو وشەی لێکدراو پێك هاتووە (ئیسر=سەرباز، ئیل=خوا) واتە سەربازی خوا (جند الله یان عبد اللەش دێت) ئاماژە بە ناوی ئەو وڵاتە کۆنەیە گوایە مەملەکەتی

(شـــائوول، داوود، ســـولەیمان) بـووە، بـەناوی مەملەکـــەتی ئیسرائیل لــە (١٠٢٠ — ٩٢٠) پ.ز .

زۆر بە خێرایی لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکان دانی پیا هێنرا بـە پێـی بڕیـاری (١٨١) ساڵی ١٩٤٧ لە ١١/ ٣ /١٩٤٩ بە پێی بەڵگەنامەی ژمارە (٢٧٣) بـە ئەندام وەرگیـرا لێی، بە زۆرینەی (٣٧) دەنگ بەرامبەر (١٢) دەنگی دژو (٩)ی بێدەنگ، لەدوای جاردانی ئیسرائیل لە ١٩٤٨ فەڵەستین کـرا (٣) بـەش، قطـاع غزە بۆ میسر، (ضفة الغربية) بۆ ئەردەن لە ١٦/ دیسمبر /١٩٤٩ شوردەنیش بـە ڕەمی بڕیاریدا بەیەکجاری بەشێك بێت لێی، دوای ئیسرائیل لـە ١٩٦٧ داگـیری کردەوە[1]، لە زەمینەیەکی ڕابوونی نەتەوەگەری عەرەب زیاتر پایەکانی ئیـسرائیل پتـەو بـوو، بـەکاری تیرۆرســتانە تاوێـلەو تـاوێکی تـر بــە ڕێکـەوتنی خـۆ بەدەستەوەدانی وەکو ( کامب دیڤیـد، ئوسلو، شـەرم شـێخ، ... ) قۆناغـەکانی بەکارهێنانی زاراوەی دان پیاهێنانی دەسەڵاتدارانی عەرەب بەو شێوەو قۆناغانەدا تێپەڕی: كيان الصهيوني المزعوم، عدو الصهيوني، ما يـسمى بدولـة الإسـرائيل، دول الإسرائيل المحتلـة، ... تا ئەوڕۆ گەیشتنە ئاسـاییو (دەوڵـەتی ئیـسرائیل، ڕا ئێـستا داوایان ئەوەیـە تـەنها ئـەو خاکـەی لـە سـاڵی ١٩٦٧ لـە دەسـتیان داوە وەریگرنەوە بەرامبەر دان هێنان بـە ئیـسرائیل بـەناوی بنـەمای (الأرض مقابـل السلام)، لەدوای ڕابوونی ئیسلامی لە هەشتاکانی سەدەی ڕابـودوو هەریەکـە لـە (حماس، جیهـاد، حـزب الله ...) گـەورەترین هەڕەشـەن لەسـەر ئیـسرائیل، لـە مێـژووی عـەرەب یەکـەم جـارە خاکیـان لەدەسـت ئیـسرائیل ڕزگـار بکـەن بـەن دانوستانو سەودا لەسـەر دەسـتی حـزب الله، بـەهێزو بـازووی خـۆی خـوارووی لوبنـانی ڕزگار کردو ئیـسرائیلی دەرکرد لە ٢٠٠٠ز، (حماس)یش باڵێکی سەربازی بەناوی (عزالدين قسام) دروست کرد، عزالدين قسام ئەو ناوە موجاهدە بـووە لـە (جوبلە)ی سوریا لە دایك بـووە، لـە دژی ئینتـدابو دوای لـە فەڵەسـتینیش لـە

[1] القاموس السياسي، ل٧٥٣ .

١٩٣٥ ڕاپەڕینی ئاشكرا كردو دوای شەهید بوو ...، ئێستا تەواری بـ
عەلمانیەتی دەسەڵاتداری عەرەب لەسەر ڕەوتی سەوداو پێكهاتنن بەهەر جۆرێ
بێت بەهۆی (السلام خیار إستراتیجی الوحید) ... تەنها ئیسلامیەكان بەتەمای
بەرگریو شۆڕشنو لە تواناشیاندا هەیە، لە هەمان كات ئەو ئیسلامیانە خودی
عەلمانیە دەسەڵاتدارە عەرەبەكانو دەسەڵاتی فەڵەستینیش بە توندی بەربەرەكانێ
دەكرێ، تا ئەو ڕادەیە گەلێ جار لەگەڵ ئیسرائیلو ئەمریكا دەكەونە یەك بەرە
لە دژی ئیسلامیەكان.

## ( ٧ )

# كيشه‌ی كورد

دوای لاواز بوونی خه‌لافه‌ت، به‌ نهێنی له‌رێكه‌وتنی سایكس- بیكۆ سازانۆف ١٩١٦ بڕیاری دابه‌شكردنی مه‌مله‌كه‌تی عوسمانی درا، كوردستانێكی نیمچه‌ نازادی خاوه‌ن كۆمه‌ڵێك ده‌سه‌ڵاتو میرنشین كرا به‌ چوار پارچه‌ی سه‌ره‌كی، دوای مۆركردنی لۆزان (١٩٢٣) له‌ جیاتی سیڤه‌ر (١٩٢٠) وه‌ هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه‌ی خه‌لافه‌ت به‌یه‌كجاری له‌ ٣/٣/ ١٩٢٤ له‌ لایه‌ن عه‌لمانیه‌تی نه‌ته‌وه‌یی تورك به‌ سه‌رۆكایه‌تی ئه‌تاتورك، به‌هاریكاری رۆژئاواو شیوعیه‌ت به‌ سه‌رۆكایه‌تی (لینین)، ده‌ستیان به‌سه‌ر سه‌رووی كوردستان داگرت كه‌ قورسایی چه‌ندایه‌تیو چۆنایه‌تیه‌كه‌ی له‌وێ بوو، له‌دوایدا خوارووی كوردستانیش به‌ ده‌ردی سه‌روو چوو به‌هۆی تاكتیكو فیلبازی ئینگلیزو ئه‌و ریفراندومه‌ی ویلایه‌تی موسڵ، كوردیش نه‌یانزانی مانای ستراتیژیه‌كانی سه‌ره‌نجامی ئه‌و داوایه‌یان چیه‌ به‌شێك له‌خۆشیان عیراقیان هه‌ڵبژارد، ئیتر ئه‌و كێشه‌یه‌ش له‌گه‌ڵ دروست بوونو سه‌ربه‌خۆی ئه‌ته‌وه‌ سه‌رده‌سته‌كان به‌زه‌قیو به‌مانای نه‌ته‌وه‌ی دروست بوو، له‌ ئه‌نجامی سێ هه‌نگاوی پێچه‌وانه‌ :

١- دارمانی خه‌لافه‌ت .

٢- په‌یدابوونو هاتنی فكری عه‌لمانیه‌تو نه‌ته‌وه‌یی.

٣- وه‌رچه‌رخانی سیسته‌می ئیمپراتۆریه‌ت بۆ سیسته‌می ده‌وڵه‌تی نه‌ته‌وه‌ییو كورد تیایدا له‌و وه‌رچه‌رخانه‌ به‌جێ ما ..

ناوه‌ندی ئه‌و كێشه‌یه‌ له‌ سه‌رووی كوردستان را ده‌ستی پێ كرد چونكه‌ شۆڕشی نه‌ته‌وه‌یی توركی له‌وێ زووتر ده‌ستی پێكرد، له‌ به‌شی خوارووی شۆڕشی رزگاری وه‌ك سه‌روو نه‌بوو به‌ڵكو عێراقێكیان له‌ نه‌بوونه‌وه‌ دروست كرد، بۆیه‌ مه‌ڵبه‌ندی كێشه‌و ملململانێیه‌كه‌ له‌ سه‌روو بوو، شۆڕشو راپه‌رینه‌كانیش به‌و مانایه‌ یه‌كه‌م

جار لەوێ دەستی پێکرد، جوولانەوەی ڕزگاری نیشتیمانی کوردستانیش هەر لەوێ سەری هەڵدا، باشترین پێناس ئەو جوولانەوەو کێشەی کورد لە دروشمی ڕاپەڕینەکەی (شێخ سەعید) دەدۆزریتەوە: (یان گەڕانەوەی خەلافەت یان کوردستانیش سەربەخۆ بێت) ... ئیتر ماناکانی ڕوونە، واتە لە خەلافەتدا ئەگەر کێشەش هەبووبێ کێشەی نەتەوەیی نەبووە، کێشەی کورد کێشەی هەزاران ساڵ نیە، سەدان ساڵیش نیە بەڵکو وا بۆ یەك سەدە دەچێ، لەگەڵ تەمەنی قەدەغەی ئیسلام‌و قەدەغەکانی جل‌و بەرگ‌و فەرهەنگ‌و زمانی کوردیش کرا، لە چواچێوەی دەستوریش، تا ئێستا هەر بەردەوامە، سەرەڕای ماڵ وێرانی‌و سوتاندن‌و کیمیایی‌و بە عەرەب‌و بە تورك کردن‌و تواندنەوە.. لەکاتێکا کورد لەپێش تورك زیاتر بە (٢٠) سەدە لەو ناوچەیە بووە بە پێی مێژووی مرۆڤایەتی، بە پێی قورئانی پیرۆزیش کورد کۆنترین کەسانێکن لەسەر زەوی خۆیان، هەموو بەڵگەکانی بوونی بە دەوڵەتیشیان هەیە زیاتر لە زۆر میللەتی‌تر، وڵات هەیە سەربەخۆیە (١/٤) دانیشتوانی کوردستان‌و ڕووبەری کوردستانیش پێك ناهێنن، ڕووبەری دەوڵەتی فاتیکان تەنها ٠٫٤٤ کم٢)، زلترین‌و کۆنترین میللەتی جیهانن کە سەربەخۆی نەبێ، ..(بۆ زیاتر سەرنج بدە نەتەوەیی کورد) (پرۆژەکانی ڕزگاری کوردستان - لە بەشی فیکری).

## (٨)

## کێشەی ئێرلەندا

زۆر جار باس لەوە دەکرێ کە دیموکراسی یان کۆمەڵگەی مەدەنی یان بە عەلمانی کردنی دەوڵەت .. چارەسەریە بۆ کێشەی فرە ڕەنگ ونیشتیمانی و نەتەویەکانیش، جار وایە دیموکراسی بە دەرمانی هەموو دەردان ناو براوە هەروەك لە ڕاپۆرتی کۆنگرەی یەکەمو دووەمی (ی.ن.ك) دا هاتووە، هەرچەندە ئەو بۆچوونە هەڵچوانەیە پێش تریش بەهەمان ئەندازەی هەڵچوانە باس لە شیوعیەت کراوە گوایە دەرمانی هەموو دەردانەو تیایدا جیهانێکی بێ کێشەت پێشکەش دەکا ... هتد، ئێستا ئەو کێشانەی پێشوو ئەو کێشەیەش دا لەناو جەرگەو چارگی دیموکراسیە، ئێرلەندا نیشتیمانێکی سەربەخۆیە لە ڕووی جوگرافیش کەوتۆتە سەرووی بەریتانیا و دەریایەك لێکیان جیا دەکاتەوە، ئەو کێشەیەی ئێستا دا بەردەوامە بریتیە لە ئێرلەندای سەروو، (٦) هەرێمەو پایتەختی (بەلفاستە) ڕاستەوخۆ خراوەتە سەر بەریتانیای مەزن وئەوەش کێشەکەیە، هەرچی ئێرلەندای خواروە پایتەختی دبلنە، (٢٦) هەرێمە ئەوسەربەخۆیە ئێستا.

زمانو فەرهەنگو ئاینو نەریتو مێژووەکی تایبەتیو جیایان هەیە، سروودی نیشتیمانی وئاڵایان تەواو جیایە لە گەڵ بریتانیا، بریتانیا ناوی خوایەکی دانیشتوانی ئەو ناوچەیەی ئێستای بریتانیا بووە، دوای لەسەر دراوێك تۆمارکراو دوایش کرا بەهێمای ئیمپراتۆریەتیان، بۆیە ئێرلەندیەکان بەو ناوەش زۆر دلگرانن، ئیرلەندا مانای دورگەی تەم ومیوەی تەڕ، ژمارەی دانیشتوانیان بە پێی ئاماری ١٩٩١ نزیکەی (٤) ملیۆنە، زمانیان غیلیە وبە ئینگلیزیش دەدوێن، هەردوو زمان ڕەسمیە، ئاینی مەسیحیان لە ٤٣١ ز پێ گەیشتووە، ئێستا مەزهەبیان کاتۆلیکە بە ڕیژەی ٩٥٪، لەکاتێکا ئینگلیزەکان مەزهەبیان پرۆتستانە، کێشەی ئێرلەندای مەزن لەگەڵ بەریتانیا بۆ چەندین سەدە

دەگەڕێتەوە، هەردەم بریتانیەکان ویستوویانە ئێرلەندا داگیر بکەن و بە تواوەتییەوە بخرێتە سەر بریتانیا، ئەوانیش هەر لە شۆڕش و بەرگری دا بوونە، لە هەر سەردەمێك بە پێی سیستەمی خۆی ئەو ناکۆکیە هەبوو، لە ئاینی و مەزهەبی و ئیمپراتۆری و ئێستاش وا بە تیژی نەتەوەیی، مەزن ترین ڕاپەڕینەکانیان لەسالی ١٦٤١ ز بوو، (کرومول)ی بریتانی بەتوندی تێکی شکاندن، ... بەردەبەرد وەك نەریتی ئیمپریالیزمی و داگیرکاری پرۆسەی پاکتاوی ڕەگەزی لەسەر شێوەی دروست کردنی کۆمەلگەی ئینگلیزی و هێنانی زیاتریان بۆ ئێرلەنداو دامەزراندنیان لە بەشی سەروو بەردەوام بووە، زۆربەی ناوەندە گرنگەکانی سیاسی و ئابووری و کۆمەلآیەتیەکانیان بەوان دەسپارد، ئیتر بەریتانیەکان لایەنگیری پرۆتستانیەکانی ئێرلەندایان کردووە کە زۆربەی ئینگلیزن لە دژی کاتۆلیکەکان کە زۆربەی ئێرلەندای ڕەسەنن، لە شیَ کردنەوەی دا ماتای کیشەیەکی نەتەوەیی نێوان دوو نەتەوە دەبەخشی، لەسەدەکانی ١٨ و ١٩ ئێرلەندیەکان دووچاری کارەساتێکی سامناك بوو لەسەر شێوەی (جینۆساید)، بەهۆی ژەهراوی بوونی پەتاتە (کە بەرهەمێکی سەرەکی ئێرلەندایە)، لە ملیۆنێك زیاتریان لێ مرد، بەو ئەندازەیەش کۆچیان کرد بۆ دەرەەی ئێرلەندا، ئەو ڕووداوە لە کۆتاییدا لەسەر بریتانیا وەك پیلان حساب کرا، هەرچەندە لەو شێوە بە نەهاتی و گرانی لە هندو چین و ڕووسیاو ئەفریقیا ڕوویان داوە .. بەلآم کارەساتێکی بایۆلۆجی وا جێی گومان بوو .

لەگەڵ ڕابوونی نەتەوەیی و وەرچەرخانی سیستەمی ئیمپراتۆری بۆ دەولەتی نەتەوەیی و بوونی سنووری ڕەمی ئەو کێشەیە بەهەردوو تەوەری ئاینی و نەتەوەیی بەگەرمی سەری هەلدایەوە، بزووتنەوەی بیری نەتەوەیی وەکو جیهان لەدوای سەدەی بیست زیاتر خەملی، حزبە نەتەوەیی خوازەکانیش لەدوای سالی ١٩١٤ دروست بوونە، لە سالی ١٩٢٠ – ١٩٢١ جۆرێك لە سەربەخۆی بە ئێرلەندا درا لەلایەن بەریتانیا، لەهەمان کاتدا یاسایەکی دەرکرد (٦) هەرێمی ئێرلەندای لە

سەروو جیاکردەوە، کە زۆرایەتی یەکەی ئینگلیزن وە مەزهەب پڕۆتستانن، ناویشی نا ئێرلەندای سەروو، ئیرلەندای خوارروو و ئێرلەندیە ڕەسەنەکانی ئەو (٦) هەرێمەش بەو هەنگاوە قایل نەبوون، ئەوەشە کێشەی ئێستای ئیرلەندا، لە ساڵی ١٩٤٩ ئێرلەندای خواروو بەیەکجاری سەربەخۆی خۆی وەرگرت، بەڵام ئێرلەندای سەروو کە لە (١٩٢٠)ەوە لە خواروو جیا کرایەوە، هەر لەسەر بریتانیا مایەوە، بە ئێرلەندای خواروو دەوترێ ئێرلەندای سەربەخۆ (یوبلاشت ناە ئیریانی — بەزمانی غیلی خۆیان)، ئێرلەندیە ڕەسەنە غیلی زمانو مەزهەب کاتۆلیک لە بەرامبەر ئینگلیزەکانی مەزهەب پڕۆتستان بوونە کەمایەتی لە ئێرلەندای سەروو، تا ئێستاش پرۆتستانەکان لە دژی داواکاری یەکانی ئێرلەندە ڕەسەنەکان دەیانەوێ لەسەر بەریتانیا بێننەوەو بەشەکەی تریش دەیانەوێ نیشتیمانەکەیان یەك خەنەوە لەگەڵ ئێرلەندای خواروو لەدوا مەبەستدا، کێشەکە لەسەر شێوەی کشمیر وایە لە دروست بوون پێکهاتن‌و ڕەوت‌و ئامانج دا ..

ئەو کێشەیە شێوازی توندو شۆڕشگێرانەو ناشتیشی بەخۆوە بینیوە، بە هیچ کامیان یەکلای نەکردۆتەوە، بەو شێوەیە حزب‌و دەزگای سیاسی جیاجیا نوێنەرایەتی هەریەکەیان دەکا، سوپای کۆماری ئێرلەندا لە دژی بەریتانیا لە ساڵی ١٩١٩ دروست بووەو کار دەکا، گەلێ جار دانوستانیان بووە لەگەڵ باڵی سیاسیەکەی ( شین ڤین) بەسەرۆکایەتی (ئادەمز)، دوا ڕێکەوتنی سەرتاسەریان لە ساڵی ١٩٩٨ مۆرکردووە، بۆ یەکەم جار لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٣ لە هەڵبژاردنێکی نوێدا (شین ڤین) کورسی لە پەرلەمانی ئێرلەندای سەروو بەدەست هێناوە، ئەو کێشەیە هەر بەردەوامە لەگەڵ خامۆش بوونەوەشی، تا ئێستا بە سیستەمی دیموکراسیش چارەسەر نەکراوە .

## (٩)

# کێشەی کورکسیکا

کێشەی ئەو نیشتیمانو میللەتە لەگەڵ فرنسایە، دوورگەیەکە لە دەریای سپی ناوەڕاست کەوتۆتە نێوان ئیتالیاو فەرەنسا، ژمارەی دانیشتوانیان نزیکەی ملیۆنێکە ئێستا بە فرنسی دەدوێن، بە پێی (موسوعة العالمية) ناپلیۆنیش هەر لەوێ لەدایك بووە، ڕووبەرەکەی (٨٦٨٠کم٢)، پایتەختی (ئاگاسیز)یە، دوو هەرێمی سەرەکی لێیە، لە زۆر کۆنەوە ئاوەدان کراوەتەوە، هەرجارەی ئیمپراتۆرێك داگیری کردووە، لەوانە قرتاجییەکان، ڕۆمان، فراندالییەکان، ... لە دوایدا ئیتالیاش دەستی بەسەر داگرتو لە ساڵی ١٧٦٥ز فرۆشتیە بەریتانیا، دوای (٣١) ساڵو لە (١٧٩٦) ناپلیۆن داگیری کرد، لەوکاتیەوە لە ژێر دەستی فەرەنسایە، هەرچەندە جارجار دەستی بەسەر داگیراوە لەلایەن بەریتانیەکان، ئیتالیەکان، ئەڵمانیا، ... بەڵام دوایی دەگەڕایەوە ژێر دەستی فرنسا، لە حەفتاکانی سەدەی بیستەم زیاتر دەنگی ڕزگاری لە دژی فەرەنسا بەرزکرایەوە، لە ساڵی ١٩٧٢ پەرلەمانی فەرەنسا قایل بوو پەرلەمانو ئیدارەیەکی سەربەخۆی کورسیکی دروست بکرێ، بەڵام ئەو هەنگاوەشی تەواو هیواو ئامانجی گەلی کورسیکی نەهێناوەتە دی، زیاتر مەیلی ڕزگار بوونو بە دەوڵەتیان هەیە، بۆیە لە ساڵی (٢٠٠١) دیسان دەنگی ناڕەزایی بەرامبەر فەرەنسا بەرز بۆوەو هەرەشەی پەنابردنە بەر خەباتی چەکداری کرا بەتایبەتی ناوچەکانیان شاخاویو دارستانە .. تا ئێستا ئەو کێشەیە لە ڕیزی کێشەکانی بزووتنەوەی ڕزگاری نیشتیمانی جیهانیە .

## (١٠)

# کێشــەی باســک

کێشەیەکی جیهانی نەتەوەییە لەگەڵ ئیسپانیا، هەرچەندە باسك بەشکراوە لــە نێوان فەرەنساو ئیسپانیا بەڵام بەهۆی ڕەوتی دیکتاتۆریو ڕەگەزیانەی ئیسپانیای پێشوو لەویّ ئەو سۆزو ئینتیمایەیان وروژاپەوە، ئەو بەشەی باسکی لە ئیسپانیایە ڕووبەری نیشتیمانەکەیان (٢٠٧٥٢ کــم٢)، ژمــارە دانیــشتوانیان (٢,٥) ملیــون دەبێت بە تێکڕایی، زمانو ڕەسەنیان تەواو جیایە لەگەڵ ئیسپانیا خەڵکی باســك بە (بەسکارا) ی دەدوێن، بەپێی هەندێ سەرچاوە باسك (بەشك) کۆنترین میللەتن لە ئەورووپا، واتە ئەوانە لە ئیسپانیەکانو فەرەنسیەکان ڕەســەن تــرن، هــەر بــەو بۆنەیەوە زۆربەی ئەو میللەتانەی ئێستا دووچاری وەها کێشەیەك بوونــە ڕەســەن ترن لە زۆربەی میللەتانی دەوروبەریان وەك (کــورد، عــەرەبی فەلەســتین، باســك، ئێرلەندیەکان، بەربەرەکان، ... هتد ) .

ئەو کێشەیە زیاتر لــە ئیــسپانیا ڕیــشەی گرتــووە نــەك فەرەنــسا، لەوکاتــەی دەســەڵاتی (فرانکۆ) دەستی بەچاکــسازی نەتــەوەیی کــردو دیکتاتۆریانــە هــەموو مافــو زمانو تایبەتەندیەکانی باسکی قەدەغە کرد، (فرانکــۆ) ســەرۆکی حزبــی ڤالانژیز بوو کە حزبێکی فاشی لەسەر ترازی فاشی ئیتاڵی بوو ا، هەرچــەندە ئــەو حزبە دامەزرێنەرەکەی ( ئۆنتۆنیۆ ڕیڤێرا)کوڕی دیکتاتۆر (پریمۆدی ڕیڤۆرا )بوو لــە ســاڵی ١٩٣٣ دروست بوو، دوای لە چــەند هــەنگاوێکی تــر جنراڵ فرانکــۆ بــووە سەرۆك، ڕەفتارەکانی بەرامبەر نەتەوەی تر زۆر توووند بوو [١]، لە ســاڵی ١٩٨٠ وە ــلــە دوای مردنــی فرانکــۆ - کــەمێك چاکــسازیان بــۆ کــراوە جۆرێــك لــە خودموختاریان پێ درا، ئەنجومەنی یاسا دانانو ئیدارەیەکی سەربەخۆیان دروســت

[١] بۆ زیاتر بڕوانە (قاموس السیاسی) بابەت : فالانج

کرد، بەهۆی خەباتی ئاشتی‌و چەکدارەیان لە ڕێکخراوێکی ڕزگاریان دا بەناوی (ئیتا) (ETA= Easkadi Ta Askataseme ) بەمانای خۆشەویستی خاك، (ئیتا) داوای سەربەخۆ باسك دەکا، هەرچەندە چەپەکانیان وەك چەپەکانی کوردستان چۆن قەیرانی عێراقچی‌و کوردستانچیان هەبوو، ئەوانیش بەشێك ئیسپانچی‌و بەشێك باسکچی یان ددکرد بۆیە یەکێ لە دروشمەکانی ئیستا بریتی بوو لە: ٣+٤=١ مەبەست لەوەیە ٣ هەرێمی باسك کەوتۆتە فرنساو ٤ یش لە ئیسپانیاو یەکەکەش مانای یەکخستنەوەیانە٠

کێشەی ناوەکی فکری‌و ئیداری‌و سایکۆلۆجیان هەبووە، هەروەك زۆربەی ڕیکخراوە چەکدارەکانی تر لە نێو خوێندکاران لە سالی ١٩٥٩ چەکمەی کرد، دامەزرێنەرەکەی ناوی (ئەنتۆنیۆ خۆسێب)، لەداوی مردنی فرانکۆ لە ١٩٧٥ بالی سیاسی (ئیتا) بەهێزتر بور لەگەل پتەو بوونی زیاتری دیموکراسی، بەلام بەهۆی هەندێ هەلس وکەوتی بالی سەربازیەکەی لە تیرۆرو کوشتنی تاك‌و کەسایەتیەکان لە فەزای دیموکراسی دیمەنی ناشیرن بووە، بۆیە بە تێکرای جەماوەری جارانی نەماوە، نەیتوانی بەرنامەی ڕزگاری لە چوارچێوەی پرۆسەیەکی سیاسی فراوان جێ بکاتەوە بتوانێ لەگەل گۆڕانکاریەکانیش ڕابێ، بۆیە بەجیا لە سەروەری ئیتا خەریکە حزبی تر لە پێناو ئەو بنەمایانە دروست بکەن، بەلام ئەو تەقەلایانەش لە چوارچێوەی دیموکراسیدا گەلێ جار شکست دەهێنێ، ئەوەش نوقسانیەکی دیموکراسیە لە ئاست چارەسەری کێشەی کەمایەتی و زۆرایەتی، لەو چوارچێوەدا پەرلەمانی ئیسپانی لە ٢٠٠٢/٨/٢٥ حزبی باتسوانی قەدەغە کرد بە تاوانی لایەنگیری باسکایەتی لە ٢٠٠٣/٣/١٤ جێ بەجێ کرا، هێشتا ئەو کێشە نەچۆتە قاوغی چارەسەری دلنیایی .

## (١١)

# کێشـــەی قوبـــرس

دوورگەیەکە لەناو دەریای ناوەڕاست بە ٦٤کم دەکەوێتە خوارووی تورکیا، هەر لەسەر ئاسیا حیـــسابە نـەك ئـەورووپا، تـەنها لـە (٢٠٪)ی موسـولمانی تـورکن کەمایەتیەکی عـەرەب‌و مەسـیحی بـە ڕەچـەلەك مـارۆنی لوبنانیـشی تێدایـەو (٨٠٪)ی ڕەچەڵەك یۆنانین، پایتەختی نیقوسیایە، ڕووبەری ٩٢٥١کم٢، لە سـاڵی ١٥٧١ز لەلایەن خەلافەتی عوسمانلیەوە ئازاد کراوە، بۆ دووەمین جار، چونکە لـە سەردەمی (معاویە)ش جارێکی ترگیرا بـوو، تـەواو بـەمانای ئـازاد کـردن نـەك بەشێك ئازاد بکرێت‌و بەشێکی تـر ژێردەسـت بکـرێن وەك کێشەکانی ئێـستای نەتەوەی، چونکە لەگەڵ ئازاد کردنی سەربەخۆی تەواویش درا بە کنێـسە لەلایـەن ( بـاب العـالی ئەسـتانە) وە، پایـەی ئوسـقف وەك نوێنـەری میللـەتی ڕۆم‌و ئەرسەدوکسی قوبرسی دووەمین کەسێتی لە دوای والی بووە لـە ١٧٥٦، ئـەوەش دیمەن‌و نمونەی کۆمەڵگەی مەدەنی بە شێوە ئیـسلامی بـووە، تـاوای لێهـات لـە سـەردەمی (سوڵتان محمدی دووەم) لە ساڵی ١٨٥٦ ئەنجومەنێکی ئیداری‌و دادگای پێك هات لە (٤) نوێنەر هەریەکە لە موسـولمانی‌و یۆنانی[1]، بەو شـێوەیە لـە ژێـر خەلافەتی ئیـسلامی پێکەوە ژیـانێکی مرۆڤایـەتی بـووە، ئـەو دۆخـەی ئێستای ناگەرێتەوە بۆ قولای مێـژوو، قـوبرس لـە فۆنـاغی نـوێی دا لـە ١٩٦٠/٨/١٦ سەربەخۆی لە بریتانیا وەرگرت،، بە بنـەمای (تـەوافوق) لـە دەسـتووری ١٩٥٩ تۆماریان کردە سـەرۆك بۆ یۆنانیەکان‌و جێگـر تـورك، پەرلـەمانیش پێکبیـت لـە (٥٠) ئەندام، ٣٥ لە یۆنانی‌و ١٥ لە تورك‌و ٧ وەزیری یونانی‌و ٣ وەزیری تورك، سوپاش لە ٦٠٪ یۆنانی‌و ٤٠٪، ئەو جۆرە پێك هاتنە پێی دەووترێ (تەوافوق)[2]،

[1] بۆ زیاتر سەرنج بدە ( الموسوعة السیاسیة ج٤ ل٧٤٦

[2] قاموس السیاسي

یەکەم سەرکۆمار هەڵبژێردرا بە پێشبڕکێ لە نێوان (مکاریۆس)و (جۆن کلیۆدۆس)، قەشە مکاریۆس بووە سەرکۆمار بەئامادەبوونی هەرسێ لا (تورکیا-یۆنان-بەریتانیا)و (فازل کوتچوك)ی تورك بووە جێگری، لە ساڵی ١٩٦٤ جەنگێك هەڵگیرسا لەنێوان تورك‌و یۆنانییەکان، جارێکی تریش لە ساڵی ١٩٦٧، لە ساڵی ١٩٦٨ جارێکی تریش (مکاریۆس) هەڵبژێردراوە تا لە ساڵی ١٩٧٤ (٢٥/جماد الآخرة/١٣٩٤بەرامبەر ١٩٧٤\٧\٥) ئینقلابێکی لە دژی مکاریۆس کرا لەلایەن ڕێکخراوی ئەیۆکا بە سەرۆکایەتی گریفاس —ئەو ڕێکخراوە لە ساڵی ١٩٥٥ ڕۆڵێکی گرنگی بینی لە بەرگری دژ بە بریتانیا بۆ گێڕانەوەی قوبرس بۆ یۆنان تا لە ١٩٦٩ هەموو لایەك ڕێك کەوتن -، تورکە قوبرسیەکان بەو ئینقلابە قایل نەبوون تورکیاو یۆنانیش تێوە گلاّن وبووە هۆی ناکۆکیەکی ترسناکی جیهانی وا سۆڤیەت‌و ئەمەریکاش هێزەکانیان جولاّند بەرەو ناوچەکە، لەئەنجامدا تورکیا سوپا بۆ ناو قوبرس هێناو لەو کاتیەوە تا ئێستا بووینە دوو بەش، بەشی سەرووی تورك بەسەرۆکایەتی (رەئوف دنکتاش) لە ساڵی ١٩٨٣ ناویان نا (کۆماری قوبرسی تورکی سەروو)، جگە لە تورکیا هیچ وڵاتێکی تر دانی بەو کۆمارە نەهێناوە، بەشەکەی تریش یۆنانی بە سەرۆکایەتی (سبیرو کیبریانۆ) بەناوی (کیبریاکی دیموکراسی) .. ئەو هەنگاوەی تورکیاو هێنانی سوپای لە سەردەمی ( بۆلند ئەجەوید) بوو سەرەك حکومەت بە ناوی (مافی چارەی خۆنووسی گەلان)و شایەنی باسە خۆشی گەلێکی ٢٠ ملیۆنی (کورد) چەوساندۆتەوە هیچ حیسابێکی مافی چارەنووسی ئەوان نەك هەرناکا بەڵکو زمان‌و نەریت‌و فەرهەنگ‌و مێژووشی لێ قەدەغە کردوون .

# (١٢)

## خوارووی فیلیپین

بە پێچەوانەی ئەو گۆتەیەی گوایە ئیسلام بە زەبری شمشێر بڵاوکرایەتەوە،ئەوا دەبینین ئەو ناوچانەی خوارووی ئاسیا بەشی هەرە زۆری تەنها لە ڕێی بازرگانیو خوڕەوشتە جوانو ڕاستگۆییو بەڵێن پاکی دادگەری لەو بەرنامەیە بوویتە هۆی بڵاوبوونەوەی ئەو ئاینە، بەڵام دوای لەگەڵ هەڵمەتەکانی ئیمپریالیزمیو (تەبشیری) بەشێکیان لێ هەڵگێڕاینەوە .

فیلیپین ئێستا ٨٠ ملیۆنە لە ٨٠٪ مەسیحیەو لە ١١٪ ئیسلامە، پایتەختی (مانیلا) بە ڕووبەری ٣٠٠,٠٠٠کم٢، لە (٧١٠٠) دورگە پێك هاتووە، وڵاتێکی نیمچە دیموکراسی پەرلەمانی نۆستاندارییە، مێژووی ئاوەدان کردنەوەی لێڵە، وا پێدەچێ لەلای هندەوە بۆی پەڕیبنەوە لە زوویەکەوە، چونکە بە پێی زۆربەی سەرچاوە مێژووە زانستیو ئاینییەکان (ح.ئادەم) لەناوچەکانی هند هاتۆتە سەرزەوی و ژیارەو کۆمەڵگەی لێ پێك هاتووە .

لە دوای دۆزینەوەی فیلیپین لە لایەن (ماجەلان)و هاتنی ئیسپانیا بۆی لە ساڵی ١٥٢١ ناوی (فیلیپین)ی لێ نرا بەناوی (فیلیپی دووەم -شای ئەسپا) کراوە، ناوچەیەکی ململانێی نێوان دەسەڵاتی ئیمپراتۆرو داگیرکەران بووە، ئەمەریکا فیلیپینی بە (٢٠) ملیۆن دۆلار لە ئیسپانیا کڕی، دوای یابان داگیری کردەوە، ئەمەریکا جارێکی تر گرتیەوە، .. تا لەگەڵ وەرچەرخانی ئیمپراتۆرییو ئیمپریالیزمیەکانیش لە ساڵی ١٩٤٦ سەربەخۆی وەرگرت، لەگەڵ ڕابوونی نیشتیمانی دوایش ئیسلامی خوارووی فیلیپین بۆ سەربەخۆی کە زۆربەیان موسوڵمانن بەرەیەکیان پێك هێنا لە ساڵی ١٩٧١ بەناوی (بەرەی ڕزگاری مۆرۆ) دوای بووە بەرەی مۆرۆی ئیسلامی، مێژووی بەرگری فیلیپین بەشی هەرەزۆری موسوڵمان بووینە لە دژی هەڵمەتەکانی ئیمپریالیزمی، هەتا (ماجەلان)ی

سەرکردەی ئیسپان لەوێ کوژراوە بەدەستی سەرکردەی ئیسلامیەکان، هەر بۆیەش لەلایەن ئیسپانیەکان ناوی (مۆر) لە ئیسلامەکان نراوە هەروەك ئەو ناوەی (مۆر) بە مسوڵمانانی رۆژئاوا (مغرب) وتراوە ناوی (مۆریتانیا) لەوە هاتووە بە زمانی ئەوان (مۆر مانای ئەسمەر)، مسوڵمانانی سریلانکاش ناویان (مۆروز)ە، مەدغشقر بە (مۆر) ( فیلیپین)یش هەر (مۆر) .. تا ئێستا ئەو ناوەیان بۆ ماوەتەوە، زەبرو زەنگێکی زۆریان لەسەرە، چ لەلایەن حکومەت بە رەسمی چ لەلایەن رێکخراوی نهێنی بەناوی: (فنران)، (أخطبوط).. کاریان ئەزیەتدانی خەڵکی ئیسلام بووە لەو ناوچە، بۆیە بە ناچارو بێدەرأمەتی بە کۆنە چەك بەرگریان لەخۆ کردووە، لە هەشتاکانەوە شۆڕشیان زیاتر پەرە پێدا لە دوورگەکانی (میاند ناوە)، رووبەری ئەو دوورگانە (٩٤،٦٣٠)کم٢، ناوچەیەکی شاخاویەو بەنداوی سەرەکی وزەی کارەبای فیلیپین لەوێیە، زۆر تایبەتمەندی جوگرافیو مێژوویيو پیشەییو سروشتی تری لێیە، بێجگە لە نەخشەی کۆمەڵایەتیو سیاسیو ئاینیو فەرهەنگیشیان.

لە سەدەی (١٣) بەدواوە بانگی ئیسلامی پێگەیشتووە بێ جەنگو هێزو توندوتیژی، بە هۆی چەند بانگخوازێکی بەناوبانگ، لەوانە راجا پاگندا *، سوڵتان ئەبوبەکر، کابۆ نەکسوان ... تاڵای ئیسلام لە پایتەختی فیلیپین (مانیلا)ش دەشەکایەوە، ئەو والیە لە مانێلاو ناودار بووە (ناوی سلێمان بووە)، ئێستا تەنها زۆرایەتی یان لە ناوچەکانی میاندناو هەندێ ناوچەی تر ماوە، ئەوانە خاوەنی بەرگری نیشتیمانینو هەرگیز ملیان کەچ نەکردووە بۆ داگیرکەرانی ئیسپانیاو ئەمریکاو یابان ... پێشوش.

لەو سەردەمەش لەگەڵ سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران ساڵی ١٩٧٩ ناسنامەیەکی ئیسلامی بەو کێشەیە درایەوە، تا (ا.خمینی ) مابوو زیاتر پاڵپشتی ئەو جۆرە بزووتنەوە دوورو فەرامۆش کراوانە دەکرا، بەڵام ئێستا

---

ڕاستەوخۆ ئەو پاڵپشتیە هەست پێ ناکرێ،، جگە لە ئێرانی نوێ لەسەرەتادا هەریەکە لە لیبیاو مالیزیاو وڵاتی تری ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی یارمەتی دەدان، چەند جارێك دانوستانو ڕێکەوتن لەنێوان بەرەی مۆرۆو مانیلا کراوە، بەدەست پێشخەری کۆنگرەی ئیسلامی لە ساڵی ١٩٧٦ لەگەڵ ڕژێمی ئەوسای (مارکۆس) گەیشتنە شێوە چارەسەرێکی خودموختاری هەرێمایەتی، لە ساڵی ١٩٧٩ حکومەت لە بەندەکانی پەشیمان بوونەوە بە لێکدانەوەی تایبەتی حکومی، دوای ڕووخانی (مارکۆس) - سامان دارترین سەرۆکە لە جیهانو خاوەنی زیاتر لە (٥٥) تەن زێڕ بوو - کوررۆزان ئەکینۆ هات دیسان جۆرە ڕیفراندۆمێکی ئەنجام دا بەرەی مۆرۆ پێی قایل نەبوو، بەڵام ئێستا بەرەی مۆرۆی ئیسلامیو سەرۆکەکە ( حاجی مراد إبراهیم) کەمتر پاڵپشتی لێ دەکرێ، ئەوەی لە سیستەمی نوێی جیهانی تێبینی دەکرێ ئەو (بانەو چەند هەوایە) لەکاتێدا ڕۆژئاوا بەسەرکردایەتی ئەمەریکا لەولایەش ئوستورالیا بوونە هۆی ڕزگار بوونی تەیموری ڕۆژهەڵات لە ئەندۆنوسیا، بەهۆی ڕیفراندۆم، کەچی ئەو مافە بەواتە وا نابینی، لەولایەش فشارێکی زۆر دەخاتە سەر سوودان بۆ ئەوەی وا دەستکاری دەستوور بکا شەریعەتی ئیسلامی لێ بقەتێنێ بەناوی ئەوەی جێگەی کۆمەڵگەی خوارووی سودانی تیا ببێتەوە کە ئەوانیش شۆڕشیان هەیە .. کەچی هەمان کێشە بەهەمان ناوەرۆکەوە لە فیلیپین هەیەو دەستورەکەش مەسیحە کەچی دەنگێکی وا نەبیستراوە بۆئەوەی دەستکاری دەستوور بکرێ، نەك هەر لەلایەن ڕۆژئاوا هەتا لەمن وڵاتانی بەناو ( کۆنگرەی ئیسلام)یش، بەرەی مۆرۆ لەگەڵ گەشە بوونی کێشەکەی دووچاری گرفتێکی تریش بووەو کۆمەڵێکی ئیسلامی توندڕەوی هاوتاو هاوجێی لەگەڵ دروست بووە لەدوای سەرهەڵدانی (ئەلقاعیدە) بەناوی (کۆمەڵی ئەبو سەییاف) تا ڕادەیەك ناوبانگە ناسکەکەی ئەو کێشەیەشی زڕاندووە بەهۆی بە بارمتە گرتنی خەڵکی بیانی و گۆڕینەوەیان بە پارەو پووڵ .

# (١٣)

## دیواری بەرلین    جدار برلین    Berlin Wall

لە دوای شکستی حکومەتی نازی لە ساڵی ١٩٤٥ز بە رابەرایەتی (ئەدۆلف هتلەر) لەسەر دەستی هاوپەیمانان لە رۆژهەڵات و رۆژئاوا، بە جۆرێك لە جۆرەکانی ئەڵمانیایان دابەش کرد، ئەڵمانیای رۆژهەڵات بە (ئەڵمانیای میللی دیموکراسی) خۆی ناس کردبوو، کەوتە ڕێزی یەکێتی سۆڤیەت و حزبی شیوعی بووە دەسەڵاتدار، تا کەوتنیش هەر ئەو حیزبە دەسەڵاتدار بە سەرۆکایەتی (ئەرش هۆنیکەر)، بەشی رۆژئاواشی بەناوی ئەڵمانیای رۆژئاوا یان ئەڵمانیای فیدراڵی ناو دەبرا، (بۆن) پایتەختی بوو، بەشی رۆژهەڵاتی (بەرلین) یش وەبەر ئەڵمانیای رۆژهەڵات کەوت و کردی بە پایتەخت، بەشی رۆژئاواشی وەبەر رۆژئاوا کەوت، لە دوای ساڵانی ١٩٥٨ کێشەیەکی زۆر لەسەر ئەو شارە پەیدا بوو کە بە (قەیرانی بەرلین) ناو دەبرا، دوای بەو بیانۆیەو چەندین مەبەستی تر وەك چارەسەری ئەو قەیرانەش لە ١٩٦١/٨/١٣ ئەو دیوارە دروست کراو هەردوو بەشی بەرلینی لێك جیا کردەوە،بە بەرزایی ٥ پێ، درێژی ٢٥ میل، ٨٠ پەنجەرەی هاتوچۆی تیا بوو، ئەو دیوارە لە دواییدا ماناو مەبەستی سیاسی زۆری لێپەیدا بوو، بووە دیوارێکی شەرمەزاری بۆ تەواوی سیستەمی شیوعی یەت، ئەو شیوعی یەی وا رادەبینرا کە بەهەشتێك بهێنێ و خەڵکی لە سیستەمی سەرمایەداری رۆژئاوا رزگار بکا، کەچی بەردەوام خەڵکی ئەڵمانیای شیوعی بەسەر ئەو دیوارە رایان دەکرد بۆ ئەڵمانیای سەرمایەداری، بۆیە ئەو دیوارە هەر قایم دەکرا تا مین رێژ کردنیش، بەدەیان رووداوی دڵتەزێنی لێ روودا، لە راستیدا هەتا ئایدۆلۆژیای مارکسی دووچاری شکست نەبوو ئەو دیوارەی پێویست نەبوو، بە پێچەوانەوە دەبوایە سەرمایەداری دیوارێکی وا بکا بۆ ئەوەی هەردوو سیستەمی سەرمایەداری و

سۆشیلیستی نەگەنە تەنیشت یەك بۆ بەراوردێکی زەق، ئەوەیان نمونەو وێنەی زۆرە بۆ ئێستاش .

لەدوای چاکسازی یەکانی (گۆرباتچۆڤ لە بیرۆسترۆیکاو گلاسنۆست)و لەگەل ئەو هەموو قەیرانانەی ناو یەکێتی سۆڤیەت بڕێری بەخەلکی ئەلمانیا دا هێرش بکەنە سەر ئەو دیوارەو لە سالّی ١٩٨٩ دیواری بەرلینیان ڕووخاند، بووە هۆی یەکگرتنەوەی هەردوو ئەلمانیا یان وردتر بلّێین بووە هۆی گەڕانەوەی ئەلمانیای ڕۆژهەلاّت بۆ ناو ئەلمانیای رۆژئاوا، ئیتر ئەو ڕووداوە بووە دیمەنێکی شەرمەزاری زەق بۆ ئەزموون‌و چارەنووسی شیوعی یەت لە جیهان،بووە یەکێ لە فاکتەرە بنچینەیی یەکانی تێکڕووخانی سەرانسەری بلۆکی سۆڤیەت‌و شیوعی یەت، ئێستا هەرجۆرە بەربەستێکی سیاسی یان ڕێگرتنێك بێتە ئاراوە یەکسەر دەلّێن وەك دیواری بەرلین، بەو شێوەیە دیواری بەرلین بووە زاراوەیەکی سیاسی سەلبی بۆ هەموو ئەوانەی لە بەراووردو ئاشکرابوونی ڕاستی دەترسن‌و ئایانەوێ ڕەوشەنگەری (شەفافیەت) هەبێت .

بۆ زیاتر سەرنج بدە :

١- قاموس السياسي .

٢- الموسوعة العالمية .

٣- وكالات الأنباء .

(١٤)

## کۆنفۆشیۆسی Confitios

ڕێبازێکی فەلسەفی کۆنی چینی یە، لەسەر دەستی فەیلەسوفێکی چینی بە (کۆنفۆشیۆس ٥٥١ – ٤٧٩ پ ز) ناوی دەرکرد، ناوی تەواوی (کونج فوتو– واتە – بە لاتینی دەگۆترێت مامۆستای کونج)، بناغەکانی فەلسەفی بۆ سەردەمی خۆی زۆربە پێشکەوتوو دەژمێردرێت بەتایبەتی لەبارەی (دژەکان – الأضداد= یان ین)، هەتا ساڵی ١٩١٤ هەر دەپەرسترا لەلای چینی یەکان، هەروەها لە کۆریاو یابانیش باوی هەبووە، لە شۆڕشە فەرهەنگی ڕۆشەنبیری یەکەی (ماوتسی تۆنگ) لەژێرخانی کۆنفۆشیۆسی درا، لەدوای دارمانی شیوعی یەت دیسان باوی هاتەوە بەتایبەت لەچوارچێوەی ئەو دابەشی یە شارستانی یەی بۆ جیهان نەخشێنرایە لەلایەن تیۆری (ململانێی شارستانی)ی (سامۆئیل هینتگتۆن)، ئەو ناوچەی چینو دەورو بەری لەسەر شارستانی کۆنفۆشیۆسی پۆلێن کردووە، (لەوەشەوە خرایە سەر فەرهەنگی سیاسی ئەگینا ئەوە لەبەشی فەرهەنگی فکری دەبوایە تۆمار بکرێت لەو فەرهەنگە، بەشێکی زۆریش لە توێژەرەوەو مێژووی فەلسەفی یەکان پێیان وایە کۆنفۆشیۆسیش وەك مەسەلەی (بوزا) یان (زەردەشت) خاوەنی پەیامێکی ئاسمانی یە یان درێژکراوەی پەیامێکی ئاسمانی یە، چونکە بنەما فەلسەفی یەکانی زۆربەی ئەخلاقین، وا پێ دەچێ ئەگەر پەیامی ئاسمانیش بێت بەدەستکاری مرۆڤەوە ئەو کەلتوورە فەلسەفی یە بەجێماوە، بەڵام لەگەڵ گرنگیشی ناتوانێ وەڵامی پرسیارەکانی سەردەم بداتەوە، هەر بۆیەش لە ڕەوتی ئەو گفتوگۆیەی نوێنەری ئیسلامی یەکانی سەرووی ئەفریقیا بۆ لای (ماوتسی تۆنگ) کە باسی بیرو باوەڕو شەریعەتی ئیسلامیان بۆ کردبوو لە وەڵاما وتبووی، ئێمەی چینی تەنها کەلتوورو فەرهەنگێکی فکری کۆنفۆشیۆسیمان هەیە کە

لەگەڵ سەردەمی ئێستاو ئامانجەکانمان لە بینا کردنی چین نایەتەوە، ئەگینا پەنامان بۆ شیوعی یەت نەدەبرد، وەك ئەوەی ئێوە باسی ئیسلام دەکەن ئەگەر ئەو پاڵپشتە (شەریعەتیو عەقیدەیە) مان هەبوایە لە چین نەك هیچ بیرو باوەڕێکی ترم وەرنەدەگرت بەڵکو ئەو بیروباوەڕو شەریعەتەم بۆ جیهانیش دەناردە دەرەوە.

(١٥)

## کۆمـــکاری عـــەرەبیَ          الجامعة العربيـــة

## Arab League

دەزگایەکی سیاسی یە لەسەر بنچینەی (ڕەچەڵەك)ی دروست بـوە، وڵاتـانی عەرەب کۆ دەکاتەوە بە پلەی سەفیر، لە ساڵی ١٩٤٥ سەرەتایەکی ئەو کۆمکارە دارێژرا لە نێوان (میسر، عێراق، سوریا، شرق ئوردن (ئوردەن)، سعودیە، لوبنـان، یەمەن، دوای سودان‌و لیبیا‌و تونس‌و جەزائیر‌و مەغریب‌و کوێتیش هاتنـە ڕیـزی، هەڵبەتە ئەو کۆمکارە هەر لە ئەنجامی ئەو شکـستو پەرتەوازەیـەی ڕێکـەوتنی سایکس بیکۆ – ١٩١٦و هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت هاتە کایەوە، تـا گەیـشتنە هەرەشەکانی ئیسرائیل لەسەر عەرەب هـەمور ئـەو ڕووداوانـە بوونـە فـشارێکی یەکخستنەوە، بەڵام هیچ کام لە سەرۆکەکانی عەرەب ئامـادە نـەبوو لـەو پایـەی خۆی دابەزێ بۆیە وەها کۆمکارێك چارەسەرییـەکی مام ناوەندی بـوو لـە نێـوان پێویستی یەکگرتن‌و ئارەزوانی هەموو سەرۆکەکان بۆ مانـەوە لـە سـەرۆکایەتی، وەك لاسـایی کردنەوەش لە سەدەکانی پێشوو باوی (زانکۆ)ی ئاوا هەبوو، لەپێشتر بیری زانکۆی: ئیسلامی هەبور، زانکـۆی جرمـانی، زانکـۆی وڵاتـانی ئـەمریکا، فرانکۆ فۆنی‌و ئەنگلۆسکۆنی ئێستا، بەو شێوەیە لە ئەنجامی هەمور ئەو فاکتەرە پێچەوانەوەو فشارانە لە ساڵی ١٩٦٣ یەکەم دانیشتنی سەرانی عـەرەب بەسـتراو تایبەت بوو بە وڵاتانی عەرەب، ئەوەش هەنگاوێکی‌تری سەربار بوو بۆ چڕبوونەوە لە فاکتەری نەتەوەگەری‌و دوورکەوتنەوە لە زانکـۆی ئیـسلامی‌و بـچوککردنەوەی کێشەی فەلەستین کە (سوڵتان عبدالحمید‌و جمال الدین ئەفغانی‌و سـعید نورسـی‌و ڕەشید ڕەزاو زۆری تر داوایان دەکرد)، کۆمکاری عەرەبی دەورێکی زۆر سەلبیشی

هەبووە بەرامبەر کێشەی کورد، لە بەڵگەنامەکانیدا باسی مافی چارەی خۆنوسی عەرەبی کردووە بێ ئەوەی باسی مافی خەڵکی تر بکا، لە زۆربەی کۆنگرەکانیدا باسی لە مەترسییەکانی شیوعی‌و ئیسلامی کردووە کە زیاتر قایلکردنی ئەمریکا بووە، لە کۆنگرەی عەممانی ساڵی ١٩٨٧ بەتێکڕای دەنگ (جگە لە لیبیاو سوریا) ئێران بە هەڕەشەی یەکەم دانرا نەك ئیسرائیل، لە کۆنگرەی (٢٠٠١)ی نیسانی عەممان داوای (پارێزگاری نێو دەوڵەتی) کرا بۆ خەڵکی فەلەستین کەچی بۆخۆیان خاوەنی زیاتر لە ١٠ ملیۆن سوپاو چەکدارو تەکنۆلۆجیای جەنگی باڵان، زۆربەی کۆنگرەکانیشیان هەر گۆتە بووە نەك کردە، بۆیە (معمر قزافی) لە کۆنگرەی بەغدا (١٩٨٩) وەسفی هەموو کۆنگرەکانی عەرەبی کرد بە ڕادەی سەرکەوتنی (سفرو، -١) وەك نوکتە وتی: ئەو کۆنگرەی بەغدا زۆر سەرکەوتووەو (-١) نیە، سفرە، لە بنەشەدا کە ئەو وڵاتۆکانەی عەرەبی دروست بووە لە سەرەتای سەدەی بیستەم وەسفی ئەو وڵاتانەش بە سفر هاتووە[1].

هەر خودی (لۆرانس) ووتی: وایان دروست دەکەین، کە هەر ملکەچمان بن‌و نرخی سەنتێکیشیان نەبێ[2]،.کۆبونەوە لە کۆمکاری عەرەبیش بە کۆبوونەوەو کۆی سفرەکان کراوە، ئێستا زۆر لاواز بووە بەتایبەتی لە دوای داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراق‌و دوایی داگیرکردنی عێراق لەلایەن ئەمریکا. ئەوە بۆ چەندین جارە لیبیا پێشنیاری هەڵوەشاندنەوەی ئەو کۆمکارە دەکاو خۆشی بەرەو کشانەوەیەو ڕوو لە یەکێتی ئەفریقی یە.

کۆمکاری عەرەبی درێژکراوەی مەبەستەکانی سایکس- بیکۆو پلانەکانی (فرق تسد)ە لە جیهانی ئیسلامی، یەکەم جار لە مادەی (١)ی سایکس بیکۆ پێشنیار کرا لەژێر ناوی (حلف دول عربیة) هەر لەوێش بڕیاری دروستکردنی

---

١ یەکەم کەس وەسفی وڵاتانی عەرەبی بە سفر کرد (سعد زغلول) بور.

٢ بڕوانە: الاسلام والعلمانیة واثرهما في نشأة الدولة العراقیة الحدیثة -لورانس ڕۆڵێکی گرنگی بینی لە دروستکردنی وڵاتانی عەرەبی، بۆیە بە (لورانس العرب) بەناوبانگە.

دراوە، بۆ دروستكردنی ئەو كۆمكارە چەندین جار نوێنەری زایۆنی لەگەڵ گەورە بەرپرسانی عەرەب كۆبونەوە[1]، مەبەستەكەش زیاتر دابڕینی عەرەبە لە ئیسلامو لە یەكتریش، بۆ ئەوەی هەنگاوەكانی لە نەتەوەگەری بەرەو ڕەگەزپەرستی زیاتر بڕواو ئیقلیمچیایەتی تەواو بەرجەستە بێت، لەسەر شێوەی زانكۆی جەرمانی كە بزووتنەوەی نازیو هیتلەری بەرهەم هێناو جیهانی خستە نائارامی، بەڵام ئێستا زیاتر ئەو مەبەستانە لەچەندین سەرچاوەی تر هاتۆتە دی، بۆیە لەلایەن ڕۆژئاوا كۆمكاری عەرەبی بە دەزگایەكی بەسەرچووو كلاسیكی حیسابە بەتایبەتی دوای دامركانەوەی ڕۆڵی ئێرانو ڕابوونی ئیسلامی، تا ڕۆڵێكی تری بەرەو پێنادرێتەوە. هەر لە مەبەستەكانیشیدا نەیتوانیوە زانكۆیەكی كاریگەر بێت لەسەر سیاسەتی عەرەب، تەنانەت نەیتوانیوە یەكێتی (تەكەتولی) تری عەرەبیش هەڵوەشێنێتەوە لەوانە (یەكێتی مەغریبی عەرەبی UAM- مەغریب، جەزائر، تونس، لیبیا، مۆریتانیا، لە ١٧/ فیبرایر/١٩٨٩ لە مەراكش دروست كرا)، هەروەها (ئەنجومەنی هاریكاری كەنداو لەگەڵ چەندین تەكەتولی تری عەرەبی سەری هەڵداوەو پوكایەتەوە لەوانە (جبهة الصمود والتصدي)و (دول المواجهة).

[1] بۆ زیاتر بڕوانە: (نوری سعید و ... ره السیاسي في العراق).

## مەبەستی ئەم زاراوانە لەم ســەردەمەدا :

(١)

### کـۆکــوژی- جینــۆساید Genocide

کوشتنی به کۆمەڵ، بێ لێك جیاکردنەوەی شەڕکەر لەگەڵ مەدەنی، مرۆڤ و ئاژەڵ، لەو سەردەمە زۆربەی چەکە نوێکان کۆکوژن نەك هەر کیمیایی و چەکی بایۆلۆژی و ئاوەکی و هایدرۆجینی و ...هتد. بە پێی ڕێکەوتنە نێو دەوڵەتیەکان کەلە ٩\١٢\١٩٤٨ بە تاوانێك پۆلێن کرا لە یاسای نێو دەوڵەتی. (بۆ زیاتر بڕوانە: القاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدولية )

(٢)

### جـەنگـی ســارد Cold war

بەو شەڕەی نێوان هەردوو سەربازگەی ڕۆژهەڵاتی ( شیوعی)و ڕۆژئاوایی (سەرمایەداری) دەوترا جەنگی سارد کە تەنها تەقەمەنی گەرمی لێ بەکار نەدەهات، بریتی بوو لە جەنگەکانی ڕاگەیاندن و فکری و فەلسەفی و شارستانی و یاسایی ... هەتا جەنگە گەرمە ناڕاستەوخۆیەکانیش، ئێستا بە هەموو ململانێیەکی ( بێتەقەمەن) دەگوترێ جەنگی سارد کە ئامانجەکانی هەمان ئامانجی جەنگ و ململانێی بێ بە چەکی گەرم .

(٣)

## Radical رادیکـــاڵ

بـە هـەموو ئـەو بزووتنـەوەو بەرنامانـە دەووتـرێ ڕادیکـاڵی کـە دەیانـەوێ واقیعیکی دیاریکراو لـە ڕیـشەوە بگـۆڕن، جـاران (لیـبراڵ) یـش ئـەو مانایـەی هەڵدەگرت بەڵام ئێستا ئەو توانایەی نەماوە، تەنها بەرنامـە شـمولی یـەکان ئـەو ئەرکەیان پێ ئەنجام دەدرێ، یەکەم جار (جیمس ئۆکس ١٧٩٧) بەکاری هێنـا لـە بەریتانیا، داوای چاکـسازی قووڵی کرد بەڵام نەگاتە ڕادەی سۆشیالیـستی، .. ئـیتر تەشەنەی کرد .

(٤)

## Conservative پارێزگـــار

ئەوانـەن کـە دەیانـەوێ پارێزگـاری لـەو واقیعـە بکـەنو گۆڕانکـاری یـەکی سروشتیو لەسەرخۆ و ڕواڵەتی بێت نەک ڕیشەیی .

(٥)

## ئیمپریالیزم Imperialism

جۆرێکە لەسەرمایەداری کە دەیەوێ بەهۆی داگیرکردن یان یارمەتی دان بازاڕی سەرمایەداری یەکەی خۆی تیا ساغ بکاتەوە، زادەی مەدرەسەی لیبرال دیموکراسی یە .

(٦)

## تەکنۆکرات Tachnocrat

دوو زاراوەی یۆنانی کۆنە، تەکنۆ — واتە: پیشە، کراتیش — واتە: دەسەڵات، سەرجەم مانای دەسەڵاتی خاوەن پیشەکان، مەبەست پێی دەسەڵاتی چینی خاوەن کۆمپانیاو پیشەسازی یەکانی شارەزایە، بەڵام دەبێت تێبینی بکرێت کە (تکنو) لە (تقنی) وشەی قورئان چووەتە ئەورووپا ..

(٧)

## ئورستۆکرات Aristocrat

یۆنانی یە لە دوو وشە پێکهاتووە (Aristos واتە مەزن) (kratos-واتە دەسەڵات)، مەبەستی دەسەڵاتی کۆمەڵە خەڵکێکی تایبەت لە میرو بەگو بۆرجوازی یەکان، یا وەك دابەشی یەکەی یۆنانی کۆن کۆمەڵگایان دابەش کردبوو بۆ چینی زێڕ، ئاسن، زیو، .. جا چینە زێرینەکە (ئورستۆکراتیان) پێ دەووترا .

(٨)

## لیبرال Libral

وەك زاراوە (نەك وەك وشە) لە بنەچەدا لە (Liberty) هاتووە، مانای ئازادیە، لە سیستەمی سەرمایەداری بەمانای ئازادی تاك هاتووە، كە بنەچەی ئەو سیستەمە زیاتر بنیاتنراوە لەسەر بنەمای (تاكایەتی)، سەرەتا زیاتر مانای گۆڕانی قووڵی وەردەگرت دوای لە بەرامبەر ڕادیكاڵو پارێزگار جۆرە میانڕەوی یەكی وەرگرتو بووە مانایەكی نێوان هەردوولایان، دوای گەشەی كرد لە لیبراڵ دیموكراسی جێ گیر بوو وەك مەدرەسەیەك، ئێستا بە هەموو سیستەمی ژیانی ڕۆژئاوا دەوترێ لیبرالی، بە هەموو ئەو حزبو لایەنو تاكانەش دەوترێ لیبرالی كە خاوەنی ئایدۆلۆژیاو بەرنامەی گۆڕین نین، زیاتر لەسەر بنەمای پراگماتی و (بەرژەوەندی) دەڕۆن، بەڵام وەك لایەنی ئیجابی زۆربەی خواستیان دیموكراسی یە بۆ دەسەڵات، وەك لایەنی سەلبی تریش سنووری وەستانو بنیاتنانی نی یە هەتا لە ئەو لایەن ئەریتو كۆمەڵایەتی بە چاكەكانیش لانادات، لیبرال لەو سەردەمە زیاتر مانای هەڵوەشاندنەوەی دەزگاو پەیوەندی یە كۆمەڵایەتی و ئەریتەكان وەردەگرێ بە سەلبیو ئیجابی یەوە .

(٩)

## راپەڕین Uprising

بەو جمو جۆڵو هەڵچوونە جەماوەری یە دەوترێ کە بەهۆیەکی سەرەکی هەستیار ڕادەپەڕێ، جیاوازە لەگەڵ شۆڕش کە خاوەن بەرنامەو ڕێکخستن و ئامانجێکی روونی عەقلانی یەتە، لەناو کورددا زیاتر بە ڕاپەڕینی ١٩٩١ دەووترێ لە دژی دامو دەزگای حکومەتی بەعس، بەسەرکەوتوویی کۆتایی هاتو واقیعێکی سیاسی نوێ دروست بوو .

تێبینی: ئەو ڕاپەڕینە لەگەڵ (نهضة – رنسانس) جیایە.

(١٠)

## سانسۆر Sansor

بە دژی سروشتی خۆی مەبەست لێی ئەو دەزگا تایبەتو ڕەسمیەیە کە چاودێری جێبەجێ کردنی یاسا دەکا، بەڵام لەو سەردەمە زیاتر چاودێری جموجۆڵی سیاسی خەڵكو نەیارانی دەسەڵات دەکا لەولاتە دیکتاتۆرەکان، سانسۆر بەو مانایەش پاراستنی ڕادەی خۆی بۆ نەبەزاندنی سنوورەکانی کۆمەڵایەتیو سیاسیو ئابووریو یاسایی زۆر نایابە .

(١١)

## دەسەڵاتی عورفی Court martial

لەوکاتە کە باری نائاسایی ڕوو لە وڵات دەکا وەك هێرشێکی لەناکاوی دەرەکی یان کارەساتێکی کۆمەڵایەتی یان سروشتی یان هەرتێکچوونێکی شیرازەی کۆمەڵ ئەوادەسەڵاتێکی تایبەتی جاڕ دەدرێ‌و (حوکمی دەستوور) هەڵدەسپێردرێ، دەسەڵات دەدرێتە دەزگاو تاکیش .. ئەو دۆخە تایبەتی بە پێی دەڵێن دەسەڵاتی عورفی، یان جاری واشە (دۆخی تایبەت – حالة الإستثنائية)شی پێ دەوترێ .

(١٢)

## گەریلا Gurilla

ئێستا لە کوردستان بە پێشمەرگەکانی (پارتی کرێکارانی کوردستان – PKK) سەروو دەوترێ گەریلا، یەکەم ناوە (PKK) لەچەکدارانی خەباتی چەکداری کوردستان دەنێ (گەریلا) لەجیاتی (پێشمەرگە)، گەریلا وشەیەکی ئیسپانی بە بەمانای (جەنگە بچوکەکان)، دوایی بۆ جەنگی پارتیزانی بەکارهاتووە لە دژی سوپای داگیرکەر بە تایبەتی لەدوای داگیرکردنی ئیسپانیا لە ١٨٠٥ لە لایەن ناپلیۆن .

زۆربەی شۆرشگێڕانی جیهان ئەو جۆرە سیستەمەی جەنگیان لە دژی داگیرکەران بەکار هێناوە .

(١٣)

## ئەکادیم

کۆنترین مەدرەسەی فەلسەفی یە لە یۆنانی، لەسەر دەستی ئەفلاتون دامەزراوە لە ئەسینا لە ٣٨٧ پ.ز، وانەکانی (بیرکاری و فەلسەفە)ی لێخوێندراوە، لەسەر دەرگای نووسرابوو ئەوەی ئەندازیاری نەبێ نەچێتە ژوورەوە، تا لەساڵی ٥٢٧ز ئیمپراتۆر (جستنیان) دایخست، دەڵێن بۆیە ناویشی ئەکادیم لێنراوە چونکە بینایەکە بەرامبەر بیستانێك بووە بە ناوی (ئەکادیموس)، ئێستاش زیاتر بە زانکۆو توێژینەوە زانستی یەکان دەوترێ ئەکادیمی .

(١٤)

## جیۆپۆلۆتیك Geopolitics

بە شیتەڵکردنی وشە ئینگلیزی یەکانی مانای ڕوونتر دەبێتەوە، (جیو= زەوی، پۆلیتیك= سیاسە) واتە زانستێکی سیاسی لەگرنگی شوێنی جوگرافی و کاریگەری یەکانی بەسەر واقیع و هاوکێشە سیاسی یەکان دەکۆڵێتەوە، بە مانایەکی تر پەیوەندی کاری نەخشەی جوگرافی بەسەر نەخشەی سیاسی و پێچەوانەش، ئەوەش لە ئەنجامی گەشەو فراوانی سیاسەت بۆ هەموو بەشەکانی ژیان هەتا گەیشتۆتە جیۆلۆجیاو جیۆپۆلیتیك .

(١٥)

## ماوەی گواستنەوە    فترة الإنتقالية    Transitional Period

مەبەست لێی ئەو دۆخە تایبەتی یانیە کەلە دوای دۆخێکی شاز دێتە دی شەرعی یەتی یاساو جەماوەری ڕووچوونێت (بەهۆی جەنگی ناوەکی یان دەسەلاتێی دیکتاتۆری توند ...)، بەو ماوەی نێوان ئەو بارودۆخە نائاسایی یە هەتا ئاسایی بوونەوە دەووترێ (ماوەی گواستنەوە)، هەموو ئەو دامودەزگا ئیداریو یاسایی و ئاسایش و ...ناوەڵناوی گواستنەوەی بۆ زیاد دەکرێ وەك (حكومة الإنتقالية ) (مجلس إنتقالي) (رئاسة إنتقالية) ... هتد ئێستا ئەم زاراوە کەوتۆتە نێو ڕابوونی ئیسلامیش، بەو (فترة)یە دەووترێ کە لە کۆمەڵگایەکی نەفامی (بە مانا قورئانی یەکەی) دەست پێ دەکات تا دەگاتە حوکمی ئیسلامی تەواو یان هەموو ئەو فەترە نائاسایی یانەی بەرێوەن بەرەو ئیسلامی تەواو دەووترێ فەترەی ئینتقالی .

(١٦)

## ئیمپراتۆر Emperor

زاراوەیەکی لاتینی یە بەمانا (سەرکردە= قائد) دێت، بەلام لە پەیڕەویدا شێوە شاهنشایەکە بەسەر مەملەکەتێکی فراوانی بێسنووری رەسمی، بە دەسەلاتەکەش دەوترێ (ئیمپراتۆریەت)، بەپێی (معجم المصطلحات العلمية والفنية) [١] یەکەم جار ئەو ناوە لە دەسەلاتی رۆمی سەردەمی (ئیمپراتۆر ترابزۆن) نراوە زیاتر لە ١٢٠٠ ساڵ لە پێش زاین، بەڵام بەپێی (قاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدولية) [٢] ئەوناوە لە سەردەمی (ئۆگتس) بەکارهاتووە، پێشتر بەسەرکردەیەکی سەرکەوتووی سەربازی وتراوە ئیمپراتۆر، لەم سەردەمە ئەو ناوو سیستەمە نەماوە، هەچەند سیستەمی سەرۆکایەتی ژاپۆن ئیمپراتۆریە بەڵام بەو مانایەی سەروو نی یە تەنها ئیمپراتۆری دەستووری یە، لە ئەفریقیای ناوەڕاستیش لە هەشتاکانی سەدەی بیستەم (جنرال جان بیدل بۆکوسا) لەناکاو سیستەمی وڵاتی گۆڕی وخۆی ناونا ( ئیمپراتۆر) بەڵام ئەو دۆخە پێچەوانەیی یە تەنها چەندساڵێکی خایاندو دەرکەوت هەرخۆشی تەواو هۆشمەند نی یە .

---

[١] معجم المصطلحات العلمية والفنية ... إعداد وتصنيف يوسف خياط- من سلسلة (لسان العرب )

[٢] قاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدولية د. أحمد سعيفان : المادة إمبراطور ص٤٦

(١٧)

## پرۆلیتاریا Proletariat

لە رۆمانی کۆن بەو کۆمەڵە خەڵکەی بێکەس‌و کارو غەوارەو بێ پایە دەوترا (پرۆلیتاریا)، یەکەم جار (سان سیمون ١٨٣٨ ز) ئەو زاراوەی بەکارهێناوە بەو چینە خەڵکەی وت پرولیتاریا کە داهاتێکی وایان نی یە ژیانیان پێ زامن بکرێ، ئێستاو لە دوای دەستکاری یەکانی (مارکس) مەبەست لەو چینە کرێکارەیە کە لە کارگەکان کاردەکەن بێ سەرو سامانن جگە لە دەست‌و بازووی خۆیان، بژێویان ئەو کرێ یەیە کە وەری دەگرن رۆژانەو بەس، بەڵام ئەو جۆرە چینە هەر لە پێناسەکانی (سەرمایەداری — مارکس) وا هاتوە ئەگینا کرێکاری وا دروست نەبوو .

(١٨)

## بورجوازی Borgiois

زاراوەیەکی فەرەنسی یە، لە بنەچەدا بەخەڵکی شار وتراوە (بورگ) ئەویش لە لاتینی وەرگیراوە لە (Burgus)، ئەوانە بوونە کە باری ژیانیان باش بووە، ئەو مانایەی لە فەرەنسی‌و وڵاتانی ئەورووپی هەروا مایەوە بەو دەوڵەمەندانەی لەدوای چینی دەرەبەگ دێت، لە دوایدا بەوانە وترا کە خاوەن کارگەو کۆمپانیاکانن، لە فەلسەفەی مارکسی یەتیش ئەو چینەن کە موڵکی یەتیان لەسەر کارو سوری پرۆلیتاریایە .

(١٩)

## دایک سالاری و باوک سالاری

بەپێی هەندی سەرچاوەی لایەنگری مادی مێژوویی (لەوانە: مورگان – لە کتێبی المجتمع القدیم، ئەنجلس- لە کتێبی اصل العائلة والملکیة الخاصة والدولة، مارکس- لە کتێبی العائلة المقدسة...) پێیان وابوو کۆمەڵگە لە سەرەتادا بێ خاوو خێزانو مولکیەتو یاساو ..بووە، ژیانیش بە تەنهایی بوو لەسەر شێوەی راوو شکارە درندەکان، ئیتر جۆری هاوسەری تایبەت نەبوو، بۆیە پەیوەندی جنسی نێرو مێ رێکخراو نەبووە، واتە: یەکەی خانەوادەش دروست نەبیبوو، لە ئەنجاما ئەو منداڵەی دەبوو باوکەکەی نا دیاربوو، تەنها دایکی دیاربوو، بۆیە دایکەکە دەبووە خاوەن منداڵەکان، ئەو فەترەیەیان ناوونا "دایك سالاری"، تا دوایی لە ئەنجامی سەرهەڵدانی مولکیەتی تایبەتی خانەوادەو هاوسەری تایبەتی دوانەیی پەیدابوو، کۆتایی بەو سیستەمە هێناو بووە "باوك سالاری".

هەڵبەتە ئەو تیۆرە لە کۆتایی سەدەی (١٩) گەشاوە لەگەڵ گەشانەوەی تیۆری داروینیو مادیەتی مارکسی، دوایی بەرەبەرە شکستی هێنا، ئێستاش بە نەشارەزایی هەندێك لە بەناو بەرگری لە مافی ئافرەت باس لە سەروەریو دایك سالاری دەکەن، بەڵام نازانن ئەوە مانای تەواوی چیە.

(٢٠)

## رۆژهەلاتناس (مستشرق) Orientiatist

بە هەموو توێژەرەوەیەکی رۆژئاوایی دەوترێ (رۆژهەلاتناس) کە لەسەر رۆژهەلات بکۆلێتەوەو بنووسێ، یان وەك لە (موسوعة العربیة) هاتووە (معرفة ینتجها غیر الشرقي عن الشرق) .

(٢١)

## لاتینی Latin

ناوو هەرێمێکی ئیتالیە، رۆماشی کەوتۆتە نێو، لەکۆنەوە ناوبانگی شارستانی هەبووە، زەخیرەیەکی کەلتووری زۆری لە زمانو نووسین زانیاری بەجێ هێشتووە، ئێستا تەنها دەولەتی فاتیکان زمانی رەسمی لاتینی یە، بەلام بەشێکەلە خێزانە زمانی سەرەکی ئەورووپی ئاری شان بەشانی ئاری زمانەکانی ئەلمانیو فەرەنسی و بەریتانیو ولاتانی ئەسکەندەنافی .

(٢٢)

## هەلپەرست　　إنتهازية　　Opportunism

بەهەموو ئەو کەسانە دەوترێ (هەلپەرست) کە هەر دەرفەتو هەلێك بێتە پێش بێگوێدانە بنەمای ئەخلاقیو بەلێنو بڕواو ..لە پێناو بەرژەوەندی خۆی دەیقۆزێتەوە، نزیك دەبێتەوە لە هەمووده سەلأت وقازانجێکی مادی، ئینجا بۆی دەنووسێ، بۆی دەلێ، بۆی دەکا، .. بەقەناعەتەوەش نیە، ئەوانە لە کوردستان ناوی هاوتای تریشی هەیە: ماستاو چی، مامە حەمە، دووڕوو، تەلەم فرۆش، فتوا فرۆش، خۆفرۆش ...

(٢٣)

## دیماگۆجی　　Demagogicism

بریتی یە لە پرۆسەی هەلخەلەتاندنی خەلکێکی سادە بەهەندێ دروشمی رەنگاوڕەنگ، یان هەندێ بەلێنی مادی ساویلکانە، هەموو جۆرە خەلکێك هەلناخەلەتێنێ، زیاترخەلکی عەوامە، جا زۆر جار ئەو عەوامە خاوەن بڕوانامەشە .

( ٧٤ )

## سەندیکا Syndicate

ئەو ڕێکخراوە مەدەنیانە دەگرێتەوە کە کۆمەڵە خەڵکێك کۆبوونەوە تیایدا لەسەر بنچینەی هاوپیشەیی بۆ بەرژەوەندی هاوبەش، وەك قوتابیان، کرێکاران، ئافرەتان، زانایان، پزیشکان، ... هەرچەندە ئێستا لە دەسەڵاتە شمولی و دکتاتۆریە حزبیەکان زۆربەی ئەو سەندیکانە لە (مەدەنیەت) دەکەون دەبنە دەستکردی ئەو دەسەڵاتەو بەرپرسانی ئەو سەندیکانەش بەرامبەر هەندێ دەستکەوتی مادی قایل دەبن .

( ٢٥ )

## هیلنستیە

لە دوو وشە پێکهاتووە: (هیلین) بە یۆنانی واتە: (باپیر)، لە بنەچەدا یۆنانی ئیستا ناوی هیلاس[1] بووە، و ئیست east یش واتە ڕۆژهەڵات، بە ڕوونی دەردەکەوێ لێکدراویان گوزارشت لە تێکەڵیەکی نێوان ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات دەکا، کە کاریگەری ڕۆژئاوا (باپیرە) لەسەر ڕۆژئاوا بێت، هەروەك لە یۆنەو بنەچەی پەیدا بوونی ئەو زاراوەش وا دێت، دوای ئەوەی ئەسکەندەری مەکدۆنی جێی باوکی (فیلیپی دووەم)ی گرتەوە، لە ٣٣٨ پ.ز یۆنانی خستە ژێردەسەڵاتی خۆی، دوای پەڕیەوە ئاسیاو سەرووی ئەفریقیای لە فارسەکان ستاندەوە، خۆشی هات لە بابل ( لە بنەچەدا بۆ "باڤیل"ی فارسی دەگەڕێتەوە)، بەپێی کتێبی (الملل والنحل – شهرستانی ) ئەوا لەگەڵ ئەو هەڵمەتانەی ئەسکەندەر دووقوتابی فیساگورسیش هاتبوون بیروڕای فیساگۆرسی بڵاودەکردەود لە ڕۆژهەڵات و ناوچەکانی فارس تا هند، لە بنەڕەتا بیروراکانی فیساگورس بۆ پێغەمبەر (ح.سلیمان) دەگەڕێتەوە، لەو هەڵمەتەی ئەسکەندەرو فیساگورسیە شارستانی یەك دروست بوو لە ناوچەی ڕۆژهەڵات لە ژێر ئەو داگیرکاری بە بەناوی (شارستانی هیلنستی)، ئەو فەترەیەی دوای جەنگیش لەگەڵ فارس لە ٣٣٢ پ.ز تا پەلامارەکانی ڕۆم لە سەدەی (١) پ.ز دەوترێ ( ماوەی هلنستی)، ئەو وڵاتەر گەلانەی وەبەر ئەو شاڵاوەی ئەسکەندەر کەوتن لەگەڵ یۆنانو دەسەڵاتی ئەسکەندەر خۆی دەوترێ ( جیهانی هلنستی )، دەبێ تێبینی بکرێ ئەو هلنستیەی لەناو یۆنان دروست بوو ئەوە ( یەك ڕەگو ساغە ) جیایە لەگەڵ شارستانیە دوو ڕەگیەکەی ( ڕۆژهەڵاتی)، هەرچی (پاشاکانی هلنستیە )

---

[1] لە لایەن ئەگریکیەکان ئەو ناوەی لێنراوە بڕوانە: الاسلام والعلمانية وأثرهما في نشأة الدولة العراقية الحديثة ، هەروەها لە (جدول وشر ن)ی كتاب المقدس دەڵێ جاران بە وڵاتی یۆنان دەوترا هیلاس.

مەبەست لێ یان هەموو ئەو پادشایانەی حوکمی ئەو ناوچانەیان کردووە لەدوای ئەسکەندەر هەتا پادشا رۆمی یەکانیش، لە راستیدا (هلنستیە) بووە جووت بوونی دوو سەرچاوەی شارستانی هەرسەردەمەو یەکیان بە ئەندازەیەکی زیاتر کاری لەوی تر کردووە .

( ٢٦ )

## کۆنگرەی ئیسلامی Islamic Congress

ئەو رێکخراوە ناوی ئیسلامی یە بەڵام هەر تایبەتە بە حوکومەتەکان نەك زاناو بزووتنەوە ئیسلامیەکان، بۆیە زۆرجار سەرۆكو نوێنەری ئەو حکومەتانە کە شیوعیو سۆشیالیستیو یان لیبرال دیموکراسیشن هەتا مسیحیش وەك (سەرۆکی لبنان) بەشداری دەکەن، ئەو رێکخراوە لە ساڵی ١٩٧١ لە (جدە)ی سعودیە دروست بووە، هەرچەندە ( قاموس السیاسی) ئەو هەوڵو تەقەلایە دەگێڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٥٤، بەڵام لە کۆنتر تەقەلای (زانکۆی ئیسلامی) لەلایەن کەسایەتی یە ئیسلامی یەکان هەبووە، هەندێ بەندی چاك لە (بەڵگەنامە – میثاق)ەکە هەیە، بەڵام هێزی جێبەجێکردنی لاوازە، وەك پاڵپشتی گەلانی موسوڵمان بۆ سەربەخۆی، هاریکاری ئیسلامی، قەڵاچۆی رەگەز پەرستی، بەکارنەهێنانی چەكو توندو تیژی بۆ کێشە ناوەکیەکان، .. لەهەر (٣) ساڵێك کۆنگرەیەکی سەران دەکرێ نزیکەی (٥٥) وڵات ئێستا بەشدارن .

(٢٧)

## یەکێتی ئەفریقی African union

لە ساڵی ١٩٦٣ لە (ئەدیس ئەبابەی) پایتەختی حەبەشە دروست بوو لەلایەن (٣٠) وڵاتی ئەو سەردەمی، سەرەنجامی کۆمەڵێك تەقەلای پێشینەی تری هەرێمایەتی وەك دروست کردنی ڕێکخراوی وڵاتانی (دار البیضاء-لە ١٩٦١)، هەروەها (یەکێتی ئەفریقی مالگارشی-ئەویش لە ١٩٦١)، کۆمەڵەی وڵاتانی مانرۆڤیا لە هەمان ساڵ، دوای ئەوان فراکسیۆنی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیا، یەکێتی وڵاتانی ڕۆژئاوای ئەفریقیا .. تا لەو ڕێکخراوە سەرتاسەری ئەفریقیاییە خەملی، هەندێ مەرجی مرۆڤانەو دیپلۆماسیانە دارێژرا ... تا ئێستاش بەکارە پێچەوانەی (وڵاتانی بێلایەن – دول عدم الإنحیاز) کە لەگەڵ دارمانی بلۆکی سۆڤیەتی چالاکی نەما، یەکێتی ئەفریقی ساڵانە کۆبوونەوەیەکی سەرانی دەکا، لەبەر ئەوەی لە ناپلۆقەکەی سەر لیبیا ئەوانە زیاتر بەهانای هاتن نەك زانکۆی عەرەبی بۆیە لیبیا لە سەدەی نوێتوە داخوازی ئەوە دەکا کە خۆی و وڵاتانی عەرەبی ئەفریقی زانکۆی عەرەبی هەڵوەشێننەوەو بچنە ڕیزی یەکێتی ئەفریقی .

(٢٨)

## یەکێتی ئەوروپی European Union

لەدوای جەنگی جیهانی دووەم لە ١٩٥٨ لە ڕۆما بیرۆکەی ئەو یەکێتیە زیندوو کرایەوە بەناوی (کۆمەڵەی ئەوروپی)، لەدوای دارمانی شیوعیەت لە ساڵی ١٩٩٠ زیاتر بنەماکانی یەکێتی ئەوروپی بەرجەستە کرا لە (واستریخ)و کرا بە (یەکێتی ئەوروپی)، ئێستا دراویشیان یەکخست، کۆمەڵێك مەرجی مرۆڤایەتیو سیاسی تیایە بۆ وەرگرتنی هەر وڵاتێك لەو یەکێتیە، هەر بۆیەش زیاتر لە (١٠) ساڵە تورکیا ناتوانێ ئەو مەرجانە بسازێنێو وەرگیرێ، یەکێتی ئەوروپی ڕەوتێکی سروشتی ئەو عەولەمەیەو سەلماندنی ناسنامەی بەکۆمەڵە.

ئەگینا تەقەلای یەکبوونی ئەوروپا زۆر کۆنە، هەر لەدوای جەنگی سی ساڵەی ئەوروپی لە ١٥٢٣ لەلایەن (ئیمریك کروچیە) ئەو داوایە کراوە، دوایش لە ١٥٤٨ لە ویستیفالیای ڕۆژئاوای ئەڵمانیا بناغەی خانەوادەی ئەوروپی پێك هات، ئیتر لەو کاتیەوە لە هەوڵو تەقەلا دان تا جیهانی ئیسلامی لێك بکەنەوە ئەوروپاش یەك خەنەوە.

( ٢٩ )

## ئەنجومەنی هاریکاری کەنداو — مجلس تعاون الخليجي
## Gulf cooperation couneil

لەدوای سەرکەتنی شۆڕشی ئیسلامی لە ئێرانو هەلگیرسانی جەنگی عێراق — ئێران لە ١٩٨٠، ئەو ئەنجومەنە بەڕەسمی دروست بوو، هەموو ولاَتانی کەنداو (جگە لە یەمەن) ی تیایە، هەر (٣) ساڵ جارێك ئەمینداری گشتی هەڵدەبژێرێتەوە، لە داگیرکردنی کوێت لەلایەن عێراق ڕۆڵێکی گرنگیان گێڕا بۆ گێڕانەوەی بنەماڵەی (صباح زادە)، هەروەها پێشتریش لایەنگیری عێراق کرد لە دژی ئێرانو کوردیش، بەلاَم بۆ کێشە ڕاستەقینەکانی عەرەب بەرامبەر ئیسرائیلو کێشەکانی تری عەرەب لەگەڵ تورکیاو حەبەشەو ... ئەو ڕۆڵەی نەبووە، ئێستا دیسان بەرەو کزیە .

( ٣٠ )

## جیهانی سێیەم — Third world

ئەو زاراوەیە لە بنەچەدا دەگێڕنەوە بۆ (ئەلفرد سۆفی) یەکەم جار لە ساڵی ١٩٥٢ بەکاری هێنا، کاتی جیهانی ڕۆژئاوای بە جیهانی یەکەم داناو، ولاَتانی سۆشیالیستیش بە جیهانی دووەم جیهانی سێیەم کە هیچ لەو دوو بەرە نەبوون ناوی نان جیهانی سێیەم، دوای باوی وەرگرتو بووە زاراوەیەکی نەرم وبەرێزەوە بۆ ئەو ولاَتانەی کە دوا کەوتوون لە ئابووریو تەکنۆلۆجیو باری سیاسیو ... زۆر جار (دول النامية) شیان پێ دەوترێ، زۆربەی چڕ بووینەوە لە ئاسیاو ئەفریقیا، زۆربەی ولاَتانی موسولمان نشین دەگرێتەوە، هەر لەنێو ئەوانەش دواکەوتوو تریش هەیە پێیان دەوترێ (جیهانی چوارەم) لەلایەن (un)ەوە .

(٣١)

## فرانکۆفۆنیە Francfort

پێکهاتووە لەو وڵاتانەی کە بە زمانی فەرەنسی دەدوێن، جا مەرج نیە نەتەوەی فەرەنسی بن، ئەوانەی لە بنەڕەتدا لەلایەن فەرەنسا داگیرکراوون،و بە پاکتاوی ڕەگەزی فێرە فەرەنسی بووینە، بەشێکی زۆریشیان زمانی ڕەسەنی خۆیان لەبیرچۆتەوە، زۆربەی وڵاتە ئەفریقیەکانن، زۆر لەخزمەتی کەلتوورو فەرهەنگی فرنسیە، لەو ترازە ڕێکخراوە لە لایەن بەریتانیاش بەناوی (ئەنگلۆ سەکسۆنی) هەیە، لە پێشتریش وەها ئامانجێك بەناوی (ژانکۆی جرمانی) ... ئەڵمانیاو هیتلەر خۆشی جارەدرا بەمەبەستی یەکخستنەوەی هەموو پارچە کۆنەکانی ژێردەستی ئەڵمانی، لەگەڵ ئەوانەش کە بە ئەڵمانی دەدوێن، هەمە ئەوانە جۆرە یەکێتیەك کۆیان بکاتەوە وەك ئەوەی ئێستای فرانکۆفۆنی .

لە ٧/ ئەیلول/١٩٦١ وڵاتانی فرانکۆفۆنی یەکێتیەکیان پێکهێنا بەناوی . یەکێتی ئەفریکی مەلیگاسی(AMU.) ١٢وڵات بوون ئەو ساتی سەربەخۆییان وەرگرتبوو ( کامیرۆن، کونگو، برازافیل، ساحل العاج، داهومی (بنین-ئێستا)، گابون، بۆرکینۆفاسۆ، موریتانیا، نیجر، کۆماری ئەفریقیای ناوەڕاست، سەنیگال، تشاد، مدغشقە) بەپێی (قاموس المصطلحات السیاسیة والدستوریة والدولیة) یەکەم کەس کە بەکاری هێناوە ( لوپولد سیدار سنغور)ی سەنیگالی بوو لە ١٩٦٢ لەدوای بەکاربوونیەوە لە ١٩٩١، ئێستا (٥٠) وڵاتی تیایە، ٧ وڵاتی عەرەبیە وبەشێکی ئاسیاوی‌و ئەورووپیش، (فرانسۆ میتران)ی سەرۆکی پێشووی فەرەنسا ئەقەلایەکی زۆریدا ئەو ڕێکخراوە لە کەلتووری وفەرهەنگی یەوە وەرچەرخێنیتە ڕێکخراوێکی سیاسی، تا ڕادەیەك هەندێ لە ئامانجەکانی هێنا دی ڕۆڵێکی سیاسیان لە پەیوەندی نێودەوڵەتی هەیە، بەتایبەتی لەبەرەنگاری ڕابوونی ئیسلامی لە وڵاتانی ئەفریقیا وەك لە جەزائیر ئەو ڕۆڵەی بە ئاشکرا بەرجەستە

بوو، لەدوای کۆنگرەی ٢٠٠٢/١٠/٢٠ لە بێرووت (عەبدۆ زیوف)ی سەرۆکی پێشووی سەنیگال بووە سەرۆکی فرانکۆفۆنیە لەجێی (پترس غالی) سەرۆکی پێشووی (نەتەوە یەکگرتووەکان)، کۆمەڵێك بریاری سیاسیو ناسیاسی گرنگیاندا لەوانە لەبارەی (تیرۆر)، وەك تێبینی دەکرێت ئەو رێکخراوە لەوە بەدی دەکرێ کە سەرۆکەکانی کەسێتی نێو دەوڵەتی بەهێزن.

(٣٢)

## UNICEF یۆنیسێڤ

ڕێکخراوێکی سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکانە، کاری بنچینەیی زامن کردنی شیرە بۆ منالآنو چالآکی تەندروستیەتی لەڕێ تێرکردنی دایکەکان، داهاتەکەشی خێرخوازیە، ئەو ڕێکخراوە لە دوای ڕاپەڕین هاتە کوردستان پشکێکی دیاری هەبووە لە خزمەتی لەگەڵ کۆمەڵێك کەمو کوڕیشی، ناوی یونیسێف لە کورتکراوەی پیتی یەکەمی ناوەکەی

<u>U</u>nited <u>N</u>ations <u>I</u>nternational <u>E</u>mergency <u>F</u>und
UNICEF

(٣٣)

## UNISCO یونسکو

لە سالی ١٩٤٦ دروست بووە، سەر بەکۆمەڵەی نەتەوەکانە بۆ کاروباری زانستیو لێکۆلینەوە، پەروەردەی ئاشتیانەو ئارامی، مافە مەدەنیەکان، پەیوەندیو چالآکیە هونەریەکانو فەرهەنگیو کەلتووری دەگرێتەوە، ناوەندەکەی لە پاریسە، بەپێی بەرنامەکانی (UN) ڕێبازی پەروەردەی ڕۆژئاواییانە پەیڕەو دەکا، ناوەکەشی لە کورتکراوەی

<u>U</u>nited <u>N</u>ations <u>E</u>ducational <u>S</u>cientific and <u>C</u>ultural <u>O</u>rganization = UNESCO

( ٢٤ )

## Red crescent مانگی ســـوور

کۆمەڵێکی خێرخوازی جیهانی و نیشتیمانیە، لەنێو وڵاتانی ئیسلامی هەیە لە جیاتی ( خاچی سوور) کە تایبەتە بە وڵاتانە مەسیحی، دروشمی بریتیە لە ئاڵایەکی سپی و مانگێکی سوور لە ناوەندی، ئەوەش هێمایەکی ئاینی کۆنە، بەرەسمی لە سەردەمی (سوڵتان ئورخانی) عوسمانیّ لەساڵی ١٣٢٦ ز هەمان ئەو دروشمە ئاڵای سوپاکەیان بووە، بەڵام دروست بوونی کۆمەڵێکی وا خێرخوازی بە هەمان دروشمی ( مانگێکی سوور) لە جەنگی نێوان عوسمانلی و سربی لە ١٨٧٦ز دروست بوو، ئەرکی بەهانا هاتنی بریندارو لێقەوماوان بوو، هەتا ئەگەر ئی دوژمنیشیان بوایە، ئینجا ناوی وەرگرت لەناو جیهانی ئیسلامی، بەپێی ڕۆژهەڵاتناس (دۆزی)و زۆر لە توێژەرەوەی تری ڕۆژئاوایی ئەو نەریتە خێرخوازیە هەمروی لە ئەزموونی ئیسلامیەوە پەڕیتەوە ئەوروپا، تا لەساڵی ١٨٦٣ز لە کۆنگرەی جنێف بە بۆنەی جەنگی قرم (خاچی سوور) دروست بوو ... لە سەردەمی نوێشدا مانگی سوور لە ساڵە ١٩٢٩ وەرگیرا لە لیژنەی جیهانی (خاچی سوور)، زۆربەی وڵاتانی ئیسلامی ئەو کۆمەڵەیان هەیە بۆ ڕووداوە ناکاوەکانی ناوخۆو جیهانیش .

( ٣٥ )

## فراکسیۆن Federation

بەو کۆمەڵە خەڵکە دەوترێ لەناو کۆمەڵێکی فراوانتر کە بیروبڕوار هەڵوێستو بۆچوونەکانیان لێك نزیکە، ئێستاش هەر بەو کۆمەڵە پەرلەمانتارانی دەوترێ کە سەر بەیەك لیستن (بۆ زیاتر بڕوانە، پەرلەمان، حزب، لەو فەرهەنگە).

( ٣٦ )

## مافـیـــا Mafia

لە بنەچەدا مافیا ناوی کۆمەڵێکی نهێنی بوو لە (سقلیە) لە سەدەی (١٥)، بەڵام چالاکیەکانی لەدوای سەدەی (١٩) بۆ (٢٠) زیادی کرد، ئەندامیەتی لەو کۆمەڵەیە تەنها بۆ ئەوانە بوو کە توانای چەقۆ وەشاندن بوون (یان خەنجەر)و پابەندیش بوون بەو نەریتیە ڕێگری باج وەرگرتنو سەودای تۆڵە سەندنەوەو پارێزگاری کردنی ئەندامانیان بەو ئامرازانە، لەدوای پەرەسەندنی بەدکاریەکانیان لە سەرانسەر ناوچەکە تا ئیتالیاش، ئینجا (مۆسولینی) لە ساڵی ١٩٢٧ز بەتوندی دەستی لێوەشاندنو کۆتایی پێ هێنان، دوای ئەوەی لەگەڵ پەنابردنی کەسانێکی زۆریان بۆ ئەمریکا لەوێش ئەو دەستەو تاقمەی مافیایان دروست کردەوە، کارو پیشەیان ڕێگریو قاچاغیو ... دوای بووە زاراوەیەك بە هەموو ئەو باندە شارەزایانە دەوترێ مافیا کە بازرگانیەکی ناڕەوا دەکەن یا قاچاغی نێودەوڵەتی دەکەن .

(٣٧)

## یـۆتـۆپـیـا Eutopia

زاراوەیەکی یۆنانی کۆنە بە مانای (لە هیچ شوێنێك نیە)، واتە بوونێکی خەیاڵیە لە واقیعانیە، ئێستاش هەر ئەو مانایەی هەیە، تۆماس مور (١٤٧٨ — ١٥٣٥ز) کتێبێکی بەناوبانگی بەناوی (دوورگەی یۆتۆپیا) هەبوو، تیایدا حوکومەتێك دەست بەکارە لەو دوورگە دادگەریەکی نمونەیی لێ پەیڕەو کردووە هەر بە خەیاڵ، ئیتر بە هەموو ئەو تیۆرە سیاسیو مەدرەسە فەلسەفیانە وتراوە یۆتۆپیا کە نەشیابێت پیادە بکرێتو بوونی نەبووبێ یان ئەزموونێکی سەرکەوتووی نە دابێ، لەوانە (دوورگەی یۆتۆپیا)، (مدینة فاضلة) (دولة العلماء)، ... کۆمەڵگەو سیستەمی شیوعیەتیش چووە ریزی ئەو خانەیە کە پێشتر زۆربەی سیستەمەکان تری بە میسالیو یۆتۆپی وەسف دەکرد، بەڵام کۆمەڵگەی ئیسلامی جەند جارێك لە مێژوو نمونەی دروست کردووە، بۆیە لەنێو هەموو مەدرەسەکانی سەردەم لە شیوعیەتو سۆشیالیستیو لیبراڵ دیموکراسیو وجودیو میسالی ... تەنها سیستەمی ئیسلامە بتوانێ بە بوێرانە بڵێ من یۆتۆپی نیم .

(٣٨)

## مافی چارەی خۆنووسی          حق تقرير مصير
## right of self determination

ئەو مافە یاسایانە لە (UN)و لە (مقاصدەکانی) – (پرانسیپەکانی نەتەوەکان) دیاری کراوە، تیایدا هاتووە هەر نەتەوەیەك دەتوانێ چارەنووسی سیاسی‌و ئابووری تەواوی خۆی دیاری بکا، لەهەردوو مادەی (١)و (٥٥) ی (ميثاق الأمم المتحدة) هاتووە، زۆر جاری تریش دوو بارە کرایتەوەو مافی بەرگری چەکداریشی داوە بە پێی مادەی(١) پەرەگراف (٢) وا هاتووە : (إنما العلاقات الودية بين الأمم على أساس المبدأ الذي يقض بالمساواة في الحقوق بين الشعوب بأن يكون لكل منها تقرير مصيرها)، هەروەها چەند جارێتر لە بریارەکانی (UN) دووپات کراوەتەوە، لە سالی ١٩٦٠ جارێکی تر بریارێکی تری (مافی چارەنووسی) درا بە ژمارە ١٥١٤ بەسەردێری : (إعلان منح الأستقلال للبلدان والشعوب المستعمرة) تیایدا هاتوە : (إن الجمعية العامة .. تعلن .. لجميع الشعوب حق في تقرير مصيرها، ولها بمقتضى هذا الحق أن تحدد بحرية مركزها السياسي، وتسعى بحرية الى تحقيق نانها الأقتصادي والاجتماعي والثقافي).

لە بنەچەدا بەو پاساوە یاسایانە ئەو مافەی چارەنووس هاتووە: ١- پاراستنی ئاشتی٢- قەلاچۆی چەوساندنەوە ٣- پێکەوە نەژیانی چەند پێکهاتەیەك پێکەوە ٤- مافی مێژوویبان لە سەر خاکی خۆیان ٥- نەبوونی ڕاپرسی کەپیشانی بدا بە پێکەوە ژیان قایلن ٦-ی ان پێ شێل کردنی ڕێکەوتنێکی نێوانیان ،..

هەروەها ئەو مافە هەر میللەتێك دەگرتەوە بەپێی ی ئەو مەرجانەی کە لە نەتەوە یەکگرتووەکان هاتووە: ١- مقەوەماتی یەك نەتەوەییان هەبێ وەك

هاوبەشی زمان‌و خاك ومێژوو و..٢- لـە نێوان ئـەو گەلـە پەیوەسـت وئـیرادەی سیاسی هەبیت ٣- لە نێوان هەموو ئەوانەو هەرێمەکەیان پەیوەستی سیاسی بە کۆمەل هەبێ .

کەواتـە مـافی چـارەی خۆنـووس کەمایـەتی ناگرێتەوە،بۆیـە لـە نەتـەوە یەکگرتووەکان مادەی (٢٧) بۆ مافی فەرهەنگیان دیاری کراوە .

گرفتی بنچینەیی بۆ مافی چارە نووس بریتیە لە :

١-پاراستن‌و سـەلامەتی هەرێمە کە لە مادەی (١٠) لە عصبة الامم دوایـش لەفەقەرە (٤) ی مادەی (٢) هاتووە، هەردوو بنەمای (عدم التدخل)و (سیادە)ش لەوە سەرچاوە دەگرێ.

٢-گوایە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی پشێوی

٣-موڵکیەی دەوڵەتێکە ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان ،

بۆ زیاتر بڕوانە - زاراوەی نەتـەوەیی لـەو فەرهەنگـە — هـەروەها لەبەشـی فکری ( مافی چارەنووس ..) وەك چەمك تۆمار کراوە .

## (٣٩)

## mandate ئینتداب

لە مادەی (٢٢)ی بەلگەنامەکانی (کۆمەڵەی نەتەوەکان — عصبة الأمم)ی یەکەم لە ١٩١٩ز ئەو سیستەمە ڕەوایی پێ درا لەدوای جاڕدانی بنەمای ویلسن کە بۆ ڕزگاری میللەتان پەیدابوو، کرا سێ پایە، (أ-ب-جـ) بە پێی پێگەیشتووی ئەو وڵاتانە، میراتی عوسمانی (سوریا، لبنان، بۆ فەرەنسا، عیراق، ئوردن، فەلەستین، بۆ بەریتانیا) لە پایەی (أ) بوون هەرچی (ب)و (جـ) بۆ هەریەکە لە ئەفریقیای سەروو ئەفریقیای خواروو دانرا کە ئاستی پێگەیشتنیان بۆ بوون بە دەوڵەت لاوازتر بووە، دەسەڵاتی (دەوڵەتی منتدب) زیاتر بووە لە کاروبار هەڵسوڕانی .. ناوەڕۆکەکەی بە پوختەیی ئەوەیە وڵاتانی دەسەڵاتداری مەزن هەڵسێ بە پێی فەرمانی یاسای نێو دەولی یارمەتی میلەتێکی پێنەگەشتوو بدا تا داموو دەزگای دەوڵەتیان بۆ ڕێك دەخا، بەو نێوانەی دروستکردنی دام ودەزگای دەولەت بوون دەووترا (فترة الإنتداب)، بەڵام گەلێ جار لە لایەن ڕەخنەگرانەوە وادەبینرا کە ئەوەش هەر جۆرێکی ترە لە داگیرکردنی ئینتیدابی و گۆڕینی شێوازی ئیمپریالیزمیە، بەتایبەتی کە ماوەی ئینتیدابی درێژە دەکێشێ، لەڕاستیدا ئنتداب گوزارش لە فەلسەفەیەکی کونی ڕوژئاوایی دەکا کە ئەوان خۆیان پێ مامۆستاو خەلکی تریشیان پێ قوتابی یە، یەکەم جار جنرال سمتیس ئەوبیروکەی لەگەل بیروکەی داهینانی (عصبة الامم) جاردا، دوای بەیاسایی کراو جێ بەجێ کرا.

(٤٠)

## پسولەی لێبوردن     صكوك غفران

ئەو پسولەیە بوو لەلایەن کنێسەوە دەفرۆشرا تا خەڵك لە بەهەشت وەرگیری، ئەو دیاردەیەش لە چوارچێوەی ئەو هەموو دەستکاری‌و داهێنانەی کنێسە دەیکرد، لە ئاینی مەسیحی بەتایبەتی لە سەدەکانی ١٥و ١٦و بلاوبوونەوەی چەندین جۆر باج‌و سەرانەو سزاو پاداش، دەقی پسولەکە بەعەرەبی دەینووسینەوە ئەوەیە : {ربنا یسوع یا ( یا لەو کەوانە ناوی کڕیارەکە دەنوسرێ) ویشملك بإستحقاقات الأمة الكلية والقدسية وإنا بالسلطان الرسول المعطى لي أحلك من جميع القصاصات والأحكام والطاملات الكنيسة التي استوتيهاء أيضاً من جميع الأفراط والخطايا والذنوب التي إرتكبها مهما كانت عظيمة و فظيعة، ومن كل علةء إن كانت محفوظة لأبينا القدس البابا الكرسي الرسولي، امحو جميع أقذار الذنب وكل علامات الملامة التي ربما جلبتها على نفسك في هذه الفرصة و أرفع القصاصات التي كنت تكترم بكا كبرتها في المطهر، وأدرك حديثاً الى الشركه في أسرار الكنيسة، و اقرنك شركه القديسين، أرك الثانية الى طهارة والبر اللذين كانا لك عند محمودتيك، حتى إنه في ساعة الموت يغلق امامك الباب الذي يدخل منه الطاة الى محل العذاب والعقاب، ويفتح الباب الذي يؤدى الى فردوس الفرح، وإن لم تمت سيئن مستطيلة فهذه النعمة تبقى غير متغيرة حتى تأتي ساعتك الآخرة بأسم الأب و الإبن والروح القدس} .

مارتن لوتەر(١٤٨٢ – ١٥٤٦) یەکێ لەو زانا ئاین پەروەرانە بووە کە زۆر دژی ئەو پسولەیە بووە، هەڵساوە بە چاکسازی‌و ڕێبازی پرۆتستانی لێ هاتە دی، لەچەند سەرچاوەیەك هاتووە دەڵێن بە ڕێگەیەکی زۆر دانایانە بەریان لەو نەریتە ئاینیە نامۆیە گرتەوە یەکەجار یەکێ لەو زانایانە چووە کنێسەو داوای لێکردن کە دوزەخیان پێ بفرۆشێ (نەك بەهەشت) بە نرخێکی گران لێی کرین،

